# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

بەرگی هەژدەیەم

سوورەتەکانی

(النّور) و (الفرقان)

عەلی باپیر

# تەفسیری سوورەتەکانی

# النُّورِ و الفُرْقَانِ

نـــووســـــینی: عـــەلی بـــاپیر
دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی
چاپـــی یەکەم ١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز
٦٣٨ لاپــــــەڕە
١٧* ٢٤ ســــم
بابـەت : ئـاینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتیی

إنَّ الحَمْدَ للَّـهِ نَحْمَـدُهُ وَنَسْـتَعِينُهُ، وَنَسْـتَغْفِرُهُ، وَنَعُـوذُ باللَّهِ مِـنْ شرُورِ أَنْفُسِـنَا، وَمِنْ سَـيئَاتِ أَعْمَالِنَـا، مَـنْ يَهْـده اللَّـهُ فَـلاَ مُضِـلَّ لَـهُ، وَمَـنْ يُضْلِـلْ فَـلاَ هَـادِيَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَن لاَ إِلَـهَ إِلاّ اللَّـهُ وَحْـدَهُ لاَ شَرِيـكَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـداً عَبْـدُهُ وَرَسـولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب.

أَمَّـا بَعْـدُ: فـإِنَّ أَصْـدَقَ الحَديـث كَلامُ اللَّـه، وَخَـيْرَ الْهَـدِيِ هَـدْيُ مُحَمَّـد ﷺ وَشرُّ الأُمُـورِ مُحْدَثاتُهـا، وَكُلُّ مُحْدَثَـةٍ بِدْعَة، وَكُـلُّ بِدْعَةٍ ضَـلاَلَةٌ، وَكُلُّ ضَـلاَلَةٍ فِي النَّـار[1].

**خوێنـەرە بەرِێـزو خۆشـەویستەکان!**

هیـچ گومـانی تێدانیـە - بـۆ مرۆڤـی بـڕوادار - کـە ئـەو تەمەنـەی لـە خزمـەت دواییـن کتێبـی خـوا (قورئـان)دا بەسـەردەبرێ، جا بـە هـەر شـێوەیەك لـە شـێوەکانی لە خزمەتدابوونـدا بـێ؛ خوێندنـەوە، تێفکریـن و ڕامـان، فێرکـردن، کارپێکـردن ... هتـد، بـە باشتـرین جێگرتـن جێـگا دەگـرێ و، خاوەنەکـەی لـە دنیـاو دوارۆژدا لێـی بەهرەمەنـدە.

---

(١) ئـەوە پێـی دەگـوترێ: (خطبـة الحاجـة) کـە پێغـەمبـەر ﷺ هـاوەڵانی بەرِێـزی فێـردەکرد، پێـش هـەر قسـەیەکی گرنگ، بیڵـێن، وەك وتـاری جومعـەو داخـوازییکردن (خِطْبة)و... هتـدو، ئـەم وتـارە، هـەرکام لە: التـرمذي: (١١٠٥)، النسـائي: (١١٠٤)، ابن ماجـە: (١٨٩٢) أحمـد: (٣٧٢٠)، الطَّبـراني: (٢٤١٤) هێنـاویانەو (مسلم)یش بەشـێکی هێنـاوە.

منیش کـە - وەك باسـکردنی چاکـەی خـوا (التحدّث بنعمـة اللّـه) دەیخـەمەڕوو- لـەوەتی فامـم کردۆتـەوە، خـوای بەبەزەیـی و بەخشـەر چاکـەی لەگـەڵ کـردووم و، بـە فەرمایشـتی بـەرزو بـێ وێنـەی خۆیـەوە سـەرگەرمی کردوومـو، بـەر لـە تەمـەنی بیســـت سـاڵیی یـەوە هیدایـەتی داوم، کـە قورئـانی بەڕێـزو پیـز لەبـەر بکـەم و، سـەرقـاڵی خوێندنـەوەی تەفسـیرەکانی قورئـان و تێوەڕامـانی ئایەتـە پڕ بەرەکەتـەکانی و، لێوردبوونەوەیـان بـم.

هــەر بۆیـەش تێکـڕای کتێـب و نامیلکـەو وتـارو دەرسـەکانم، کـەم و زۆر لەبـەر ڕۆشـنایی قورئـان دابـوون، کـە دیـارە هــەر ئەمـەش شـتێکی سروشـتییە؛ ئاخـر ئایـا ئیسـلام بێجگـە لـە قورئـان پاشـان سـوننەتی پێغـەمبــەر ﷺ، کـە ئەویــش هــەر ڕوونکردنـەوەی قورئـان و چۆنیـەتی جێبەجێکـردن و کارپێکردنیـەتی، شـتێکی دیکەیـە؟! بێگومـان نەخێـر.

ئنجـا لەمێـژ سـاڵیش بـوو، کـە بـراو خوشـکانێکی دڵســۆزی نزیـك و ئاشـنام، داوایـان لێدەکـردم کـە دەسـت بکـەم بـە دانـانی تەفسـیـرو لێکدانەوەیـەکی قورئـان، هــەتا لـە ڕەمـەزانی سـاڵی (١٤٢٨)دا هاتـە دڵمــەوە، کـە نـاوی خـوای لێبهێنـم و دەسـت بـەو کارە گـەورەو گرنگـە بکـەم، بەڵکـو وردە وردە بەپێـی بـوارو دەرفـەت، هــەرساڵە هــەندێکی لـێ ئەنجـام بـدەم، لەگـەڵ سـەرقاڵیی زۆرو جـۆراو جۆریشــدا، هــەتا دەرفەتێـکی وام بۆ دەڕەخسـێ کـە بتوانـم خێرایـی تێـدا بکـەم و خۆمـی بـۆ یەکلایـی (متفـرّغ) بکەمـەوەو، خـوا پشـتیوان بـێ تـەواوی بکـەم، ئەگــەر تەمـەن بەبەریـــەوە مابێ.

سـەرچاوەی دانـانی ئـەم تەفسـیرو لێکدانەوەیەشـــم، وێـڕای سـەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسـیــرانەی کـە بـاون و، دەسـتم پێیان گەیشـــتوە، بریتیە لـە وردبوونـەوەو تێوەڕامانی خـۆم لە خــودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هــەندێکی هــەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (القرآن يُفَسِّـر بَعضُهُ بَعْضَـاً)، پاشان سـوننەتی پێغـەمبـەری خوا ﷺ، چونکە پێغـەمبـەری خــواش ڕوونکەرەوە (مُبَيِّن)ی قورئـــانە، وەك خـــوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتە: وە زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیر بکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە مسوڵمانانی کوردستان بکەم، کە لە قورئان بوەشێتەوەو، مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش کە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزن و تەفسیرەکانی و کتێبەکانی سوننەتدا خەریکم و، دەیان کتێب و بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەکانی زانستەکانی شەریعەتدا پێشکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیست و دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئەمریکاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێکی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی کتێبی خوا (تبارك و تعالى) و، بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەکانی یەوە، ئەم ڕاستییەش لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله تعالى)دا زۆر چاك دەرەوشاوەتەوە[1]. بەڵام هەڵبەتە ناڵێم و هیچکەسیش بۆی نیە بڵێ: کە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونکە وێڕای سنوورداربوونی تواناو بڕستم، لە بەرانبەر کتێبی لە هەموو ڕوویێکەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشمویستوە کە زۆر بەملاولادا بچم و بچمە نێو هەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیدا پسپۆڕو

---

(١) ئەو مەوسووعەیە کە ئێستا چاپ کراوەو، کەوتۆتە بەردەستی خوێنەران و، سەرجەم هەشت بەرگ و دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەم و، تاکە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەکانی سوننەت، کە لە هۆش (ذاکرة)دا بووون.

شایانی باسە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمی دا، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبی سەربەخۆ، بە مەبەستی ئاسانتر سوود لێ بینرانی .

شـــارەزا نیـم، یـان خوێنـــەر پێویســـتی پێـی نیـــە، لـە کاتێکـدا دەیـــەوێ لـە قورئان تێبگات و، بزانـێ خـوا (تبارك وتعـالـی) ڕاستەوخۆ چـی پـێ فـــەرمووە؟!

ئنجا هــەر لێرەشـەوە بە پێویسـتی دەزانم پڕ بە دڵ سـوپاسی ئەو بـرا گەنجە ڕووح ســـووك و گـورج و گـۆڵ و دڵســـۆزە بکـەم (حـەزی نەکـرد نـاوی بهێنـم)، کـە هــەڵسـا بـە نووسـینەوەو هێنـــانە ســـەر کاغـــەزو، پاشـان تایپکـردن و دوایـی پێداچوونـەوەو هەڵەگیــریی، ســەرجــەم ئـەم زنجیــرە دەرسـە، کـە لـە ئەسـڵدا لـە شێوەی وتـار (محـاضرة)دا پێشـکەش کراون، هـــەروەها هـــەڵسـا بـە (تخریج)ی سـەرجەم دەقەکانی سـوننەت، لـە سـەرچاوە متمانـە پێکراوەکانـەوەو، زەحمـەت و ماندووبوونێـکی زۆری بـە ســەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسـیــرە کێشـــاوە، خـــوا بــە باشتـــرین شـــێوە پاداشـتی بداتـەوەو، هـــەر صـالح و ســاغ و سـەلامەت و ســەربەرزبێ[1]، لـە خـوای بـەرزو بێهـاوتاش داواکارم ئـەو جـۆرە گەنـج و لاوانـە لـە کـوڕان و کچـان، لەنێـو گەلەکەمانـدا، زۆر بـکات .

شـایانی باسیشــە کــە ئێمــە لــەم تەفسیـــرەماندا بــاسی بــەش (جــزء)ەکانی قورئـــان و دابەشــکردنەکانی دیکــەی وەك: - (حـــزب) - ناکەیـــن، چونکــە هـــەر ســـوورەتێك بۆخـــۆی شـــتێکی ســـەربەخۆیـــەو، ســـەرجەم ئایەتـــەکانی وەك ئاڵقـــەکانی زنجیرێـــك پێکـەوە پەیوەسـتن و، ئاشکراشـە کـە دابەشـکرانی سـەرجەم قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جزء) و شەســـت (٦٠) (حـزب)، شـتێکە لەلایـەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قورئـــان، دیـارە ئێمــە لــە دابەشـکردنی بەرگـەکانی ئــەم تەفسـیـرەشـــدا، دیســان حیســـاب بــۆ بەشــەکان (أجـزاء)ی ناکەیــن و، بــە گوێــرەی ســـوورەتەکان، بەرگــەکانی دیــاریی دەکەیـن.

---

(١) ئــەو بـــرا دڵســـۆزە ئێســـتاش پـاش تەواوکردنــی نیـوەی زیاتـری قورئـان، لێبڕاوانــە بەردەوامە و عەزمیشــی جــەزم کــردوە، کــە ئەگــەر تەمەنـــان بــەردەوام بێ، هەتـــا کۆتـــایی ئــەم تەفسیـــرە ســـەرگەرمی کارەکــەی بێ .

دوا قســەشــم ئەوەیــە کە:

ئــەم تەفســیرە - وەك پێشــتــر گوتمــان - لــە ئەســڵدا بەشــێوەی دەرس و وتــار پێشــکەش کــراوە، بــەڵام دواتــر خــۆم دووجــار بــە وردیــی پێیــدا چوومــەوەو، بەپێــی پێویســت دەســتکاریم کــردوە، دیــارە هــەموو دەرسێکیش بەنــاوی خــواو ســتایشی خــوا ﷻ دەســتی پێکــردوە، بــەڵام ئێمــە لــە ســەرەتای دەرســەکانەوە، ئەوانەمــان لابــردوە، بــۆ زۆر دووبــارە نەبوونــەوەو، ئــەو (خطبــة الحاجــة)یەی لــە ســەرەتای ئــەم پێشــەکەییەوە هاتــوە، لەجیــاتی ســەرەتای ســەرجەم دەرســەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هــەولێر

## بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەکی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان کردوە کە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە، لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە کۆتایی هەر بەرگێکی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی کەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەکانیانمان بە ڕیز نووسیون، بەڵام لێرەش وەك جەختکردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەکانمان نووسیوە، نە پێویست دەکات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆکەیەك، کە زۆربەی تەفسیرەکان لەبارەی ئایەتێکەوە، یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێکەوە، دەیهێنن، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر کات بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتی یەکێك لە تەفسیرەکان هەبێ و بکەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بکەم، چ ڕەفزی بکەم، هەر کات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەکەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەکان لە کۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیکتیفا دەکەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمية) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بکەم، چونکە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێکی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

شایانی باسیشە جاری وا هەیە بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتیی خۆمم، دەربارەی کۆمەڵە ئایەتێك یان ئایەتێك یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێك، بۆ دروست دەبێ،

وەك تێگەیشتن و بۆچوونی خۆم دەینووسم، کەچی ڕەنگە لە تەفسیرەکانی دیکەش - یەکێکیان یان زیاتر - دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە کە من ئەو تەفسیرەم نەکەوتۆتە بەر دیدە، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە.

## پێشەکی ئەم بەرگە

**الحمدلله الكبير المتعال والصلاة والسلام على محمد والآل من الصحب والقرابة والأزواج والتابعين لهم بإحسان إلى يوم المثال .**

بەڕێزان !

ستایشی پێویست و لێوەشاوە بۆ خوای بەرزی مەزن کە یارمەتیی داین ئەم بەرگی هەژدەیەمەش ئامادە و چاپ و بڵاوبکەینەوە لە [تەفسیری قورئانی بەرزی بەڕێز] کە هەردووك سوورەتی (النور) و (الفرقان)ی گرتوونەخۆی و، کە تەنیا سوورەتی (النور) زیاتر لە بیست (٢٠) حوکمی شەرعیی گەورە و گرنگی جۆراوجۆر و هەستیاریی گرتوونە خۆی.

دیارە ئەم دوو سوورەتەی (النور) و (الفرقان)یش، هەر بەهەمان نەخشەی سوورەتەکانی دیکە بە حەوت قۆناغ تەفسیرکراون و، وێڕای تەفسیرکردنی پشوو درێژانەی ئایەتەکانیشیان ، ژمارەیەك کورتە باسیشیان تێدا خراونە ڕوو، کە ئەمانە گرنگترینیانن:

**یەکەم: لە سوورەتی (النور) دا:**

١- کورتە باسێك لەبەرەی سزای زیناوە.

٢- کورتە باسێك لەبارەی ڕەوایی و ناڕەوایی هاوسەرگیریی پیاو و ئافرەتی پاك لەگەڵ زیناکاردا.

٣- کورتە باسێك لەبارەی بوختانی داوێنپیسییەوە.

٤- کورتە باسێك لەبارەی کچانەوە.

٥- دە هەڵوەستەی کورت لەبارەی بەسەرهاتی بوختان پێکران بە دایکمان عائیشەوە .

٦- کورتەباسێك لەبارەی سەردان و مۆڵەت وەگرتن و سڵاوکردنەوە.

٧- کورتەباسێك لەبارەی سنووری عەورەتی پیاو و ئافرەت.

٨- کورتەباسێك دەربارەی هاوسەرگیریی و پێنج مەسەلەی هەستیار.

٩- کورتەباسێك: دە دەقی سوننەت لەبارەی مامەڵەکردنەوە لەگەڵ مزگەوتان دا.

١٠- کورتەباسێك : ئایەتی (٥٥) و چوار ڕاستی مەزن.

**دووەم: لە سووڕەتی (الفرقان) دا:**

١- کورتەباسێك لەبارەی ئەندازەگیریی خواوە بۆ گەردوون و پێکهاتەکانی.

٢- بۆچی خوا بێبڕوایانی لە ئاژەڵ بە خراپتر داناون؟

٣- واتا و هۆکاری تێکەڵ نەبوونی دەریای سوێر و شیرین.

هیواداریشـم خوێنەرانـی بەڕێـز بەوردیـی و تێوەڕامانـی زۆرەوە بیخوێننـەوەو بەهـرەی لێوەربگـرن وە ئێمـە لـە سـەرنج و تێبینییەکانـی خۆیـان بەهرەمەنـد بکـەن.

١٧ / ربیع الثاني ١٤٤٢ك

٢ / ١٢ / ٢٠٢٠ز

## دەستپێک

خوشك و برایانی مسوڵمانی بەڕێزو خۆشەویست !

خـوا پشـتیوان بـێ ئەمـرۆ کـە (١٣)ی مانگـی بـە پێـزی ڕەمەزانـی، سـاڵی (١٤٤٠)ی کۆچیـی، بەرانبـەر بـە (٢٠١٩/٥/١٨)ی سـاڵی زایینییـە، دەسـت دەکەین بە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (النـور)، سـەرەتا وەك عادەتـی خۆمـان، پێناسـەی سـوورەتی (النـور) دەکەیـن و، نێوەڕۆکەکـەی و ئـەو بابەتانـەی گرتوونیـە خـۆی، تیشـکیان دەخەینـە سـەر بـە خوڵاصەیـی و کوشراویـی، بـۆ ئـەوەی بـەر لـەوەی بچینـە نێـو وردەکارییەکانـی ڕوونکردنـەوەی چەمـك و واتـاو مەبەسـتەکانی، ئـەو ئایەتـە بـە پێزانـەی گرتوونیـە خـۆی، نەخشـەی گشـتیی سـوورەتەکەو، مانـاو مەبەسـتەکانیمان لەبـەر چـاو بـێ.

## پێناسەی سوورەتی (النور) و نێوەڕۆکەکەی

ئێمـە لـە حـەوت بڕگـەدا پێناسـەی ئـەم سـوورەتە دەکەیـن و، نێوەڕۆکـی ئایەتەکانـی و، مەبەسـتەکانی دەخەینـە ڕوو:

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە تەنیـا یـەك نـاوی هەیـە (سـورة النـور)، وا دیـارە لـە سـەردەمی پێغەمبەریشـدا ﷺ یـان بـە لای کەمـەوە لـە سـەردەمی چـوار خەلیفـە ڕاشـیدەکاندا: (ئەبـوو بەکـرو عومـەرو عوسـمان و عەلـی) (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) بـەو نـاوە نـاسراوە، ئەویـش بـە هـۆی ئایەتـی ژمـارە (٣٥)ەوە، کـە ئـەم سـوورەتە موبارەکـەی گرتوویەتـە

خوای، کە بەم ڕستە بە پێزە دەست پێدەکات: ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾.

لەو بارەوە ئەم دوو شوێنەوارە دێنین:

**١)- [عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: عَلِّمُوا رِجَالَكُمْ سُورَةَ الْمَائِدَةِ، وَعَلِّمُوا نِسَاءَكُمْ سُورَةَ النُّورِ] (رَوَاهُ الْبَيْهَقِيُّ فِي الشُّعَبِ: ٢٤٥٤، مُرْسَلاً، والأَشْبَهُ كونُهُ عَنْ عُمَرَ مِنْ قَوْلِهِ، وَصَحَّحَهُ مَوْقُوفاً مَحقِّق فَتحُ القَدْيرِ، عَبْدالرزاق المهدي).**

واتە: موجاهید دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پیاوەکانتان سوورەتی (المائدة)یان فێر بکەن و، ئافرەتەکانیشتان سوورەتی (النور)یان فێر بکەن.

ئەم دەقە مادام لە موجاهیدەوە بێ، موجاهیدیش لە شوێنکەوتووانەو قوتابی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسە، (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، مانای وایە بە (مرسل) دادەنرێ، دەقێکی (مرسل)یش ئەوەیە کە یەکسەر تابیعیی پاڵی بداتە لای پێغەمبەر ﷺو، ناوی ئەو هاوەڵە نەهێنێ کە لێیبیستوە، بۆیە وا پێدەچێ: ئەمە قسەی عومەر بێ (خوا لێی ڕازی بێ)، کە ئەو کاتە بە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ لە قەڵەم نادرێ، بەڵکو بە قسەو ڕێنمایی عومەر لە قەڵەم دەدرێ.

**٢)- [أَخْرَجَ أَبُو عُبَيْد فِي «فَضَائِلِهِ» عَنْ حَارِثَةَ بْنِ مُضَرِّبٍ، قَالَ: كَتَبَ إِلَيْنَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ أَنْ تَعَلَّمُوا سُورَةَ النِّسَاءِ، وَالأَحْزَابِ، والنُّورِ][1].**

واتە: ئەبوو عوبەید کتێبێکی هەیە بە ناوی (فضائل) لە حاریسەی کوڕی موزەڕریبەوە هێناویەتی، کە عومەری کوڕی خەتتاب نامەی بۆ نووسین: سوورەتەکانی (النساء) و (الأحزاب) و (النور) فێربن.

مەبەستم ئەوەیە: ئەو سوورەتە لە ڕۆژگاری زووەوە، هەر بەو ناوە ناسراوەو نەشمزانیوە کە ناوێکی دیکەی بۆ بەکارهێنرابێ.

---

(١) فَتحُ القَدِير: ج٤، ص ٥.

**دووەم: ڕیزبەندیی دابەزینی و ڕیزبەندیی لە (مصحف)دا:**

ئەم سوورەتە لە ڕیزبەندیی (**مصحف**)دا، کە لە سوورەتی (**الفاتحة**)ەوە دەست پێدەکەین لە لای ڕاستەوە، تاکو دەگاتە ئەم سوورەتە، بیست و چوارەمین (٢٤) سوورەتە.

بەڵام لە ڕیزبەندیی دابەزین (**ترتیب نزول**)دا، زانایان لەوەدا ڕاجیاییان هەیە، نەك هەر بۆ ئەم سوورەتە، بەڵکو بۆ زۆربەی سوورەتەکان، یەکێك ژمارەیەکی کەمتر، یەکێك ژمارەیەکی زیاتر دەڵێ، بەڵام زۆریان گوتوویانە: ژمارە سەد (١٠٠) ە، واتە: سەدەمین سوورەت بووە دابەزیوە بە گشتیی، هەندێکیش ژمارە سەدو چوار (١٠٤)یان بۆ داناوە.

**سێیەم: جۆری ئەم سوورەتەو، شوێنی دابەزینی:**

ئەم سوورەتە بە یەکدەنگیی هەموو زانایان سوورەتێکی مەدینەییەو، لە مەدینە دابەزیوە، هەندێك لە زانایان ڕایان وایە لە چەند ماوەیەکی جیا جیادا، ئەم سوورەتە موبارەکە دابەزیوە، واتە: چەند ئایەتێك فڵان ساڵ، چەند ئایەتی دیکە فڵان ساڵ، بۆ وێنە: (**محمد الطاهر بن عاشور**) خاوەنی (**التحریر والتنویر**)، دەڵێ: هەندێکی لە نێوان ساڵانی (٢ و ٣)ی کۆچیی داو، هەندێکیش دوای ساڵی چوارەمی کۆچیی، هەندێکیش گوتوویانە: لە ساڵی نۆ (٩)ی کۆچیی دا، پاش جەنگی تەبووك دابەزیوە.

بەڵام زۆرێك لە زانایان و لێکۆڵەرەوان، ڕایان وایە: ئەم سوورەتە هەمووی پێکەوە دابەزیوە لە کۆتایی ساڵی شەشەم (٦)ی کۆچیی داو، منیش ئەو ڕایەم پێ ڕاسترە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە:

بە هەندێک سەرژمێران (٦٢)ە، بەڵام زۆربەیان (٦٤)یان داناوە، پێشتریش گوتوومانە: ژمارەی ئایەتەکان، کە زانایان ڕاجیاییان لە بارەیەوە هەیە، مانای ئەوە نیە یەکێکیان بڵێ: شەست و دوو ڕستەیە، یەکێکیان بڵێ: نەخێر دوو ڕستەی دیکەشی لێ زیادن و، دەبنە شەست و چوار (٦٤)! بەڵکو زۆریی و کەمیی ژمارەی ئایەتەکان، پەیوەستە بە چۆنیەتیی خوێندنەوەی، لە کوێ دەوەستی؟ ئەگەر لە شوێنێك بوەستی، ڕستەیەك بکەی بە دوو کەرتەوە، مانای وایە ئەو ڕستەیە دەبێتە دوو ئایەت، بەڵام ئەگەر لەو شوێنە دیاریکراوە نەوەستی، بۆ وێنە: لە سەرەتای سوورەتی (المؤمنون)دا، کە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ ١٠ ﴾، هەندێکیان لەوێ وەستاون، هەندێکیان یەکسەر خوێندوویانەتەوە: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ ١٠ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ١١ ﴾، ئەگەر نەوەستی هەمووی دەبێتە یەك ئایەت و، ئەگەر بوەستی، دەبێتە دوو ئایەت، لێرەدایە کە ڕاجیایی زانایان لە ژمارەی ئایەتەکان دا پەیدا دەبێ.

## پێنجەم: پێگەی ئەم سوورەتە:

ئەم سوورەتە پێگەو پلەیەکی تایبەتیی هەیە، دەتوانین لەو بارەوە پێنج بەڵگە بێنینەوە:

١)- ئەم سوورەتە تاکە سوورەتێکە بە وشەی (سورة) دەستی پێکردبێ، خوای پەروەردگار یەکسەر دەفەرموێ: ﴿ سُورَةٌ أَنزَلْنَٰهَا وَفَرَضْنَٰهَا وَأَنزَلْنَا فِيهَآ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ١ ﴾.

٢)- ئەم سوورەتە لە قەدەر قەبارەی خۆی کە (٦٤) ئایەتەو، دەوری نیو بەش (نصف جزء)ە، زۆرترین حوکمی شەرعیی گرتوونە خۆی، زیاتر لە سی (٣٠) حوکم، ڕەنگە یەکێك بڵێ: نەخێر (٣٠) نین و (٢٥)ن و، یەکێکی دیکە بڵێ: نەخێر (٣٠) نین و چل (٤٠)ن،

ئەگەر حوكمەكان ورد بكرێنەوە، یاخود هەندێ حوكمی دیكە لە هەندێ ئایەتی دیكە دەربهێنرێن، بەڵام من دەوری سی (٣٠) حوكمم كەوتوونە بەرچاو، كە لەم سوورەتە موبارەكە وەردەگیرێن و، حوكمی گەورەو گرنگ و هەستیارن.

٣)- لەم سوورەتەدا بەرگریی لە كەسایەتیی و سومعەی پێغەمبەری خوا ﷺو، هاوسەرانی بەرێزی بە گشتیی و، بە تایبەتیی دایكمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، (الصِّدِّيقَةُ بنتُ الصِّدِّيق) كراوەو، هاوەڵان، مسوڵمانان لە كێشەو گرفتێكی زۆر گەورە دەرباز كراون، بە هۆی ئەو حوكمانەوە، كە لەم سوورەتە موبارەكەدا نێردراونە خوارو، بە هۆی ئەو ڕوونكردنەوانەوە كە خوا ﷻ، لەم سوورەتە داونی، بە تایبەت شازدە (١٦) ئایەتەكەی: (١١ - ٢٦) كە هەموویان دەربارەی بەسەرهاتی (إِفْك) واتە: بوختان هەڵبەستن بۆ دایكمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)و، (صفوان)ی كوڕی (مُعطَّل)، كە یەكێكە لە هاوەڵانی بەرێزی پێغەمبەر ﷺ، دابەزیون.

٤)- تەنیا لەم سوورەتەدا خوای بەرزو بێ وێنە بە: ﴿نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، پێناسە كراوە، ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، خوا ڕووناكیی ئاسمانەكان و زەوییە.

٥)- حوكمە شەرعییەكانی ئەم سوورەتە موبارەكە، گشتگیرن، بۆ سەرجەم بوارەكانی: خێزانیی، ئاكاریی، كۆمەڵایەتیی، حوكمڕانیی، دادوەریی، سیاسیی و، زۆربەی ڕەهەندو لایەنەكانی ژیان و گوزەرانییان گرتوونەوە.

## شەشەم: نێوەڕۆكی ئەم سوورەتە:

باس و بابەتەكانی ئەم سوورەتە بەم شێوەیەن، كە ئێمە لە بیست و دوو (٢٢) خاڵدا باسی بابەتەكانی و، نێوەڕۆكی ئەم سوورەتە موبارەكە دەكەین، بۆ ئەوەی خوێنەر هەر لە سەرەتاوە: جوگرافیاو نەخشەی بابەتەكانی ئەم سوورەتە موبارەكەی لەبەر چاو بن:

١)- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە كە ئەم سوورەتە خوا ﷻ دایبەزاندوەو پێویستی كردوەو، چەندان ئایەتی ڕۆشن و ڕوونی تێدا دابەزاندوون.

**ئەمە لە ئایەتی (١)دا هاتوە.**

**٢)- ڕاگەیاندنی حوکمی زیناکارانی پیاوو ئافرەت، کە سزایەکەیان ئەوەیە دەبێ یەکێ سەد (١٠٠) قەمچییان لێ بدرێ.**

**لە ئایەتی (٢)دا هاتوە.**

**٣)- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە پیاوان و ژنانی زیناکارو موشریك، هۆگرو شایستەی یەکدین و، لەسەر پیاوانی بڕوادار قەدەغەیە، هاوسەرگیریی لەگەڵ ژنانی زیناکارو هاوبەش بۆ خوادانەران دا، بکەن.**

**لە ئایەتی (٣)دا هاتوە.**

**٤)- حوکمی بوختانی داوێن پیسیی کردن بە ژنان و پیاوانی پاك، کە دەبێ یەکێ هەشتا قەمچییان لێبدرێ، وەك سزا.**

**ئەمیش لە ئایەتەکانی (٤ و ٥)دا، هاتوە.**

**٥)- حوکمی (لِعَان) یان (مُلاَعَنَة) لە نێوان ژن و مێردا، لە کاتێکدا مێردەکە ژنەکەی بە زیناکردن تۆمەتبار دەکات.**

**لە ئایەتەکانی: (٦ - ١٠)دا هاتوە.**

**٦)- بەسەرهاتی بوختان بۆ هەڵبەسترانی دایکی بڕواداران عائیشە (خوا لێی ڕازیبێ)و، سەرزەنشتکردنی خوا بۆ بڕواداراتێك، کە بەو بوختانە بێ بنەمایە هەڵخەڵەتان و، بە جۆرێك لە جۆرەکان پشکیان لە بڵاوبوونەوەیدا هەبوو و، چەند بابەتێکی دیکەی پەیوەست بەو بەسەرهاتەوەو، ڕاگەیاندنی ڕوون و ڕاشکاوی، پاکیی و، چاکیی دایکی بڕواداران عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، هەروەوها (صفوان بن معطل)، کە ئەویش تۆمەتبار کرابوو لەگەڵ دایکمان عائیشەدا.**

**ئەمیش لە ئایەتەکانی: (١١ - ٢٦)داو، شازدە (١٦) ئایەتی بۆ تەرخان کراون.**

٧)- مەسەلەی مۆڵەت وەرگرتن بۆ سەردانیی کردن بۆ ماڵی یەکدیی مسوڵمانان و، حوکمەکانی و، حاڵەتە جۆراو جۆرەکانی ئەو مەسەلەیە.

ئەویش سێ ئایەتی بۆ تەرخانکراون، ئایەتەکانی: (٢٧، ٢٨، ٢٩).

٨)- پێویست بوونی چاوی خۆپاراستنی هەر کام لە پیاوان و ئافرەتان لە ئاست یەکدیی داو، داوێنی خۆپاراستن و، جوانیی خۆ دەرنەخستنی ئافرەتان، مەگەر بۆ مێردیان و پیاوانی مەحرەم.

ئەمیش ئایەتەکانی: (٣٠ - ٣١)ی بۆ تەرخانکراوە.

٩)- لەسەر مسوڵمانان پێویستکردنی هاوسەردارکردنی ئافرەتان و پیاوانی بێ هاوسەر، چ ئازادبن چ کۆیلە بن و، پێویستکردنی خۆ پاکراگرتنی ئەوانەی توانای هاوسەرگیرییان نیە و، پێویستکردنی (مُکَاتَبَة) لەگەڵ کۆیلان داکردن و، هاوکاریی کردنیان، لەو ماڵ و سامانەی مسوڵمانان لەبەر دەستیان دایەو، قەدەغەکردنی ناچارکردنی کەنیزەکەکان لەسەر لەشفرۆشیی، (زیناکردن بە پارە).

کە ئایەتەکانی: (٣٢ - ٣٣) گرتوویاننە خۆیان.

١٠)- جەختکردنەوە لەسەر ئەو ڕاستییە کە، قورئان ئایەتە ڕوون و ڕۆشنکەرەوەکان و، پەندو عیبرەت و پێشووان و، ئامۆژگاریی بۆ بڕواداران گرتوونە خۆی.

ئەمیش لە ئایەتی (٣٤)دا خراوەتە ڕوو.

١١)- وەسفکرانی خوا (عز وجل) بەوە کە ڕووناکیی ئاسمانەکان و زەوییەو، ڕوونکردنەوەی ئەوەش بە هێنانەوەی وێنەیەك: تاقێك چرایەکی تێدا دانراوە، چرایەکە لە شووشەیەکدایە، کە وەك ئەستێرەی درەوشاوە وایە، شووشەکە بە زەیتێك دادەگیرسێ، هێندە زەیتێکی باشە، ئەگەر ئاگریشی نەگاتێ، بۆ خۆی ڕۆشنبێ، بەو بۆنەشەوە باسکردنی ماڵەکانی خواو، پیاوانێك کە یادی خوا لەو ماڵانەدا دەکەن و، بازرگانیی و مامەڵە لە یادی خواو،

بەرپاکردنی نوێژو زەکاتدان، بێ ئاگایان ناکات، هەروەها باسی پاداشتی بەرزو زۆرو زەوەندیان و، ئەوە کە خوا لە بەخششی خۆی بۆشیان زیاد دەکات.

ئەمیش لە ئایەتەکانی: (٣٦ و ٣٧ و ٣٨)دا خراوەتە ڕوو.

١٢)- باسی سەرەنجامی شوومی بێبڕوایان و، کردەوەکانیان، بە هێنانەوەی دوو وێنەی زەمینیی: تراویلکەی بیابان، وێنەی دەریایی: تاریکاییەکانی نێو دەریایەك، چ تاریکایی خودی دەریاکە، چ شەپۆلە یەك لەسەر یەکەکانی، چ هەورێ کە لەسەر دەریاکەوە قەراری گرتوە.

ئەمیش لە ئایەتەکانی: (٣٩ و ٤٠)دا خراوەتە ڕوو.

١٣)- خستنە ڕووی چەند دیاردەو دیمەنێکی گەردوونی خوا کردی، دڵبزوێن، لەسەر باڵادەستیی و، زانایی و، میهرەبانیی و، کارزانیی خوا ﷻ، هەروەها باسی ئەوە کە هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەویدایە، خوا بە پاك دەگرێ و، باڵندەکانیش کە باڵیان ڕاست دەکەن و ڕیز دەکەن، خوا بە پاك دەگرن، پاشان باسی هەورەکان کە چۆن خوا ﷻ بە نەرمیی لێیان دەخورێ، دوایی پێکەوە دەلکێن و موتووربە دەبن، دوایی لەسەر یەك کەڵەکە دەبن، دوایی بارانیان لێ دێتە دەر، هەروەها لەو هەورانەی شێوەی چیا دەنوێنن، تەرزە دێتە خوار، کە خوا هەر کەسێکی بیەوێ لێی دەدلو، هەر کەسێ بیەوێ لێی لادەدلو، تیشکی برووسکەکەی خەریکە چاو کوێر دەکات، هێندە بەهێزە.

پاشان باسی ئەوە کە خوا ﷻ هەموو شتێکی لە تۆو ئاو دروست کردوە، هەموو ژیاندارێك، چ ئەوانەی دەخشێن لەسەر سك، چ ئەوانەی لەسەر دوو پێ دەڕۆن، چ ئەوانەی لەسەر چوار پێ دەڕۆن.

ئەمەش لە ئایەتەکانی: (٤١ - ٤٥) خراوەتە ڕوو.

١٤)- دووبارە جەختکردنەوە لەسەر ڕۆشنیی و، ڕۆشنکەرەوەیی ئایەتەکانی قورئان و، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوا بەندەکانی بەرەو ڕاستە شەقام ڕێنمایی دەکات.

ئەمیش لە ئایەتی (٤٦)دا خراوەتە ڕوو.

١٥)- خستنەڕوو و، ڕەخنەلێگرتنی هەڵوێستی کەسانێکی دەغەڵ و دڵنەخۆش، کە وێڕای لاف لێدانی هەبوونی ئیمان بە خواو پێغەمبەری خوا ﷺو، دەربڕینی ئامادەییان بۆ فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ، کەچی ئامادە نین ملکەچی خواو پێغەمبەر بن، لە کاتی دادەوەرییداو، پابەند بن بە بڕیارەکانی پێغەمبەرەوەو، ڕاگەیاندنی هەڵوێستی ڕاست و دروستی ئیمانداران لەو بارەوە، کە ئەگەر دەیانەوێ بە ئیماندار لە قەڵەم بدرێن لە لای خوا، دەبێ بەو شێوەیە بن.

ئەمیش لە ئایەتەکانی: (٤٧ - ٥٤)دا خراوەتە ڕوو.

١٦)- موژدە پێدانی ئیماندارانی کردار باش، بە باڵا دەست کردن و بە حوکمڕان کردنیان لە زەویی دا، بەڵام بە مەرجی بەندایەتیی کردنی، بێ خڵتەی شیرك و لادان، بۆ خوا، ئنجا فەرمانکردن بە نوێژو زەکات و، فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺو، دڵنیا کردنەوەی بڕواداران لە دەستە پاچەیی بێبڕوایان لە بەرانبەر خوای باڵا دەستی هەمەکارەدا.

ئەمیش لە ئایەتەکانی: (٥٥، ٥٦، ٥٧)دا خراوەتە ڕوو.

١٧)- فەرمانکردنی خوا ﷻ بە مسوڵمانان کە کۆیلەو، کەنیزەکەکان و، منداڵەکانیان چ نەباڵغ بن، چ باڵغ بن، لەسەر مۆڵەت وەرگرتن بۆ چوونە ژووری تایبەتییان، ڕابهێنن و ئامادەیان بکەن.

ئەمیش لە ئایەتەکانی: (٥٨ و ٥٩)دا خراوەتە ڕوو.

١٨)- هەڵاواردنی ئافرەتانی بە تەمەنی بێ تەماع لە شووکردن دا، لە حوکمی زێدە خۆداپۆشین، وەك: چارۆکەو سەرپۆش، کە بۆیان هەیە ئەوانە دابنێن، هەرچەندە ئەگەر دووربینیی (إحتیاط) بکەن بۆ ئەوان باشترە.

ئەمەش لە ئایەتی ژمارە (٦٠)دا خراوەتە ڕوو.

١٩)- ڕوونکردنەوەی حوکمی خواردن و خواردنەوەی کەسانی کوێر، شەل، نەخۆش، هەروەها کەسانی ساغ بە گشتیی لەماڵی خۆیان، بابیان، دایکیان، برایان، خوشکیان،

مامیان، پلکیان (واتە: خوشکی بابیان)، خاڵیان، پووریان (واتە: خوشکی دایکیان)، ئەو ماڵەی کە کلیلیان بە دەستە، (یان ئەو کەسەی کلیلی ماڵەکەی بە دەستە)، برادەریان، هەروەها حوکمی پێکەوە، یان تاك تاك نانخواردنی مسوڵمانان و، ئەدەبی سڵاوکردنیان لە کاتی چوونە ژووردا.

ئەمیش لە ئایەتی ژمارە (٦١)دا خراوەتە ڕوو.

٢٠)- ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە بڕواداران لە کاتێکدا بۆ کارێکی گرنگی کۆکەرەوە کۆدەبنەوە، کارێکی کۆمەڵایەتیی، سیاسیی، پڕۆژەیەك، کۆبوونەوەیەك، بۆیان نیە بە بێ مۆڵەتی پێغەمبەر ﷺ، هەروەها ئەو کەسەی لە شوێنی ئەو دەبێ، بەملاولادا بڕۆن.

ئەمیش لە ئایەتی (٦٢)دا خراوەتە ڕوو.

٢١)- ڕوونکردنەوەی ئەدەبی بانگکردنی مسوڵمانان بۆ پێغەمبەر ﷺ، کە نابێ وەك بانگکردنی نێو خۆیان بێ، بۆ یەکدیی و، بڵێن: ئەی موحەممەد ﷺ! یان (**یا أبا القاسم**)، بەڵکو دەبێ بەڕێزو حورمەتەوە بانگی بکەن (**یا نبي الله، یا رسول الله**) و، هۆشداریی پێدانی مسوڵمانان لە خۆ دزینەوەو سەرپێچیی کردن لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ، هەروەها هەر قیادەیەك کە بەڕێی ویدا دەڕوا، تاکو دووچاری سزای دنیا، یاخود دوا ڕۆژ نەبن.

ئەمیش لە ئایەتی (٦٣)دا خراوەتە ڕوو.

٢٢)- هۆشداریی پێدانی مسوڵمانان بە گشتیی، کە خوا خاوەنی هەر شتێکە، کە لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیەو، هەموو شتێکیان لە بارەوە دەزانێ و، کاتێ دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، هەواڵی کردەوەکانیان پێدەداو، خوا بە هەموو شتێ زانایە.

ئەمیش لە ئایەتی (٦٤)و کۆتایی دا خراوەتە ڕوو.

**حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە بۆ شەش (٦) دەرس:**

بەڕێـــزان!

هـەر سـووڕەتێ کـە دەمـەوێ تەفسـیری بکـەم، پێـش هەمـوو شـتێ، دێنـم زۆر سـەرنجی دەدەم و، لێـی ورد دەبمـەوەو تێـی ڕادەمێنـم: ئایـا دەگونجـێ چەنـد ئایەتـێ زیاتـر پێکـەوە زیاتـر پەیوەسـت بـن و، بکرێنـە دەرسـێك، هەرچەنـدە ئایەتەکانـی قورئـان، بـە تایبەتـی سـووڕەتە مەککەییـەکان، - کـە ئـەم سـووڕەتە سـووڕەتێکی مەدینەییـە - وەك شـەپۆلی دەریـا وان و ناپسـێنەوە، وەك لـە سـەرەتای سـووڕەتی (الأنعـام)دا کاتی خـۆی باسـمان کـردوە، بـەڵام بـە هەرحـاڵ هـەر چـۆن بـێ، بـۆ تەفسـیرکردن و تاکـو خوێنـەرانی بەڕێـز باشـتر تێبگـەن، هـەر دەبـێ بـۆ چەنـد دەرسـێ دابـەش بکرێـن و، ناکـرێ هەمـووی یـەك بینـە، پێکـەوە بـاس بکـرێ، ئنجـا مـن سـووڕەتی (النور)یشـم دابـەش کـردوە بـۆ شـەش دەرس:

دەرسـی یەکـەم: ئایەتەکانـی: (١ - ١٠)، کـە باسـی نێوەڕۆکەکەیانمـان کـردو سـزای: زینـاکارانی پیـاوو ئافـرەت و بوختانکـەرانی داوێنپیسـیی و، بـاسی چۆنیـەتی لیعانکـردنی ژن و مێردیـان تێیـدا خراوەتـە ڕوو.

دەرسـی دووەم: ئایەتەکانـی: (١١ - ٢٦)، هەمـووی لـە بـارەی باسـی بوختـان بـۆ هەڵبەسـتنی دڵ نەخۆشـەکانەوەیە، بـۆ دایکـی بـڕواداران عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ).

دەرسـی سـێیەم: ئایەتەکانـی: (٢٧ - ٣٤)، کـە کۆمەڵـێ حوکمـی پەیوەسـت بـە هەڵـس و کەوتـی خێزانیـی و، کۆمەڵایەتیـی گرتوونـە خـۆی.

دەرسـی چـوارەم: ئایەتەکانـی: (٣٥ - ٤٦)، کـە بـە ئایەتـی: ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، دەسـت پێـدەکات و، پاشـان کۆمەڵێـك ڕاسـتیی دیکـەی مـەزن وەك: دیـاردەی گەردوونیـی، کـە نیشـانەو بەڵگـەی باڵادەسـتیی پەروەردگارێتیـی و، میهرەبانیـی و، کارزانیـی خـوای پـەروەردگارن، خراونـە ڕوو.

دەرسی پێنجەم: ئایەتەکانی: (٤٧ - ٥٧)، یان ئەو یازدە (١١) ئایەتەش باسی کەسانێکن لافی ئەوە لێدەدەن کە ئیماندارو مسوڵمانن و فەرمانبەرن بۆ پێغەمبەر ﷺ، کەچی کاتێ دادوەرییەك دێتە پێش، بە بەرنامەی پێغەمبەر ﷺو، دادوەرییەکەی ڕازیی نین، هەروەها ئەوە کە مسوڵمانانی ڕاستەقینە دەبێ هەڵوێستیان چۆن بێ؟ دیسان چەند شتێکی دیکەی پەیوەست بەو بابەتەوە، خراونە ڕوو.

دەرسی شەشەم: ئایەتەکانی: (٥٨ - ٦٤) دەگرێتە خۆی، ئەوانیش دیسان کۆمەڵێك بابەتی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی زۆر گەورەو گرنگ دەگرنە خۆیان.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی: (١ - ١٠) دە ئایەتی سەرەتای سووڕەتی (النور) دەگرێتە خۆی، لەو دە (١٠) ئایەتەدا، سەرەتا خوای زانا و توانا، ئەم سووڕەتی (النور) بەوە پێناسە دەکات کە دایبەزاندووەو، فەرزی کردووەو، ئایەتانێکی ڕۆشنی تێدا دابەزاندوون، بە مەبەستی بیرکەوتنەوەی خەڵك و، فێربوونیان و، بەرچاو ڕوونبوونەوەیان لە بارەی ئەو ڕاستییانەوە، کە خوا ﷻ لەم سووڕەتەدا ناردوونیە خوارو، لە زگماك و خواڕسکی ئەوانیشدا هەن و، سەرەنجام پەند وەرگرتنیان.

دوایی خوا ﷻ چوار حوکمی گەورەو، گرنگ و، هەستیاری بواری خێزانیی، لەم دە (١٠) ئایەتەدا خستوونە ڕوو:

١)- حوکمی ئافرەت و پیاوی زیناکار، کە سزایەکەیان یەکی (١٠٠) قەمچییە.

٢)- حوکمی هاوسەرگیریی کردن لەگەڵ ژنان و پیاوانی زیناکارو، هاوبەش دانەردا، کە قەدەغەیە.

٣)- حوکمی بوختانی داوێنپیسیی کردن بە ئافرەتانی پاك و بێگەرد، هەروەها پیاوانی پاك و بێ خەوش، بەبێ هێنانی چوار شایەد، وەك بەڵگە بۆ سەلماندنی ئەو دەعوایە، کە سزای ئەو بوختانی داوێن پیسییە بەبێ ئیسپات و بەڵگە، کە ئەگەر ئیسپات و بەڵگە هەبوو، ئەو کاتە پێی ناگوترێ: بوختان، سزایەکەی بریتیە لە: هەشتا (٨٠) قەمچیی، وێڕای بە لادەر (فاسق) دانرانی ئەو کەسەی ئەو تۆمەتە هەڵدەبەستێ.

٤)- حوکمی (لِعَان) یان (مُلاَعَنَة) یانی: (نەفرین لە یەکدی کردن، لە نێوان ژن و مێرددا)، لە کاتێکدا پیاوێ ژنەکەی بە زینا کردن تۆمەتبار دەکات، بێ ئەوەی بتوانێ بە هێنانی چوار شایەدان، کە شایەدیی دانەکەیان وەك یەك بێ، کت و مت و، بێ جیاوازیی، ئیسپاتی

بکات، کە سەرەنجام ئەگەر ژنەکە دانی بەو تۆمەتەدا هێنا، کە لە لایەن مێردەکەیەوە پێی دەکرێ و، ڕەفزی تۆمەتەکەی نەکرد، سزایەکەی دەکەوێتە سەر، کە سەد (١٠٠) قەمچییە، بەڵام ئەگەر دانی پێدا نەهێناو، ڕەفزی تۆمەتەکەی کرد، کە ئەویش دەبێ هەڵسێ بە وەڵامدانەوەی مێردەکەی، وەك مێردەکەی کە چوار جاران شایەتیی دەدات: کە ڕاست دەکات، لەو تۆمەتەدا کە بە ژنەکەی دەکات و جاری پێنجەمیش بڵێ: نەفرینی خوای لێ بێ ئەگەر درۆ بکات، ئەویش دەبێ چوار جاران شایەتیی بدا کە مێردەکەی ڕاست ناکات و، جاری پێنجەمیش بڵێ: تووڕەیی خوای لەسەر بێ، ئەگەر مێردەکەی ڕاست بکات، کە لە ئەنجامی ئەو یەکدی نەفرین کردنەدا، ئەو ژن و مێردە لێك جیادەبنەوەو، بۆ هەتا هەتایە لێك قەدەغە دەبن.

لە کۆتاییش دا خوا ﷻ باسی بەخشش و بەزەیی و لێبوردەیی خۆی بۆ بڕوادارن و، تەوبە وەرگرتن و کاربەجێیی خۆی دەکات، کە هۆکاری زوو سزا نەدران و پارێزرانی مسوڵمانانە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ سُورَةٌ أَنزَلْنَاهَا وَفَرَضْنَاهَا وَأَنزَلْنَا فِيهَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿١﴾ الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا
كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ
وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢﴾ الزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا
يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا
بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٤﴾ إِلَّا
الَّذِينَ تَابُوا مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاءُ
إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٦﴾ وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ

اللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدْرَؤُا عَنْهَا الْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ
الْكَاذِبِينَ ﴿٨﴾ وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِن كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٩﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ
عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە. (ئەمە) سوورەتێکە دامانبەزاندوەو، پێویستمان کردوە، (کە حوکمەکانی کاریان پێ بکرێ)و، ئایەتانیکی ڕۆشنمان تێدا ناردوونە خوار، بەڵکو بیرتان بکەوێتەوە (سەرەنجام فێربن و پەند وەربگرن) ﴿١﴾ ئافرەتی زیناکارو پیاوی زیناکار، هەر کامێکیان یەکی سەد قەمچییان لێبدەن و، لە جێبەجێکردنی ئایین(و فەرمانی) خوادا، پەرۆشییتان بەرانبەریان نەبێ، ئەگەر بڕواتان بە خواو ڕۆژی دوایی هەیەو، با کۆمەڵێ لە بڕوادارانیش سزاکەیان ببینن و ئامادەی بن ﴿٢﴾ پیاوی زیناکار تەنیا ژنی زیناکار، یان هاوبەش دانەر دێنێ و، ژنی زیناکاریش تەنیا پیاوی زیناکار، یان هاوبەش دانەر دەیهێنێ (و هاوسەرگیریی لەگەڵ دەکات)، ئەوەش لە بڕواداران قەدەغە کراوە ﴿٣﴾ ئەو کەسانەش کە ئافرەتانی پاك بە زینا تۆمەتبار دەکەن، (هەروەها پیاوانی پاکیش)، دواییش چوار شایەدان ناهێنن بۆ نیسپاتی دەعواکەیان، یەکی هەشتا قەمچییان لێ بدەن و، هەرگیزیش شایەدییان لێ وەرمەگرن و، ئا ئەوانە لادەرن ﴿٤﴾ بێجگە لەوانەی دوای ئەوە، تۆبە دەکەن و چاکسازیی دەکەن، بە دڵنیایی ئەو کاتە خوا لێبووردەی بە بەزەییە ﴿٥﴾ ئەو پیاوانەش کە ژنەکانیان بە زینا تۆمەتبار دەکەن و، جگە لە خۆیشیان شایەدیان نین، شایەدیی دانی یەکیان (بۆ نیسپاتی ڕاستیی دەعوایەکەی) ئەوەیە کە چوار جاران شایەدیی بدات بە ناوی خوا هێنانەوە، کە لە ڕاستانە ﴿٦﴾ جاری پێنجەمیش بڵێ: نەفرینی خوای لێ بێ

ئەگەر لە درۆزنان بێ ﴿٧﴾ (بەو جۆرە سزای زینا دەکەوێتە سەر ژنەکە، بەڵام) ئەویش بەوە سزای لێ لادەدرێ، کە چوار جاران شایەدیی بە خوا بدات، کە ئەو (مێردەی) لە درۆزنانە ﴿٨﴾ جاری پێنجەمیش بڵێ: تووڕەیی خوای لەسەر بێ، ئەگەر مێردەکەی لە ڕاستان بێ (لەو تۆمەتەدا کە بۆی دەکات) ﴿٩﴾ ئەگەر بەخشش و بەزەیی خواش لەسەرتان نەبووایەو، ئەوە کە خوا زۆر تۆبە وەرگرو کاربەجێیە، (ئەو گرفت و کێشانەتان بە ئاسانیی بۆ چارەسەر نەدەکران و، زۆرتان لێ ئاڵۆز دەبوون) ﴿١٠﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(سُوَرَةٌ): (السُّورَةُ: المَنْزِلَةُ الرَّفِيعَةُ، وسُورُ المَدِينَةِ: حَائِطُهَا المُشْتَمِلُ عَلَيْهَا، وَسُورَةُ القُرْآنِ تَشْبِيهًا بِهَا لِكَوْنِهِ مُحَاطاً بِهَا إحَاطَةَ السُّورِ بِالمَدِينَةِ)، (سُورَة) لە زمانی عەرەبییدا واتە: پێگەی بەرز، پلەو پایەی بەرز (سُورُ المَدِينَةِ)، (سُور)، ئەو شوورایەیە بە دەوری شاردا کراوە (کاتی خۆی دەوری شارەکەی داوە)و گرتوویەتە نێو خۆی، سوورەتی قورئان بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە، چونکە چوێنراوە بەو شوورایەی کە بە دەوری شاردا دەکرێ، وەك چۆن ئەو شوورایە شارەکە دەگرێتە نێو خۆی، ئەو سوورەتەش ئەو ئایەتانەی کە لە نێوی دان، دەیانگرێتە نێو خۆی.

(وَفَرَضْنَاهَا): خوێنراویشەتەوە: (فَرَّضْنَاهَا)، (الفَرْضُ: قَطْعُ الشَّيْءِ الصُّلْبِ، والتَّأْثِيرِ فِيهِ، وَالفَرْضُ كَالإِيجَابِ)، وشەی (فَرْض) بە مانای بڕینی شتێکی ڕەق و، کارتێکردنیەتی، (فَرْض)، وەك پێویست کردنە، واتە: (الفَرْضُ) و (الوُجُوبِ)، بە یەك واتا بەکاردێن و مانایان لێك نیزیکە.

(لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ): واتە: بەڵکو بیرتان بکەوێتەوە، (التَّذَكُّرُ: خُطُورُ مَا كَانَ مَنْسِياً فِي الذِّهْنِ، وَهُوَ هُنَا مَسْتَعَارٌ لاِكْتِسَابِ العِلْمِ مِنَ الأَدِلَّةِ اليَقِيْنِيَّةِ)، (تَذَكُّر)، بریتیە لەوە

کە شتێکت بێتەوە زەین، کە پێشتر لە زەیندا هەبووە، بەڵام تێیدا نەماوەو لە بیرت چۆتەوە، بەڵام لێرەدا (تَذَكُّر)، خوازراوەتەوە بۆ وەدەست هێنانی زانست لە بەڵگە دڵنیا کەرەکانیەوە، کە دەفەرموێ: (لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ)، واتە: بۆ ئەوەی فێر بین، یان بۆ ئەوەی پەند وەربگرن، ئەگەرنا یانی: بۆ ئەوەی بیرتان بکەوێتەوە.

(جَلْدَةٍ): (الجَلْدُ: الضَّرْبُ بِسيرٍ مِنْ جِلْدٍ، مُشْتَقٌّ مِنَ الجِلْدِ لأَنَّهُ ضَرْبُ الجِلْدِ)، (جَلْد) بریتیە لە لێدان بە چەرمێك کە لە پێست دروستکراوە، یانی: شتێ کە لە زوێڵە[1] چەرم دروست دەکرێ و دەهۆنرێ، لە (جِلْد)ەوە هاتوە، لەبەر ئەوەی ئەو لێدانە لە پێست دەدرێ.

بەڵام دوایی باسی دەکەین کە مەرجیش نیە تەنها لە زوێڵە چەرم بێ، بەڵکو دەگونجێ لە شولکە دار بێ.

(رَأْفَةٌ): ﴿وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ﴾، واتە: با لە جێبەجێ کردنی دینی خوادا، پەرۆشییتان بەرانبەر بەوانە نەبێ کە داوێنپیسییان کردوە، (الرَّأْفَةُ: رَحْمَةٌ خَاصَّةٌ تَنْشَأُ عِنْدَ مُشَاهَدَةِ ضُرٍّ بِالمَرْؤُوفِ)، (رَأْفَة) بریتیە لە بەزەییەکی تایبەت، لە کاتێکدا مرۆڤ ئەو کەسەی پەرۆشیی بەرانبەر دەردەبڕدرێ، دەبینێ، ئەو حاڵەتەی بۆ پەیدا دەبێ.

(طَآئِفَةٌ): (الطَّائِفَةُ: الجَمَاعَةُ مِنَ النَّاسِ، وَمُخْتَلِفٌ عَدَدُهَا بِاخْتِلافِ الأَغْرَاضِ)، (طَائِفَة) بریتیە لە کۆمەڵێك لە خەڵك، کە ژمارەکەی جیاوازە، بە پێی جیاوازیی ژینگەکان و، نەرێت و باوەکانی خەڵك.

(الْمُحْصَنَاتِ): یانی: ئافرەتە پاکەکان، کە خوێنراویشەتەوە: (المُحْصِنَات)، واتە: ئافرەتە خۆ پاکڕاگرەکان (المُحْصَنُ: إِسْمُ مَفْعُولٍ مِنْ أَحْصَنَ الشَّيْءَ، إِذَا مَنَعَهُ مِنَ الإِضَاعَةِ وَاسْتِيلاَءِ الغَيْرِ عَلَيْهِ)، (مُحْصَنٌ)، بەرکار (مَفْعُول)ە، لە: (أَحْصَنَ الشَّيْء)، ئەو شتەی پاراست لە زایە بوون و، لەوە کە یەکێکی دیکە دەستی بەسەردا بگرێ و

---

(١) زوێڵ: پارچە چەرمی باریك لە شێوەی دەزووی درشت دا.

دەستی بۆ بەرێ، کەواتە: (مُحْصَنَات)، یانی: پارێزراوان، ئەگەر بشخوێنرێتەوە: (المُحْصِنَات)، ئەو کاتە (مُحصِنْ) ناوی بکەر (إسْمُ فَاعِلْ)ە، یانی: خۆپارێزەران لە ئافرەتان، ئەگەر پیاویش بن، دەگوترێ: (مُحْصَنُونْ)، یان (مُحْصَنِينْ)، یان (مُحصِنون)و (مُحْصِنِينْ)، بە (مَفْعُول) یان (إسْمُ الفَاعِل).

(يَرْمُونَ): وتە: دەیهاوێن، (الرَّمِيُ: حَقِيْقَتُهُ: قَذْفُ الشَّيءِ مِنَ اليَدِ، وَشَاعَ اسْتِعْمَالُهُ فِي نِسْبَةِ فِعْلٍ أو وَصْفٍ إلى شَخْصٍ)، (رَمِي) بریتیە لەوە کە شتێکت بە دەستەوە بێ و هەڵیدەی، بیهاوێی، بەڵام بەکارهێنانی بڵاوبۆتەوە بۆ پاڵدانی کردارێك، یاخود وەصفێك بۆ لای شەخصێك، (رَمَاهُ بِهِ)، واتە: تۆمەتباری کرد، کە وشەی (رَمِي) لێرە بەکارهێنراوە بۆ (قَذْف)، واتە: بوختانی داوێن پیسی.

(وَيَدْرَؤُاْ): (الدَّرْأُ: الدَّفْعُ بِقُوَّةٍ، وَاسْتُعِيرَ هُنَا للإبْطَال)، (دَرْأ) بریتیە لە پاڵپێوەنان بەهێز، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ هەڵوەشاندنەوە، واتە: ئەو ئافرەتە ئەو تۆمەتە هەڵدەوەشێنێتەوە، ئەگەر بەو شێوەیە شایەدیی بدات.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـەی کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ ﴾، لـەو بـارەوە دوو گێـڕدراوە هـەن:

١)- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، كَانَتْ امْرَأَةٌ يُقَالُ لَهَا: أُمُّ مَهْزُولٍ، وَكَانَتْ بِأَجْيَادٍ، وَكَانَتْ تُسَافِحُ، فَأَرَادَ رَجُلٌ مِنَ أَصْحَابِ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَتَزَوَّجَهَا، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ: ﴿ ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ ﴾}[1].

واتـە: ئافرەتێـك هەبـوو پێـی دەگوتـرا: (أُمُّ مَهْـزُولٍ) لـە ئەجیاد: «نـاوی شـوێنێكە»، ئـەو ئافرەتـە بـە پـارە داوێـن پیسـیی لەگـەڵ خەڵكـدا دەكـرد (لەشفرۆشـیی دەكـرد)، پیاوێـك لـە هاوەڵانـی پێغەمبـەر ﷺ ویسـتی هاوسـەرگیریی لەگـەڵ بـكات، خـوا ﷻ ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد، كـە دەفەرمـوێ: ئافرەتـی زینـاكار مەگـەر پیـاوی زینـاكار، یـان هاوبـەش بـۆ خوادانـەر، دەنـا نایهێنـێ، (یاخـود هاوسـەرگیریی لەگـەڵ نـاكات)و، ئـەوە لـە بـڕواداران قەدەغەیـە.

٢)- {عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ مَرْثَدَ بْنَ أَبِي مَرْثَدٍ الْغَنَوِيَّ، وَكَانَ رَجُلًا شَدِيدًا، وَكَانَ يَحْمِلُ الْأُسَارَى مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَةِ، قَالَ: فَدَعَوْتُ رَجُلًا لِأَحْمِلَهُ وَكَانَ بِمَكَّةَ بَغِيٌّ، يُقَالُ لَهَا: عَنَاقُ وَكَانَتْ صَدِيقَتَهُ، خَرَجَتْ، فَرَأَتْ سَوَادِي فِي ظِلِّ الْحَائِطِ ، فَقَالَتْ: مَنْ هَذَا! مَرْثَدٌ مَرْحَبًا وَأَهْلًا يَا مَرْثَدُ! انْطَلِقْ اللَّيْلَةَ، فَبِتْ عِنْدَنَا فِي الرَّحْلِ، فَقُلْتُ: يَا عَنَاقُ! إِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى

---

(١) أخرَجَهُ أحْمَد: ٦٤٨٠، والطبري في جامع البيان: ج١٨، ص٥٦، والنسائي في الكبرى: ١١٣٥٩، والطحاوي في «مشكل الآثار»: ٤٥٥١، والطبراني في «الأوسط»: ١٧٩٨، قال مؤلفا الإستيعاب: قُلْنَا: وهذا إسناد ضعيف، ج٢ ص: ٥٤١.

اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ حَرَّمَ الزِّنَا، قَالَتْ: يَا أَهْلَ الْخِيَامِ! هَذَا الدُّلْدُلُ، هَذَا الَّذِي يَحْمِلُ أُسَرَاءَكُمْ مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَةِ، فَسَلَكْتُ الْخَنْدَمَةَ، فَطَلَبَنِي ثَمَانِيَةٌ، فَجَاءُوا حَتَّى قَامُوا عَلَى رَأْسِي، فَبَالُوا، فَطَارَ بَوْلُهُمْ عَلَيَّ وَأَعْمَاهُمُ اللهُ عَنِّي، فَجِئْتُ إِلَى صَاحِبِي، فَحَمَلْتُهُ، فَلَمَّا انْتَهَيْتُ بِهِ إِلَى الْأَرَاكِ فَكَكْتُ عَنْهُ كَبْلَهُ، فَجِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ! أَنْكِحُ عَنَاقَ؟ فَسَكَتَ عَنِّي، فَنَزَلَتْ: ﴿ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۝٣﴾، فَدَعَانِي فَقَرَأَهَا عَلَيَّ، وَقَالَ: لاَ تَنْكِحْهَا)[1].

واتـە: لـە عەمـرِی کـوڕی شـوعەیب ئەویـش لـە بابـی ئەویـش لـە باپیریـەوە گێڕاویەتـەوە کـە مەرثـەدی کـوڕی ئەبـوو مەرثـەدی غەنەویـی، کـە پیاوێکـی زۆر خێراو بـە هێـز بـووە، (زۆر خێـرا ڕۆیشـتوە)، دیلەکانـی لـە شـاری مەککـەوە دەبـردن بـۆ شـاری مەدینـە، (واتـە: ئەوانـەی کـە کافـرەکان دەستبەسـەریان کردبـوون، دەرفەتـی دەهێنـاو دەیگواسـتنەوە)، دەڵـێ: بەڵێنمـدا بـە پیاوێـك لـە دیلەکانـی مەککـە، کـە هەڵیگـرم لەگـەڵ خۆمـی بـەرم بـۆ مەدینـە، لە شـاری مەککـەش ئافرەتێکی لەشـفرۆش هەبـوو پێـی دەگوتـرا: عەنـاق، کـە لـە سـەردەمی نەفامیـی دا دۆسـتی بـووە، (کـە ئەو دەچێ ئـەو پیـاوە ببینـێ)، ئـەو ئافرەتـەش لـە سێبەری دیـوار ڕەشـاییەك (تارمایيەك) دەبینـێ، دەڵـێ: ئـەوە کێیـە؟ دوایـی دەیناسـێ، دەڵـێ: مەرثـەد تۆی! سـڵاوت لـێ بێ، تـۆ ئەهلـی، وەرە بـا ئەمشـەو پێکـەوە لـە ماڵـێ بیـن، (زینـای لەگـەڵ بـکات)، منیـش گوتـم: ئـەی عەنـاق! پێغەمبـەری خـوا ﷺ زینـای قەدەغـە کـردوە، ئەویـش گوتـی: ئـەی خەڵکـی (ئـەو ماڵانـە) ئـەو چادرانـە (کـە لەوێـن)، ئـەوە دوڵ دوڵـە (یـانی: وڵاخـی زۆر خێـرا)، ئـەوە ئـەو پیـاوە خێرایەیـە کـە دیلەکانتـان لـە مەککـەوە دەبـا بـۆ مەدینـە، (وەرن بیگـرن)، منیـش چوومـە خندرکێکـەوە، هەشـت پیاویـان شـوێنم کەوتـن، (ئـەو لـە نێـو خندرکەکـەدا بـووە، شـوێنێك کـە نـاو دڕیویەتـی، یـان شـوێنێ کـە چاڵاییـەك بـووە)، هاتـن تاکـو لەسـەر سـەرم وەسـتان، (ماوەیـەك لـەوێ گـەڕاون و

---

(١) أَخْرَجَـهُ أَبُـو دَاوُدَ: ٢٠٥١، وَالتِّرمِـذِيُّ: ٣١٧٧، وَالنَّسَـائِيُّ فِي الْكُبْرَى: ٥٣٢٨، وَغَيْرُهُـم، وَهَـذَا إِسْنَادٌ حَسَـنٌ، قـال مؤلفـا الإسـتيعاب: قُلْنـا: وهـذا إسـناد حسـن، ج٢ ص: ٥٤٢.

وەستاون) میزیان کرد، میزەکەیان فڕیە سەر سەرم، بەڵام خوا لە ئاست من کوێری کردن و نەیانبینیم، ئیدی دوایی کە ڕۆیشتن، هاتم بۆ لای هاوەڵەکەم، کە بەڵێنم لەگەڵیدا بوو، هەڵمگرت و پیاوێکی قورسیش بوو، (دیارە بە کۆڵێ هەڵگرتوەو وەك دوایی باسی دەکات، دەست و پێیان بەستوون بە زنجیر، یان بە پەت) کاتێ کە بردم بۆ لای ئەراك، (دیارە ئەراك: «هەندێك درەخت بوون، لە شوێنێك)، کۆت و پێوەندەکەم لێکردەوەو، بردم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! عەناق بێنم، هاوسەرگیریی لەگەڵدا بکەم؟ پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بوو، هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿ وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ﴾، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردم و ئایەتەکەی بەسەردا خوێندمەوەو فەرمووی: هاوسەرگیریی لەگەڵ دا مەکە.

٢)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو دوو ئایەتەی خوا تێیان دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ۝٤ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ۝٥ ﴾، لە بارەی هۆی هاتنە خواری ئەم دوو ئایەتە موبارەکەوە، کۆمەڵێ گێڕدراوە هەن، من هەوڵدەدەم کامەیان لە ڕووی سەنەدەوە بەهێزتر بێ و، لە ڕووی نێوەڕۆکەوە گونجاوتر بێ، لەگەڵ ئەم دوو ئایەتەدا، ئەوە بێنم:

{عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: لَمَّا كَانَ زَمَنُ العَهْدِ الَّذِي كَانَ بَيْنَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَبَيْنَ أَهْلِ مَكَّةَ، جَعَلَتِ المَرْأَةُ تَخْرُجُ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، مُهَاجِرَةً فِي طَلَبِ الإِسْلَامِ، فَقَالَ المُشْرِكُونَ: إِنَّمَا انْطَلَقَتْ فِي طَلَبِ الرِّجَالِ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ... ﴾[1].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لە کاتێکدا کە ئەو پەیمانەی لە نێوان پێغەمبەر ﷺو خەڵکی مەککە دابوو (کە مەبەست پێی صولحی

---

(١) ذَكَرَهُ السُّيُوطِيُّ فِي «الدّر المَنْثُور» ج٦، ص١٣٣، وَنَسَبَهُ لابْنِ مَرْدَوَيْه، الإِستيعاب، ج٢ ص ٥٤٦.

حودەیبییەیە، کە لە ساڵی شەشەمی کۆچیی دا بووە، بەو پێیەش بێ، ئەم سوورەتە، لە ساڵی شەشەمی کۆچیی و بەرەو دوا دابەزیوە)، ئافرەتی وا هەبوو لە لای خەڵکی مەککە دەردەچوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دەکرد، بۆ شوێنکەوتنی ئیسلام، هاوبەش بۆ خوادانەرەکان تۆمەتباریان دەکرد، دەیانگوت: ئەوە دوای پیاوان کەوتوە، (وەك لە مەککە پیاوی لێ نەبووبن!)، خواش ئەم دوو ئایەتە موبارەکەی ناردنە خوارێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ.. ﴾ النور (٥،٤).

٣)- هۆی هاتنە خواری ئایەتەکانی: (٦ و ٧ و ٨ و ٩ و ١٠)، واتە: ئەو پێنج ئایەتە کە باسی (لِعَان)، یان (مُلَاعَنَة) دەکەن، واتە: نەفرین لە یەکدیی کردنی ژن و مێردان: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلۡخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ أَن تَشۡهَدَ أَرۡبَعَ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلۡخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ ﴾.

لەو بارەوە چەند ڕیوایەتێك هەن، یەکێکیان ئەمەیە:

أ- [عَنِ عَبْدِاللهِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ هِلاَلَ بْنَ أُمَيَّةَ قَذَفَ امْرَأَتَهُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ بِشَرِيْكِ ابْنِ سَحْمَاءَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: الْبَيِّنَةُ أَوْ حَدٌّ فِي ظَهْرِكَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِذَا رَأَى أَحَدُنَا عَلَى امْرَأَتِهِ رَجُلاً، يَنْطَلِقُ يَلْتَمِسُ الْبَيِّنَةَ؟ فَجَعَلَ النَّبِيُّ يَقُولُ: الْبَيِّنَةَ وَإِلاَّ حَدٌّ فِي ظَهْرِكَ، قَالَ هِلَالُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ إِنِّي لَصَادِقٌ، فَلَيُنْزِلَنَّ اللهُ مَا يُبْرِيءُ ظَهْرِي مِنَ الْحَدِّ، فَنَزَلَ جِبْرِيلُ، وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ ﴾، فَقَرَأَ حَتَّى بَلَغَ: ﴿ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾، فَانْصَرَفَ النَّبِيُّ ﷺ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا، فَجَاءَ هِلَالٌ فَشَهِدَ وَالنَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ اللهَ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ، فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ، ثُمَّ قَامَتْ فَشَهِدَتْ، فَلَمَّا كَانَ عِنْدَ الْخَامِسَةِ، وَقَفُوهَا، وَقَالُوا: إِنَّهَا مُوجِبَةٌ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَتَلَكَّأَتْ، وَنَكَصَتْ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهَا تَرْجِعُ، ثُمَّ قَالَتْ: لاَ أَفْضَحُ قَوْمِي سَائِرَ الْيَوْمِ، فَمَضَتْ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَبْصِرُوهَا فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَكْحَلَ الْعَيْنَيْنِ، سَابِغَ الْأَلْيَتَيْنِ، خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ،

**فَهُوَ لِشَرِيْكِ بْنِ سَحْمَاءَ « فَجَاءَت بِهِ كَذَلِك، فَقَالَ النَّبِي ﷺ: لَوْ لاَ مَا مَضَى مِنْ كِتَابِ الله، لَكَانَ لِي وَلَهَا شَأْنٌ]**[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: هیلالی کوڕی ئومەییە لە لای پێغەمبەر ﷺ ژنەکەی خۆی تۆمەتبار کرد، کە لەگەڵ شورەیکی کوڕی سەحماندا زینای کردوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: یان بەڵگە، یان ئەوەتا (سزات دەدەین) لە پشتت دەدەین (واتە: هەشتا قەمچییت لە پشتێ دەدەین)، هیلال گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئایا یەکێك لە ئێمە ئەگەر پیاوێکی لەسەر ژنەکەی خۆی بینی، دەچێ بەڵگە بێنێ، (چوار پیاوان بێنێ، تەماشای بکەن؟) بۆ ئەوەی شایەدیی بۆ بدەن؟ پێغەمبەر ﷺ هەر دەیفەرموو: یان بەڵگە، ئەگەرنا سزات بەسەردا دەچەسپێنین، هیلال گوتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بە هەق ناردوە، من ڕاستگۆم، بە دڵنیایی خواش ئایەتان دادەبەزێنێ، کە پشتی من لەو سزایە دوور بخاتەوە، (سەرنج بدەن! چەند متمانەیان بووە بە دادگەریی و میهرەبانیی خوای خۆیان!)، جبریل دابەزی و ئەم ئایەتانە دابەزێنرانە سەر پێغەمبەر ﷺ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ ﴾، خوێندیەوە تاکو دەگاتە ئەو شوێنەی: ﴿ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾، ئنجا پێغەمبەر ﷺ ڕۆیی و، بە دوای ئافرەتەکەیدا نارد، (بۆ ئەوەی پێکەوە (مُلاعَنَة) بکەن)، هیلال هات شایەدییدا (واتە: چوار جاران)، گوتی: شایەدیی دەدەم بە خوا کە من لە ڕاستگۆیانم، (ئەو ژنەم لەگەڵ ئەو کابرایەدا زینای کردووەو، جاری پێنجەمیش گوتی: نەفرینی خوای لێ بێ ئەگەر درۆ بکات)، پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: خوا دەزانێ کە یەکێکتان درۆزنن (درۆ دەکەن)، کامەتان دەگەڕێتەوەو پەشیمان دەبێتەوە؟ ئنجا دوای ئەوەی هیلال شایەدییەکانی خۆی دا، ئنجا ئافرەتەکەش هەڵسا، ئەویش شایەدییەکانی دا (واتە: ئەویش چوار جاران گوتی: شایەدیی دەدەم بە خوا، کە ئەو مێردەی من درۆ دەکات، کە دەڵێ: تۆ زینات کردوە لەگەڵ فلان

---

(١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٤٧٤٧، وغيره.

کەسدا)، کە گەیشتە جاری پێنجەم، رایانگرت، گوتیان: ڕاوەستە!، پێیان گوت: ئەو شایەدییدانە ئەگەر بە درۆ بێ، پێویستکەرە، (واتە: سزای خواو دۆزەخت بۆ پێویست دەکات)، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: کە وایانگوت، ئافرەتەکە ڕاوەستا، تۆزێ وەخراو کشایەوە، هەتا پێمان وابوو کە پەشێمان دەبێتەوە (و دەڵێ: مێردەکەی ڕاست دەکات و، مل دەدا بۆ سزایەکەی)، دوایی گوتی: ناچم بە درێژایی ڕۆژگار خەڵکەکەی خۆم، خزمەکانم سەرشۆڕ بکەم، (مەرج نیە لەبەر خۆیەوە ئەوەی گوتبێ، چونکە ئەگەر لەبەر خۆیەوە گوتبی، ئەوە دان پێدانانە، بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس وایزانیوە لە دڵی خۆیدا وایگوتوە)، ئیدی ئەویش شایەدیی پێنجەمیشی دا، (شایەدیی پێنجەم ئەوەیە کە بڵێ: تووڕەیی خوا لەسەر من، ئەگەر ئەو مێردە ڕاست بکات)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چاوەڕێ بن، ئەگەر ئەو منداڵەی ئەو ئافرەتە دەیبێ، چاوی ڕەش بوون و، سمت و ڕانی ڕێك بوون و، لاقەکانی گۆشتن بوون، ئەوە ڕاستە ئەو منداڵە لە شورەیکی کوڕی سەحمائە، (بەڵام ئەگەر جۆرێکی دیکەش بوو، ئەوە تۆمەتەکە ڕاست نیە)، سەرەنجام منداڵەکە بەو وەسفە دەرچوو کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووبووی: (ئەگەر وابێ هی شورەیکی کوڕی سەحمائە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە حوکمی کتێبی خوا ڕابردوە، من لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا بڕیارێکی دیکەم دەبوو، (بەڵام هەموومان پابەندین بە حوکمی خواوە).

ب- هەر لە بارەی هەمان بابەتەوە، بەسەرهاتێکی دیکەش هەیە، کە بریتیە لە بەسەرهاتی لیعانی:

(عُمَیر بن عجلان) لەگەڵ ژنەکەی دا، ئەویش بوخاریی بە ژمارە (٥٣٠٨)و، موسلیم بە ژمارە (٤٩٢) هێناویانە، کە هەر شێوەی ئەوەیە کە باسمان کرد، بۆیە بە پێویستم نەزانی ئەویش دووبارە بێنم.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەك لە پێناسەی ئەم سوورەتە موبارەکەدا گوتمان: ئەم سوورەتە تاکە سوورەتێکە خوا ﷻ ناوی سوورەتی لە سەرەتایەکەیەوە هێنابێ، بۆیە ئەمە بەڵگەو نیشانەی ئەوەیە کە ئەم سوورەتە گرنگییەکی تایبەتیی هەیەو، ئەمە تایبەتمەندیی ئەم سوورەتە موبارەکەیە، کە لە نێو هەموو سوورەتەکانی قورئان دا، خوای پەروەردگار ئەم سوورەتەی بە وشەی (سورة) دەست پێکردوە، لە حاڵێك دا، هەر سەدو چوارده (١١٤) سوورەتەکە، هەر سوورەتن، کەواتە ئەم سوورەتە تایبەتمەندییەکی خۆی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە: لە قەدەر قەبارەی خۆی، زۆرترین یاسای شەرعیی گرتوونە خۆی و، یاسا شەرعییەکانیش زۆر هەستیارن، زۆر گرنگن، زۆریش گشتگیرن بۆ هەموو بوارو ڕەهەندەکانی ژیان و گوزەران: ڕەوشتیی، ئاکاریی، خێزانیی، کۆمەڵایەتیی، سیاسیی و، هەموو هەڵس و کەوتە جۆراو جۆرەکانی ژیانی کۆمەڵگا.

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: (بسم الله الرحمن الرحيم)، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

١)- ئەم کارە بە ناوی خوا دەست پێدەکەم.

٢)- ئەم کارە بۆ خوا دەکەم.

٣)- ئەم کارە بە پێی شەرعیی خوا ئەنجام دەدەم.

٤)- ئەم کارەم بە یارمەتییدان و ئاسانکاریی خوا دەکەم، نەك بە شان و شەوکەتی خۆم.

دوای ئەوە دەفەرموێ: ﴿ سُورَةٌ أَنزَلْنَٰهَا وَفَرَضْنَٰهَا ﴾، سوورەتێکە دامانبەزاندوەو پێویستمان کردوە، زانایان دەڵێن: ئاگونجێ نەناسراو (نَكِـرَة) بکرێتە نیهاد (مُبْتَـدَأ)، (سورة) لێرەدا (نكِرَة)یە، بەڵام هەندێکیان گوتوویانە: دروستەو (سورة)

نیهاد (مُبْتَدَأ)یە، ﴿ أَنزَلْنَٰهَا وَفَرَضْنَٰهَا ﴾، دەبێتە گوزارە (خَبَر)ی، بەڵام ڕای ڕاستتر ئەوەیە کە (سُورَة) گوزارە (خَبَر)ەو، نیهاد (مُبْتَدَأ)ەکەی قرتێنراوە، یانی: (هَٰذِهِ سُورَة) ئەمە سوورەتێکە، ﴿ أَنزَلْنَٰهَا وَفَرَضْنَٰهَا ﴾، دامانبەزاندوەو، پێویستمان کردوە.

هەروەك خوێنراویشەتەوە: (فَرَّضْنَاهَا)، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر دەچینە نێو وردکاریی شیکردنەوەی ئایەتە موبارەکەکان. ﴿ وَأَنزَلْنَا فِيهَآ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾، چەند ئایەتێکی ڕۆشن و ڕوونمان تێدا دابەزاندوون، بۆ ئەوەی بیرتان بکەوێتەوەو، لە ئەنجامی بیرکردنەوەدا، فێربن، پەند وەربگرن و، سەرەنجام پابەند بن.

ئەم چوار ئایەتە موبارەکە، باسی چوار حوکمی گەورەو گرنگی شەریعەت دەکەن، دێتە سەر باسی حوکمی یەکەم و دەفەرموێ:

﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ﴾، ئافرەتی زیناکارو پیاوی زیناکار، هەر کامێکیان یەکی سەد (١٠٠) قەمچییان لێبدەن، (ئەوە سزاکەیانە)، ﴿ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِى دِينِ ٱللَّهِ ﴾، لە جێبەجێ کردنی دینی خواشدا، لە ئەنجامدانی حوکمی شەریعەتی خوادا، ئێوە پەرۆشییتان بەرانبەریان نەبێ، پەرۆشیی نەتانگرێ، کە ئەو سزایە جێ بەجێ نەکەن، ﴿ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ﴾، ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، لێرەدا مەبەست ئەوە نیە: با پەرۆشیی و بەزەییتان لە دڵدا نەبێ، پەرۆشیی و بەزەییان لە دڵدا هەیەو، سیفەتێکی بنەڕەتیی مسوڵمانانە، یانی: با سۆزو بەزەیی نەتانگرێ، دەستتان بگرێ و نەهێڵێ ئەو سزایەی خوا، ئەو حوکمەی خوا جێبەجێ بکەن، ئەگەرنا سزایەکە جێبەجێ بکەن و، با دڵیشتان پێیان بسووتێ، پەرۆشبوون قەدەغە نەکراوە، بەڵکو ئەوە قەدەغەکراوە کە بەزەیی و پەرۆشەکە دەستتان بگرێ، سۆزو بەزەییەکە دەستتان بگرێ و ڕێ نەدات سزایەکە جێ بەجێ بکەن، ﴿ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، با سزاکەشیان کۆمەڵێك لە بڕواداران ببینن، ئامادەی

بن، ئایا ئەوانە چەند کەس بن؟ دوو بن، سێ بن، دە بن، چل بن؟ زانایان لەو بارەوە ڕاجیاییان هەیە، ئەوەش دەکەوێتەوە سەر جیاوازیی ژینگەکان و، جیاوازیی عادەت و نەرێت و، باوەکانی کۆمەڵگاکان، هەروەها کەسەکانیش، کە ئەو گوناهو تاوانەیان لە دەست قەوماوە، دیسان جۆرو چۆنیەتیی کەسەکانیش، ئەویش جیاوازە.

ئنجا دێتە سەر باسی حوکمی دووەم، لەو چوار حوکمەی لەم دە (١٠) ئایەتە موبارەکەدا خراونە ڕوو، خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، پیاوی زیناکار تەنیا ئافرەتی زیناکار، یاخود هاوبەش بۆ خوا دانەر، دێنێ (مارەی دەکات)، ئافرەتی زیناکاریش تەنیا پیاوی زیناکار، یاخود هاوبەش بۆ خوا دانەر، دەیهێنێ (مارەی دەکات)، ﴿ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، تا ئەوە لەسەر بڕواداران قەدەغە کراوە، ئەوە وردەکاریی و مشت و مڕیی زۆری تێدا هەیە، کە ئایا مەبەست ئەوەیە: کە پیاوێك زیناکار بێ، ئافرەتی پاکی پێ ناشێ و، ناگونجێ هاوسەرگیریی لەگەڵدا بکات؟ هەروەها ئافرەتێ زیناکار بێ، ئایا ناگونجێ پیاوێکی پاك مارەی بکات؟ لەو بارەوە ڕاجیایی زانایان هەیە، لە مەسەلە گرنگەکان دا تیشکی دەخەینە سەر، یاخود: ئایا وشەی (نِکَاح)، لێرەدا مەبەست پێی هاوسەرگیریی کردن و گرێبەستی هاوسەرگیرییە، یاخود وشەی (نِکَاح)، مەبەست پێی جووتبوون (وَطْأ)ە؟ ئێرە حەوصەڵەی ئەوەی نیەو، مەسەلە گرنگەکانمان زیاتر بۆ ئەو وردەکارییانە داناون.

ئنجا دێتە سەر باسی حوکمی سێیەم، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ﴾، ئەوانەش کە ئافرەتانی پاك تۆمەتبار دەکەن بە زیناکردن، (ٱلْمُحْصَنَٰتِ)، یانی: ئافرەتانی پاك لە داوێن پیسیی، خوێنراویشەتەوە: (الْمُحْصِنَات)، یانی: ئەو ئافرەتانەی خۆیان پاکراگرتوە، یانی: کەسانێك کە ئافرەتانی پاك، یان خۆ پاکراگر، تۆمەتبار دەکەن بە داوێن پیسیی، (يَرْمُونَ)، یانی: (يَقْذِفُون)، تۆمەتباریان

دەکەن بە داوێن پیسی، کە ئەگەر پیاوانی پاکیش تۆمەتبار بکەن، هەر هەمان حوکمی هەیە، ﴿ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً ﴾، دوایی چوار شایەدیان نەهێنان، ﴿ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً ﴾، هەشتا قەمچییان لێبدەن، واتە: هەر کامێکیان هەشتا قەمچییان لێبدەن، هەشتا داری لێبدەن، ﴿ وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ﴾، هەرگیز شایەدییشیان لێ وەرمەگرن، ﴿ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾، ئا ئەوانەش لاڕێ و لادەرن.

﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ ﴾، جگە لەوانەی دوای ئەوە دەگەڕێنەوەو، چاکسازیی دەکەن، یانی: دەگەڕێنەوە بۆ لای خواو چاکسازییش دەکەن، ئەگەر تاکو ئێستا زمانیان بە خراپە بەرانبەر بە خەڵك گەڕاوەو بوختانیان کردوە، لەمەودوا خۆیان چاك دەکەن، زمانی خۆیان کۆنترۆڵ دەکەن، ئنجا کەسانێك وا بن: ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بە بەزەییە، گوناهەکەیان لەسەر لادەچێ، گوناهی بوختان کردنەکە، چونکە سزادراون، یاخود مەبەست ئەوەیە: وێڕای ئەوەی گوناهەکەیان لەسەر لاچووە، کە گوناهەکە هەر بە سزایەکە لادەچێ، چونکە ئەو سزایە، دانراوە بۆ پاککردنەوەی ئەو کەسانە، لە پیسیی ئەو گوناهو تاوانەی کردوویانە، وێڕای ئەوە خوا لەگەڵیشیان لێبوردەی میهرەبانە، ئنجا ئایا مەبەست چییە کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾؟

زۆربەی زانایان گوتوویانە: مەبەست ئەوەیە کە دوایی شەیەدیان لێ وەردەگیرێ و، بە فاسقیش لە قەڵەم نادرێن، پێشتر بۆیە شایەدیان لێ وەرنەگیراوە، چونکە درۆو بوختانیان کردوە، بەڵام کە خۆیان چاککردو، گەڕانەوە بۆ لای خواو، وازیان لە درۆو بوختان هێنا، مانای وایە دەچنەوە حاڵەتی ئاسایی و شایەدییان لێ وەردەگیرێ، هەروەها پێشتر بۆیە بە لادەرو لاڕێ (فاسق) لە قەڵەم دەدران، چونکە لایان دابوو، ئێستا کە دێنەوە سەر ڕاستە ڕێی شەریعەت، مانای وایە ناوی لاڕێ و لادەریشیان لەسەر لادەچێ.

ئنجا دێتە سەر حوکمی چوارەم و کۆتایی، کە لەم دە (١٠) ئایەتە موبارەکەدا هاتوون، کە پێنج ئایەتی کۆتایی ئەم دەرسەمانی بۆ تەرخان کراون، ئایەتەکانی: (٦ - ١٠)، دەفەرموێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ۝٦ وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾.

واتە: ئەو پیاوانەی کە بوختان بۆ ژنەکانیان دەکەن، یاخود ژنەکانیان تۆمەتبار دەکەن، بەوە کە داوێن پیسییان کردوەو، جگە لە خۆشیان، هیچ شایەدیی دیکەیان نیە، ئەوە شایەدییدانی یەکێکیان، یاخود: بەڵگە هێنانەوەی یەکێکیان، ئەوەیە کە چوار جاران شایەدیی بە خوا بدات بڵێ: (أَشْهَدُ باللە)، واتە: خوا بە شایەد دەگرم، خوا ئاگادارە کە ئەو لە ڕستگۆیانە، لەو قسەیەدا کە کردوویەتی، لەو تۆمەتەدا کە بۆ هاوسەرەکەی کردوویەتی، چوار جاران وا بڵێ، جاری پێنجەمیش بڵێ: نەفرینی خوای لەسەر بێ، ئەگەر لە درۆکاران بێ، هەر کات وایگوت، ئەو کاتە تۆپ دەکەوێتە نێو ساحەی ئافرەتەکەو، ئافرەتەکە تۆمەتەکەی دەکەوێتە سەر، بەڵام ئایا یەکسەر سزا دەدرێ؟ نەخێر، بەڵکو هەر کات ئافرەتەکە وەڵامی نەدایەوەو گوتی: ڕاست دەکات، ئەوە سزایەکەی دەکەوێتە سەر، کە سەد (١٠٠) قەمچییەکەیە، بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە ئەو تۆمەتەی ڕەتکردەوە، حوکمەکە دەگۆڕێ، ئەویش دەبێ بەو شێوەیە ڕەتی بکاتەوە:

﴿ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ ﴾، ئازارو سزا (کە لێدانی سەد (١٠٠) قەمچییەکەیە) لەو ئافرەتە لادەدرێ، بە چی؟ ﴿ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ﴾، کە چوار جاران شایەدیی بە خوا بدات، واتە: چوار جاران بڵێ: (أَشْهَدُ باللە)، ﴿ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەو مێردەی لە درۆکارانە، واتە: خوا بە شایەد دەگرم کە ئەو لە درۆکارانە، لەو قسەو تۆمەتەدا کە پاڵی دەداتە لای وی، ﴿ وَٱلْخَٰمِسَةَ ﴾، جاری پێنجەمیش شایەدیی بدات، ﴿ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾، کە تووڕەیی خوا لەسەر وی بێ، ئەگەر ئەو پیاوە لە ڕاستان بێ.

ئیدی کە وایگوت، ئەو ئافرەتەش سزاو ئازارەکە، کە بە هۆی تۆمەتبارکردنی پیاوەکەیەوە دەکەوتە سەری، کە سەد (١٠٠) قەمچییە، لەسەری لادەچێ.

هەڵبەتە ئەوە بە ڕاو بۆچوونی بەندەو، ژمارەیەك لە زانایان کە دوایی ئاماژەیان پێ دەکەین، ئەگەرنا زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: سزایەکە بریتیە لە بەرد بارانکردن تاکو مردن، دوایی ئێمە باسێکی سەربەخۆ لەو بارەوە، دەکەین، بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە ئامادە نەبێ، ئەو تۆمەتە ڕەتبکاتەوەو ئەو پێنج شایەدییانە بدات و، بێدەنگ بێ لە بەرانبەر تۆمەتبارکردنی پیاوەکەی دا، ئەوە سزایەکەی دەکەوێتە سەر، ئنجا سەد (١٠٠) قەمچییە، یان بەرد بارانکردنە.

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ ﴾، ئەگەر لەبەرئەوەش نەبووایە کە بەخششی خواو بەزەیی خوا لەسەر ئێوە هەیەو، لەبەر ئەوەش نەبووایە کە خوا زۆر تۆبە وەرگری کاربەجێیە.

وەڵامی (وَلَوۡلَا) لێرەدا قرتێنراوە یانی: ئەگەر بەخشش و بەزەیی خوا نەبووایە لەسەر ئێوەو، لەبەر ئەوەش نەبووایە زۆر تۆبە وەرگرو کاربەجێیە، ئاوا دەرووی خێری لێ نەدەکردنەوە، کاتێ کە تووشی کێشەیەك دەبن، بزانن چۆن لێی دەربازبن، بەو سزایانەی خوا دایناون، بۆ ئەو تاوان و خراپانەو، ئێوە لەو گرفت و کێشانە، کە لەگەڵیاندا ڕووبەڕوویان دەبنەوە، لێیان ڕزگار بن، یان: ئەگەر بەخشش و بەزەیی خوا لەسەر ئێوە نەبووایەو، لەبەر ئەوە نەبووایە خوا زۆر تۆبە وەرگری کارزانە، ئەوە زوو سزای دەدان، کە بە سیاق و سەلیقە وەڵامەکە دیاریی دەکرێ و، لە مەسەلە گرنگەکانیش دا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەو بابەتە.

## مەسەلە گرنگەکان

وەك جاری دیکەش باسمان کردوە: مەسەلە گرنگەکان بریتین لەوە: کە خوڵاصەی ئایەتێك، یان چەند ئایەتێك، وەك بابەتێك، وەك ناوونیشانێك دەیهێنم، دوایی ئەو ئایەتە، یان ئەو چەند ئایەتانەی ئەو مەسەلە گرنگانەیان لێ هەڵدەهێنجین، بڕگە بڕگە شییان دەکەینەوەو تیشکیان دەخەینە سەر:

**مەسەلەی یەکەم:**

**ئایەتمەندێتیی سوورەتی (النور)و، پێویست کرانی ئەو حوکمانەی تێیدا خراونە ڕوو، کە مایەی فێربوونی مسوڵمانان و پەند وەرگرتنیانە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿سُورَةٌ أَنزَلْنَاهَا وَفَرَضْنَاهَا وَأَنزَلْنَا فِيهَآ ءَايَٰتٍ بَيِّنَٰتٍ لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾.

**ئەم ئایەتە بە پێزە لە چوار بڕگەدا شی دەکەینەوە:**

١)- ﴿سُورَةٌ أَنزَلْنَاهَا﴾، وەك پێشتر باسمان کرد: (سورة) یان نیهاد (مبتدأ)یەو، گوزارە (خبر)ەکەی بریتیە لە: (أَنزَلْنَاهَا)، لەسەر ڕای هەندێ لە زانایان، یاخود (سورة) گوزارە (خبر)یە و نیهاد (مبتدأ)کەی، بریتیە لە (هي)، (هِيَ سورة) یان (هذهِ)، (هذهِ سورة) ئەمە سوورەتێکە (أَنزَلْنَاهَا)، دامانبەزاندوە، خوا ﷻ لە سەرەوەی دروستکراوەکانی خۆیەتی، بەو شێوەیەی کە بۆ خوا شایستەیە، لە دەرەوەی ئاسمانەکان و زەوییە، بەو شێوەیەی کە بۆ خوا شایستەیە: (ألله مسْتَوٍ عَلَى عَرْشِهِ، بَائِنٌ عَنْ خَلْقِهِ كَمَا يَليق بِهِ) بۆیە هەمیشە بۆ ئایەتەکان دەفەرموێ: دامانبەزاندوون.

٢)- ﴿ وَفَرَضۡنَٰهَا ﴾، (أَوْجَبْنَاهَا)، پێویستمان کردوە، یانی: ئەم سوورەتەو، ئایەتەکانی کە لە نێوی دان، پێویستمان کردوون، یانی: ئەو یاسایانەی گرتوویانە خۆیان، پێویستمان کردوە کاریان پێ بکرێ، لەسەر مسوڵمانان پێویستمان کردوون.

(وَفَرَّضْنَاهَا)، خوێنراویشـەتەوە: (فَرَّضْنَاهـا)، بەگیـرە (شـدة)، [فَرَّضناهـا أي: فَصَّلْنَاهـا]، واتـە: ڕوونمـان کردۆتـەوە.

هەندێکیـش گوتوویانـە: (فَرَّضْنَاهَـا)، هـەر بـە مانـای پێویسـتکردنە، بـەڵام یـانی: زۆرمـان پێویسـتمان کـردوون، وەك: (قَطَـعَ)و (قَطَّـعَ)، (كَسَرَ)و (كَسَّرَ)، شـکاندی، زۆری شـکاند، بـڕی، زۆری بـڕی.

٣)- ﴿ وَأَنزَلۡنَا فِيهَآ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ ﴾، لەم سوورەتەش دا ئایەتانێکی ڕۆشنمان دابەزاندوون، ماناکەیان ڕۆشنە، ئەو حوکمە شەرعییانەی گرتوویانە خۆیان، هیچ پێچ و پەنایان تێدانیە، زۆر ڕۆشنن.

٤)- ﴿ لَّعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴾، بەڵکو ئێوە وەبیرتان بێتەوە، کە ئەمە لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ فێربوون بە بەڵگە دڵنیاکەرەکانی، (مُسْتَعَارٌ لِلعِلْمِ بِأَدِلَّتِهِ اليَقِيْنِيَّة)، (تَذَكَّرُونَ)، خوێنراویشەتەوە: (تَذَّكَّرُون)، کە لە ئەسڵدا (تَتَذَكَّرُون)ە، بەڵام (ت) لە (ذ)دا جۆشدراوە، دەبێتە (تَذَّكَّرُون)، ئنجا (تَذَكَّرُونَ)و (تَذَّكَّرُون)، هەر یەك واتایان هەیە، واتە: بۆ ئەوەی بێتەوە بیرتان، پەند وەربگرن فێربن، شارەزابن.

پێشـتر باسـمان کـرد کـە وشـەی (سـورة)، لـە زمانـی عەرەبیـی دا، بـە مانـای: نـاوی پێگـەی بـەرز دێ، (إسـمٌ للمنزلَـةِ الشَّرِيْفَـة)، پلەیەکـی بـاش، بۆیـەش هـەر سـوورەتێك لـە سـوورەتەکانی قورئـان، ئـەوەی پێگوتـراوە، چونکـە هـەر کام لـە سـوورەتەکانی قورئـان، پێگـەو پلەیەکـی بـەرزی هەیـەو، فەرمایشـتی خوایـە، وەك (زهـير أبي سـلمة) کـە خاوەنـی یەکێـك لـە حـەوت شـیعرە هەڵـواسراوەکان (المُعَلَّقَـات السَّـبْع)ە، لـە شـیعرێکی دا گوتوویـەتی:

**أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللهَ أَعْطَاكَ سُورَةً ... تَرَى كُلَّ مَلِكٍ دُونَهَا يَتَذَبْذَبُ**

**ئایا تۆ نابینی خوا سووڕەتێکی[1] بە تۆ داوە**

**دەبینی هەر پادشایەك لە بەرانبەریدا لەرەلەریەتی[2].**

---

(١) واتە: پێگەیەکی بەرزی بە تۆ داوە.

(٢) واتە: ئەوەی تۆ لە هی هەمووان بەرزتر و دامەزراوترە.

**مەسەلەی دووەم:**

**لەسەر قەوارەی سیاسیی مسوڵمانان پێویستە، زیناکارانی ئافرەت و پیاو، یەکی سەد (١٠٠) قەمچییان لێ بدرێ، وەك سزاو، دەبێ ئەنجامدانی ئەو سزادانە بە ئامادەبوونی کۆمەڵێك لە بڕوادارانیش بێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ۖ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِى دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۖ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:**

**١)- ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ﴾، ئافرەتی زیناکارو پیاوی زیناکار، هەرکامێکیان سەد قەمچیی لێبدەن، دەپرسین: بۆچی ئافرەتی زیناکار پێش پیاوی زیناکار خراوە؟.**

**ئەوە دوو هۆکاری هەن:**

**هۆکاری یەکەم: چونکە ئافرەت هۆکاری سەرەکییە بۆ ڕوودانی داوێن پیسیی و زیناکردن، ئەگەر ئافرەتەکە ئامادەیی نەبێ، پیاوەکە تەماعی تێ ناکات، ئەگەر زینا کردنەکە ئارەزوومەندانە بێ، بەڵام ئافرەتێك کە پیاوێك، یان چەند پیاوێك دەستدرێژیی دەکەنە سەر، ئەوکاتە ئەو ئافرەتە بە زیناکار لە قەڵەم نادرێ.**

**هۆکاری دووەم: لەبەر ئەوەی شوورەیی و عەیبی زیناکردن، زیاتر ئافرەتان دەگرێتەوە، پیاو زیناش دەکات، هیچ شوێنەوارێکی نایەتە سەر، بەڵام ئافرەتەکە تۆڵدار (حامل) دەبێ، پاشان عورفی هەموو کۆمەڵگایەك وایە، زینا لە ئافرەتان ناشرینترە، ئەگەرنا گوناه هەر گوناهە بۆ هەردووکیان، بەڵام عەقڵ و سەلیقەو باوی خەڵك، بەو شێوەیە تەماشای شتەکان دەکەن.**

شایانی باسە: بە نسبەت دزیی کردنەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾ ﴾المائدة، واتە: پیاوی دزو ئافرەتی دز دەستیان ببڕن، لەوێ پیاوی دز پێش ئافرەتی دز خراوە، لەولا ئافرەتی زیناکار پێش پیاوی زیناکار خراوە، بۆچی؟

چونکە زیناکردن زیاتر حاڵەتی نەرمیی و ملکەچیی دەوێ، بە نسبەت ئافرەتەوە، ئەوەش زیاتر لە ئافرەتدا هەیە، بەڵام دزیی کردن، زیاتر حاڵەتی زبریی و، دڵڕەقیی و، ئازایەتیی دەوێ، کە ئەوەش زیاتر لە پیاودا هەیە، بۆیە پیاوان زیاتر دەسپێشخەری دزیین، ئافرەتان زیاتر دەستپێشخەری زینان، خوای پەروەردگاریش واقیعەکە چۆنە، بەو شێوەیە تەعبیری لێ کردوە.

کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَٱجْلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِاْئَةَ جَلْدَةٍ ﴾، هەر کامێکیان یەکی سەد (١٠٠) قەمچییان لێ بدەن، ئەم (ف)یە، کە دەفەرموێ: (فَٱجْلِدُواْ)، (فاء الجزائية)یە، یانی: وەك سزادان، یەکی سەد (١٠٠) قەمچییان لێ بدەن.

﴿ مِاْئَةَ جَلْدَةٍ ﴾، دەگوترێ: (جَلَدَهُ: أي ضَرَبَ جِلْدَهُ)، (جَلَدَهُ) یانی: لە پێستی دا (الجَلْدُ: الضَّرْبُ بِسيرٍ مِنْ جِلْدٍ)، (جَلْد)یش بریتیە لە لێدان بە زوێڵە چەرم، زۆربەی زانایان وایانگوتوە، بەڵام لە ڕاستیی دا - وەك دوایی دەیهێنین - ئەوە ڕاست نیە، چونکە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ شوڕکەداریش بە کارهێنراوە بۆ ئەوەو، دەگونجێ بە شتی دیکەش لێی بدەن، چەرم نەبێ، سیم بێ، لاستیك بێ، هەر شتێك بێ، گرنگ ئەوەیە کە سەد (١٠٠) دانەی لێ بدرێ.

٢)- ﴿ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِى دِينِ ٱللَّهِ ﴾، با پەرۆشیی لە جێبەجێ کردنی ئایینی خوادا نەتانگرێ، بەرانبەر سزادرلوان، پێشتریش باسمان کرد، کە مەبەست ئەوە نیە پەرۆشیی و بەزەییتان نەبێ، پەرۆشیی و بەزەیی سیفەتێکی گەورەو پەسندە لە مرۆڤدا، بەڵام یانی: با بەزەیی و پەرۆش بەرانبەر بەوان، دەستتان نەگرێ، کە ئەو سزاو ئەو حوکمەی خوا جێ بەجێ بکەن.

وشەی (رَأْفَةٌ)و (رَحْمَةَ)ە، جیاوازییان چییە؟ گوتراوە: (الرَّأْفَة: خَاصَة، تَنْشَأُ عِنْدَ مُشَاهَدَةِ المَرْؤوفِ)، (رَأْفَة) بریتیە لە بەزەییەکی تایبەت لە کاتێك دا، مرۆڤ ئەو کەسەی پەرۆشیی بۆ دەنوێنرێ، دەیبینێ، ئەو حاڵەتەی بۆ پەیدادەبێ.

بەڵام ڕاستتر ئەوەیە بگوترێ: بەزەیی بریتیە: لەوە کە مرۆڤ هەوڵبدات چاکە بۆ بەرانبەرەکەی بێنێ، بەڵام (رَأْفَة) بریتیە لەوەی هەوڵبدات ئازاری لێ دوور بخاتەوە، هەر بۆیەش لێرەدا وشەی (رَأْفَة)ی بەکارهێناوە، چونکە ئەوانە ئازار دەدرێن، دەفەرموێ: با سیفەتی ئازار دوورخستنەوە لەوان، دەستتان نەگرێ و، ڕێگاتان لێ نەگرێ ئەو سزایەی خوا جێبەجێ بکەن.

کە دەفەرموێ: ﴿فِي دِينِ ٱللَّهِ﴾، واتە: لە جێبەجێ کردنی ئایینی خواو حوکمی شەریعەتی خوادا، نابێ دڵنەرمیی و پەرۆشیی دەستت بگرێ و، نەهێڵێ یاسای خوا جێبەجێ بکەی، چونکە خوا بەرانبەر بە بەندەکانی لە هەموو کەس بە بەزەییترەو، ئەو سزایانەشی داناون، کە بە دڵنیایی بۆ بەندەکانی وا باشە.

ئنجا نابێ بەس ئەوکەسە ببینی کە سزا دەدەرێ، ئەو کەسە کە تاوانەکەی لە دژ کراوە دەبێ ئەویش ببینی، ئنجا سزا بۆ بابای سزا دراویش، هەر بەزەییە، تاکو جارێکی دیکە ئەوە دووبارە نەکاتەوەو، بۆ کۆمەڵگاش بە گشتیی هەر چاکە، هەروەها بۆ ئەو کەسەش کە گوناهەکەی لە بەرانبەردا کراوە، ئەگەر ئافرەتەکەیە بە زۆر تەعەدای لێ کرابێ، ئەگەر خزمانی ئافرەتەکەن، کە عەیبەیان هێنراوەتە سەر، دیسان بەزەیی خوایە، ئەو سزایە جێ بەجێ بکرێ، وەك بەرگریی کردن لە سومعەو کەرامەتی ئەوانیش.

٣)- ﴿إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾، ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە.

(إن)ی ﴿إِن كُنتُمْ﴾، (إن)ی (شَرْطية)یە واتە: بە مەرجێ بڕواتان بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێ، وەڵامەکەشی قرتێنراوە، چونکە هی پێشەوە دەیگەیەنێ، واتە:

ئەگەر بڕواتان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێ، نابێ پەرۆشیی دەستتان بگرێ، لە بەرانبەر سزادانیاندا.

٤)- ﴿ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، با ئازاردانەکەی ئەو دووانەش، (ئەو ئافرەتە داوێن پیس و ئەو پیاوە داوێن پیسە)، کۆمەڵێ لە بڕواداران لە لای ئامادەبن و ببینن.

زانایان لەو بارەوە زۆر قسەیان کردوون:

١- هەندێك گوتوویانە: ئەفەرێ بەسە.

٢- هەندێ گوتوویانە: دووان.

٣- هەتا هەزاریش ڕۆیشتوون.

٤- زۆربەیان گوتوویانە: نابێ لە چواران کەمتر بن.

٥- بەڵام ڕای من وایە: ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی ژینگەکان و کۆمەڵگاکان و عادەت و نەریت، پاشان ئەو کەسەش کە سزا دەدرێ، ئەگەر کەسێکی وابێ، یەکەم جار بێ، یان کەسێك بێ پێکەیەکی بوو بێ، یان کەسێك بێ، تەنیا هەڵەیەکە کردوویەتی، بەڵام لێی نەوەشێتەوە، ئەوە دەگونجێ خەڵکی زۆر لێ کۆنەکرێتەوە، بەڵام ئەگەر بە جۆرێکی دیکە بێ، ئەوە دەگونجێ خەڵکی زۆر لێ کۆبکرێتەوە، هەروەها چۆنیەتیی زینایەکەش، ئەویش دیسان ئایا ئەفەرێك بووە، یان چەند کەسێ بوون، چەند پیاوو ئافرەتێك بوون؟ هەموو ئەو ئیعتیبارانە، جۆری خەڵك لێ کۆکردنەوەکەو ژمارەی کەسەکان، ئەو حاڵەتانە ڕۆڵی تێدا دەبینن.

## کورتە باسێک لە بارەی سزای زیناوە

هەرچەنـدە نـاوم لێنـاوە کورتـە بـاس، بـەڵام ئـەم باسـە، پانتاییەکـی زۆرم بـۆ تەرخـان کـردووەو، هەوڵـم داوە لـە یـازدە (١١) تـەوەردا، باسـی سـزای زینـا بکەیـن، وێـرای هەندێـک مەسـەلەی دیکـە، کـە پێیـەوە پەیوەسـتن:

### تەوەرەی یەکەم: پێناسەی زینا:

خەڵـک بەگشـتیی دەزانـن زینـا یانـی چـی؟ پێکـەوە جـووت بوونـی پیاوێـک و ئافرەتێـک کـە بـۆ یـەک حـەڵاڵ نیـن و، پێکـەوە جـووت بوونێکـی ئارەزوومەندانـە، بـەڵام ئەگـەر پیاوەکـە دەسـتدرێژیی بکاتـە سـەر ئافرەتەکـە، یاخـود پیاوەکـە ناچـار بکـرێ، ئـەو کاتـە ئـەو کەسـەی لـەو کاتـەدا ئارەزوومەنـد نیـەو، ویسـت (إرادة) لـە دەسـت دەدا، بێگومـان بـۆی بـە زینـا لـە قەڵـەم نـادرێ.

ئێمە سێ جۆرە پێناسەی زانایان بۆ زینا دێنین، کە لە نێوەڕۆك دا یەکن:

١)- (القُرطبي) دەڵێ: (الزِّنَا: اسْمٌ لِوَطءِ الرَّجُلِ المَرْأَةَ فِي فَرْجِهَا مِنْ غَيْرِ نِكَاحٍ وَلاَ شُبْهَةَ نِكَاحٍ بِمُطَاوَعَتِهَا)[1]، واتە: زینا بریتیە لەوە کە پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێکدا جووت بێ، بەبێ ئەوەی نیکاحیان لە نێواندا هەبێ، یاخود شوبهە نیکاحێکیان لە بەیندا هەبێ، بە مەرجێ ئافرەتەکەش ئارەزوومەندانە ئەنجامی بدات.

٢)- هەروەها هەر (القرطبي) پێناسەیەکی دیکەش دێنێ هەر لە سەرچاوەی پێشوودا، دەڵێ: (الزِّنَا هُوَ إِدْخَالُ فَرْجٍ فِي فَرْجٍ مُشْتَهىً طَبْعَاً مُحَرَّمٍ شَرْعَاً)[2]، واتە: زینا بریتیە لەوە

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٢، ص١٣٣.

(٢) الجامع لأحكام القرآن: ج١٢، ص١٣٣.

کە ئەندامی نێرینەی پیاوێك بچێتە نێو ئەندامی مێینەی ئافرەتێك، بە جۆرێ لە ڕووی سروشتییەوە ئارەزوو بۆ کراوبێ و لە ڕووی شەرعەوە قەدەغە بێ، (مەبەستی ئەوەیە: ئەگەر لە داوێنیەوە نەبێ، ئەو کاتە بە زینا لە قەڵەم نادرێ و، حوکمێکی دیکەی هەیە).

٣)- (محمد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دەڵی: [الزِّنَا: هُوَ الجمَاعُ بَيْنَ الرَّجُلِ وَالمَرْأَةِ الَّذَيْنِ لاَ يَحِلُّ أَحَدُهُمَا للأَخَر)، واتە: زینا بریتیە لە پێکەوە جووت بوونی پیاوێك و ئافرەتێك، کە یەکێکیان بۆ ئەوی دیکەیان حەڵاڵ نیە.

## تەوەرەی دووەم: سزای زینا وەك سەرجەم سزا شەرعییەکان، حوکمڕان جێبەجێی دەکات:

دەبــێ کــێ ســزای زینــا جــێ بەجــێ بــکات؟ خــوا ﷻ ڕووی لــە ئیمانــداران کــردوە، دەفەرمــوێ: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖ ﴾النور(٢)، ڕوو لــە کۆمەڵگایــە، بــەڵام ئایــا لــە کۆمەڵــگادا کێیــە، هــەر کەســێك ڕاســت بــۆوە دەتوانــێ؟ نەخێــر، بەڵکــو دەبــێ حوکمــڕان جێبەجێــی بــکات و زانایــان لــەو بــارەوە یەکدەنگــن:

١)- (القرطبي) لەو بارەوە دەڵێ: (لاَ خِلاَفَ أَنَّ الْمُخَاطَبَ بِهَذَا الْأَمْرِ الْإِمَامُ وَمَنْ نَابَ مَنَابَهُ، وَقِيلَ: الْخِطَابُ لِلْمُسْلِمِينَ، لِأَنَّ إِقَامَةَ مَرَاسِمِ الدِّينِ وَاجِبَةٌ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، ثُمَّ الْإِمَامُ يَنُوبُ عَنْهُمْ، إِذْ لَا يُمْكِنُهُمُ الإجْتِمَاعُ عَلَى إِقَامَةِ الْحُدُودِ)[2].

واتــە: ڕاجیایــی نیــە لــەوەدا کــە دوێــنراو بــەو فەرمانــە، حوکمــڕان و پێشــەوایە، (واتــە: ســەرۆکی مســوڵمانان)و هــەر کەســێك کــە لــە شــوێنیەتی، گوتراویشــە: ڕووی دوانــدن لــە مســوڵمانانە بــە گشــتیی، چونکــە بەرپاکردنــی دەســتوورەکانی ئاییــن، لەســەر مســوڵمانان پێویســتە، بــەڵام پێشــەواو ســەرۆکی مســوڵمانان لــە جیاتــی ئــەوان جێبەجێــان دەکات، چونکــە ناگونجــێ هەموویــان بــۆ بەرپاکردنــی ســزاو ســنوورە شــەرعیەکان کۆببنــەوەو هەموویــان جــێ بەجێیــان بکــەن.

---

(١ ) التحرير والتنوير: ج١٨، ص١٤٦.

(٢ ) الجامع لأحكام القرآن: ج١٢، ص١٣٤.

٢)- (محمد الطاهر بن عاشور)یش، لەو بارەوە دەڵێ: (والخِطَابُ بالجَلْدِ مُوَجَّهٌ إلى المُسْلِمِينَ، فَيَقُومُ بِهِ مَنْ يَتَوَلَّى أُمُور المُسْلِمِين، مِنَ الأُمَرَاءِ وَالقُضَاةِ وَلاَ يَتَوَلاَّهُ الأَولِيَاء)[1].

واتـە: ڕووی دوانـدن کـە دەفەرمـوێ: جەڵدەیـان لـێ بـدەن، قەمچییـان لـێ بـدەن، لـە مسـوڵمانانە، بـەڵام ئـەو کەسـە پێـی هەڵدەسـتێ کـە کاروبـاری مسـوڵمانان بەڕێوە دەبـات، لەوانـەی فەرمانـدەن و لـە قازییـەکان و، ئەوانـەی سەرپەرشـتیی مسـوڵمانان دەکـەن، بـەڵام خزمـان بـەو کارە هەڵناسـتن.

واتـە: نابـێ خزمانـی نافرەتەکـە، یـان خزمانـی پیاوەکـە، بـە حوکمـی خزمایەتیـی بـەو کارە هەڵسـن، بەڵکـو دەبـێ ئـەوەی کـە دەسـەڵاتی شـەرعیی هەیـە، ئـەو پـێ هەڵسـتێ، پێشـینانمان گوتوویانـە: (دەسـتێ شـەرع ببـڕێ، خوێنـی لـێ نایـەت)، بـەڵام ئەگـەر بێـت و خـزم و خوێـش پێـی هەسـتن، دەبێتـە هـۆی کێشـەو گرفـت و ئـاژاوە، لـە کۆمەڵـگادا.

## تەوەرەی سێیەم: قەدەغەبوونی نواندنی پەرۆش بەرانبەر بە سزا لەسەر چەسپاوان، کە ببێتە مایەی جێبەجێ نەکرانی سزا شەرعییەکان:

﴿وَلَا تَأۡخُذۡكُم بِهِمَا رَأۡفَةٞ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ﴾النـور (٢)، خـوا دەفەرمـوێ: بـا پـەرۆش و بەزەییتـان بەرانبـەر بـەو دوو کەسـە (کـە پیـاوی زینـاکارو ژنـی زینـاکارن) دەسـتتان نەگـرێ، بەزەیـی و پەرۆشـیی بەسـەرتان زاڵ نەبـێ، کـە سـەرەنجام دەبێتـە هـۆی ئـەوەی ئایینـی خـوا جێبەجـێ نەکـەن و، پابەنـد نەبـن بـە حوکمـی شـەریعەتەوە.

لێـرەدا کـە خـوا قەدەغـەی دەکات پەرۆشـیی و بەزەییـمان هەبـێ، جیاوازیـی نێـوان (رَأفَـةً)و (رَحْمَـةً)، وەك پسـپۆڕانی زمـان گوتوویانـە، بـە تایبـەت (راغـب الأصفهـاني)، (رَحْمَـةً) ئەوەیـە هەوڵبـدەی بەرانبەرکـەت چاکـەی بـۆ بێنـێ، (رَأفَةً)یـش:

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٨، ص١٤٧.

ئەوەیە پەرۆشت بێ و هەوڵبدەی زیان و خراپەی لێ دوور بخەیەوە، ئنجا لەبەر ئەوەی پیاوی زیناکارو ئافرەتی زیناکار، بەو شێوەیە سزا دەدرێن، کە یەکی سەد (١٠٠) قەمچییان لێ دەدرێ، زیانیان بۆ دێ، نارەحەتییان بۆ دێ، بۆیە وشەی (رَأْفَةٌ)، لەگەڵی دێ و دەگونجێ، واتە: با پەرۆشیی و دڵ پێ سووتان و، ئەوە کە زیانیان لێ دوور بخەنەوە، دەستتان نەگرێ، کە سزا نەدرێن، کە لێرەدا مەبەست ئەوەیە: سزا شەرعییەکە جێ بەجێ نەکرێ، یاخود: کەم و کووڕیی تێدا بکرێ، ئەگەر نا خودی بەزەیی هەبوون و خودی پەرۆش هەبوون، بەبێ ئەوە مرۆڤ ویستی لەسەر بێ، ئەوە نەهی لێ ناکرێ، چونکە خوا ﷻ خۆی خاوەن بەزەییەو خاوەن بەزەییانی خۆش دەوێن، بەڵام بەزەیی دەبێ لە جێی خۆی دابێ، هەروەك دڵڕەقییش دەبێ لە جێی خۆی دابێ و، پێویستە مرۆڤ خۆی ڕابێنێ لەسەر بەکارنەهێنانی سۆزو بەزەیی، لەو شوێنانەدا بەزەیی تێیاندا خراپە.

(الطبري) لە تەفسیرکەی خۆیدا[1] دەڵێ: (مَعْنَى ذَلِكَ وَلاَ تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي إِقَامَةِ حَدِّ اللهِ الَّذِي افْتَرَضَ عَلَيْكُمْ إِقَامَتُهُ عَلَيْهِمَا)، واتە: مانای ئەو ڕستە موبارەکە ئەوەیە: با پەرۆش و بەزەیی لە جێ بەجێکردنی سزای خوادا، کە خوا پێویستی کردوە لەسەریان جێ بەجێ بکرێ، نەتانگرێ و بەسەرتان دا زاڵ نەبێ، کە ڕێگاتان لێ بگرێ ئەو سزا شەرعییەیان بە سەردا بچەسپێنن.

بە بیانووی ئەوە کە بەزەییان بەرانبەر دەنوێنن، چونکە بە تەئکید خوا لە ئێوە بە بەزەییترە، ئەو سزایەشی داناوە، لەبەر ئەو حیکمەتانەی گرتوونیە خۆی.

---

(١) جامع البیان: ج١٨، ص٧٢.

## تەوەرەی چوارەم: بڕوا بە خواو پێغەمبەر ﷺ و بە ڕۆژی دوایی بوون، هاندەری جێبەجێکردنی سزا شەرعییەکانە:

ئەمەش زۆر ڕۆشنە، هەر لە خودی ئایەتەکەدا، کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ۖ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِى دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۖ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾النور -٢-.

کەواتە کە دەفەرموێ: ﴿ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ﴾، ئەگەر ئێوە بڕواتان هەیە بە خواو بە ڕۆژی دوایی، دەبێ ئەوەی خوا ﷻ دایناوە لە شەریعەتی خۆیدا، جێ بەجێی بکەن، بە تایبەتیی لێرەدا کە مەبەست پێی سزای زیناکارانە لە پیاوان و ئافرەتان، کە بریتیە لەوەی یەکی سەد (١٠٠) قەمچییان لێ بدرێ، ئەگەر ئیمانتان بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێ، ئەوە ئەو سزایە بەسەر ئەوانەدا کە شایستەینی، دەچەسپێنن.

کە دەفەرموێ: ﴿ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ﴾، (إن)ی (إِن كُنتُمْ...)، (إن)ی (شرطیة)یە، بەڵام لێرەدا ئەو مەرجە وەڵامەکەی فڕێندراوە، چونکە پێشەوەی دەلالەتی لەسەر دەکات، واتە: ئەگەر بڕواتان بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێ، دەبێ ئەوەی خوا ﷻ دایناوەو بڕیاری داوە، بێ ئەوەی عاطیفەو سۆزتان ڕێگرو پەرچ بێ، جێبەجێی بکەن.

ئنجا بەڕێزان! ئەمە نەك تەنیا بۆ چەسپاندنی سزای داوێن پیسیی، بەسەر داوێن پیساندا، بەڵکو بۆ هەموو حوکم و یاسا شەرعییەکان هەر وایە، مسوڵمانان چ تاك تاکیان، چ بە کۆمەڵ، بە ئەندازەی ئەوە کە ئیمان لە دڵ و دەروونیاندا دەچەسپێ، ملکەچ دەبن بۆ شەریعەتی خواو بۆ حوکمەکانی خوا، ئەمە لە زۆر شوێنی دیکەی قورئاندا هاتوە، بۆ وێنە:

أ- لە سووڕەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِى شَىْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ﴿٥٩﴾ ﴾، هەروەها لە زۆر شوێنی دیکەدا، هەمیشە خوا ﷻ

ئەوە دەخاتەوە بیری مسوڵمانان، کە ئەگەر ئیمانتان هەبێ بە خوا ﷻ و پێغەمبەری خوا ﷺ و بە ڕۆژی دوایی، پێویستە پابەند بن.

ب- هەر لەم سوورەتی (النور)دا، لە ئایەتەکانی کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾﴾، واتە: بڕواداران تەنیا ئەو کەسانەن، کە بڕوایان بە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ هەیەو، کاتێك ئامادە دەبن بۆ کارێکی کۆکەرەوە (کارێکی هەرەوەزیی)، بەم لاو لادا ناچن تاکو مۆڵەتی لێ وەرنەگرن، (لە پێغەمبەری خوا ﷺ)، ئەوانەی مۆڵەتت لێ وەردەگرن، بۆ ڕۆیشتن بەملاولادا، ئەوانە ئیمانیان بە خواو بە پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە، ئنجا هەر کات داوای مۆڵەتیان لێکردی بۆ هەندێ کاریان، بۆ هەر کامێکیانت ویست، مۆڵەتیان بدەو داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکە، بێگومان خوا لێبوردەی بەبەزەییە.

## تەوەرەی پێنجەم: ئامادەبوونی کۆمەڵێك لە بڕواداران، لە کاتی جێبەجێ کردنی سزای زینادا، بە مەرج گیراوە:

ئەمیش هەر لە دەقی ئایەتەکەدا، زۆر بە ڕوونیی دیارە، کە دەفەرموێ: ﴿وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾، با ئازاردانەکەیان کۆمەڵێك لە بڕواداران ئامادەی بن، ببینن، ئەمە پێویست دەکات چەند ڕوونکردنەوەیەکی لەسەر بدەین:

١)- (الطبري) لە تەفسیرەکەی خۆی (جَامِعُ البَيَان)دا دەڵێ: [وَالْعَرَبُ تُسَمِّي الْوَاحِدَ فَمَا زَادَ: طَائِفَةً][1]، واتە: عەرەب عادەتیان وابووە یەکێك زیاتریان بە (طائفة) ناو هێناوە، یانی: یەك کەسیش بە طائیفە ناوی دەهێنرێ، هەروەها دووان و سێ و تا دوایی، (طبري) کە

---

(١) ج١٨، ص٧٢.

بە پێشەوای لێکدەرەوانی واتاکانی قورئان، ناسراوە وا دەڵێ، هەڵبەتە زانایانی دیکەش هەن وا دەڵێن.

(مجاهـد)، لـەو بـارەوە وەك (القرطبـي)، لـە تەفسـیرەکەی خـۆی، (الجَامِـع لأحَـكَام القُـرآن)دا دەڵـێ: {رَجُـلٌ فَمَا فَوْقَـهُ إِلَى أَلْـفٍ}[1]، پیاوێـك یاخـود زیاتـر، تاکـو دەگاتـە هـەزار.

هەمووی وشەی طائیفەی بۆ بەکار دەهێنێ.

٢)- هەندێکیشیان دەڵێن: نەخێر، تەنیا کاتێك بە تائیفەو کۆمەڵ لە قەڵەم دەدرێن، دوو کەس یاخود زیاتر بن.

ئنجا هـەر (الطبري)، دەڵـێ: {أَسْتَحِبُّ أَنْ لَا يَقْصُرَ بِعَـدَدِ مَـنْ يَحْضُرُ ذَلِكَ الْمَوْضِعَ، عَـنْ أَرْبَعَـةِ أَنْفُسٍ، عَـدَدَ مَـنْ تُقْبَـلُ شَـهَادَتُهُ عَـلَى الزِّنَـا}[2]، دەڵـێ: وای بـە پەسـند دەزانم ئەوانـەی ئامـادەی ئـەو سـزادانە دەبـن، لـەو شـوێنەدا لـە چـوار کـەس کەمـتر نەبـن، ژمـارەی ئەوانـەی کـە شـایەدییان لـێ وەردەگیـرێ، بـۆ ئیسـپاتی زینـا.

٣)- هەندێکیش گوتوویانە: دەبێ دە (١٠) کەس کەمتر نەبن و، هەندێك گوتوویانە: حەوت (٧)و قسە لەو بارەوە زۆرن.

٤)- منیش وای تێدەگەم کە ژمارەی ئەوانە کە ئامادە دەبن بۆ ئەو سزایە:

یەکەم: بە پێی عورف و باوی کۆمەڵگایەکان و، بە پێی ژینگەکان دەگۆڕێ.

دووەم: بە پێی حاڵی سزادراوەکانیش، دەگۆڕێ، کە نەمبینیوە لە تەفسیرەکاندا ئاماژە بەوە بکرێ.

سێیەم: هەروەها بە پێی چۆنیەتیی زینا کردنەکەشیان دەگۆڕێ، جاری وایە ژنێك و پیاوێك، یان کوڕێك و کچێك لە پەنایەك دا، ئەو کەتنە دەکەن، ئەوە شتێکە، جاری واشە:

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٢، ص١٢٨.

(٢) جامع البيان: ج١٨، ص٧٢.

أ- كۆمەڵێك ئافرەت و پیاوێك.

ب- یان كۆمەڵێك پیاو لەگەڵ كۆمەڵێك ئافرەت.

ج- كۆمەڵێك پیاوو ئافرەتێك...هتد، ئەو حاڵەتانەی دەستدرێژیین بۆ سەر پاكیی كۆمەڵگا.

ئنجا بە پێی ئەو هەل و مەرج و ئەو حاڵەتانە كە دەوری تاوانەكە دەدەن، پێم وایە: ئەوە كە ئایا خەڵكی زیاتریان لێ كۆبكرێتەوە بۆ سزادانەكە یان كەمتر؟ ئەو شتانە هەموویان كاریگەرییان هەیە لەسەر دیارییكردنی ژمارەی ئامادەبووان و بەشداربووان و تەماشاچییان، بۆ ئەو سزادانە.

٥)- ئایا حیكمەتی ئەو خەڵك كۆكردنەوەیە بۆ ئەو سزادانە چییە؟

دەتوانین بڵێین: چوار حیكمەتی هەن، كە كۆی ئەوەیە لە تەفسیرەكان و سەرنجدانی خۆیشم وەرمگرتووە:

أ)- بۆ سەرزەنشتكردنی داوێن پیسان، تاكو چ ئەوانەی زینایەكەیان كردوەو، چ خەڵكی دیكە، تەمبێ خواردوو بن، ئەو خەڵكەیان لێ كۆ بكرێتەوەو ئاوا ئابڕوو ببردرێن.

ب)- بۆ ئەوەی بابای زیناكار بپرینگێتەوەو، بسڵەمێتەوەو، جارێكی دیكە بەو شێوەیە خۆی نەخاتە مەوقیعێكەوە، ئابڕووی بچێ.

ج)- بۆ ئەوەی خەڵك بە گشتیی پەند وەربگرێ و، بسڵەمنەوە، چونكە ئەوانەی ئامادەی تەماشاكردنی ئەو سزادانە دەبن، دوایی بۆ ئەوانی دیكەی باس دەكەن و دەنگ دەداتەوە.

د)- بۆ ئەوەی بزانرێ: ئەو سزایە جێبەجێ كراوەو، خاتری كەس نەگیراوە.

## تەوەرەی شەشەم: چۆنیەتیی قەمچیی لێدانەکە:

زانایان لەو بارەوە زۆر وردەکارییان باس کردوە:

١)- ماددەی قەمچییەکە دەبێ چی بێ؟ هەرچەندە هەموویان یان زۆربەیان گوتوویانە: دەبێ چەرم بێ، گوتوویانە: (سِيرٌ جِلْدٍ)، (سِيرٍ)، یانی: زوێڵ، زوێڵی چەرم کە مەرج نیە هەر یەك زوێڵ بێ، بەڵکو چەند زوێڵێکی باریك بهۆنرێنەوە، زانایان زۆربەیان، یان هەموویان وایانگوتوە، بەڵام بە پێی دەقێك کە (مَالِك عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَم)، لە (المُوَطأ)ی خۆیدا[1]، هێناویەتی، شوڕکی درەختی تەڕیش دەبێت، لەوێدا باسکراوە کە جارێك سزای کەسێکیان دەدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شوڕکێکی تەڕم بۆ بێنن، یەکێکی تازەیان بۆ هێنا کە گەڵاکانی لێنەکرابوونەوە، واتە: زۆر سەخت بوو، فەرمووی: یەکێکی لەوە کەمتر، یەکێکیان بۆ هێنا، مەیلەو شکا بوو، فەرمووی یەکێکی لەوەش بەهێزتر، ئنجا یەکێکیان بۆ هێنا، کە نە زۆر قایم و پتەو بوو، نە زۆریش باریك و شل بوو، فەرمووی: بەو شێوەیە.

هەڵبەتە ئەو کاتە شوڕکی داری لێبووە، ئەگەرنا دەگونجێ هەر شتێکی دیکەش بەکار بێ کە ئەو ئامانجە بپێکێ، کە بریتیە لە ئازار پێگەیاندنی بابای سزادراو.

٢)- ئایا کاتێك قەمچییەکەی لێدەدرێ، دەبێ ئەو کەسە پۆشاکی لەبەردا بێ؟ یاخود ڕووت بکرێتەوە؟ ئەوە ڕاجیایی لەسەرە، بەڵام زۆربەیان لەسەر ئەوەن نابێ ڕووت بکرێتەوە، ئەگەر ئافرەت بێ ئەوە ئاشکرایە، بەڵام نابێ پۆشاك و بەرگێکی وا ئەستووریشی لەبەر دابێ، کە ئەگەر ئەك بە قەمچیی، بە گۆپاڵیش لێی بدەی، هەست بە خۆی ئەکات، بەڵام دەبێ پۆشتە بێ.

٣)- بە نسبەت شوێنی لێدانی، ئایا لە کوێی جەستەی بدرێ؟ هەموو زانایان لەسەر پاراستنی دەم و چاوو عەورەت یەکدەنگن، زۆربەشیان دەڵێن: دەبێ لە پشتی بدرێ و، هەندێکیان دەڵێن: دەبێ لە لاقەکانیشی بدرێ.

---

(١) الموطأ: ج٢، ص٨٢٥.

٤)- لێدانەکە دەبێ بە تێش بێ، بەڵام نابێ بریندارکەر بێ، زانایان گوتوویانە: (ضَرْبٌ غَيْرَ مُبَرِّحٍ، ضَرْبٌ بَيْنَ ضَرْبَيْنِ لاَ يُرَي إِبْطُ الضَارِبِ)، دەبێ لێدانێکی بریندارکەر نەبێ، لێدانێکی میانجیی بێ، بابای لێدەر نابێ بن هەنگڵی دیاربێ، نابێ دەستی بە تەواویی بۆ هەڵێنێ، تنجا لێیبدا.

(الزمشخري) لە تەفسیری (الْكَشَّافِ)دا وەك (مُحَمَّد الطاهِر بن عَاشُور) لە (التحْرِير والتنْوِير)دا، لێی دەخوازێتەوە، دەڵێ: [قَالَ فِي «الْكَشَّافِ»: وَفِي لَفْظِ الْجَلْدِ إِشَارَةٌ إِلَى أَنَّهُ لَا يَنْبَغِي أَنْ يَتَجَاوَزَ الْأَلَمُ إِلَى اللَّحْمِ][1].

دەڵێ: وشەی (جَلْد)، ( کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً ﴾)، ئاماژەیە بەوە کە لێدانەکە نابێ وابێ، ئازارەکە لە پێستەوە بگوازرێتەوە بۆ گۆشت، واتە: وا نەبێ کە پێستەکەشی بریندار بکات و، بیگەیەنێتە گۆشتەکەشی، چونکە ئامانج ئەوە نیە ئەو مرۆڤە بفەوتێندرێ، ئامانج ئەوەیە: ئازار بدرێ و لەو خراپەیەی کردوویەتی، بسڵەمێتەوەو، جارێکی دیکە دووبارەی نەکاتەوەو، خەڵکی دیکەش پێی عیبرەت گرتوو بێ.

**تەوەرەی حەوتەم: ئایا لە هەموو شوێنێك، ئەو سزایە جێ بەجێ دەکرێ؟!**

ئایا سزای قەمچیی لێدان، لە هەر وڵاتێك بێ جێبەجێ دەکرێ؟ زانایان لەو بارەوە ڕاجییان هەیە، زۆربەیان کە (مالك، والشافِعي، وأحمد، وأبو ثور، وابن المنذر)ن و، هی دیکەش، دەڵێن: شوێنی مسوڵماننشین و، شوێنی نامسوڵماننشین، لە جێ بەجێکرانی ئەو سزایەدا یەکسانن، کە ئەوان پێیان گوتوون: (دَارُ الحَرْب) و (دَارُ الإِسْلَام)، بەڵام ئێستا ئەو دابەشکردنەی جیهان بەو شێوەیە نەماوەو، ئەوە بۆ کاتی خۆی بووە، ئێستا نابێ شوێنێك کە مسوڵماننشینەو، کۆمەڵێك لە حوکمڕانانی خۆسەپێن، خۆیان بەسەر مسوڵماناندا سەپاندوە، پێی بگوترێ:

---

(١ ) التحرير والتنوير: ج١٨، ص١٤٧.

(دارُ الإسلام)، چونکە ئیسلامی لێ جێبەجێ ناکرێ، مەگەر تەوەندەی زەرەری بۆ پەزەکانی وان نەبێ! هەروەها لەو شوێنەش کە جاران پێی گوتراوە: (دارُ الحَرْب)و بەشێك مسولّمانانی تێدا بوون، ئێستا بە (دارُ الحَرْب) دانانرێ، چونکە بۆ مسولّمانانێکی زۆر، ئەوێ بۆتە پەناو شوێنی حەوانەوەو، ولّاتەکانی خۆیانیان لێ بوون بە (دارُ الحَرْبْ) و (دارُ الخَوْف)، وە ئەو ولّاتانەیان بۆ بوون بە (دارُ الأمْنُ) و (دار الأمان)! کەواتە: دەبێ ئەوە چاوی پێدا بگێردرێتەوە، کاتێ خۆی بەو شێوەیە دنیا دابەشکراوە، لەبەر رۆشنایی واقیعی سیاسیی ئەو کاتەدا، بەڵام ئێستا دنیا بە جۆرێکی دیکە گۆڕاوە، ئنجا ئەو زانایانە دەڵێن: (شوێنی مسولّماننشین و، شوێنی نامسولّماننشین، من ئەو تەعبیرە بەکاردێنم ئەگەرنا ئەوان گوتوویانە:) (دارُ الحَرْب)و (دارُ الإسْلام)، یەکسانن، واتە: لە هەمووی ئەو سزایە وەك یەك جێ بەجێ دەکرێ، مسولّمانێك لە شوێنێکی نامسولّماننشینیش دا زینا بکات، سزا دەدرێ و، لە شوێنی مسولّماننشینیش دا بە هەمان شێوە.

بەڵام حەنەفییەکان دەڵێن: وانیە، ئەگەر مسولّمانێك لە شوێنێکی نامسولّماننشین دا زینای کرد، دوایی چووە شوێنێکی مسولّماننشین، لەوێ سزا نادرێ، چونکە ئەو زینایە لە شوێنێکدا بووە، کە دەسەڵاتی پێشەوای مسولّمانانی بەسەردا نەبووە.

کە ئێستا حوکمڕانانی مسولّمانان، لە ولّاتی مسولّمانانیشدا هیچ نین، بەس بەسەر مسولّمانە بێ چارەو چەوساوەکاندا زاڵن، ئەگەرنا گوێیان بە دەستی زلهێزانەوەیە، دەوڵەتانی کەنداوو ئەو دەوڵەتانەی کە مسولّمانانیان تێدان بە چەوساوەیی، حوکمڕانەکانیان هەموویان گوێیان بە دەست زلهێزەکانەوەیە[1]!.

---

(١) التفسير المنير: ج٩، ص ٤٧٩، د. وهبة الزُحيلي.

## تەوەرەی هەشتەم: سەد قەمچیی سزای تێکڕای زیناکارانە:

هەرچەندە زۆربەی هەرە زۆری زانایانی ئیسلام لە ڕابردوودا بە تایبەت، ئێستاش دەتوانین بڵێین: زۆربەیان، ڕایان وایە، کە سزای سەد قەمچیی، تەنیا هی کوڕو کچی زیناکارە، (﴿ مِائَةَ جَلْدَةٍ ﴾، (عُقُوبَةُ البِكْرَيْن))، واتە: کوڕێك و کچێك کە هاوسەرگیرییان نەکردبێ، ئەگەرنا ژن و پیاو کە هاوسەرگیرییان کردبێ، ئنجا چ ئێستا لە حاڵەتی هاوسەرگیریی دا مابن، چ ژنەکە لە مێردی جیابووبێتەوە، یان مردبێ، یان پیاوەکە لە ژنەکەی جیابووبێتەوە، یان مردبێ، ژن و پیاو کە هاوسەرگیرییان کردبێ، سزاکەیان بریتیە لە بەردبارانکردن (الرَّجْم)، هەتا مردن.

هەندێکیشیان وێڕای بەرد بارانکردنەکە، سەد قەمچییەکەش هەر زیاد دەکەن، هەروەها بۆ کوڕو کچیش، کە زینایان کردبێ وێڕای سەد قەمچییەکە، ساڵێك دوور خستنەوە (تَبْعِيدُ عَامٍ، نَفْيُ عَامٍ)ش، زیاد دەکەن.

بەڵام من پێم وایە: سزای زیناکاران بە گشتیی تەنیا سەد قەمچییە، وەك ئایەتەکە زۆر بە ڕوونیی فەرموویەتی: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ﴾، ئافرەتی زیناکارو پیاوی زیناکار هەر کامیان سەد قەمچییان لێبدەن، خوا ﷻ بە گشتیی فەرموویەتی، وەك دوایی ڕوونی دەکەینەوە، هەڵبەتە ئەوە ڕای بەندەیەو، دەشزانم کاتی خۆی خەواریج ڕایان وابووەو، لەم ڕۆژگاری خۆشماندا، کۆمەڵێك لە زانایان، چ ئەوانەی کۆچی دواییان کردوە ژمارەیەکیان، چ ئەوانەی کە ئێستا هەن لە ژیاندا، ئەو ڕایەیان هەیە، بەڵام وەك لە سەرەتاوە گوتم: ئێستاش لەگەڵبێ، زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە سەد قەمچیی تەنیا سزای پیاوێکە کە هاوسەرگیریی نەکردبێ و، هی ئافرەتێکە کە هاوسەرگیریی نەکردبێ، ئەگەرنا لە دوای هاوسەرگیریی، هەر کەسێك زینا بکات، سزایەکەی بریتیە لە بەردبارنکردن تاکو مردن، وەك ئەمانەتی عیلمیی، دەبێ ئەوە بگوترێ.

بەڵام ئایا بۆچی من قەناعەتم وایە کە: پیاوان و ئافرەتان، چ هاوسەرگیرییان کردبێ، چ هاوسەرگیرییان نەکردبێ، ئەگەر ئەو گوناهەیان کرد، سزایەکەیان تەنیا سەد قەمچییە؟.

دەڵێم:

سەرەتا لەبەر ڕواڵەتی ئایەتەکە کە وا دەگەیەنێ، پاشان لەبەر چەند بەڵگەیەکی دیکە.

من ئەم تەوەری هەشتەمە، لە شەش (٦) بڕگەدا دەتوێژمەوە، بۆ ئەوەی بە تەواویی تیشك بخەمە سەر ئەوە: بۆچی من ئەو ڕایەم پێ ڕاستە؟ ناشڵێم ئەو ڕایەم لە خۆمەوە پەیدا کردوە، دەزانم کاتی خۆی ئەوە ڕای خەواریج بووەو، هەندێك لە زانایانی ئیسلامیش لە مێژوودا ڕایەکی وایان هەبووەو، هی هاوچەرخیش کەمێکیان ڕای وایان هەیە:

## بڕگەی یەکەم: سزای بەردبارانکردن (الرَّجْم) لە سوننەت دا:

با وا نەزاندرێ من نکووڵیی لەوە دەکەم، کە سزای بەرد بارانکردن لە ڕێبازی پێغەمبەردا ﷺ جێبەجێ نەکراوە، با، لە دەقەکانی سوونەتدا باسی ڕەجم کردن هاتوە، واتە: بەرد بارانکردنی ژن و پیاوی هاوسەردار (الثَّيِّبَيْن)، کە دەبێ بەرد باران بکرێن و، هەندێکیش بەرد باران کراون، کە دوایی ئاماژە بە هەندێك لەو دەقانە دەکەین، کەواتە: کە دەڵێم: ئێستا سزای سەد قەمچیی بریتیە لە سزای پیاوو ئافرەتی زیناکار، هاوسەرداربن یان بێ هاوسەر، لەسەر ئەوە بنیاتی نانێم، کە نکووڵیی بکەم لەو دەقانەی سوننەت کە لەو بارەوە هاتوون، بەڵام وەڵامیان چییە؟ ئەوە دوایی باسی دەکەم، ئێستا با ئاماژە بە چەند دەقێك بکەین:

١)- یەك لەو دەقانە کە بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ کە پێغەمبەر ﷺ سزای بەرد بارانکردنی بەسەر ئافرەت و پیاوێك دا، کە هاوسەردار بووبن، زینایان کردبێ، چەسپاندوە، ئەم دەقەیە:

{جَاءَ مَاعِزُ بْنُ مَالِكٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! طَهِّرْنِي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: « وَيْحَكَ، ارْجِعْ فَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ وَتُبْ إِلَيْهِ » قَالَ: فَرَجَعَ غَيْرَ بَعِيدٍ، ثُمَّ جَاءَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ طَهِّرْنِي، فَقَالَ النَّبِيُّ عَلَيْهِ السَّلَامُ: مِثْلَ ذَلِكَ، حَتَّى كَانَتِ الرَّابِعَةُ، قَالَ لَهُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: « مِمَّا أُطَهِّرُكَ؟ » فَقَالَ: مِنَ الزِّنَا، فَسَأَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « أَبِهِ جُنُونٌ؟ » فَأُخْبِرَ أَنَّهُ لَيْسَ بِمَجْنُونٍ، فَقَالَ: « أَشَرِبَ خَمْرًا؟ » فَقَامَ رَجُلٌ: فَاسْتَنْكَهَهُ، فَلَمْ يَجِدْ مِنْهُ رِيحَ خَمْرٍ، قَالَ: فَقَالَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « أَزَنَيْتَ أَنْتَ؟ » فَقَالَ: نَعَمْ، فَأَمَرَ بِهِ فَرُجِمَ}(أخرجه مسلم: ١٣١٩).

واتە: ماعیزی کوڕی مالیك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ، پاکم بکەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێ قەزا بی، ((وَيْحَكَ))، (یانی: بێ قەزا بی، یان وەك دەڵێن: ماڵ خراپ)، داوای لێبوردن لە خوا بکەو بۆ لای بگەڕێوە، دەڵێ: تۆزێ دوورکەوتەوە، زۆرنا، دوایی هاتەوە، دووبارە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پاکم بکەوە! دووبارە فەرمووی: داوای لێبوردن لە خوا بکەو بۆ لای بگەڕێوە، پەشێمان بەوە، دیسان تۆزێك کشایەوە، هەتا لە جاری چوارەمدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە چی پاکت بکەمەوە؟ گوتی: لە زینا، پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەڵکەکەی پرسی، ئایا حاڵەتی شێتیی هەیە؟ هەواڵی پێدرا، نەخێر شێت نیە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا شەڕابی خواردۆتەوە (بەسەر خۆشیی قسان بکات)، پیاوێك هەڵسا بۆنی زاری کرد، بۆنی مەی لە زار نەکرد، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: تۆ زینات کردوە؟ گوتی: بەڵێ، ئیدی فەرمانی کرد، بەردباران کرا.

٢)- هەر هەمان بەسەرهاتیش بە هەمان شێوە، لە ئافرەتێك کە لە کتێبەکانی سوننەتدا بە (إِمْرَأَةٌ مِنْ غَامِدِي مِنَ الأَزْدِ)، هەمان بەسەرهات گێردراوەتەوە، کە ژنەکە تۆلدار (حامل) بووەو پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتەوە، تاکو منداڵەکەی بووەو، دوایی پیاوێك لە پشتیوانان شیرپێدان (إِرْضَاعِ)ی منداڵەکەی بە ئەستۆوە گرتوە، ئنجا بەرد باران کراوە. (أخرجه مسلم: ١٣٢٣).

٣)- [عَنْ عَلِيٌّ بِنْ أَبِي طَالِب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، حِينَ رَجَمَ المَرْأَةَ، ضَرَبها يَوْمَ الخَمِيْسِ، وَرَجَمَهَا يَوْمَ الجُمُعَةِ، وَقَالَ: جَلَدْتُهَا بِكِتَاب الله، وَرَجَمْتُهَا بِسُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ](أخرجه البخاري: ٦٨١٢، وأحمد: ٧١٦).

واتــە: لــە عەلــی کــوڕی ئەبــوو تاڵیبــەوە، (خــوا لێــی ڕازی بــێ)، (خەلیفــەی چوارەمــی پێغەمبــەر ﷺ) هاتــوە، کــە ئافرەتێــك زینــای کــردوە، (بــۆ خــۆی دانــی پێداهێنــاوە)، کاتێـك سـزای داوە، ڕۆژی پێنـج شـەممە سـەد قەمچیی لێـداوەو، ڕۆژی جومعــەش بــەرد بارانــی کــردوەو، گوتوویەتــی: بــە کتێبــی خــوا ســەد قەمچییەکــەم لێـداوە (لەبـەر ئـەوەی لـە کتێبـی خـوادا بـەس باسـی سـەد قەمچییەکـە کـراوە)و بــەرد بارانیشــم کــردوە بــە ســوننەتی پێغەمبــەری خــوا ﷺ.

٤)- هەروەها پێغەمبەر ﷺ بڕیاری ڕەجم کردنی ژن و پیاوێکی جوولەکەی داوە، کاتێك بۆ دادوەریی چوونە خزمەتی. (أخرجه البخاري: ٣٦٣٥، ومسلم: ١٦٩٩ عن ابن عمر).

ئەم چوار دەقەم وەك نموونە هێنانەوە، ئەگەرنا دەقی دیکەش هەن.

کەواتــە: لــە ڕێبــازی پێغەمبــەردا ﷺ بــەرد بارانکــردن (رجــم) چەســپاوە، بــەڵام ئــەو فەرموودانــە هیچیــان موتەواتیــر نیــن، تاکــو دڵنیایــی (یقــین) بکەیەنــن، بەڵکــو فەرمــوودەی جــۆری (آحــاد)ن و، زانایانیــش هەمــوو، یــان زۆربــەی هــەرە زۆریــان لەســەر ئــەوە یەکدەنگــن کــە حوکمــە شــەرعییەکان لــە فەرمــوودەی (آحــاد)، (واتــە: ئـەو فەرموودانـەی کـە یەکێـك لـە هـاوەڵان یـان چەنـد کەسـێکیان گێڕاویاننـەوە، بـا ئەگەبیێتــە ڕاددەی تەواتوریــش، حوکمــە شــەرعییەکان وەردەگیرێــن.

کەواتــە: لــە ســوننەتدا چەســپاوە کــە پێغەمبــەر ﷺ ســزای پیــاوو ئافرەتــی هاوســەرداری زینــاکاری داوە بــە بــەرد بارانکــردن (رجــم)، کــە ئەمــەش وەڵام و ڕوونکردنــەوەی خــۆی هەیــەو، دوایــی باســی دەکەیــن، بــەڵام بــا جــارێ بەڵگەکانــی ئــەو ڕایــەی کــە دەڵــێ: ســزای زینــاکاران بــە گشــتیی ســەد (١٠٠) قەمچییــە بخەینــە ڕوو:

**بڕگەی دووەم: بەڵگەکانی ئەو ڕایەی دەڵێ: سزای زیناکاران بە گشتیی سەد قەمچییە.**

**پێنج بەڵگان لەو بارەوە دێنینەوە:**

بەڵگەی یەکەم: ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ﴾النور، هەر ئافرەتێك كە زینای كردوەو، هەر پیاوێك كە زینای كردوە، یەكی سەد قەمچییان لێ بدەن.

لە زمانی عەرەبییدا ئەم ڕێژگەی: (ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى) كە هەردووكیان ناوی بكەر (**إسم فاعل**)ن و، (**ال**)ی ناساندنیان لەسەرەو مانای جینس دەگەیەنن، یانی: هەر ئافرەتێك كە زینا دەكات و، هەر پیاوێك كە زینا دەكات، یەكی سەد قەمچییان لێ بدەن، چونكە لە زمانی عەرەبییدا (**إسم فاعل**)ێك كە (**ال**)ی (**تعریف**)ی لەسەر بێت، واتاكەی گشتییەو هەموو تاكەكانی دەگەیەنێ، بەبێ هەڵاواردن، هەر دەقێكیش واتایەكی گشتیی هەبێ، دەبێ واتا گشتییەكەی وەربگیرێ، مادام بەڵگەیەك نەبێ كە واتایەكەی تایبەت بكات، بە هەندێك لە تاكەكانیەوە، ئەوە بە نسبەت خودی ئایەتەكەوە.

ئەدی ئایا چۆن پێغەمبەر ﷺ، سزای ڕەجمی چەسپاندوە، بەسەر ئافرەت و پیاوی هاوسەرداردا؟

لە وەڵام دا دەگوترێ: پێغەمبەری خوا ﷺ - هەڵبەتە دوایی زیاتر ڕوونی دەكەینەوە - ئیجتیهادی كردوە، ئیجتهادەكەشی بینا كردوە لەسەر پشت بەستن بە شەریعەتی جوولەكەكان لە تەوراتدا، هەروەها عورف و باوی كۆمەڵگاكەی و، ڕەچاو كردنی بەرژەوەندیی لە چوارچێوەی سیاسەتی شەرعییدا، بۆیە ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ كردوویەتی، بە ئیجتیهادی خۆی، واتای گشتیی ئایەتەكە تایبەت (**تخصیص**) ناكات.

بەڵگەی دووەم: لەسەر ئەوە کە سزای پیاو و ئافرەتی هاوسەردار، کە هەر دەبێ سەد قەمچیی بێ، هاوسەردار بن، یان نا، ئایەتی (٢٥)ی سوورەتی (النساء)ە، کە خوا ﷻ لەوێدا باسی ئەو پیاوانە دەکات کە توانای ئەوەیان نیە، هاوسەرگیریی بکەن لەگەڵ ئافرەتانی ئازاددا، کاتی خۆی ئافرەتانی کۆیلە (کەنیزەك) هەبوون، کە ئاسانتر پیاو توانیویەتی هاوسەرگیریان لەگەڵدا بکات، مەسرەفیان و مارەییان کەمتر بووە، لەو بارەوە خوا دەفەرموێ:

﴿ وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ مُحْصَنَٰتٍ غَيْرَ مُسَٰفِحَٰتٍ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍ ۚ فَإِذَآ أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَٰحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى ٱلْمُحْصَنَٰتِ مِنَ ٱلْعَذَابِ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِىَ ٱلْعَنَتَ مِنكُمْ ﴿٢٥﴾ ﴾.

ئەوەی جێی مەبەستە ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ئافرەتانی کەنیزەك ﴿ فَإِذَآ أُحْصِنَّ ﴾، هەر کات هاوسەردار بوون، واتە: کەنیزەکێك کە پیاوێك دەیهێنێ و هاوسەرگیریی لەگەڵدا دەکات، ﴿ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَٰحِشَةٍ ﴾، ئەگەر فاحیشەیەکیان ئەنجامدا، واتە: زینایان کرد، ﴿ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى ٱلْمُحْصَنَٰتِ مِنَ ٱلْعَذَابِ ﴾، ئەوە نیوەی ئەو سزایەی لەسەر ئافرەتانی ئازادە، لەسەر ئەوانە!

ئنجا نیوەی ئەو ئازارەی کە لەسەر ئافرەتانی ئازادە، دەبێ بڵێین: پەنجا قەمچییە، ئافرەتانی ئازاد سەد قەمچییان لەسەرە، ئەگەر زینا بکەن، کەواتە: کەنیزەکیش پەنجا قەمچیی، بەڵام ئەگەر بگوترێ: ئافرەتی هاوسەردار، سزایەکەی بەرد بارانکردنە، بەرد بارانکردن چۆن دەکرێتە نیوە؟! مردن هەر مردنە، نیوە مردن و مردنی تەواو نیە!!.

کەواتە: ﴿ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ﴾، یانی: ئافرەتانی ئازاد، ئافرەتانی ئازاد دیسان لێرەش (أل)ی ناساندنی لەسەرە، کە مانای تێکڕا (جنس) دەگەیەنێ، واتە:

ئافرەتانی ئازاد چ هاوسەردار بن، چ بێ هاوسەر، سزایەکەیان، ئازارەکەیان هەر سەد قەمچییەو، سەد قەمچییش دەگونجێ (تَنْصِيف) بکرێ، بکرێتە نیوە، کە نیوەکەی پەنجایە، بەڵام ئەگەر گریمان ئافرەتانی هاوسەردار سزایەکەیان بەرد بارانکردن (رجم) بووایە، ئەو کاتە ڕەجم (تَنْصِيف) ناکرێ، ناکرێتە نیوە.

بەڵگەی سێیەم: لە سوورەتی (النور)، لە ئایەتی (٨)دا لە باسی (لِعَان)و (مُلاَعَنَةَ)ی نێوان ژن و مێرددا، پیاوێك کە ژنەکەی خۆی تۆمەتبار دەکات بەوە کە زینای کردووەو، ناشتوانێ چوار شایەدان بێنێ، دەڵێ: ئەو ژنەم زینای کردوە، شەریعەت چارەسەرێکی بۆ داناوە، کە بریتیە لەوەی پێکەوە نەفرین لە خۆیان بکەن، ئەگەر درۆ بکەن، ئنجا لەوێدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ ﴿٨﴾ ﴾النور، واتە: سزای ئازاردان لەو ئافرەتە دوور دەخرێتەوە، بە چی؟ ﴿ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَـٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلْخَـٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾، دوای ئەوەی کە پیاوەکە چوار جاران شایەدیی دەداو دەڵێ: شایەدیی دەدەم (أَشْهَدُ بِاللهِ)، کە ئەو ژنەی خۆی، زینای کردووەو، جاری پێنجەم دەڵێ: نەفرینی خوای لێبێ ئەگەر درۆ بکات، ئەو کاتە تۆپ دەچێتە ساحەی ئافرەتەکەوەو، ئەگەر ئافرەتەکە وەڵام نەداتەوەو، دانی پێدا بێنێ، سزا دەدرێ، بەڵام ئەگەر وەڵام بداتەوە، ئەویش دەبێ چوار جاران شایەدیی بدا بڵێ: شایەدیی دەدەم (أَشْهَدُ بِاللهِ)، ئەو پیاوە ڕاست ناکات و درۆ دەکات، کە ئەو تۆمەتە دەداتە پاڵ من، جاری پێنجەم بڵێ: تووڕەیی خوا لەسەر من بێ، ئەگەر ڕاست بکات.

ئنجا لێرەدا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ ﴾، ئەو ئافرەتە ئازاری لێ دوور دەخرێتەوە، ئەگەر ئەو پێنج جار شایەدییانە بدات، نافەرموێ: مردنی لێ دوور دەخاتەوە (بەرد بارانکران) (وَيَدْرَؤُا عَنْهَا المَوْتَ أي: الرَّجْمَ)، بەڵکو دەفەرموێ: (ٱلْعَذَابَ)، یانی: ئازاردان، سزادان، ئنجا هەر لە قورئاندا ئەم تەعبیرەی مردن لێ وەدوورخستن هاتوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (آل عمران) لە ئایەتی (١٦٨)

دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ وَقَعَدُواْ لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلۡ فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾، واتـە: ئەوانـەی کـە بـە برایەکانـی خۆیانیـان گـوت و خۆشـیان دانیشـتن، ئەگـەر بـە قسـەی ئێمەیـان کردبایـە، نەچووبـان بـۆ جەنـگ و جیهـاد، نەدەکـوژران، بڵـێ: ئەگـەر لـە ڕاسـتانن، مـردن لـە خۆتـان دوور بخەنـەوە، کەواتـە: ﴿ فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ ﴾، ئـەم تەعبیـرە لـە قورئانـدا هاتـوە، ئـەدی بۆچـی خـوا ﷻ نەیفەرمـوە: (وَيـدْرَؤُا عَنْهـا المَـوْتَ)، یـان (وَيـدْرَؤُا عَنْهـا الرَّجْـمَ)، بەڵکـو فەرموویەتـی: ﴿ وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ ﴾، ئـازاردان لـەو ئافرەتـە دوور دەخاتـەوە، ئەگـەر ئەویـش بـەو شـێوەیەی ئـەو شـایەدییە بـدات، کەواتـە: سـزایەکە هـەر ئازاردانەکەیـە، کـە سـەد قەمچییەکەیـە، نـەك بـەرد بارانکردنەکـە کـە مردنـە، ئەگەرنـا خـوا ﷻ ئـەو تەعبیـرەی بەکاردەهێنـا.

هەروەهـا وشـەی (ٱلۡعَذَابَ)، لـە ئایـەتی ژمـارە (٤)دا، هەمـان وشـەی (ٱلۡعَذَابَ)ی ئایەتـی ژمـارە (٢)ی سـوورەتی (النـور)ە کـە سـەد قەمچییەکەیـە، چونکـە لەوێـش دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖۖ وَلَا تَأۡخُذۡكُم بِهِمَا رَأۡفَةٞ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ وَلۡيَشۡهَدۡ عَذَابَهُمَا ﴾، وشـەی: (عَذَابَهُمَا) واتـە: ئازاردانەکەیـان، لەوێـش کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ ﴾، هـەر هەمـان شـتە، هەروەهـا لـە ئایەتـی (٢٥)ی سـوورەتی (النساء)یشـدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَعَلَيۡهِنَّ نِصۡفُ مَا عَلَى ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ ﴾، ئـازاردان هەمـووی هـەر ئازاردانـە، هەمووشـی بریتیـە لـە سـەد قەمچییەکـە.

بەڵگـەی چـوارەم: [عَـنْ أَبِي إِسْـحَقَ الشَّـيْبَانِيِّ قَـالَ سَـأَلْتُ عَبْـدَ اللَّـهِ بْـنَ أَبِي أَوْفَى: هَـلْ رَجَـمَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ؟ قَـالَ نَعَـمْ، قَـالَ قُلْـتُ: بَعْـدَ مَـا أُنْزِلَـتْ سُـورَةُ النُّـورِ، أَمْ قَبْلَهَـا؟ قَـالَ: لَا أَدْرِي] (أخرجـه البخـاري: ٦٨١٣، ومسـلم: ١٧٠٢).

واتـە: ئەبـوو ئیسـحاقی شـەیبانیی دەڵـێ: لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی ئەبـی ئەوفـام پرسـی (کـە یەکێکـە لـە هاوەڵانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)): ئایـا پێغەمبـەری خـوا ﷺ زینـاکاری ڕەجـم کـردوە (بەردبـاران کـردوە)؟، (واتـە: پیـاوو

نافرەتی هاوسەردار)، گوتی: بەڵێ، گوتم: پاش دابەزینی سوورەتی (النور) بوو، یان پێشێ؟ گوتی: نازانم.

ئنجا ئەمە لێی وەردەگیرێ کە بابای پرسیارکەر ویستوویەتی بزانێ: ئایا ئەو سەد قەمچییە، نەسخ کەرەوەی سزای بەردبارانکردنە؟ یاخود سزای بەردبارانکردن تایبەتکەری سزای گشتیی سەد قەمچییە، (مُخَصِّصٌ لعُمُومِ الجَلْدِ)؟!، کە ئەو جەڵدە تایبەت بکات بە پیاوانێك و ئافرەتانێکی بێ هاوسەرەوە.

کەواتە: ئەو پرسیارە لە نێو زانایانی هاوەڵان و لە جیلی تابیعینیشدا بووە، چونکە هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەو سزادانی پێغەمبەر ﷺ بۆ پیاوو ئافرەتی هاوسەرداری زیناکار بە بەردبارانکردن، پێش دابەزینی سوورەتی (النور) بووە، کە وەك گوتمان: زۆربەی زانایان دەڵێن: سوورەتی (النور)، لە ساڵی شەشەمی کۆچیی دا دابەزیوە، کەواتە: ئەو بەرد بارانکردنە، پێش ساڵی شەشەمی کۆچیی جێبەجێ کراوە، بەڵام کە سوورەتی (النور)، دابەزیوە، خوا ڕایگەندوە: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖ ﴾، هەموو ئافرەتانی زیناکارو پیاوانی زیناکار هاوسەرداربن، یان بێ هاوسەر، یەکی سەد قەمچییان لێ بدەن.

کەواتە: ئەوەی پێشتر پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی بە ئیجتهادو بۆچوونی خۆی، نەسخ کراوەتەوەو، ئایەتەکە ئەو حوکمەی گۆڕیوە.

بەڵگەی پێنجەم: خوای زاناو توانا سەرجەم سزا شەرعییەکانی باسکردوون، تەنانەت باسی هەشتا قەمچیی بوختان کردنیشی کردوە، هەشتا قەمچیی بۆ کەسێك کە بوختان بە کەسێك دەکات، بوختانی داوێن پیسیی و، ناشتوانێ بە چوار شایەدان ئیسپاتی بکات، هەروەها باسی سزای دەستبڕینی دزیشی کردوە، ئنجا بە پێی عەقڵ و لۆژیك، ژن و پیاوی هاوسەرداری زیناکار، ئەگەر سزایەکەیان ڕەجم بووایە، دەبووایە باس بکرێ، مادام لە قورئاندا باسی کەمتر لەو سزایانە کراوە، باسی هەشتا قەمچیی کراوە، باسی دەستبڕین کراوە، ئەدی

چۆن باسی خراپترین جۆری کوشتن ناکات، کە بریتییە لە بەرد بارانکردن؟!
ئەگەر ئەوە سزایەك بووایە لە شەریعەتی ئیسلامیدا و دانی پێدا هێنرابووایە، کە بمێنێ؟ بەڵێ کاتی خۆی بووەو پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی، بەڵام ئەگەر خوا ویستبای ئەو سزایە وەك یاسایەکی چەسپاوی شەریعەت کاری پێ بکرێ و بمێنێ، لە قورئاندا باسی دەکرد، چونکە شتی لەوە کەمترو بچووکتری باسکردووەو، عەقڵ و مەنتیقیش وا دەخوازێ: ئەگەر شتی گچکە باس بکرێ، دەبێ شتی لەو گەورەتر، باشتر باس بکرێ.

## بڕگەی سێیەم: وەڵامی باسکردنی سزای ڕەجم لە سوننەتدا:

پێشتریش هەروا ئاماژەیەکمان پێدا، بەڵام ئێستا وردتری دەکەینەوە، ئێمە چەند دەقێکی سوننەتمان لەو بارەوە هێنان، کە پێغەمبەری خوا ﷺ سزای بەرد بارانکردنی بەسەر پیاوان و ژنانێکی زیناکاری هاوسەرداردا چەسپاندوە، ئنجا ئایا مادام ئەو سزایە لە سوننەتدا جێ بەجێ کرابێ، چۆن دەتوانین بڵێین: بەرد بارانکردن، سزای زیناکارانی ژن و پیاوانی هاوسەردار نییە؟!

وەڵام: ئێمە وەڵامی ئەو ئیشکالە بەوە دەدەینەوە دەڵێین: سەپاندنی سزای ڕەجم لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بەسەر ژنان و پیاوانی هاوسەرگرتووی زیناکاردا، هەڵقوڵاوی ئیجتیهادو بۆچوونی خۆی بووە، چونکە بە سەرنج دانی سیرەی پێغەمبەر ﷺ دەردەکەوێ کە پێغەمبەر ﷺ جاری وابووە، ئەگەر وەحیی بۆ دانەبەزیبێ، ئیجتیهادی کردوە، کۆششی کردوە، بیری کردۆتەوە، ئنجا جاری وایە ئەگەر نەیپێکابێ، خوای پەروەردگار بۆی ڕاست کردۆتەوە، جاری واشە خوا ﷻ لێی گەڕاوەو، دوایی لەو بارەوە حوکمی شەرعیی دابەزاندوە، بە تایبەت لە بواری سیاسەتی شەرعییدا، ئەگەر تەماشای کۆی سوننەت و سیرەی پێغەمبەریش ﷺ بکەین، دەبینین: سێ بنەمای بە بناغە گرتوون لە ئیجتیهادو بۆچوونی خۆیدا، بۆ چارەسەر کردنی ئەو شتانە کە هاتوونە پێشی و لە بارەیانەوە وەحیی بۆ دانەبەزیوە:

**١)- عورف و باوی کۆمەڵگایەکەی خۆی:**

پێغەمبەر ﷺ هەندێ شتی کردوە، بە لەبەر چاوگرتنی عورف و باوی کۆمەڵگای خۆی، مادام پێی وانە بووبێ ئەو عورف و باوە لەگەڵ وەحییدا، لەگەڵ دەقێکی سوننەت یان ئایەتێکی قورئاندا تێك دەگیرێ، بۆ وێنە: با تەماشای ئەم بەسەرهاتە بکەین:

خەولەی کچی ثەعلەبە هاوسەری ئەوسی کوڕی صامیت، مێردەکەی (ظِهَار)ی لێ دەکات، پێی دەڵێ: (أَنْتِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمِّي)، تۆ بۆ من وەك پشتی دایکم وای، کە لە سەردەمی نەفامییدا هەر پیاوێك وای بە ژنەکەی گوتبایە، ئەو ژنەی لێ قەدەغە دەبوو، وەك تەڵاق وابوو، ژنەکەش (خولة بِنْتِ ثَعْلَبَة) سکاڵای خۆی دەباتە لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی دەفەرموێ: لێی قەدەغە بووی، بۆچی وا دەفەرموێ؟ دیارە ئەو کاتە ئەو عورف و باوی کۆمەڵگا وابووەو هەر کەسێ (ظِهار)ی لە ژنەکەی کردبایە، مانای وابووە لە خۆی قەدەغەی کردوە، دوو ڕیوایەتان لەو بارەوە دێنین، کە دەقی بەسەرهاتەکە دەخەنە ڕوو:

**١- (عَنْ أَبِي الْعَالِيَةِ قَالَ: إِنَّ خُوَيْلَةَ ابْنَةَ الدُّلَيجِ أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ وَعَائِشَةُ تَغْسِلُ شِقَّ رَأْسِهِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! طَالَتْ صُحْبَتِي مَعَ زَوْجِي، وَنَفَضْتُ لَهُ بَطْنِي، وَظَاهَرَ مِنِّي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «حَرُمْتِ عَلَيْهِ»، فَقَالَتْ: أَشْكُو إِلَى اللَّهِ فَاقَتِي، ثُمَّ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! طَالَتْ صُحْبَتِي، وَنَفَضْتُ لَهُ بَطْنِي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «حَرُمْتِ عَلَيْهِ»، فَجَعَلَ إِذَا قَالَ لَهَا: «حَرُمْتِ عَلَيْهِ»، هَتَفَتْ وَقَالَتْ: أَشْكُو إِلَى اللَّهِ فَاقَتِي، قَالَ: فَنَزَلَ الْوَحْيُ، وَقَدْ قَامَتْ عَائِشَةُ تَغْسِلُ شِقَّ رَأْسِهِ الآخَرَ، فَأَوْمَأَتْ إِلَيْهَا عَائِشَةُ أَنِ: اسْكُتِي، قَالَتْ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا نَزَلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ أَخَذَهُ مِثْلُ السُّبَاتِ، فَلَمَّا قُضِيَ الْوَحْيُ، قَالَ: «ادْعِي زَوْجَكِ»، فَتَلَاهَا عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ﴿١﴾ الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَائِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ الْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٢﴾ وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن**

نِسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِۦۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿٣﴾ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّاۖ فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينٗاۚ ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِۗ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤﴾﴾[1].

واتـە: ئەبـو عالیـە دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: خویلـەی کچـی دولەیـج (لێـرە ناڵـێ: ئەعلەبـە، ڕەنگـە ئـەو ناوەشـی بووبـێ، یـان نـاوی عەشـیرەتەکەی بـێ، یـان نازنـاوی بـێ)، هاتـە لای پێغەمبـەر ﷺ لـەو کاتـەدا عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، لایـەکی سـەری پێغەمبـەری ﷺ دەشـۆرد، ئـەو ئافرەتـە گوتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ، مـن ماوەیەکـی زۆرە لەگـەڵ هاوسـەرەکەم دام و نێـو سـکی خـۆم بـۆ هەڵڕشـت، (واتـە: منداڵـم لێـی بـوون)، ئێسـتاش (ظِهـار)ی لێکـردووم، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی: لێـی قەدەغـە بـووی، گوتـی: دووبـارەی کـردەوە، گوتـی: سـکاڵای خـۆم دەبەمـە لای خـواو بـێ حاڵیـی خـۆم بـە خـوا ڕادەگەیەنـم، دووبـارە گوتیـەوە: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ ماوەیەکـە لەگەڵـی دام و نێـو سـکی خـۆم بـۆ هەڵڕشـتوە، پێغەمبـەری خـواش ﷺ دووبـارە فەرمـووی: لێـی قەدەغـە بـووی، ئنجـا کاتێـك دەیفەرمـوو: لێـی قەدەغـە بـووی، دەنگـی بـەرز دەکـردو دەیگـوت: سـکاڵا دەبەمـە لای خـوا، (بـێ حاڵیـی خـۆم، سـکاڵای خـۆم بـۆ لای خـوا بـەرز دەکەمـەوە)، لـەو کاتـەدا وەحیـی دابـەزی، عائیشـەش (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، لاسـەرەکەی دیکـەی پێغەمبـەری ﷺ دەشـۆرد، ئامـاژەی کـرد بـۆ ئافرەتەکـە گوتـی: بێدەنـگ بـە، چونکـە پێغەمبـەر ﷺ کـە وەحیـی بـۆ دادەبـەزی، حاڵەتێکـی بـێ دەنگیـی و کـش و ماتیـی دایدەگـرت، هیـچ جووڵـەی نەدەمـا، ئنجا کاتێـك وەحییەکـە تـەواو بـوو، پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: مێردەکەتـم بـۆ بانـگ بکـە، مێردەکـەی بـۆ بانـگ کـرد، (ئەوسـی کـوڕی صامیـت)، پێغەمبەریـش ﷺ ئایەتەکانـی (١ -٤)ی (المجادلـة)ی بـۆ خوێندنـەوە.

---

(١) جامع البيان: ج٢٨، ص٣٢، والبيهقي في السنن الكبرى، ج٧، ص٣٨٥.

**٢- [عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: تَبَارَكَ الَّذِي وَسِعَ سَمْعُهُ كُلَّ شَيْءٍ، إِنِّي لَأَسْمَعُ كَلَامَ خَوْلَةَ بِنْتِ ثَعْلَبَةَ وَيَخْفَى عَلَيَّ بَعْضُهُ، وَهِيَ تَشْتَكِي زَوْجَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهِيَ تَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَكَلَ شَبَابِي، وَنَثَرْتُ لَهُ بَطْنِي، حَتَّى إِذَا كَبِرَتْ سِنِّي وَانْقَطَعَ وَلَدِي، ظَاهَرَ مِنِّي، اللَّهُمَّ إِنِّي أَشْكُو إِلَيْكَ، قَالَتْ: فَمَا بَرِحَتْ حَتَّى نَزَلَ جِبْرِيلُ بِهَذِهِ الآيَاتِ: ﴿ قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَـٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿١﴾ ﴾المجادلة] (أخرجه البخاري مُعلّقاً، وأحمد: ٢٤٢٤١ ، والنسائي: ٥٦٦٦، وابن ماجه: ٢٠٦٣، وقال مؤلفا الإستيعاب في بيان الأسباب: سنده صحيح).**

**واتـە: عائیشـە (دایـكی بـڕواداران) (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، دەڵـێ: بەرزیـی و بـە پێزیـی بـۆ ئـەو زاتـەی کـە بیسـتنی وی هەمـوو شـتێكی گرتۆتـەوە، (هەمـوو دەنگێـك دەبیسـتێ)، مـن لـە ماڵـێ گوێـم لـە قسـەی خەولـەی کچـی ئەعلەبـە بـوو، هەندێکـم لـێ بیسـت و هەندێکـم لـێ پەنهـان بـوو، (بـە سرکـە قسـەی لەگـەڵ پێغەمبـەردا ﷺ کـردووە، دایکـمان عائیشـەش وا دیـارە لـە سـووچێکی ژوورەکـەدا بـووە)، کـە سـکاڵای لـە مێردەکـەی خـۆی دەکـرد بـۆ لای پێغەمبـەر خـوا ﷺ، دەیگـوت: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ گەنجێتیـی منـی خـواردووە، تێـو سـکی خۆمـم بـۆ بڵاوکردۆتـەوە، (واتـە: منداڵـم لێـی بوونـە)، هەتـا کاتێك کـە کەوتوومـە تەمەنـەوە، منداڵم نەمـاوە، (چیدیکە منداڵـم نابـن)، زیهـاری لـێ کـردووم، ئـەی خوایـە! پەنـا بـۆ تـۆ دێنـم و سـکاڵای خـۆم لـە لای تـۆ دەکـەم، دەڵـێ: زۆری پـێ نەچـوو کـە جیبریـل ئـەم ئایەتانـەی دابەزانـدن.**

**ئنجـا بـا ئایەتـەکان مانـا بکەیـن، بـۆ ئـەوەی مەبەسـتەکە زیاتـر دەربکـەوێ، خـوا ﷻ سـەرەتای سـوورەتی (المجادلة)ی بـەو بۆنـەوە دابەزانـدوە، کـە ئەمـە ئایەتەکانـن:**

بسم الله الرحمن الرحيم :

**﴿ قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَـٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ يُظَـٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَـٰتِهِمْ ۖ إِنْ أُمَّهَـٰتُهُمْ إِلَّا**

ٱلَّـٰٓـِٔي وَلَدْنَهُمْۚ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ ٱلْقَوْلِ وَزُورًاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ
يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا۟ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِۦۚ
وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٣﴾ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّاۖ فَمَن لَّمْ
يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًاۚ ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِۗ وَلِلْكَٰفِرِينَ
عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾.

**واتـە:** بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، بـە دڵنیایـی خـوا قسـەی ئـەو ئافرەتـەی بیسـت، کـە مشـت و مـڕی لەگەڵ تـۆدا دەکـرد لە بـارەی هاوسـەرەکەیەوە، {کـە (**خولة بنت ثعلبة**)یـەو، هاوسەرەکەشـی (**أوس بنُ صامت**)ە}، سـکاڵای خۆیشـی بـۆ لای خـوا دەکـرد، خـواش گفتوگـۆی ئێـوەی بیسـت، بێگومـان خـوا بیسـەری بینـەرە، (ئنجا دێتـە سـەر باسـی حوکمەکـەی)، ئەوانـەی کـە لـە ئێـوە زیهـار دەکـەن لـە ژنەکانیـان، ژنەکانیـان نابنـە دایکیـان، {چونکـە هەیانبـووە گوتوویەتـی: (**أنـتِ کأمـي**)، یـان (**أنـتِ عَلَيـكَ كَظَهْـرِ أُمّـي**)}، دایکیـان هـەر ئەوانـەن کـە ئەوانیـان بـووە، (بـەو قسـەیە کـە ژنەکانیـان بـە دایکیـان دەشـوبهێنن)، قسـەیەکی خـراپ و درۆش دەکـەن، بـەڵام خـوا چاوپۆشـییکاری لێبووردەیـە، (ئەوانـەش کـە زیهـار لـە ژنەکانیـان دەکـەن، دوایـی دەگەڕێنـەوە بـۆ ئـەوەی گوتوویانـە، (دەیانـەوێ کـە دووبـارە لەگـەڵ ژنەکانیـان بگەڕێنـەوە حاڵەتـی ئاسـایی)، لەسـەریان پێویسـتە کـە گەردنێـك ئـازاد بکـەن، پێـش ئـەوەی دەسـتیان بگاتـە یـەك، (پێـش ئـەوەی پێکـەوە جووت بـن، دەبێ کۆیلەیـەك ئـازاد بکـەن)، ئـا ئەوەتـان ئامۆژگارییتـانی پـێ دەکـرێ و، خـوا بـەوەی دەیکـەن شـارەزایە، هـەر کەسـێك کۆیلەیەکـی دەسـت نەکـەوت ئـازادی بـکات، بـا دوو مانـگان لەسـەر یـەك بـەڕۆژوو بـێ، پێـش ئـەوەی دەسـتیان بگاتـە یـەك، ئەگـەر نەشـیتوانی (دوو مانـگان لەسـەر یـەك بـەڕۆژوو بـێ)، بـا خواردنـی شەسـت نـەدار بـدات، ئـەوەش تاکـو بـڕوا بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ بێنـن و، ئەوانـە سـنوورەکانی خـوان و، کافـرەکان ئازارێکـی بـە ئێشـیان هەیـە.

دوایی پێغەمبەر ﷺ لە هەندێك ڕوایەتاندا هاتوە (أوس بن الصّامت)، بانگ دەكات، دەفەرموێ: كۆیلەیەك ئازاد بكە، وەك كەفارەتی ئەو زیهارەی كە لە ژنەكەت كردوە، ئەویش دەست لە ملی دەدا، دەڵێ: بێجگە لەم گەردنەم، هیچ گەردنی دیكەم نیە، توانام نیە كۆیلە ئازاد بكەم، دەفەرموێ: باشە دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بە، ئەویش دەڵێ: ئنجا كوا توانای دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بوونم هەیە، كەوتوومە تەمەنەوەو بێتاقەتم، دەفەرموێ: كەواتە: خواردنی شەست (٦٠) نەدار بدە، دەڵێ: بڕوا بكە ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ لەم شێوەدا لە منی هەژارتری تێدا نیە، ئنجا پێغەمبەریش ﷺ پێدەكەنێ و لەو كاتەدا ئەندازەیەك خورمای بۆ دێنن، دەفەرموێ: بچۆ ئەوە بكە بە كەفارەت، بۆ ئەوەی لەو گرفتەی خۆت تێخستوە دەربازت بێ.

كەواتە: پێغەمبەر ﷺ پێشێ بە جۆرێك بڕیاری داوەو، بە ئافرەتەكەی فەرمووە: لێی قەدەغە بووی، هەرچەندە خوای پەروەردگاریش وای نەفەرمووە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ هیچ چارەسەری دیكەی پێ نەبووەو، بە پێی عورف و باوی كۆمەڵگایەكەی، ئەو مەسەلەیە ئەوە حوكمەكەی بووە، دوایی خوای پەروەردگار حوكمەكەی دابەزاندووە، كە بەڵێ ئەو ژنە بە (ظهار) حەرام بووە، بەڵام چارەسەری بەوە دەبێ، كەفارەت بدات، كەفارەتەكەش ئەوەیە: یان كۆیلەیەك ئازاد بكات، یان دوو مانگ لەسەر یەك بە ڕۆژوو بێ، یاخود خواردنی شەست نەدار بدات، مانای وایە، خوای كاربەجێ بڕیارەكەی پێغەمبەری خوای ﷺ كە گوتوویەتی: لێی قەدەغە بووی بە یەكجاریی و تەڵاقت كەوتوە بە یەكجاریی، ئەو بڕیارەی هەڵوەشاندۆتەوە، كە لەسەر بناغەی عورفی كۆمەڵگایەكەی بووە، ئەوە نموونەیەك لە بارەی بنەمای یەكەمەوە، كە پێغەمبەر ﷺ بە بناغەی گرتوە بۆ ئیجتهاد كردنی.

٢- شەرعی ئەوانەی پێشوو (شَرْعُ مَنْ قَبْلَنا)، بە تایبەتی تەورات:

وەك لەم دەقەوە دیارە، با تەماشای بكەین:

{عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ الْيَهُودَ جَاءُوا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَذَكَرُوا لَهُ أَنَّ رَجُلًا مِنْهُمْ وَامْرَأَةً زَنَيَا، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا تَجِدُونَ فِي التَّوْرَاةِ فِي شَأْنِ الزِّنَا»؟ فَقَالُوا: نَفْضَحُهُمْ وَيُجْلَدُونَ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ: كَذَبْتُمْ، إِنَّ فِيهَا الرَّجْمَ، فَأَتَوْا بِالتَّوْرَاةِ، فَنَشَرُوهَا فَجَعَلَ أَحَدُهُمْ يَدَهُ عَلَى آيَةِ الرَّجْمِ، ثُمَّ جَعَلَ يَقْرَأُ مَا قَبْلَهَا وَمَا بَعْدَهَا، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ: ارْفَعْ يَدَيْكَ، فَرَفَعَهَا فَإِذَا فِيهَا آيَةُ الرَّجْمِ، فَقَالُوا: صَدَقَ يَا مُحَمَّدُ، فِيهَا آيَةُ الرَّجْمِ، فَأَمَرَ بِهِمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَرُجِمَا}. (أخرجه مالك: ١٤٩٧، والبخاري: ٣٤٣٦، وأبو داود: ٤٤٤٦، وإبن حبان: ٣٤٣٦).

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: جوولەكەكان هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بۆیان باسكرد كە پیاوێكیان و ژنێكیان زینایان كردوە، (واتە: پیاوێكی هاوسەردارو ژنێكی هاوسەردار)، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: لە تەوراتدا لە بارەی زیناوە چیتان لە لایە؟ گوتیان: ئابڕوویان دەبەین و قەمچییان لێ دەدرێ، (یانی: سەد قەمچییان لێ دەدرێ، كەمتر یان زیاتر)، عەبدوڵڵای كوڕی سەلام (كە یەكێك بووە لە زانایانی جوولەكە مسوڵمان بوو بوو، زۆر شارەزا بوو)، گوتی: درۆ دەكەن، لە تەوراتدا سزای بەرد بارانكردن هەیە، تەوراتیان هێنا بلاویان كردەوە، (تەوراتی ئەو كاتە وەك كتێب نەبووە، بەڵكو وەك تۆمارێك بووە)، یەكێكیان دەستی لەسەر ئایەتی ڕەجم دانا (تاكو ئەوەی نووسراوە بیشارێتەوە)، ئنجا پێش ئەوەو دوای ئەوەی دەیخوێندنەوە (و دەستی لەسەر ئایەتی ڕەجم دانا بوو)، عەبدوڵڵای كوڕی سەلام گوتی: (دەستت لابەرە)، دەستت بەرز بكەوە، دەستی بەرز كردەوە، ئایەتی ڕەجم دیار بوو، دوایی جوولەكەكان دانیان پێدا هێنا، گوتیان: ئەی موحەممەد! ﷺ ڕاست دەكات، (عەبدوڵڵای كوڕی سەلام ڕاست دەكات)، ئایەتی ڕەجمی تێدایە، ئیدی پێغەمبەر

ﷺ فەرمووی: (مادام بۆ دادوەریی هاتوون بۆ لای من، هەر تەوراتەکەی خۆتان بەسەردا دەچەسپێنم و) فەرمانی کرد بەردباران کران، واتە: حوکمی تەوراتی بەسەردا جێبەجێ کردن.

ئەوەش بنەمای دووەم کە پێغەمبەر ﷺ بە بناغەی گرتوە بۆ ئیجتهاد کردنی، کە ئەوەتا سزای تەوراتی بەسەردا ئەو ژن و پیاوە جوولەکەدا جێبەجێ کردوە.

کەواتە: وەك چۆن بەسەر وانیدا جێبەجێ کردوە، پێغەمبەر ﷺ کە زانیویەتی ئەوە شەریعەتی خوایە، بەرنامەی پێش خۆمان بەرنامەیە بۆمان، (شَرْعُ مَنْ قَبْلَنَا، شَرْعٌ لَنَا)، بە هەمان شێوە هەتا ئایەتەکەی سوورەتی (النور) دابەزیوە، بەسەر مسوڵمانانیشدا جێ بەجێی کردوە، چونکە شەریعەتە پێشووەکانی پێغەمبەران، بەرنامەشن بۆ ئێمە، ئەگەر لە شەرعی ئێمەدا شتێك نەهاتبێتە خوار، کە لایبردبێ و هەڵیوەشاندبێتەوە.

٣- ئەوەی پێغەمبەر ﷺ خۆی بە بەرژەوەندیی زانیوە:

جاری وایە پێغەمبەر ﷺ ئیجتیهادی کردوە، یانی: دەقێکی بە دەستەوە نەبووە، ئنجا نە پشتی بە عورف و باوی کۆمەڵگا بەستوەو، نە پشتیشی بە شەرعی پێشتر بەستوە، بەڵکو بە عەقڵی خۆی، ئیجتیهادی کردوە، وای بە چاك زانیوە، وەك لەم دەقەوە دیارە:

(فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُبَادِرُهُمْ إِلَى الْمَاءِ، حَتَّى إِذَا جَاءَ أَدْنَى مَاءٍ مِنْ بَدْرٍ نَزَلَ بِهِ، قَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ: فَحُدِّثْتُ عَنْ رِجَالٍ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ، أَنَّهُمْ ذَكَرُوا: أَنَّ الْحُبَابَ بْنَ الْمُنْذِرِ بْنِ الْجَمُوحِ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَرَأَيْتَ هَذَا الْمَنْزِلَ، أَمَنْزِلًا أَنْزَلَكَهُ اللَّهُ لَيْسَ لَنَا أَنْ نَتَقَدَّمَهُ، وَلَا نَتَأَخَّرَ عَنْهُ، أَمْ هُوَ الرَّأْيُ وَالْحَرْبُ وَالْمَكِيدَةُ؟ قَالَ: بَلْ هُوَ الرَّأْيُ وَالْحَرْبُ وَالْمَكِيدَةُ؟ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! فَإِنَّ هَذَا لَيْسَ بِمَنْزِلٍ، فَانْهَضْ بِالنَّاسِ حَتَّى نَأْتِيَ أَدْنَى مَاءٍ مِنَ الْقَوْمِ، فَنَنْزِلَهُ، ثُمَّ نُغَوِّرُ، مَا وَرَاءَهُ مِنَ الْقُلُبِ، ثُمَّ نَبْنِي عَلَيْهِ حَوْضًا

**فَنَمْلَؤُهُ مَاءً، ثُمَّ نُقَاتِلُ الْقَوْمَ، فَنَشْرَبُ وَلاَ يَشْرَبُونَ، فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: لَقَدْ أَشَرْتَ بِالرَّأْيِ، فَنَهَضَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ وَمَنْ مَعَهُ مِنَ النَّاسِ)**[1].

(لە جەنگی بەدردا، پێش ئەوەی جەنگەکە دەست پێ بکات، باسی ئەوە دەکات) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت، کە لە پێش سوپای قورەیشییەکاندا بگاتە سەر ئاوەکە، ئاوێکی لێ بووە، هات هەتا گەیشتە دامێن ئاوەکە، (لەو شوێنەی پێی دەگوترێ: (بَدْر)، جەنگەکەش بەو ناوەوە ناونرا، بەو شوێنەوە)، ئەوێی کردە مەنزڵ، ئیبن و ئیسحاق دەڵێ: بۆم گێڕدراوەتەوە لە پیاوانێک لە بەنو سەلەمەوە، باسیان کردوە کە (الْحُبَاب بْن الْمُنْذِرِ بْنِ الْجَمُوحِ)، (یەکێک لە هاوەڵان) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئایا ئەمە مەنزڵگایەکە خوا ﷻ تۆی لێ دابەزاندوە، بۆمان نیە نە بچینە پێشتر، نە لێی دوا بکەوین، یاخود ئەوە بە بۆچوونی خۆتەو بەرژەوەندیی جەنگەو فێڵی جەنگە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵکو بۆچوونی خۆمەو، بەرژەوەندیی جەنگ و تاکتیکی جەنگیی، پێم وایە وا دەخوازێ لێرە بین، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەم مەنزڵگایە باش نیە، خەڵکەکە هەڵسێنە، با بڕۆین تاکو دەگەینە نیزیکترین ئاو لە قورەیشییەکانەوە، (کۆتا ئاو پێش ئەوەی بگاتە لای قورەیشییەکان، دیارە چەند گۆلاوێک بوون، نەک لە خوارێ بن، بچنە سەرتر)، ئێمە ئەوێ دەکەینە مەنزڵ، دوایی هەرچی ئاوی دەکەوێتە خواری ئێمەوە، گۆلاوەکان هەموویان پڕ دەکەینەوە، ئنجا ئەو گۆلاوەی سەرێ، حەوزێکی گەورەی لەسەر دروست دەکەین و پڕی دەکەین لە ئاو، لە شوێنی دیکەشەوە ئاوی بۆ دێنین، دوایی ئێمە جەنگ دەکەین لەگەڵ ئەو خەڵکەدا، ئێمە ئاومان دەبێ بیخۆینەوە، ئەوان ئاویان نابێ بیخۆنەوە (چونکە گۆلاوەکانی دیکەمان هەموو پڕکردوونەوە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆچوونەکەی تۆ تەواوە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ خۆی و خەڵکەکە هەڵسان چوون بۆ ئەو شوێنە (کە (الْحُبَابَ بْنَ الْمُنْذِرِ بْنِ الْجَمُوحِ)، دیاریی کرد بوو):

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام: ج٢، ص٢٣٥، ٢٣٦.

لێرەشدا دەبینین کە پێغەمبەر ﷺ پێشێ بۆچوونێکی هەبووە، بەڵام دوایی کە ئەو هاوەڵە، بۆی ڕوون کردۆتەوە، بۆچوونەکەی ئەوی تەبەننیی کردووەو هی خۆی واز لێهێناوە.

کەواتە: چەسپاندن و کارپێکردنی سزای ڕەجم لە لایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ هەڵقوڵاوی ئیجتیهادی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، لەسەر ئەو سێ بنەمایەی کە باسمان کردن، بە بناغەی گرتوون بۆ ئیجتیهادو بۆچوونەکانی خۆی:

١)- عورف و باوی کۆمەڵگاکەیەی.

٢)- شەریعەتی پێغەمبەرانی پێشوو، بە تایبەتی تەورات کە لەبەر دەستدا هەبووە.

٣)- بەرژەوەندییەك، کە ئەو لە وەزعەکەدا بینیویەتی.

ئەگەرنا هیچ ئایەتێکی قورئان لەو بارەوە نیەو، تاکە ئایەتێك لەو بارەوە ئایەتی (٢)ی سوورەتی (النور)ە، کە باسی سەد قەمچیی دەکات بۆ سزای کۆی زیناکاران.

**بڕگەی چوارەم: دوو ئایەتەکەی (١٥ و ١٦) سوورەتی (النساء)، باسی سزای خۆ لە یەك خشاندن (مساحقة)ی ئافرەتان و نێربازیی (لواطة)ی پیاوان دەکەن، نەك وەك زۆربەی لێکۆڵەرەوانی قورئان پێیان وابووە: باسی سزای زینا دەکەن:**

هەڵبەتە ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (النساء)دا بە درێژیی باسمان کردوە، بەڵام ئێستا با جارێ هەردوو ئایەتەکە بێنینەوە:

١)- خوا ﷻ لە ئایەتی (١٥)ی سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّٰتِي يَأْتِينَ ٱلْفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَٱسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِّنكُمْ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي ٱلْبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا ﴿١٥﴾ ﴾.

بە بۆچوونی بەندە کە دیارە لە کۆمەڵێك لە زانایانیشم وەرگرتوە، ئەم ئایەتە باسی خۆ لە یەکخشاندنی ئافرەتان دەکات و، سزای خۆ لە یەکخشاندنیان، کە (سُحاق)ی پێ دەڵێن و (مساحقة)شی پێ دەڵێن، دەفەرموێ: ئەو ژنانەتان کە فاحیشە دەکەن، (واتە: ئەو گوناهە ناقۆڵایە دەکەن، کە بریتیە لە خۆ لە یەکخشاندن و خۆ بە یەکدی ڕەحەتکردن)، چوار شایەدانیان لێ بگرن، ئەگەر شایەدییاندا، لە ماڵەکانیاندا حەپسیان بکەن، تاکو دەمرن، یاخود خوا ڕێیەکیان بۆ دەدۆزێتەوە.

٢)- ئایەتی ژمارە (١٦)ی سوورەتی (النساء)، کە بە بۆچوونی من باسی نێربازیی و سزای نێربازیی دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأْتِيَٰنِهَا مِنكُمْ فَـَٔاذُوهُمَا فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمَآ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿١٦﴾ ﴾.

واتە: ئەو دوو نێرینەشتان کە دەیکەن، (واتە: فاحیشە دەکەن، فاحیشەیەکیش لە نێوان دوو نێریناندا بێ، بریتیە لە نێربازیی)، ئازاریان بدەن، ئەگەر گەڕانەوەو خۆیان چاك کرد، وازیان لێ بێنن، بێگومان خوا تۆبە وەرگری بە بەزەییە.

وەك گوتم: من لە بەرگی سێیەمی ئەم تەفسیرە، كوردییە: (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)دا، كە تەرخان كراوە بۆ سوورەتی (النساء)، بە درێژیی باسم كردوە، كە ئەم دوو ئایەتە باسی سزای ئەو تاوانە جینسییەی نێوان ئافرەتان بە تەنیاو، پیاوان بە تەنیا دەكەن و، هیچ پەیوەندییان بە مەسەلەی سزای زیناوە نیە، وەك ڕواڵەتی ئایەتەكان بە ئاشكرا لێی دەفامرێتەوە، چونكە ئایەتی یەكەم دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ﴾، ئەو ژنانەتان كە فاحیشە دەكەن، ئاشكراشە فاحیشەیەك ژنان بە تەنێ بۆ خۆیان بیكەن، هەر ئەوەیە كە خۆلەیەكخشاندن (سحاق)و (مساحقة)ی پێدەڵێن.

هەروەها ئایەتەكەی دیكەش كە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ﴾، ئەو دوو نێرینەیەتان كە دەیكەن، (ئەو فاحیشەیە دەكەن)، بێگومان فاحیشەیەك كە دوو نێرینە دەیكەن، هەر بریتیە لە نێربازیی.

ئنجا ناگونجێ یەكەمیان بریتی بێ لە باسی زینا كردن، چونكە خوای پەروەردگار تەنیا باسی سزای ئافرەتەكان دەكات: ﴿فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ١٥﴾النساء، ئەگەر چوار شایەدتان شایەدییاندا، لە ماڵەكان دا حەپسیان بكەن، هەتا دەمرن، یاخود خوا ڕێیەكیان بۆ دەدۆزێتەوە.

باشە ئەگەر ئەو ئافرەتانە زینایان كردوەو ئەوە سزایەكەیانە، ئەدی سزای پیاوەكان؟ باسی پیاوان نیە، بەس باسی ئافرەتانە، كەواتە: ئەو گوناهە لە نێو خودی ئافرەتەكاندا دەكرێ، كە بریتیە لە خۆ لە یەكخشاندن.

هەروەها ئەوەی دووەمیشیان: ﴿وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ﴾، ئەو دوو پیاوەتان كە دەیكەن، واتە: ئەو فاحیشەیە دەكەن لە بەینی خۆیاندا، ﴿فَـَٔاذُوهُمَا﴾، ئازاریان بدەن، چۆنیان ئازار بدەن؟ سنووردار نەكراوە، ﴿فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآ﴾، ئنجا ئەگەر پەشێمان بوونەوەو خۆیان چاككرد، وازیان لێ بێنن، دیسان ئەو گوناهەش كە دوو پیاو دەیكەن، بەس نێربازییە.

کەواتە: سێ جۆرە گوناهی جینسیی هەن بە گشتیی:

أ- زینا هەیە، کە لە نێوان پیاوو ئافرەتدا دەکرێ.

ب- خۆ لە یەکدی خشاندن (**سحاق**)و (**مساحقة**) هەیە، کە لە نێوان ژناندا بە تایبەت دەکرێ.

ج- نێربازیی هەیە، کە تایبەت لە نێوان پیاواندا دەکرێ.

خواش ﷻ سێ جۆرە سزای بۆ داناون:

١- سزای زینا: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ﴾، ژنی زیناکەرو پیاوی زیناکار (هاوسەرداربن، یان بێ هاوسەر) یەکێ سەد قەمچییان لێبدەن.

٢)- سزای ئافرەتانێك کە گوناهی خۆ لە یەکخشاندن (**سحاق، مسحاقة**) دەکەن، حەپس کردنە لە ماڵەکاندا هەتا دەمرن، ئەگەر هەر بەردەوام بن، یاخود لێیان نەفامرێتەوە کە پەشێمان دەبنەوەو واز دێنن، ئەگەرنا: ﴿ أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا ﴾، خوا دەرووی خێریان لێ دەکاتەوە، ئەگەر تۆبە بکەن و پەشێمان ببنەوەو، بڕیار بدەن کە جارێکی دیکە نەگەڕێنەوە سەری.

٣)- سزای گوناهی سێیەمی جینسیی نێربازییە، بریتیە لە ئازاردان بە گشتیی، کە ئەوە تاکو ڕاددەیەك بۆ حوکمڕانان جێ هێڵدراوە، ئازار دانەکە چۆن بێ، بەڵام ناگاتە ڕاددەی کوشتن، وەك ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**هود**)دا باسی بەسەرهاتی لووطو گەلەکەی و سزای نێر بازییشمان کردووەو، ڕای زانایانیشمان لەو بارەوە هێناوە.

کەواتە: ئایەتی (١٥ و ١٦)ی سوورەتی (**النساء**)، هیچ پەیوەندییان بە زیناوە نیە، تاکو بگوترێ: ئەوە کاتی خۆی سزای زینا بە قۆناغ هاتوە، پێشێ بەو شێوەیە بووە، دوایی بۆ کوڕو کچ سەد قەمچیی هاتوەو، بۆ پیاوو ژنی هاوسەرداریش بەرد بارانکردن هاتوە!! بەڵکو دوو ئایەتی (١٥ و ١٦)ی سوورەتی (**النساء**)، هیچ پەیوەندییان بە زیناوە نیە، ئایەتی (١٥) پەیوەندیی بەو تاوانەی نێوان ئافرەتانەوە

هەیەو، ئەوەی (١٦)ش پەیوەندیی بەو تاوانەی نێوان پیاوانەوە هەیە.

وشەی (فاحشة)ش کە لەوێدا هاتوە، فاحیشە هەم بە مانای زینا لە قورئاندا هاتوە، هەم بە مانای نێربازییش هاتوە:

أ- ﴿ وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾الإسراء، واتە: توخنی زیناش مەکەون، بێگومان زۆر خراپ و ناقۆڵایەو خراپترین ڕێشە - بۆ تێرکردنی غەریزەی جنیسیی -.

ب- ﴿ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ ﴾الأعراف، واتە: ئایا ئێوە فاحیشەیەك دەکەن، کە پێش ئێوە لە جیهانییان ڕووی نەداوە، (کە نێربازییە)، کەواتە: نێربازیی و، خۆ لە یەکخشاندنی ئافرەتانیش، هەر بە فاحیشە هاتوە.

**بڕگەی پێنجەم: ئەو دەقەی کە گوایە ئایەت بووەو نەسخ کراوەتەوە، واتە: بێژەکەی نەسخ کراوەتەوە، بەڵام حوکمەکەی ماوە، ناگونجێ بە قورئان دابنرێ:**

بەڵێ ئەو دەقەی، کە دەڵێ: (الشَّيْخُ والشَّيْخةُ فارْجُمُوهُمَا ألْبَتَّةَ)، واتە: شەیخ و شەیخە بە حەتمیی بەرد بارانیان بکەن، ئەمە ناگونجێ ئایەت بێ.

بەڵام با سەرەتا ئەو دەقە گشتییە بێنین، کە ئەو دەقەی تێدایە، کە گوایە ئایەتی قورئان بووە:

{عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ لَمَّا صَدَرَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ مِنْ مِنًى أَنَاخَ بِالْأَبْطَحِ...، ثُمَّ قَدِمَ الْمَدِينَةَ فَخَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ سُنَّتْ لَكُمْ السُّنَنُ، وَفُرِضَتْ لَكُمْ الْفَرَائِضُ، وَتُرِكْتُمْ عَلَى الْوَاضِحَةِ، إِلَّا أَنْ تَضِلُّوا بِالنَّاسِ يَمِينًا، وَشِمَالًا وَضَرَبَ بِإِحْدَى يَدَيْهِ عَلَى الْأُخْرَى، ثُمَّ قَالَ إِيَّاكُمْ أَنْ تَهْلِكُوا عَنْ آيَةِ الرَّجْمِ، أَنْ يَقُولَ قَائِلٌ: لَا نَجِدُ حَدَّيْنِ

فِي كِتَابِ اللَّهِ، فَقَدْ رَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَرَجَمْنَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْلَا أَنْ يَقُولَ النَّاسُ: زَادَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فِي كِتَابِ اللَّهِ، تَعَالَى لَكَتَبْتُهَا، الشَّيْخُ وَالشَّيْخَةُ فَارْجُمُوهُمَا أَلْبَتَّةَ، فَإِنَّا قَدْ قَرَأْنَاهَا[١].

(قَالَ يَحْيَى: سَمِعْت مالكاً يَقُولُ: قَوْلُهُ: الشَّيْخُ وَالشَّيْخَةُ يَعْنِي: الثَّيِّبَ وَالثَّيِّبَةَ فَارْجُمُوهُمَا أَلْبَتَّةَ) (أخرجه البخاري: ٦٨٢٩، ومسلم: ١٦٩١، وأبو داود: ٤٤١٨).

واتە: سەعیدی کوڕی موسەییەب دەڵێ: کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ)، کە ئەو کاتە جێنیشینی پێغەمبەر ﷺ بووە، لە میناوە ڕۆیشت لە ئەبتەح حوشترەکەی یەخدا، دوای چەند قسەیەك دەڵێ، چۆوە بۆ مەدینە، وتاری بۆ خەڵکدا گوتی: ئەی خەڵکینە! سوننەتەکانتان، (واتە: ڕێبازەکانی پێغەمبەر ﷺ) بۆ ڕوونکراونەوەو، فەڕزەکانتان لەسەر پێویست کراون و، لەسەر ڕێبیەکی ڕۆشن بەجێ هێڵدراون، مەگەر خۆتان خەڵك بە لای ڕاست و چەپدا گومڕا بکەن، دەستیشی بە دەستی دادا بەو شێوەیە، (یانی: مەگەر خۆتان خەڵکی ئاوا سەر لێ بشێوێنن، ئەگەرنا ئیسلام زۆر ڕوون و ڕۆشنە)، دوایی گوتی: وریا بن، ئایەتی ڕەجم پشتگوێ مەخەن و بە هۆی ئەوەوە بفەوتێن، دوایی قسە بێژێك بڵێ: ئێمە دوو سزایان لە کتێبی خوادا نابینین، (واتە: سزای ئافرەتی زیناکاری هاوسەردارو، پیاوی زیناکاری هاوسەردار، کە بریتیە لە: بەرد بارانکردن، لە کتێبی خوادا شتی وا نابینین)، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەرد بارانی کرد، ئێمەش بەردبارانمان کردوە، (ئافرەت و پیاوی هاوسەرداری زیناکارمان بەردباران کردن)، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، لەبەر ئەوە نەبووایە کە خەڵك بڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب شتێکی لە کتێبی خوادا زیاد کردوە، ئایەتەکەم دەنووسی: {الشَّيْخُ والشَّيْخةُ فارْجُمُوهُمَا أَلْبَتَّةَ}، (الشَّيْخُ) و (والشَّيْخةُ) بە حەتمیی بەرد بارانیان بکەن، چونکە ئێمە خوێندوومانەتەوە.

---

(١) أخرجه مالك بن أنس في « المَوطأ »، كتاب الحدود أولًا، باب ما جاء في الرجم، الحديث رقم: ١٠، ص٦٨٦، ٦٨٧. ط دار الفكر ١٤٠٧ك/١٩٨٧ز.

(یحیی) - کە یەکێکە لە گێڕەرەوەکان - گوتوویەتی: گوێم لە مالیك بوو دەیگوت: (الشیخ والشیخة)، یانی: بێوە مێردو بێوە ژن، بە حەتمیی بەرد بارانیان بکەن.

بەڵام ئێمە دەڵێین: بێگومان ناگونجێ ئەو دەقە بە قورئان دابنرێ و، هیچ حوکمێك بەو بیانووەوە لەسەری بنیات بنرێ، ئەویش لەبەر حەوت بەڵگان ناگونجێ ئەو دەقە بە ئایەتێکی قورئان دابندرێ و، بەو بیانووەوە کە ئایەتێکی قورئانە، حوکمێکی شەرعیی لەسەر بنیات بنرێ:

بەڵگەی یەکەم: ئەو دەقە بە چەند شێوەیەك هاتوە:

أ)- {الشَّيْخُ والشَّيْخَةُ إِذَا زَنَيَا، فارْجُمُوهُمَا أَلْبَتَّةَ}.

ب)- {الشَّيْخُ والشَّيْخَةُ إِذَا زَنَيَا، فارْجُمُوهُمَا الْبَتَّةَ، نَكَالاً مِنَ اللهِ واللهُ عَزِيزٌ حَكِيْم}.

ج)- {الشَّيْخُ والشَّيْخةُ إِذَا زَنَيَا، فارْجُمُوهُمَا الْبَتَّةَ بِمَا قَضَيَا مِنَ اللَّذَّةَ}.

د)- {إِذَا زَنَيَا الشَّيْخُ والشَّيْخةُ، فارْجُمُوهُمَا الْبَتَّةَ بِمَا قَضَيَا مِنَ اللَّذَّةَ}.

ئەوە چوار تەعبیر، وەك لە (فتح الباري شرح صحيح البخاري)(١)، و (نيل الأوطار للشوكاني)[٢]، هاتوە.

بەڵام قورئان نابێ وابێ! ئایەتەکانی قورئان پیت و وشەکانیشیان هەموویان دیارن، بەڵام ئەو ڕستەیە لێرە بە چوار جۆرە تەعبیر هاتوە، کەواتە: ناگونجێ ئەمە قورئان بێ، چونکە بە چوار تەعبیر هاتووەو، نازانین بڵێین: کامیانەو هەمووشیان واتاکانیان لێك نیزیکن، بەڵام تەعبیرەکانیان لێك جیان.

بەڵگەی دووەم: دەڵێن: خوێندنەوەی نەسخ کراوەتەوەو، حوکمەکەی ماوەتەوە، بەڵام:

---

(١) ج١٢، ص١٤٣.

(٢) ج٧، ص١٠٢.

أ)- قورئان هیچ ئایەتێکی مەنسووخی تێدا نیە، وەك لە ڕابردوودا باسمان کردوە.

ب)- ماناو بێژە ناگونجێ لە یەك بترازێن، ناگونجێ بڵێین: بێژ (لفظ)ەکەی نەسخ کراوەتەوە، بەڵام ماناکەی ماوەتەوە، شتی وا نیە، ماناو بێژە، (لفظ ومعنی) هەر پێکەوەن و تێکهەڵکێشن و بە بێ یەك نابن.

بەڵگەی سێیەم: ڕەجم پەیوەستە بە هاوسەرگیریی (إحصان)ەوە، ئەگەر هەشبی نەك بە پیرییەوە، بەڵام لە هەر چوار تەعبیرەکاندا کە هێنامانن، هەر دەڵێ: {الشَّيْخُ والشَّيْخَةُ}، بەڵێ، دوایی یەحیا دەڵێ: گوێم لە مالیك بووە، گوتوویەتی: کە دەڵێ: {الشَّيْخُ والشَّيْخَةُ يعني: الثَّيِّبُ الثَّيِّبَةُ}، واتە: پیاوی هاوسەردارو ئافرەتی هاوسەردار، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەوەی گوایە ئایەتەکەیە، هەر دەڵێ: {الشَّيْخُ والشَّيْخَةُ}، (الشَّيْخُ)یش یانی: پیاوی بە تەمەن، (الشَّيْخَةُ)ەش، واتە: ئافرەتی بە تەمەن، ئنجا جاری وایە پیاو بە تەمەنیشە، بەڵام هاوسەرگیریی نەکردوەو، ئافرەت بە تەمەنیشە، هاوسەرگیریی نەکردوە، جاری واش هەیە پیاوو ئافرەت، گەنجیشن و هاوسەرگیرییشان کردوە.

کەواتە: سزای بەردبارانکردن، ئەگەر هەشبێ، نەبەستراوەتەوە بە تەمەنەوەو، بەستراوەتەوە بە هاوسەرگیرییەوە، بەڵام لێرەدا باسی تەمەن کراوە: {الشَّيْخُ والشَّيْخَةُ}، پیاوی پیرو ئافرەتی پیر، ئەگەر زینایان کرد، بەردبارانیان بکەن، ئنجا ئەگەر ئەو پیاوە پیرەو ئەو ئافرەتە پیرە، ئەوە هاوسەرگیریان نەکرد بوو، پیاوەکە ڕەبەن بووو مابۆوەو هاوسەرگیریی نەکرد بوو، زیناشی کرد، دەبێ بەردباران بکرێ، بە پێی ئەم قسەیە، بەڵێ دەبێ بەرد باران بکرێ، هەرچەندە هاوسەگیرییشی نەکردوە! یان ئافرەتێك کە ماوەتەوەو قەیرە کچەو کەوتۆتە تەمەنەوە، بەڵام زینا دەکات، بە پێی ئەمە بێ، دەبێ بەردباران بکرێ، کە هاوسەرگیرییشی نەکردوە! لە حاڵێکدا کە هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە سزای بەرد بارانکردن ئەگەر هەشبێ، پەیوەستە بە پیاوو ئافرەتی هاوسەردارەوە، تەمەنیان کردبێ، یان تەمەنیان نەکردبێ.

بەڵگەی چوارەم: ئەگەر ڕاستبایە عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) ئەم تەعبیرەی بە قورئان زانیبایە، دەینووسی و، ئەو کاتە نەشدەگوترا: ئایەتێکی قورئانی زیاد کردوە، چونکە ئایەتی قورئان، دەبێ بنووسرێ و نووسینیشی زیادکردن نیە لە قورئان، بەڵام گێڕراوەکە هەر ڕاست نیە لە ئەصڵداو، دەڵێین: عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) وای نەگوتوە، چونکە ئەگەر عومەر بزانێ ئایەتی قورئانە، چۆن لەبەر لۆمەی خەڵکی نایینووسێ؟! شتی وا نیە، هاوەڵانیش هەموویان ڕێزیان گرتوەو، ئەویش ئەگەر قەناعەتی وا بووایە، قەناعەتی پێ دەهێنان، ئەگەر بەڵگەی هەبووایە، ئەگەر بەڵگەشی نەبێ، عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، لەوە بە بەرزتر دەزانین، لە خۆیەوە قسەی وا بکات.

بەڵگەی پێنجەم: نەمانزانیوە عومەر سزای ڕەجمی لە ماوەی حوکمڕانیی خۆیدا جێ بەجێ کردبێ، کە دەڵێ: (رَجَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وقد رَجَمْنا)، ڕاستە لە بارەی پێغەمبەرەوە دەق هەن، بەڵام لە بارەی عومەرەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، نەزانراوە سزای بەردبارانکردنی جێ بەجێ کرد بێ.

بەڵگەی شەشەم: قورئان هەمووی بە تەواتور هاتوە، واتە: کۆمەڵێکی زۆر، لە پێغەمبەری خوایان ﷺ بیستوەو گەیاندوویانە بە کۆمەڵێکی زۆری دوای خۆیان، ئەوانیش بە کۆمەڵێکی زۆر، تاکو گەیشتوە بە ئێمە، بەڵام ئەمە دەقێکی (آحاد)ەو، تەواتور نیە، ئنجا مەرجی قورئان بوونی دەقێك، ئەوەیە کە بە تەواتور هاتبێ، بەڵام ئەوە لە ڕێی سەنەدی (آحاد)ەوە هاتوە، تاکێك، یان چەند تاکێك، کە نەگەیشتوونە ڕاددەی تەواتور، هێناویانە.

٧)- ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە پێغەمبەر ﷺ پێش عومەر ئایەتێکی قورئانی نەنووسیبێ، ئنجا شتی وا چۆن دەگونجێ! واتە: ئایەتێکی قورئان هەبووە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ نەینووسیوە، دوایی عومەریش هەر نەینووسیوە!!

ئنجا مادام نە پێغەمبەر ﷺ نووسیبێتی و، نە عومەریش نووسیبێتی و، نە هاوەڵانیش گوتبیان: دەبێ بنووسرێ، دیارە ئایەتی قورئان نیەو، هەر ڕووداوەکە هیچی ئەصڵ و بناغەی نیەو، عەقڵ و لۆژیك ڕەتی دەکاتەوە.

**بڕگەی شەشەم: ناگونجێ دەقی: {خُذُوا عَنِّي، خُذُوا عَنِّي، قَدْ جَعَلَ اللهُ لَهُنَّ سَبِيلاً..}، فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێ:**

با سەرەتا كۆی دەقەكە بێنین:

**{عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: خُذُوا عَنِّي، خُذُوا عَنِّي، قَدْ جَعَلَ اللهُ لَهُنَّ سَبِيلًا، الثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ، وَالْبِكْرُ بِالْبِكْرِ، الثَّيِّبُ جَلْدُ مِئَةٍ، ثُمَّ رَجْمٌ بِالْحِجَارَةِ، وَالْبِكْرُ جَلْدُ مِئَةٍ، وَنَفْيُ سَنَةٍ} (أخرجه أحمد: ٢٢٧١٨، ومسلم: ١٤٣٩، وأبو داود: ٤٤١٥، والترمذي: ١٤٣٤، وابن ماجه: ٢٥٥٠، وابن حبان: ٤٤٢٥).**

واتە: عوبادەی كوڕی صامیت (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لێم وەربگرن، لێم وەربگرن، خوا ڕێی بۆ دۆزینەوە، (بۆ ئەو ئافرەتانەی خوا لە بارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا ﴿١٥﴾﴾النساء)، پیاوی هاوسەردارو ئافرەتی هاوسەردارو، كوڕی گەنج و كچی گەنج (هی زیناكار) پێكەوە سزا دەدرێن، پیاوو ئافرەتی هاوسەردار یەكی سەد قەمچییان لێ دەدرێ و، دواییش بەرد باران دەكرێن (تاكو دەمرن)، كوڕو كچی (بێ هاوسەر)یش، یەكی سەد قەمچییان لێ دەدرێ و ساڵێكیش دوور دەخرێنەوە.

دەڵێین: ناگونجێ ئەم دەقە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێ، دەزانم لە هەندێك سەرچاوان دا هاتوە، بەڵام لەبەر شەش هۆكاران ناگونجێ ئەمە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ بێ، وەك لە تەفسیری سوورەتی (النساء)یشدا باسم كردوە، شایانی باسە: زۆربەی زانایان گوتوویانە: ئەم دەقە هەردووك ئایەتەكەی (١٥و ١٦)ی (النساء)ی نەسخ كردوونەوە، وەك (محمد الطاهر بن عاشور) گوتوویەتی[١].

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٨، ص ١٤٨، ١٤٩.

ئێمەش بە کورتیی دەڵێین: لەبەر ئەم شەش هۆکارە، ناگونجێ ئەو دەقە فەرمایشتی پێغەمبەر بێ:

یەك: نەسخ کرانەوەی قورئان بە سوننەت، ڕایەکی بێهێزی هەندێك لە زانایانەو، هیچ بەڵگەیەکیشیان نیە، چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمایشتی خوا نەسخ دەکاتەوە؟! پێغەمبەری خوا ﷺ پابەند (مُلْزَم) کراوە کە ئەم قورئانە مەزنە پیادە بکات، ئنجا چۆن ڕێی تێدەچێ خوا شتێکی فەرمووبێ، کەچی پێغەمبەری خوا ﷺ بفەرموێ: ئەوەی خوا فەرموویەتی، لامبرد!! لە حاڵێك دا خوای پەروەردگار، پێغەمبەری خۆی ﷺ مولزەم کردوە بەم قورئانەوە: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا۟ عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۖ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩﴾﴾الجاثية، واتە: دوایی تۆمان دانا لەسەر شەریعەتێك شوێنی بکەوەو، بە دوای ئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە نازانن، چونکە ئەوانە هیچ سوودێك بە تۆ ناگەیەنن و، ستەمکارانیش هەندێکیان دۆست و پشتیوانی هەندێکیانن و، خواش دۆست و پشتیوانی پارێزکارانە.

دوو: چۆن دەقێکی جۆری (آحاد)، (واتە: کە تاك تاکێك لە هاوەڵان گێڕاویانەتەوە)، دوو ئایەتی قورئان کە بە تەواتور پێمانگەیشتوون، نەسخ دەکەنەوە؟! ئایا دەگونجێ قسەیەك کە لە نەفەرێکەوە هاتوە، دەقێکی قورئان کە بە تەواتور بە ئێمە گەیشتوە، نەسخی بکاتەوە؟! هەرگیز ناگونجێ، چونکە دڵنیایی (يقين) بە گومان هەڵناوەشێتەوەو تەواتوریش دڵنیایی دەبەخشێ و، ئاحادیش گومانی زاڵ.

سێ: پێشتر باسمان کرد، کە ئەو دوو ئایەتە، باسی سزای خۆڵێکخشاندنی ئافرەتان (سُحاق)و، نێربازیی (لِواطَة) دەکەن، ئەو مەسەلەیەمان بە باشیی ڕوون کردەوەو، ڕواڵەتی ئایەتەکانیش هەر ئەوە دەگەیەنێ.

چوار: ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّٰتِى يَأْتِينَ ٱلْفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَٱسْتَشْهِدُوا۟ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِّنكُمْ ۖ فَإِن شَهِدُوا۟ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِى ٱلْبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلْمَوْتُ

﴿أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ١٥﴾ النساء، ئەو ئافرەتانەی کە فاحیشە دەکەن لە ئێوە، چوار شایەدانیان لێ بگرن، ئنجا ئەگەر شایەدییان لەسەر دان، لە ماڵەکاندا حەپسیان بکەن، (زیندانیان بکەن) تاکو دەمرن، یاخود خوا ڕێیەکیان بۆ دەدۆزێتەوە.

ئنجا ئایا ڕەجم کران و سەد قەمچیی لێدران، کوا دەرووی خێرە؟!

چونکە خوا دەفەرموێ: تاکو دەمرن، یان خوا دەرووی خێریان لێ دەکاتەوە، مردنەکە، ئەگەر هەر بەردەوام بن و سوور بن لەسەر ئەو تاوانەی کردوویانە، دەبێ هەر سجن بن، تاکو دەمرن، دەروولێکرانەوەکەش ئەوەیە کە خوا بیخاتە دڵیان بڵێن: پەشیمانین و جارێکی دیکە ناگەڕێینەوەو، ئەو کەسانە دڵنیا بکەنەوە کە گرتوویانن، کە حوکمڕانن، کە جارێکی دیکە ناگەڕێنەوە سەر ئەو گوناهە، ئا ئەوە دەروو لێکرانەوەیە.

ئەگەرنا کەی ئەوە دەروولێکرانەوەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ بفەرموێ: خوا دەرووی لێکردنەوە: بەرد باران دەکرێن و، یەکی سەد قەمچییشیان لێ دەدرێ، ئەوە کەی دەروو لێکرانەوەیە؟ هەر تەعبیرەکە کە بە ناوی پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە، لەگەڵ ئایەکەدا تێکدەگیرێ!

پێنج: ئەم دەقە زۆر نامۆیە بە ئایەتەکانی قورئان و دەقەکانی دیکەی سوننەت، چونکە یەکی دوو سزای قورس، بۆ هەر کام لە زیناکاری هاوسەردارو (ثَیّب)، زیناکاری بێ هاوسەر (بِکْر)، دادەنێ، کە:

یەکەمیان: سەد قەمچیی و دواییش ڕەجم کردن.

دووەمیان: سەد قەمچیی و دوورخرانەوەش.

کە ئەوە لەگەڵ قورئان و سوننەت دا، شتێکی نامۆیەو، لە شەریعەتدا یەك سزای جەستەیی هەیە، بۆ هەر خراپەو تاوانێك.

**شەش:** جێی سەرنجیشە کە زانایان و حوکمڕانان، ئەو دوو سزایەیان، مەگەر بە دەگمەن ئەگەرنا جێ بە جێ نەکردوون و، نەبیستراوە پیاوێك کە هاوسەردار بووە، ئافرەتێك کە هاوسەردار بووەو، زینای کردوە، ڕەجمیش بکرێ و سەد قەمچییشی لێ بدرێ، ئەگەر ڕەجمیان کردبێ، ڕەجمیان کردوەو تەواو، تەنانەت پێغەمبەر ﷺ خۆیشی ئەوەی ڕەجمی کردبێ، قەمچیی لێنەداوە، کەواتە: کردەوەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەم دەقەدا، کە بە فەرموودەی وی لە قەڵەم دەدرێ، تێکدەگیرێ.

**تەوەری نۆیەم: ڕاستکردنەوەی هەڵەیەکی گەورەی زۆرێك لە توێژەرەوانی قورئان، لە بارەی تەفسیری هەر سێك ئایەتی (١٩)ی (النساء) و (٣٠)ی (الأحزاب) و (١)ی (الطلاق)ەوە:**

بەڕێـــــزان!

بـە پێویسـتی دەزانـم ئاماژەیـەك بکـەم، بـۆ هەڵەیەکـی گـەورەی زۆرێـك لـە لێکۆڵەرەوانـی واتاکانـی قورئـان، کـە بریتیـە لـەوەی وشـەی: (**فَاحِشَة مبینة**)یـان بـە مانـای (زینـا)، لێکداوەتـەوە، لـەو سـێ شـوێنەدا کـە ئامـاژەم پێـدان، کـە ئـەوەش وای لێکـردوون تووشـی پینـەو پـەڕۆی سـەیر بـبن!

سـەرەتا بـا تەماشـای هەرسـێك ئایەتەکـە بکەیـن، کـە وشـەی ناوبراویـان تێـدا هاتـوە:

١)- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا۟ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا ۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا۟ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَـٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿١٩﴾ ﴾النساء.

واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! بۆتـان ڕەوان نیـە ئافرەتـان بە زۆر بـە میرات بگـرن و، ڕێشـیان لـێ مەگـرن (کـە شـوو بکەنـەوە)، بـۆ ئـەوەی هەندێـك لـەوەی

داوتاننێ، (لە مارەیی) لێیان زەوت بکەن، مەگەر گوناهێکی ئاشکرا بکەن و، بە چاکەش مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، ئنجا ئەگەر ڕقتان لە سیفەتێکیان هەڵسا، نیزیکە ڕقتان لە شتێك بێتەوەو خواش خێر (و بەرژەوەندییەکی) زۆری تێبخات.

گوتوویانە: (فاحشة مبينة)، لێرەدا مەبەست پێی زینایە، بەڵام وەك دوایی باسی دەکەم، ئەمە ناگونجێ.

٢)- ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ﴿٣٠﴾﴾الأحزاب، ئنجا ئەو ئایەتەشی لەگەڵ دا دێنین: ﴿وَمَن يَقۡنُتۡ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعۡمَلۡ صَٰلِحٗا نُّؤۡتِهَآ أَجۡرَهَا مَرَّتَيۡنِ وَأَعۡتَدۡنَا لَهَا رِزۡقٗا كَرِيمٗا ﴿٣١﴾﴾.

واتە: ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر! ﷺ هەر کامێك لە ئێوە گوناهێکی ئاشکرا بکات، سزای بۆ دوو قات دەکرێتەوەو، ئەوەش لەسەر خوا ئاسانە، هەر کام لە ئێوەش بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەی گوێڕایەڵ و ملکەچ بێ و کردەوەی باش بکات، دوو کەڕەتان (دوو هێندە) پاداشتی دەدەینەوەو، بژێوێکی پڕ ڕێزو حورمەتیشمان بۆ داناوە.

٣)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ لَا تَدۡرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا ﴿١﴾﴾الطلاق.

واتە: ئەی پێغەمبەر! ﷺ هەر کاتێ ژنانتان تەڵاقدان، لە پێش دەستی عیددەیانەوە، تەڵاقیان بدەن، (واتە: لە کاتێکدا تەڵاقیان بدەن، کە جیماعتان لەگەڵیان نەکرد بێ، یان دوای جیماع پاك بووبنەوە، ئنجا تەڵاقیان بدەن، لە سەرەتای عیددەیانەوە)، عیددەکەش بژمێرن و، پارێز لە پەروەرگارتان بکەن،

(ئەو ژنانە دوای ئەوەی تەڵاقتان دان) لە ماڵەکانی خۆیان دەریان مەکەن و، با ئەوانیش نەچنە دەرێ، مەگەر گوناهێکی ئاشکرا بکەن، ئەوانە سنوورەکانی خوان (مەیانبەزێنن)، هەر کەسێ سنوورەکانی خوا ببەزێنێ، ستەمی لە خۆی کردوە، نازانی، ڕەنگە خوا کارێکی دیکە، حاڵێکی دیکە بێنێتە پێش.

ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (النساء)یشدا، ئەو مەسەلەیەمان باسکردوە لە لاپەڕە (٢١٦ - ٢٢٠)دا. [١].

کلیلی ڕاست تێگەیشتنی ئەو سێ ئایەتەش، تێگەیشتنی وشەی: (**فاحشة مبینة**)یە، کە جیایە لە وشەی (**فاحشة**)، (**فاحشة**) بە مانای زیناو بە مانای نێربازیی دێ و، بە مانای گوناهو تاوانی دیکەش دێ.

بەڵام (**فاحشة مبینة**) واتە: یاخیبوون و دەمەوەربوونی ئافرەتێك کە تەڵاق دراوە، لەگەڵ مێردی، یان لەگەڵ کەس و کاری مێردیدا، (**فاحشة مبینة: النشوز والعِصیان وبذاءة الّلسان وغیر ذلك**)، (**فاحشة مبیِّنة**) بریتیە لە یاخیبوون و سەرپێچیی کردن و زمان شڕیی و ئەوانە.

ئنجا ئەگەر (**فاحشة مبینة**) بە زینا تێبگەین، مانای وایە:

**١)- ئایەتی یەکەم: سوورەتی (النساء) ئایەتی ژمارە (١٩)، مانایەکەی ئاوای لێ دێ: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بۆتان نیە ئافرەتەکانتان بە میرات بگرن و، بۆشتان نیە ڕێی شووکردنەوەیان لێ بگرن، دوای ئەوەی تەڵاقتان داون، تاکو هەندێك لە ماڵ و**

---

(١) شایانی باسە وێڕای ئەوەی زانایان زۆربەیان ئەو وشەیە (فاحشة مبیِّنة)یان بە هەڵە بە مانای زیناوە لێك داوەتەوە، (د. مصطفی زلـمي)یش لە کتێبەکانی خۆیدا، تووشی هەمان هەڵە بووە، بۆ وێنە لە: (مجموعة أبحاث قرآنیة)، (لا رجم في القرآن) ص: ٨٩، ط: ٢٠١٤م)، هەرچەندە یەك دوو ساڵ پێش وەفاتی پێم گوت: مامۆستا! ناگونجێ: (فاحشة مبیِّنة)، بە مانای زینا بێ و، دوایی بۆم ڕوونکردەوە و بۆشی سەلماندم، بەڵام وا دیارە نەخۆشیی و سەرقاڵیی دەرفەتی ڕاستکردنەوەی نەداوە، هەر بەو شێوەیە کە هەڵەیە، ماوەتەوە لە کتێبەکانیدا.

سامانەکەیانیان لێ بستێنن، مەگەر زینا بکەن، (ئەگەر زینا بکەن، بۆتان هەیە ماڵ و سامانیان لێ بستێنن)، ئایا مانای وا دەگونجێ؟! نەخێر.

بەڵکو مانای ڕاستی ئایەتەکە ئاوایە: ئەی بڕوادارینە! بۆتان نیە ئافرەتان بە میرات بگرن و بەشێك لە مارەییەکەشیان لێ وەربگرنەوە، مەگەر لەگەڵتان نەگونجێن زمانشڕو یاخیی بن، ئەو کاتە بۆتان هەیە دەستیان لێ هەڵبگرن و بڵێن: مارەییەکەمان بدەنەوە، کە ئەوە پێی دەگوترێ: داڕنین (خُلع)، ئەو ئافرەتە دەتوانێ خۆی داببڕێ و لە گرێبەستی ئەو پیاوە دەرباز بێ، مادام بەو پیاوە ڕازی نیە.

بەڵام ئەگەر (فاحشة مبينة)، بە مانای زینا بێ، یانی: پیاوێك بۆی نیە ژنەکەی هەندێك مارەیی، یان ماڵ و سامانی لێوەربگرێ، مەگەر زینا بکات، ئەگەر زینای کرد، بۆی هەیە لێی وەربگرێ!! بەڵام ئەوە ڕێك دژی ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ: الدَّيُّوثُ}[1]، واتە: بابای بێ غیرەت ناچێتە بە هەشت، (ديوث) یانی: کەسێك بزانێ ژنەکەی زینا دەکات و لێی بێدەنگ بێ!.

٢)- هەروەها ئایەتەکەی سوورەتی (الأحزاب) - ٣٠ -، مانای زۆر ناقۆڵای دەبێ، ئەگەر بڵێین: (فاحشة مبينة) بە مانای زینایە، کە دەفەرموێ:

ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر! ﷺ هەر کامێك لە ئێوە گوناهێکی ئاشکرا بکات، ئەوە سزای بۆ دوو قات دەکرێتەوەو، ئەوە لەلای خوا ئاسانە، بەڵام چۆن خوای پەروەردگار وشەی زینا لەگەڵ هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەردا ﷺ بەکاردێنێ؟!.

---

(١) {ثلاثة لا يدخلون الجنة: الديوث من الرجال، والرجلة من النساء، ومدمن الخمر} أخرجه الطبراني كما في الترغيب والترهيب ومجمع الزوائد، قال المنذري (٧٧/٣): رواته ليس فيهم مجروح . وقال (١٧٨/٣): رواته لا أعلم فيهم مجروحا وشواهده كثيرة، وقال الهيثمي (٣٢٧/٤): فيه مساتير، وليس فيهم من قيل إنه ضعيف. وأخرجه أيضًا: البيهقي في شعب الإيمان: ١٠٨٠٠.

بەڵكو یانی: ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر! هەر كامێك لە ئێوە، لە پێغەمبەر ﷺ یاخیی بێ و، لەگەڵی دەمەوەر بێ، سەرپێچیی لێ بكات، سزای بۆ دووقات دەكرێتەوە... بە بەڵگەی ئایەتی دوایی كە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ﴾الأحزاب، هەر كامێك لە ئێوە گوێڕایەڵ بێ بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەكەی و، كردەوەی باش بكات، دوو كەڕەت پاداشتی دەدەینەوە، گوێڕایەڵیی (قنوت) پێچەوانەی (فاحشة مبینة)یە، (فاحشة مبینة) یانی: دەمەوەریی و یاخیبوون، بەڵام گوێڕایەڵیی، پێچەوانەیەتی.

ئنجا ئەصڵی ڕووداوەكەش، هەر ئەوە بووە كە هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ بە پێغەمبەری خوایان دەگوت: دەبێ نەفەقەمان بۆ زیاد بكەی، ئەویش توانای نەبوو، ئایەتەكە لەسەر ئەوە هاتە خوار.

٣)- هەروەها ئایەتەكەی سوورەتی (الطلاق) -٢-یش، ئەگەر (فاحشة مبیِّنة) بە مانای زینا لێك بدرێتەوە، مانایەكەی ئاوای لێ دێتەوە: ئافرەتانێك كە تەڵاقتان داون، بۆتان نیە لە ماڵێ دەریانبكەن، مەگەر زینا بكەن! یانی: (ئەگەر زینا بكەن، بۆتان هەیە دەریان بكەن!! بەڵام ژنان ئەگەر زینا بكەن، دەبێ سزا بدرێن، چۆن دەبێ بەس دەربكرێن! بەڵام وەك ئێمە گوتمان، مانایەكەی ئاوای لێ دێ، ئەو ئافرەتانەی تەڵاقیان دەدەن، دەبێ هەر لە ماڵەكانتاندا بمێننەوە، مەگەر یاخیبین و دەمەوەربن و قسەتان پێ بڵێن، پرتەو بۆڵە بكەن، ئەو كاتە بۆتان هەیە بڵێن: هەقتان نیە لە ماڵدابن، مادام دەمەوەریی و یاخیبوون دەكەنە پیشە.

**تەوەری دەیەم: چەسپاندن و، ئیسپاتکردنی زینا بە دان پێداهێنان (إقرار)ی بابای زیناکار، یان چوار شایەد دەبێ:**

واتە: بۆ ئیسپاتکردن و سەلماندنی ئەوە کە فڵان پیاوە، یان فڵان ئافرەتە گوناهی داوێن پیسی ئەنجام داوەو، سزای زینای دەکەوێتە سەر، تەنیا بە دوو ڕێ دەبێ: یان دان پێداهێنانی خۆی، یاخود چوار کەس، چوار پیاو شایەدیی بدەن، هەڵبەتە چوار پیاو کە لێیان نەزانرابێ درۆزنن، یان درۆ دەکەن، شایەدیی بدەن لەسەر ئەوەی ئەو کارەیان لەو پیاوە، یان لەو ئافرەتە بینیوە.

بە نسبەت دان پێداهێنانەوە کە گوتراوە: (**الإِقْـرَارُ سَـيِّدُ الأَدلَّـة**) دان پێداهێنان گەورەی هەموو بەڵگەکانە، سەرجەم ئەو سزادانانەش کە ئیسپات بوون و، ئەنجام دراون، لەسەر زیناکردن لە مێژووی ئیسلامدا، هەموویان بە هۆی دان پێداهێنانی خاوەنەکانیانەوە ئیسپات بوون، ئەگەرنا هیچیان بە هۆی چوار شایەدانەوە ئیسپات نەبوون و، ئەوە زۆر زۆر زەحمەتە:

١)- (**الإقرار**) دان پێداهێنان، لە بارەی دان پێداهێنانەوە، فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ زۆرن، بەڵام یەکێکیان بەنموونە دەهێنینەوە، کە (بوخاریی بە ژمارە: ٢٣١٤ و ٢٣١٤، و موسلیم بە ژمارە: ١٦٩٧)، هێناویانە، کە خوڵاصەکەی ئەوەیە:

ڕۆژێك دوو پیاو دەچن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، یەکێکیان دەڵێ: کوڕی ئەو پیاوە زینای لەگەڵ هاوسەری مندا کردووەو، لە بەرانبەردا سەد سەر مەڕ لەگەڵ کەنیزەکێکیم لێستاندوە، ئێستا هاتووین دادوەرییمان لە نێواندا بکەی بە قورئان، بابی کوڕەکە شارەزاتر دەبێ لەوی دیکە، دەڵێ: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ هاتووین بە حوکمی قورئان دادوەرییمان لە نێواندا بکە: کوڕی من لە لای ئەو پیاوە کرێکار بووەو، زینای لەگەڵ ژنەکەیدا کردوە، سەد مەڕی لێستاندووم لە بەرانبەرداو، کەنیزەکێکیش، ئێستا جەنابت چی دەفەرمووی؟ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: سەد سەر مەڕەکە دەبێ بدرێتەوە بە تۆ، هەروەها

کەنیزەکەکەش بدرێتەوە بە تۆ، ئنجا بە یەکێك لە هاوەڵان کە ناوی ئونەیس دەبێ، دەفەرموێ: {یا أُنَیسُ! اغْدُو إلی امْرَأةِ هذا، فَإنِ اعْتَرَفَتْ، فَارْجُمْهَا}، ئەی ئونەیس! بچۆ بۆ لای ژنی ئەو کابرایە، ئەگەر دانی پێداهێنا، بەرد بارانی بکە، بە نسبەت کوڕەکەشەوە لەبەر ئەوەی ژنی نەبووە، (هاوسەرگیریی نەکردوە)، دەفەرموێ: سەد قەمچیی لەسەرە کوڕەکەی تۆشە، ئنجا دەچن ئافرەتەکە دانی پێدا دێنێ، (دیارە شتەکەیان ئاشکرا بووە)، کوڕەکەش بە هەمان شێوە، ئیدی ژنەکە بەرد باران دەکرێ و، کوڕەکەش سەد قەمچیی لێ دەدرێ.

هەروەها پێشتریش باسی (ماعز)و (غامِدیة)مان کرد، ئەو ئافرەتەی کە بە (غامِدیة) مەشهوور بووە، ئەوانیش هەردووکیان دوای دان پێداهێنانی خۆیان، ئەو سزایەیان لەسەر پێویست بووەو سزا دراون، ئەوە بە نسبەت دان پێدا هێنانەوە.

٢)- (أربعة شهداء)، چوار شایەد، دەقی ئایەتی ژمارە (٤)ی، سوورەتی (النور) دەیگەیەنێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ ﴿٤﴾ ﴾، ئەوانەی ئافرەتانی داوێنپاك تۆمەتبار دەکەن بە داوێن پیسیی و، دواییش چوار شایەدان ناهێنن، یەکی هەشتا قەمچییان لێ بدەن.

بەڵام شایانی باسە: هەر کات بە هۆی دان پێدا هێنانەوە، ئەو گوناهە چەسپا لەسەر کەسێك و لەسەری خۆی چەسپاندی، دوایی لەو دان پێدا هێنانە پەشێمان بۆوە، ئەگەر پێش دەست پێکردنی سزا دانەکە بێ، یاخود لە نێوە ڕاستی دا بێ، لە میانی سزا دانەکەدا بێ، کە گوتی: پەشێمانم، ئەو کاتە سزا نادرێ و سزایەکەی لەسەر لادەچێ، وەك لە بارەی (ماعز)ەوە لە (سنن الترمذي) بە ژمارە: ١٤٢٨، و (سنن ابن ماجە) بە ژمارە: ٢٥٥٤)دا هاتوە، کە دوای ئەوەی (ماعز) بەرد باران دەکرێ و، تێشی پێدەگا، ڕادەکات، بەڵام دوایی دەیگرنەوەو، بەردەوام دەبن لەسەر بەرد بارانکردنی تاکو دەمرێ، کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵەکەی پێدەگاتەوە، دەفەرموێ:

(هَلاَّ تَرَكْتُمُوهُ)، بۆچی وازتان لێ نەدەهێنا! چونکە ئەو پیاوە کە ڕادەکات، مانای وایە پەشیمان بۆتەوە لە دان پێدا هێنانەکەی، بۆیە دەبووایە وازتان لێ هێنابووایە.

## تەوەری یازدەیەم و کۆتایی:

هەر چەند پێشتریش باسمان کرد، بەڵام جارێکی دیکەش دووبارەی دەکەمەوە، وەك ئەمانەتی زانستیی دەڵێین: زۆربەی هەرە زۆری زانایان، هەم کاتی خۆی، هەم ئێستاش ڕایان وایە کە ژن و پیاوی هاوسەرداری زیناکار، سزایەکەیان: (رجم)ە، واتە: بەرد باران کران، تاکو مردن، بەڵام کەمینەیەك ئەو ڕایەیان هەیە، کە نەخێر زیناکاران بە پیاوو ئافرەتەوە، بە هاوسەردارو بێ هاوسەرەوە، سزایەکەیان هەر سەد (١٠٠) قەمچییە، ئنجا من ئەو ڕایەم بە دڵە، کە ئەو ڕایەشم بە دڵە، بەڵگەکانم خستنە ڕوو، کە ئەو قەناعەتەیان بۆ پەیدا کردووم و، لە مسوڵمانەتیی و دینداریش دا، ئینسان نابێ تەماشا بکات: بزانێ کێ چی دەڵێ و، کێ چی ناڵێ! بەڵکو دەبێ تەماشای وەحیی بکەی، تەماشای قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بکەی و، عەقڵی خۆشت ئازاد بکەی، لە لێ تێگەیشتنی وەحییدا.

ئنجا من هەوڵم داوە هەم لەم بابەتەدا، هەم لە هەر بابەتێکی دیکەدا، وا بکەم، بەڵام ئەوە کە دەگوترێ: یەکدەنگیی (إجماع)ی زانایانی لەسەرە، زۆربەی زانایان ئەو قسەیە دەکەن، ئەوە ڕاست نییە، چونکە خەواریجیش هەر مسوڵمان بوون، ئنجا خەواریج هەموویان ڕایان وابووە، کە سزای ڕەجم لە ئیسلامدا نیە، کە پێم وا نیە نکووڵییشیان کرد بێ لەوەی لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ هەبووە، بەڵام یان گوتوویانە: ئایەتەکەی سوورەتی (النور)، سزای ڕەجمی نەسخ کردۆتەوە، یان گوتوویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ سزای بەرد بارانی لە سنووری صەلاحییەتی خۆیدا، وەك سیاسەتیی شەرعیی جێبەجێ کردوە، بە بۆ چوون و

ئیجتهادی خۆی، وەك پێشتر باسمان كرد، بەڵام گرنگ ئەوەیە مادام خەواریج، رایان نەبوو بێ، با رەخنەو گلەییشمان لێیان هەبێ، وەك من لە (مەوسووعەی بیركردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیعدا)، لە كتێبی سێیەمدا كە تێیدا باسی (تەوژمە فیكرییەكانیی مێژووی مسوڵمانان)م كردووە، باسی خەواریجم كردوە، خەواریج، بەڵێ، رەخنەو گلەیی لەسەریان هەیە، هەروەها موعتەزیلەو كۆمەڵ و پێرو تاقمەكانی دیكەش، بەڵام ئەوە مانای وانیە، ئەوانیش هیچ هەقیان لە لا نیە، پاشان مادام بە ئەهلی قیبلە لە قەڵەم دەدرێن و، لە بازنەی ئیسلامدا دادەنرێن، كەواتە: ئیعتیبار بە قسەیان دەكرێ، مادام قسەكەیان رێی تێ بچێ و، لە سنووری تێگەیشتن لە دەقەكانی وەحییدا بێ، بۆیە ئەگەر هەر خەواریجیش رایان لەسەر ئەو بەرد باران كردنە نەبووبێ، مانای وایە راست نیە بگوترێ: یەكدەنگیی (إجماع)ی لەسەرە.

ئەوەش كە دەگوترێ: فڵانكەس ئیعتیبار بە قسەی ناكرێ، فڵان زانایە بەڵێ رای جیابووە، بەڵام ئیجماعی پێ هەڵناوەشێتەوە، من ئەو قسانەم پێ راست نین، چونكە هەر كەسێك بە مسوڵمان لە قەڵەم درا، ئیعتیباریش بە قسەی دەكرێ، وەك گوتراویشە: (**انْظُر إِلى مَا قِيلَ، وَلا تَنْظُر إِلى مَنْ قَالَ**)، تەماشا بكە چی گوتراوە، تەماشا مەكە كێ گوتوویەتی.

بۆیە ویستم ئەوە دووبارە بكەمەوە، ئنجا رای زۆرینەش بە تەئكید هەر رێی تێدەچێ و، دەگونجێ رای كەمینە هەڵە بێ، چونكە رایە، بەڵام مەرجیش نیە لەبەر ئەوەی رای كەمینە، كەمینەیەك دەیڵێن، بێهێزتربێ لە رای زۆرینەیەك، كە زۆرینە دەیڵێن، چونكە جاری واش هەیە، رایەك كەمینە تەبەننیی دەكەن، بەڵام لە رووی بەڵگەوە، پشت ئەستوورە بە بەڵگەو، بەهێزترە لە رای زۆرینە، قسەیەكی باو (مشهور)یشە، ماموستایان دەڵێن: «قیلی وا هەیە دەڵێی: فیلە»، (قیل: یانی: قسەیەك كە گوتراوە)، قسە هەیە بە كەم دانراوە، بەڵام جاری وایە لە رووی بەڵگەوە زۆر بەهێزە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ڕوونکردنــەوەی ئــەو ڕاســتییە کــە پیــاوی زینــاکار، ئــارەزووی ژنــی زینــاکارو هاوبەشــدانەر دەکات و، ژنــی زیناکاریــش ئــارەزووی پیــاوی زینــاکارو موشریــك دەکات و، ئــەوەش لــە بــڕواداران قەدەغەیــە:**

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:**

**١)- ﴿ ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً ﴾، واتە: پیاوی زیناکار هەر نیکاحی ئافرەتی زیناکار، یاخود هاوبەش بۆ خوا دانەر دەکات.**

**یاخـود لێـرەدا وشـەی (نـکاح) بـە مانـای مارەکـردن و هاوسـەرگیریی لەگـەڵ کـردن نیـە، بەڵکـو بـە مانـای جووتبـوون (جِـمَاعُ)ە، واتـە: پیـاوی زینـاکار، تەنیـا لەگـەڵ ئافرەتـی زینـاکار، یاخـود هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەردا، جـووت دەبـێ.**

**٢)- ﴿ وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ﴾، هەروەها ئافرەتی زیناکاریش، تەنیا پیاوی زیناکار یاخود هاوبەش بۆ خوا دانەر نیکاحی دەکات و مارەی دەکات.**

**یاخـود: ئافرەتـی زیناکاریـش، تەنیـا پیـاوی زینـاکار یاخـود هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەر، لەگەڵـی جـووت دەبـێ.**

**٣)- ﴿ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، ئەوە لە بڕواداران قەدەغەیە.**

**ئـەم دوو واتایـە بـۆ ئـەم ئایەتـە موبارەکـە لێکدەدرێنـەوە، بـە پێـی ڕاجیایـی زانایـان لـە بـارەی وشـەی: (لَا يَنكِحُ) و (لَايَنكِحُهَآ)، ئایـا نیـكاح لێـرەدا بـە مانـای هاوسـەرگیریی (زواج)ە، یاخـود بـە مانـای واتـە: جووتبـوون (وطـأ)ە؟!.**

## کورتە باسێک لە بارەی ڕەوایی و ناڕەوایی هاوسەرگیریی پیاوو ئافرەتی پاک. لەگەڵ زیناکاراندا

لێرەدا ڕای کۆمەڵێک لە زانایانم هێناوە، چونکە ئەم باسە بە ڕاستیی باسێکی زۆر هەستیارەو، زانایان ڕاجیاییەکی زۆر خەست و قووڵیان لە بارەیەوە هەیە، ڕای پێنج لە توێژەرەوانی زەبر دەستی قورئانم هێناوە، کە بریتین لە: (**الطبري، القرطبي، محمد الطاهر بن عاشور، الرازي، الشنقيطي**)، دواییش ڕای خۆم لە بارەیەوە هێناوە:

١)- (**الطبري**) کە بە پێشەوای توێژەرەوان و لێکدەرەوانی مانای قورئان، لە قەڵەم دراوەو، ئەو نازناوەشی شایستەیە، دەڵێ:

أ)- {**فَقَالَ بَعْضُهُمْ: نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي بَعْضِ مَنِ اسْتَأْذَنَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي نِكَاحِ نِسْوَةٍ كُنَّ مَعْرُوفَاتٍ بِالزِّنَا مِنْ أَهْلِ الشِّرْكِ، وَكُنَّ أَصْحَابَ رَايَاتٍ، يُكْرِينَ أَنْفُسَهُنَّ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَحْرِيمَهُنَّ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ، فَقَالَ: الزَّانِي مِنَ الْمُؤْمِنِينَ لَا يَتَزَوَّجُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً، لِأَنَّهُنَّ كَذَلِكَ، وَالزَّانِيَةُ مِنْ أُولَئِكَ الْبَغَايَا لَا يَنْكِحُهَا إِلاَّ زَانٍ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَوِ الْمُشْرِكِينَ، أَوْ مُشْرِكٌ مِثْلُهَا، لِأَنَّهُنَّ كُنَّ مُشْرِكَاتٍ**}[١].

دوایی دەڵێ:

ب)- {**وَقَالَ آخَرُونَ: مَعْنَى ذَلِكَ: الزَّانِي لاَ يَزْنِي إِلاَّ بِزَانِيَةٍ أَوْ مُشْرِكَةٍ، وَالزَّانِيَةُ لاَ يَزْنِي بِهَا إِلاَّ زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ، قَالُوا: وَمَعْنَى النِّكَاحِ فِي هَذَا الْمَوْضِعِ: الْجِمَاعُ**}[٢].

دوایی وەك زاڵکردنی یەکێك لەو دوو ڕایانە، هەر لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ:

---

(١ ) جامع البيان: ج١٨، ص٧٥.

(٢ ) جامع البيان: ج١٨، ص٧٨.

ج)- {وَأَوْلَى الأَقْوَالِ فِي ذَلِكَ عِنْدِي بِالصَّوَابِ قَوْلُ مَنْ قَالَ: عُنِيَ بِالنِّكَاحِ فِي هَذَا الْمَوْضِعِ الْوَطْءُ، وَأَنَّ الآيَةَ نَزَلَتْ فِي الْبَغَايَا الْمُشْرِكَاتِ ذَوَاتِ الرَّايَاتِ، وَذَلِكَ لِقِيَامِ الْحُجَّةِ عَلَى أَنَّ الزَّانِيَةَ مِنَ الْمُسْلِمَاتِ، حَرَامٌ عَلَى كُلِّ مُشْرِكٍ، وَأَنَّ الزَّانِيَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ حَرَامٌ عَلَيْهِ كُلُّ مُشْرِكَةٍ مِنْ عَبَدَةِ الأَوْثَانِ، فَمَعْلُومٌ إِذَا كَانَ ذَلِكَ كَذَلِكَ، أَنَّهُ لَمْ يُعْنَ بِالآيَةِ أَنَّ الزَّانِيَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ لاَ يَعْقِدُ عَقْدَ نِكَاحٍ عَلَى عَفِيفَةٍ مِنَ الْمُسْلِمَاتِ، وَلَا يَنْكِحُ إِلَّا بِزَانِيَةٍ أَوْ مُشْرِكَةٍ، وَإِذْ كَانَ ذَلِكَ كَذَلِكَ، فَبَيِّنٌ أَنَّ مَعْنَى الآيَةِ: الزَّانِي لاَ يَزْنِي إِلاَّ بِزَانِيَةٍ لاَ تَسْتَحِلُّ الزِّنَا، أَوْ بِمُشْرِكَةٍ تَسْتَحِلُّهُ}[1].

(طبري)، لە تەفسیرکردنی ئەو ئایەتە موبارەکەدا، ئایەتی ژمارە (٣)ی سوورەتی (النور)دا، تەنیا دوو ڕای هێناون و، لەو دوو ڕایەش یەکیان پەسند دەکات، بەمجۆرە:

١)- دەڵێ: هەندێکیان گوتوویانە: ئەم ئایەتە لە بارەی هەندێك لە هاوەڵانەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، دابەزیوە، کە مۆڵەتیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرت، بۆ مارەکردنی هەندێك لەو ژنانەی ناسرابوون بە زیناکردن لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، ئەو ئافرەتانە خاوەن ئاڵا بوون و، خۆیان بە کرێ دەگرت، کە خەڵك زینایان لەگەڵدا بکات بە پارە، (واتە: لەشفرۆش بوون، بە زاراوی ئەمڕۆ)، خواش ﷻ قەدەغەکردنی ئەو ئافرەتانەی لەسەر بڕواداران دابەزاند، فەرمووی: بڕواداری زیناکار، تەنیا ئافرەتی زیناکار، یان ئافرەتی هاوبەش بۆ خوا دانەر، مارە دەکات، چونکە ئەوانیش بەو شێوەیەن، ئافرەتی زیناکاریش لەو لەشفرۆشانە، تەنیا پیاوی زیناکار لە بڕواداران، یاخود پیاوێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەران، یاخود هاوبەش دانەرێك کە وەك خۆی داوێن پیس بێ، دەیهێنێ، لەبەر ئەوەی ئەو کاتە، ئافرەتەکانیش هاوبەش بۆ خوا دانەر بوون و مسوڵمان نەبوون.

٢)- دەڵێ: هەندێکی دیکە گوتوویانە: مانای ئەوە ئەوەیە کە پیاوی زیناکار، تەنیا زینا لەگەڵ ئافرەتی زیناکار، یاخود هاوبەش بۆ خوا دانەردا دەکات و، ئافرەتی زیناکاریش، تەنیا پیاوی زیناکارو هاوبەش بۆ خوا دانەر، زینای لەگەڵدا دەکات و، گوتوویانە: وشەی (نِكَاح) لێرە (لەم شوێنەدا) بە مانای جووتبوون (جِمَاع)ە.

---

(١) جامع البيان: ج١٨، ص٧٩-٨٠.

دوایی خۆی هەڵسەنگاندن دەکات و ئەو ڕایەی بە دڵیەتی هەڵیدەبژێرێ و دەڵێ:

لە لای من نزیکترین قسە لە ڕاستییەوە، قسەی ئەو کەسەیە کە گوتوویەتی: مەبەست لە (نِکَاحِ) لەم شوێنەدا، بریتیە لە جووتبوون و، ئەم ئایەتە لە بارەی ئافرەتانێکی هاوبەش بۆ خوا دانەری لەشفرۆشی خاوەن ئاڵاوە هاتۆتە خوار، چونکە بەڵگە لەسەر ئەوە هەیە، کە ئافرەتی داوێن پیس لە مسوڵمانان، لە هەموو هاوبەش بۆ خوا دانەرانێك قەدەغەیە، (واتە: ئافرەتی مسوڵمان ئەگەر زیناکاریش بێ، هەر دروست نیە شوو بکات بە پیاوی هاوبەش بۆ خوا دانەرو کافر)، هەروەها پیاوی زیناکار لە مسوڵمانان، لێی قەدەغەیە، ئافرەتی هاوبەش بۆ خوا دانەر لە بتپەرستەکان بێنێ.

ئنجا مادام ئەمە بەو شێوەیە، کەواتە: ئاشکرایە کە مەبەست لە ئایەتەکە ئەوە نیە کە پیاوی زیناکار لە بڕواداران، ئافرەتی پاك لە مسوڵمانان ناهێنێ و، تەنیا دەبێ ئافرەتی زیناکار، یاخود هاوبەش بۆ خوا دانەر، بێنێ، ئنجا مادام ئەمە بەو شێوەیە، کەواتە: مانای ئایەتەکە وایە، کە پیاوی زیناکار، تەنیا زینا لەگەڵ ئافرەتێکدا دەکات، کە بە حەلاڵی دانانێ (زینا بکات) چونکە مسوڵمانە، یاخود لەگەڵ ئافرەتێکی هاوبەش بۆ خوا دانەردا زینا دەکات، کە زینا بە حەلاڵ دەزانێ، لەبەر ئەوەی کافرو هاوبەش بۆ خوا دانەرە.

٢)- (القُرطبي): لەو بارەوە شەش بۆچوونان دێنێ:

أ)- {مَقْصِدُ الآيَةِ تَشْنِيعُ الزِّنَى وَتَبْشِيعَ أَمْرِهِ، وَأَنَّهُ مُحَرَّمٌ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ، لَا يَنْكِحُ: لَا يَطَأُ، ثُمَّ زَادَ تَقْسِيمَ الْمُشْرِكَةِ وَالْمُشْرِكِ مِنْ حَيْثُ أنّ الشِّرْكَ أَعَمُّ فِي الْمَعَاصِي من الزِّنَى، فَالْمَعْنَى: الزَّانِي لَا يَطَأُ فِي وَقْتِ زِنَاهُ إِلَّا زَانِيَةً مِنَ الْمُسْلِمِينَ، أَوْ مَنْ هِيَ أَسوءُ مِنْهَا مِنَ الْمُشْرِكَاتِ}.

ب)- {قَالَ الْخَطَّابِيُّ: هَذَا خَاصٌّ بِهَذِهِ الْمَرْأَةِ إِذْ كَانَتْ كَافِرَةً، فَأَمَّا الزَّانِيَةُ الْمُسْلِمَةُ، فَإِنَّ الْعَقْدَ عَلَيْهَا لَا يُفْسَخُ}.

ج)- [أَنَّهَا مَخْصُوصَةٌ فِي رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ أَيْضاً، اسْتَأْذَنَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي نِكَاحِ امْرَأَةٍ يُقَالُ لَهَا» أُمُّ مَهْزُولٍ» وَكَانَتْ مِنْ بَغَايَا، الزَّانِيَاتِ، وَشَرَطَتْ أَنْ تُنْفِقَ عَلَيْهِ]. (مرثد ابن أَبِي مَرْثَدٍ وعَنَاقُ صَدِيقَتَهُ).

د)- [أَنَّهَا نَزَلَتْ فِي أَهْلِ الصُّفَّةِ، وَكَانَ بِالْمَدِينَةِ بَغَايَا مُتَعَالِنَاتٌ بِالْفُجُورِ، مَخَاصِيبُ بِالْكِسْوَةِ وَالطَّعَامِ، فَهَمَّ أَهْلُ الصُّفَّةِ أَنْ يَتَزَوَّجُوهُنَّ، فَيَأْوُوا إِلَى مَسَاكِنِهِنَّ وَيَأْكُلُوا مِنْ طَعَامِهِنَّ وَكِسْوَتِهِنَّ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ صِيَانَةً لَهُمْ عَنْ ذَلِكَ].

ح)- [الْمُرَادُ الزَّانِي الْمَحْدُودُ وَالزَّانِيَةُ الْمَحْدُودَةُ، قَالَ: وَهَذَا حُكْمٌ مِنَ اللَّهِ، فَلاَ يَجُوزُ لِزَانٍ مَحْدُود أن يتزوج إلاّ محدودة] [عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا يَنْكِحُ الزَّانِي الْمَحْدُودُ إِلَّا مِثْلَهُ] (أخرجه أبو داود: ٢٠٥٢).

هـ)- [أَنَّهَا مَنْسُوخَةٌ بِالآيَةِ الَّتِي بَعْدَهَا: ﴿وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ ﴿٣٢﴾﴾النور][1].

واتە: ئەو شەش ڕایەش بەو شێوەیەن:

١)- یەکەمیان: دەڵێ: ئامانجی ئایەتەکە زیاتر دزێوو ناقۆڵا پێشاندانی زینایە، کە لەسەر بڕواداران قەدەغەیەو، (لاَ يَنْكِحُ) یانی: (لاَ يَطأُ)، [وشەی (نِكَاحِ)، لێرەدا بە مانای جووتبوون بەکار هاتوە]، دواییش ئافرەتی هاوبەش بۆ خوا دانەرو پیاوی هاوبەش بۆ خوا دانەریش باسکراون، لەو ڕووەوە کە هاوبەش بۆ خوا دانان، گوناهێکی گشتییترە لە زینا، مانایەکەی ئاوای لێ دێتەوە: پیاوی زیناکار لە کاتێکدا کە زینا دەکات، یان زینا لەگەڵ ئافرەتێکی مسوڵمانی زیناکاردا دەکات، یاخود لەو خراپتر لەگەڵ ئافرەتێکی هاوبەش بۆ خوا دانەردا دەکات.

٢)- دووەمیان: (الْخَطَّابِيُّ)، گوتوویەتی: ئەمە تایبەتە بە ئافرەتێکی دیارییکراوەوە، بەڵام ئافرەتی مسوڵمانی کە زینا بکات، مارەکردنی هەڵناوەشێتەوە، (واتە: دروستە مارە بکرێ و، مارەیی دێ).

---

(١ ) الجامع لأحكام القرآن: ج١٢، ص١٣٩،١٤١.

٣)- سێیەمیان: ئەم ئایەتە تایبەتە بە پیاوێك لە مسوڵمانانەوە، كە داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، ئافرەتێك بێنێ پێی دەگوترا: (أُمُّ مَهْزُولٍ)، كە ئەو ئافرەتەش لە ئافرەتانی زیناكاری لەشفرۆش بوو، مەرجی گرتبوو بۆ ئەو پیاوەی بیهێنێ، كە مەسرەفی پیاوەكە بكێشێ، (لەو پارەیەی پەیدای دەكات بە لەشفرۆشیی).

پیاوەكە (مرثد بن أبي مرثد) بوو، ژنەكەش (عناق) بوو.

٤)- چوارەمیان: ئەم ئایەتە لە بارەی (أَهْلِ الصُّفَّةِ)ەوە، دابەزیوە، [(أَهْلِ الصُّفَّةِ)، هەندێك ڕیوایەت دەڵێن: چوار سەد كەس بوون، لەوانەیە كەم و زیادیان كردبێ، كۆمەڵێك هاوەڵی زگورتی بوون، بێ ژن و ماڵ بوون، لە شوێنێكی وەك هەیوان، لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ خەوو ئیسراحەتیان و هەموو شتیان لەوێ بووە، ماڵ و حاڵیان نەبووە)، ئەم ئایەتە لە بارەی وانەوە هاتە خوار]، كە لە مەدینەدا ئافرەتانیكی لەشفرۆش هەبوون، بە ئاشكرا زینایان دەكردو، دەوڵەمەندیش بوون، پۆشاكیان هەبوو، خواردنیان هەبوو، پارەیان هەبوو، جێ و ڕێیان هەبوو، بەڵام بە لەشفرۆشیی دابینیان كردبوو، (أَهْل الصُّفَّة) هەندێكیان ویستیان لەوانە مارە بكەن و، بچنە جێ و ڕێیەكانی ئەوانەوەو، لە خواردنەكەیان بخۆن و، لە پۆشاكەكەشیان بەهرەمەند بن، بەڵام ئەم ئایەتە هاتە خوار بۆ پارێزگاریی لێكردنیان، لەوەی ئەو عەیبە بێننە سەر خۆیان.

٥)- پێنجەمیان: مەبەست لەم ئایەتە، ئەوەیە كە پیاوێك كە سزا درابێ لەسەر زیناو، ئافرەتێك سزا درابێ لەسەر زینا، هەر ئەوانە پێك دەشێن، ئەمەش حوكمی خوایە كە دروست نیە بۆ پیاوێك كە لەسەر زینا سزا درابێ، هاوسەرگیریی بكات، مەگەر لەگەڵ ئافرەتێكدا كە لەسەر زینا سزا درابێ، لەو بارەشەوە ئەم فەرموودەیە هەیە كە ئەبوو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە، كە فەرموویەتی: {لَا يَنْكِحُ الزَّانِي الْمَجْلُودُ إِلاَّ مِثْلَهُ}، أبوداود: (٢٠٥٢)، واتە: پیاوێكی زیناكەری سزادراو، دەبێ هەر لەگەڵ یەكێكی وەك خۆی دا هاوسەرگیریی بكات.

٦)- شەشەمیان: ئەوەیە کە ئەم ئایەتە نەسخ کراوەتەوە بە ئایەتێك کە دواتر دێ، ئایەتی ژمارە (٣٢) لە سوورەتی (النور)، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ ﴿٣٢﴾ ﴾، پیاوان و ئافرەتانێکی کە بێ هاوسەرن، هاوسەرداریان بکەن، هاوسەرگیرییان بۆ بکەن.

کەواتـە: بـە حیسـاب تـەو ئایەتـەی ژمارە (٣٢) ئەمەی نەسـخ کردۆتـەوە، هەڵبەتە ئەمـە قسـەی (قُرطبي)یـەو، ئێمـە پێشـتر گوتوومانـە: هیـچ ئایەتێـك لـە قورئانـدا نەسـخ کـراوە نیـە.

٣)- (محمد الطاهر بن عاشور): ئەویش دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر، لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ:

أ)- (مَنْ كَانَ الزِّنَى دَأْبًا لَهُ قَبْلَ الإِسْلَامِ، وَتَخَلَّقَ بِهِ ثُمَّ أَسْلَمَ، وَأَرَادَ تَزَوُّجَ امْرَأَةٍ مُلَازِمَةٍ لِلزِّنَى مِثْلَ الْبَغَايَا وَمُتَّخِذَاتِ الأَخْدَانِ، فَنَهَى اللهُ الْمُسْلِمِينَ عَنْ التَّزَوُّجِ بِمِثْلِهَا.... فَقَوْلُهُ: ﴿ ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً ﴾، تَمْهِيدٌ وَلَيْسَ بِتَشْرِيعٍ، لِأَنَّ الزَّانِيَ، بِمَعْنَى: مَنِ الزِّنَى لَهُ عَادَةٌ، لَا يَكُونُ مُؤْمِنًا، فَلَا تُشْرَعُ لَهُ أَحْكَامُ الإِسْلَامِ)[1].

واتـە: کەسـێك کـە لـە پێـش ئیسـلامدا داوێـن پیسـی و زینـا کـردن عادەتـی بووبــێ و، تێیــدا بووبــێ بــە ئاکارێکــی ڕۆچــوو و، دوایــی مســوڵمان بووبێــت و، ویسـتبێتی ئافرەتێـك بێنـێ کـە بەردەوامـە لەسـەر زینـا، وەك ئافرەتـە لەشفرۆشـەکان، یاخـود هاوەڵـدارەکان، خـوا ﷻ قەدەغـەی کـردوە کـە پیـاوی مسـوڵمان، دوای ئـەوەی مسـوڵمان بـووە، بـا پێـش ئیسـلام زیناکاریـش بووبـێ، ئافرەتـی ئـاوا بێنـێ.

کەواتـە: کـە دەفەرمـوێ: پیـاوی زیناکـەر تەنیا ئافرەتـی زیناکـەر، یاخـود هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەر دێنـێ، ئەمـە ڕێ خۆشـکردنەو، یاسـا دانـان نیە، چونکـە پیـاوی زیناکار بـەو واتایـە کـە زیناکـردن عادەتێـك و ئاکارێکـی ڕیشـەداری بووبـێ، بـە بـڕوادار لـە قەڵـەم نـادرێ، تاکـو یاسـاکانی ئیسـلامی بـۆ دابنرێـن.

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٨، ص١٥٥.

٤)- (فخرالدين لرّازي): ڕایەکی دیکەی جیاواز دێنێ، ئەویش دوای وردەکاریی و شیکردنەوەی زۆر لە تەفسیرەکەی خۆیدا، دەڵێ:

{وَالْمَعْنَى أَنَّ كُلَّ مَنْ كَانَ زَانِيًا، فَلاَ يَنْبَغِي أَنْ يَنْكِحَ إِلاَّ زَانِيَةً وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ. وَهَكَذَا كَانَ الْحُكْمُ فِي ابْتِدَاءِ الإِسْلَامِ، وَعَلَى هَذَا الوَجْهِ ذَكَرُوا قَوْلَيْنِ:

أَحَدُهُمَا: أَنَّ ذَلِكَ الْحُكْمَ بَاقٍ إِلَى الآنِ حَتَّى يُحَرَّمَ عَلَى الزَّانِي وَالزَّانِيَةِ التَّزَوُّجُ بِالْعَفِيفَةِ وَالْعَفِيفِ وَبِالْعَكْسِ، وَيُقَالُ: هَذَا مَذْهَبُ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعَلِيٍّ وَابْنِ مَسْعُودٍ وَعَائِشَةَ، ثُمَّ فِي هَؤُلَاءِ مَنْ يُسَوِّي بَيْنَ الابْتِدَاءِ وَالدَّوَامِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَفْصِلُ.

وَالقَوْلُ الثَّانِي: أَنَّ هَذَا الْحُكْمَ صَارَ مَنْسُوخاً وَاخْتَلَفُوا فِي نَاسِخِهِ، فَعَنِ الْجُبَّائِيِّ أَنَّ نَاسِخَهُ هُوَ الإِجْمَاعُ، وَعَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ أَنَّهُ مَنْسُوخٌ بِعُمُومِ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴿٣﴾ ﴾النساء، ﴿ وَأَنكِحُواْ ٱلْأَيَٰمَىٰ مِنكُمْ ﴿٣٢﴾ ﴾النور، لكِنَّ الإِجْمَاعَ لاَ يَنْسَخُ}[1].

واتە: مانای ئەم ئایەتە ئەوەیە کە هەر پیاوێك زیناکاربووبێ، نابێ جگە لە ئافرەتێکی زیناکار بێنێ و، ئەوە لە بڕواداران قەدەغەیە، لە سەرەتای ئیسلامدا حوکم بەو شێوەیە بوو، هەر پیاوێك زیناکار بووبایە، (زانیبایان زیناکارە، ڕێیان نەدەدا کە ئافرەتی پاك بێنێ، هەروەها ئافرەتی پاکیش نەدەدرا بە پیاوی زیناکار)، لەو بارەوە دوو قسەیان باس کردووە:

یەکەمیان: ئەو حوکمە هەتا ئێستاش بەردەوامەو، لەسەر پیاوی زیناکارو ئافرەتی زیناکار قەدەغەیە: پیاوی زیناکار ئافرەتی پاك بێنێ و، ئافرەتی زیناکاریش پیاوی پاك بیهێنێ، هەروەها بە پێچەوانەشەوە، گوتراوە: ئەمە ڕای ئەبوو بەکرو عومەرو عەلی و ئیبنو مەسعوودو عائیشەش بووە، (واتە: لەوان گێردراوەتەوە)، ئنجا ئەوانەش هەیانە، دەڵێ: یەکسانە، دەستپێکردن و بەردەوام بوون، هەندێکیش دەڵێن: نا، لە سەرەتاوە

---

(١) التفسير الكبير، ج٢٣، ص١٤٢.

وەك دەستپێكردن وایە، بەڵام بۆ بەردەوام بوون، مەرج نیە وابێ، (واتە: بۆ دەستپێكردن لە سەرەتاوە، پیاوی پاك بۆی نیە ئافرەتی زیناكار بێنێ و، ئافرەتی پاك بۆی نیە شوو بە پیاوی زیناكار بكات، بەڵام دوایی، دوای هاوسەرگیریی، ئەگەر هەر كامێكیان تووشی زینا بوون، نیكاحەكە هەڵناوەشێتەوە).

دووەمیان: ئەوەیە كە ئێستا ئەم حوكمە بەردەوام نیەو نەسخ كراوەتەوە، بەڵام لە بارەی نەسخ كەرەوەكەیەوە ڕاجیایان هەیە: (الْجُبَّائِيّ)، گوتوویەتی: بە یەكدەنگیی زانایان (إجماع العلماء) نەسخ بۆتەوە، (زانایان یەكدەنگن لەسەر ئەوە كە ئافرەتی زیناكارو پیاوی زیناكار، دروستە لەگەڵ پیاوی پاك و ئافرەتی پاكدا هاوسەرگیریی بكەن)، بەڵام سەعیدی كوڕی موسەییەب گوتوویەتی: نەسخ كراوەتەوە بە واتای گشتیی فەرمایشتی خوا، كە دەفەرموێ: ﴿ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴿٣﴾ ﴾النّساء، ئافرەتانێك كە پێتان پاك و چاكن، (یان پێتان دەشێن)، بیانهێنن، هاوسەرگیرییان لەگەڵ بكەن، هەروەها كە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنكِحُواْ ٱلْأَيَٰمَىٰ مِنكُمْ ﴿٣٢﴾ ﴾النور، پیاوان و ئافرەتانێكی بێ هاوسەر هاوسەردار بكەن.

٥)- (محمد أمين الشنقيطي): لە كتێبی (أضواء البيان)ی خۆیدا، دەڵێ:

{ هَـذِهِ الآيَـةُ الكَرِيمَـةُ مِـنْ أَصْعَـبِ الآيَـاتِ تَحْقِيقًـا؛ لِأَنَّ حَمْـلَ النِّـكَاحِ فِيهَـا عَـلَى التَّزْوِيـجِ، لَا يُلَائِـمُ ذِكْـرَ الْمُشْرِكَـةِ وَالْمُـشْرِكِ، وَحَمْـلَ النِّـكَاحِ فِيهَـا عَـلَى الْـوَطْءِ، لَا يُلَائِـمُ الْأَحَادِيـثَ الْـوَارِدَةَ الْمُتَعَلِّقَـةَ بِالْآيَـةِ، فَإِنَّهَـا تُعَيِّنُ أَنَّ الْمُـرَادَ بِالنِّـكَاحِ فِي الْآيَـةِ: التَّزْوِيـجُ، وَلَا أَعْلَـمُ مَخْرَجًـا وَاضِحًـا مِـنَ الْإِشْـكَالِ فِي هَـذِهِ الْآيَـةِ إِلَّا مَـعَ بَعْـضِ تَعَسُّـفٍ .

وَهُـوَ أَنَّ أَصَـحَّ الْأَقْـوَالِ عِنْـدَ الْأُصُولِيِّـينَ، هُـوَ جَـوَازُ حَمْـلِ الْمُشْـتَرَكِ عَـلَى مَعْنَيَيْـهِ، أَوْ مَعَانِيـهِ...

فَيُحْمَـلُ النِّـكَاحُ فِي الْآيَـةِ عَـلَى الْـوَطْءِ، وَعَـلَى التَّزْوِيـجِ مَعًـا، وَيَكُـونُ ذِكْـرُ الْمُشْرِكَـةِ وَالْمُـشْرِكِ عَـلَى تَفْسِـيرِ النِّـكَاحِ بِالْـوَطْءِ دُونَ الْعَقْـدِ...}[1].

---

(١ ) ج٥، ص٤٢٥.

واتە: دەڵێ: ئەم ئایەتە لە ڕووی ساغکردنەوەی واتاکەیەوە، یەکێکە لە ئایەتە هەرە قورسەکان، چونکە ئەگەر وشەی (نِكَاحِ)، بە مانای هاوسەرگیریی بگرین، ئەوە ناگونجێ لەگەڵ باسکردنی پیاوی هاوبەش بۆ خوا دانەرو، ئافرەتی هاوبەش بۆ خوا دانەردا، (چونکە هاوسەرگیریی لە نێوان پیاوی مسوڵمان و ئافرەتی هاوبەش بۆ خوا دانەرو، ئافرەتی مسوڵمان و پیاوی هاوبەش بۆ خوا دانەردا، دروست نیە، بە یەکدەنگیی زانایان)، ئەگەر وشەی (نِكَاحِ)یش، بە مانای جووتبون (وَطْأ) بگرین، لەگەڵ ئەو فەرمایشتانەدا ناگونجێ کە پەیوەستن بە ئایەتەکەوە، چونکە ڕوونیان کردۆتەوە کە مەبەست لە وشەی (نِكَاحِ) لە ئایەتەکەدا بریتیە لە هاوسەرگیریی، ئنجا من هیچ دەروویەکی ڕۆشن بۆچوونەدەر لەو ئیشکالە نابینم، مەگەر بە تۆزێك نەگونجانەوە، ئەویش ئەوەیە کە ڕاسترین قسە لە لای زانایانی (أصولِ الفِقه) ئەوەیە کە دروستە وشەیەك کە دوو واتای هەن، یاخود زیاتر لە دوو واتاشی هەن، لە یەك کاتدا بە هەموو واتاکان، یاخود بە دوو واتایەکە بەکاربهێنرێ، لێرەش دا وشەی (نِكَاحِ)، لە ئایەتەکەدا هەم بە مانای جووتبوون و، هەم بە مانای هاوسەرگیریی کردن بەکارهێنراوە، ئنجا ئەو کاتە باسی ئافرەتی هاوبەشدانەرو پیاوی هاوبەشدانەر کراوە، لەسەر بناغەی ماناکردنی (نکاح) بە جووتبوون، نەك بە مانای گرێبەست و مارەبڕین، (چونکە یەکدەنگیی زانایانی لەسەرە کە ناگونجێ، کافرو مسوڵمان پێکەوە هاوسەرگیریی بکەن).

واتە: مانایەکەی ئاوای لێ دێتەوە:

١)- پیاوی زیناکارو ئافرەتی زیناکار، تەنیا زینا لەگەڵ پیاوو ئافرەتی زیناکار دا، یاخود پیاوی هاوبەش بۆ خوا دانەرو ئافرەتی هاوبەش بۆ خوا دانەر دا، دەکەن.

٢)- ئەگەر بە مانای هاوسەرگیرییش بێ، یانی: پیاوی زیناکارو ئافرەتی زیناکار، هەر هاوسەرگیریی لەگەڵ یەکدییدا دەکەن، ئارەزوومەندی یەکدین و کەیفیان بە یەکدی دێت، نەك بڵێی: دروست نیە هاوسەرگیریی لەگەڵ هی دیکەدا بکەن.

ڕای خۆم لەو بارەوە:

منیـش زۆر لـەو ئایەتـە موبارەکـەم کۆڵیوەتـەوەو، دوو ڕام بـۆ پەیـدا بـوون، کـە تاڕاددەیـەك لـەو ڕایانـەی باسـمکردن، جیـاوازن:

١)- قەدەغەیە پیاوی پاك، ژنی ناپاك مارە بکات، هەروەها بە پێچەوانەوەش، ئافرەتی پاکیش نابێ شوو بە پیاوی ناپاك و زیناکار بکات، بەڵام لەگەڵ گوناهبار بوونیشدا، نیکاحەکە دادەمەزرێ، باسی پیاوی هاوبەش بۆ خوا دانەرو، ئافرەتی هاوبەش بۆ خوا دانەریش، لەبەر زێدە قێزەون و ناشیرین پێشاندانی زینایە، کە عادەتی کافرانەو لە مسوڵمانان ناوەشێتەوە.

٢)- پیاوی زیناکارو ژنی زیناکار، هەتا تۆبە نەکەن لە زینا، دروست نیە هاوسەرگیریی بکەن، مەگەر لەگەڵ هاوکوفی خۆیاندا.

بەڕێـــــــزان!

خـوا ﷻ فەرمایشـتەکانی خـۆی وا داڕشـتوون، ئـەو هەمـوو واتایانـە هەڵدەگـرن، ئنجـا هیـچ کەسـیش ناتوانـێ بڵـێ: بـە تەئکیـد هـەر ئـەوە واتاکەیەتـی و، هیـچ واتـای دیکـەی نیـە، کـە ئـەوەش یەکێکـە لـە ڕووەکانـی ئیعجـازی قوڕئـان.

**مەسەلەی چوارەم:**

**ئەوانـەی ئافرەتانـی پـاك (هەروەهـا پیاوانیـش) بـە زینـا تۆمەتبـار دەكـەن و، چـوار شـایەدان ناهێنـن (بـۆ ئیسـپاتی تۆمەتەكەیـان)، سـزایان هەشـتا قەمچییـەو شایەدییشـیان لێوەرناگیـرێ و بـە فاسـق دادەنرێـن، مەگـەر ئەوانـەی پەشـێمان دەبنـەوەو چاكسـازیی دەكـەن، (ئەوانـە دەگەڕێنـەوە بـۆ حاڵەتـی ئاسـایی پێشـوویان):**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ﴾، ئەو پیاوانەی كە ئافرەتانی پاك تۆمەتبار دەكەن، (يَرْمُونَ أي: **يَقْذِفُوْن**)، یانی: (**يَتَّهِمُونَ بِالزِّنَا**)، ئەو پیاوانەی ئافرەتانی پاك تۆمەتبار دەكەن بە داوێن پیسیی، وشەی (ٱلْمُحْصَنَٰتِ)، واتە: پاكڕاگیراوان، خوێنراویشەتەوە: (**الْمُحْصِنَات**)، واتە: خۆ پاكڕاگران، (ٱلْمُحْصَنَٰتِ)، ناوی بەركار (**إسم المفعول**)ەو، (**مُحْصِنَات**)، ناوی بكەر (**إسم فاعل**)ە، (**الرَّمْيُ**)، (**قَذْفُ الشَّيءِ مِنْ اليَدِ، وَشَاعَ اسْتِعْمَالُهُ فِي نِسْبَةِ فِعْلٍ أو وَصْفٍ إلَى شَخْصٍ**)، وشەی (رَمي) بریتیە لە فڕێدانی شتێك كە بە دەستەوەیە، بەڵام بەكارهێنانی بڵاو و باوە، لە پاڵدانی كردەوەیەك یاخود وەصفێك بۆ لای كەسێكدا.

شـایانی باسـە: كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ﴾، ئـەو پیاوانـەی ئافرەتانـی پـاك تۆمەتبـار دەكـەن بـە داوێـن پیسـیی، هـەر سیاقەكە وایخواسـتوە، ئەگەرنـا ئەگـەر پیاوانێكـی پاكیـش تۆمەتبـار بكـەن بـە زینـا، هـەر بـە هەمـان شـێوەیە، هەروەهـا ئافرەتانێكیـش پیاوێكـی پـاك، یـان ئافرەتێكـی پـاك تۆمەتبـار بكـەن بـە زینـا، هـەر بـە هەمـان شـێوەیە.

٢)- ﴿ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ ﴾، (ئەوانەی کە نافرەتانی پاك تۆمەتبار دەکەن بە داوێن پیسیی و)، دواییش چوار شایەدان ناهێنن.

٣)- ﴿ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَـٰنِينَ جَلْدَةً ﴾، ئەوانە هەشتا قەمچیيان لێ بدەن، واتە: هەر کامێکیان هەشتا قەمچیی لێبدەن، ئەوەش کە هەشتا قەمچییەکان لێ دەدا، بێگومان دەسەڵاتی شەرعییە.

وشـەی (ٱلْمُحْصَنَـٰتِ)، لـە (إحصان)ەوەيـە، يـانی: پاکبـوون، زانايـان دەڵێـن: ئـەوە دوو هـۆکار هـەن:

یەکەم: لە خودی خۆیدا پاك بێت.

دوو: بە هۆی هاوسەرگیرییەوە.

هۆی بە پاکڕاگیران:

یەکەم: لە زاتی خۆیدا پاك بێت و، خاوەنی پاکیزەیی (عِفَّة) بێ.

دووەم: هاوسـەرگیریی، دیـارە هەيـە هاوسـەرگیرییش دەکات و ناپاکیشـە، بـەڵام کەسـێك بیـەوێ، هاوسـەرگیریی هۆکارێـکی گرنگـی پاکییـە.

٤)- ﴿ وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَـٰدَةً أَبَدًا ﴾، (ئەوانەی تۆمەتی داوێن پیسیی دەدەنە پاڵ ئافرەتانی پاك (يان پياوانی پاك)، دواییش چوار شایەدان ناهێنن، یەکی هەشتا قەمچیيان لێ بدەن و)، هەرگیزیش شایەدییان لێ وەرمەگرن، یانی: لە ماوەی ژیانیاندا.

٥)- ﴿ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴾، ئا ئەوانەش لاڕێن، لادەرن.

لێـرەدا بـە شـێوازی کـورت هەڵێنـان هێناویەتـی، بـۆ زێدەڕۆیـی لـە پێشـاندانی ناشـیرینی و ناقۆڵایـی کردەوەکەیـان، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴾، ئـا ئەوانـەن لاڕێبـووان و لادەران، وەك کەسـی دیکـە فاسـق نەبـێ.

٦)- ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ﴾، مەگەر ئەوانەی دوای ئەوە، (دوای ئەوەی تۆمەتی داوێن پیسییان کردووەو، سزا دراون)، پەشێمان دەبنەوەو دەگەڕێنەوە، لێرەدا کە

دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ ﴾، جگە لەوانەی دوای ئەوە گەڕاونەوە، پەشێمان بوونەوە، زانایان دوو واتایان بۆ لێك داونەوە:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: لە نێوان خۆیان و خوادا گەڕاونەوە، ئەوە کە سزا دراون، سزایەکە پاکی کردوونەوە لەو گوناهەی کردوویانە، کە تۆمەتبارکردنی خەڵکە بە ناهەق، بە زینا، بێ ئەوەی بتوانن ئیسپاتی بکەن، سزایەکە دەبێتە هۆی پاك بوونەوەیان، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە[1]، بەڵام لە نێوان خۆیان و خوادا دەگەڕێنەوە، کە جارێکی دیکە شتی وا نەکەن.

ب- هەندێکی دیکە گوتوویانە: یانی: خۆیان بە درۆ بخەنەوەو بڵێن: ئێمە درۆمان کرد، ئەمە مانای گەڕانەوەیەکە! بەڵام من ئەو مانایە بە دوور دەبینم، چونکە خوا فەرموویەتی: (تَابُواْ)، واتە: بگەڕێنەوە، ئیدی نەیفەرمووە: بچن ئیعلانی بکەن کە ئێمە درۆمان کردوە، تەوبەش بریتیە لە: وازهێنان لە گوناهو، لێ پەشێمان بوونی و، بڕیاردانی نەگەڕانەوە سەری.

٧)- ﴿ وَأَصۡلَحُواْ ﴾، چاکسازییش دەکەن.

ئەمەش دوو واتای هەن:

أ- خۆیان چاك دەکەن، کە تاکو ئێستا دەمیان ڕانەوەستاوە بوختانیان کردوە، لەمەودوا وا ناکەن.

---

(١) [عن عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ قَالَ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةَ الْعَقَبَةِ الْأُولَى عَلَى أَنْ لَا نُشْرِكَ بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلَا نَسْرِقَ وَلَا نَزْنِيَ وَلَا نَقْتُلَ أَوْلَادَنَا ، وَلَا نَأْتِيَ بِبُهْتَانٍ نَفْتَرِيهِ مِنْ بَيْنِ أَيْدِينَا وَأَرْجُلِنَا ، وَلَا نَعْصِيَهُ فِي مَعْرُوفٍ فَإِنْ وَفَيْتُمْ فَلَكُمْ الْجَنَّةُ وَإِنْ غَشِيتُمْ مِنْ ذَلِكَ فَأُخِذْتُمْ بِحَدِّهِ فِي الدُّنْيَا، فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ وَإِنْ سُتِرْتُمْ عَلَيْهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ فَأَمْرُكُمْ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ إِنْ شَاءَ عَذَّبَ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ] السيرة النبوية لابن هشام ، ج١ ص٢٢٣.

ب- واتایەکی دیکەی ئەوەیە: ئەوەی تێکیان داوە لە سومعەو ناوو شۆرەتی کەسایەتیی ئەو کەسەی قسەیان بەرانبەر کردوە، هەوڵ دەدەن مەدحی بکەن و، چی تێکیان داوە، چاکی بکەنەوە، ئنجا کەسانێك کە ئاوا بکەن:

٨)- ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، ئەوە بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بە بەزەییە، کە ئەمە هەم دەگەڕێتەوە بۆ دووەمیان، کە بریتیە لەوەی شایەدییان لێ وەرنەگیرێ، هەم بۆ سێیەمیان، کە فاسق بوونە، سیفەتی فاسق بوونیشیان لەسەر لادەچێ، وەك دوایی باسی دەکەین.

ئێمە لەبەر ئەوەی کورتە باسێك (لە بارەی بوختانی داوێن پیسییەوە) دەخەینە ڕوو، لێرەدا بەوەندە شیکردنەوەی ئەو دوو ئایەتە موبارەکە لێیدەگەڕێین، ئەوەندە دەڵێین: زانایان ڕاجیان دەربارەی ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بە بەزەییە، ئایا خوا مەبەستی ئەوەیە: ئەو کەسانەی بوختانیان کردوە، دوای ئەوەی یەکی هەشتا قەمچییان لێدراوە، لەبەر ئەوەی نەیانتوانیوە چوار شایەدان بێنن، ئایا لەمەودوا بە دادگەر (عادل) لە قەڵەم دەدرێن و، شایەدییان لێ وەردەگیرێ و، سیفەتی فیسقیشیان لەسەر لادەچێ؟!:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: شایەدییان لێ وەرناگیرێ و، هەر بە فاسیقیش لە قەڵەم دەدرێن.

ب- هەندێکیش گوتوویانە: شایەدییشیان لێ وەردەگیرێ و، بە فاسقیش لە قەڵەم نادرێن.

ج- هەندێکیش گوتوویانە: شایەدییان لێ وەردەگیرێ، بەڵام هەر بە فاسق لە قەڵەم دەدرێن.

# کورتە باسێک لە بارەی بوختانی داوێن پیسیی یەوە

ئەم کورتە باسە لە پێنج بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

## ا)- پێناسەی بوختانی داوێن پیسیی:

بوختانی داوێنپیسیی وشەی (قَذْف)ی بۆ بەکارهاتوە، بەڵام لە قورئاندا وشەی (رَمي)، بەکارهاتوە، بۆختانی داوێن پیسیی بریتیە لە: (إِتِهامٌ بالزِّنَى بِصَرِيْحِ العِبَارَة) تۆمەتبار کردن بە زینا، بە دەربڕینێکی ڕاشکاو، بێ پێچ و پەنا.

(القرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆی (الجامع لأحكام القرآن)دا، چەند شتێك دەربارەی بوختانی داوێن پیسیی، دەڵێ، ئێمە هەندێکی لێ دەخوازینەوە، لە یەکێ لە قسەکانی دا دەڵێ: (اتَّفَقَ الْعُلَمَاءُ عَلَى أَنَّهُ إِذَا صَرَّحَ بَالزِّنَى، كَانَ قَذْفًا وَرَمْيًا مُوجِبًا لِلْحَدِّ، لَكِنْ إِذَا عَرَّضَ، فَفِيْهِ خلاَفٌ بَيْنَ الْفُقَهَاء)[1].

واتە: زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، ئەگەر کەسێك بە ڕاشکاویی کەسێك تۆمەتبار بکات بە زینا، ئەوە (قَذْف) و (رَمي)ی، سزا پێویستکارە، بەڵام ئەگەر بە کنارە (كِناية) بێ، لە پەناداو بە لەبەر ڕاهاویشتن بێ، ئەوە لەو بارەوە لە نێوان شەرعزاناندا ڕاجیایی هەیە، (کە ئایا سزا لەسەر بابای لەبەر ڕاهاویشتەر، لە پەنادا بوختانکەر، پێویست دەبێ، یاخود هەر تەمبێ کردن و سەرزەنشتکردنی دەکەوێتە سەر؟).

---

(١) ج١٢، ص١٤٣،١٥٠.

## ٢)- مەرجەکانی بوختانی داوێنپیسیی نۆ (٩)ن:

١)- بوختانکەر (القاذف):

دوو مەرجی تێدا بە مەرج گیراون:

یەکەم: دەبێ عاقڵ بێ.

دووەم: دەبێ باڵغ بێ.

کەواتە: ئەگەر شێت بێ، یاخود منداڵ بێ، ئەو قسانە بشکات، هیچ ئیعتیباری پێ ناکرێ و ئەویش سزای ناکەوێتە سەر، بەڵێ ڕەنگە تەمبێ بکرێ و گوێی با بدرێ، بەڵام ئەو سزا شەرعییەی ناکەوێتە سەر.

٢)- بوختان پێکراو (المقذوفُ بِهِ):

ئەوەی بەکاردەهێندرێ بۆ بوختانەکە، دوو مەرجی پێویستن:

یەکەم: دەبێ تۆمەتبارکردن بێ بە زینا.

دووەم: نەفی کردنی ئەو منداڵە لە بابی، بگوترێ: ئەوە کوڕی بابی خۆی نیە، یان ئەو کچە کچی بابی خۆی نیە، واتە: زۆڵە، هەڵبەتە (القرطبي)، وشەی (لِواط)یشی هێناوە، کە ئەویش یەکێکە لە هۆکارەکانی بە بوختانی داوێن پیسی لە قەڵەم دران، بەڵام لە ڕاستییدا لەو ڕایەیدا زانایانی دیکە لەگەڵی نین و، زینا جیایەو نێربازیی (لِواط) جیایە، ئنجا سزای زینا جیایەو، سزای نێربازییش جیایە.

کەواتە: دوو مەرج لە بابای بوختانکەرداو، دوو مەرجیش لە خودی بوختانەکەدا بە مەرج گیراون:

أ- دەبێ بریتی بێ لەوەی زینای پاڵ بداتە لای.

ب- بڵێ: منداڵەکەی هی خۆی نیە، زۆڵە، بیژوویە.

ئەوە چوار مەرج لە نۆیەکان.

**٣)- بوختان بۆ کراو (المقذوف): بە نسبەت بابای بوختان بۆ کراوەوە، دەبێ پێنج مەرجی تێدا هەبن:**

**یەکەم: عاقڵ بێ.**

**دووەم: باڵغ بێ.**

**سێیەم: مسوڵمان بێ.**

**چوارەم: پاك بێ لە داوێن پیسیی.**

**پێنجەم: ئازاد بێ.**

**بە نسبەت عەقڵ و باڵغیی و پاکیی لە داوێن پیسییەوە، هەموو زانایان لەسەری یەکدەنگن، بەڵام ئەوە کە دەبێ مسوڵمان بێ و ئازادیش بێ، دەڵێم: مادام پاك بێ لە داوێن پیسیی، مسوڵمان یان نامسوڵمان بێ، پێم وایە ئەگەر بوختانی بۆ بکرێ، سزا هەر دەیگرێتەوە، بۆ ئازادیش، بە نسبەت کاتی خۆیەوە وا بووە، کە کۆیلەو کەنیزەك لە رووی پاکیی ئەخلاقییەوە، ئەو ئیعتبارەیان پێ نەکراوە.**

**بەڵام پێم وایە لە رووی عەدالەتی شەریعەتەوە، ئەوانیش بە هەمان شێوە، هەمان حوکمیان هەیە، ئەگەر کەسێك کەنیزەکێك، کۆیلەیەکیش تۆمەتبار بکات بە زینا، مادام پاك بێ و، عاقڵ بێ و باڵغ بێ، بە تایبەتیی ئەگەر مسوڵمانیش بێ، هەر هەمان حوکمی هەیە.**

## ٣)- چۆنیەتی شایەتییدانی چوار شایەدەکان:

**دەبێ چوار شایەدەکە شایەدییەکەیان لەسەر بناغەی دیتن بێ و بڵێن: وەك کلچێوکی نێو کلدان دیتوومانە کە زینایان کردوە، (المِروَدَ في المكحلة)، [(مِرود)، ئەوەیە کە چاوی پێ دەرێژن، (المكحلة)، کلدان، (مِرْود) کلچێوکی پێ دەڵێن**

دەیخەنــە نێــو کلدانەکــەوەو توزێــك كلــی پێــوە دێ، ئافــرەت چــاوی پــێ دەڕێــژێ، چاو پــێ ڕەش دەکات]، دەبــێ بڵێــن: ئێمــە ئەندامــی نێرینــەی پیاوەکەمــان لــە ئەندامــی مێینــەی ئافرەتەکــەدا بــەو شــێوەیە، کــە کلچێــوك لــە نێــو کلدانــدا دەبینــرێ، ئاوامــان بینیــوەو، دەبــێ بڵێــن: بــە چــاوی خۆمــان بینیــمان، ئنجــا پێویســتە هــەر چواریشــیان وەك یــەك کــت و مــت و بــێ جیاوازیــی، شــایەدییەکە بــدەن، ئەگەرنــا ئیعتیبــاری پــێ ناکــرێ و، دووچــاری ســزا درانیــش دەبــن، وەك چــۆن کاتــی خــۆی ڕووداوێــك بــووە لــە ســەردەمی خەلیفــەی دووەمــدا: عومــەری کــوڕی خەتتــاب (خــوا لێــی ڕازی بــێ)، ئەویــش ئــەوە بــوو[1]:

چــوار کــەس، موغیــرەی کــوڕی شــوعبەیان -کــە یەکێکــە لــە هــاوەڵان، بــەڵام مشــت و مــڕی لەســەرە- چــوار کــەس کۆبوونــەوەو تۆمەتباریــان کــرد کــە زینــای کــردوە لەگــەڵ ئافرەتێکــدا، ئــەو چــوارەش: (أبــو بکــرة)و، (نافــع)ی بــرای و، (زیــاد)و (شــبل بــن معبــد البجــلي)، ئــەم چــوارە شــایەدییاندا، بــەڵام دوایــی زیــاد کشــایەوە، ئەگەرنــا ئەوانــی دیکــە شــایەدییان لەســەردا، (ئنجــا ئایــا ئەبــوو بەکــرو نافیعــی بــرای ڕێــك کەوتــوون و زیادیشــیان قەناعــەت پێهێنــاوەو، شیبلیشــیان قەناعــەت پــێ هێنــاوە؟ ئــەو شــتانەش دەبــن، گرنــگ ئەوەیــە زیــاد کشــایەوە)، مانــەوە: (أبــو بکــرة)و، (نافــع)ی بــرای و، (شــبل بــن معبــد البجــلي)، عومــەر (خــوا لێــی ڕازی بــێ)، نــەك ســزای موغیــرەی نــەدا، بەڵکــو ســزای بوختانــی بەســەر ســێ کەســەکەی دیکــەدا چەســپاند، چونکــە خــوا دەفەرمــوێ: دەبــێ چــوار بــن، چوارەکــەش وەك یــەك شــایەدیی بــدەن، هەڵبەتــە کــە ئەوانــە ســزا دراون و، ســزایەکە لەســەر موغیــرە نەچەســپاوە، ئێســتا هیــچ کــەس بــۆی نیــە موغیــرە تۆمەتبــار بــکات بــەوە، چونکــە ســزایەکەی لەســەر نەچەســپا، ئنجــا ئایــا ئەو ســێیەش کە ســزا دراون، وەك چــۆن زیــاد کشــاوەتەوە، ئایــا ئەوانیــش لــە ڕووی غــەرەز شــەخصییەوە بــووە، یاخــود چونکــە موغیــرە گوتوویەتــی: ئــەو ژنــە خێزانــی خــۆم بــووە کــە ئێــوە دەڵێــن، زینــات لەگەڵیــدا کــردوە، بــەڵام وەك فــڵان ئافرەتــە دەچــێ کــە منتــان پــێ تۆمەتبــار کــردوە! ئــەو مەســەلەیە مشــت و مڕێکــی زۆری لەســەر بــووە، گرنــگ ئەوەیــە

---

(١) أخرجه الحاكم: ٥٨٩٢.

ئەگەر چوار شایەدەکەش شایەدییەکەیان وەك یەك نەبێ، كت و مت، دووچاری سزا دەبن، نەك سزایەکە لەسەر تۆمەتبارەکە بچەسپێ، بەڵکو خۆیان دووچاری سزا دەبن.

## ٤)- دەرهاویشتەکانی سزادران، لەسەر بوختانی داوێن پیسیی:

ئایەتەکە سێ جۆرە سزای گرتوونە خۆی:

١)- هەشتا قەمچیی لێدران.

٢)- ڕەتکردنەوەی شایەدییەکەی، شایەدیی لێ وەرنەگیرێ.

٣)- بە فاسق لە قەڵەم دران، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴾.

١)- ئنجا بە یەکدەنگیی زانایان هەڵاواردن(إستثناء)ەکە (فسق)ەکە دەگرێتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، ئایا ئەم هەڵاواردنە بۆ کوێ دەچێتەوە؟ زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە (فسق)ەکە دەگرێتەوە، واتە: دوای تەوبە کردن، ئەو مرۆڤە سیفەتی لادان (فِسق)ی لەسەر نامێنێ.

٢)- هەروەها بە یەکدەنگیی زانایان سزایەکە لاناچێ، هەرچەندە تۆبە بکات و چاکسازیی بکات، مادام تازە بوختانی کردووەو، مەگەر خۆی بە درۆ بخاتەوە، ئەوە جیایە، ئەگەرنا مادام سوور بێ لەسەر تۆمەتەکەی، سزایەکەی لەسەر لاناچێ و دەبێ سزایەکە بدرێ، چونکە عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) بە (أبو بكرة) و (نافع) و (شبل بن معبد البجلي)، گوت وەك چۆن (زياد) پەشێمان بۆتەوەو خۆی بە درۆ خستۆتەوە، ئێوەش خۆتان بە درۆ بخەنەوە، بۆ ئەوەی شایەدییتان لێ وەربگیرێ و بە فاسیق لە قەڵەم نەدرێن، بەڵام ئامادەنەبوون بڵێن: درۆمان کردوە، ئەگەرنا بابای بوختانچیی ئەگەر بڵێ: درۆم کردو بوختانم کرد، ئەو کاتە سزایەکەشی لەسەر لادەچێ و، شایەدییەکەشی بۆ دێتەوەو، سیفەتی فاسقێتییشی تێدا نامێنێ.

٣)- لە بارەی گێڕانەوەی متمانەش بە شایەدییەکەی، ڕاجیایی هەیە، (الطبري)، گوتوویەتی: {وَالصَّوَابُ مِنَ الْقَوْلِ فِي ذَلِكَ عِنْدَنَا: أَنَّ الإِسْتِثْنَاءَ مِنَ الْمَعْنَيَيْنِ جَمِيعًا}[1].

دەڵێ: قسەی ڕاست لە لای ئێمە لەو بارەوە، ئەوەیە کە هەڵاواردنەکە هەردوو واتایەکە دەگرێتەوە: کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، ئەوە هەم شایەدییەکەش دەگرێتەوەو، خوا لێبوردەو بە بەزەییە بەرانبەریان، واتە: دەبێ شایەدییەکەشیان بۆ بگەڕێتەوە، مادام تەوبەیان کردوەو، چاکسازییان کردوەو، سیفەیی فاسقێتییشیان تێدا لادەچێ.

منیش قسەکەی (الطَّبري)م بە دڵە، کە دەبێ بۆ هەردووکیان بچێتەوە.

## ٥)- چۆنیەتی تۆبەکردنی بابای بوختانکەر:

زانایان دوو ڕایان هەن لەو بارەوە:

١)- هەندێکیان دەڵێن: چۆنیەتی تەوبە کردنەکەی ئەوەیە، خۆی بە درۆی بخاتەوە.

٢)- هەندێکیش دەڵێن: تۆبە کردنەکەی ئەوەیە، خۆی چاك بکات و پەشێمان بێتەوە، لەوەی لێی ڕووی داوە.

(الطبري)، دەڵێ: {وَهَـٰذَا الْقَـوْلُ أَوْلَى الْقَوْلَـيْنِ بِالصَّـوَابِ}[2]، ئەوە کە خۆی چاك بکات و، لە بەینی خۆی و خوادا پەشێمان بێتەوە، ئەوەیان لە ڕاستییەوە نیزیکترە، واتە: بە مەرج نەگیراوە خۆی بە درۆ بخاتەوە، دوای ئەوەی سزا دراوەو، تێپەڕیوە، پابەند نەکراوە بەوەوە کە دەبێ خۆی بە درۆ بخاتەوە، سزایەکەی دراوە، لەسەر ئەوەی ئامادە نەبووە خۆی بە درۆ بخاتەوە، ئێستاش تەوبەکردنەکەی ئەو مەرجەی تێدا نیە، کە دەبێ خۆی بە درۆ بخاتەوە، چونکە سزای خۆی بینیوە لەسەر ئەو تۆمەتەی هەڵیبەستوە.

---

(١) جامع البيان: ج١٨، ص٨٤.

(٢) جامع البيان: ج١٨، ص٨٥.

منیش وای تێدەگەم کە ئەو ڕایەی (الطَّبري) هەڵیبژاردوە، ڕاستە، چونکە، بۆچی خوا دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، جگە لەوانەی دوای ئەوە، پەشێمان بوونەوەو چاکسازییان کردوە، بە تەئکید خوا لێبوردەی بە بەزەییە؟ ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە خوا لەو کەسە دەبووریّ و، بەزەییشی پێیدا دیّ، ئنجا بێگومان لێبوردن و بەزەیی پێداهاتنی خوا، ئەگەر ئەو گوناهبارە، تۆبەکارو چاکەکارە، نەگێڕێتەوە سەر حاڵەتی ناسایی خۆی، مانای وایە بەرهەمێکی نەبوو بۆ وی، ئەدی کوا لێبوردنەکەی خوا! کوا بەزەیی پێدا هاتنەوەکەی خوا! نابێ هاتنە دی (مِصْدَاق)ێکی هەبێ، نابێ بەرهەمێکی هەبێ بۆی، بۆیە من لەوە دڵنیام کە ئەو ڕایە ڕای ڕاستە کە (الطَّبري)یش ڕەحمەتی خوای لێبێ، تەبەنیی کردوەو هەڵیبژاردوە.

مەسەلەی پێنجەم:

**ئەو پیاوانەی ژنەکانیان تۆمەتبار دەکەن بە زیناو، جگە لە خۆشیان شایەدیان نیە، دەبێ چوار کەڕەتان شایەدیی بدەن کە ڕاستگۆن و، جاری پێنجەم بڵێن: نەفرینی خوایان لەسەر بێ، ئەگەر درۆ بکەن، ژنەکەش بەوە سزای زیناکردنی لەسەر لادەچێ، کە چوار کەڕەتان بڵێ: مێردەکەی درۆ دەکات و، جاری پێنجەم بڵێ: ئەگەر ڕاست بکات، تووڕەیی خوای لەسەر بێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ ﴾، ئەو پیاوانەی کە هاوسەرەکانیان، تۆمەتبار دەکەن (بە زینا کردن)، (أي يقذفونهن بالزِّنى)، تۆمەتباریان دەکەن بەوە کە زینایان کردوە.

٢)- ﴿ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ ﴾، جگە لە خۆشیان هیچ شایەدێکیان نیە، (أَنفُسُهُمْ)، خوێنراویشەتەوە: (أَنْفُسَهُمْ)، کە هەر یەك واتایان هەیە.

٣)- ﴿ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ ﴾، چۆنیەتیی شایەدیی دانی یەکێکیان ئەوەیە.

٤)- ﴿ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ﴾، کە چوار جاران شایەدیی بە خوا بدات، واتە: بڵێ: (أشهد بالله)، یانی: من ئەو قسەیە دەکەم لە حاڵێکدا کە خوا دەبینم و، خوا بە شایەد دەگرم لەسەر خۆم کە ڕاست دەکەم، ﴿ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ﴾، یانی: (أَرْبَعَةُ أَيْمَان)، واتە: چوار جاران سوێند بخوات.

٥)- ﴿إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾، کە ئەو لە ڕاستانە، لەو قسەیەدا کە بەرانبەر بە هاوسەرەکەی، بەرانبەر بە ژنەکەی دەیکات.

٦)- ﴿وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾، جاری پێنجەمیش بڵێ: نەفرینی خوای لەسەر بێ، ئەگەر لە درۆکەران بێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ﴾، خوێنراویشەتەوە: (أَنْ لَعْنَةُ اللهِ)، (اللَّعْن)، دورخستنەوەیە، بە ڕیسوا کردنەوە، ئەوە بە نسبەت پیاوەکەوە، ئنجا ئەگەر ئافرەتەکە وەڵامی نەدایەوە مانای وایە، ئەو تۆمەتەی پیاوەکە بۆ ژنەکەی کردوە، لەسەری دەسەپێ و، دووچاری سزادان دەبێ، بەڵام ئایا ئەو ئافرەتە بە چی سزاکەی لە کۆڵ دەبێتەوە، کە بریتیە لە سەد قەمچیی، وەك پێشتر باسمان کرد، کە وشەی (عَذَاب)ی بۆ بەکارهاتوە، هەروەك چۆن لە ئایەتی ژمارە (٢)دا، لە بارەی سەد قەمچییەکەوە فەرموویەتی: ﴿وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا﴾، لێرەش کە دەفەرموێ: ﴿وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ﴾، ئازاری لەسەر لا دەبات، واتە: هەر ئەو سەد قەمچییە، وەك پێشتر باسمان کرد؟ وەڵامی ئەو پرسیارە لە ئایەتەکانی دوایی دایە.

٧)- ﴿وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ﴾، ئازارەکە (سزا سەد قەمچییەکە) لە ئافرەتەکە لا دەبات، چی لایدەبات؟!.

٨)- ﴿أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ﴾، کە (ژنەکە) چوار جاران شایەدیی بە خوا بدات، واتە: چوار جار سوێند بە خوا بخوات.

٩)- ﴿إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾، کە ئەو مێردەی وی، لەو تۆمەتەدا کە بۆی هەڵبەستوە، لە درۆکەرانە.

١٠)- ﴿وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾، جاری پێنجەمیش بڵێ: تووڕەیی خوا لەسەر وی بێ، ئەگەر ئەو (مێردەکەی) لە ڕاستگۆیان بێ، شایانی باسە: (وَٱلْخَٰمِسَةَ)، ئەمە خوێندنەوە (قراءة)ی حەفص و هەندێك لە قورئانخوێنەکان، بەڵام خوێندراویشتەوە: (وَالخَامِسَةُ أَنْ غَضِبَ اللهُ عَلَيْهَا)، واتە: جاری پێنجەمیش بڵێ: کە خوا لێی تووڕەبێ...

هەروەها خوێنراویشەتەوە: (وَالخَامِسَةُ أَنْ غَضَبُ اللهُ عَلَيْهَا)، واتە: پێنجەم بڵێ: کە تووڕەیی خوای لەسەر بێ، بە سێ جۆر، خوێنراوتەوە، ئنجا کە ئافرەتەکەش بەو شێوەیە ئەو چوار جارە سوێندی خواردو، جاری پێنجەمیش بەو شێوەیەی گوت و، ئەو تۆمەتەی مێردەکەی خۆی بەرپەرچ دایەوە، مانای وایە ئافرەتەکەش بەر بەڵا نابێ و سزا نادرێ، ئنجا ئەوە سەر دەکێشێ بۆ ئەوەی لێك جیاببنەوەو، لێك قەدەغە ببن بە یەکجاریی، وەك دوایی باسی دەکەین.

خوا ﷻ لە کۆتایی دا دەفەرموێ:

١٢)- ﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ ﴾، ئەگەر لەبەر بەخششی خواو بەزەیی خواش نەبووایە لەسەر ئێوەو، لەبەر ئەوە نەبووایە کە خوا زۆر تۆبە وەرگری کارزانە.

لێرەدا وەڵامی (لَوْلَا)، فڕتێنراوە، (جوابُ لَوْلَا مَحْذوفٌ لقَصْدِ تَهْويلِ مَضْمُونِهِ)، بە مەبەستی ئەوە کە نیوەڕۆکەکەی زۆر بە گەورە پێشان بدرێ، یانی: ئەگەر لەبەر بەخششی خواو بەزەیی خوا نەبووایە، لەسەر ئێوەو، لەبەر ئەوە نەبووایە کە خوا زۆر تۆبە وەرگری کارزانە، ئاواو ئاوا دەقەوما.

کە دەگونجێ بگوترێ:

{لَوْلَا فَضْلُ اللّهِ عَلَيْكُمْ فَدَفَعَ عَنْكُمْ أَذَى بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ، بِمَا شَرَّعَ مِنَ الزَّوَاجِ، لَتَكَالَبَ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ، وَلَوْلَا رَحْمَةُ اللّهِ بِكُمْ، فَقَدَّرَ لَكُمْ تَخْفِيفاً مِمَّا شَرَعَ مِنَ الزَّوَاجِرِ فِي حَالَةِ الإِضْطِرَارِ وَالْعُذْرِ، لَمَا اسْتَطَاعَ أَحَدٌ أَنْ يَسْكُتَ عَلَى مَا يَرَى مِنْ مَثَارِ الغَيْرَةِ، وَلَوْلَا أَنَّ اللّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ، لَمَا رَدَّ عَلَى مَنْ تَابَ، فَأَصْلَحَ مَا سَلَبَهُ مِنْهُ مِنَ الْعَدَالَةِ وَقَبُولِ الشَّهَادَةِ}[1].

دەگونجێ وەڵامی (لولا) بەمجۆرە مەزەندنە بکرێ:

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٨، ص١٦٨.

أ- ئەگەر بەخششی خوا لەسەر ئێوە نەبووایە، کە ئازاری هەندێکتانی لە هەندێکتانی دوورخستۆتەوە، بەوەی کە خوا ﷻ هەندێ سڵەماندنەوەی داناون، ئەوە هەندێکتان ستەمیان لە هەندێکتان دەکرد.

ب- هەروەها ئەگەر بەزەیی خوا نەبووایە بەرانبەر بە ئێوە، کە هەندێ شتی لەسەر سووك کردوون و، بۆی دابەزاندوون، لەو سزایانەی دایناون، لە حاڵەتی ناچاریی و لە کاتی هەبوونی ڕۆژشدا، ئەوە هیچ کام لە ئێوە نەیدەتوانی بێدەنگ بێ لە بەرانبەر شتێکدا کە دەیبینێت و غیرەتی دەجووڵێنێ، (کە بریتیە لەوەی زینا لەگەڵ هاوسەریدا بکرێ).

ج- هەروەها ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە، کە خوا زۆر تۆبە وەرگری کارزانە، ئەوانەتان کە دەگەڕێنەوەو چاکسازیی دەکەن، ئەو دادگەریی و شایەدیی لێ وەرگیرانەی لێی وەرگرتوونەوە، بە هۆی بوختانکردنەکەوە، بۆی نەدەگێڕانەوە.

دەشـــگونجێ شـــتی دیکـــەش تەقدیـــر بکـــرێ، گرنـــگ ئەوەیـــە خـــوا دەفەرمـــوێ: ئەگـەر بەخشـش و بەزەیـی خـوا لەسـەر ئێـوە نەبووایـەو، لەبـەر ئـەوە نەبووایـە کـە خـوا زۆر تەویـە وەرگـرو کاربەجێیـە، مانـای وایـە ئێـوە تووشـی زۆر بـەڵاو گرفـت و کێشـە دەبـوون و، نەتاندەتوانـی لێیـان دەربازبـن.

## كورتە باسێك لە بارەی لیعانەوە

ئەم كورتە باسە لە پێنج برگەدا دەخەینە ڕوو:

### ا)- پێناسەی لیعان:

(القرطبي) بەمجۆرە پێناسەی لیعان دەكات، كە پێم وایە تەفسیرەكەی بە ناوی (الجامع لإحكام القرآن)، لە ڕووی حوكم و یاساكانی قورئانەوە، باشترین سەرچاوەیە، زۆر خۆی ماندوو كردوەو وردەكاریی كردوە، دەڵێ:

[**وَكَيْفِيَّةُ اللِّعَانِ أَنْ يَقُولَ الْحَاكِمُ لِلْمُلَاعِنِ: قُلْ أَشْهَدُ بِاللَّهِ لَرَأَيْتُهَا تَزْنِي وَرَأَيْتُ فَرْجَ الزَّانِي فِي فَرْجِهَا، كَالْمِرْوَدِ فِي الْمُكْحُلَةِ، وَمَا وَطِئْتُهَا بَعْدَ رُؤْيَتِي، يُرَدِّدُ هَذَا اللَّفْظَ أَرْبَعَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ يَقُولُ فِي الْخَامِسَةِ: عَلَيَّ لَعْنَةُ اللَّهِ إِنْ كُنْتُ مِنَ الْكَاذِبِينَ، فَإِذَا فَرَغَ الرَّجُلُ مِنَ الْتِعَانِهِ، قَامَتِ الْمَرْأَةُ بَعْدَهُ فَحَلَفَتْ بِاللَّهِ أَرْبَعَةَ أَيْمَانٍ، تَقُولُ فِيهَا: أَشْهَدُ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَكَاذِبٌ، أَوْ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ فِيمَا ادَّعَاهُ عَلَيَّ، وَذَكَرَ عَنِّي، وَإِنْ كَانَتْ حَامِلًا قَالَتْ: وَإِنَّ حَمْلِي هَذَا مِنْهُ، ثُمَّ تَقُولُ فِي الْخَامِسَةِ: وَعَلَيَّ غَضَبُ اللَّهِ إِنْ كَانَ صَادِقًا**][(١)].

دەڵێ: چۆنیەتیی لیعان بەو شێوەیە: كە بابای دادوەر، قازیی، بە پیاوەكە بڵێ كە دەیەوێ لیعان بكات لە ژنەكەی: شایەدیی دەدەم بە خوا ئەو ژنەم بینی كە زینای دەكردو، ئەندامی نێرینەی زیناكەرم لە ئەندامی مێیەنەی ئەودا بینی، وەك چۆن كلچێوك لە كلدانـدا دەبینرێ، دوای ئەوەش كە ئەوەم لێ بینیوە، جیماعم لە گەڵدا نەكردۆتەوە، ئەمە چوار جاران دووبارە دەكاتەوە، جاری پێنجەم دەڵێ: نەفرینی خوا لەسەر من بێ، ئەگەر لە درۆكەران بم،

---

(١ ) الجامع لأحكام القرآن: ج١٢، ص١٥٨.

کاتێ پیاوەکە لێبوّوە، ئنجا ئافرەتەکە ئەگەر ویستی تۆمەتەکە رەت بکاتەوە، هەڵدەستێ دوای وی، ئەویش چوار سوێندان بە خوا دەخوات، دەڵێ: شایەدیی دەدەم بە خوا کە ئەو پیاوە درۆکەرە، یاخود لە درۆکەرانە لەوەدا کە ئیددیعای کردوە لە دژی من و، لە بارەی منەوە باسی کردوە، جاری پێنجەمیش دەڵێ: تووڕەیی خوا لەسەر من بێ، ئەگەر ئەو لە ڕاستان بێ.

ئەمە پێناسەی لیعان و چۆنیەتی مولاعەنە، یاخود لیعان.

## ٢)- چوار پایەکانی لیعان:[1]

لیعان چوار پایەی هەن:

١)- ژمارەی بێژەکانی:

کە بریتین لە چوار شایەدیی دان، هەڵبەتە جاری پێنجەمیش هەر هەیە، بەڵام مەبەست ئەوەیە ئەو بێژانەی دەگوترێن: ئەوەیە کە چوار جار شایەدیی بدات بە خوا، ئنجا ئەو چوار سوێندە لە جیاتی چوار شایەدەکانن، کەسێك کە تۆمەتی داوێن پیسیی بۆ کەسێك دەکات، دەبێ چوار شایەدان بێنێ، ئنجا ئایا پیاو چوار شایەدان لە کوێ بێنێ؟ وەك دوایی باس دەکەین لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیداو، پێشتریش باسمان کردوە، بەڵام بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی باسی دەکەین، ماقووڵ نیە، پیاو مولزەم بکرێ چوار شایەدان بێنێ بەسەر ژنەکەی خۆیەوە، پیاوێك ببینن! شتێکی نالۆژیکییە، شتێکی ناواقیعییشە، بۆیە ئەو چوار سوێندە لە جیاتی ئەو چوار شایەدەن.

٢)- پایەی دووەمی لیعان، ئەوەیە کە شوێنەکەی لە مزگەوت بێ.

٣)- پایەی سێیەمی کاتەکەی دوای نوێژی عەسر بێ.

٤)- پایەی چوارەمی خەڵکیش کۆ کرابێتەوە.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٢، ص١٦١.

هەڵبەتە مەرجیش نیە ئەوانە هەموویان زانایان لەسەریان یەکدەنگ بن:

مـەرج نیـە ئەگـەر لـە مزگـەوت نەبـوو نەبـێ، هەروەهـا مـەرج نیـە ئەگـەر لـە دوای نوێـژی عـەسر نەبـوو، نەبـێ، بـەڵام بـە تەئکیـد دەبـێ چـوار بێـژەکان هەبـن، چـوار شـایەدیی دانـەکان و، دەبـێ خەڵکیـش کۆکرابێتـەوە.

## ٣)- دەرەنجامی لیعان: ئایا لیعان چی لێدەکەوێتەوەو دەرهاویشتەکەی چیە؟

لیعان چوار دەرهاویشتەی دەبن:

أ)- لە یەك جیابوونەوەی ژن و مێردەکە، وەك پێغەمبەر ﷺ بە یەکێك لە هاوەڵان کە مولاعەنەی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا کرد، فەرمووی: [لاَ سَبِيلَ لَكَ عَلَيْهَا] (أخرجه البخاري: ٥٣١٢، ومسلم: ١٤٩٣).

واتـە: تـازە تـۆ هیـچ ڕێـت نیـە بـۆ لای، واتـە: بـۆ تـۆ حـەڵاڵ نیـەو، تاکـو ئەبـەد لێـت قەدەغـە بـووە.

ب)- جەماوەری زانایان دەڵێن: ئەو ژن و پیاوە کە پێکەوە مولاعەنەیان کردوە، هەرگیز پێکەوە هاوسەرگیریی ناکەنەوە، بەڵام ئەگەر پیاوەکە خۆی بە درۆخستەوە، ئەوە پێویستە سزای بوختانکردنەکەی لێ بدرێ، کە هەشتا قەمچییە، منداڵەکەش ئەگەر گریمان ئەو ئافرەتە تۆلدار بوو بوو، منداڵەکەش دەبێتە هی پیاوەکە، بەڵام ئافرەتەکە هەر نابێ بگەڕێتەوە بۆ لای، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: [الْمُتَلاَعِنَانِ إِذَا تَفَرَّقَا لا يَجْتَمِعَانِ أَبَدًا] (أخرجه الدارقطني: ١١٦، البيهقي: ١٥١٣١، والديلمي: ٦٦١٧).

واتـە: هـەردوو لیعـان لـە یەکـدی کەرەکـە، ئەگـەر لێـك جیابوونـەوە، هەرگیـز پێکـەوە کۆنابنـەوە، بـەڵام بـە نسـبەت منداڵەکـەوە، ئەگـەر پیاوەکـە خـۆی بـە درۆخسـتەوە، سـزای بوختـان کردنـی لـێ دەدرێ و، منداڵەکـە دەبـێ بـە هـی ئـەو.

ج)- منداڵەکە پاڵ نادرێتە لای مێردەکەی، مەگەر خۆی بە درۆخستبێتەوە، ئەگەر خۆشی بە درۆ خستبێتەوە، دەبێ سزای بوختانکردنی لێ بدرێ، کە هەشتا قەمچییە.

د)- بەڵام ئەگەر ژنەکە وەڵامی لیعانەکەی نەدایەوە، ئەوە سزای زینای بەسەردا دەچەسپێ، وەك پێشتریش باسمان کردوە.

**٤)- بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی مەبەست دەبێ سەرەنجی هەردووك بەسەرهاتی، (هلال بن أمية) و، (عمير العجلاني)، بدرێ:**

ئێمە پێشتر لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانەدا، هێناومانن، بۆیە ئێستا دووبارە ناگەڕێینەوە سەریان، بەڵام بەسەر هاتی (**هلال بن أمية**)، دێنین، هەڵبەتە بە شێوەیەکی دیکە.

بۆ ئەوەی بزانین ئەم یاسای لیعانە، کە ئەویش جۆرێکە لە سزا، مسوڵمانانی لە چ گرفت و کێشەیەکی گەورەو بێ ڕەزا دەرباز کردو، چ گرفتێکی گەورەی بۆ چارەسەر کردن؟ با تەماشای ئەم دەقە بکەین:

**{لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ﴾، قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ: وَهُوَ سَيِّدُ الْأَنْصَارِ: هَكَذَا أُنْزِلَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ أَلَا تَسْمَعُونَ مَا يَقُولُ سَيِّدُكُمْ؟ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَا تَلُمْهُ فَإِنَّهُ رَجُلٌ غَيُورٌ، وَاللَّهِ مَا تَزَوَّجَ امْرَأَةً قَطُّ إِلَّا بِكْرًا، وَمَا طَلَّقَ امْرَأَةً لَهُ قَطُّ، فَاجْتَرَأَ رَجُلٌ مِنَّا أَنْ يَتَزَوَّجَهَا، مِنْ شِدَّةِ غَيْرَتِهِ. فَقَالَ سَعْدٌ: وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنِّي لَأَعْلَمُ أَنَّهَا حَقٌّ وَأَنَّهَا مِنَ اللَّهِ، وَلَكِنِّي قَدْ تَعَجَّبْتُ أَنِّي لَوْ وَجَدْتُ لَكاعًا قَدْ تَفَخَذها رَجُلٌ، لَمْ يَكُنْ لِي أَنْ أُهَيِّجَهُ وَلَا أُحَرِّكَهُ حَتَّى آتِيَ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ، فَوَاللَّهِ لَا آتِي بِهِمْ حَتَّى يَقْضِيَ حَاجَتَهُ. قَالَ: فَمَا لَبِثُوا إِلَّا يَسِيرًا حَتَّى جَاءَ هِلَالُ بْنُ أُمَيَّةَ وَهُوَ أَحَدُ الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ تِيبَ عَلَيْهِمْ، فَجَاءَ مِنْ أَرْضِهِ عِشَاءً، فَوَجَدَ عِنْدَ أَهْلِهِ رَجُلًا، فَرَأَى بِعَيْنَيْهِ، وَسَمِعَ بِأُذُنَيْهِ، فلم يُهَيِّجه حَتَّى أَصْبَحَ، فَغَدَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ**

ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي جِئْتُ أَهْلِي عِشَاءً، فَوَجَدْتُ عِنْدَهَا رَجُلًا فَرَأَيْتُ بِعَيْنِي، وَسَمِعْتُ بِأُذُنِي، فَكَرِهَ رسولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا جَاءَ بِهِ، وَاشْتَدَّ عَلَيْهِ.

وَاجْتَمَعَتِ الْأَنْصَارُ فَقَالُوا: قَدِ ابْتُلِينَا بِمَا قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، الْآنَ يَضْرِبُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هِلَالَ بْنَ أُمَيَّةَ، وَيُبْطِلُ شَهَادَتَهُ فِي النَّاسِ! فَقَالَ هِلَالٌ وَاللَّهِ إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ يَجْعَلَ اللَّهُ لِي مِنْهَا مَخْرَجًا، فَوَاللَّهِ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُرِيدُ أَنْ يَأْمُرَ بِضَرْبِهِ، إِذْ أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْوَحْيَ فَنَزَلَتْ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾)، (أخرجه أحمد: ٢١٣١، تعليق شعيب الأرنؤوط: حسن).

لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە: [قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنْ وَجَدْتُ مَعَ امْرَأَتِي رَجُلًا أُمْهِلُهُ حَتَّى آتِيَ بِأَرْبَعَةٍ! وَاللَّهُ لَأَضْرِبَنَّهُ بِالسَّيْفِ غَيْرَ مُصْفِحٍ عَنْهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَتَعْجَبُونَ مِنْ غَيْرَةِ سَعْدٍ، لَأَنَا أَغْيَرُ مِنْهُ، وَاللَّهُ أَغْيَرُ مِنِّي]، (أخرجه أبو داود: ٢٢٥٦٠، والبيهقي في سنن الكبرى: ج٧، ص٣٩٥، والطيالسي: ٢٦٦٧، و ابن أبي حاتم في تفسيره: ٢٥٣٣، وأحمد: ٢٧٤١، ٢٧٤٠).

واتە: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ﴾، سەعدی کوڕی عوبادە کە (سەرۆکی هۆزی خەزرەجی پشتیوانەکان بوو)، گوتی: ئایا ئاوا دابەزیوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ (وەك جۆرێك لە دوو دڵیی بووبێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کۆمەڵی پشتیوانان! گوێتان لێ نیە گەورەکەتان چی دەڵێ؟ (واتە: پرسیارێکی سەیر دەکات، هەڵبەتە دواییش ڕوون دەبێتەوە کە بە ڕاستیی پێ سەیر بوونەکەی سەعد، لە جێی خۆیدا بووە)، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ لۆمەی مەکە، پیاوێکی زۆر بە غیرەتە، (واتە: زۆر بە تەنگ ناموسەوەیە)، سوێند بە خوا هیچ کاتێك هاوسەرگیریی لەگەڵ ئافرەتێکدا نەکردوە، کە دوایی لێی جیا بۆتەوە، پیاوێك لە ئێمە جورئەتی کردبێ هاوسەرگیریی لەگەڵ ئەو ئافرەتە

تەڵاق دراوەی ئەودا بکات، لەبەر زۆر غەیرە هەبوونی، سەعد گوتی: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ، من دەزانم کە ئەوە هەقەو، لە خواوەیە، بەڵام بە ڕاستیی پێم سەیر بوو، ئەگەر من نافرەتێکی نزم، (یاخود: هیچ و پووچ) ببینم لەگەڵ پیاوێکدا، بۆم نەبێ پیاوەکە دووربخەمەوەو، بۆم نەبێ بیجووڵێنم، هەتا دەچم چوار شایەدان دێنم، بە خوا چوار شایەدەکان ناهێنم، تاکو ئەو لە ئیشی خۆی دەبێتەوە، (قسەکەشی ڕاستە)، دەڵێ: زۆری پێنەچوو، (کەمێك پێچوو)، هیلالی کوڕی ئومەییە هات، هیلالی کوڕی ئومەییەش، یەکێکە لەو سێ کەسانەی کە تەوبەی لێ قبووڵ کراوە، (ئەوە کە لە سووڕەتی (التوبة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ ﴿١١٨﴾ ﴾، تەوبەش قبوڵ کرا لەو سێیانەی کە دوا خرابوون، ئەوە بوو کە پەنجا ڕۆژ پێچوو، ئنجا پێغەمبەر ﷺ قسەی لەگەڵ نەدەکردن، مسوڵمانان نەیاندەدواندن، دوای پەنجا شەوو پەنجا ڕۆژەکە خوای پەروەردگار تەوبەی لەوانیش قبووڵ کرد)، دەڵێ: لەسەر زەوییەکەی دەهاتەوە، تەماشای کرد پیاوێك لە لای هاوسەریەتی، بە چاوی خۆی دیتی و بە گوێی خۆی، گوێی لە قسەیان بوو، ئەویش لێیان گەڕا تاکو ڕۆژ بۆوە، (نەچوو شەڕو هەرای لەگەڵ نەکرد)، بەیانی چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، (هەڵبەتە زۆریش سروشتێکی نەرمی هەبووە، هیلالی کوڕی ئومەییە)، گوتی: من کاتی خەوتنان چوومەوە بۆ ماڵێ، پیاوێکم لە لای ژنەکەم بینی، بە چاوی خۆم دیتم و، بە گوێی خۆشم گوێم لێبوو (لە دەنگیان کە زینای لەگەڵ دەکرد)، پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆش بوو ئەو هەواڵەی بۆ هات و، زۆریش لەسەر دڵی قورس بوو، پشتیوانەکان کۆبوونەوەو گوتیان: ئەوەی سەعدی کوڕی عوبادە گوتبووی، ئەوە پێی تاقیکراینەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێ هەشتا قەمچیی لە هیلالی کوڕی ئومەییە بدات و، شایەدییەکەشی لە نێو خەڵکیدا بە تاڵ بکاتەوە، (شایەدیی لێ وەرنەگیرێ و بە فاسیقیش لە قەڵەم بدرێ)، هیلالیش گوتی: بە خوا من ئومێدم وایە کە خوا لەم بەڵایە دەروویێکم بۆ بکاتەوە،

ئنجا سوێند بە خوا، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیویست هەشتا قەمچییەکەی لێبدات، خوا ﷻ وەحیی دابەزاندە سەری، ئەو پێنج ئایەتەی دەربارەی لیعان ناردنە خوار: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلۡخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ أَن تَشۡهَدَ أَرۡبَعَ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلۡخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾﴾.

لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتووە، (هەر ئەو سەرچاوانەی ئاماژەمان پێدان، هەردوو ڕیوایەتەکەیان هێناون)، دەڵێ: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی، سەعدی کوڕی عوبادە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەگەر پیاوێك لەگەڵ ژنەکەمدا ببینم، لێی دەگەڕێم دەچم چوار شایەدان دێنم؟ بە خوا بە شمشێرەکەم لێی دەدەم، چاو پۆشیی لێناکەم، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئایا سەرتان سووڕدەمێنێ لە غیرەتی سەعد؟ من لەویش بە غیرەتترم، خواش لە من بە غیرەتترە.

واتە: من لەو زیاتر بە تەنگ ناموسەوەم، خوای پەروەردگاریش زیاتر بە تەنگ ناموس و ئابڕووی بەندەکانیەوەیە، بۆیەش خوا ئەو سزایانەی بەو شێوەیە داناون.

ئنجا ئێستا با تەماشای بکەین:

لە ڕاستییدا ئەو بەسەرهاتە، شتێکی زۆر گەورە بووە، کە پێشێ سەعد پرسیویەتی و، سەعد زۆر لەسەر دڵی قورس بووەو، لە عەقڵیەوە نەچووە، باشە ئەوە بۆ خەڵکی دیکە دەبێ چوار شایەدان بێنی تاکو ئیسپاتی بکات فڵان ژنی فڵانکەس زینای کردوە، یان فڵان پیاوە زینای کردوە، بەڵام پیاو، مێرد بۆ ژنی خۆی چۆن چوار شایەدان دێنێ، چۆن دڵی، غیرەتی، ئابڕووی، کەرامەتی ڕێگەی دەدا، پیاوێك لەسەر ژنەکەی ببینێ ئنجا بگەڕێ چوار پیاوان بێنێ و بڵێ: وەرن تەماشا بکەن!، زۆر قورسە، ناگونجێ شتی وا، هیچ ویژدانێك قبوڵی ناکات، بۆیە پێشێ کە خوای پەروەردگار حوکمەکەی دابەزاندبوو، بە نسبەت غەیرەوە بوو،

بەڵام بە نسبەت پیاوێك كە ژنەكەی تۆمەتبار بكات، ئەوە سزایەكی دیكەی هەیە، خوای پەروەردگار ئەو پێنج ئایەتە موبارەكەی كە ناردنە خوار بۆ چارەسەری ئەوە بوو.

٥)- سێ دەرس لە مەسەلەی لیعان دا:

١)- قورئان چارەسەری كێشەكانی كۆمەڵگای كردوە، هەر كێشەیەك لە كاتی خۆیداو بە شێوازی خۆی، بۆ وێنە: كێشەی بوختانكردنی خەڵك بۆ ژنی خەڵك، بەو شێوەیە چارەسەر دەبێ، كە بوختانكەر یان چوار شایەدان بێنێ، یان دەبێ هەشتا قەمچیی لێ بدرێ، بەڵام پیاوێك بوختان بۆ ژنی خۆی بكات، داوای لێ ناكرێ شایەدان بێنێ، بەڵكو داوای لێ دەكرێ چوار جاران سوێند بخوات و، شایەدیی بدات كە ڕاست دەكات و، جاری پێنجەمیش بڵێ: نەفرینی خوای لێبێ، ئەگەر درۆ بكات.

بە نسبەت ئافرەتەكەشەوە، یان دەبێ بێدەنگ بێ، لە بەرانبەر ئەو شایەدیی دانەی پیاوەكەیداو، تۆمەتەكە لەسەر خۆی ساغ بكاتەوە، ئەو كاتە سزا دەدرێ، سەد قەمچیی لێ دەدرێ، یان ئەوەتا ئەویش بەوە ئەو ئازاردانە (ئەو سەد قەمچییە)ی لە كۆڵ دەبێتەوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ أَن تَشۡهَدَ أَرۡبَعَ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلۡخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾ ﴾، ئافرەتەكەش دەبێ چوار جاران سوێند بخوا، كە پیاوەكەی لە درۆكەرانە، لەو قسەیەدا كە بەرانبەر بەوی كردوویەتی و، جاری پێنجەمیش بڵێ: تووڕەیی خوا لەسەر وی بێ، (لەسەر ئافرەتەكە بێ)، ئەگەر پیاوەكەی ڕاست بكات، ئەو كاتە ئافرەتەكەش سزایەكەی لەسەر لادەچێ و، دەرهاویشتەكەی ئەوە دەبێ، كە ئەو ژن و پیاوە: بۆ تاكو ئەبەد لە یەك حەڕام و قەدەغە دەبن.

٢)- هاوەڵان چەندە پابەند بوون بە ئیسلامەوە! بە ڕاستیی ئینسان سەری سوڕ دەمێنێ، چەندە خۆیان كۆنتڕۆڵ كردوە، چەندە ملكەچ و فەرمانبەر بوون بۆ فەرمانی خواو پێغەمبەر ﷺ، چەندە سروشت و تەبیعەتی خۆیان ملكەچ كردوە بۆ شەریعەت: هیلالی

کوڕی نومەییە کاتێك ئەوە دەبینێ، ناچێ پیاوەکەش و ژنەکەش بکوژێ، بەڵکو سەبر دەگرێ تاکو بەیانی، بەیانی دەچێ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: شتێکی وام بینیوە! بە ڕاستیی ئەوە ئەوپەڕی ملکەچیی بۆ شەریعەت دەگەیەنێ، هەڵبەتە ئەوەی سەعدی کوڕی عوبادەش گوتوویەتی: ئەگەر شتێکی وا ببینم چوار شایەدان ناهێنم، بەڵکو بە تیژایی شمشێر لێی دەدەم! پێغەمبەریش ﷺ بەرپەرچی نەداوەتەوە، بەڵکو فەرموویەتی: سەرتان سوڕ دەمێنێ لە غیرەتی سەعد؟ من لەویش بە غیرەتترم، واتە: منیش ئەگەر شتێکی وا ببینم، هەر وادەکەم، هەروەك ئێستا لە یاساکانی باری کەسێتییشدا، ئەو حاڵەتانە ئینسان لە نیزیکی خۆی: لە کچی، لە خێزانی، لە خوشکی، ببینێ و خۆی کۆنتڕۆڵ نەکاو شتێ بکات، ئەوە هەتا لە یاسای دنیاییشدا دایناوە، بە سووککەر بۆ سزایەکە.

٣)- شەریعەتی خواو زگماك و عەقڵی سەلیم دوو ڕووی دراوێکن! ئەوەی سەعد گوتوویەتی: بۆم قبووڵ ناکرێ، دوایی خوای پەروەردگاریش هەر وایفەرمووە، کە پیاو مولزەم ناکرێ چوار شایەدان بێنێ بۆ سەر ئافرەتەکەی، چوار پیاوان بێنێ.

کەواتـە: ئـەوەی کـە بـە عەقڵـی سـەلیم، مـرۆڤ بـۆی دەچـێ و، فیترەتـی سـاغ دەیخـوازێ، شـەریعەتی خـوای پەروەردگاریـش هـەر ئـەوە دەفەرمـوێ.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی یارمەتیـی هەمـوو لایەکـمان بـدات، کـە زیاتـر لـە نهێنییەکانـی شـەریعەت تێبگەیـن و، زیاتـر خۆمـان مـل پێکـەچ بکەیـن بـۆ خـواو، بـۆ حوکمـی شـەریعەت، بێگومـان ئـەو شـەریعەتەی خـوا ﷻ خێـرو بەرەکەتـە بـۆ دنیـای مـرۆڤ و، بـۆ دوا ڕۆژی مـرۆڤ و، بـۆ تاکـەکان و، بـۆ خێزانـەکان و، بـۆ لایەنـی کۆمەڵایەتیـی و، لایەنـی سیاسـیی، شـەریعەت هەمـووی خێـرو بەرەکەتـە، خـوا یارمەتییـمان بـدات زیاتـر لـەو شـەریعەتەی خـوا تێبگەیـن و، زیاتـر پێـوەی پابەنـد بیـن، بـۆ ئـەوەی بەرەکـەت و پیـزی خـوا، هـەم لـە ژیانـی دنیامانـدا زیاتـر بـێ و، هـەم مایـەی سـەرفرازیی و بەختەوەریـی و سەربەرزییشـمان بـێ لـە ڕۆژی دواییـدا.

سُبْحَانَكَ اللّٰهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان ئایەتەکانـی: (١١ - ٢٦)، واتـە: شـازدە ئایـەت دەگرێتـە خـۆی و، ئـەو شـازدە ئایەتـە هەموویـان لـە بـارەی بەسـەرهاتی بوختـان پێکرانـی عائیشـە دایکـی بڕوادارانــەوەن (خــوا لێــی ڕازی بــێ) و، پوختەکەشــی ئەوەیــە کــە ئــەو بوختانــە درۆیەکـی هەڵبەسـتراوی بـێ بنەمـا بـوو، هەندێـك لـە مسـوڵمانان پێـی هەڵخەڵەتـان و، سەرچاوەکەیشـی (عَبْدُ اللهِ بْـنُ أُبَيّ ابْـنُ سَلُولَ) بـوو، سـەرۆکی مونافیقەکانـی مەدینـە.

خـوای کارزان و میهرەبانیـش لـە سـەرووی حـەوت ئاسـمانانەوە، پاکیـی دایکـمان خاتـوون عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) و (صَفْـوَانُ بْـنُ الْمُعَطِّلِ) ڕاگەیانـدو، ئەوانـەش کـە بوختانەکەیـان کـردو لەسـەریان چەسـپا، هـەم سـزای دنیایـی دران، لەسـەر ڕای زۆربـەی زانایـان، ژمارەیەکیـان و، سـزای دواڕۆژیـش بـۆ ئەوانـەی سـزا نـەدران، وەك: (عَبْـدُ اللهِ بْـنُ أُبَيّ ابْـنُ سَـلُولَ)، لەبـەر ئـەوەی لەسـەری نەچەسـپا، یـان لەبـەر هـەر هۆکارێـك بـێ، ئەوانـەش سـزای قیامـەت، سـزای ڕۆژی دوایـی چاوەڕێیانـە.

﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُو بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ
مِّنْهُم مَّا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّىٰ كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١﴾ لَّوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ
الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا هَٰذَا إِفْكٌ مُّبِينٌ ﴿١٢﴾ لَّوْلَا جَاءُو عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ
شُهَدَاءَ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا بِالشُّهَدَاءِ فَأُولَٰئِكَ عِندَ اللَّهِ هُمُ الْكَاذِبُونَ ﴿١٣﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ
وَرَحْمَتُهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِي مَا أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾ إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ
وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ وَلَوْلَا إِذْ
سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَا أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبْحَانَكَ هَٰذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ ﴿١٦﴾ يَعِظُكُمُ اللَّهُ أَن

تَعُودُوا۟ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧﴾ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَـٰتِ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٨﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَـٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ
وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٌ
رَّحِيمٌ ﴿٢٠﴾ ۞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ
فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۚ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَـٰكِنَّ
ٱللَّهَ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢١﴾ وَلَا يَأْتَلِ أُو۟لُوا۟ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓا۟ أُو۟لِى
ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ
لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَـٰتِ ٱلْغَـٰفِلَـٰتِ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ لُعِنُوا۟ فِى ٱلدُّنْيَا
وَٱلْءَاخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ
﴿٢٤﴾ يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلْحَقَّ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ ٱلْمُبِينُ ﴿٢٥﴾ ٱلْخَبِيثَـٰتُ لِلْخَبِيثِينَ
وَٱلْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَـٰتِ ۖ وَٱلطَّيِّبَـٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَـٰتِ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا
يَقُولُونَ ۖ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٢٦﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

(بە دڵنیایی (بڕوادارینە!) ئەوانەی درۆو بوختانەکەیان هەڵبەست، کۆمەڵێك بوون لە خۆتان، وا مەزانن بۆتان خراپ بوو، بەڵکو بۆتان باش بوو (ئەوانەی هەڵیانبەست)، هەر کامێکیان پشکی خۆی لە (سزای) ئەو گوناهەدا هەیەو، ئەو کەسەیان کە زۆربەی بوختانەکەی هەڵبەست، سزایەکی مەزنی هەیە (لە ڕۆژی دواییدا) ﴿١١﴾ دەبووایە هەر کە گوێبیستی دەبوون، بڕوادارانی پیاوو بڕوادارانی ئافرەت، گومانی باشیان بە خۆیان بردبایەو، گوتبایان: ئەمە درۆو بوختانێکی ئاشکرایە ﴿١٢﴾ دەبووایە بوختانچییەکان چوار شایەدیان لە سەری هێنابان، ئنجا مادام ئەو (چوار) شایەدەیان نەهێنان، ئەوانە لە لای خوا درۆکارن ﴿١٣﴾ ئەگەر بەخشش و بەزەیی خواش لەسەرتان نەبووایە، لە دنیاو دوا ڕۆژدا، بە هۆی ئەو درۆو بوختانەوە کە بە نێوی کەوتن (تێیرژان)، سزایەکی مەزنتان تووش دەبوو ﴿١٤﴾ کاتێك کە بە زمانەکانتان (دەماو دەم) لە یەکدیتان وەردەگرت و، بە زارتان شتێکتان دەگوت، کە زانیارییتان پێی نەبووو، پێتان وابوو شتێکی کەم و سووکە، بەڵام لە لای خوا مەزن بوو ﴿١٥﴾ دەبووایە هەر کە دەتانبیست، گوتباتان: بۆمان نیە قسە لەو بارەوە بکەین، (خوایە) پاکیی بۆ تۆ، ئەمە بوختانێکی مەزنە ﴿١٦﴾ خوا ئامۆژگارییتان دەکات کە ئەگەر بڕوادارن، هەرگیز جارێکی دیکە نەگەڕێنەوە سەر وێنەی ئەو (درۆو بوختان)ە، ﴿١٧﴾ خواش ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوەو، خوا زانای کارزانە ﴿١٨﴾ بێگومان ئەوانەی حەز دەکەن، قسەو کردەوەی دزێوو خراپ بە نێو بڕوادارانـدا تەشەنە بکات (بڵاوبێتەوە) لە دنیاو دوارۆژدا سزایەکی بە ئێشیان هەیەو، خواش دەزانێ بەڵام ئێوە نازانن ﴿١٩﴾ ئەگەر بەخشش و بەزەیی خواش نەبووایە لەسەرتان و، لەبەر ئەوە نەبووایە کە خوا بە پەرۆشی بە بەزەییە (بەزوویی سزاو جەزرەبەی ئەوانەی دەدا کە

ئـەو درۆو بوختانەیـان بڵاوکـردەوە) ﴿٢٠﴾ ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! شـوێنی هەنگاوەکانـی شـەیتان مەکـەون، هـەر کەسـێکیش دوای هەنگاوەکانـی شـەیتان بکـەوێ، گومـڕاو سـەرگەردان دەبـێ، چونکـە ئـەو بـەس فەرمـان بـە قسـەو کـردەوەی دزێـوو خـراپ دەکات و، ئەگـەر بـە هـۆی بەخشـش و بەزەیـی خـواوەش نەبووایـە لەسـەرتان، هەرگیـز هیـچ کامتـان پـاك و چـاك نەدەبـوون، بـەڵام خـوا هـەر کەسـی بـوێ، پـاك و چاكـی دەكات و، خـوا بیسـەری زانایـە ﴿٢١﴾ بـا ئەوانەشـتان کـە خاوەنـی چاكـە و فراوانییـن (لـە سـاماندا) سـوێند نەخـۆن کـە واز بێنـن لـە پێـدان و هاوكاریـی خزمـان و نـەداران و کۆچکەرانـی ڕێـی خـوا، بـا ببـوورن و چاوپۆشـیی بکـەن (لەوانەی خراپەیـان بەرانبـەر کـردوون)، ئایـا پێتـان خـۆش نیـە خـوا لێتـان ببـوورێ، خـواش لێبـوردەی بەزەییـە؟! ﴿٢٢﴾ مسـۆگەر ئەوانـەی بوختـان بـە ئافرەتانـی پاکـی بـێ ئـاگا (لـە گونـاه)و بـڕوادار دەکـەن، لـە دنیـاو دوا ڕۆژدا نەفرینیـان لێکـراوەو، سـزایەکی مەزنیـان هەیـە ﴿٢٣﴾ (ئـەو سـزا مەزنـە) لـە ڕۆژێـك دا دەبـێ کـە زمانیـان و دەسـتیان و لاقیـان شـایەدییان لەسـەر دەدەن بـۆ ئـەوەی دەیانکـرد ﴿٢٤﴾ لـەو ڕۆژەدا خـوا سـزای هـەق و، پـڕ بـە پێسـتیان دەدات و، دەزانـن کـە تەنیـا خـوا هەقـی ڕوون و ئاشـکرایە ﴿٢٥﴾ ئافرەتانـی پیـس شایسـتەی پیاوانـی پیسـن و، پیاوانـی پیـس شایسـتەی ئافرەتانی پیسـن و، ئافرەتانـی پـاك و چـاك شایسـتەی پیاوانـی پـاك و چـاك و، پیاوانـی پـاك و چاکیـش شایسـتەی ئافرەتانـی پـاك و چاکـن، ئەوانـە (کـە بوختانیـان پێکـرا) دوورن لـەوەی (بوختانکـەران دەیڵێـن) لێبوردنێکـی تایبـەت و باشـترین بژێویـان هەیە ﴿٢٦﴾).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(بِٱلۡإِفۡكِ): (الإفْـكُ: الكَـذِبُ، وَالإفْـكُ كُلُّ مَـصْرُوفٍ عَـنْ وَجْهِـهِ الَّـذِي يَحِـقُّ أَنْ يَكُـوْنَ عَلَيْـهِ، وَمِنْـهُ قِيْـلَ لِلرِّيَـاحِ العَادِلَـةِ عَـنِ المَهَـابِّ: مُؤْتَفِكَـةٌ)، (إفْـك) بـە مانـای درۆ دێ و، بـە مانـای هـەر قسـەیەك دێ کـە لـە ڕووە هەقەکەیـەوە کـە دەبووایـە لەسـەری بـێ، لابـدرێ بـۆ ڕووێکـی ناهـەق، هـەر لـەو ڕووەشـەوە ئـەو بایانـەی کـە لـە شـوێنی ئاسـایی خۆیانـەوە هەڵناکـەن، پێیـان دەگوتـرێ: (مُؤْتَفِكَـةٌ)، واتـە: بایـە لادراوەکان.

(عُصۡبَةٌ): (العُصْبَـةُ: جَمَاعَـةٌ مُتَعَصِّبَـةٌ مُتَعَاضِـدَةٌ، مُجْتَمِعَـةُ الـكَلَامِ مُتَعَاضِـدَة)، (عُصْبَـة) کۆمەڵـە خەڵکێکـن کـە بـۆ یـەك دەمارگیـر بـن و، پشـتی یەکـدی بگـرن و، قسـەیان یـەك بـێ و پێکـەوە هـاوکار بـن.

(كِبۡرَهُۥ): (الكِـبْرُ والكُـبْرُ: أَشَـدُّ الـشَّيءِ وَمُعْظَمُـهُ)، ﴿وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ﴾، (كِـبْرُ) و (كُـبْرُ)، یانـی: زۆربـەی شـتێك و لای سـەختیی و گەورەیـی ئـەو شـتە، واتـە: ئـەوەی کە بەشـی زۆری بوختانەکـەی تەبەننیـی کـردو بـڵاوی کـردەوە.

(أَفَضۡتُمۡ فِيهِ): واتـە: تێیـڕژان، (الإفَاضَـةُ فـي القَـوْلِ مُسْـتَعَارٌ مِـنْ إفَاضَـةِ المَـاءِ فـي الإنَـاءِ، أي: كَثْرَتِـهِ فِيْـهِ فَالمَعْنَـى: مَـا أَكْثَرْتُـمُ القَـوْلَ فِيْـهِ، وَالتَحَـدُّثُ فِيْـهِ بَيْنَكُـمْ)، (إفَاضَةُ) لە قسـەدا خوازراوەتـەوە لـە ڕژانـی ئـاو لـە دەفرێـك، دەفرێـك کـە زۆری ئـاو تێبکـرێ، لـە قەراغەکانیـەوە دەڕژێ، واتـە: زۆری ئاوەکـە، کەواتـە: (أَفَضۡتُمۡ فِيهِ)، واتـە: زۆرتـان قسـە لێکـردو، زۆر لـە بارەیـەوە دوان، بـە ناهەقیـش.

(بُهۡتَٰنٌ): (البُهْتَـانُ: الخَـبَرُ الكَـذِبُ الَّـذِي يَبْهَـتُ السَّـامِعَ، لأَنَّـهُ لا شُـبْهَةَ فِي كَذِبِـه)، (بُهْتَـان) ئـەو هەواڵـە درۆیەیـە، کـە بیسـەرەکەی سەرسـام دەکات، لەبـەر ئـەوەی هیـچ گومـان نیـە لـە درۆ بوونیـدا.

(هَیِّنًا): (الهَیْنُ: مُشْتَقٌّ مِنَ الهَوَانِ، هَانَ عَلَی فُلاَنٍ كَذَا: لَمْ یَعُدْ أَمْرَاً مُهِمًّا، وَالمَعْنَى شَیْئَاً هَیْنًا)، (هین) لە (الهَوَانِ)ەوە وەرگیراوە، دەگوترێ: (هَانَ عَلَى فُلاَنٍ كَذَا)، واتە: فڵانكەس فڵان شتەی لە لا (هَیْنٌ)، بوو، واتە: گەر بە لایەوە شتێكی گرنگ نەبووبێ، بێ بایەخ بوو بێ، كەواتە: ﴿وَتَحْسَبُونَهُۥ هَیِّنًا﴾، یانی: (شَیْئَاً هَیْنًا)، پێتان وابوو شتێكی كەم و سووك و گچكەیە ئەو بوختانە!

(تَشِیعَ ٱلْفَـٰحِشَةُ): یانی: فاحیشە بڵاوبێتەوە، لە ئەصڵدا یانی: هەواڵی فاحیشەو شتی ناشیرین بڵاوبێتەوە، هەواڵەكەی بڵاوبێتەوە، واتە: (الشُّیُوعُ مِنْ صِفَاتِ الأَخْبَارِ وَالأَحَادِیثِ كَالفُشُوِّ، وَهُوَ اشْتِهَارُ التَحَدُّثِ بِهَا، أَي: یَشِیعَ خَبَرُهَا)، (شُیُوع) لە سیفەتی هەواڵان و قسانە، وەك (فُشُوّ)، (فُشُو)، یانی: بڵاوبوونەوە، ﴿إِذْ نَفَشَتْ فِیهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ ٧٨﴾الأنبیاء، یان: (فَشَتِ النَّارُ فِي الهَشِیمِ)، ئاگرەكە تێیدا بڵاوبۆوە، كە بریتیە لە باوبوونی قسەكردن لەو بارەوە، واتە: هەواڵەكەی بڵاوبێتەوە.

(ٱلْفَـٰحِشَةُ): (الفَاحِشَةُ: الفِعْلَةُ البَالِغَةُ حَدَّاً عَظِیمَاً فِي الشَّنَاعَةِ، وَالفَحْشَاءُ: كُلُّ فِعْلٍ أَو قَوْلٍ قَبِیحٍ)، (فَاحِشَة) هەر كردەوەیەكە لە ناقوڵاییدا گەیبێتە ئەوپەڕی، وشەی (فَحْشَاء)یش هەر قسەو كردەوەیەكی ناقۆڵاو خراپە.

(خُطُوَٰتِ): كۆی (خُطْوَة)یە، (خُطْوَة): هەنگاو، (الخُطْوَةُ: إِسْمٌ لِنَقْلِ المَاشِي إِحْدَى قَدَمَیْهِ الَّتِي كَانَتْ مُتَأَخِّرَةً عَنِ القَدَمِ الأُخْرَى، وَجَعَلَهَا مُتَقَدِّمَةً عَلَیْهِ)، (خُطْوَة) بریتیە لەوەی بابای كە دەڕوا، بابای پێڕۆ، یەكێك لە پێیەكانی هەڵێنێ كە لە دوایە بووەو، بیخاتە پێش پێیەكەی دیكەی كە لە پێشەوە بووە، واتە: پێ هەڵێنان و ڕۆیشتن.

(أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ): یانی: خاوەن چاكەو خاوەن فراوانیی لە ماڵ و ساماندا، (الفَضْلُ: الزِّیَادَةُ فِي الخَیْرِ وَالكَمَالِ الدِّینِي)، (فَضْل) زێدەییە لە چاكەو لە تەواویی دینداریدا، بەڵام (سَعَة)، یانی: دەوڵەمەندیی و ساماندارێی و دەستڕۆیشتوویی.

(دِینَهُمُ ٱلْحَقَّ): یانی: (جَزَاءَهُمُ الحَقَّ)، سزای پڕ بە پێست، (حَق) یانی: شتی چەسپاوو دادگەرانە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم دە (١٠) ئایەتە کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو
بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ
ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ (١١) لَّوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ ظَنَّ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ
بِأَنفُسِهِمۡ خَيۡرٗا وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفۡكٞ مُّبِينٞ (١٢) لَّوۡلَا جَآءُو عَلَيۡهِ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَۚ فَإِذۡ لَمۡ يَأۡتُواْ
بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُوْلَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ (١٣) وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا
وَٱلۡأٓخِرَةِ لَمَسَّكُمۡ فِي مَآ أَفَضۡتُمۡ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ (١٤) إِذۡ تَلَقَّوۡنَهُۥ بِأَلۡسِنَتِكُمۡ وَتَقُولُونَ بِأَفۡوَاهِكُم
مَّا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنٗا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٞ (١٥) وَلَوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ قُلۡتُم مَّا
يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٞ (١٦) يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُواْ لِمِثۡلِهِۦٓ أَبَدًا
إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ (١٧) وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (١٨) إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن
تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا
تَعۡلَمُونَ (١٩) وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ (٢٠)﴾.

ئەوە لە زاری دایکمان عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئەو دە (١٠) ئایەتە لە بارەی بوختان پێکرانی منەوە هاتنە خوار.

بەڵام ئەگەر سەرنجی کۆی ئایەتەکان بدەین، لە ڕاستییدا (١١ - ٢٦)، یانی: هەر شازدە ئایەتەکە، هەموویان پەیوەستن بە جۆرێك لە جۆرەکان، بەو ڕووداوەوە.

هەروەها لە بارەی هۆی هاتنە خواری ئایەتی (٢٢)ش، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلْيَعْفُواْ وَلْيَصْفَحُوٓاْ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾[1].

ئێمە ئەو دەقە دێنین، کە کۆی هەردوو ڕیوایەتەکەی بوخاریی و موسلیمی تێکەڵ کردوون.

ئەو بەسەر هاتە دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، خۆی دەیگێڕێتەوە، چونکە ڕووداوەکە لە خۆی ڕوویداوەو، خۆی لە هەموو کەس باشتر دەزانێ، چی بووەو چۆن بووەو وردەکارییەکانی چین؟ ئێمە سەرەتا قسەکانی ئەو و دەقە عەرەبییەکەی دێنین، دوایی ڕێك وەریدەگێڕینە سەر زمانی کوردیی، پاشان چەند هەڵوەستەیەکیش لە بەردەم گێڕانەوەکەی خاتوو عائیشەی دایکماندا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەکەین و، چەند شتێکی لێ هەڵدەهێنجین:

[أَنَّ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ سَفَرًا، أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ، فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ مَعَهُ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَأَقْرَعَ بَيْنَنَا فِي غَزْوَةٍ غَزَاهَا، فَخَرَجَ فِيهَا سَهْمِي، فَخَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَذَلِكَ بَعْدَمَا أُنْزِلَ الحِجَابُ، فَأَنَا أُحْمَلُ فِي هَوْدَجِي، وَأُنْزَلُ فِيهِ مَسِيرَنَا، حَتَّى إِذَا فَرَغَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْ غَزْوِهِ، وَقَفَلَ، وَدَنَوْنَا مِنَ الْمَدِينَةِ، آذَنَ لَيْلَةً بِالرَّحِيلِ، فَقُمْتُ حِينَ آذَنُوا بِالرَّحِيلِ، فَمَشَيْتُ حَتَّى جَاوَزْتُ الْجَيْشَ، فَلَمَّا قَضَيْتُ مِنْ شَأْنِي أَقْبَلْتُ إِلَى الرَّحْلِ، فَلَمَسْتُ صَدْرِي، فَإِذَا عِقْدِي مِنْ جَزْعِ ظَفَارِ قَدِ انْقَطَعَ، فَرَجَعْتُ فَالْتَمَسْتُ عِقْدِي، فَحَبَسَنِي ابْتِغَاؤُهُ، وَأَقْبَلَ الرَّهْطُ الَّذِينَ كَانُوا يَرْحَلُونَ لِي، فَحَمَلُوا هَوْدَجِي، فَرَحَلُوهُ عَلَى بَعِيرِيَ الَّذِي كُنْتُ أَرْكَبُ، وَهُمْ يَحْسِبُونَ أَنِّي فِيهِ، قَالَتْ: وَكَانَتِ النِّسَاءُ إِذْ ذَاكَ خِفَافًا، لَمْ

---

(١) صحيح البخاري: (٢٦٣٧، ٢٦٣٧، ٢٦٦١، ٢٨٧٩، ٤٠٢٥، ٤١٤١، ٤٦٩٠، ٤٧٥٠، ٦٦٧٩، ٧٣٦٩، ٧٥٠٠، ٧٥٤٥)، وصحيح مسلم: (٢٧٧٠)، حسبما جاء في (الإستيعاب في بيان الأسباب): أول موسوعة علمية حديثية محققة في أسباب نزول آيات القرآن الكريم، تأليف: سليم بن عيد الهلالي، ومحمد بن موسى آل نصر ج٢، ص٥٥٦، ٥٦١).

يُهَبَّلْنَ وَلَمْ يَغْشَهُنَّ اللَّحْمُ، إِنَّمَا يَأْكُلْنَ الْعُلْقَةَ مِنَ الطَّعَامِ، فَلَمْ يَسْتَنْكِرِ الْقَوْمُ ثِقَلَ الْهَوْدَجِ حِينَ رَحَلُوهُ وَرَفَعُوهُ، وَكُنْتُ جَارِيَةً حَدِيثَةَ السِّنِّ، فَبَعَثُوا الْجَمَلَ وَسَارُوا، وَوَجَدْتُ عِقْدِي بَعْدَمَا اسْتَمَرَّ الْجَيْشُ، فَجِئْتُ مَنَازِلَهُمْ وَلَيْسَ بِهَا دَاعٍ وَلَا مُجِيبٌ، فَتَيَمَّمْتُ مَنْزِلِي الَّذِي كُنْتُ فِيهِ، وَظَنَنْتُ أَنَّ الْقَوْمَ سَيَفْقِدُونِي فَيَرْجِعُونَ إِلَيَّ، فَبَيْنَا أَنَا جَالِسَةٌ فِي مَنْزِلِي غَلَبَتْنِي عَيْنِي فَنِمْتُ، وَكَانَ صَفْوَانُ بْنُ الْمُعَطَّلِ السُّلَمِيُّ ثُمَّ الذَّكْوَانِيُّ، قَدْ عَرَّسَ مِنْ وَرَاءِ الْجَيْشِ فَادَّلَجَ، فَأَصْبَحَ عِنْدَ مَنْزِلِي فَرَأَى سَوَادَ إِنْسَانٍ نَائِمٍ، فَأَتَانِي فَعَرَفَنِي حِينَ رَآنِي، وَقَدْ كَانَ يَرَانِي قَبْلَ أَنْ يُضْرَبَ الْحِجَابُ عَلَيَّ، فَاسْتَيْقَظْتُ بِاسْتِرْجَاعِهِ حِينَ عَرَفَنِي، فَخَمَّرْتُ وَجْهِي بِجِلْبَابِي، وَوَاللهِ مَا يُكَلِّمُنِي كَلِمَةً وَلَا سَمِعْتُ مِنْهُ كَلِمَةً غَيْرَ اسْتِرْجَاعِهِ، حَتَّى أَنَاخَ رَاحِلَتَهُ، فَوَطِئَ عَلَى يَدِهَا فَرَكِبْتُهَا، فَانْطَلَقَ يَقُودُ بِيَ الرَّاحِلَةَ، حَتَّى أَتَيْنَا الْجَيْشَ، بَعْدَمَا نَزَلُوا مُوغِرِينَ فِي نَحْرِ الظَّهِيرَةِ، فَهَلَكَ مَنْ هَلَكَ فِي شَأْنِي، وَكَانَ الَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ، فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَاشْتَكَيْتُ، حِينَ قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ شَهْرًا، وَالنَّاسُ يُفِيضُونَ فِي قَوْلِ أَهْلِ الْإِفْكِ، وَلَا أَشْعُرُ بِشَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ، وَهُوَ يَرِيبُنِي فِي وَجَعِي أَنِّي لَا أَعْرِفُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ اللُّطْفَ، الَّذِي كُنْتُ أَرَى مِنْهُ حِينَ أَشْتَكِي، إِنَّمَا يَدْخُلُ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَيُسَلِّمُ، ثُمَّ يَقُولُ: «كَيْفَ تِيكُمْ؟» فَذَاكَ يَرِيبُنِي، وَلَا أَشْعُرُ بِالشَّرِّ، حَتَّى خَرَجْتُ بَعْدَمَا نَقَهْتُ وَخَرَجَتْ مَعِي أُمُّ مِسْطَحٍ قِبَلَ الْمَنَاصِعِ، وَهُوَ مُتَبَرَّزُنَا، وَلَا نَخْرُجُ إِلَّا لَيْلاً إِلَى لَيْلٍ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ نَتَّخِذَ الْكُنُفَ قَرِيبًا مِنْ بُيُوتِنَا، وَأَمْرُنَا أَمْرُ الْعَرَبِ الْأُوَلِ فِي التَّنَزُّهِ، وَكُنَّا نَتَأَذَّى بِالْكُنُفِ أَنْ نَتَّخِذَهَا عِنْدَ بُيُوتِنَا، فَانْطَلَقْتُ أَنَا وَأُمُّ مِسْطَحٍ، وَهِيَ بِنْتُ أَبِي رُهْمِ بْنِ الْمُطَّلِبِ بْنِ عَبْدِ مَنَافٍ، وَأُمُّهَا ابْنَةُ صَخْرِ بْنِ عَامِرٍ، خَالَةُ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، وَابْنُهَا مِسْطَحُ بْنُ أُثَاثَةَ بْنِ عَبَّادِ بْنِ الْمُطَّلِبِ، فَأَقْبَلْتُ أَنَا وَبِنْتُ أَبِي رُهْمٍ قِبَلَ بَيْتِي، حِينَ فَرَغْنَا مِنْ شَأْنِنَا، فَعَثَرَتْ أُمُّ مِسْطَحٍ فِي مِرْطِهَا، فَقَالَتْ: تَعِسَ مِسْطَحٌ فَقُلْتُ لَهَا: بِئْسَ مَا قُلْتِ، أَتَسُبِّينَ رَجُلًا قَدْ شَهِدَ بَدْرًا، قَالَتْ: أَيْ هَنْتَاهْ أَوَلَمْ تَسْمَعِي مَا قَالَ؟ قُلْتُ: وَمَاذَا قَالَ؟ قَالَتْ: فَأَخْبَرَتْنِي بِقَوْلِ أَهْلِ الْإِفْكِ، فَازْدَدْتُ مَرَضًا إِلَى مَرَضِي، فَلَمَّا رَجَعْتُ إِلَى بَيْتِي، فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ

اللـهِ ﷺ، فَسَـلَّمَ ثُـمَّ قَـالَ: «كَيْـفَ تِيكُـمْ؟» قُلْـتُ: أَتَـأْذَنُ لِي أَنْ آتِيَ أَبَـوَيَّ؟ قَالَـتْ: وَأَنَـا حِينَئِـذٍ أُرِيـدُ أَنْ أَتَيَقَّـنَ الْخَبَرَ مِـنْ قِبَلِهِـمَا، فَـأَذِنَ لِي رَسُـولُ اللـهِ ﷺ، فَجِئْـتُ أَبَـوَيَّ، فَقُلْـتُ لِأُمِّـي: يَـا أُمَّتَـاهُ مَـا يَتَحَـدَّثُ النَّـاسُ؟ فَقَالَـتْ: يَـا بُنَيَّـةُ هَـوِّنِي عَلَيْـكِ فَوَاللـهِ لَقَلَّـمَا كَانَـتِ امْـرَأَةٌ قَـطُّ وَضِيئَـةٌ عِنْـدَ رَجُـلٍ يُحِبُّهَـا، وَلَهَـا ضَرَائِـرُ، إِلَّا كَـثَّرْنَ عَلَيْهَـا، قَالَـتْ قُلْـتُ: سُـبْحَانَ اللـهِ وَقَـدْ تَحَـدَّثَ النَّاسُ بِهَـذَا؟ قَالَـتْ: فَبَكَيْـتُ تِلْـكَ اللَّيْلَـةَ حَتَّـى أَصْبَحْـتُ لَا يَرْقَـأُ لِي دَمْـعٌ وَلَا أَكْتَحِـلُ بِنَـوْمٍ، ثُـمَّ أَصْبَحْـتُ أَبْـكِي، وَدَعَـا رَسُـولُ اللـهِ صَـلَّى اللـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ عَـلِيَّ بْـنَ أَبِي طَالِـبٍ وَأُسَامَةَ بْـنَ زَيْـدٍ حِـينَ اسْـتَلْبَثَ الْوَحْـيُ، يَسْتَشِـيرُهُمَا فِي فِـرَاقِ أَهْلِـهِ، قَالَـتْ فَأَمَّـا أُسَامَةُ بْـنُ زَيْـدٍ، فَأَشَـارَ عَـلَى رَسُـولِ اللـهِ ﷺ بِالَّـذِي يَعْلَـمُ مِـنْ بَـرَاءَةِ أَهْلِـهِ، وَبِالَّـذِي يَعْلَـمُ فِي نَفْسِـهِ لَهُـمْ مِـنَ الْـوُدِّ، فَقَـالَ: يَـا رَسُـولَ اللـهِ هُـمْ أَهْلُـكَ وَلَا نَعْلَـمُ إِلَّا خَـيْرًا، وَأَمَّـا عَـلِيُّ بْـنُ أَبِي طَالِـبٍ، فَقَـالَ: لَـمْ يُضَيِّـقِ اللـهُ عَلَيْـكَ وَالنِّسَـاءُ سِـوَاهَا كَثِـيرٌ، وَإِنْ تَسْـأَلِ الْجَارِيَـةَ تَصْدُقْـكَ، قَالَـتْ: فَدَعَـا رَسُـولُ اللـهِ ﷺ بَرِيـرَةَ فَقَـالَ: «أَيْ بَرِيـرَةُ هَـلْ رَأَيْـتِ مِـنْ شَيْءٍ يَرِيبُـكِ مِـنْ عَائِشَـةَ؟» قَالَـتْ لَـهُ بَرِيـرَةُ: وَالَّـذِي بَعَثَـكَ بِالْحَـقِّ إِنْ رَأَيْـتُ عَلَيْهَـا أَمْـرًا قَـطُّ أَغْمِصُـهُ عَلَيْهَـا، أَكْثَرَ مِـنْ أَنَّهَـا جَارِيَـةٌ حَدِيثَـةُ السِّـنِّ، تَنَـامُ عَـنْ عَجِـينِ أَهْلِهَـا، فَتَـأْتِي الدَّاجِـنُ فَتَأْكُلُـهُ، قَالَـتْ: فَقَـامَ رَسُـولُ اللـهِ ﷺ عَـلَى الْمِنْـبَرِ، فَاسْـتَعْذَرَ مِـنْ عَبْـدِ اللـهِ بْـنِ أُبَيٍّ ابْـنِ سَـلُولَ، قَالَـتْ: فَقَـالَ رَسُـولُ اللـهِ ﷺ وَهُـوَ عَـلَى الْمِنْـبَرِ: «يَـا مَعْـشَرَ الْمُسْـلِمِينَ مَـنْ يَعْـذِرُنِي مِـنْ رَجُـلٍ قَـدْ بَلَـغَ أَذَاهُ فِي أَهْـلِ بَيْتِـي، فَوَاللـهِ مَـا عَلِمْـتُ عَـلَى أَهْـلِي إِلَّا خَـيْرًا، وَلَقَـدْ ذَكَـرُوا رَجُـلًا مَـا عَلِمْـتُ عَلَيْـهِ إِلَّا خَـيْرًا، وَمَـا كَانَ يَدْخُـلُ عَـلَى أَهْـلِي إِلَّا مَعِـي» فَقَـامَ سَـعْدُ بْـنُ مُعَـاذٍ الْأَنْصَـارِيُّ، فَقَـالَ: أَنَـا أَعْـذِرُكَ مِنْـهُ، يَـا رَسُـولَ اللـهِ إِنْ كَانَ مِـنَ الْأَوْسِ ضَرَبْنَـا عُنُقَـهُ، وَإِنْ كَانَ مِـنْ إِخْوَانِنَـا الْخَـزْرَجِ أَمَرْتَنَـا فَفَعَلْنَـا أَمْـرَكَ، قَالَـتْ: فَقَـامَ سَـعْدُ بْـنُ عُبَـادَةَ وَهُـوَ سَـيِّدُ الْخَـزْرَجِ، وَكَانَ رَجُـلًا صَالِحًـا، وَلَكِـنِ اجْتَهَلَتْـهُ الْحَمِيَّـةُ، فَقَـالَ لِسَـعْدِ بْـنِ مُعَـاذٍ: كَذَبْـتَ لَعَمْـرُ اللـهِ لَا تَقْتُلُـهُ، وَلَا تَقْـدِرُ عَـلَى قَتْلِـهِ، فَقَـامَ أُسَـيْدُ بْـنُ حُضَـيْرٍ وَهُـوَ ابْـنُ عَـمِّ سَـعْدِ بْـنِ مُعَـاذٍ، فَقَـالَ لِسَـعْدِ بْـنِ عُبَـادَةَ: كَذَبْـتَ لَعَمْـرُ اللـهِ لَنَقْتُلَنَّـهُ، فَإِنَّـكَ مُنَافِـقٌ تُجَـادِلُ عَـنِ الْمُنَافِقِـينَ، فَثَـارَ الْحَيَّـانِ الْأَوْسُ وَالْخَـزْرَجُ حَتَّـى هَمُّـوا أَنْ يَقْتَتِلُـوا وَرَسُـولُ اللـهِ ﷺ، قَائِـمٌ عَـلَى الْمِنْـبَرِ، فَلَـمْ يَـزَلْ رَسُـولُ اللـهِ ﷺ يُخَفِّضُهُـمْ حَتَّـى سَـكَتُوا وَسَـكَتَ، قَالَـتْ: وَبَكَيْـتُ

يَوْمِي ذَلِكَ لَا يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلَا أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ، ثُمَّ بَكَيْتُ لَيْلَتِي الْمُقْبِلَةَ لَا يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلَا أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ، وَأَبَوَايَ يَظُنَّانِ أَنَّ الْبُكَاءَ فَالِقٌ كَبِدِي، فَبَيْنَمَا هُمَا جَالِسَانِ عِنْدِي وَأَنَا أَبْكِي اسْتَأْذَنَتْ عَلَيَّ امْرَأَةٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَأَذِنْتُ لَهَا فَجَلَسَتْ تَبْكِي، قَالَتْ: فَبَيْنَا نَحْنُ عَلَى ذَلِكَ، دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَسَلَّمَ، ثُمَّ جَلَسَ، قَالَتْ: وَلَمْ يَجْلِسْ عِنْدِي مُنْذُ قِيلَ لِي مَا قِيلَ، وَقَدْ لَبِثَ شَهْرًا لَا يُوحَى إِلَيْهِ فِي شَأْنِي بِشَيْءٍ، قَالَتْ: فَتَشَهَّدَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حِينَ جَلَسَ، ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ يَا عَائِشَةُ، فَإِنَّهُ قَدْ بَلَغَنِي عَنْكِ كَذَا وَكَذَا، فَإِنْ كُنْتِ بَرِيئَةً، فَسَيُبَرِّئُكِ اللهُ وَإِنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بِذَنْبٍ، فَاسْتَغْفِرِي اللهَ وَتُوبِي إِلَيْهِ، فَإِنَّ الْعَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ بِذَنْبٍ، ثُمَّ تَابَ تَابَ اللهُ عَلَيْهِ» قَالَتْ: فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ، مَقَالَتَهُ، قَلَصَ دَمْعِي حَتَّى مَا أُحِسُّ مِنْهُ قَطْرَةً، فَقُلْتُ لِأَبِي: أَجِبْ عَنِّي رَسُولَ اللهِ ﷺ، فِيمَا قَالَ، فَقَالَ: وَاللهِ مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَقُلْتُ لِأُمِّي: أَجِيبِي عَنِّي رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقَالَتْ: وَاللهِ مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقُلْتُ: وَأَنَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ لَا أَقْرَأُ كَثِيرًا مِنَ الْقُرْآنِ، إِنِّي وَاللهِ لَقَدْ عَرَفْتُ أَنَّكُمْ قَدْ سَمِعْتُمْ بِهَذَا حَتَّى اسْتَقَرَّ فِي نُفُوسِكُمْ وَصَدَّقْتُمْ بِهِ، فَإِنْ قُلْتُ لَكُمْ إِنِّي بَرِيئَةٌ، وَاللهُ يَعْلَمُ أَنِّي بَرِيئَةٌ، لَا تُصَدِّقُونِي بِذَلِكَ، وَلَئِنِ اعْتَرَفْتُ لَكُمْ بِأَمْرٍ، وَاللهُ يَعْلَمُ أَنِّي بَرِيئَةٌ، لَتُصَدِّقُونَنِي وَإِنِّي، وَاللهِ مَا أَجِدُ لِي وَلَكُمْ مَثَلًا إِلَّا كَمَا قَالَ أَبُو يُوسُفَ: ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾﴾ يوسف، قَالَتْ: ثُمَّ تَحَوَّلْتُ فَاضْطَجَعْتُ عَلَى فِرَاشِي، قَالَتْ: وَأَنَا، وَاللهِ حِينَئِذٍ أَعْلَمُ أَنِّي بَرِيئَةٌ وَأَنَّ اللهَ مُبَرِّئِي بِبَرَاءَتِي، وَلَكِنْ، وَاللهِ مَا كُنْتُ أَظُنُّ أَنْ يُنْزَلَ فِي شَأْنِي وَحْيٌ يُتْلَى، وَلَشَأْنِي كَانَ أَحْقَرَ فِي نَفْسِي مِنْ أَنْ يَتَكَلَّمَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ فِيَّ بِأَمْرٍ يُتْلَى، وَلَكِنِّي كُنْتُ أَرْجُو أَنْ يَرَى رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي النَّوْمِ رُؤْيَا يُبَرِّئُنِي اللهُ بِهَا، قَالَتْ: فَوَاللهِ مَا رَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مَجْلِسَهُ، وَلَا خَرَجَ مِنْ أَهْلِ الْبَيْتِ أَحَدٌ، حَتَّى أَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى نَبِيِّهِ ﷺ، فَأَخَذَهُ مَا كَانَ يَأْخُذُهُ مِنَ الْبُرَحَاءِ عِنْدَ الْوَحْيِ، حَتَّى إِنَّهُ لَيَتَحَدَّرُ مِنْهُ مِثْلُ الْجُمَانِ مِنَ الْعَرَقِ، فِي الْيَوْمِ الشَّاتِ، مِنْ ثِقَلِ الْقَوْلِ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَيْهِ، قَالَتْ: فَلَمَّا سُرِّيَ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَهُوَ يَضْحَكُ، فَكَانَ أَوَّلَ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا أَنْ قَالَ: «أَبْشِرِي يَا عَائِشَةُ أَمَّا اللهُ فَقَدْ بَرَّأَكِ» فَقَالَتْ لِي

أُمِّي: قُومِي إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: وَاللهِ لَا أَقُومُ إِلَيْهِ، وَلَا أَحْمَدُ إِلَّا اللهَ، هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ بَرَاءَتِي، قَالَتْ: فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡ﴾، مِنْكُمْ عَشْرَ آيَاتٍ فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ هَؤُلَاءِ الْآيَاتِ بَرَاءَتِي، قَالَتْ: فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ وَكَانَ يُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحٍ لِقَرَابَتِهِ مِنْهُ وَفَقْرِهِ: وَاللهِ لَا أُنْفِقُ عَلَيْهِ شَيْئًا أَبَدًا بَعْدَ الَّذِي قَالَ لِعَائِشَةَ فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ٢٢﴾، (قَالَ حِبَّانُ بْنُ مُوسَى: قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ: هَذِهِ أَرْجَى آيَةٍ فِي كِتَابِ اللهِ)، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَاللهِ إِنِّي لَأُحِبُّ أَنْ يَغْفِرَ اللهُ لِي، فَرَجَعَ إِلَى مِسْطَحٍ النَّفَقَةَ الَّتِي كَانَ يُنْفِقُ عَلَيْهِ، وَقَالَ: لَا أَنْزِعُهَا مِنْهُ أَبَدًا، قَالَتْ عَائِشَةُ: وَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ سَأَلَ زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ عَنْ أَمْرِي «مَا عَلِمْتِ؟ أَوْ مَا رَأَيْتِ؟» فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ أَحْمِي سَمْعِي وَبَصَرِي، وَاللهِ مَا عَلِمْتُ إِلَّا خَيْرًا. قَالَتْ عَائِشَةُ: وَهِيَ الَّتِي كَانَتْ تُسَامِينِي مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ، فَعَصَمَهَا اللهُ بِالْوَرَعِ، وَطَفِقَتْ أُخْتُهَا حَمْنَةُ بِنْتُ جَحْشٍ تُحَارِبُ لَهَا، فَهَلَكَتْ فِيمَنْ هَلَكَ (قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَهَذَا مَا انْتَهَى إِلَيْنَا مِنْ أَمْرِ هَؤُلَاءِ الرَّهْطِ وقَالَ فِي حَدِيثِ يُونُسَ: احْتَمَلَتْهُ الْحَمِيَّةُ).

واتە: لە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک دەیویست بە سەفەر دەربچێ، قورعەی لە نێوان هاوسەرەکانیدا، دەکرد، هەر کامیان قورعەی بۆ دەرچووبایە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆ ئەو سەفەرە، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لە یەکێک لە جەنگەکاندا، کە پێی هەڵسا، قورعەی لە نێوانماندا کێشا، (پشکی لە نێواندا کردین)، پشکی من دەرچوو، (ئەو جەنگە جەنگی (بني مصطلق)، بووە لە ساڵی پێنجەمی کۆچییدا بووە، وەك لە سیرەی ئیبنو هیشام و سەرچاوەکانی دیکەدا هاتوە)، لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووم، ئەویش دوای ئەوە بوو کە ئایەتی پەردە دابەزیبوو، [ئەوە کە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ دەبێ لە پشت پەردەوە خەڵک بیاندوێنێ، (حِجَابٌ) بە مانای پەردە دێ، نەك وەك زۆربەی

مسـوڵمانان وا دەزانـن (حِجَـابٌ)، ئـەو پۆشـاکەیە کـە ئافـرەت دەیپۆشـێ]. منیـش لـە کـەژاوەدا هەڵدەگیـرام، [هـۆدج بریتـی بـووە لـە ژوورێـك، بـە کوردیـی «کـەژاوەی پێ دەڵێـن»، کـە لـە چەرمـی حوشـتر دروسـت کـراوەو ئافـرەت لەوێـدا بـووە، بـۆ ئـەوەی لەوێـدا پۆشـتەو پـەرداخ بـێ و، ئیسـراحەت دەکات]، ڕۆیشـتین هەتـا کاتێـك کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـەو جەنگـەی تـەواو بـووو، گەڕایـەوە، ئێمـەش لـە مەدینـە وە نیزیـك کەوتیـن، لـە گەڕانەوەمانـدا، شـەوێکیان پێغەمبـەر ﷺ (لـەو شـوێنەی بارگەیـان خسـتوە)، جاڕیـدا دەڕۆیـن، (دەڕۆیـن بـەرەو شـاری مەدینـە)، کاتێـك جاڕیانـدا بـۆ ڕۆیشـتن، مـن هەڵسـام ڕۆیشـتم هەتـا لـە سـنووری سـوپایەکە چوومـە دەر، (دەبـێ بـە تەنـێ بووبـێ)، کاتێـك کاری خۆمـم تـەواو کـرد، (مەبەسـتی تـارەت گرتنـە)، هاتـم تاکـو چوومـەوە لای بارەکـەم، چوومـەوە ئـەو شـوێنەی کـە وڵاخەکـەی لێیـە، دەسـتم بـرد بـۆ سـینگم، گۆبەرۆکێـك، ملوانکەیـەك کـە لـە (جَـزْعِ)ی (ظَفَـارٍ) بـوو، [دەبـێ جـۆرە بەردێـك، ئێسـقانێك شـتێکی بـە نـرخ بووبـێ]، تەماشـام کـرد پچـڕاوە، (لـە ملمـدا نەمـاوە)، گەڕامـەوەو، لـەو ملوانکەیـەم گـەڕام، داواکـردن و لـێ گەڕانـی ئـەو ملوانکەیـە منـی دواخسـت، کۆمەڵەکـەش کـە کەژاوەکـەی منیـان هەمـوو جارێ بـار دەکـرد، کەژاوەکـەی منیـان لەسـەر حوشـترەکەم بارکـردووەو، پێیـان وابووە هـەر لە نێو کەژاوەکـەم دام، [کەژاوەکـە کـە ئافرەتی چۆتە نێـو پەردەیەکی هەبـووە، دایداوەتەوە، نەیانزانیـوە، کـەژاوەش هـەر تـۆزێ قـورس بـووەو، نەیانزانیـوە کـە خاتـوو عائیشـەی تێدانیـە]، ئـەو کاتـەش ئافرەتـان جەسـتەیان سـووك بـوو، گۆشـتیان هەڵنەگرتبـووو، خواردنێکـی کەمیـان دەخـوارد، بۆیـە ئـەو کۆمەڵـە پیـاوە کـە کەژاوەکـەی منیـان هەڵگرتبـوو، پێیـان سـەیر نەبـووە، کـە بەرزیـان کردۆتـەوە، سـووك بـووە، منیـش ئـەو کاتـە کچێـك بـووم تەمەنـم کـەم بـوو، ئیـدی حوشـترەکەیان هەڵسـاندووەو ڕۆیشـتوون، منیـش دوای ئـەوەی کـە سـوپایەکە ڕۆیشـتبوو، ئنجـا ملوانکەکـەی خـۆم دۆزیـەوە، هاتمـەوە بـۆ مەنزڵگاکانیـان، نـە کەسـێ لێبـوو بانـگ بـکات و، نـە کەسـێ لێبـوو وەڵام داتـەوە، (کەسـێ لـێ نەمـا بـوو)، منیـش چوومـەوە ئـەو شـوێنەی کـە پێشـتر

لێی بووم، چونکە پێم وابوو، کاتێك هەر دەبێ بزانن منیان لەگەڵ نیم و، بگەڕێنەوە بۆ لام، کاتێك دانیشتبووم لە شوێنەکەی خۆم، خەوم بە سەردا زاڵ بوو، خەوتم. (صَفْوَانُ بْنُ الْمُعَطِّلِ السُّلَمِيُّ الذَّكْوَانِيُّ)یش، شەوگاری کردبۆوە لە پشتی سوپایەکە، [واتە: ئەو لە دووری سوپا شەوگاری کردۆتەوە، بێگومان پێغەمبەر ﷺ دایناوە، بە شوێنی سوپاکەدا بێ، ئەوەك کەسێکیان لێ بەجێ مابێ]، گەیشتە لای شوێنەکەی من، تەماشای کرد: تارمایی مرۆڤێکی نوستووی دی، هات بۆ لام و، کاتێك منی بینی، ناسیمی، چونکە بەر لەوەی پەردەپۆش بکرێین (بخرێینە پشتی پەردەوە)، منی دەبینی، بۆیە ناسیمی، منیش بێدار بوومەوە، بەوە کە دەیگوت: (إنا لله وإنا إليه راجعون)، کاتێك کە منی ناسی، ئەو وشەیەی گوت، منیش دەم و چاوی خۆم بە جیلبابەکەم داپۆشی، سوێند بە خوا، یەك وشەی دیکەی لەگەڵ من نەگوت و، منیش یەك وشەم لێ نەبیست، جگە لە ئیستیرجاعەکەی، [گوتنی: (إنا لله وإنا إليه راجعون)، کە ئەوە لە کاتی موصیبەت و بەڵادا دەگوترێ]، دوایی هات حوشترەکەی خۆی یەخ کردو، پێی لەسەر دوو دەستەکانی دانا، (بۆ ئەوەی حوشترەکە یەخ بێ، نزم بێ)، منیش سواری حوشترەکە بووم، ئەویش لە پێشەوە ڕێشمەی حوشترەکەی گرت و پێش کەوت و، منیش سواری حوشترەکەی بووم، هەتا گەیشتینە لای سوپایەکە، دوای ئەوەی ئەوان گەیشتبوونە نێو چرقەی گەرمای نێوەڕۆ، ئیدی ئەوەی لە بارەی منەوە فەوتا، فەوتا، [واتە: ئەوەی کە درۆو بوختانی کرد، کردی و، ئەوەی کە بوختانەکەی تەبەننیی کرد بە پلەی یەکەم (عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيِّ ابْنُ سَلُولَ)، بوو]، هاتینە مەدینە، کاتێ هاتینە مەدینە، من بۆ ماوەی مانگێك نەخۆش بووم، خەڵکیش لە بارەی ئەو قسەیەوە کە بوختانچییەکان کردبوویان، دەڕژانە نێوی، بەڵام من هەستم بە هیچ لەوە نەدەکرد، بەڵام ئەوەی کە منی دەخستە گومانەوە، ئەوە بوو کە لە ئازارو نەخۆشییەکەمدا، ئەو لوتف و میهرەبانییەی پێشتر لە پێغەمبەری خوام ﷺ دەبینی، کاتێك کە نەخۆش دەبووم، ئەوەم لێ

نەدەبینی، بەڵكو پێغەمبەری خوا ﷺ دەهات، سڵاوی لێ دەكردم و دەیفەرموو: ئەو كەسەتان چۆنە (كَيْفَ تِيكُمْ؟)، دوایی دەڕۆیشت، تا ئەوە تۆزێ منی خستبووە نێو دوو دڵیی، بەڵام هەستم بە هیچ خراپەیەك نەدەكرد، [هەستم بەوە نەدەكرد كە ئەو بوختانە، لە نێو خەڵكیدا قسەو باسی لە بارەوە دەكرێ]، هەتا دوای ئەوەی هەڵساmەوە لە نەخۆشییەكەم و چاك بوومەوە، شەوێك چووینە دەر لەگەڵ دایكی میستەح، بەرەو ئەو شوێنەی كە بۆ تارەت گرتن بۆی دەچووین و، ئێمە تەنیا شەوانە دەردەچووین وەك ئافرەتان، ئەویش بەر لەوەی لە نیزیك ماڵەكانماندا ئاودەست دروست بكەین، ئێمە هەروەك عەرەبی سەرەتا، هەروا لە دەشت تارەتمان دەگرت و ئاودەستمان نەبوو، پێمان ناخۆش بوو لە نیزیك ماڵەكانمانەوە ئاودەست هەبن، ئیدی من و دایكی میستەح كە كچی (أَبِي رُهْمِ بْنِ الْمُطَّلِبِ بْنِ عَبْدِ مَنَافٍ) بوو، دایكیشی كچی (صَخْرِ بْنِ عَامِرٍ) بوو، خوشكی دایكی ئەبوو بەكری صیددیق، كوڕەكەشی (مِسْطَحُ بْنُ أُثَاثَةَ بْنِ عَبَّادِ بْنِ الْمُطَّلِبِ) بوو، ڕۆیشتین من و دایكی میستەح بەرەو ماڵێ، دوای ئەوەی كاری خۆمان تەواو كرد، (تارەتمان گرت)، دایكی میستەح لە سەرپۆشەكەی، لە كۆڵوانەكەی هەڵەنگوت، (لە بەر پێی ئاڵقا)، گوتی: (تَعِسَ مِسْطَحٌ)، میستەح لە بەین بچێ، بەد بەخت بێ، منیش پێمگوت: قسەیەكی زۆر خراپت كرد، چۆن قسە دەڵێی بە پیاوێك كە لە جەنگی بەدردا بەشدار بووە؟ ئەویش گوتی: ئەدی فڵانكەس! ئەوە تۆ نازانی چی گوتوە! گوتم: چی گوتوە؟ ئیدی هەواڵی بوختان چییەكانی پێ گوتم، ئنجا (كە هەر تازەش لە نەخۆشیی هەڵسابوومەوە)، نەخۆشییەكەم زیادی كردو، كاتێك گەڕامەوە بۆ ماڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام و، سڵاوی كرد، گوتی: چۆنن؟ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئایا مۆڵەتم دەدەی بچمەوە ماڵی بابم؟ ئەو كاتەش من مەبەستم ئەوە بوو، كە لە لای ئەوانەوە لە هەواڵەكە دڵنیابم، پێغەمبەری خواش ﷺ مۆڵەتی دام، چوومەوە بۆ لای باب و دایكم، بە دایكم گوت: ئەی دایە! ئەوە خەڵك دەڵێن چی؟ ئەوە چییە

ئەو شتە بڵاوبۆتەوە؟ دایکیشم گوتی: کچە خۆشەویستەکەم! لەسەر خۆتی وە زەحمەت مەخە، بە ئاسانیی بیگرە، سوێند بە خوا کەم وا هەبووە: ئافرەتێکی جوان لە لای پیاوێك بێ، خۆشی بوێ، هەوێشی هەبن، مەگەر قسەی لە بارەوە دەکەن، منیش گوتم: (سُبْحَانَ اللهِ)، ئایا خەڵك لەو بارەوە قسەیان کردوە؟ ئیدی ئەو شەوە هەر گریام تاکو بەیانی، فرمێسکم وشك نەبوون و هیچ خەوم لێ نەکەوت، (هەتا بەیانی گریام)، دوایی رۆژی دواییش هەربەردەوام بووم لە گریان، پێغەمبەری خواش ﷺ عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب و ئوسامەی کوڕی زەیدی بانگ کردن کاتێك کە وەحیی دواکەوت، وەحیی پێی وەخرا، راوێژی پێ کردن لەو بارەوە کە ئایا لەگەڵ هاوسەرەکەی بمێنێتەوە، یان لێی جیابێتەوە؟ هەرچی ئوسامەی کوڕی زەید بوو، ئەوەی بە پێغەمبەری خوا ﷺ گوت: لە پاکیی هاوسەرەکەی کە دەیزانێ و، ئەوەی کە لە لای بوو لە خۆشەویستیی بۆی پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ هاوسەری خۆتە، ئێمە جگە لە چاکە لێمان نەزانیوە، بەڵام عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ خوا لە تۆی وەتەنگ نەهێناوەو، ئافرەتیش جگە لەو زۆرن، (واتە: ئەگەر وازیشی لێ بێنی، ئافرەتی دیکە هەن)، ئەگەر پرسیاریش لە کەنیزەکەکە بکەی، راستت لەگەڵ دەڵێ، (کەنیزەکێکیان هەبووە بە ناوی بەریرە)، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ بەریرەی بانگ کرد، گوتی: ئەی بەریرە! ئایا هیچت لە عائیشە بینیوە تۆ بخاتە گومانەوە؟ بەریرە گوتی: نەخێر، سوێند بەو کەسەی تۆی بە هەق ناردوە، هەرگیز شتێکم لێ نەبینیوە، لێی بە رەخنە بگرم، جگە لەوەی کە کچێکی کەم تەمەنە، جاری وا هەبووە کە ئاگاداری هەویری ماڵێ نەبووەو نوستوە، (خەوی بە لادا هاتوە)، ئاژەڵێك کە لە ماڵدا دا دەبەسترێ، هاتوە هەویرەکەی خواردوە! پێغەمبەری خواش ﷺ چووە سەر مینبەرو، پۆزشی بۆ خەڵك هێنایەوە لە بارەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوولەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر فەرمووی: ئەی کۆمەڵی مسوڵمانان! کێ پۆزشم بۆ دێنێتەوە لە بارەی پیاوێکەوە

کە لە ماڵ و خێزانی خۆمدا ئازاری پێگەیاندووم، [اتە: ئەگەر سزای بدەم کێ پۆزشم بۆ دێنێتەوە، یان کێ پشتم دەگرێ؟] سوێند بە خوا، من لە بارەی هاوسەری خۆمەوە جگە لە چاکە نازانم، باسی پیاوێکیشیان کردوە کە هەر چاکەم لە بارەوە بیستوە، [مەبەست پێی صەفوانی کوڕی موعەتیلی سەهمییە]، لەگەڵ خۆشم دا نەبێ نەهاتۆتە لای ماڵێ، سەعدی کوڕی موعاز لە پشتیوانان، (کە سەرۆکی هۆزی ئەوس بوو)، هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ من پۆزشت بۆ دێنمەوە، ئەگەر لە هۆزی ئەوس بێ، لە گەردنی دەدەین، ئەگەر لە برایەکانمان بێ لە خەزرەج، چی فەرمانمان پێ بکەی، وا دەکەین، (خەڵکی مەدینە دوو هۆزی سەرەکیی بوون، خەزرەج و ئەوس).

(دایکمان عائیشە دەڵێ:) سەعدی کوڕی عوبادەش کە گەورەی خەزرەجییەکان بوو، هەڵسا، کە پێشتر پیاوێکی باش بوو، بەڵام لەو کاتەدا دڵی گەرم داهات، [کە باسی خەزرەجی کرد، کە ئەگەر لەوانیش بێ، فەرمانمان پێ بکە چی بڵێی وا دەکەین]، دەمارگیریی عەشیرەتیی گرتی و، بە سەعدی کوڕی موعازی گوت: هەڵە دەکەی، سوێند بە خوا نایکوژی و ناشتوانی بیکوژی، ئوسەیدی کوڕی حوزەیر، کە ئامۆزای سەعدی کوڕی موعاز بوو، ئەویش بە سەعدی کوڕی عوبادەی گوت: بە هەڵەدا چووی، سوێند بە خوا دەیکوژین، تۆش موونافیقی و بەرگریی لە موونافیقان دەکەی، ئیدی هەردوو هۆزی ئەوس و خەزرەج بۆ یەکدی هەڵسان، هەتا ویستیان پێکەوە بە شەڕ بێن، لە یەکدی بدەن، پێغەمبەری خواش ﷺ لەسەر مینبەرەکە بوو، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ هەروا خەریك بوو، بێدەنگی کردن، تاکو ئەوانیش بێدەنگ بوون، پێغەمبەری خواش ﷺ بێدەنگ بوو، (خاتوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ:) ئەو ڕۆژە هەمووی مامەوە فرمێسکم وشك نەبوون و، خەویشم لێ نەکەوت، هەتا باب و دایکم پێیان وابوو کە گریان جەرگم لەت دەکات، ئنجا کاتێك ئەوان لە لام دانیشتبوون، منیش دەگریام ئافرەتێك لە پشتیوانەکان هات، مۆڵەتی خواست، منیش مۆڵەتم دا، ئەویش هات لەگەڵم دەستی کرد بە گریانێ.

کاتێك کە ئێمە لەو حاڵەدا بووین، پێغەمبەری خوا ﷺ لێمان وەژوور کەوت، سڵاوی کردو هات دانیشت، (دایکمان عائیشە دەڵێ:) کە لەو کاتەوەی ئەوەی گوترابوو، گوترابوو لە لام دانەنیشتبوو، مانگێك پێ چوو بوو، وەحیی بۆ نەهاتبوو، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ شایەتمانی هێنا، [عادەتی وا بووە کە قسەیەکی گرنگی کردبێ، فەرموویەتی: (أشْهَدُ أن لا إلـه إلا الله، وأشْهَدُ أن محمداً رسول الله]، هەتا دانیشت، دوایی فەرمووی: (أمَّا بَعْدُ)، ئەی عائیشە! لە بارەی تۆوە ئاواو ئاوام پێگەیشتوە، ئەگەر تۆ بەریی و، پاك بی، خوا پاکیی تۆ دەردەخات، بەڵام ئەگەر گوناهێکت کردبێ، داوای لێبوردن لە خوا بکەو بۆ لای بگەڕێوە، چونکە بەندە ئەگەر دانی بە هەڵەی خۆیدا هێناو، گەڕایەوە بۆ لای خوا، خوا دەگەڕێتەوە بۆی لای و لێی خۆش دەبێ!

ئنجا کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ قسەکەی خۆی تەواو کرد، منیش فرمێسك لە چاومدا نەمابوو، هەتا هەستم نەدەکرد یەك دڵۆپە فرمێسکی تێدا مابێ، بە بابم گوت: وەڵامی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەوە، لەوەدا کە فەرمووی، بابم گوتی: بە خوا نازانم چی بە پێغەمبەری خوا ﷺ بڵێم، بە دایکم گوت: وەڵامی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەوە، ئەویش گوتی: بە خوا نازانم چی بە پێغەمبەری خوا ﷺ بڵێم، منیش کە لەو کاتەدا کچێکی کەم تەمەن بووم و، زۆرم قورئان نەدەخوێندەوەو زۆر شارەزا نەبووم، گوتم: سوێند بە خوا دەزانم کە ئێوە ئەو قسەیەتان بیستوە، هەتا لە دڵتاندا جێگیر بووەو بڕواتان پێی کردوە، ئنجا من بڵێم: بەرییم و پاکم، خواش دەزانێ کە من پاکم، لەو بارەوە بڕوام پێ ناکەن، ئەگەر دانیش بە شتێك دابنێم، کە خوا دەزانێ من پاکم، ئەوە بڕوام پێ دەکەن، سوێند بە خوا من بۆ خۆم و ئێوە هەر وێنەی قسەی بابی یوسوفم دێتە یاد بیڵێم، [ناوی یەعقووبم لە بیرچوو بۆوە بیڵێم، لەو کاتەدا لە یادم نەبوو][1]، کە فەرموویەتی: ﴿ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ ﴾یوسف، خۆڕاگرتنێکی جوان و، خوا پەنا پێبراوە لەو بارەوە کە ئێوە دەیڵێن.

---

(١) ئەمە لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتووە.

دوایی من خۆم من وەرسووڕاندو لەسەر جێیەکەم ڕاکشام، [ڕەنگە ڕووی لەوان بووبێ، پشتی تێ کردوون، پاڵیداوەتەوە لەسەر کەلەکە]، بە خوا ئەو کاتە من دڵنیا بووم کە پاکم و، خواش پاکیی من دەردەخات، بەڵام بە خوا هەرگیز گومانم وا نەبوو لە بارەی منەوە وەحییەك بنێررێتە خوارو بخوێنرێتەوە، خۆمم لە لا، لەوە کەمتر بوو کە خوا (عَزَّ وَجَلَّ)، لە بارەی منەوە فەرمایشت بفەرموێ، بە شتێك کە دوایی ببێتە قورئان و بخوێندرێتەوە، بەڵام ئومێدم وابوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەویدا خەونێك ببینێ و، خوای پەروەردگار پاکیی من دەربخات بۆی.

سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کۆڕو مەجلیسەی هەڵنەستاو، هیچ کام لە خەڵکی ماڵەکە کە دانیشتبووین، هەڵنەستا، تاکو وەحیی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزێنراو، ئەو حاڵەتە گرتی، کە لە کاتی وەحیی بۆ هاتندا دەیگرت، کە جۆرێك لە حاڵەتێکی ناناسایی دەیگرت و لە ڕۆژی ساردی زستاندا، زەنگوڵ زەنگوڵ ئارەقەی پێدا دەهاتە خوار، لەبەر قورسایی ئەو وەحییەی کە دادەبەزیە سەری، کاتێك کە ئەو حاڵەتە لەسەر پێغەمبەر ﷺ لاچوو، (واتە: حاڵەتی وەحیی بۆ هاتنەکە تەواو بوو)، پێغەمبەری خوا ﷺ پێدەکەنی، یەکەمین وشە کە قسەی پێکردو فەرمووی، ئەوە بوو: (أَبْشِرِي يَا عَائِشَةُ)، عائیشە موژدەت لێبێ، خوا (عَزَّ وَجَلَّ)، پاکیی تۆی ڕاگەیاند، دایکم پێی گوتم: هەڵسە بۆ لای، (واتە: سوپاسی بکە)، گوتم: سوێند بە خوا، هەڵناستم بۆ لای و، بێجگە لە خوا (عَزَّ وَجَلَّ)، سوپاس و ستایشی کەس ناکەم، چونکە خوا پاکیی منی دابەزاند، ئنجا خوا ﷻ ئەوەی دابەزاند: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ...﴾، دە (١٠) ئایەتی دابەزاندن لەسەر پاکیی من، ئنجا کاتێك خوا پاکیی منی دابەزاند، ئەبوو بەکری صیددیق (خوا لێی ڕازی بێ) کە پێشتر هاوکاری میستەحی کوڕی ئەثاثەی دەکرد، (کە کوڕە پووری بوو)، لەبەر ئەوەی خزمیشی بووو هەژاریش بوو، ئەبوو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ) سوێندی خوارد: هەرگیز لەمەودوا هیچ شتێك نادەم بە

میستەح، دوای ئەوەی بە عائیشەی گوت، کە گوتی، خوا (عَزَّ وَجَلَّ) یش لەو بارەوە ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِي ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلْيَعْفُواْ وَلْيَصْفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ۝٢٢ ﴾، واتە: با ئەوانەی کە خاوەن بەخششن و خاوەن دارایی فراوانن، سوێند نەخۆن هاوکاریی کەسانێك کە خزمن و نەدارن و، کۆچکەرن، لە ڕێی خوادا هاوکارییان بکەن، (با سوێند لەوە نەخۆن) و با لێیان ببوورن و چاوپۆشییان لێ بکەن، ئایا حەز ناکەن خوا لێتان ببووریّ؟ خواش لێبووردەی میهرەبانە.

ئەبوو بەکریش (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتی: با، سوێند بە خوا حەز دەکەم خوا لێم ببووریّ، بۆیە ئەو هاوکارییەی میستەحی کە دەکرد، بۆی گێڕایەوەو، دەستی کردەوە بە هاوکارییەکەی و، گوتیشی: بە خوا هەرگیز ئەو هاوکارییەی لێ نابڕم، مادام خوا وای پێ خۆشە.

(خاتوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ:) پێغەمبەری خوا ﷺ لە زەینەبی کچی جەحش (هاوسەری پێغەمبەری ﷺ) دەپرسێ لە بارەی منەوە، (زینەب کچە پووری پێغەمبەر ﷺ بوو، لێی پرسیبوو ئەی زەینەب! چیت زانیوە، یان چیت دیوە؟ ئەویش گوتبووی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ من گوێی خۆم و چاوی خۆم دەپارێزم، (کە شتێك بڵێم وا نەبێ)، جگە لە چاکە لێم نەمزانیوە، هەر ئەویش بوو لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ کە مونافەسەی منی کرد بێ (لە ڕێکیی و جوانیی و گەنجیی دا)، بەڵام خوا بە هۆی خۆپارێزییەوە، ئەوی پاراست، کەچی حەمنەی کچی جەحش، [کە خوشکی زەینەبی کچی جەحش بوو]، شەڕی لەسەر خوشکەکەی دەکردو، لەگەڵ ئەوانەدا فەوتا لە بوختانچییەکان، (خاوەن بوختانەکان) کە فەوتان.

واتە: ئەویش لەگەڵ خاوەن بوختانەکاندا، بوختانی کردوە، وەك دوایی باسی دەکەین و سزاش دراوە.

## دە هەڵوەستەی کورت،
## لە بارەی ئەو بەسەرهاتگێڕانەوەیەوە

١)- تەماشای ئەدەبی بەرزی هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ) بکەن، هەم دایکمان عائیشەو، هەم صەفوانی کوڕی موعەتتیلی سەهمیی، کە دەڵێ: **(وَاللهِ مَا يُكَلِّمُنِي كَلِمَةً وَلَا سَمِعْتُ مِنْهُ كَلِمَةً غَيْرَ اسْتِرْجَاعِهِ)**، کاتێك صەفوان دەبینێ دایکمان عائیشە لەسەر جێیەکەی خۆی خەوتوە بە تەنێ، دەزانێ بەجێماوە، دایکمان عائیشە دەڵێ: سوێند بە خوا جگە لەوەی کە گوتی: **(إنا لله وإنا إليه راجعون)**، وشەیەکی دیکەم لێ نەبیست و، وشەیەکی دیکەی نەگوت، حوشترەکەی پەخداو دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، سواری بووە، واتە: نەچووە حیکایەتی لەگەڵدا بکات!

٢)- ئنجا کە دایکی میستەح، دەڵێ: **(تَعِسَ مِسْطَحٌ)**، میستەح لە بەین بچێ، یان: بێمراد بێ، دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) پێی دەڵێ: **(بِئْسَ مَا قُلْتِ، أَتَسُبِّينَ رَجُلًا شَهِدَ بَدْرًا)**، قسەیەکی زۆر خراپت کرد، چۆن جنێو بە پیاوێك دەڵێی، کە لە جەنگی بەدردا ئامادە بووە، (واتە: قسەی پێ مەڵێ)، نەیزانیوە ئەویش یەکێك بووە لە بوختانچییەکان، دایکی بۆیە قسەی پێگوتوە، دایکی لەسەر عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) قسەی پێگوتوەو کوڕو دایکایەتیی لێکنەداوەتەوە، دایکمان عائیشەش بەرگریی لێ دەکات و دەڵێ: قسەی پێ مەڵێ، لە جەنگی بەدردا بەشدار بووە.

تەماشا ئەو دوو هەڵوێستە جوامێرە بکەن! دایکەکە قسە بە کوڕەکەی دەڵێ، لەسەر ئەوەی کە گوناهێك دەکات، بەڵام هاوسەری پێغەمبەریش ﷺ - کە جارێ نازانێ لەبەرچی قسەی پێ دەڵێ - بەرگریی لێ دەکات.

٣)- دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەوەندە پاك بووە، کاتێك لە دایکی دەبیستێ، کە ئەو قسەیە لە نێو خەڵکدا باوە، ئەو بوختانە بە عائیشە کراوە، دەڵێ: **(سُبْحَانَ اللهِ**

أَوَلَقَدْ تَحَدَّثَ النَّاسُ بِهَذَا؟)، پاکیی بۆ خوا، بۆچی خەڵك قسەی واش دەکەن؟ ئایا قسەی وا کراوە لە نێو خەڵکدا؟.

پاشان ئەو هەڵوێستەی تەماشا بکەن کە دەڵێ: (فَبَكَيْتُ تِلْكَ اللَّيْلَةَ حَتَّى أَصْبَحْتُ لَا يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلَا أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ، حَتَّى أَصْبَحْتُ أَبْكِي)، ئەو شەوە هەمووی گریام و، چاوم وشك نەبوو لە فرمێسکان و، خەوم لێ نەکەوت هەتا بەیانی، هەر گریام.

٤)- ئەو هەڵوێستەی بەریرە، کەنیزەکەکە، کە دەڵێ: هەر ئەو رەخنەیەم لە خاتوو عائیشە هەیەو، بەس ئەوەم لێ بینیوە وەك کەم و کورییەك، کە جاری وا هەبووە هەویر شێلدراوە، ئنجا بەرخێك، کارێلەیەك کە دایدەبەستن لە ماڵێ (خزمەتی دەکەن بۆ ئەوەی دوایی سەری برن)، ئەو لە هەویرەکە بێ ئاگا بووەو، ئەو کاریلەو بەرخە هاتوە هەویرەکەی خواردوە، بەس ئەو کەم و کورییەم لێ بینیوە.

٥)- هەڵوێستی جوامێرانەی سەعدی کوڕی موعاذ (خوا لێی ڕازی بێ)، هەڵوێستێکی زۆر پیاوانە بووە، دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: کێ پشتم دەگرێ لە بەرانبەر کەسێکدا کە ئازاری داوم لە خێزانم دا؟ واتە: بوختانی بۆ کردوە، سەعدی کوڕی موعاذ دەڵێ: ئەگەر لە هۆزەکەی خۆمان بێ لە گەردنی دەدەم، ئەگەر لە هۆزی خەزرەجییەکانیش بێ هەرچی جەنابت بفەرمووی، وا دەکەین.

ئەوە هەڵوێستی زۆر جوامێرانە بووە، بەڵام بە پێچەوانەوە، هەڵوێستەکەی سەعدی کوڕی عوبادە، کە سەرۆکی خەزرەجییەکان بووە، بە ڕاستیی هەڵوێستێکی دەمارگیرانەی دواکەوتووانەی نەفامانە بووە، کە بە سەعدی کوڕی موعاذ دەڵێ: نەخێر ناتوانی بیکوژی و، تواناشت بە سەردا نیە.

هەڵبەتە ئەوانەش کە هاوەڵ بوون و ئیمانداری چاکیش بوون، بەڵام جاری وا هەبووە شەیتان زەفەری پێ بردوون و، زەڵلەی پێ کردوون و، دەماری نەفامێتی لە دڵیاندا جووڵاوە، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ جارێك بە ئەبوو زەڕ دەفەرموێ،

دوای ئەوەی بە بیلالی حەبەشەیی دەڵێ: [یا ابْنَ السَّوْدَاء] ئەی کوڕی ئافرەتە ڕەشەکە! پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: [يَا أَبَا ذَرٍّ إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ] **(أخرجه البيهقي في شعب الإيمان: ٥١٣٥)**، واتە: ئەی ئەبوو زەڕ! تۆ پیاوێکی نەفامییت تێدایە.

سەعدی کوڕی عوبادەش (خوا لێی ڕازی بێ) لەو هەڵوێستەیدا، نەفامانە بووە، ئنجا تەماشا بکەن! دەمارگیریی، تیرەگەریی و هۆزگەریی و...هتد، زۆر مەترسییدارە، وەك دایکمان عائیشە گوتوویەتی: (**فَثَارَ الْحَيَّانِ الْأَوْسُ وَالْخَزْرَجُ حَتَّى هَمُّوا أَنْ يَقْتَتِلُوا**)، هەردوو هۆزی ئەوس و خەزرەج لە یەکدی هەڵسان، هەتا ویستیان پێکەوە بە شەڕ بێن، لێك بدەن.

لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەرەوە قسەیان بۆ دەکات!!

مانای وایە بەشەر هەر بەشەرە و نابێتە فریشتە، کەم و کوڕیی و خاڵی بێهێزی هەر دەمێنن.

٦)- هەڵوێستێکی دیکە ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ، خوا وەك تاقیکردنەوەیەکی سەخت، یەك مانگ وەحیی بۆ نەناردوە، لە بارەی عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، کە ئایا ئەو ڕووداوە چۆنە؟ تاکو هەم دایکمان عائیشە چاك تاقی بکرێتەوەو، هەم ئەبوو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، هەم دایکی عائیشە، هەم هاوەڵان، عومەر و عوسمان و عەلیی و ...هتد (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەبێ ئەو هاوەڵانە هەر کامیان چەندەی خەفەت پێ خواردبێ!، ئێمە ئێستا لێرەوە دوای هەزارو چوار سەدو ئەوەندە ساڵە، خەفەتی پێ دەخۆین، ئەوان دەبێ چەندەیان خەفەت پێ خواردبێ، بێگومان تاقیکردنەوە بووە بۆ هەمووان، پێش هەمووان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺو، بۆ دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)و بۆ باب و دایکی خوا لێیان ڕازی بێ.

٧)- هەڵوێستێکی دیکە ئەوەیە کە دایکمان عائیشە دەڵێ: من دڵنیا بووم خوا پاکیی من دەردەخات، بەڵام پێم وا نەبوو، خوا لە بارەی منەوە وەحیی بنێرێتە خوار، بخوێندرێتەوە،

ئەو تەعبیرەی چەند جوانە دەڵێ: (وَلَشَأْنِي فِي نَفْسِي كَانَ أَحْقَرَ مِنْ أَنْ يَتَكَلَّمَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ فِيَّ بِأَمْرٍ يُتْلَى)، خۆم لەلا لەوە بچووکتر بوو کە خوا (عَزَّ وَجَلَّ) لە بارەی منەوە فەرمایشت بفەرموێ و، وەحییێك بنێرێتە خوار تاکو قیامەت بخوێنرێتەوە! ئەها ئینسان ئەگەر خۆی لە لا کەم بوو بەرانبەر بە خوا، ئنجا لە لای خوا بەڕێزەو بە حورمەتەو زۆرە.

٨)- هەڵوێستێکی دیکەی دایکمان عائیشە کە خوا بەیەککگرتنێکی گەورەی تێدا دەدرەوشێتەوە، کە دایکی پێی دەڵێ: هەڵسە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ سوپاسی بکە، دەڵێ: (وَاللهِ لاَ أَقُومُ إِلَيْهِ، وَلَا أَحْمَدُ إِلَّا اللهَ عَزَّ وَجَلَّ)، وەڵڵاهی هەڵناستم بۆ لای و، بێجگە لە خوا ستایشی کەس ناکەم، چونکە خوا پاکیی منی دابەزاندوە، ئەوەش مانای وایە هەقی خوای پەروەردگاری بە تەواویی داوە، هەڵبەتە ئەگەر هەڵیشستاباو سوپاسێکی پێغەمبەری ﷺ کردبایە، هەر چاك بوو، بەڵام گرنگ ئەوەیە لەو کاتەدا دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، تەواو بۆ خوای پەروەردگار یەکلابۆتەوەو، تەوحیدێکی چاکی لە دڵدا هەبووە.

٩)- هەڵوێستێکی دیکە کە شایستەیە هەڵوەستەی لە بەردەمدا بکەین: ئەبوو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، دوای ئەوەی خوا ئەو ئایەتە دەنێرێتە خوارو دەفەرموێ، با سوێند نەخۆن کە هاوکاریی بڕواداران خزم و نەدارو کۆچکەر، بکەن، ئەبوو بەکر دەڵێ: هەرگیز ئەو هاوکارییەی کردوومە، لێی نابڕم، مادام خوا وای پێ خۆشە! کە ئەوەش پایە بەرزیی و ڕێزی ئەبوو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ) لە لای خوا دەگەیەنێ.

١٠)- دەیەم لەو هەڵوەستانە، لەبەردەم هەڵوێستی زەینەبی کچی جەحش (خوا لێی ڕازی بێ)، دایە، کە هەوێی عائیشە بووە (خوا لێی ڕازی بێ)، بەڵام لەبەر ئەوەی ئافرەتێکی بە دین و تەقوا بووە، کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ لێی دەپرسێ، دەڵێ: وەڵڵاهی من چاوو گوێی خۆم دەپارێزم لە چاکە زیاتر لێم نەبینیوە، کەچی خوشکەکەی، خوشکی زەینەب، کە (حمنة)یە، بە هۆی دەمارگیرییەوە بۆ خوشکەکەی، خۆی تووشی ئەو بوختانە کردوەو، دواییش تووشی سزاش بووە.

## ماناى گشتيى ئايەتەكان

لە سەرەتادا دەڵێم: بە ڕاستیی ئەو تاقیکردنەوەیە، ئەو بوختان بۆ کرانەی دایکمان خاتوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)و، سەفوانی کوڕی موعەتیلی سەهمیی، تاقیکردنەوەیەکی زۆر سەخت و دژوارو بە ئێش بووە بۆ پێغەمبەر ﷺو، بۆ دایکمان عائیشە و بۆ باب و دایکیشی بە هەمان شێوە، هەروەها بە تەئکید بۆ سەفوانی کوڕی موعەتیلی سەهمییش و بۆ کۆی هاوەڵانیش، بەڵام بە تایبەت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، کە ماوەی مانگێکیش لەو بارەوە هیچ وەحیی بۆ نەهاتوە، ئەمە زۆر شتی لێ وەردەگیرێ:

یەکەم: پێغەمبەریش ﷺ مرۆڤە وەك ئێمەو، شتێك کە لە ڕێی وەحییەوە پێی نەگوترابێ، نەیزانیوە، کاتێك کە ڕاوێژ دەکات بە عەلی کوڕی ئەبوو تالیب و، ئوسامەی کوڕی زەیدو، ڕاوێژ دەکات بە زەینەبی خێزانی، دواتر ڕاوێژ دەکات بە بەریرە، کەنیزەکەکەیان، مانای وایە: ڕەنگە پێغەمبەر ﷺ جۆرێك لە گومان و دوو دڵییشی بۆ دروست بووبێ، بەشەرە، ئنجا تۆ وەرە یەك مانگ پێغەمبەری پایە بەرزی خوا (محمد) ﷺ بەو ئازارەوە بتلێتەوە، بێگومان خواش ﷻ ئاگای لە هەست و نەستی بووە، کە چەندە دڵی بە ئازارە، چەندە ناڕەحەتە! بەڵام وەك خوا دەفەرموێ: ﴿لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ﴾، واتە: پێتان وا نەبێ بۆتان خراپە، بەڵکو ئەوە بۆ ئێوە چاکە.

دووەم: پێغەمبەران (عَلَيۡهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، لە هەموو کەس تاقیکردنەوەیان قورستر بووە، بە دڵنیاییش ئەوە تاقیکرنەوەیەکی زۆر قورس بووە بۆ پێغەمبەر ﷺو، وەك شایستەی خۆشیەتی، بەو پەڕی سەربەرزییەوە لێی دەرچووە.

سێیەم: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو شتێکی دا، سەر مەشقە بۆ ئۆممەتەکەی، کاتێك کە درۆو بوختانێکیش بۆ کەسێك دەکرێ، تاکو بزانێ چی بکات و کاردانەوەی چی

بێ؟ ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرمەشقیەتی: لە سنووری شەرع لاینەدا، چاوەڕێ بوو داخۆ خوا چی دەفەرموێ و، ڕاوێژی کردوەو، بە پێی عەقڵی خۆی پرسیویەتی: ئایا دەبێ ئەو هەواڵە ڕاست بێ، ڕاست نەبێ؟ کە هەڵوێستیشی لەگەڵ دایکمان عائیشەدا گۆڕاوە، لەوەوە دەڵێم: ڕەنگە گومان و دوو دڵییەکی بۆ دروست بووبێ، کە دایکمان عائیشە دەڵێ: پێشتر کە نەخۆش دەبووم، زۆر لەگەڵم بە لوتف و میهرەبان بوو، بەڵام لەو حاڵەتەدا هەر ئەوەندەی دەگوت: چۆنن؟ مانای وایە دڵی گۆڕاوە، دواجار کە بە دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەفەرموێ: ئەگەر بەریی و پاك بی، خوا پاکیی تۆ دەردەخات و ئەگەر گوناهێکیشت کردوە، داوای لێبوردن لە خوا بکەو بۆ لای پەشێمان ببەوە، مانای وایە پێغەمبەر ﷺ شتێك لە دڵیدا پەیدا بووە، بەرانبەر بە دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ خۆی کۆنترۆڵ کردوە.

چوارەم: بەرانبەر بەوانەش کە بەخراپیی قسەیان کردوە، ویستوویەتی ڕای گشتیی تێبگەیەنێ، چۆتە سەر مینبەر، خەڵکینە! کێ پشتم دەگرێ لە بەرانبەر کەسێکدا کە لە ماڵ و خێزانمدا ئازارم دەدا؟ یان کێ پۆزشم بۆ دێنێتەوە، ئەگەر سزای بدەم؟ چونکە (مَنْ يَعْذِرُنِي)، هەردوو واتایەکە دەگرێتەوە یانی: أ- (مَنْ يَنْصِفُنِي)، ب- (مَن يُؤَيِّدُنِي)، یانی: لەگەڵم دادگەر دەبێ یان: پۆزشم بۆ دێنێتەوە ئەگەر سزای بدەم، مانای وایە پێغەمبەریش ﷺ مادام هەواڵەکە بە نێو خەڵکدا بڵاو بۆتەوە، بە باشی زانیوە ڕای گشتیی بە قازانجی خۆی، تێبگەیەنێ، چونکە نەیزانیوە خوای پەروەردگار چی بڕیار دەدات و، ئەگەری ئەوەی داناوە، لەو بارەوە وەحیی هەر نەیەت، ئنجا هەر دەبوو وەك شتی ڕواڵەتیی دنیایی، بە عەقڵی خۆی و ئیجتیهادو بۆچوونی خۆی و بە ڕاوێژ لەگەڵ هاوەڵاندا، چارەسەری ئەو کێشەیە بکات، ئەگەری ئەوەی داناوە، وەك چۆن دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: خۆم لەلا لەوە کەمتر بوو، کە خوا لە بارەی منەوە وەحیی بنێرێتە خوار.

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بوختانەکەیان هەڵبەست، کۆمەڵێك بوون لە خۆتان.

ئـەوەش سەرزەنشـتێکە بـۆ مسـوڵمانان، کـە چـۆن دەبـێ لـە نێـو مسـوڵماناندا کۆمەڵێـك هەبـن ڕێکبکـەون، بوختـان بکـەن بـۆ هاوسـەری پێغەمبـەر ﷺ؟!، وشـەی (إفـك)، لـە (أَفَـك)ەوە هاتـوە، واتـە: هەڵگەڕانـەوە، دۆڕیەکـی ڕووت، ﴿ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴾، پێتـان وا نەبـێ بـۆ ئێـوە خراپـە، بەڵکـو بـۆ ئێـوە چاکـە.

ئایـا چاکییەکـەی لـە چیدایـە؟ چاکییەکـەی لـەوە دایـە کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ هەتـا سـەختتر تاقـی بکرێتـەوە، پلـەو پایـەی بەرزتـر دەبـێ، هەروەهـا دایکـمان عائیشـەش و دایـك و باب‌یـشی (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، هەروەهـا صەفوانـی کـوڕی موعەتتیلـی سـەهمییش، هەورەهـا باقـی هاوەڵانیـش (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، کـە هـەر کامێکیـان بـە دەوری خـۆی، نەزیـەت و ئـازارو ناسـۆری زۆری چێژتـە دڵ و دەروونـەوە، بـۆ هەمـوو ئەوانـە بۆتـە مایـەی کەفـارەت و سـڕانەوەو، پلـەو پایـەو پاداشـت، پاشـان بـۆ ئـەوەی بزانـن: ئەگـەر شـتێکی وا بـوو، چـۆن مامەڵـەی لەگەڵـدا بکـەن؟ دەرس و پەنـدی لـێ وەربگـرن.

دەفەرمـوێ: ﴿ لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُم مَّا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ ﴾، بـۆ هـەر مرۆڤێـك لەوانـە پشـکی خـۆی هەیـە لـە گوناهەکـە، ئەوەنـدەی کـە بـە دەسـتی هێنـاوە بـۆ قیامـەت، ﴿ وَالَّذِي تَوَلَّىٰ كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، ئـەو کەسـەش کـە مەسـەلەکەی تەبەننیی کـرد، بوختانەکـەی ڕێکخسـت و، لـە بناغـەدا دەسـتی ئـەوی تێدابـوو، سـزایەکی مـەزنی هەیـە، کـە عەبدوڵـڵای کـوڕی ئوبیـی سـەلوول بـوو، چونکـە یەکەمجـار ئـەو کـە دایکـمان عائیشـەی بینـی (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، سـواری حوشـترەکەیەو، صەفوانـی کـوڕی موعەتتیلـی سـەهمیی ڕێشـمەکەی ڕادەکێشـا، گوتـی: حەتمـەن لـە دەسـتی دەربـازی نەبـووە، خێزانـی پێغەمبەرەکەتـان تاکـو بەیانـی لەگـەڵ ئـەو پیـاوە بـووە! لـەوەوە لـە عەبدوڵڵای کـوڕی ئوبەییەوە قسـەکە داکـەوت، دوایـی بـاس دەکەیـن لە مەسـەلە گرنگەکانـدا، ئایـا ئـەو سـزای بوختانچییەتیـی لێـدراوە، کـە هەشـتا قەمچییـە، یـان لێـی نـەدراوە؟! ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، ئەویـان سـزایەکی مەزنـی هەیـە، کـە بـە تەئکیـد مەبەسـت پێـی قیامەتـە، چونکـە لـە دنیـادا سـزای مـەزن کـوا؟ سـزای مـەزن لـە قیامەتـدا هەیـە.

﴿ لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا ﴾، دەبووایە[1] کە دەتانبیست، (ئەو بوختانەتان دەبیست)، پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار، گومانی باشیان بە خۆیان بردبایە، ﴿ وَقَالُوا۟ هَـٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ ﴾، گوتباشیان: ئەوە بوختانێکی ئاشکرایە، نە هاوسەری پێغەمبەر ﷺ، شتی وای لێدەوەشێتەوە، نە ئەو هاوەڵە (خوا لێی ڕازی بێ)و، نە هیچ بەڵگەیەکیش هەیە.

﴿ لَّوْلَا جَآءُو عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ ﴾، دەبووایە چوار شایەدانی لەسەر بێنن، ﴿ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا۟ بِٱلشُّهَدَآءِ ﴾، ئنجا ئەگەر چوار شایەدەکان نەهێنن، ﴿ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْكَـٰذِبُونَ ﴾، ئا ئەوانە لە لای خوا لە درۆکەرانن.

لە لای خوا (عِندَ ٱللَّهِ) یانی: نەك هەر بە ڕواڵەتی شەرع، بەڵکو خوا دەفەرموێ: لە لای من درۆکەرن، چونکە جگە لەوەی کە بە ڕواڵەت شایەدیان نەهێناون، بە پەنهانییش خوای پەروەردگار دەزانێ کە درۆزنن و درۆیان کردوە.

﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِى مَآ أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، ئەگەر لەبەر بەخششی خواو بەزەیی خوا نەبووایە لەسەر ئێوە لە دنیاو دوا ڕۆژدا، بە هۆی ئەوەوە کە تێیڕژان، بە هۆی ئەو مەسەلەیەوە کە قسەی زۆرتان لە بارەوە کرد، ئازارێکی مەزنتان دەبوو، واتە: لە دوا ڕۆژدا.

﴿ إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ ﴾، بێننەوە بەر چاوی خۆتان کاتێك کە بە زمان لە یەکدییتان وەردەگرت و، بە زاری خۆتان شتێکتان دەگوت، کە زانیارییتان لە بارەیەوە نەبوو، ﴿ وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴾، پێتان وابوو شتێکی سووك و ئاسانە، بەڵام لای خوا زۆر مەزن بوو، هەروەها دەماو دەم قسەکەتان دەکرد، پێتان وابوو هەروا قسەیەکی سووك و سادەیە.

﴿ وَلَوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَـٰذَا ﴾، دەبووایە کە دەتانبیست، گوتباتان: بۆمان نیە ئێمە قسەی وا بکەین، لەو بارەوە قسە بکەین، ﴿ سُبْحَـٰنَكَ

---

(١) وشەی (لولا) بە مانای (هلّا)یەو بۆ هاندان (تحضيض)ە.

﴿ هَٰذَا بُهْتَٰنٌ عَظِيمٌ ﴾، پاکیی بۆ تۆ ئەی خوایە! ئەوە بوختانێکی مەزنە، (بُهْتَٰنٌ): کە بوختانی کوردییش لەوە وەرگیراوە، دەڵێ: بریتیە لە هەواڵێك کە بیسەرەکە سەرسام دەکات، هێندە ئاشکراو زەقە کە درۆیە.

﴿ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُوا۟ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، خوا ئامۆژگاریتان دەکات، کە هەرگیز ئەگەر بڕوادار بن، جارێکی دیکە نەگەڕێنەوە سەر قسەی وا، (پەندی لێوەربگرن)، ﴿ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾، خواش ئایەتەکان بۆ ئێوە ڕۆشن دەکاتەوەو، خوا زانای کارزانە.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی حەز دەکەن، شتی ناقۆڵاو ناشیرین بە نێو ئیمانداراندا بڵاوبێتەوە، (ئەوانە) ئازارێکی بە ئێشیان هەیە لە دنیاو لە دوا ڕۆژدا، (واتە: حەز دەکەن: هەواڵی شتی ناشیرین بڵاوبێتەوە)، ﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾، خواش دەزانێ و ئێوە نازانن، واتە: خوا هەموو شتێك دەزانێ، بەڵام ئێوە هەموو شت نازانن، هەندێك شت دەزانن، زۆر شت نازانن.

﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾، ئەگەر لەبەر بەخششی خواو بەزەیی خواش لەسەر ئێوە نەبووایەو، لەبەر ئەوە نەبووایە کە خوا لەگەڵ ئێوەدا زۆر بە پەرۆشەو زۆریش میهرەبانە.

وەڵامەکەی قرتێنراوە، یانی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە، تووشی سزا دەبوون، یان: خوا ﷻ پەلەی دەکرد لە سزادانتان، یاخود: ئەو گرفت و کێشەیەتان بۆ چارەسەر نەدەبوو، دەگونجێ زۆر شت تەقدیر بکرێ.

ئنجا بە پێی ڕیوایەتەکەی دایکمان عائیشە (خوای لێی ڕازی بێ)، ئەم دە ئایەتە (١١ - ٢٠) لە بارەی بەسەرهاتەکەی دایکمان عائیشەو، بوختان پێکرانەکەیەوە هاتوونە خوار، بەڵام وەك پێشتر باسمان کرد: تاکو ئایەتی (٢٦)ش، ئەو شەش ئایەتەی دیکەش، بە جۆرێك لە جۆرەکان پەیوەستن بەو ڕووداوەوە، خوا دەفەرمووێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، واتە: بە شوێن پێی ویدا مەڕۆن، یانی: شەیتان خوتخوتەو دنەدانی خراپتان بۆ دەکات، بە قسەی مەکەن و، بە ڕاستە شەقامی شەرعدا بڕۆن، نەك بە کوێرە ڕێی (قیل و قال)و قسەی بێ بنەمادا، ﴿ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ ﴾، هەر کەسێ بە شوێن هەنگاوەکانی شەیتانیش بکەوێ، ﴿ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ ﴾، بە دڵنیاییی (شەیتان) فەرمان دەکات بە قسەی ناقۆڵاو، بە کردەوەی خراپ، یاخود بە قسەو کردەوەی ناشیرین و، قسەو کردەوەی خراپ، ﴿ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ ﴾، ئەگەر بەخششی خواو بەزەیی خواش نەبووایە لەسەرتان، ﴿ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا ﴾، هەرگیز هیچ کامێکتان پاك و چاك نەدەبوون، ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ ﴾، بەڵام خوا هەر کەسێکی بوێ، چاك و چاکی دەکات، (بە هۆی تاعەتی خۆیەوە)، ﴿ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴾، خواش بیسەری زانایە.

ئنجا دێتە سەر مەسەلەیەکی دیکە، کە هەر پەیوەستە بەو بابەتەوە: ﴿ وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ ﴾، با ئەوانەتان کە خاوەن چاکەن و، خاوەن توانای دارایی فراوانن، سوێند نەخۆن: هاوکاریی کەسانێك بکەن کە خاوەنی خزمایەتیین و، نەدارن و، کۆچکەرن لە ڕێی خوادا، واتە: با سوێند نەخۆن کە هاوکارییان بکەن، یانی: سوێندەکە نەبێتە پەرچ لە بەردەم هاوکاریی کردنیاندا، واتە: با سوێند لە هاوکاریی کردنییان نەخۆن و سوێند نەخۆن کە لەمەودوا هاوکارییان نەکەن، ﴿ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ ﴾، با ببوورن و چاوپۆشیی بکەن، ﴿ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ ﴾، ئایا حەز ناکەن خوا لێتان ببووری؟ ﴿ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾، خواش لێبووردەی بە بەزەییە.

وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەی باسمان کرد: ئەبوو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، کوڕە پوورێکی هەبوو بە ناوی میسطەحی کوڕی ئەثاثە، کە هاوکاریی

دەکرد، لەبەر ئەوەی هەم خزم بوو، هەم نەدار بوو، کۆچکەریش بوو، بەڵام ئەویش یەکێك بوو لەوانەی کە دەستی هەبوو لە بڵاوکردنەوەی ئەو بوختانەدا، بۆیە ئەبوو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، سوێندی لێ خوارد گوتی: لەمەودوا هاوکاریی ناکەم، بەڵام خوا ﷻ ئەم ئایەتەی ناردە خوارو، دوای ئەو ئایەتە ئەبوو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتی: با، حەز دەکەم خوا لێم ببوورێ و، لەمەودوا هەرگیز ئەو یارمەتیی و هاوکارییەی لێ نابڕم، مادام خوا ﷻ وا دەفەرموێ! ئنجا ئا ئەوەیە بە خۆ وێران و لێبوردەیی و دڵ گەورەیی و سەماحەت.

ئنجا خوا ﷻ دووبارە دێتەوە سەر بابەتی بوختان پێکرانەکە، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْغَٰفِلَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ لُعِنُوا۟ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بوختان دەکەن، بۆ ئافرەتانی پاکی بێ ئاگای بڕوادار.

پاکن، یانی: پاککراوەو پارێزراون، خوێندراویشەتەوە: (مُحْصِنَات)، واتە: خۆ پاکڕاگرن، (ٱلْغَٰفِلَٰتِ)، یانی: بێ ئاگان و ئەصڵەن هەر بیریان لەو گوناهە نەکردۆتەوە، (ٱلْمُؤْمِنَٰتِ)، ئیمانداریشن، ﴿لُعِنُوا۟ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ﴾، ئەوانەی کە بوختان بەو جۆرە ئافرەتانە دەکەن، کە: پاکن و بێئاگان و بڕوادارن، لە دنیاو دوا ڕۆژدا نەفرینیان لێکراوە، ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾، هەروەها ئازارێکی مەزنیان بۆ هەیە.

﴿يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم﴾، ڕۆژێك کە زمانەکانیان و دەستەکانیان و لاقەکانیان، شایەدییان لەسەر دەدەن، ﴿بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە دەیانکرد، ﴿يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلْحَقَّ﴾، لەو ڕۆژەدا خوا سزای هەق و دادگەرانەو پڕ بە پێستیان دەدات، ﴿وَيَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ ٱلْمُبِينُ﴾، لەو ڕۆژەشدا چاك دەزانن کە هەر خوا هەقی ڕوون و ئاشکراو بێ چەندو چوونەو، هەقیشی لە لایە.

لە کۆتایی دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱلْخَبِيثَـٰتُ لِلْخَبِيثِينَ وَٱلْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَـٰتِ ﴾، ئافرەتانی پیس شایستەی پیاوانی پیسن و، پیاوانی پیس، شایستەی ئافرەتانی پیسن، ﴿ وَٱلطَّيِّبَـٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَـٰتِ ﴾، ئافرەتانی پاك و چاك، شایستەی پیاوانی پاك و چاكن و، پیاوانی پاك و چاك، هاوكوف و شایستەی ئافرەتانی پاك و چاكن، ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ ﴾، ئەوانە بەریین، دوورن لەوەی ئەو خەڵكە دەیانگوت، ﴿ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾، لێبوردنێكی مەزن و، بژیوێكی پڕ ڕێزو حورمەتیان بۆ هەیە.

لێرەدا خوا ﷻ دەیەوێ پێمان بفەرموێ: خوا ﷻ چۆن ڕێ دەدات ئافرەتێكی پیس، بە قسمەت و نسیبی پێغەمبەرەكەی ﷺ بێ؟ نەخێر ئافرەتانی پیس، شایستەی پیاوانی پیسن و، پیاوانی پیسیش، هاوكوف و شایستەی ئافرەتانی پیسن، كە مەبەست پێی ئەوانەن لە مونافیقەكان و كافرەكان و موشریكەكان، كە خۆیان لە گوناهو تاوان ناپارێزن، بەڵام ئافرەتانی پاك و چاك، شایستەی پیاوانی پاك و چاكن و، پیاوانی پاك و چاكیش، شایستەی ئافرەتانی پاك و چاكن، واتە: دایكمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، شایستەی پێغەمبەری خوایەو ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ شایستەی ئەوە، هەردووكیان هاوكوف و شایستەی یەكدین، لەبەر ئەوەی پاك و چاكن.

دوایی كە خوا دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ ﴾، ئەوانە دوورن لەوەی بوختانكەران دەیڵێن، بۆچی بە ڕاناوی نێرینە هێناویەتی (أُوْلَـٰٓئِكَ)؟ كە ئەوە بۆ كۆی نێرینەیە، لەبەر ئەوەی صەفوانی كوڕی موعەتیلی سەهمیی تێدا بووەو، ئەمە بەپێی بنەمای: (تغليبُ الذكور عَلَى الإنَاث)، زاڵكردنی نێرینە لەسەر مێینە، ڕەفتار كراوە، كە بنچینەیەكی زمانی عەڕەبییە.

یاخود: لەبەر ئەوەی وەك ڕێزو حورمەت بۆ دایكمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، خوا ڕاناوی كۆی بەكارهێناوە، ئەوانە ئەگەر یەكێكەو ئەگەر دووان، بەڵام پایەو مەقامێكی بەرزیان هەیە، پاكن لەوەی كە بوختانچییەكان دەیانگوت، كە ئەوەش بە ڕاستیی موژدەیەكی زۆر خۆشە بۆ دایكمان عائیشە، كە دەفەرموێ: لێبوردنێكی چاك و تایبەت و، بژیوێكی پڕ ڕێزو حورمەتیشیان هەیە، لە ڕۆژی دوایی دا.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**ئەو درۆ بوختانەی لە لایەن هەندێك لە مسوڵمانانەوە (بۆ دایكی بڕواداران: عائیشە) هەڵبەسترا، بۆیان بە خێر دەگەڕێ و، بوختانچییانیش بە تایبەت سەر گەورەکەیان، سزای مەزنی هەیە لە ڕۆژی دواییدا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُو بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُم مَّا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّىٰ كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:**

١)- ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُو بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی کە بوختانەکەیان کرد کۆمەڵێك بوون لە خۆتان، (**الإفْكُ: مُشْتَقٌّ مِنَ الأَفْكِ وَهُوَ قَلْبُ الشَّيْءِ، اسْمٌ يَدُلُّ عَلَى كَذِبٍ لاَ شُبْهَةَ فِيهِ، فَهُوَ بُهْتَانٌ يَفْجَأُ النَّاسَ**)، (إفْك) لە (أَفْك)ەوە وەرگیراوە لە زمانی عەرەبیدا، (أَفْك)یش، (قَلْب)ە، هەڵگێڕانەوەی شتێك، ئەمە ناوێکە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوە درۆیەکە هیچ گومانی تێدانیەو، بوختانێکە خەڵك پێی سەرسام دەبێ، خەڵك پێی تووشی شۆك دەبێ، ئنجا خوا دەفەرموێ: ئەوانەی ئەو بوختانەیان هێنا، کۆمەڵێك بوون لە خۆتان، (عُصْبَة) لە (٣ - ١٠)، یاخود، لە (١٠ - ٤٠) کەسن، بەڵام گرنگ ئەوەیە لێرەدا خوا ﷻ بۆ بە کەم تەماشا کردنی کۆمەڵەکەو قسەکەیان، ئەوە دەفەرموێ: یانی: کەمینەیەك و دەستەیەك بوون، بەڵام لە خۆتان بوون.

کە دەفەرموێ: ﴿جَاءُو بِالْإِفْكِ﴾، واتە: بە ئامانجەوەو، بە نەخشە بۆ دانانەوە، ئەو کارەیان کرد، کە دەشفەرموێ: (جَاءُو) بە زۆریی وایە شاندو

میوان کە هاتوون، هەواڵی تازەیان لە شوێنان هێناوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ ﴾ ئەو هەواڵەیان، ئەو درۆو بوختانەیان هێنا.

٢)- ﴿ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم ﴾، پێتان وا نەبێ ئەو بوختانە بۆ ئێوە خراپە:

أ- بەڵێ پێغەمبەر ﷺ ئازاری زۆری پێوە چێژت، ئاسۆری زۆری چۆوە دڵ، دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دایك و بابی عائیشەو، هاوەڵانی نیزیکی پێغەمبەر ﷺ و هەموو دڵسۆزانی ئیسلام و مسوڵمانان، بەڵام ئینسان تاکو ئازار نەچێژێ، پاداشتیشی نابێ و، بە هۆی ئازار چێژتن و، ناڕەحەت بوونەوە، ئینسان پێگەی بەرزی دەست دەکەوێ:

بِقَدَرِ الْكَدِّ تُكْتَسَبُ الْمَعَالِي ... مَنْ طَلَبَ الْعُلَى سَهَرَ اللَّيَالِي[1].

واتە: بە ئەندازەی ئەوە کە زەحمەت و ڕەنج دەدەیە بەر خۆت، بەرزاییەکان وەدەستدێنی، هەر کەسێ بەرزیی بوێ، شەونخوونیی دەکێشێ.

ب- هەروەها بۆ ئەوەش کە پێغەمبەری خوا ﷺو، دایکمان عائیشەو صەفوانی کوڕی موعەتتیلی سەهمیی، بە پلەی یەکەم و، پاشان دایك و بابی عائیشەو، هاوەڵان بەگشتیی ببنە سەر مەشق بۆ مسوڵمانان.

ج- دوایی بۆ ئەوەش کە مسوڵمانان پەند وەربگرن و، هەر لە خۆڕا قسە لە یەکدی وەرنەگرن و، زمانیان بە شتێك نەجووڵێنن، کە زانیارییان لە بارەیەوە نیە.

٣)- ﴿ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ ﴾، (بۆ ئێوە خراپ نیە)، بەڵکو بۆ ئێوە چاك بوو، (إبن العربي) گوتوویەتی: (الخَيْرُ: مَا زَادَ نَفْعُهُ عَلَى ضُرِّهِ، وَالشَّرُّ مَا زَادَ ضُرُّهُ عَلَى نَفْعِهِ)[2]، (خير) هەر شتێکە سوودی لە زیانی زیاتر بێ و، (شرّ) هەر شتێکە زیانی لە سوودی زیاتر بێ، واتە: هەرچەندە ئازارو ناڕەحەتییشتان بینی، بەڵام گرنگ ئەوەیە سەرەنجامەکەی بۆتان بە خێر گەڕا، بە تایبەت بۆ دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، چەند شەڕەفێکی گەورەیە،

---

(١) ديوان الإمام الشافعي.

(٢) أحكام القرآن: ج٢، ص٣٦٣.

شازدە (١٦) ئایەت لە بارەی ئەوەوە بێنە خوارێ، تاکو قیامەت لە مینبەرو میحرابەکاندا بخوێنرێنەوە، نەك بەس بۆ وی، بەڵکو بۆ هاوسەرەکانی دیکەی پێغەمبەریش، هەڵبەتە پێغەمبەری خوا ﷺ لە لووتکەی پایە بەرزیی دایە، بەڵام بە تەئکید بۆ پێغەمبەری خواش ﷺ خوا لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوە، بەرگرییەکی باشی کردوە، لە سومعەو کەرامەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ. بەڵێ خوا مانگێك لێی گەڕا بە ئازارەوە بتلێتەوە، بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی دیکە ببێتە سەرمەشق، خەڵکیش کە شتێکی وای هاتە سەر، کۆنترۆڵی خۆی لە دەست نەداو، بزانێ چی دەکاو، سنوورەکانی شەرع نەبەزێنێ، بەڵام دوایی خوای بەخشەر بۆ هەمووانی بە باشترین شێوە قەرەبوو کردەوە.

٤)- ﴿ لِكُلِّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ ﴾، بۆ هەر مرۆڤێك لەوان، (بوختانچییەکان)، ئەوەندە گوناهەی بە دەستی هێناوە، بۆی هەیە.

وشەی (ٱمْرِيٍٕ)، بە مانای ئینسان دێ (المرء: الإنسان) ئنجا ئەگەر ئینسانەکە مێیینە بێ دەڵێن: (إمرأة)، بەڵام ئەگەر بیانەوێ بڵێن: مرۆڤ، دەڵێن: (إمرئ، المرء)، گوتراوە: (المروءة: كَمَال المرء)، (المروءة) تەواویی مرۆڤە.

﴿ مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ ﴾، واتە: هەر کەسە گوناهی خۆی ئەوەندەی کە بە دەستهێناوە، بەشی خۆی هەیە، یانی: سزایەکەشی لەسەر وەردەگرێ.

٥)- ﴿ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، ئەوەشیان کە مشووری زۆربەی بوختانەکەی خوارد، سزاو ئازارێکی مەزنی بۆ هەیە، (كِبْرَهُ أو كُبْرَهُ)، بە هەردووکیان خوێنراوەتەوە، دوو جۆرە خوێندنەوەن، هەندێك گوتوویانە: (كِبْرَ)، یانی: (الإثم)، گوناە، بەڵام (كُبْر)، یانی: (مُعْظَم الشيء وأساسُهُ) زۆربەی شتێك و بناغەکەی، واتە: ئەو کەسەی زۆربەی بوختانەکەی تەبەنیی کرد.

﴿ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، ئەو کەسەیان سزایەکی مەزنی هەیە، لەبەرئەوەی خەمی لێخواردو لە بناغەدا ئەو بوختانەکەی دەستپێکرد، ئەو گومانە خراپەی کە بەس لە دڵە پیسەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەییە دەوەشێتەوە، هەر بابای

وا خەتـەرەی وای بـە دڵـدا دێ، چونکـە گـۆزە چـی تێدابـێ، ئـەوەی لـێ دەڕژێ، بـەس بابایەکـی مونافیـق و سـەر گـەورەی موناففیقـەکان لێـی دەوەشـێتەوە، خەتـەرەو غایلـەی وا خراپـی بـە دڵـدا بـێ، گومانـی وای بـە دڵـدا بـێ، کـە هاوسـەری پێغەمبـەر ﷺ لەگـەڵ یەکـێ لـە هاوەڵانـی پێغەمبـەر ﷺ کـە لـە جەنگـی بـەدردا بەشـدار بـووەو، پیاوێکـی پـاك و چـاك بـووە، تـووشی هەڵـەو تـاوان بـێ!! گومانـی وا بـەس دڵە پیسـە نەخۆشـەکەی عەبدوڵـڵای کـوڕی ئوبەییـە، لێـی دەوەشـێتەوە شـتی وای تێـدا هەبـێ، بـەڵام دوایـی لـە دڵـە پیسـەکەی ئـەوەوە، خەڵکێکـی سـادەو فەقیرحاڵێـش ئـەو قسـەیان وەرگـرت، لەبـەر ئـەوەی پارێزبەندیـی (حصانـة)و بەرهەڵسـتیی (مناعـة) یـان نەبـوو، بەڵکـو دوای ئـەوە کـە خـوای پـەروەردگار ئـەو ئایەتانـە دەنێرێتـە خـوار، دوای ئـەو پـەروەردە کردنـە بـۆ مسـوڵمانان، لـە مـەودوا حەصانـەو مەناعەیـان هەبـێ و بـە دوای هـەر قیـل و قالێـك نەکـەون، بـە دوای هەمـوو قسـەیەك نەکـەون، سـەبەتە نەبـن هەمـوو قسـەیەك لـە خۆیـان بکـەن، بەڵکـو بێژینـگ بـن، شـتەکان لـە بێژینـگ بـدەن و، هـەر قسـەیەکی بیسـتیان نەیگێڕنـەوە، وەك پێشـینانی خۆمـان گوتوویانـە: «قسـە دابێـژە، بیچێـژە، ئنجا ببێـژە»، نـەك لـە خـۆڕا قسـە فـڕێ بـدەن، وەك ئایەتەکـە دەفەرمـوێ: ﴿إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ﴾، کاتێـك بـە زمانتـان وەرتـان دەگـرت و بـە زارتـان دەتانگـوت (قسـەتان لـە بـارەوە دەکـرد) بـێ ئـەوەی زانیاریتـان لـە بارەیـەوە هەبـێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**سەرزەنشتکردنی خوا بۆ بڕوادارانی بەشداری ئەو بوختانە، لەسەر گومانی چاك بە یەكدی نەبردنیان و، بە بێ هەبوونی بەڵگەو ئیسپات زارو زمان لێكوتانی ئەو بوختانەو، بە كەم و گچكە تەماشاكردنی و، ئامۆژگاریی كردنیان بەوە كە هەرگیز دووبارەی نەكەنەوەو، هێنانەوە بیریان كە خوا زۆر لەگەڵیان بەخشەرو میهرەبانە، ئەگەرنا وا بە ئاسانیی لەو گرفتە دەرنەدەچوون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ ﴿١٢﴾ لَّوْلَا جَآءُو عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ ۚ فَإِذْ لَمْ يَأْتُواْ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُوْلَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِى مَآ أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾ إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ وَلَوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبْحَٰنَكَ هَٰذَا بُهْتَٰنٌ عَظِيمٌ ﴿١٦﴾ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُواْ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧﴾ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٨﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ﴾، دەبووایە كە گوێبیستی دەبوون، (لَّوْلَآ)، لێرەدا بە مانای (هَلَّا) یەو بۆ هاندانە، بەڵام لێرەدا بە مانای سەرزەنشتكردنە، ﴿ لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ﴾، وەك تێخوڕین و سەرزەنشتكردنە، دەبووایە كە دەتانبیست (بە درۆتان دانابایە).

٢)- ﴿ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا ﴾، پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار گومانی چاكیان بە خۆیان بردبایە.

ئەمە یانی چی؟ یانی: ئیمانداران دەبێ پێغەمبەر ﷺ لە خۆیان بە چاكترو هاوسەری پێغەمبەریش ﷺ لە هاوسەری خۆیان بە چاكتر دابنێن، ئنجا ئەگەر

شتی خراپ لە خۆیان ناوەشێننەوەو، لە هاوسەری خۆیانی ناوەشێننەوە، دەبێ باشتر لە پێغەمبەری خوا ﷺو، لە هاوسەری پێغەمبەری خوای نەوەشێننەوە، لەو بارەوە ئەم گێردراوەیە هەیە کە (الطبري)، دەڵێ:

{أَنَّ أَبَا أَيُّوبَ، قَالَتْ لَهُ امْرَأَتُهُ أُمُّ أَيُّوبٍ: أَمَا تَسْمَعُ مَا يَقُولُ النَّاسُ فِي عَائِشَةَ؟ قَالَ: بَلَى، وَذَلِكَ الْكَذِبُ، أَكُنْتِ فَاعِلَةً ذَلِكَ يَا أُمَّ أَيُّوبَ؟ قَالَتْ: لاَ وَاللَّهِ مَا كُنْتُ لأَفْعَلَهُ، قَالَ: فَعَائِشَةُ وَاللهِ خَيْرٌ مِنْكِ}[1].

واتە: ئەبوو ئەییووب ژنەکەی (ئوممو ئەییووب) پێی دەڵێ: ئایا گوێت لێ نیە خەڵك لە بارەی عائیشەوە چی دەڵێن؟ ئەبوو ئەیووبیش دەڵێ: با، گوێم لێ بووە، بەڵام ئەوە درۆیە، ئەی (أمّ أیوب)!، تۆ کاری وا دەکەی؟ ئەویش دەڵێ: ناوەڵڵا من شتی وا ناکەم، (واتە: زینا ناکەم)، دەڵێ: دەنا بە خوا عائیشە لە تۆ چاکترە.

لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە دەڵێ: عائیشە بۆ خۆی لە تۆ چاکترەو، بابیشی لە بابت و، دایکیشی لە دایکیشت و، مێردەکەشی پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئەی بۆچی گومانی خراپ بە خۆت نابەی، چۆن بە عائیشەی دەبەی؟.

(محمد الطاهر بن عاشور)، لە تەفسیرەکەی دا[2]، بە عەکسەوە هێناویەتی، کە پێم وایە لێی تێکچووەو بە هەڵەدا چووە، کە دەڵێ: ئەبوو ئەییووب گومانە خراپەکەی بردوەو، بەڵام ئوممو ئەییووب بۆی ڕاست کردۆتەوە.

خوا ﷻ دوایی دەفەرموێ: دەبوو گومانی چاکتان بە خۆتان بردبایە، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺو هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێ وەك خۆتانیان دابنێن، بەڵکو لە خۆتانیان لە پێشتر دابنێن، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ﴿٦﴾﴾الأحزاب، واتە: پێغەمبەر ﷺ بۆ بڕواداران لە خۆیان لە پێشترەو، هاوسەرەکانیشی دایکیانن.

---

(١) جامع البيان: ج١٢، ص٢٥٨.

(٢) التحرير والتنوير: ج ٨، ص ١٧٤.

٣)- ﴿ وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفۡكٞ مُّبِينٞ ﴾، (دەبووایە گومانی چاکیان بە خۆیان بردبایەو)، گوتباشیان: ئەوە بوختانێکی ئاشکرایە.

٤)- ﴿ لَّوۡلَا جَآءُو عَلَيۡهِ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ ﴾، دەبووایە چوار شایەدیان لەسەر هێنابان، (بۆ ئیسپاتی زینا، چوار شایەد پێویستن)، (لولا: هلاّ) بۆ هاندانە.

٥)- ﴿ فَإِذۡ لَمۡ يَأۡتُواْ بِٱلشُّهَدَآءِ ﴾، ئنجا ئەگەر چوار شایەدەیەکەیان نەهێنان.

٦)- ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴾، لە لای خوا، هەر ئەوانەن درۆزن.

ئەمە شێوازی کورت هەڵێنانە، واتە: ئەگەر درۆکەر هەبێ لە لای خوا، بەس ئەوانەن، کە دەفەرموێ: ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾ ﴾، ئەوانە لە لای خوا، بەس ئەوانن درۆکار، (أي: هُوَ كَذِبٌ فِي عِلْمِ اللهِ، إِذْ عِلْمُ اللهِ لاَ يَكُونُ إِلاَّ مُوَافِقاً لِنَفْسِ الأَمْرِ)، واتە: لە زانیاریی خوادا ئەوانە درۆزنن، چونکە زانیاریی خوا لەگەڵ واقیعدا هەر ڕێک دەبێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، لە لای خوا، یانی: لە زانیاریی خوادا.

چونکە زۆربەی تەفسیرەکان وەك (محمد الطاهر بن عاشور)یش، گوتوویەتی: لە تەفسیری ﴿ عِندَ ٱللَّهِ ﴾دا، دەڵێن: (أي: فِي شَرْعِه)، لە بەرنامەی خوادا، بەڵام لە ڕاستییدا ئەوە وا نیە، بۆچی؟! (لأَنَّ ذَلِكَ يُصَيِّرُه قَيْداً للإِحْتِرَازِ، أَي: هُمُ الكَاذِبُون فِي إِجْرَاءِ أَحْكَامِ الشَّرِيْعَةِ)، ئەگەر (عِندَ ٱللَّهِ) بە مانای: (لە بەرنامەی خوادا) بێ، ئەمە قەیدێکە خراوەتە سەری، واتە: تەنها لە جێبەجێ کردنی حوکمی بەرنامەی خوادا، ئەوانە درۆ دەکەن، بەڵام دەگونجێ لە واقیعدا ڕاست بکەن! بەڵام نەخێر (عِندَ ٱللَّهِ) یانی: لە لای خوا، ئەوە هیچ لە ڕووی بەرنامەی خواوە، دەبێ چوار شایەدان بێنن، ئەگەر نەیانهێنن، بە درۆکارو بوختانچیی لە قەڵەم دەدرێن، بەڵام وێڕای ئەوەش بەتایبەتیی لەم مەسەلەیەدا لە لای خوا، ئەوانە درۆکارن، واتە: وێڕای ئەوە کە بە پێی بەرنامەی خوا بە درۆزن و بوختانچیی لە قەڵەم دەدرێن، لە زانیاریی خوای پەروەردگاریش دا، هەر وایەو قسەکەیان درۆیەو خۆشیان درۆزنن.

٧)- ﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِى مَآ أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، ئەگەر بەخششی خواو، بەزەیی خوا لە دنیاو دوا ڕۆژدا، لەسەر ئێوە نەبووایە، بە هۆی ئەوەوە کە تێیڕژان (قسەو باستان زۆر لە بارەوە کرد)، ئازارێکی مەزنتان تووش دەبوو، واتە: لە دنیادا، یاخود لە دوا ڕۆژدا، یاخود لە دنیاو دوا ڕۆژدا.

لێرەدا (لَولاَ): (حَرْفُ امْتِنَاعٍ لوجود)، پیتی نەبوونە، لەبەر بوون، بۆیە ئازاری مەزنتان تووش نەبوو، چونکە بەخششی خواو بەزەیی خوا لە دنیاو دوا ڕۆژدا لەسەر ئێوە هەیە.

﴿ لَمَسَّكُمْ فِى مَآ أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، (الإِفَاضَةُ فِي القَوْلِ مُسْتَعَارٌ مِنْ إِفَاضَةِ المَاءِ فِي الإِنَاءِ أَي: كَثُرَتْهِ فِيهِ)، (إِفَاضَة) لێرەدا خوازراوەتەوە لە ڕژانی ئاو لە دەفرێك، لە قاپێك دا، بۆ قسەی زۆر خوازراوەتەوە، وەك چۆن قاپێك کە ئاوی تێ دەکرێ، شلەمەنییەکی تێ دەکرێ، لەسەری دەڕژێ، ئەگەر زۆر بێ، ئێوەش هێندە قسەتان لەو بارەوە کرد، قسەی زیادتان کردو، زۆر چوونە نێو قسانەوە.

٨)- ﴿ إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ ﴾، بیهێننەوە بەرچاوی خۆتان: کاتێك ئێوە بە زمانەکانتان ئەو قسەیەتان وەردەگرت، دەماو دەم لە یەکدیتان وەردەگرت.

٩)- ﴿ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ ﴾، بە زارەکانتان شتێکتان دەگوت کە زانیارییتان لە بارەیەوە نەبوو.

(تَلَقَّوْنَهُۥ)، لە ئەسڵ دا (تَتَلَقَّوْنَهُ)، یانی: وەرتان دەگرت، (التَلَقِّي: التَكَلُّفُ للقاءِ الغَيْرِ)، (تلقّي) ئەوەیە کە ئینسان خۆی ئەزیەت بدات کە بگات بە کەسێك، واتە: زۆرتان لە خۆتان دەکرد، ئەو قسەیە لە دەمی یەکدی وەربگرن و، بە زارانیشتان شتێکتان دەگوت، زانیارییتان لە بارەیەوە نەبوو، ئەمە جۆرێکە لە سەرزەنشت بۆ ئەو مسوڵمانانەی کە ئەو قسەیان دەماو دەم بڵاوکردۆتەوە، بەبێ لێکۆڵینەوەو وردبوونەودو سەرنج دان، هەر لەخۆوە قسەکەیان کردەوە، هەڵبەتە ئینسان دەبێ زۆر وریا بێ! جاری وایە قسەیەك دەکرێ، درۆیە، ئنجا ئەگەر کەسێك بیگێڕێتەوە، وەك بڕوا پێبوون، ئەویش دەبێتە یەکێك لە

درۆزنەکان، یا بۆ خۆشی درۆیەکەی نەکردبێ، یان قسەیەك دەگوترێ، بوختانە، ئەگەر مرۆڤێك ئەو قسەیەی بڵاوکردەوە، ئەویش دەبێتە هاوبەشی ئەو بوختانە، یا بۆ خۆشی بوختانەکەی نەکردبێ، مادام وەك بڕوا پێیوون وایگوت، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ) (أخرجه أبو داود: ٤٩٩٢، والحاكم: ٣٨١، وابن حبان برقم ٣٠)، واتە: مرۆڤ ئەوەندە گوناهەی بەسە، هەرچی بیستی بڵاوی بکاتەوە، ئەگەر هەرچی بیستت بڵاوی بکەیەوە، دەبێ ڕۆژێ هەزاران درۆ بڵاو بکەیەوەو، لە هەمووانیدا پشکت هەبێ.

١٠)- ﴿ وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّنًا ﴾، پێتان وابوو کە ئەوە شتێکی کەمە، شتێکی بچووکە، (هَيِّنًا) لە (هَوان)ەوە هاتوە، (هَانَ عَلَيْهِ، أي: سَهُلَ)، پێتان کەم و ئاسان بوو، ئەو قسەیە بڵاوبکەنەوە.

١١)- ﴿ وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴾، بەڵام لە تەرازووی خواو لە بەرنامەی خوادا، شتێکی زۆر مەزن بوو، کە باسی کەرامەت و سومعەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکرێ، باسی ئافرەتێك بکرێ کچی ئەبوو بەکری صیددیق (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئەو ئافرەتە پاك و چاکە، کە دوایی خوا ﷻ شازدە ئایەتان لە بارەی ئەو ئافرەتە پاك و چاکەوە بنێرێتە خوار، دەبێ چ پایەو مەقامێکی هەبێ، قسە گوتن بەرانبەر ئەو ئافرەتە، دەبێ چەند گوناهو تاوانێکی گەورە بێ!!

١٢)- ﴿ وَلَوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ﴾، دەبووایە کە دەتانبیست (لَوْلاَ)، لێرەدا بە مانای (هَلاّ) یەو، بۆ هاندانەو، مەبەست پێی سەرزەنشتە.

١٣)- ﴿ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا ﴾، گوتباتان: بۆمان نیە ئێمە لەو بارەوە بدوێین، (مَّا يَكُونُ لَنَآ)، ئەمە بۆ لابردنی شتێك زۆر بەهێزترە لەوە کە بگوترێ: (لَيْسَ لِنا أَنْ نَتَكَلَّمَ)، چونکە ئەوە یانی: هەر ناگونجێ ئێمە ئەو کارە بکەین و، هەر ئەصڵەن کردنەکەی ئەگونجاوەو جێی خۆی نیە.

١٤)- ﴿ سُبْحَٰنَكَ هَٰذَا بُهْتَٰنٌ عَظِيمٌ ﴾، پاکیی بۆ تۆ (ئەی خوایە!) ئەمە بوختانێکی مەزنە.

وشەی (سُبْحَٰنَكَ)، (مَصْدرٌ وَقَعَ بَدَلاً مِنْ فِعْلِهِ، أي: نُسَبِّحُ سُبْحَانَك)، چاوگە لە جێی کردارەکەی دانیشتوە، واتە: ئێمە بە بەپاکگرتن تۆ بە پاك دەگرین ئەی خوایە!، کە

لێرەدا مەبەست پێی سەرسوڕمانەو، پاکیی دەربڕینە بۆ دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، (بُهْتَان) چاوگە، (كَالغُفْرانِ والكُفْران، وَهُوَ الخَبَرُ الكَذِبُ الَّذِي يَبْهتُ السَّامِعَ، لأنَّهُ لا شُبْهَةَ فِيْهِ)، (بُهْتَان) وێنەی (غفران)و (كفران)ە، یانی: لێبوردن و سپڵەیی، ئەو هەواڵەیە کە بابای بیسەر سەرسام دەکات، سەری سوڕدەمێنێ لێی، لەبەر ئەوەی هیچ گومانی تێدانیە کە درۆیە، یانی: کەسێك شتێك بڵێ، هەموو کەس بزانێ درۆیە، ئەوە بوختانەو پێی سەرسام دەبن و، سەراسیمە دەبن.

١٥)- ﴿ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُواْ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، خوا ئامۆژگاریتان دەکات کە هەرگیز جارێکی دیکە بۆ شتی ئاوا نەگەڕێنەوە، قسەی ئاوا نەکەن، ئەگەر بڕوادارن.

(يَعِظُكُمُ)، (الوَعظ) بریتیە لە قسەیەك کە هەست و نەستی ئینسان بجووڵێنێ و، ویژدانی وەخەبەر بێنێ، کە دەفەرموێ: ﴿ أَن تَعُودُواْ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا ﴾، (الأَبَدُ: الزَّمَنُ المُسْتَقْبَلُ كُلُّهُ، وَالغَالِبُ أَنْ يَكُونَ ظَرْفَاً لِلنَّفْيِ)، (أبد) یانی: هەرگیز، لەمەودوا، کە داهاتوو هەمووی دەگرێتەوەو، زیاتریش بۆ حاڵەتی لابردن (نفي) بەکاردێ، چونکە لە ڕاستییدا درۆو بوختان لەگەڵ ئیماندا دژن، تەنانەت لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە فەرموویەتی: [يطْبَعُ المؤمن على كلُّ الخلال إلا الخيانة والكذب] رواه البيهقي في الشعب عن ابن عمر، ورمز السيوطي لحسنه في الجامع الصغير: ١٠٠١٤ واتە: دەگونجێ مسوڵمان هەر گوناهێك بکاتە پیشە، بەڵام ناگونجێ خیانەت و درۆ بکات بە پیشە، یانی: هەمیشە هەر درۆ بکات، درۆ بکات، چونکە ئیمان یانی: بە ڕاستزانین و، درۆش پێچەوانەی بە ڕاستزانینە[1].

١٦)- ﴿ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾، خواش ئایەتەکانی بۆ ئێوە ڕۆشن دەکاتەوە، خوا زانای کارزانە، ئایەتەکانی بۆ ئێوە ڕۆشن دەکاتەوە، واتە: بە ئاسانیی لێیان تێبگەن و، خواش کارزانە هەر شتە لە شوێنی خۆیدا دەفەرموێ و، هەر یاسایە لە جێی خۆیدا دادەنێ.

---

(١) فيض القدير شرح الجامع الصغير، ج٦ ص٥٩٨

**مەسەلەی سێیەم:**

**ئەوانەی حەز دەکەن قسەو باسی خراپ بە نێو مسوڵمانانیدا بڵاوبێتەوەو تەشەنە بکات، ئازاری بە ئێشی دنیاو دوا ڕۆژیان مسۆگەرەو، بەخشش و بەزەیی و میهرەبانیی خواش پارێزەری مسوڵمانانە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ١٩ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ٢٠ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەوانەی کە حەز دەکەن، پێیان خۆشە شتی ناقۆڵاو ناشیرین بڵاو بێتەوە، بەنێو بڕواداران دا، ﴿ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ ﴾، واتە: خراپە هەواڵەکەی بڵاو بێتەوە، چونکە بڵاوبوونەوە لە سیفەتی هەواڵ و قسانە، نەك لە سیفەتی کردەوان، واتە: ئەوانەی کە حەز دەکەن هەواڵی کرداری ناشیرین و ناقۆڵا بڵاوبێتەوە.

﴿ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، بە نێو بڕوادارانـدا، واتـە: لـە کـۆڕو مەجلیسیاندا بەمیانیاندا بڵاوبێتەوە، ئایا ئەوانە سزایان چییەو چۆنە؟.

٢)- ﴿ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ ﴾، ئازارێکی بە ئێشیان هەیە لە دنیاو لە دوا ڕۆژدا.

لە دنیادا کە سەرەنجام ئەگەر لەسەریان ساغ بێتەوە، کە بوختانە، ئەوە سزای بوختانیان لەسەر دەسەپێندرێ، ئەگەر بوختانیش نەبێ و جۆرە درۆیەکی دیکە بێ، سەرەنجام بابای درۆزن ئابڕووی دەچێ، ڕوو ڕەش دەبێ و، خەڵك متمانەی پێ ناکات و، ئازاری دوا ڕۆژیش، ئەوە دیارە کە بەس خوا دەزانێ چۆنیان سزا دەدات! (الطبري) لەو بارەوە دەڵێ:

{لَهُمْ عَذَابٌ وَجِيعٌ فِي الدُّنْيَا، بِالْحَدِّ الَّذِي جَعَلَهُ اللَّهُ حَدًّا لِرَامِي الْمُحْصَنَاتِ وَالْمُحْصَنِينَ، إِذَا رَمَوْهُمْ بِذَلِكَ، وَفِي الآخِرَةِ عَذَابُ جَهَنَّمَ، إِنْ مَاتَ مُصِرًّا عَلَى ذَلِكَ غَيْرَ تَائِبٍ}[1].

كە خوا دەفەرموێ: ﴿لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ﴾، واتە: سزایەکی بە ئازاریان هەیە لە دنیادا، کە بریتیە لەو سزایەی خوا کردوویەتی بە سزا بۆ کەسێك کە بوختان دەکات، بۆ ئافرەتانی پاك و پیاوانی پاك، هەر کات بوختانەکەیان ئاراستە کردن، لە دوا ڕۆژیش دا، سزای دۆزەخیان هەیە، ئەگەر ئەو کەسە لەسەر ئەو گوناهە سوور بێ و بمرێ و، لێی پەشیمان نەبێتەوەو، نەگەڕێتەوە.

٣)- ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾، خوا دەزانێ و ئێوە نازانن، واتە: خوا درۆی بوختانچییەکان دەزانێ، خوا نهێنییەکان دەزانێ و، هەموو شتێك دەزانێ، خوا بەرژەوەندیی دنیاو دواڕۆژی ئێوە دەزانێ، خوا ئەو دەرهاویشتە خراپانە دەزانێ، کە لە ئەنجامی بوختان کردنەوەدا، بڵاودەبنەوە، بەڵام ئێوە نازانن، ئێوە هەموو شتێك نازانن و کەمێك دەزانن، بەڵام خوا هەموو شتێك دەزانێ.

٤)- ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾، ئەگەر لەبەر بەخششی خواو بەزەیی خوا نەبووایە، لەسەرتان و، لەبەر ئەوە نەبووایە کە خوا لەگەڵتان بە پەرۆشەو بە بەزەییە، وەڵامەکەی قرتێنراوە، چونکە سیاقەکە دەیگەیەنێ، واتە: ئەگەر بەخششی خواو بەزەیی خوا لەسەر ئێوە نەبووایە، خوا لەگەڵتان بە پەرۆش و میهرەبان نەبووایە، لەسەر ئەوە خوا زوو سزای دەدان، بەڵاتان بەسەر دەهات و، تووشی گرفتاریی دەبوون، تووشی کێشەو ناکۆکیی دەبوون، بۆیەش وەڵامەکەی قرتێندراوە، تاکو زەین بە هەموو لایاندا بچێ و چەمکەکەی زۆر فراوان بێ.

قسەیەکی (القرطبي)، لەو بارەوە کە ئایا ئەوانەی ئەو درۆو بوختانەیان کرد، سزا دراون یان نا؟ دەڵێ: {اخْتَلَفُوا هَلْ حَدَّ النَّبِيُّ ﷺ أَصْحَابَ الإِفْكِ، عَلَى قَوْلَيْنِ:

---

(١) جامع البيان: ج١٨، ص١٠٦.

أَحَدُهُمَا: أَنَّهُ لَمْ يَحُدَّ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ الْإِفْكِ، لِأَنَّ الْحُدُودَ إِنَّمَا تُقَامُ بِإِقْرَارٍ أَوْ بِبَيِّنَةٍ، وَلَمْ يَتَعَبَّدْهُ اللَّهُ أَنْ يُقِيمَهَا بِإِخْبَارِهِ عَنْهَا، كَمَا لَمْ يَتَعَبَّدْهُ بِقَتْلِ الْمُنَافِقِينَ، وَقَدْ أَخْبَرَهُ بِكُفْرِهِمْ.

وَالْقَوْلُ الثَّانِي: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ حَدَّ أَهْلَ الإِفْكِ عَبْدَ الله بن أُبَيٍّ، ومِسْطَحِ بن أُثَاثَةَ، وَحَسَّانَ بْنَ ثَابِتٍ، وَحَمْنَةَ بِنْتَ جَحْشٍ[1]".

واتە: ڕاجیایی هەیە لەو بارەوە کە ئایا پێغەمبەر ﷺ بوختانچییەکانی سزادان، یان نا؟ (سزای بوختانیش هەشتا قەمچییە)، دوو ڕا هەن:

ڕایەکیان دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بوختان سزای بەسەردا نەسەپاندن، چونکە سزایەکان بە دوو هۆکار دەچەسپێن:

یەکەم: بە دانپێداهێنانی بابای تاوانبار.

دووەم: بە بەڵگەو شایەد، [دەبێ دوو شایەد هەبن کە ئەو کەسە ئەو قسەیەی کردوە]، خواش ﷻ بەوە بەندایەتیی پێ (بە پێغەمبەرەکەی) نەکردوە کە بەوەی هەواڵی پێ دەدا، سزایەکان بچەسپێنێ، هەروەك چۆن هەواڵی پێدابوو کە مونافیقەکان کوفر دەکەن، بەڵام لەبەر ئەوەی خۆی هەواڵی پێداوە، ڕێی نەدابوو سزایان بدات.

قسەی دووەم: ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ بوختانچییەکانی سزادان (یەکی هەشتا قەمچییان لێدرا)، کە بریتی بوون لە: عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول و، میستەحی کوڕی ئەثاثە (کوڕە پوورەکەی ئەبوو بەکر خوا لێی ڕازی بێ)، حەسسانی کوڕی سابیت و، حەمنەی کچی جەحش.

هەروەها لەو بارەوە ئەم دەقە دێنین:

{فَرَوَى مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ وَغَيْرُهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَلَدَ فِي الْإِفْكِ رَجُلَيْنِ وَامْرَأَةً: مِسْطَحًا وَحَسَّانَ وَحَمْنَةَ} (أخرجه أبو داود: ٤٤٧٤، والترمذي: ٣١٨١، وابن ماجه: ٢٥٦٧).

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٢، ص١٦٦.

واتە: موحەممەدی کوڕی ئیسحاق و غەیری ئەویش دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ لە مەسەلەی بوختان کردنەکەدا، سزای دوو پیاوو ژنێکی دا، میستەح و حەسسان و حەمنەی کچی جەحش.

هەندێك گوتوویانە: سزای عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوولی نەداوە، لەبەر ئەوەی لە ڕێیەکی مسۆگەرەوە لەسەری نەچەسپیوە، کە قسەو بوختانەکە ئەو بڵاوی کردۆتەوە، بەڵکو بە خەڵکی گوتوە: وا بڵێن، وەك ئاگری بن کا بووە، وەك گوتراوە: «گەورە دەڵێن، لە بنە بانان، گچکە دەڵێن لەسەر بانان»، ئەویش لە بنەوە ڕا گوتوویەتی و بە خەڵکی دیکەی فەقیری گوتوە، کە سەرەنجام خەڵکە سادەکە، سزایەکەیان لەسەر چەسپاوەو بەڵگەو شایەدیان لەسەر بوون، یان دانیان پێداناوە، بەڵام عەبدوڵلا وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچووە، بەڵام ئەوە لە دنیادا، نەك لە دوا ڕۆژدا، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾.

لە کۆتایی ئەم مەسەلەیەدا دەمەوێ ئاماژە بەوە بکەم، کە بە داخەوە شیعە، (مەبەستم شیعەی دوازدە ئیمامییە)، بوغزو غەرەزیان بەرانبەر بە دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)و بە بابی عائیشە کە ئەبوو بەکری صیددیقە، وای لێکردوون کە ئەم ئایەتە موبارەکانە، ئەو هەموو مەدح و ستایشەی عائیشەیان تێدایەو، ئەو مەدح و ستایشەی ئەبوو بەکریان تێدایە (خوا لێیان ڕازی بێ)، بەڵام خۆیان بەسەر ئەوەوە نەبردوە!

بۆ وێنە: لە (تفسیر المیزان)ی (الطباطبائي)(١)و، (تفسیر نمونە)دا، کە بە فارسییە(٢)، دەڵێن: هەر کەسێك بڵێ: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، هەڵەی کردوە، ڕاست ناکات و، خوای پەروەردگار پاکییەکەی دەربڕیوە، بەڵام دەڵێن: ئەو بەسەرهاتە شتێکی مسۆگەر نیە کە ئەو ئایەتانە لەوبارەوە هاتبن، یانی: بە

---

(١) ج: ١٥، ص: ٨٩، ط: ١٩٧٢م.

(٢) ج: ١٤، ص: ٣٧٨ - ٣٩٣.

نسبەت پاکیی عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، لەسەر ئەوە یەکدەنگن، بەڵام دەڵێن: ئەو ئایەتانە لە بارەی عائیشەوە نین! چونکە ئەو ئایەتانە مەدحی زۆر گەورەیان تێدایە بۆ دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەوانیش ڕقیان لە عائیشەیە، بە بیانووی ئەوەی کاتی خۆی لە جەنگی (جمل)دا سەرکردایەتیی ئەو سوپایەی کردوە، کە تەڵحەو زوبێریشی تێدا بوون (خوا لێیان ڕازی بێ) کە لەگەڵ سوپایەکەی عەلی کوڕی ئەبوو تالیب دا کە خەلیفەی چوارەمی پێغەمبەرە ﷺ خوا لێی ڕازی بێ، بە شەڕ هاتوون، خەڵکێکی زۆر کوژرا، ئەو ڕقەیان هەر لە دڵدایە، لەگەڵ ئەوەشدا کە دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)و، تەڵحەو زوبێر بۆ شەڕێ نەچووبوون، بەڵکو بۆ ئەوە چوو بوون کە بکوژەکانی عوسمان (خوا لێی ڕازی بێ)، بگیرێن و سزا بدرێن و، عەلییش نکوولیی لەوە نەدەکرد کە ئەوان سزا بدرێن، بەڵام دەیگوت: ئەوانە زۆرن، جارێ دەبێ هەموومان پێکەوە ڕێك بین، ئنجا دوایی ئەوانە وەك موو لە ماست دەردێنین.

بێ ئینصافیەکەیان لەوە دایە دەڵێن: ئەو ئایەتانە دوو هۆی هاتنە خواریان هەن، یەکێکیان ئەوەیە کە جەماوەری مسوڵمانان هێناویانەو بوخاریی و موسلیم و هەموو کتێبەکان هێناویانە، ئنجا ئەوان ئەو هۆکارە ڕەفز دەکەن و دەڵێن: هۆکارێکی دیکە هەیە: گوایە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، بوختانی بە (مارية القبطية) کردوەو، گوتوویەتی: ئیبراهیمی کوڕت ئەی پێغەمبەر! ﷺ لە تۆ ناچێ، ڕەنگە فلانکەس لەگەڵ ماریەدا زینای کردبێ و، ئەو کوڕە هی ئەو بێ!

کە ئەوە درۆو دەلەسەیەکە بەس لە کتێبی شیعاندا هەیەو، کەس شتی وای نەگوتوە، مەبەستم ئاماژە کردن بوو بە بێ ویژدانیی و دەمارگیرییەکەیان، ئەو قسەیان هیچ پەیوەندیی بە دینداریی و لێکۆڵینەوەی زانستییەوە نیەو ئایەتەکان زۆر ڕۆشنن، بەسەرهاتەکەش لە (سيرة ابن هشام)داو، لە هەموو سەرچاوەکاندا هاتوە، بەڵام بە داخەوە لەبەر ئەوەی شیعە متمانەیان بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ نیە، خۆیان بێ بەش کردوە لەو گێڕدراوانە، پاشانیش لەبەر ئەوەی بوغزو

غەرەزیان هەیە، دەربارەی ئەبوو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ)و، دەربارەی عائیشە، ئەو ئایەتانەش لەبەر ئەوەی مەدحی ئەو باب و کچە بەڕێزەیان زۆر تێدایە، گوتوویانە: ئەو هۆی هاتنە خوارەوانەی لەو بارەوە باس کراون، جێی متمانە نین!! کە لە ڕاستییدا هەر لە لای ئەوان جێی متمانە نین، کە بە داخەوە لە ڕاستە شەقامی پێغەمبەر ﷺو چوار خەلیفە ڕاشیدەکان و، هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ لە زۆر مەسەلاندا لایانداوە، هەرچەندە هەر لە بازنەی ئیسلامدا حیساب دەکرێن، خوا هیدایەتی ئەوانیش بدات و، زیاتر هیدایەتی هەموو لایەکیشمان بدات.

**مەسەلەی چوارەم:**

**فەرمانکردنی خوا ﷻ بە بڕواداران، کە شوێن هەنگاوەکانی شەیتان نەکەون، کە تەنیا فەرمان بە شتی خراپ و دزێو دەکات و، دڵنیا کردنەوەیان کە تەنیا بە هۆی بەخشش و بەزەیی خواوە، پاك و چاك دەبن و، ئامۆژگاریی کردنی مرۆڤە چاك و بەخشەرەکان، کە هاوکاریی لە کەسانی خزم و نەدارو کۆچکەر نەبڕن، هەرچەندە هەڵەو پەڵەشیان هەبێ، با لێیان ببوورن و چاوپۆشییان لێ بکەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۚ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢١﴾ وَلَا يَأْتَلِ أُو۟لُوا۟ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓا۟ أُو۟لِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە دوازدە بڕگەدا:**

**١)- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وەك هەموو جارێ گوتوومانە: ئەم ڕستەیە بەرکار (مفعول به)ەکەی فڕتێنراوە، بۆ ئەوە هەموو ئەو شتانە بگرێتەوە کە ئیمانیان پێ دێنن، چونکە (ءَامَنُوا۟) کارو بکەر (فعل)و (فاعل)ە، یانی: (ءامَنُوا بِكلِ مَا يَنْبَغِي الإيْمَانُ بِه)، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، (ئیمان بە خوا، بە فریشتەکانی، بە کتێبەکانی، بە پێغەمبەرانی، بە ڕۆژی دوایی، بە نەخشەو ئەندازەگیریی خوا ... هتد)، ئەی ئەوانەی بەو شێوەیە بڕواتان هێناوە!.**

**٢)- ﴿ لَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ﴾، شوێن هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، (خُطُوَٰتِ) کۆی (خطوة)یە، ئەویش ئەوەیە کە پێیەکت داناوە، پێیەکی دیکە دابنێی لەو لای**

ئەوەوە، واتە: ئەوەی دەکەوێتە نێوانی دوو پێیەکان، پێی دەگوترێ: (خطوة)، ئنجا هیچ کەس شەیتانی نەبینیوە بە ڕێیەدا بڕوات و، هەنگاو هەڵێنێ، بۆیە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ): (أي: طُرُق الشَّيْطَان)، ڕێیەکانی شەیتان، بەڵام لە ڕاستییدا (خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ)، چەمك و واتایەکی گشتیی لە زەین و خەیاڵی هەموو کەسدا هەیە، یانی: شوێن پێی شەیتان مەکەون، بە دوای شەیتاندا مەچن، بە قسەو خوتخوتەی دنەدانەکانی مەکەن.

٣)- ﴿وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾، هەر کەسێك بە دوای هەنگاوەکانی شەیتان بکەوێ، هەر کەسێك شوێن پێیەکانی شەیتان هەڵبگرێ، بە شوێن پێی ویدا بڕوات.

٤)- ﴿فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ﴾، بە دڵنیایی ئەو بەس فەرمان دەکات بە ناشیرین و خراپە، پێشتریش گوتمان: (فحشاء) هەر قسەو کردەوەیەکی دزێو ناقۆڵاو ناشیرینە، (منکر)یش هەر شتێکە کە عەقڵی سەلیم نکووڵیی لێ بکات و، شەریعەت نکووڵیی لێ بکات و، زگماك نکووڵیی لێ بکات و، خەڵکی باش نکووڵیی لێ بکات.

(المنكر): یانی: شتی خراپ، (الفحشاء): یانی: شتی ناقۆڵاو ناشیرین، کە هەر کام لە (الفحشاء)و (المنكر)یش، هەم قسان دەگرنەوە، هەم کردەوانیش دەگرنەوە، زانایان دەڵێن: لێرەدا (مَنْ): ﴿وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾، چونکە (يَتَّبِعْ)ی پێ زەنەدار (مجزوم)ە، (مَنْ: الشُرطية)یە، بە یەکدەنگیی هەموو قوڕئان خوێنەکان، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ﴾، ئەمە وەڵامی مەرجەکەیە، واتە: هەر کەسێك بە دوای شەیتان بکەوێ (وەڵامەکەی ئەوەیە) بە تەئکید شەیتان فەرمان دەکات بە هەر قسەو کردەوەیەك کە ناشیرینەو، خراپە، کەواتە: شوێنکەوتووی شەیتانیش، تووشی هەرچی شتی ناشیرین و خراپە لە کردەوان و لە قسان، دەبێ.

٥)- ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا﴾، ئەگەر بەخشش و بەزەیی خواش نەبووایە لەسەر ئێوە، هەرگیز هیچ کامێك لە ئێوە پاك و چاك نەدەبوون.

(زَكَىٰ)، هەموو قورئان خوێنەکان، یان زۆربەی هەرە زۆریان بە بێ گیرە (شدّة) خوێندوویانەتەوە: ﴿مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا﴾، یانی: هیچ کامێکتان هەرگیز پاك و چاك نەدەبوون، بەڵام ئەگەر بە (زَكّى) بخوێنرێتەوە، بە گیرە (شدّة)، ئەو کاتە یانی: خوا هیچ کامێك لە ئێوەی پاك نەدەکردەوە، یانی: ئەگەر بەخشش و بەزەیی خوا نەبووایە لەسەرتان، هیچ کامێکتان پاك و چاك نەدەبوون، یاخود: خوا پاك و چاکی نەدەکردن.

٦)- ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ﴾، بەڵام خوا هەر کەسێکی بیەوێ، پاکی دەکات، چاکی دەکات، گەشەی پێ دەدات، وەك هەموو جارێ گوتوومانە: وشەی: (زَكَّى يُزَكّو زَكَاةً وَتَزْكِيَةً)، بە مانای (نَمَا، طَهُر، صَلُحَ) دێ، واتە: گەشەی کرد، پاك بوو، چاك بوو.

٧)- ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾، بە دڵنیایی خواش بیسەری زانایە.

ئەمە هەم هەڕەشە دەگرێتەوە، هەم مـوژدەو دڵخۆشکردنیش دەگرێتەوە، واتە: خوا زانای بیسەرە، خوا زانایە ئەگەر کەسێك بە دوای هەنگاوەکانی شەیتان بکەوێ، بە شوێن پێی ئەودا بڕوات، قسەکانیشی دەبیستێ و کردەوەکانیشی دەزانێ، هەروەها بە پێچەوانەشەوە: هەموو ئەوانەی هەوڵ دەدەن خۆیان پاك و چاك بکەن، خوا قسەکانیان دەبیستێ و، نهێنیی نێو دڵیشیان و کردەوەکانیشیان دەزانێ.

٨)- ﴿وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ﴾، با ئەوانەشتان کە خاوەن چاکەن و خاوەن توانایی ماددیی فروانن، سوێند نەخۆن، کە نەبەخشن.. خوا لە ئایەتی (٢٢)ەمدا دێتە سەر باسی مەسەلەیەك کە پێشتر ئێمە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی بوختان پێکرانی دایکمان عائیشەدا (خوا لێی ڕازی بێ) لەسەر زمانی خۆی کە لە صەحیحی بوخاریی و صەحیحی موسلیم دا هێنامان، ئەویشمان لەگەڵدا باس کرد، ئەویش ئەوەبوو کە ئەبوو بەکر بابی عائیشە (خوا لێیان ڕازی بێ)، خزمێکی هەبوو بە ناوی (مِسْطح بن أثاثة)، کوڕە پووری بوو، ئەبوو بەکر هاوکاریی دەکردو، یارمەتیی دەدا، ئەبوو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ) بازرگان بوو، خوا پێداو بوو، ئنجا کاتێك ئاشکرا بوو کە میستەحی کوڕی

ئەثاثە، یەكێكە لەوانەی لە بوختان كردنەكەدا بەشدار بووە، ئەبوو بەكر سوێندی خوارد كە هاوكاریی میستەح ناكات لەمەودوا، خوا بەو بۆنەوە ئەم ئایەتەی نارده خوار:

﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُولُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ ﴾، (وَلَا يَأْتَلِ)، (الإِيتِلَاءُ: افتِعَالٌ مِنَ الإِلْيَةِ وَهِيَ الحَلِفُ، وأَكثَرُ استِعْمَالِهَا عَلَى الإِمْتِنَاعِ)، (الإيتلاء)، (افتعال)ە، لە (الإلية)، یانی: سوێند، (حَلِفْ) بەڵام (إلية) بە زۆریی بەكاردەهێنرێ بۆ نەكردنی شتێك، دەگوترێ: (آلى على نفسه ألاّ يفعل)، یانی: سوێندی خوارد ئەوە نەكات، (الإيتلاء)، سوێند خواردن، یانی: ئەوانەتان كە خاوەنی چاكەن و، دەستڕۆیشتوون، با سوێند نەخۆن.

٩)- ﴿ أَن يُؤْتُوا أُولِي الْقُرْبَىٰ وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﴾، (با سوێند نەخۆن) كە هاوكاریی ئەوانەی خاوەنی خزمایەتیین و نەدارن و كۆچكەرن لە ڕێی خوادا، بكەن، واتە: با سوێند نەخۆن لە هاوكاریی كردنیان، یاخود: با سوێند نەخۆن كە هاوكارییان ناكەن، هۆی هاتنە خوارەوەكەی دیارە، بەڵام خوا ﷻ بە گشتیی و بە كۆ هێناویەتی، چونكە لە هەندێ گێڕدراواندا هاتوە، كەسانی دیكەش هەبوون یارمەتیی خەڵكی خزم و نەدارو كۆچكەری خۆیانیان داوە، ئەوانیش گوتیان: ئێمەش لەمەودوا یارمەتیی خزمان نادەین، كە بە شێوەیەك لە شێوەكان بەشدار بوون و، پشكیان هەبووە لەو بوختانەی دایكمان عائیشەدا (خوا لێی ڕازی بێ)، بۆیە خوا بە كۆ هێناویەتی، بەڵام ئەگەر بەس ئەبوو بەكریش بووبێ (خوا لێی ڕازی بێ) خوا ﷻ هەمیشە كە مەسەلەیەك بووە لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ، هەرچەندە لە تاكێك ڕوویداوە، یان لە چەند كەسێك، بەڵام بنچینەیەكی گشتیی بۆ دارشتوە.

١٠)- ﴿ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا ﴾، با ببوورن و چاوپۆشیی بكەن، (عَفَا)، یانی: (دَرَسَ)، نەما، سڕایەوە، (فَهُو مَحُو الذنب)، (عفو) ئەوەیە كە خراپەكە بسڕێتەوە، (صَفْح) بریتیە لەوەی نەك هەر گوناهەكە بسڕێتەوە، بەڵكو هەر لە بیر خۆی بەرێتەوە: (الصَّفْحُ: عَدَمُ ذِكْرِهِ مُطْلَقاً).

١١)- ﴿ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ﴾، ئایا پێتان خۆش نیە خوا لێتان ببووریّ! واتە: وەك چۆن پێتان خۆشە، خوا لێتان ببووریّ، ئێوەش ببوورن.

١٢)- ﴿ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، خواش لێبوردەی بە بەزەییە، واتە: ئێوەش هەوڵبدەن چاو لە سیفەتەکانی خوا بکەن، ئێوەش لە قەدەر خۆتان لێبوردنتان هەبێ و، بەزەییتان هەبێ.

لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە، فەرموویەتی: {مَنْ لاَ يَرْحَم، لاَ يُرْحَمْ}، (أخرجه: البخاري: ٥٩٩٧، ومسلم: ٢٣١٨)، واتە: هەر کەسێك بەزەیی نەنوێنێ، بەزەیی بەرانبەر نانوێنرێ، یانی: خواش بەزەیی پێیدا نایەت، بە کورتیی: ئێوەش هەوڵبدەن سیفەتەکانی خوا لە خۆتاندا بێننە دی، ئەو سیفاتانەی کە لەگەڵ مرۆڤدا دەگونجێن، وەك زانیاریی، لێبوردن، بەزەیی، کاربەجێیی، ئەو سیفەتانەی دیکە کە لەگەڵ مرۆڤدا دەگونجێن، ئێمە پێشتریش هۆی هاتنە خوارەوەکەیمان هێنا لە نێو ئەو بەسەرهاتەدا، کە دایکمان عائیشە گێڕایەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، بەڵام لێرەشەوە ئەم گێڕراوەیە دێنین:

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَ هَذَا: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ﴾، فِي عَائِشَةَ وَفِيمَن قَالَ لَهَا مَا قَالَ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، وَكَانَ يُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحٍ لِقَرَابَتِهِ وَحَاجَتِهِ: وَاللهِ لَا أُنْفِقُ عَلَيْهِ شَيْئًا أَبَدًا، وَلاَ أَنْفَعُهُ بِنَفْعٍ أَبَدًا، بَعْدَ الَّذِي قَالَ لِعَائِشَةَ مَا قَالَ، وَأَدْخَلَ عَلَيْهَا مَا أَدْخَلَ، قَالَتْ: فَأَنزَلَ اللهُ فِي ذَلِكَ: ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِي ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، قَالَت: فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: واللهِ إِنِّي لأُحِبُّ أَنْ يَغْفِرَ اللهُ لِي، فَرَجَعَ إِلَى مِسْطَحٍ النَّفَقَةَ الَّتِي كَانَ يُنْفِقُ عَلَيْهِ، وَقَالَ: لَا أَنْزِعُهَا مِنْهُ أَبَدًا}[1].

واتە: دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: کاتێ فەرمایشتی خوا: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ﴾، لە بارەی عائیشەوە هاتە خوارو لە بارەی ئەوانەوە کە ئەو قسەیان لە بارەیەوە کرد بوو، کە کردبوویان، ئەبوو بەکر

---

(١) جامع البيان: ج١٨، ص١٠٨: ٢٥٨٢٨.

(خوا لێی ڕازی بێ)، کە پێشتر هاوکاریی میستەحی دەکرد، (هاوکاریی ماددیی)، بە هۆی خزمایەتییەکەیەوە (کە کوڕە پووری بوو)، بە هۆی پێویستییشیەوە، ئەبوو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتی: سوێند بە خوا، لەمەودوا هەرگیز هیچ شتێك نادەمە میستەح و، هیچ سوودێکی پێ ناگەیەنم، دوای ئەوەی، ئەوەی گوت لە بارەی عائیشەوە، ئەو خەم و مەراقەی تووش کرد، عائیشە گوتی: خواش ﷻ ئەم ئایەتەی نارده خوار: ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُولُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَن يُؤْتُوا أُولِي الْقُرْبَىٰ وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﴾، واتە: با ئەوانەتان کە خاوەنی بەخشش و دەستڕۆیشتوون، سوێند نەخۆن کە هاوکاریی خزمان و نەداران و کۆچکەران بکەن، دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕای بێ)، دەڵێ: ئەبوو بەکر گوتی: بە خوا حەز دەکەم خوا لێم ببووری، بۆیە ئەو هاوکارییەی میستەحی کە دەکرد پێشتر، بۆی گێڕایەوە، گوتیشی: بە خوا هەرگیز جارێکی دیکە لێی نابڕم.

واتە: ئێوە مادام لەبەر خوا بەخشیوتانە، ئێستا لەبەر خۆیان، کە شتێکی بێجێیان کردوە، لێیان مەبڕن، چونکە ئێوە بۆ خوا کردووتانە، هەڵبەتە وەك پێشتریش باسمان کرد، ئەمەش ئاکارو ڕەوشتێکی بەرزو باڵایە، کە هەر شایستەی پیاوێکی وەك ئەبوو بەکر بووە (خوا لێی ڕازی بێ)، هەروەك چۆن خاتوو عائیشە ئەو ئاکارو ڕەوشتە بەرزو جوانەی هەبوو، کە دوایی هیچ بەسەر خۆی نەهێناوە، بەرانبەر بەوانەی بوختانیان بۆ کردوە، هەتا گێڕدراوەتەوە کە حەسسانی کوڕی ثابیت کە یەکێك بووە لە بوختان کەرەکان، هاتوە بۆ لای دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، مۆڵەتی لێ خواستوە، ئەویش فەرمووی لێکردوەو، هاتۆتە ژوورێ، جارێك شیعرێکی بەسەر دایکمان عائیشەدا گوتوە، کە تۆ ئافرەتێکی هێندە بە ماقووڵی سەنگینی و تاواو تاوای، یەکێ: گوتوویەتی: ئەی دایکی بڕواداران! چۆن ڕێگا دەدەی بێتە ژوورەکەت، لە پشت پەردەوە، لە کاتێکدا بۆ خۆت دەزانی کاتی خۆی بوختانی بە تۆ کرد؟ ئەویش گوتوویەتی: ئاخر حەسسانی کوڕی ثابیت بەرگریی لە پێغەمبەر ﷺ کردوە بە شیعرەکانی، واتە: من لە هەقی خۆم دەبوورم، مادام ئەو بەرگریی لە ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ کردوە.

**مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:**

**نەفرین لێکرانی بوختانچییان بە ئافرەتانی پاکی بێ ئاگای بڕوادار، لە دنیاو دوا ڕۆژداو، شایەدیی دانی زمان و دەست و پێیان لەسەریان و، وەرگرتنەوەی سزای پڕ بە پێست و، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە، کە ئافرەتان و پیاوانی پاك و بێ خەوش، شایستەی یەکدین و، پیاوان و ژنانی پیسیش لە یەکدی دەوەشێنەوەو، ڕاگەیاندنی پاك و بێگەردیی دایکی بڕواداران عائیشەو، صەفوانی کوڕی موعەتتیلی سەهمیی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡغَٰفِلَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٢٣﴾ يَوۡمَ تَشۡهَدُ عَلَيۡهِمۡ أَلۡسِنَتُهُمۡ وَأَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٤﴾ يَوۡمَئِذٖ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلۡحَقَّ وَيَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ٱلۡمُبِينُ ﴿٢٥﴾ ٱلۡخَبِيثَٰتُ لِلۡخَبِيثِينَ وَٱلۡخَبِيثُونَ لِلۡخَبِيثَٰتِۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِۚ أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَۖ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٢٦﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە (١٠) بڕگەدا:**

١)- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡغَٰفِلَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بوختانی داوێن پیسیی دەکەن، بۆ ئافرەتانی پاکی، بێئاگای، بڕوادار.

ئەو ئافرەتانە سێ سیفەتیان هەن:

أ- (ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ)، یانی: پاککراوەن، پاکڕاگیراون، خوێندراویشتەوە: (مُحْصِنَات)، خۆیان پاکڕاگرتوە، لە خۆیان وریا بوون، بە (إسم مفعول)،و (إسم فاعل)، خوێنراوەتەوە.

ب- (ٱلۡغَٰفِلَٰتِ)، واتە: بێ ئاگان، هەر بیریان لەو گوناهە نەکردۆتەوە کە بۆیان کراوەتە تۆمەت.

ج- (ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ)، بڕواداریشن، ئەوانەی بوختان دەکەن بە ئافرەتانێکی ئاوا: کە پاك و چاکن و، بێ ئاگان لەو گوناهو تاوانەوە، بڕواداریشن.

٢)- ﴿لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ﴾، لە دنیاو دوا ڕۆژدا نەفرینیان لێ کراوە، نەفرین (لعنة) چییە؟ (اللَّعْنَةُ: الإبْعَادُ عَنْ رَحْمَةِ الله)، (لعنة) دوور خستنەوەیە لە بەزەیی خوا، لە دنیاو دوا ڕۆژدا لە بەزەیی خوا دوور خراونەوە.

٣)- ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾، ئازارێکی مەزنیشیان هەیە، پێشەوا (الطّبري) دەڵێ: ئەم ئایەتە تایبەتە بە دایکمان عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، هەندێکیش گوتوویانە: هەم دایکمان عائیشە، هەم هاوسەرانی دیکەی پێغەمبەریش ﷺ دەگرێتەوە، هەندێکیش گوتوویانە: هەم دایکمان عائیشەو، هەم هاوسەرانی دیکەی پێغەمبەر ﷺ و، هەم هەموو ئافرەتانیش دەگرێتەوە، واتە: حوکمەکەی گشتییە، کە بە تەئکید وایەو، هەر ئافرەتێك خاوەنی ئەو سێ سیفەتە بێ، دەیگرێتەوە.

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: خوا ﷻ بۆ گوناهی زینا، سزایەکی هێندە سەختی باس نەکردوە، کە زینا گەورەترە لە بوختان کردنی داوێن پیسی، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ بۆ بوختانکردنی داوێن پیسی، سزایەکەی زۆر بە سەختی باسکردوە: ﴿لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾، دواییش، ﴿يَوۡمَ تَشۡهَدُ عَلَيۡهِمۡ أَلۡسِنَتُهُمۡ وَأَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ يَوۡمَئِذٖ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلۡحَقَّ وَيَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ٱلۡمُبِينُ﴾، ئەمە زۆر قورسە ئەم سزایە، بۆیە گوتوویانە: ئەمە تایبەتە بە دایکمان عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، بەڵێ ئافرەتانی دیکەش دەگرێتەوە، ئەگەر بوختانیان پێ بکرێ، هەر کەسێ بوختانیان پێ بکات، سزای هەیە، بەڵام ئەو سزا سەختەی لێرەدا باسکراوە، بۆ کەسانێکە کە بوختانیان بە دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) کردوە، بە تایبەت عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول، سەرۆکی مونافیقەکانی مەدینە، چونکە زینا گوناهەکەی گەورەترە، کەچی خوا ﷻ لێرەدا بۆ ئەو بوختانکردنە، کە سزایەکەی هەشتا قەمچییە، سزا

دوا ڕۆژییەکەی زۆر بە گەورەتر باس کردوە، بۆیە ڕایەکی پەسندە نەگەر بگوترێ: ئەم ئایەتانە سزا تێدا باسکراوەکەیان، تایبەتە بە دایکمان عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، بەڵام حوکمەکەیان لە بارەی ئەسڵی سزادرانی بوختانچییانەوە گشتییە.

٤)- ﴿يَوۡمَ تَشۡهَدُ عَلَيۡهِمۡ أَلۡسِنَتُهُمۡ وَأَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾، (يَوۡمَ تَشۡهَدُ)، خوێنراویشەتەوە: (يَوۡمَ يَشۡهَدُ) ئەو ڕۆژە کە شایەدییان لەسەر دەدا، زمانەکانیان و دەستەکانیان و لاقەکانیان، بەوەی دەیانکرد، ئەو ئەندامانە هەموویان ڕۆڵیان هەبووە لە بوختانداو، ڕۆڵیان دەبێ، هەرچی زمانە: ئاشکرایە بوختان بە زمان دەگوترێ، دەستەکان و پێیەکان و لاقەکانیش: مرۆڤ بەو ئەندامانە دێ و دەچێ و، دەجووڵێ و ئەرك و کارەکانی دەکات: بە دەستەکانی ئاماژە دەکات و، بە لاق و پێیەکانی دەڕوات و قسەکە نەقڵ دەکات و، لە دەمی خەڵکی دیکەی وەردەگرێ و بڵاوی دەکاتەوە.

٥)- ﴿يَوۡمَئِذٖ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلۡحَقَّ﴾، لەو ڕۆژەدا، خوا سزای هەقیان بە تەواویی دەدات، ئەم تەنوینەی سەر: (يَوۡمَئِذٖ)، یانی: لەو کاتەدا کە ڕۆژی دوایی دێ و، سزاو پاداشت دێتە پێشێ، خوا سزای هەقی تەواویان دەدات، (يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ)، (وَفَّاهُ): (أَعْطَاهُ حَقَّهُ وَافِياً كَامِلاً)، خوا ﷻ سزای پڕ بە پێستیان دەدات.

٦)- ﴿وَيَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ٱلۡمُبِينُ﴾، (لەو ڕۆژەدا) دەشزانن هەر خوا هەقی ڕوون و ئاشکرایە، واتە: دەزانن کە: خوا ﷻ و حوکمەکانی خوا هەقی ڕەهان.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر بڕگەیەکی دیکەی ئەو بابەتەو، دەفەرموێ:

٧)- ﴿ٱلۡخَبِيثَٰتُ لِلۡخَبِيثِينَ وَٱلۡخَبِيثُونَ لِلۡخَبِيثَٰتِ﴾، ئافرەتانی پیس (و گوناهبارو، نەپرینگاوە لە تاوان و داوێن پیسیی و خراپە)، شایستەی پیاوانی پیسن، (پیاوانی پیسی وەك خۆیان)، پیاوانی پیسیش شایستەی ئافرەتانی پیسن.

لێرەدا مەبەست لە (خُبْث) پیسیی: پیسیی سیفەتە مرۆییەکانە، ئنجا ئەمە زانایان چەند واتایەکیان بۆ لێکداونەوە، هەم بۆ: ﴿ٱلۡخَبِيثَٰتُ لِلۡخَبِيثِينَ وَٱلۡخَبِيثُونَ لِلۡخَبِيثَٰتِ﴾، هەم بۆ: ﴿وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِ﴾:

أ- هەندێكیان گوتوویانە: (هَذِهِ أَوْصَافٌ جَرَت عَنْ مَوصُوفَاتٍ محذوفة، يدلّ عليها السياق، والتقدير في الجميع: الأزواج)، ئەوە ڕایەكە، كە دەڵێ: ( ٱلْخَبِيثَٰتُ )، یانی: (الزوجات الخبيثات)، (لِلْخَبِيثِينَ )، یانی: (للأزواج الخبيثين)، (والأزواج الخبيثون للزوجات الخبيثات)، ژنانی پیس شایستەی هاوسەرە پیسەكانن، مێردە پیسەكانیش، شایستەی ژنانی پیسن.

ب- هەندێكیشیان گوتوویانە: پێویست بە مەزەنەكردن (تقدیر) ناكات، بڵێین: ئەمانە وەصفن بۆ ژنان و پیاوانی پیس، بەڵكو هەر دەڵێین: (الخبیثات) سیفەتە خراپەكان، شایستەی پیاوانی خراپن، هەروەك كەسانی خراپ، شایستەی سیفەتە خراپەكانن، هەروەها: سیفەتە پەسندەكان شایستەی پیاوانی باشن و، پیاوانی باشیش سیفەتە پەسندەكانیان لێدەوەشێنەوەو شایستەیانن.

بەڵام ئەو كاتە ئیشكالێك دروست دەبێ: لە هەردوو حاڵەتەكاندا، (الخبیثات)و (الطیبات)، سیفەتە خراپەكان و سیفەتە پەسندەكان، تایبەت دەبن بە پیاوانەوەو باسی ژنان لە ئارادا نامێنێ! بەڵام بە واتایەكەی دیكە: ژنان و پیاوان هەردووكیان وەك یەك دەگرێتەوە، كە لە ڕاستییدا ئەو مانایەیان، لەگەڵ سیاقەكەش و لەگەڵ بەسەرهاتەكەش دا گونجاوترە.

٨)- ﴿ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِ ﴾، ئافرەتانی پاك و چاك، شایستەی پیاوانی پاك و چاكن، پیاوانی پاك و چاكیش، شایستەی ئافرەتانی پاك و چاكن.

٩)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ ﴾، ئەوانە (كە ئەو تۆمەتەیان بۆ هەڵبەسترا: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)و، صەفوانی كوڕی موعەتتیلی سەهمیی) دوورن، پاكن لەوەی (كە دڵنەخۆش و بوختانچییەكان) دەڵێن.

١٠)- ﴿ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾، لە دوارۆژدا لێبوردنێكی تایبەت و بژیوێكی پڕ ڕێزو حورمەتیان بۆ هەیە.

# سێ سەرنج

١- (محمد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆیدا، ویستوویەتی چارەسەری ئیشکالێك بکات، ئەویش ئەوەیە: ئەگەر کوفرو شیرك بە پیسیی دابنرێ، ئەدی چۆن هاوسەری هەر کام لە نووح و لووط (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، کافر بوون! وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (التحريم)دا دەفەرمویّ: ﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴿١٠﴾ ﴾، واتە: خوا وێنەی هێنایەوە بۆ ئەوانەی بێبڕوان، ژنەکەی نووح و ژنەکەی لووط، کە لە ژێر دوو لە بەندە چاکەکانی ئێمەدا بوون، (واتە: لە ژێر نیکاحی واندا بوون)، بەڵام ناپاکییان لەگەڵ کردن، (ناپاکیی عەقیدەیی و، فیکریی)، ئەوانیش (نووح و لووط) هیچ سوودیان پێ نەگەیاندن، (هەرچەندە هاوسەریشیان بوون) و پێیان گوترا: بچنە نێو ئاگر، لەگەڵ ئەواندا کە تێیدا هەمیشەیی دەبن.

ئنجا (محمد الطاهر بن عاشور) دەڵێ:

{وَالْمُـرَادُ بِالْخُبْـثِ: خُبْـثُ الصِّفَـاتِ الإِنْسَـانِيَّةِ، كَالْفَوَاحِـشِ وَكَذَلِـكَ الْمُـرَادُ بِالطَّيِّـبِ: زَكَاءُ الصِّفَـاتِ الإِنْسَـانِيَّةِ مِـنَ الْفَضَائِـلِ الْمَعْرُوفَـةِ فِي الْبَـشَرِ، فَلَيْـسَ الْكُفْـرُ مِـنَ الْخُبْـثِ، وَلَكِنَّـهُ مِـنْ مُتَمِّمَاتِـهِ، وَكَذَلِـكَ الإِيمَـانُ مِـنْ مُكَمِّـلَاتِ الطَّيِّـبِ، فَلِذَلِـكَ لَـمْ يَكُـنْ كُفْـرُ امْـرَأَةِ نُـوحٍ وَامْـرَأَةِ لُـوطٍ نَاقِضـاً لِعُمُـومِ قَوْلِـهِ: ﴿ ٱلْخَبِيثَٰتُ لِلْخَبِيثِينَ ﴾}[1].

واتـە: مەبەسـت لـە پیسیی، پیسـیی سیفەتە مرۆییەکانـە، هەروەهـا مەبەسـت لە پاکیـی و چاکیـی، پاکیـی و چاکیـی سـیفەتە مرۆییەکانـە، لـە خەصڵەتـە زانـراوەکان لـە بەشـەردا، بـەڵام کوفـر پەیوەندیـی بـە پیسـییەوە نیـە، بەڵکـو لـە تەواوکەرەکانـی

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٨، ص١٩٥.

پیسییە، هەروەها ئیمانیش لە تەواوکەرەکانی چاکیی و پاکییە، بۆیە کوفری ژنەکەی نووح و ژنەکەی لووط، هەڵوەشێنەرەوەی فەرمایشتی خوا نیە کە دەفەرموێ: ژنانی پیس بۆ پیاوانی پیسن( و پیاوانی پیس بۆ ژنانی پیسن).

قسەکەی جوانە، بەڵام پێم وایە ئەگەر ئەوەش نەگوترێ و هەر بگوترێ: بە ئەنکید خوا ﷻ پێغەمبەرانی خۆی (عَلَيْهِمَ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، لە شتی ناشیرین و لە هەر عەیب و لەکەو پەڵەیەك پاراستوە، کە لە نێو کۆمەڵگای خۆیاندا عەیب و ناشیرین بووبێ، ئەو کاتەش لە سەردەمی نووح و لووط دا (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و، لە سەردەمی هەموو پێغەمبەراندا، کوفرو شیرکێك کە گەلەکانیان لەسەری بوون، نەك هەر عەیب و لەکەو پەڵە نەبووە، بەڵکو بە شتێکی زۆر باش دانراوەو، بە پێچەوانەوە: ئەوەی پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هێناویانە، لە خوا بە یەکگرتن (توحید)و، تەنیا خوا پەرستن و ئیمان، ئەوە بە عەیب و ناتەواویی لە قەڵەم دراوە.

ئنجا هەردوو هاوسەری نووح و لووط (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) با کافریش بووبن، بەڵام کوفر ئەو کاتە بە عەیب و لەکە لە قەڵەم نەدراوەو، ئەگەر موشریك بووبن، شیرك بە لەکەو عەیب لە قەڵەم نەدراوە، بەڵام بە ئەنکید هاوسەرانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، لەو شتانەی کە بە عەیب و لەکە لە قەڵەم دراون، لە نێو کۆمەڵگاو، بە پێی باوو ژینگەی خۆیان، بۆ وێنە: داوێن پیسیی، هەروەها هەر ئەنگییەکی دیکە، پارێزراو بوونە.

٢- کە دەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ﴾، دەڵێ: (غُلِّبَ ضَمِيرُ التَّذْكِيرِ فِي: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ﴾)، ئەگەر مەبەست دایکمان عائیشەو صەفوانی کوڕی موعەتتەلی سەهمیی بێ، دووانن، بەڵام ڕاناوی نێرینە بەسەر ڕاناوی مێیەنەدا زاڵ دەکرێ لە زمانی عەرەبییدا، جاری واشە دووان بە کۆ (جمع) دادەنرێن لە زمانی عەرەبییدا، کە خوا فەرموویەتی: ﴿مِمَّا يَقُولُونَ﴾، لەوەی کە دەیڵێن، واتە: ئەوەی کە بوختانچییەکان

گوتراوەو گوتوویانە، جگە لە قسەیەك كە لەگەڵ واقیعدا ناگونجێ، هیچی دیكە نیە، بەس قسەیە.

٣- ڕستەی: ﴿لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾، بە تەئكید موژدەیەكی زۆر خۆشە بۆ دایكمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، هەروەها بۆ صەفوانی كوڕی موعەتتەلی سەهمیی كە مەبەست لە (مغفرة) لێبوردنەكە نەوە دیارەو، ﴿وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾، یانی: بژیوێكی پڕ ڕێزو حورمەت، یاخود: باشترین بژیو، چونكە: (الكَرِيمُ: الأَفْضَلُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ فِي نَوْعِهِ)، (كريم) یانی: باشترین شت لە جۆری خۆی: ﴿مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿٧﴾﴾الشعراء، واتە: باشترین ڕووەك، ﴿وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾، واتە: باشترین بژیوو ڕۆزیی، هەروەها گوتراوە: (الكَرِيمُ: هُوَ النَّفِيسُ فِي جِنْسِهِ، أَو الأَفْضَلُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ)، هەر شتێك كە لە جینسی خۆیدا زۆر بە نرخ بێ، یاخود باشترین شت لە هەر شتێكدا.

## دوو قسە لە كۆتایی ئەم شازدە ئایەتەدا:

بە باشی دەزانم كە لە كۆتایی كۆی تەفسیر كردنی ئەو شازدە ئایەتەدا، دوو قسان بێنم:

### قسەی یەكەم:

قسەیەك لە دایكمان عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، دێنینەوە، كە گوتوویەتی:

٤- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: لَقَدْ أُعْطِيتُ تِسْعًا مَا أُعْطِيَتْهُنَّ امْرَأَةٌ:

١)- لَقَدْ نَزَلَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ بِصُورَتِي فِي رَاحَتِهِ، حِينَ أُمِرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَتَزَوَّجَنِي.

٢)- وَلَقَدْ تَزَوَّجَنِي بِكْرًا، وَمَا تَزَوَّجَ بِكْرًا غَيْرِي.

٣)- وَلَقَدْ تُوُفِّيَ ﷺ وَإِنَّ رَأْسَهُ لَفِي حِجْرِي.

٤)- وَلَقَدْ قُبِرَ فِي بَيْتِي.

٥)- وَلَقَدْ حَفَّتِ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتِي، وَإِنْ كَانَ الْوَحْيُ لَيَنْزِلُ عَلَيْهِ وَهُوَ فِي أَهْلِهِ فَيَنْصَرِفُونَ عَنْهُ، وَإِنْ كَانَ لَيَنْزِلُ عَلَيْهِ، وَأَنَا مَعَهُ فِي لِحَافِهِ، فَمَا يُبِينُنِي عَنْ جَسَدِهِ.

٦)- وَإِنِّي لاَبْنَةُ خَلِيفَتِهِ وَصَدِّيقِهِ.

٧)- وَلَقَدْ نَزَلَ عُذْرِي مِنَ السَّمَاءِ.

٨)- وَلَقَدْ خُلِقْتُ طَيِّبَةً وَعِنْدَ طَيِّبٍ.

٩)- وَلَقَدْ وُعِدْتُ مَغْفِرَةً وَرِزْقًا كَرِيمًا)[1].

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: نۆ شتم پێ دراون، جگە لە من هیچ ئافرەتێک ئەو نۆ شتەی نەدراونێ:

١)- جیبریل وێنەی منی لە لەپە دەستیدا هێناوە، کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکراوە: من بە هاوسەر بگرێ (وێنەی منی پێشان دراوە، لە لەپە دەستیدا).

٢)- پێغەمبەر ﷺ وەک کچ بەس منی هێناوە، (ئەوانی دیکە هەموویان بێوەژن بوون).

٣)- کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، سەری لەسەر ڕانی من و لە کۆشی مندا بوو.

٤)- پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژوورەکەی مندا نێژراو بە خاک سپێردراو، گۆڕەکەی لەوێدایە.

٥)- فریشتەکان دەوری ماڵی منیاندا لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردو، کاتێک پێغەمبەر ﷺ وەحیی بۆ دادەبەزی، ئەویش لە نێو ماڵ و خێزانی دا دەبوو، ئەگەر وەحیی بۆ دابەزیبایە، لە هاوسەرەکەی دوور دەکەوتەوە، بەڵام جاری وا هەبوو من لەگەڵیدا لە نێو جێگا دەبووم، وەحیی بۆ دەهات و منی لە خۆی دوور نەدەخستەوە.

٦)- من کچی یەکەمین جێنیشینی و، یەکەمین دۆست و هاوەڵیشیمی، (کە ئەبوو بەکرە (خوا لێی ڕازی بێ)).

---

(١) (ذكره الهيثمي في المجمع ج٩، ص٢٤١، عن عائشة وقال: رواه أبو يعلى، وفي الصحيح وغيره، بَعضُهُ، وبنحوه، رواه الطبراني ورجال أحد أسانيد الطبراني رجال الصحيح) مُخرّج أحاديث: الجامع لأحكام القرآن: ج١٢، ص١٧٥، الحاشية.

٧)- خوا ﷻ پاكیی منی لە ئاسمانێوە دابەزاند.

٨)- من پاك و چاكم و، لە لای پیاوێكی پاك و چاكیشم، ﴿ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ ﴾.

٩)- بەڵێنی لێبوردن و بژێوێكی پڕ ڕێزو حورمەتم پێ دراوە: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾.

بێگومان ڕاست دەكات و شایستەی هەموو ئەو شتانەشە (خوا لێی ڕازی بێ)و خوا پلەو پایەی بەرزو بەرزتر بكاتەوە.

قسەی دووەم:

(الزمخشري)، لە تەفسیرەكەی (الكشاف)دا[1]، دەڵێ: [لَوْ قَلَبْتَ الْقُرْآنَ كُلَّهُ وَفَتَّشْتَ عَمَّا أُوعِدَ بِهِ الْعُصَاةُ، لَمْ تَرَ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ غَلَّظَ فِي شَيْءٍ تَغْلِيظَهُ فِي إِفْكِ عائشة رضوان الله عليها، وَمَا أَنْزَلَ مِنَ الآيَاتِ الْقَوَارِعِ الْمَشْحُونَةِ بِالْوَعِيدِ الشَّدِيدِ، وَالْعَذَابِ الْبَلِيغِ، وَالزَّجْرِ الْعَنِيفِ، وَاسْتِعْظَامِ مَا رَكِبَ مِنْ ذَلِكَ، وَاسْتِفْظَاعِ مَا أَقْدَمَ عَلَيْهِ، مَا نَزَّلَ فِيهِ عَلَى طُرُقٍ مُخْتَلِفَةٍ، وَأَسَالِيبَ مُفْتَنَّةٍ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهَا كَافٍ فِي بَابِهِ، وَلَوْ لَمْ يُنْزِلْ إِلاَّ هَذِهِ الثَّلاَثَ لَكَفَى بِهَا، حَيْثُ جَعَلَ الْقَذَفَةَ مَلْعُونِينَ فِي الدَّارَيْنِ جَمِيعًا، وَتَوَعَّدَهُمْ بِالْعَذَابِ الْعَظِيمِ فِي الآخِرَةِ، وَأَنَّ أَلْسِنَتَهُمْ وَأَيْدِيَهِمْ وَأَرْجُلَهُمْ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ بِمَا أَفَكُوا وَبَهَتُوا بِهِ، وَأَنَّهُ يُوَفِّيهِمْ جَزَاءَهُ الْحَقَّ الَّذِي هُمْ أَهْلُهُ، حَتَّى يَعْلَمُوا عِنْدَ اللهِ أَنَّ اللهَ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِينُ][2].

واتە: هەموو قوڕئان بپشكنی، ئەوەی كە خوا هەڕەشەی پێ لە گوناهباران كردوە، خوای بەرز نابینی، لە هیچ شتێكدا هێندە زبریی نواندبێ، وەك لەو بوختان پێكرانەی عائیشەدا (خوا لێی ڕازی بێ)و، بۆ هیچ شتێك هێندەی ئایەتی

---

(١) (الزمخشري) یەكێكە لە نوستازەكانی ڕەوانبێژیی، كتێبێكی هەیە بە ناوی (أساس البلاغة)، كتێبی دیكەشی زۆرن، بەڵام (الزمخشري)، زیاتر بە تەفسیرە ناودارەكەی (الكشاف)، ناسراوە.

(٢ ) الكشاف: ج٢، ص١٨٠.

زەبروەشێن و پڕ لە هەڕەشەی توندو سزای سەخت و تێخوڕین و سەرزەنشت و، بە گەورە گرتن و ناشیرین کردنی ئەوەی کە کراوە، بە شێوازی جۆراو جۆرو، بە ئامرازی هونەریانە دانەبەزاندوون، کە هەر کامێکیان لە بابەتی خۆیدا بەس بوو، [یانی: بۆ هیچ شتێك خوای پەروەردگار ئاوا بە توندیی و بە سەختیی نەدواوە، وەك بۆ ئەو بوختانەی عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دواوە]، ئەگەر تەنها ئەو سێیە دابەزیبانایە بەس بوون، کە:

یەك: بوختانچییەکانی هەموویان بە نەفرین لێکراو لە دنیاو دوا ڕۆژدا داناون.

دوو: هەڕەشەی لێکردوون بە سزای مەزن، لە دوا ڕۆژدا.

سێ: فەرموویەتی: زمان و دەستیان و پێیان، شایەدیان لەسەر دەدەن، لەسەر ئەوەی هەڵیانبەستوەو ئەو بوختانەی کە کردوویانە.

چوار: بەوە کە خوا ڕایگەیاندوە: سزای پێویستی پڕ بە پێستیان کە ئەوان شایستەینی، دەیانداتەوە، تاکو بزانن لەو کاتەدا کە بەس خوا هەقی ڕۆشن و ئاشکرایە.

خوا بە لوتف و کەڕەمی خۆی پلەو پایەی دایکمان عائیشە بەرزو بەرزتر بکاتەوە، هەروەها هەموو هاوسەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ دایکانی بڕواداران و، هەموو هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ، کە خوا ﷻ ئەو قورئانەی هەموو لە ژیانی ئەواندا دابەزاندوەو، هەمووی بۆ پەروەردەکردنی ئەوان بووە بە پلەی یەکەم، بۆیە باشترین کەسانێك بکرێنە سەر مەشق بۆ دینداریی و دنیاداریی، بۆ خواپەرستیی و خەڵك دۆستیی، بریتیە لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ، پیاویان و ئافرەتیان، بە تایبەت ئەوانەی زیاتر لە پێغەمبەرەوە ﷺ نیزیك بوون، هاوسەرە بەڕێزەکانی و، هاوەڵە زۆر نیزیك و بەڕێزەکانی و، خزمەکانی و، ئەوانەی کە زیاتر کارتێکراو بوون بە پەروەردەکردن و بە ڕێنماییکردنی پێغەمبەر ﷺ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان هەشت (٨) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٢٧ - ٣٤)، کە تێیاندا خوا ﷻ باسی کۆمەڵێك حوکمی شەرعیی پەیوەست بە بواری خێزانیی و، کۆمەڵایەتیی، دەکات کە ئێمە یازدەیانمان لێ سەرژمێر کردوون:

١- مۆڵەت وەرگرتن و سڵاو کردن بۆ چوونە ماڵی یەکدی.

٢- نەچوونە ژوور لە کاتی چۆڵ بوونی ماڵەکەداو، لە کاتی مۆڵەت نەداندا، گەڕانەوە.

٣- چوونە شوێنە گشتییەکانەوە بە بێ مولّەت وەرگرتن، مادام مرۆڤ کارێکی پێویستی لەوێ هەبێ و، بەهرەیەك لەو شوێنانە وەربگرێ.

٤- خۆپاراستنی پیاوانی بڕوادار، لە ڕوانینی حەڕام و، داوێنی خۆپاراستن لە گوناهـ.

٥- خۆپاراستنی ئافرەتانی بڕوادار، لە ڕوانینی حەڕام بۆ پیاوان و، داوێنی خۆپاراستن لە گوناهـ.

٦- سەرو گەردن و یەخەی خۆ داپۆشینی ئافرەتان و، جوانیی خۆ دەرنەخستنیان، مەگەر ئەوەی بە شێوەی ئاسایی دەردەکەوێ، کە دەم و چاوو هەردووك لەپە دەستیانن، مەگەر بۆ مێردیان یان بۆ مەحرەمەکانیان.

٧- خۆ دوورگرتنی ئافرەتان لە هەر ڕەفتارێك، کە سەرنجی پیاوان ڕابکێشێ، بە تایبەت لە کاتی ڕۆیشتن و پێ بە زەویدا کوتاندا.

٨- هاوسەردار کردنی پیاوان و ئافرەتانی بێ هاوسەر لە ئازادو کۆیلان، لە لایەنی کۆمەڵگاو قەوارەی سیاسیی مسوڵمانانەوە.

٩- خۆ پاکڕاگرتنی ئەوانەی توانای هاوسەرگیرییان نیە، لە پیاوان و ئافرەتان، هەتا خوا دەروویان لێ دەکاتەوەو، دەسترۆیشتوویان دەکات بە نسبەت پیاوانەوە، یاخود قسمەتیان دەڕەخسێنێ بە نسبەت ئافرەتانەوە.

١٠- ئەو کۆیلانەی داوای (مکاتبة) دەکەن، (داوا دەکەن لە گەورەکانیان کە بڕیارێکیان لە بەیندا هەبێ، بەو ئەندازەیە پارەیان بۆ بێنن و ئازادبن)، پێویستە وەڵامیان بدرێتەوەو هاوکاریی بکرێن تاکو ئازادبن.

١١- تۆبزیی نەکردن لەو کەنیزەکانەی داوێن پاکن، بۆ زینا کردن لە بەرانبەر پارەدا، واتە: لەشفرۆشیی، هەر کەسێك ئەوە بکات، ئەوە حەرامەو گوناهبارەو، ڕێگای لێ دەگیرێ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ
أَهۡلِهَاۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدٗا فَلَا تَدۡخُلُوهَا حَتَّىٰ
يُؤۡذَنَ لَكُمۡۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرۡجِعُواْ فَٱرۡجِعُواْۖ هُوَ أَزۡكَىٰ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ﴿٢٨﴾
لَّيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ مَسۡكُونَةٖ فِيهَا مَتَٰعٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ
وَمَا تَكۡتُمُونَ ﴿٢٩﴾ قُل لِّلۡمُؤۡمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِمۡ وَيَحۡفَظُواْ فُرُوجَهُمۡۚ ذَٰلِكَ
أَزۡكَىٰ لَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا يَصۡنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَغۡضُضۡنَ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِنَّ وَيَحۡفَظۡنَ
فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنۡهَاۖ وَلۡيَضۡرِبۡنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّۖ وَلَا
يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوۡ ءَابَآئِهِنَّ أَوۡ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآئِهِنَّ
أَوۡ أَبۡنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوۡ نِسَآئِهِنَّ أَوۡ
مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيۡرِ أُوْلِي ٱلۡإِرۡبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفۡلِ ٱلَّذِينَ
لَمۡ يَظۡهَرُواْ عَلَىٰ عَوۡرَٰتِ ٱلنِّسَآءِۖ وَلَا يَضۡرِبۡنَ بِأَرۡجُلِهِنَّ لِيُعۡلَمَ مَا يُخۡفِينَ مِن زِينَتِهِنَّۚ
وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٣١﴾ وَأَنكِحُواْ ٱلۡأَيَٰمَىٰ مِنكُمۡ
وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنۡ عِبَادِكُمۡ وَإِمَآئِكُمۡۚ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغۡنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ
﴿٣٢﴾ وَلۡيَسۡتَعۡفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغۡنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَٱلَّذِينَ يَبۡتَغُونَ ٱلۡكِتَٰبَ
مِمَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَكَاتِبُوهُمۡ إِنۡ عَلِمۡتُمۡ فِيهِمۡ خَيۡرٗاۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ ءَاتَىٰكُمۡۚ

وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ
ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ ءَايَٰتٍ مُّبَيِّنَٰتٍ وَمَثَلًا مِّنَ ٱلَّذِينَ
خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُمْ وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٣٤﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! (بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـتە بڕوایـان پێبهێـنرێ) مەچنـە ماڵانێـك جگـە لـە ماڵـەكانی خۆتـان، هەتـا مۆڵـەت وەردەگـرن بـە شـێوەیەکی هۆگرانـەو، سـەلام لـە خەڵکەکەیـان دەکـەن، ئـەوە بـۆ ئێـوە باشـترە (بۆیـە بۆتـان باسـکرا) بەڵکـو بیربکەنـەوەو تێبگـەن ﴿٢٧﴾ ئنجـا ئەگـەر کەسـتان تێیانـدا (لـەو ماڵانـەدا) چنـگ نەکـەوت، مەچنـە ئێویـان هەتـا مۆڵـەت نەدرێـن و، ئەگـەر پێشـتان گوتـرا: بگەڕێنـەوە، بگەڕێنـەوە، ئـەوە پـاك و چاکـترە بۆتـان و، خـواش زانایـە بـەوەی دەیکـەن ﴿٢٨﴾ گوناهتـان نـاگات کـە (بـە بـێ مۆڵـەت وەرگرتـن) بچنـە شـوێنە گشـتییەکانەوە، کـە سـوودێکیان بۆتـان تێدایـەو، خـواش ئـەوەی ئاشـکرای دەکـەن و پەنهانـی دەکـەن، دەیزانـێ ﴿٢٩﴾ (ئـەی پێغەمبـەر!) بـە پیاوانـی بـڕوادار بڵـێ: بـا لـە نیـگای چاوەکانیـان بگرنـەوە (ڕوانینـی حـەڕام نەکـەن)و، داوێنـی خۆیـان بپارێـزن (لـە حـەڕام) ئـەوە بۆیـان پـاك و چاکـترە، بـە دڵنیایـی خـوا شـارەزای ئەوەیـە کـە کارامانـە دەیکـەن ﴿٣٠﴾ هەروەهـا بـە ئافرەتانـی بـڕوادار بڵـێ: بـا لـە نیـگای چاوەکانیـان بگرنـەوە (لـە ڕوانیـن حـەڕام)و، داوێنـی خۆیـان (لـە حـەڕام) بپارێـزن و، جوانیـی خۆیـان دەرنەخـەن جگـە لـەوەی (بـە ئاسـایی) دەردەکـەوێ و، با بـە سەرپۆشـەکانیان یەخەو بەرۆکەکانیـان دابپۆشـن و، جوانیـی خۆیـان دەرنەخـەن، مەگـەر بـۆ مێردەکانیـان، یـان بابیـان، یـان بابـی مێردەکانیـان، یـان کوڕەکانیـان، یـان کـوڕی مێردەکانیـان (لـە ژنـی دیکەیـان)، یـان برایەکانیـان، یـان کـوڕی برایەکانیـان، یـان کوڕانـی خوشـکەکانیان،

یـان ئافرەتانـی خۆیـان (کـە جێـی متمانەیانـن)، یـان بەردەسـتەکانیان (کۆیلـەو کەنیـزەك)، یـان پیاوانێـك کـە (تەنیـا بـۆ ژیـان دابینکردنیـان) شـوێنکەوتوویانن (و لـە ماڵیانـن و) مەیلـی جینسـییان نیـە، یـان منداڵانێـك کـە هیـچ لـە بـارەی تایبەتمەندییەکانی ژنانـەوە نازانـن، هەروەها با (ئافرەتـان) پـێ بـە زەویـدا نەکوتـن (بـە جۆرێـك نـەڕۆن) کـە بـە هۆیـەوە ئـەو جوانییـەی شـاردوویانەتەوە، بزانـرێ، ئـەی بڕوادارینـە! تێکڕاشـتان بـۆ لای خـوا بگەڕێنـەوە، بەڵکـو سـەرفرازبن ﴿٣١﴾ هەروەها (ئـەی بڕوادارینـە!) هاوسـەرگیریی بـۆ پیـاوان و ئافرەتانـی بـێ هاوسـەر بکـەن، هەروەها بـۆ کۆیلـەو کەنیزەکـە چاکەکانتـان، ئەگـەر گریـمان (ئـەو پیـاوو ئافرەتـە بێ هاوسـەرانە) هەژاریـش بـن، ئـەوە خـوا لـە بەخششـی خـۆی بـێ نیازیـان دەکات و، خـوا (سـیفەت) فراوانـی زانایـە ﴿٣٢﴾ ئەوانـەش کـە توانـای ماددیـی هاوسـەرگیرییان نیـە، بـا خۆیـان پـاك ڕابگـرن، تاکـو خـوا لـە بەخششـی خـۆی بـێ نیازیـان دەکات و، ئـەو بەردەسـتانە (کۆیلانـە) شـتان کـە داوای موکاتەبـە دەکـەن، موکاتەبەیـان لەگەڵـدا بکـەن (ڕێککەوتنیـان لەگـەڵ بکـەن لەسـەر ئـەوەی لـە بەرانبـەر ئەندازەیەك سـاماندا ئازادیـان بکـەن)، ئەگـەر چاکەتـان تێـدا شـك بـردن (تێتـان ڕابینیـن)و، لـەو سـامانەی خـواش پێیـداون، هاوکارییـان بکـەن و، کچـە (کەنیزەکـە) کانیشـتان کـە پاکیـی و خۆپارێزییـان ویسـت، لەسـەر لەشفرۆشـیی ناچـار مەکـەن، کـە بـەو هۆیـەوە مـاڵ و سـامانێکی دنیایـی وەدەسـت بێنـن، هـەر کەسـێکیش تۆبزییـان لـێ بـکات، بێگومـان خـوا دوای ناچارکردنیـان، لێبـوردەو بەبەزەییـە (بەرانبـەر بـەو کەنیزەکانـە) ﴿٣٣﴾ بـە دڵنیاییـش ئایەتانێکـی ڕۆشـنکەرەوەمان بـۆ لاتـان دابەزانـدوە، هەروەهـا حـاڵ و بەسـەرهاتی ئـەو (گەل)انـەی لـە پێشـتاندا ڕابـردوون (بۆمـان دابەزانـدوون)و ئامۆژگارییـش بـۆ پارێـزکاران ﴿٣٤﴾.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(تَسْتَأْنِسُواْ): (الأُنْـسُ: خِـلاَفُ النُّفُـور)، (أُنْـس) واتـە: هۆگریـی، پێچەوانـەی سـڵەمینەوەیە، یـان پێچەوانـەی ناناشـناییە، وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا ٦﴾النسـاء، (أَي: أَبْصَرْتُـم)، واتـە: لێتـان هەسـت پێکـردن کـە منداڵاکانتـان باڵغ بـوون، (تَسْتَأْنِسُواْ)، یانـی: (تَجِـدُوا إِينَاسـاً) هەسـتان کـرد کـە ئولفـەت و هۆگریی هەیـە، وەك دوایـی باسـی دەکەیـن: لێـرەدا (تَسْتَأْنِسُواْ) توێژەرەوانـی قورئـان بـە (تَسْـتَأْذِنُوا)، لێکیـان داوەتـەوە، یـانی: مۆڵـەت وەردەگـرن، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا ئـەم وشـەی (تَسْتَأْنِسُواْ)، خـوا ﷻ بـە خۆڕایـی بـەکاری نەهێنـاوە، چونکـە وشـەی (تَسْـتَأْذِنُوا) لـە سـووڕەتی (النـور)دا بەکارهاتـوە، لـە دوو ئایـەت پێـش ئایەتەکانـی کۆتایـی دا (تَسْتَأْذِنُوا) چەنـد جارێـك بەکارهاتـوە، بـەڵام (تَسْتَأْنِسُواْ)، واتـە: مۆڵـەت وەرگرتـن، مۆڵـەت وەرگرتنێـك بزانـی ئـەو ماڵـە کـە بـۆی دەچـی، پێـی دڵخۆشـن و، لەسـەریان نابیـە بـارو، هۆگـرو ناسـوودەن، کـە تـۆ دەچـی بـۆ لایـان.

(تَذَكَّرُونَ): واتـە: وەبیرتـان بێتـەوە، لێـرەدا مەبەسـت وەبیرهاتنـەوەی ئـەو ڕاسـتییانەیە کـە لـە زگماکتانـدا دانـراون، قورئـان ئـەو ڕاسـتییانەتان بیـر دەخاتـەوە، بـەڵام مەبەسـتیش ئەوەیـە: ئـەو ڕاسـتییانەتان کـە بیـر دەکەونـەوە، پەندییـان لـێ وەربگـرن و کاریـان پێبکـەن.

(بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ): واتـە: ماڵانێـك خەڵکیـان تێـدا نیشـتەجێ نەبـێ، یانـی: (غَـيْرَ مَأْهُولَـة)، خەڵکیـان تێدانەبـێ، خەڵکێکـی تایبـەت، یانـی: (غَـيْرُ مَعْـدُودَةَ لِلسُّكْنَى)، کـە ئامـادە نەکرابـن بـۆ نیشـتەجێ بوونـی خێـزان، یانـی: هوتێلێکـە، هۆڵێکـە، چایخانەیـە، چێشـتخانەیە، ئـەو شـوێنە گشـتییانە، پێویسـت نـاکات سـڵاو بکـەی و مۆڵـەت وەربگـری، دەتـوانی یەکسـەر بچیـە شـوێنی گشـتیی.

(فِيهَا مَتَـٰعٌ لَّكُمْ): واتـە: سـوودێکی هەیـە، (المَتَـاعُ: التَمَتُّـعُ والإنْتِفَـاع)، سـوود وەرگرتـن و بەهـرە وەرگرتـن، وەك گوتـراوە: (كُلُّ مَنَافِـعِ الدُنْيَـا: مَتَـاعٌ)، هەمـوو سـوودەکانی دنیـا پێیـان دەگوتـرێ: (مَتَـاع) هەروەهـا بـە هـەر کـەل و پەلێك کە ئینسـان لێـی بەهرەمەنـد دەبێ و، بـە ژیانـی دنیـاش دەگوتـرێ: (مَتَـاع)، ﴿وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿٢٠﴾﴾ الحديد.

(يَغُضُّواْ مِنْ أَبْصَـٰرِهِمْ ): واتـە: لـە نیـگای چاوەکانیـان بگرنـەوە، (الغَـضُّ: النَّقْـصُ، وَالمَقْصُـودُ بِـه صَرْفُ المَـرءِ نَظَـرَهُ عَـنِ التَحْدِيْـقِ)، (غـض) بـە مانـای (نقـص)دێ، لـێ کەمکردنـەوە، (يَغُضُّواْ مِنْ أَبْصَـٰرِهِمْ )، واتـە: لـە نیـگای چاوەکانیـان بگرنـەوە، کەمـی بکەنـەوە، لێـرەدا مەبەسـت ئەوەیـە کـە مـرۆڤ چـاوی نەبڕێتـە دیمەنێکـەوە کـە نـارەزووی دەجووڵێنـێ، ئـەو کاتـە چـاو تێبڕینەکـە بـۆ ئـەو قەدەغەیـە، بـەڵام ئەگـەر چـاو بەهەڵـە تێهەڵەنگوتـن بـێ، ئـەوە چـاو پۆشـیی لێدەکـرێ، بـەڵام دوایـی کـە بـە مەبەسـتەوە سـەرنج دەدا، ئەوەیـان گوناهـە، پێغەمبـەر ﷺ بـە عەلـی کـوڕی ئەبـی تاڵیبـی (خـوا لێـی ڕازیبـێ) فەرمـووە: [يَـا عَـلِيُّ! لاَ تُتْبِـعِ النَّظْـرَةَ النَّظْـرَةَ، فَـإنَّ لَـكَ الأولَى وَلَيْسَـتْ لَـكَ الآخِـرَةُ] (أخرجـه أحمـد: ٢٣٠٧١، وأبـو داود: ٢١٤٩، والترمـذي: ٢٧٧٧، وقـال: حسـن غريـب، والحاكـم: ٢٧٨٨، وقـال: صحيـح عـلى شرط مسـلم).

واتـە: ئـەی عـەلی! لـە دوای ڕوانیـن مەڕوانـەوە، چونکـە یەکەمـت بـۆ حیسـاب دەکـرێ، بـەڵام دووەمیانـت لەسـەر حیسـاب دەکـرێ.

واتـە: یەکـەم گوناهـت ناگاتـێ، بـەڵام دووەم کـە بـە مەبەسـتەوە سـەرنج دەدەی، لەسـەرت حیسـابە.

(بِخُمُرِهِنَّ ): (الخُمُـرُ: جَمْـعُ خِمَـار)، (خُمُـر) کـۆی (خِـمَار)ە، (خِـمَار) واتـە: سـەرپۆش، دەسـماڵی نافـرەت، کـە سـەرو قـژی خـۆی پـێ دادەپۆشـێ.

(جُيُوبِهِنَّ): (جَمْـعُ جَيْـب: وَهُـوَ طَـوْقُ القَمِيْـصِ مِـمَا يَـلِي الرَقَبَـةَ)، (جیوبهـن) کـۆی (جَيْـب)ە، (جَيْـب) واتـە: دابڕاوایـی کـراس، یەخـە، بـەرۆك، بـە کوردیـی وای پـێ دەڵێـن.

(ٱلتَّـٰبِعِينَ غَيۡرِ أُوْلِي ٱلۡإِرۡبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ): واتە: شوێن کەوتووانێک لە پیاوان، کە پێویستییان نیە، واتە: پێویستیی جینسییان نیە، گوتراوە: (التابعين: أَتْبَاعُ بَيْتِ المَرْأَةِ يَتَرَدَّدُونَ عَلَىٰ بَيْتِهَا لأَخْذِ الصَّدَقَةِ أَو لِلخِدْمَةِ)، (التابعين) شوێنکەوتووانی ماڵی ئافرەت، هاموشۆی ماڵەکەی دەکەن بۆ وەرگرتنی هاوکریی، یان بۆ خزمەتکردن، (الإِرْبَةُ: الحَاجَةُ، والمُرَادُ بِهَا الحَاجَةُ إلى قُرْبَانِ النِّسَاءِ)، مەبەست لە (ٱلۡإِرۡبَةِ)، یانی: پێویستیی، بەڵام لێرەدا پێویستیی نیزیکیی لە ئافرەتانە، واتە: ئەو پیاوانەی ئارەزووی جینسییان نیە، یان لەبەر تەمەن، یان لەبەر نەخۆشیی، یان لەبەر ئەوە کە لە پلەیەکی نزمی کۆمەڵایەتیی دان، لە چاو ئەو ماڵەو، تەماع لەو ئافرەتە ناکەن.

(ٱلۡأَيَـٰمَىٰ): (جَمْعُ أَيِّمٍ مَنْ لاَ زَوْجَ لَهُ، رَجُلاً كَانَ أَوِ امْرَأَةً)، (أَيَامَى) کۆی (أَيِّم)ە، واتە: ئەوەی هاوسەری نەبێ، پیاو بێ یان ئافرەت بێ، هەندێکیش گوتوویانە: تەنها بۆ پیاوان بەکاردێ.

(ٱلۡبِغَآءِ): (البِغَاء: مَصْدَرُ بَاغَتِ الجَارِيَةُ: إذَا تَعَاطَتِ الزِّنَى بِالأَجْرِ حِرْفَةً لَهَا)، (بغاء) چاوگی (بَاغَتِ الجَارِيَة) کەنیزەکەکە زینای کرد بە پارە لە بەرانبەر کرێدا، کە بە کوردیی لەشفرۆشیی پێ دەڵێن.

(وَمَثَلًا): (المَثَلُ: النَّظِيرُ وَالمُشَابِهُ، أو الحَالَةُ العَجِيبَةُ)، (مَثَل) واتە: وێنە، یاخود وێچوو، هەروەها بە حاڵەتێکی سەیرو سەرسوڕهێنەریش دەگوترێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

ئـەم ئایەتـە موبارەکـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، ئـەم ڕسـتەیە کـە بەشـێکە لـە ئایەتـی ژمـارە (٣٣) بەسـەرهاتێکی هەیـە، چەنـد ڕیوایەتێکـی لەبـارەوە هاتـوون:

١)- {عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيِّ ابْنُ سَلُولَ يَقُولُ لِجَارِيَةٍ لَهُ: اذْهَبِي فَابْغِينَا شَيْئًا، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ ...﴾} (أخرجه مسلم: ٣٠٢٩).

واتـە: جابیـری کـوڕی عەبدوڵـڵا (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ)، دەڵـێ: عەبدوڵـڵای کـوڕی ئوبـەی کـوڕی سـەلوول کەنیزەکێکـی هەبـوو، پێـی دەگـوت: بـڕۆ پارەمـان بـۆ پەیـدا بکـە، (واتـە: لەشفرۆشـیی بکـەو پارەمـان بـۆ پەیـدا بکـە)، خـوا (عَـزَّ وَجَـلَّ) ئـەو بەشـەی لـەو ئایەتـە موبارەکـە نـاردە خـوار.

٢)- {عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ جَارِيَةً لِعَبْدِ اللهِ بْنِ أُبَيِّ ابْنِ سَلُولَ يُقَالُ لَهَا: مُسَيْكَةُ، وَأُخْرَى يُقَالُ لَهَا: أُمَيْمَةُ، فَكَانَ يُكْرِهُهُمَا عَلَى الزِّنَا، فَشَكَتَا ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾}، (أخرجه: مسلم: ٣٠٢٩).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی ئوبـەی کـوڕی سـەلوول، کەنیزەکێکـی هەبـوو بـە نـاوی موسـەیکە، یەکێکـی دیکەشـی هەبـوو بـە نـاوی ئومەیمـە، بـە تۆبزیـی زینـاو لەشفرۆشـیی پێدەکـردن، ئەوانیـش سـکاڵایان لـە لای پێغەمبـەر ﷺ کـرد، (کـە ئێمـە مسـوڵمانین و داوێـن پیسـیی و لەشفرۆشـییمان پـێ دەکات)، خـوای پەروەردگاریـش ئـەو ئایەتـەی نـاردە خـوار، کـە ئـەوە قەدەغەیـەو نابـێ.

٣)- {عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، يَقُولُ: جَاءَتْ مُسَيكَةُ لِبَعْضِ الْأَنْصَارِ، فَقَالَتْ: إِنَّ سَيِّدِي يُكْرِهُنِي عَلَى الْبِغَاءِ، فَنَزَلَ فِي ذَلِكَ: ﴿ وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾} (أخرجه أبو داود: ٢٣١١، والنسائي: ٣٨٥٠، والطبري في تفسيره: ج١٨، ص١٠٣، والحاكم ج٢، ص٣٩٧، وقال: هذا حديث صحيح على شرط مسلم، ولم يخرجاه، تعليق الذهبي في التلخيص: على شرط مسلم).

واتە: جابیر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئافرەتێك بە ناوی موسەیکە، کە کەنیزەکی هەندێك لە پشتیوانەکان بوو، هات (بۆ لای پێغەمبەر ﷺ)، گوتی: گەورەکەم ناچارم دەکات لەشفرۆشیی بکەم، خواش (عَزَّ وَجَلَّ) ئەم ئایەتەی لەو بارەوە نـاردە خوار.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

ئێمە پێشتر لە پێناسەی ئەم دەرسەدا گوتمان: ئەم هەشت ئایەتە موبارەكە، یازدە (١١) حوكمی گرنگی بواری خێزانیی و كۆمەڵایەتییان گرتوونە خۆیان، كە ئێمە یازدە حوكمەكانمان سەرژمێر كردن و، بە تەئكید دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا بە وردیی دەیانتوێژینەوە، بۆیە ئێستا لە مانای گشتییدا ناچینە نێو وردەكارییەكانەوە، بەڵام نەخشەی گشتیی ئایەتەكان دەخەینەڕوو و، مانای گشتیی ئایەتەكان دەكەین:

خوا ﷻ دوای ئەوەی باسی سزای زینای كردو، باسی ئەوەی كرد كە پیاوان و نافرەتانی داوێن پیس، شایستەی یەكدین و، پیاوان و نافرەتانی بڕوادار، لێیان قەدەغەیە ئەو جۆرە هاوسەرگیرییە بكەن و، دوای ئەوەی باسی سزای بوختان كردنی كردو، دوای ئەوەی باسی لیعانی كردو، پاشان باسی بەسەرهاتی بوختان پێكرانی دایكمان عائیشەی كرد (خوا لێی ڕازی بێ)، ئنجا دوای ئەوە خوا ﷻ ڕوو لە ئیمانداران دەكات و دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! مەچنە ماڵانێك جگە لە ماڵەكانی خۆتان، تاكو هۆگرانە مۆڵەت وەردەگرن و، سڵاو لە خەڵكەكەی دەكەن، ﴿ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾، ئا ئەوە بۆ ئێوە باشترە، (بۆیەش خوا بۆتان ڕوون دەكاتەوە) بەڵكو بیربكەنەوەو فێربن و پەند وەربگرن، پێشتریش باسمان كرد كە (تَسْتَأْنِسُواْ) هەرچەندە زۆربەی هەرە زۆری تەفسیرەكان، هەر بە (تستأذنوا)، لێكیان داوەتەوە، بەڵام وشەی (تستأذنوا)، لە قورئاندا هەر لەم سوورەتی (النور) دا هاتوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُواْ مَعَهُۥ

عَلَىٰٓ أَمۡرٖ جَامِعٖ لَّمۡ يَذۡهَبُواْ حَتَّىٰ يَسۡتَـٔۡذِنُوهُۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَـٔۡذِنُونَكَ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ فَإِذَا ٱسۡتَـٔۡذَنُوكَ لِبَعۡضِ شَأۡنِهِمۡ فَأۡذَن لِّمَن شِئۡتَ مِنۡهُمۡ ﴿٦٢﴾ ﴾، لێرەدا چوار جاران خوا ﷻ باسی مەسەلەی مۆڵەت وەرگرتنی کردوە بە بێژەی (إستئذان)، مۆڵەت وەرگرتن، بەڵام بێگومان لێرەدا (تَسۡتَأۡنِسُواْ)، تەنیا مۆڵەت وەرگرتن نیە، بەڵكو: (الإستئناس: استفعَالٌ من الأُنسِ)، یانی: (طَلَبُ الأُنس)، (أُنس)، یانی: هۆگریی، نولفەت، واتە: ئێوە تاکو نەزانن ئەو ماڵە هۆگرتانن، لەو کاتەدا کە دەچن و، لەگەڵتان ئاسوودەن و، دڵ موڕتاحن و ئێوە نابنە بارگرانیی بۆیان و، سەغڵەتیان ناکەن، مەچنە ماڵەکانەوە، جاری وا هەیە سەردانی ماڵێك دەکەی، لە دەرگاشیان دەدەی و مۆڵەتیش وەردەگری و، سڵاویشیان لێ دەکەی، بەڵام ڕەنگە موڕتاحیش نەبن لەو کاتەدا، تۆ بچی بۆ لایان، بۆیە وەك دواتر وردتر باسی دەکەین، لێرەدا (الإستئناس) تەنیا مۆڵەت وەرگرتن نیە، بەڵكو ئەوەیە کە بشزانی: ئایا لەو کاتەدا کە دەچی بۆ لایان و سەردانیان دەکەی، پێی ئاسوودەو موڕتاحن، یان نا؟

﴿ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدٗا فَلَا تَدۡخُلُوهَا ﴾، ئەگەر هیچ کەسێکتان لەو ماڵانەدا نەبینی، مەچنە ژووریان، مەچوونە نێویان، ﴿ حَتَّىٰ يُؤۡذَنَ لَكُمۡۖ ﴾، هەتا مۆڵەت دەدرێن، واتە: ئەگەر کەسێك مۆڵەتی دای گوتی: بچۆ بۆ ماڵەکەمان و ئەوەش کلیلەکەو کەسی لێ نیە، ئەوە قەیناکات، بەڵام لە حاڵێك دا کەسی لێ نەبێت، بە دەرگادا بچی، یان بە سەر دیواردا بچی، یان دەرگاکە بشکێنی، یاخود کلیلێکی دیکە پەیدا بکەی و دەرگاکەی پێ بکەیەوە، بە هەر شێوەیەك بێ، حەرامەو قەدەغەیە، ﴿ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرۡجِعُواْ فَٱرۡجِعُواْۖ ﴾، ئەگەر لەلای (خاوەن ماڵەکەوە) پێتان گوترا: بگەڕێنەوە، بگەڕێنەوە، واتە: ئەگەر مۆڵەت نەدران، دەبێ بگەڕێنەوە، نەك هەر خۆتی پێدا بکەی، وەك تاوێرێ کە خلۆر دەبێتەوە، هەر خۆت خلۆر بکەیەوە! ﴿ هُوَ أَزۡكَىٰ لَكُمۡۚ ﴾، ئەوە بۆ ئێوە پاك و چاکترە، واتە: ئەگەر پێتان گوترا: بگەڕێنەوە، ئێستا دەرفەتمان نیە، کاتمان نیە، ئەوە بۆ

تێوە پاك و چاكترە، ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ﴾، خواش بەوەی دەیكەن، زانایە، دەزانێ چی دەكەن؟ چۆن دەكەن؟ بۆچی دەچن بۆ ئەو ماڵە؟.

ئنجا خوا ﷻ حاڵەتێك هەڵداوێرێ لەو حوكمە گشتییە، حوكمی مۆڵەت وەرگرتن، ئەویش ئەوەیە كە دەفەرموێ: ﴿ لَّيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ مَسۡكُونَةٖ فِيهَا مَتَٰعٞ لَّكُمۡ ﴾، گوناهتان ناگاتێ بچنە ماڵانێكەوە، شوێنانێكەوە كە خەڵكی تایبەتییان تێدا نیە، واتە: خێزان و عائیلەیان تێدا نیە، ﴿ فِيهَا مَتَٰعٞ لَّكُمۡ ﴾، تێوەش سوودێكتان هەیە لە وێدا.

لێرەدا هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن، دەڵێن: مەبەست پێی شوێنە گشتییەكانە، ئنجا ئەو كاتە ئەو شوێنانەی دایانناون، كاروانسەرا (خان) یان پێكوتوە لە شوێنی ئوتێلی ئێستا، شوێنێك بووە كاروانچیی نانیان لێ خواردوەو، كە پشوویان لێداوە، بەڵام ئێستا ئەو شوێنە گشتییانە زۆر زۆرن: چێشتخانەیە، چایخانەیە، هوتێلە، باغ و شوێنی گشتییە، مۆزەخانەیە، هۆڵە، هەموو ئەو شوێنە گشتییانە، هەموو ئەو شوێنانەی خەڵك بە گشتیی بۆیان دەچێ، تۆ مولزەم نی بەوەی كەسێكی دیاریكراو مۆڵەتی لێ وەربگری، خەڵك بە گشتیی دەچێ، تۆش دەچی، ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا تَكۡتُمُونَ ﴾، خواش دەزانێ چی ئاشكرا دەكەن و چی پەنهان دەكەن.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر بابەتێكی دیكە: ﴿ قُل لِّلۡمُؤۡمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِمۡ وَيَحۡفَظُواْ فُرُوجَهُمۡ ﴾، ئەی پێغەمبەر ﷺ! بە پیاوانی بڕوادار بفەرموو: با لە چاویان بگرنەوە، واتە: لە تەماشاكردنی چاویان كەم بكەنەوەو بگرنەوە، ﴿ وَيَحۡفَظُواْ فُرُوجَهُمۡ ﴾، هەروەها داوێنی خۆشیان بپارێزن، ﴿ ذَٰلِكَ أَزۡكَىٰ لَهُمۡ ﴾، ئەوە پاك و چاكترە بۆیان، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا يَصۡنَعُونَ ﴾، بە دڵنیایی خوا شارەزای ئەوەیە كە بە كارامەیی و بە لێزانیی و وردەكاریی ئەنجامی دەدەن، هەرچەندە بە پەنهانیی و بە كارامەیی، كارێك بكەن، بەڵام خوا پێی شارەزایە.

جێی سەرنجە: خوا پێش ئەوەی بفەرموێ: داوێنی خۆیان بپارێزن، دەفەرموێ: با چاوی خۆیان بپارێزن، بەڵام بۆ چاوەکە نەیفەرمووە: (يُغمِضوا أبْصارَهُم)، چاویان بنووقێنن، دەفەرموێ: ﴿يَغُضُّواْ مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ﴾، (غَضْ)، یانی: (نَقْص)، بەڵام (غَمضْ)، یانی: نووقاندن، خوا نافەرموێ: با چاویان بنووقێنن، بەڵکو دەفەرموێ: با لە نیگای چاوەکانیان کەم بکەنەوە، واتە: جارێك تەماشا دەکەی بۆ بەر پێی خۆ بینین، یان بۆ ئەوەی ئەو ئافرەتە بناسی، یان ئەو نەفەرە لە پێشتەوەیە، بزانی کێیە؟ بەڵام مەچۆ دوایی دووبارە سەرنجی بدەیەوە، بە مەبەستی بینینی جوانییەکەی، ئەوەی دووەمیان حەرامە، ئەگەرنا چاو تێهەڵەنگوتن، کە تۆ بەر پێی خۆت ببینی، یان خەڵك بناسی، قەدەغە نیە، وەك گوتراوە: (النَّظَرُ بريدُ الزِّنا)، ڕوانینی قەدەغە، پۆستەی داوێن پیسییە، زینا لەوێوە سەرچاوە دەگرێ و لەوێوە دەست پێ دەکات.

ئەوە بە نسبەت پیاوانەوە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ﴾، هەروەها بە ئافرەتانی بڕواداریش بڵێ: با لە نیگای چاوەکانیان کەم بکەنەوەو داوێنی خۆشیان بپارێزن، ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾، با جوانیی خۆشیان دەرنەخەن، مەگەر ئەوەی کە دەردەکەوێ.

ئایا ئەوەی لێی دەردەکەوێ (مَا ظَهَرَ مِنْهَا) چییە؟ دوایی باسی دەکەین، مشتومڕی زۆر لە نێوان زانایاندا هەیە لەو بارەوە، بەڵام باشترین تەعبیر بە بۆچوونی من، ئەوەیە کە (القرطبي)، گوتوویەتی: کە ئەویش لە زانایانی پێشینی وەرگرتووە، کە دەڵێ: (أي: مَا يَظْهَرُ عَادَةً وَعِبَادَةً)، ئەوەی لە حاڵەتی ئاسایی و لە کاتی خواپەرستییدا دەردەکەوێ، کە دەم و چاوو هەردووك لەپە دەستن، هەندێکیان گوتوویانە: تاکو نیوەی قۆڵیش (إلى نصف الذراع)، ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾، هەروەها با سەرپۆشەکانیان بەسەر یەخەو بەرۆکیان دابدەن.

سەرپۆشەکانیان ئەوەی لەسەر سەریانە، با بەسەر یەخەو بەرۆکیدا بدەن، بۆیەش وا وردی دەکەمەوە، چونکە هەندێ لە زانایانی هاوچەرخی کەوتوە ژێر کاریگەری رەوتی سیکۆلاریزم، گوتوویانە: خوا باسی ئەوەی نەکردوە ئافرەتان سەرو قژیان داپۆشن، هەر دەفەرموێ: با سینگ و بەرۆکیان داپۆشن! بەڵام ئەوان ئەگەر خۆیان لە گێلیی نەدەن، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ ﴾، (خُمُر) کۆی (خِمار)ە، یانی: سەرپۆش، واتە: سەرپۆشەکانیان کە لەسەر سەرە، با بە زیادەی سەرپۆشەکانیان یەخەو بەرۆکیان داپۆشن، (جیوب)یش کۆی (جَیب)ە، واتە: ئەو کەلێن و دابڕاوەی کراس کە ئینسان سەری پێدا دەکات.

﴿ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ ﴾، هەروەها با جوانیی خۆیان دەرنەخەن، مەگەر بۆ مێردیان، مێردەکانیان، ﴿ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ ﴾، یان بۆ بابیان، ئەگەر بابیان سەرو قژو مل و گەردنیان ببینن، قەیدێ ناکات، ﴿ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ ﴾، یاخود بابی مێردیان، واتە: خەزووریان، ﴿ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ ﴾، یان کورەکانیان، ﴿ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ ﴾، یاخود: کوڕانی مێردەکانیان، لە ژنانی دیکە، ﴿ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ ﴾، یان برایەکانیان، ﴿ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ ﴾، یان برازایەکانیان، کوڕانی براکانیان، ئەوانە هەموویان مەحرەمن، ﴿ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ ﴾، یان کوڕانی خوشکەکانیان، خوشکەزاکانیان، ﴿ أَوْ نِسَآئِهِنَّ ﴾، یان ئافرەتەکانیان، واتە: ئەو ئافرەتانەی کە جێی متمانەیانن، ئافرەتانی مسوڵمان، یان ئافرەتانێک کە لێیان نیزیکن و جێی متمانەیانن، ﴿ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ ﴾، یاخود ئەوانەی کە لەبەر دەستیانن، واتە: کەنیزەك و کۆیلەکان، ﴿ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُوْلِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ ﴾، یاخود شوێنکەوتووانێك لە پیاوان کە پێویستییان نیە، پێویستیی جینسییان نیە، بەس بۆیە لەو ماڵەن: یان خزمەتێك دەکەن، یاخود خۆیان بەهرەیەك وەردەگرن، بەڵام ئارەزووی جینسییان نیە، یان لەبەر بە تەمەنیی، یان لەبەر نەخۆشیی، یان لەبەر هەر هۆیەك بێ، ﴿ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُواْ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ﴾.

(ٱلطِّفْلِ)، (طفل) تاکە، بەڵام مەبەست پێی کۆیە، واتە: ئەو منداڵانەی کە جارێ ئاشنا نەبوون بە عەورەتی ئافرەتان، بە تایبەتمەندییەکانی ئافرەتان ئاشنا نەبوون، ﴿وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ﴾، هەروەها با ئافرەتان پێیان بە زەویدا نەکوتن، تاکو ئەو جوانییەی کە شاردوویانەتەوە بزانرێ، کە مەبەست پێی خرخاڵە، یان مەبەست خشڵ و زێڕە کە ئافرەت بە خۆیدا دەکات، ئەگەر بە لەنجەو لار بڕوات، خرینگەو زرینگەی لێ دێ، یان: پێڵاوی پاژنە بەرز، ئەگەر بە جۆرێك پێی بڕوات ئەندامەکانی بەرجەستە دەبن، با ناوا نەکەن، ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾، ئەی بڕوادارینە! تێکڕا بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾، بەڵکو سەرفراز بن، بەختەوەر بن، بە مراد بگەن.

ئنجا خوای بەرزو مەزن، دێتە سەر بابەتێکی دیکە: ﴿وَأَنكِحُواْ ٱلْأَيَٰمَىٰ مِنكُمْ﴾، هەروەها پیاوان و ئافرەتانێك کە بێ هاوسەرن، هاوسەرداریان بکەن، هاوسەرگیرییان بۆ بکەن، ﴿وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ﴾، هەروەها کۆیلەکان و کەنیزەکەکانی کە چاکن (ئەوانیش هاوسەردار بکەن)، ﴿إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ﴾، ئەگەر هەژاریش بن، خوا لە بەخششی خۆی دەوڵەمەندیان دەکات.

یانی: لەبەر ئەوەی هەژارو نەدارن، مەچن ڕێگر بن لە بەردەم هاوسەرگیری کردنیان دا، ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾، خواش فراوانی زانایە، واتە: خوا سیفەت فراوانی، زانایە بە هەموو شتێك.

﴿وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ﴾، ئەوانەش کە توانای هاوسەرگیرییان نیە، (توانای ماددییان نیە)، با جارێ خۆ پاك ڕابگرن، تاکو خوا لە بەخششی خۆی دەوڵەمەندیان دەکات، بێ نیازیان دەکات.

ئنجا چ پیاون، چ ئافرەتن، با خۆیان پاك ڕابێنن.

ئنجا خوا دێتە سەر بابەتێکی دیکە: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَبۡتَغُونَ ٱلۡكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَكَاتِبُوهُمۡ إِنۡ عَلِمۡتُمۡ فِيهِمۡ خَيۡرٗاۖ ﴾، هەروەها ئەوانەی (ئەو کۆیلەو کەنیزەکانەی) بە دەستە ڕاستەکانتاوەن،( لەبەر دەستانن)، ئەگەر داوای موکاتەبەیان کرد، ئێوە لەگەڵیاندا بکەن، ئەگەر چاکەتان تێدا بینین.

موکاتەبە ئەوە بووە کۆیلەیەك، یان کەنیزەکێك چۆتە لای خاوەنەکەی خۆی، گوتوویەتی: دەچم کەسابەت دەکەم، دەستێك دەجووڵێنم، چەندەت پارە بۆ بێنم، ئازادم دەکەی؟ گوتوویەتی: ئەوەندەو لەوەندە مانگەدا بۆم بێنە، یان لەوەندە ساڵەدا بۆم بێنە، ئەویش چووە کەسابەتێکی کردوە دەستێکی جووڵاندوە، یان خەڵکی دیکە هاوکاریی کردوە، پارەکەی بۆ بردوەو ئازاد بووە، ئا ئەوە (موکاتەبە)ی پێگوتراوە، ﴿ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ ءَاتَىٰكُمۡۚ ﴾، لەو سامانی خوایەش کە پێی داون، هاوکارییان بکەن، ئێوەش دەستبارێکیان بۆ بگرن، ئنجا ئایا ئەوە مەبەست پێی خاوەن کۆیلەو کەنیزەکانن، کە دەبێ هاوکارییان بکەن، یان مەبەست پێی دەوڵەت و کۆمەڵگای مسوڵمانە، یان هەردووك واتایەکەی هەن لە یەك کاتدا؟!.

هەر سێکیان گونجاون و گوتراویشن.

﴿ وَلَا تُكۡرِهُواْ فَتَيَٰتِكُمۡ عَلَى ٱلۡبِغَآءِ ﴾، کچەکانتان، (کەنیزەکەکانتان) لەسەر لەشفرۆشیی ناچار مەکەن، ﴿ إِنۡ أَرَدۡنَ تَحَصُّنٗا ﴾، لە حاڵێکدا ئەوان دەیانەوێ خۆیان پاك ڕابگرن، بەڵام ئەگەر ئافرەتە کەنیزەکە، خۆی داوێن پیس بێ، ئەوە داوێن پیسە، ﴿ لِّتَبۡتَغُواْ عَرَضَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ ﴾، بۆ ئەوەی شتێك لە ماڵ و سامانی دنیا بەوە پەیدا بکەن، یانی: کاسبییان پێ مەکەن.

﴿ وَمَن يُكۡرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعۡدِ إِكۡرَٰهِهِنَّ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، هەر کەسێکیش ناچاریان بکات، بە دڵنیایی خوا لە دوای ناچارکرانیان، لێبوردەی بە بەزەییە، (بە نسبەت ئەوانەوە)، نەك بە نسبەت ئەو کەسەی ناچاریان دەکات.

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ ءَايَـٰتٍ مُّبَيِّنَـٰتٍ ﴾، بە دڵنیایی بۆ لای ئێوە ئایەتە ڕۆشنکەرەوەکانمان دابەزاندوون، (مُّبَيِّنَـٰتٍ) ڕۆشنکەرەوەکان، خوێنراویشەتەوە: (مُبَيَّنَات)، واتە: ڕۆشنکراوەکان، ڕوونەکان، ﴿ وَمَثَلًا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُمْ ﴾، هەروەها وێنەیەك لە گەلانێك کە لە پێش ئێوەدا ڕابردوون، ئەوەشمان بۆ دابەزاندوون، ئەو بەسەرهات و نموونانەی بەسەریان هاتوون، ﴿ وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴾، ئامۆژگاریشن بۆ پارێزکاران، ئەوەشمان بۆ دابەزاندوون، لەم قورئانە بەرزو بە پێزەدا.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:**

**نابێ مسوڵمانان بە بێ مۆڵەت وەرگرتن و هۆگریی پەیداکردن و سڵاوکردن، بچنە ماڵەکانی یەکدیی و، لە کاتی چۆڵ بوونی ماڵێک، یان مۆڵەت نەدرانیشدا، پێویستە بگەڕێنەوە، بەڵام شوێنە گشتییەکان، دروستە هەموو لایەک بەهرەیان لێ وەربگرن و، بەبێ مۆڵەت بچن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَاۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ٢٧ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدٗا فَلَا تَدۡخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤۡذَنَ لَكُمۡۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرۡجِعُواْ فَٱرۡجِعُواْۖ هُوَ أَزۡكَىٰ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ٢٨ لَّيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ مَسۡكُونَةٖ فِيهَا مَتَٰعٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا تَكۡتُمُونَ ٢٩ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ.

٢)- ﴿ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ ﴾، مەچنە ماڵانێك جگە لە ماڵەکانی خۆتان، (بيت) واتە: ماڵ، (منزل)یشی پێ دەگوترێ و (دار)یشی پێ دەگوترێ، ئەو شوێنەی خەڵك تێدا نیشتەجێیەو، ماڵ و خێزانێك، یان چەند ماڵ و خێزانێکی تێدان، وشەی (بیوت) لە هەردوو وشەکانداو، لە کۆی ئەم سوورەتەدا، بە دوو شێوە خوێنراوەتەوە:

أ- (بُیُوت)، (ب) کە بۆر (ضَمّة)ی لەسەر بێ.

ب- (بِیُوت)، (ب) کە ژێر(کَسْرة)ی هەبێت، (بُیُوت) و (بِیُوت)، بە هەردوو شێوەکە خوێنراوەتەوە.

٣)- ﴿ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ ﴾، تاکو مۆڵەت و هۆگریی وەردەگرن و، دڵنیا دەبن، کە ئەو ماڵە بە چوونی تێوە دڵ ئاسوودەو موڕتاحن، نەك تەنیای مۆڵەت وەرگرتنی ڕووت، چونکە: (الإِسْتِئْنَاسُ: إِسْتِفْعَالٌ مِنَ الأُنْسِ، وَهُوَ أَنْ يَسْتَأْذِنَ أَهْلَ بَيْتٍ فِي الدُّخُولِ عَلَيْهِم، فَيَأْنَسَ إِلَى إِذْنِهِم لَهُ فِي ذَلِكَ، وَيَأْنَسوا إِلَى اسْتِئْذَانِهِ إِيَّاهُم)[1].

واتە: (الإستئناس إستفعال)ە لە (أُنس)ەوە، یانی: هۆگریی و پێك موڕتاح بوون، پێك ئاشنابوون، ئەویش ئەوەیە کە داوا لە خاوەنی ئەو ماڵە بکات، بچێتە لایان، ئنجا ئەویش هۆگر بێ بە مۆڵەتدانیان بۆی و، ئەوانیش هۆگربن بەوەی مۆڵەتی بدەن، بچێ بۆ لایان و هۆگرو دڵخۆش و ئاسوودە بن بەوەی کە مۆڵەتی لێ وەرگرتوون.

وەك پێشتریش گوتمان: (تَسۡتَأۡنِسُواْ)، تەنیا ئەوە نیە مۆڵەت وەربگری، بەڵکو ئەوەیە کە دڵنیاش بی، ئەوان بە هۆی چوونی تۆوە دڵ ئاسوودەن، موڕتاحن و پێیان خۆشەو هۆگرتن، نەك وەك بارێکی گران بی لەسەر شانیان و ببیە مایەی بارگرانیی و، سەغڵەت کردنیان.

٤)- ﴿ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴾، هەروەها سڵاویش لە خەڵکەکەیان، لە خەڵکی ئەو ماڵانە بکەن، ئنجا بچنە ژوور.

٥)- ﴿ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴾، ئا ئەوە بۆ تێوە باشترە، (بۆیەش خوا بۆی ڕوونکردنەوە)، تاکو بیربکەنەوەو پەند وەربگرن، یاخود: بۆ ئەوەی: چاکیی ئەو شتە بزانن و، کاری پێ بکەن و لە خۆتاندا بەرجەستەی بکەن.

٦)- ﴿ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدٗا فَلَا تَدۡخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤۡذَنَ لَكُمۡ ﴾، ئنجا لە حاڵێکدا خەڵکەکە لەوێ بێ، ئەوە تۆ هەوڵ دەدەی بە شێوەیەکی هۆگرانە مۆڵەتیان لێ وەربگری، تاکو کە

---

(١) جامع البيان: ج١٨، ص١١٩.

بچیە لایان، نەبیە بارگرانیی بۆیان و سڵاویشیان لێ بکەی، بەڵام: ﴿ فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدًا ﴾، ئەگەر هیچ کەستان لەو ماڵاندا نەبینی، ﴿ فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ ﴾، مەچنە ژوور ئەو ماڵانە، تاکو مۆڵەتتان دەدرێ.

٧)- ﴿ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُواْ فَٱرْجِعُواْ ﴾، ئەگەر پێشتان گوترا: بگەڕێنەوە یەکسەر بگەڕێنەوە، چونکە (ف)ی (فارجعوا) وا پێدەچێ بۆ بەدواداهاتن (تعقیب)بێ، بێ وەخران.

٨)- ﴿ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ ﴾، ئەوە بۆ ئێوە پاك و چاکترە، (أَزْكَىٰ)، یانی: (أطهر وأصلح وأنمى)، پاکترەو چاکترەو، زیاتر مایەی گەشە کردنتانە، چونکە (زکى) یانی: (طهر، ونمى، وصلح)، پاکبوو، گەشەی کرد، چاکبوو.

٩)- ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴾، خواش بەوەی دەیکەن و ئەنجامی دەدەن زانایە، دەزانێ چۆن مۆڵەت وەردەگرن؟ چۆن دەچن و چۆن هەڵسوکەوت دەکەن؟

ئنجا خوای کارزان دێتە سەر باسی بابەتێکی دیکەی سێیەم:

١٠)- ﴿ لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ ﴾، گوناهتان ناگاتێ بچنە ماڵانێکەوە کە خەڵکیان تێدا نیشتەجێ نیە، واتە: بچنە شوێنە گشتییەکانەوە، کە تایبەت نین بە خێزانانەوە.

١١)- ﴿ فِيهَا مَتَٰعٌ لَّكُمْ ﴾، کە لەوێدا بەهرەیەك بۆ ئێوە هەبێ، سوودێك هەبێ.

چایەك دەخۆن، نانێك دەخۆن، پشوویەك دەدەن، یان کارێك لەوێدا ئەنجام دەدەن.

١٢)- ﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴾، خواش دەزانێ ئەوەی کە دەری دەخەن و، ئەوەش کە پەنهانی دەکەن.

ئەم ئایەتە بە پێزە دوو ئامانجان دەپێکێ:

أ- هەڕەشەو ترساندنە بۆ کەسێك، نیازو مەبەستێکی خراپی هەبێ، وەك ئەوەی بیەوێ عەورەتی خەڵك ببینێ، یاخود لە پەنهان و شێردراوەیان ئاگادار بێ، بەبێ مۆڵەتی خۆیان.

ب- مژدەو دڵخۆشییە بۆ کەسێك، کە کارو ئاکاری پەسندی ئاشکراو پەنهانی هەن.

## کورتە باسێک لە بارەی
## سەردان و مۆڵەت وەرگرتن و سڵاوکردنەوە[1]

ئـەم کورتـە باسـە لـە حـەوت بڕگـەدا دەخەینـە ڕوو، حـەوت بڕگـەی کـورت و گـوشراو، باســی ئـەو ســێ مەسـەلەیە، کـە پێکـەوە تێکهەڵکێـشراون و پێکـەوە پەیوەسـتن، دەکەیـن: سـەردان، هۆگـر بـوون و مۆڵـەت وەرگرتـن، سـڵاو کـردن:

### ١- پاراستنی حورمەتی ماڵ و حاڵ و ژیانی تایبەتیی، یەکدی پێویستە:

ماڵ و حاڵی هـەر کەسێك، موڵکی تایبەتیی ئـەو کەسـەیە، هـەر کەسـە لـە ماڵـی خۆیـدا ئـازادە، ئازادیی تەواویی هەیـە، چـۆن دەخـەوێ، چـی دەکات، چـی دەخـوات، چ پۆشـاکێك لەبـەر دەکات؟ لـە سـنووری شـەرعدا، ئـەو مرۆڤـە لـە ماڵـی خۆیـدا ئـازادە، بۆیـە هیـچ کـەس بـۆی نیـە سـنووری ئـەو شـوێنە تایبەتییـەی ببەزێنـێ و سـەغڵەتی بـکات، وەك خـوا ﷻ لـە سـووڕەتی (النحـل)دا دەفەرمـوێ: ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنٗا ﴿٨٠﴾﴾، خـوا لـە ماڵەکانـی خۆتانـدا مایـەی سرەوتنـی بـۆ دانـاون.

ئنجا ئەگـەر خەڵـك بـە بـێ سـڵاوکردن و، بـە بـێ مۆڵـەت وەرگرتـن بچنـە ماڵـی یەکـدی، مانـای وایـە ئـەو ماڵـە وەك شـەقام و کۆڵانـی لێـدێ و، لێیـان جیـاواز نابـێ و، سـەرەنجام حیکمەتـی مـاڵ و جێگـەی تایبەتیـی هەبـوون، کـە بریتیـە لـە ئۆقـرە گرتـن: (سَكَنًا)، ﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنٗا ﴿٨٠﴾﴾، (سَكَنًا)، یانـی: مایـەی ئارامیـی و نیشـتەجێ بـوون و ئوقـرە گرتـن، ئـەو حیکمەتـە تێدەچـێ، بۆیـە مۆڵـەت وەرگرتـن و سـڵاوکردن، کراوەتـە ئەدەبێکـی گرنگـی کۆمەڵایەتیـی لـە ئیسـلامدا.

---

(١) لە کتێبی: (ئـەدەب و ڕەوشـتە کۆمەڵایەتییـەکان)دا بـە درێژیـی بـاسی سی (٣٠) لـە ئـەدەب و ڕەوشـتە کۆمەڵایەتییەکانمـان کـردوە، لـە نێویـان دا: ئـەدەبی سـەردان و سـڵاوکردن.

### ٢- حیكمەتی بەكارهێنانی وشەی (إستئناس) لە جیاتی (إستئذان):

پێشتریش باسمان كرد، بەڵام لەبەر ئەوەی گرنكە دووبارەی دەكەینەوە: هەرچەندە زۆربەی هەرە زۆری ئەهلی تەفسیر وشەی (إستئناس)یان هەر بە (إستئذان) لێكداوەتەوە، بەڵام لە ڕاستییدا وا نییە، وشەی (إستئذان)، هەر لە سوورەتی (النور)دا، چەند جارێك دووبارە بۆتەوە، ئنجا خوا ﷻ دەیتوانی وەك چۆن لەوێدا فەرموویەتی: (یستأذنونك)، لێرەش بفەرمووێ: (یا أیها الَّذِینَ امنُوا لا تدخلوا بُیوتاً غیر بیوتكم حتی تستأذنوا)، بەڵام فەرموویەتی: (تَسْتَأْنِسُواْ)، وشەی (إستئناس)، مانایەكی وردتری گرتۆتە خۆی لە (مۆڵەت وەرگرتن)، مانای مۆڵەت وەرگرتنی هەر هەیە، بەڵام مانایەكی وردتریشی هەیە، ئەویش ئەوەیە كە ماڵی سەردانكراو (مَزُور) بە بۆنەی بابای سەردانكەرەوە، دووچاری نارەحەتیی و سەغڵەتیی نەبن و، بابای سەردانكەر (زائر) ئێسك قورس و ڕەزان گران نەبێ لە لایان و، بۆیان مایەی ئولفەت و خۆشحاڵیی بێ، نەك سەرئێشەو ناخۆشحاڵیی، وەك خاوەنی تەفسیری: (أولى ما قیل في آیات التنزیل)، (رشید الخطیب الموصلي) دەڵێ: {حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا أَيْ: حَتَّى تَحُسُّوا بِأُنْسِ أَصْحَابِهَا بِكُم وقَبُولِهِم لَكُم}[1]، واتە: تاكو ئێوە تەواو دڵنیا دەبن كە خاوەنانی ئەو ماڵە هۆگرتانن و، پەسندیانە بچن بۆ لایان و پێیان خۆشەو، بە چوونتان دڵ ناسوودەن.

### ٣- حیكمەتی بە بێ مۆڵەت وەرگرتن و سڵاوكردن، نەچوونە ماڵی یەكدی:

هەڵبەتە حیكمەتەكەی ڕوونە، بریتییە لە سنوور نەشكاندنی حورمەت و تایبەتمەندییەكانی یەكدی، وەك لەم دەقەشدا دیارە:

{عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ: أَنَّ امْرَأَةً مِنَ الْأَنْصَارِ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنِّي أَكُونُ فِي مَنْزِلِي عَلَى الْحَالِ الَّتِي لَا أُحِبُّ أَنْ يَرَانِيَ أَحَدٌ عَلَيْهَا، وَالِدٌ وَلَا وَلَدٌ، وَأَنَّهُ لَا يَزَالُ

---

(١ ) (أولى ماقیل في آیات التنزیل) ج٥، ص٣١٢.

يَدْخُلُ عَلَيَّ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِي وَأَنَا عَلَى تِلْكَ الْحَالِ؟ قَالَ: فَنَزَلَتْ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُوا۟ وَتُسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾)[1].

واتە: عەدی کوڕی سابیت دەڵێ: ژنێك لە پشتیوانەكان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! من لە ماڵی خۆمدا جاری وایە بە شێوەیەك دەبم، لەسەر حاڵێك دەبم، پێم خۆش نیە نە باب و دایك و نە منداڵ لەو حاڵەدا ببینن، (خۆی دەشوات، یان پشووی داوە، یان بە شێوەیەك خەتوە)، بەڵام جاری وایە پیاوێك لە نیزیكانم دێ، منیش لەسەر ئەو حاڵەتەم! ئیدی لەو بارەوە خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوار، كە بەبێ مۆڵەت وەرگرتن و سڵاوكردن، یان بەبێ زانینی ئەوە كە پێیان خۆشە یان نا؟ مەچنە ماڵی یەكدی.

## ٤- چۆنیەتیی مۆڵەت وەرگرتن و سڵاوكردن، لە كاتی سەرداندا:

لەو بارەوە كۆمەڵێك دەق دێنین:

١)- (عَنْ رِبْعِيٍّ قَالَ: حَدَّثَنَا رَجُلٌ مِنْ بَنِي عَامِرٍ اسْتَأْذَنَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ فِي بَيْتٍ، فَقَالَ: أَلِجُ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِخَادِمِهِ: اخْرُجْ إِلَى هَذَا فَعَلِّمْهُ الإِسْتِئْذَانَ، فَقُلْ لَهُ قُلِ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، أَأَدْخُلُ؟!)، (أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ١٠٨٤، وأبو داود: ٥٩٧٧).

واتە: ڕیبعی دەڵێ: پیاوێك لە بەنی عامر بۆی باسكردین كە مۆڵەتی لە پێغەمبەر ﷺ وەرگرتوە، كە لە ماڵێك - ی خۆی - دا بووە، پیاوەكە گوتوویەتی: (أَلِجُ؟)، واتە: بێمە ژوورێ؟ پێغەمبەریش ﷺ بە خزمەتكارەكەی خۆی كە لە لای بووە فەرموویەتی: بچۆ فێری ئەو پیاوە بكە چۆن مۆڵەت وەربگرێ، پێی بڵێ: با بڵێ: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ أَأَدْخُلُ)، سەلامتان لێبێ، بێمە ژوورێ؟

---

(١) جامع البيان: ٢٥٧٨٤، والواحدي: ٦٣٨ وهو مرسلٌ.

٢)- [إِذَا اسْتَأْذَنَ أَحَدُكُمْ ثَلاثًا، فَلَمْ يُؤْذَنْ لَهُ، فَلْيَرْجِعْ]، (أخرجه البخاري: ٢٠٦٢، ٦٢٤٥، ٧٣٥٣، ومسلم: ٢٠٥٣، وأبو داود: ٥١٨٠، والترمذي: ٢٦٩٠، إبن ماجة: ٣٧٠٦، والدارمي: ٢٦٢٩).

واتە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: هەر کات یەکێکتان مۆڵەتی وەرگرت سێ جاران، ئەگەر مۆڵەت نەدرا، با بگەڕێتەوە، (نەیکاتە چوارو پێنج و شەش).

ئنجا چۆنیەتی مۆڵەت وەرگرتنەکەو میکانیزمەکەی و شێوەکەی، چۆن بێ؟ ئەم دەقە بۆمان ڕوون دەکاتەوە:

٣)- [كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَتَى بَابَ قَوْمٍ لَمْ يَسْتَقْبِلِ الْبَابَ مِنْ تِلْقَاءِ وَجْهِهِ، وَلَكِنْ مِنْ رُكْنِهِ الأَيْمَنِ أَوِ الأَيْسَرِ، فَيَقُولُ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ الله، وَذَلِكَ أَنَّ الدُّورَ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا يَوْمَئِذٍ سُتُورٌ] (أخرجه أبو داود: ٥١٨٦، وإسناده حسنٌ).

واتە: دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەچوو بۆ دەرگای ماڵێك، خەڵكێك، ڕووبەڕووی دەرگاکە نەدەوەستا، بەڵکو یان لە لای ڕاستیەوە، یان لە لای چەپیەوە دەوەستاو، دەیفەرموو: (السَّلاَمُ عَلَيْكُم وَرَحْمَةُ الله)، چونکە ئەو کاتە دەرگاکان پەردەیان نەبوو، (واتە: ئەگەر پەردەی هەبێ، قەیناکا ڕووبەڕووی دەرگاکەش بوەستی، بەڵام ئەگەر پەردەی نەبێ، کە دەرگاکە کرایەوە، تۆ یەکسەر چی هەبێ لە ژوورەوە دەیبینی).

٤)- [عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، إِنَّ أَبْوَابَ النَّبِيِّ ﷺ كَانَتْ تُقْرَعُ بِالأَظَافِيرِ] (أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ١٨٠).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: دەرگاکانی ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ بە نینۆك، (بە سەری پەنجە) لێیان دەدرا.

نەك بە تەقە تەق و هەرا، بۆ ئەوەی ئەو کەسەی مۆڵەتی لێ وەردەگری، بیبستێ و تەواو.

کە ئێستا - وەك دوایی باسی دەکەین - جەرەس هەیەو، مۆبایل هەیەو، شتی دیکە هەیە، بەر لەوەی خەڵك بچێتە ماڵی یەکدی.

لەو بارەوە ئەم دەقەش هەیە:

٥)- {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: اسْتَأْذَنْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ فَقُلْتُ أَنَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَنَا أَنَا! كَأَنَّهُ كَرِهَ ذَلِكَ} (أخرجه البخاري: ٦٢٥٠، ومسلم: ٢١٥٥، وأبو داود: ٥١٨٧٠، والترمذي: ٢٧١١، وإبن ماجه: ٣٧٠٩).

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: مۆڵەتم لە پێغەمبەر ﷺ وەرگرت، بچمە ژوورێ، فەرمووی: ئەوە کێیە؟ منیش گوتم: منم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: منم، منم، وەك پێی ناخۆش بووبێ.

یانی: ناوی خۆت بڵێ، بڵێ: جابیر، بەڵام منم، هەموو کەس دەڵێ: منم، بەڵام ناوی خۆت بڵێ، کە ئەوە لە کوردەواریی خۆشماندا هەر هەیە، یەکێك دەڵێ: خۆمانین! ئاخر خۆتانن، کێن؟.

## ٥- سزای کەسێك کە بە بێ مۆڵەت تەماشای ماڵی خەڵك بکات، چییە؟

١)- {مَنِ اطَّلَعَ فِي بَيْتِ قَوْمٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِمْ، فَقَدْ حَلَّ لَهُمْ أَنْ يَفْقَئُوا عَيْنَهُ} (أخرجه البخاري: ٦٨٨٨، ومسلم: ٢١٥٨).

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: هەر کەسێك تەماشای ماڵی خەڵکێك بکات، بە بێ مۆڵەتی خۆیان، بۆیان حەڵاڵە چاوی کوێر بکەن.

بەڵام زانایان لێرەدا بەو جۆرە مانایان لێکداوەتەوە: واتە: ئەگەر چاویشی کوێر بکەن، موستەهەقە، بەڵام مانای وانیە بچن چاوی کوێر بکەن، بەس گوناهێکی کردوە، بایی ئەوە دەبێ چاوی لەسەر کوێر بکرێ، نەك کەسێك کە تەماشای یەکێکی دیکەی کرد، لە ماڵەکەیاندا، بچێ چاوی کوێر بکات، ئنجا

بڵێ: فەرمایشتی پێغەمبەرم ﷺ جێبەجێ کردوە! نا، مەبەست ئەوەیە کە ئەو کەسە گوناهێکی کردوە، بایی ئەوەیە چاوی لەسەر کوێر بکرێ، خوای دادگەر ئەوەندە سزای بدات، بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوە؟ ئەم دەقە بەڵگەیەکە لەو بارەوە: (جَاءَ فِي الْخَبَرِ أَنَّ عَبَّاسَ بْنَ مِرْدَاسٍ لَمَّا مَدَحَ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِبِلَالٍ: قُمْ فَاقْطَعْ لِسَانَهُ)[1].

واتە: عەبباسی کوڕی میرداس (وا پێدەچێ شاعیرێك بووبێ)، هاتوە مەدحی پێغەمبەری خوای ﷺ کردوە، پێغەمبەریش ﷺ بە بیلالی فەرمووە: هەڵسە بچۆ زمانی ببڕە.

زمانی ببڕە یانی: شتێکی بدەیە زمانیمان لە کوڵ بکەوە، یان شتێکی بدەیە کە دوایی نەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چرووك بوو و قسەمان لەسەر بکات، مەبەست ئەوە نەبووە تیغێك دەست بداتێ و زمانی ببڕێ، هەموو کەس دەزانێ، ئەوە مەبەست نیە، کەواتە: لێرەش کە دەفەرموێ: هەر کەس بەبێ مۆڵەتی ماڵێك تەماشای ماڵەکە بکات، بۆیان هەیە چاوی کوێر بکەن، یانی: گوناهێکی کردوە بایی چاو کوێر کردنی دەکات.

٢) هەر لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە:

(عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ أَنَّ رَجُلًا اطَّلَعَ فِي جُحْرٍ فِي بَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَمَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِدْرًى يُرَجِّلُ بِهِ رَأْسَهُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْ أَعْلَمُ أَنَّكَ تَنْظُرُ لَطَعَنْتُ بِهِ فِي عَيْنِكَ، إِنَّمَا جَعَلَ اللَّهُ الْإِذْنَ مِنْ أَجْلِ الْبَصَرِ). (أخرجه البخاري: ٦٢٤١، ومسلم: ٢١٥٦).

واتە: سەهلی کوڕی سعد (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێك لە کونێکەوە تەماشای دەرگای ماڵی پێغەمبەری ﷺ کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ شانەیەکی ئاسنی پێ بوو، سەری خۆی پێ دادەهێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو:

---

(١) أخرجه ابن سعد الطبقات: ج٤ ص: ٢٧٢، ٢٧٣ عن عروة مُرْسَلًا.

ئەگەر زانیبام تەماشات کردوە، بەو شانەیە لە چاوتم دەدا، چونکە خوا مۆڵەت وەرگرتنی لەبەر تەماشاکردن داناوە، واتە: تاکو تەماشای نێو ماڵی خەڵك نەکەی.

## ٦- گرنگیی پابەندیی بە شەریعەتەوە، هەرچەندە لەسەر دڵیشت قورس بێ:

ئینسان دەبێ بە شەریعەتەوە پابەند بێت، با ئەو پابەندییەی ببێتە هۆی ئەوەی پێشی ناخۆش بێ، بەڵکو بە عەکسەوە ئینسانی ئیماندار، دەبێ لە قالبیشی خۆش بێ و، دڵیشی پێ خۆش بێ کە بە شەریعەتەوە پابەندە، لەو بارەوە ئەم دەقە دێنین کە (الطبري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا هێناویەتی:

{عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ: لَقَدْ طَلَبْتُ عُمْرِي كُلَّهُ هَذِهِ الآيَةَ، فَمَا أَدْرَكْتُهَا: أَنْ أَسْتَأْذِنَ عَلَى بَعْضِ إِخْوَانِي، فَيَقُولَ لِي: ارْجِعْ، فَأَرْجِعَ، وَأَنَا مُغْتَبِطٌ، لِقَوْلِهِ: ﴿ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرۡجِعُواْ فَٱرۡجِعُواْۖ هُوَ أَزۡكَىٰ لَكُمۡ ﴾}[1].

واتە: قەتادە لە پیاوێك لە کۆچکەرانەوە گێڕاویەتەوە: گوتوویەتی: لە هەموو تەمەنی خۆمدا ویستم ئەم ئایەتە جێبەجێ بکەم، بەڵام بۆم جێبەجێ نەکرا، ئەویش بەوە کە مۆڵەت لە هەندێ لە برایەکانم وەربگرم، بۆ چوونە ماڵیان، ئەویش پێم بڵێ: بگەڕێوەو منیش بگەڕێمەوەو، زۆریش دڵ خۆش و کەیف خۆش بم، یانی: چونکە خوای بەرز دەفەرموێ: ئەگەر پێتان گوترا: بگەڕێنەوە، بگەڕێنەوە، ئەوە بۆ ئێوە پاك و چاکترە، پێم خۆش بوو ئەو پاك و چاکییە بۆ من بێ، بەڵام بە داخەوە هەرچەندە چۆتە ماڵی برایەکانی (مسوڵمانان)، کەس پێی نەگوتوە: بگەڕێوە.

هەڵبەتە ئەویش ئەوندە بە سەلیقەو عاقڵ بووە، لە کاتێکدا نەچووە، پێی بڵێن: بگەڕێوە!

---

(١) جامع البيان: ٢٥٨٨٦.

٧- چۆنیەتیی سەردان و مۆڵەت وەرگرتن و سلاوکردن، لەم ڕۆژگارەدا:

هەڵبەتە ئەم مەسەلەیە یەکێکە لەو مەسەلانەی کە بە هۆی گەشەکردنی ژیان و گوزەران و بەرەو پێشچوونی تەکنۆلۆژیاوە، گۆڕانکاریی گەورەیان بەسەردا هاتوە، بۆ وێنە:

أ)- بە تەلەفۆن دەگونجێ یەکدی ئاگادار بکرێتەوە، پێش سەردان، بەوەش (إستئناس)ەکە پەیدادەبێ و بەرچاوت ڕوون دەبێ، ئایا پێیان خۆشە بچی، یان نا؟ ئایا بۆیان دەگونجێ و نابیە بارگرانیی بۆیان؟

ب)- هەروەها لە ڕێی نینتەرنێتەوە دانانی ژوانگە (موعد) بە شوێن و کاتی وردەوە زۆر سێنا بووە.

ج)- جەڕەسی دەرگاو، تەلەفۆنی دەرگاش، ئێستا کارەکەی ئاسان کردوەو، پێویست ناکات بچی بە توندیی دەرگا بکوتی، بەڵێ لەو بوارەدا تەکنۆلۆژیا هەندێ شتی ئاسان کردوە.

شایانی باسیشە: لە مەسەلەی سلاوکردن و وەرگرتن مۆڵەت و، سەردانی یەکدی دا، خوا سێ شتی باسکردوون:

١)- ﴿ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾، ئا ئەوەتان بۆ ئێوە چاکترە (بۆیەش بۆی ڕوونکردنەوە) بەڵکو پەند وەربگرن و، فێرببن و شارەزا بن.

٢)- ﴿ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴾، خوا بەوەی دەیکەن زانایە، کەواتە: ئەی مرۆڤ! بزانە چۆن دەچیە ماڵی خەڵکی، بە چ نیازو مەبەستێك و، چۆنیەتیی چوونەکەت و....هتد؟!.

٣)- هەروەها کە دەفەرموێ: ﴿ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴾، خوا دەزانێ چی دەردەخەن و چیش پەنهان دەکەن.

خوا ﷻ وەك چۆن ڕواڵەتی ئێمە دەبینێ، پەنهانیشیمان دەبینێ و، نێو دڵیشمان دەخوێنێتەوە، بۆیە دەبێ وریا بین لە هەڵسوکەوت و مامەڵەکانماندا.

وەك دەبينيـن ئـاوا خـوا ﷻ مسـوڵمانان پـەروەردە دەكات، ڕایاندێنـێ و، بـەو ڕەوشـت و ئـاكارە بەرزانـە دەیاندوێنـێ، تاكـو لـە بـواری مامەڵـەی نێـو خۆیانـدا هەڵسـوكەوتێكی تەندروسـت بكـەن و، سـەرەنجام كۆمەڵگایەكـی تەندروسـت، كۆمەڵگایەكـی بەختـەوەر بـن، بـە شـێوەیەك بـێ كـە دوور بـێ لـە ڕوودانـی گوناهـو تـاوان و كێشـەو گرفـت، چونكـە ئەمـە هەمـووی دوای باسـكردنی سـزای زینـاو بوختـان و ئەوانەیـە، واتـە: ئەگـەر ئینسـان دووربینیـی (إحتیـاط) بـكات لەسـەردان و هاموشـۆی ماڵـی خەڵكـدا، بـە دڵنیایـی ئـەوە دەبێتـە جۆرێـك لـە ئاگـر بـڕ بـۆ ئـەوەی تووشـی ئـەو هەڵـەو گوناهـو تاوانانـە نەبـێ، هـەر وەك چـۆن ئەگـەر خۆیـان بپارێزن، پیـاوان خۆیـان بپارێـزن لـە ڕوانینـی حـەڕام و، ئافرەتـان خۆیـان بپارێـزن لـە ڕوانینـی حـەڕام، بـۆ ئەوەیـە كـە تووشـی ئـەو گوناهـو تاوانانـە نەبـن.

**مەسەلەی دووەم:**

**فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی (موحەممەد) ﷺ کە بە پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار بفەرمووێ: لە نیگای چاوەکانیان (لە کاتی سەرنجدانی یەکدیدا) بگرنەوە، داوێنی خۆیان بپارێزن و، بە ئافرەتانیش بفەرمووێ: پۆشتەو خۆپارێز بن و، جوانیی خۆیان جگە لەوەی بە ئاسایی دەردەکەوێ دەرنەخەن، مەگەر بۆ مێردو پیاوانی مەحرەمیان:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَـٰرِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَـٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَـٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُهُنَّ أَوِ التَّـٰبِعِينَ غَيْرِ أُولِى الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَٰتِ النِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست و سێ بڕگەدا:**

١)- ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَـٰرِهِمْ﴾، (ئەی موحەممەد!)بە پیاوانی بڕوادار بڵێ: با لە چاوەکانیان کەم بکەنەوە، (غَضّ) بە مانای کەمکردن (نَقْص) دێ، ﴿يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَـٰرِهِمْ﴾، واتە: لە چاوەکانیان کەم بکەنەوە، کە بە تەئکید مەبەست تەماشاکردن و نیگای چاوەکانە، **(الطبري)** لە تەفسیرەکەی خۆی دا، ئاوا ئەو ڕستەیە مانا دەکات، دەڵێ: **(يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ: يَكُفُّوا مِنْ نَظَرِهِمْ إِلَى مَا يَشْتَهُونَ النَّظَرَ إِلَيْهِ، مِمَّا قَدْ نَهَاهُمُ اللَّهُ عَنِ**

النَظَرِ إلَيْهِ)[1]، واتە: با سەرنج نەدەن بۆ شتێك كە ئارەزوویانە سەرنجی بدەن، لەوە كە خوا قەدەغەی كردوە سەرنج بدرێ.

كـە مەبەسـت پێـی تەماشـاكردنی ئافرەتانـە بـە ئـارەزووەوە، ئنجـا ئێمـە لەبـەر ئـەوەی دوایـی كورتـە باسـێك لـە بـارەی عەورەتـی پیـاوو ئافـرەت و، حوكمـی ڕوانینی بـە ئـارەزوو و بـێ ئـارەزووەوە، دەكەیـن، ئێسـتا بـە خێرایـی بەسـەر ئـەو بیسـت و سـێ بڕگەیـەدا دەڕۆیـن، كـە ئـەو دوو ئایەتەمـان بـۆ دابـەش كـردوون.

٢)- ﴿وَيَحْفَظُوا۟ فُرُوجَهُمْ﴾، هەروەها پێیان بڵێ: با پیاوان داوێنی خۆیان بپارێزن، كاتی دیكەش گوتوومانە: (فُرُوج) كۆی (فَرْج)، كە بە مانای دابڕاوایی و كەلێنە كە لە شتێكدا هەبێ، لێرەدا مەبەست ئەندامی زاوزێی پیاوانە، هەر وەك بە ئەندامی زاوزێی ئافرەتانیش هەر دەگوترێ، لەبەر ئەوەی هەردووك ئەندامەكە دەكەونە نێوان دوو ڕانەكانیان، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: [مَنْ يَضْمَنْ لِي مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ، وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ، أَضْمَنْ لَهُ الجَنَّةَ] (أخرجه البخاري: ٦١٠٩، والبيهقي في شعب الإيمان: ٤٩١٣).

واتـە: هـەر كەسـێك گرەنتیی پاراسـتنی ئـەوەی نێـوان دوو شـەویلاگەكانی و، ئەوەی نێـوان دوو لاقەكانیـم بـۆ بـكات، منیـش گرەنتیـی چوونە بەهەشـتی بـۆ دەكەم.

ئـەوەی نێـوان دوو شـەویلاگەكان: زمانـەو، ئـەوەی نێـوان دوو لاقەكانیـش ئەندامی زاوزێیە.

٣)- ﴿ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ﴾، ئا ئەوە بۆ ئەوان پاك و چاكترە، لێرەدا (أَزْكَىٰ)، ناوی هەڵبژاردن (إسم تفضيل)ە، پاك و چاكتر، بەڵام: (إسم تفضيل مسلوب المفاضلة)، ناوی هەڵبژاردنی بەرانبەر لابراوە، لە چی پاك و چاكترە؟ لە خودی خۆیدا پاك و چاكترە، بەبێ سەرنجدانی بەرانبەرێك.

كـە دەفەرمـوێ: ﴿يَغُضُّوا۟ مِنْ أَبْصَـٰرِهِمْ﴾ ئـەم (مِنْ)ە، كـە چۆتـە سـەر (أَبْصَـٰرِهِمْ)، (مِنْ) بـۆ هەندێـك (تبعيض)ە، چونكـە ناگونجـێ مـرۆڤ چـاو بنووقێنێ،

---

(١) جامع البيان: ج١٨، ص١٢٣.

بۆیــە خــوا نەیفەرمــووە: (وقــل للمؤمنــين يُغْمِضُــوا أبصارهــم)، یــان (عيونهــم)، بــە بــڕواداران بڵــێ: بــا چاویــان بنووقێنــن، بەڵکــو فەرموویەتــی: (يَغُضُّواْ) ئنجــا (يَغُضُّواْ)، یانــی: لێــی کــەم بکەنــەوە، (مِنْ)یشــی خســتۆتە ســەر، یــانی: لــە نیــگاو ســەرنجدانی چاوەکانیــان کــەم بکەنــەوە، نــەك هیــچ ســەرنج نــەدەن.

٤)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا يَصۡنَعُونَ ﴾، بە دڵنیایی خوا بەوەی بە کارامەیی و لێزانیی ئەنجامی دەدەن، شارەزایە.

چەند کردارێك هەن: (فعل)و (عمل)و (صنع).

أ- (فعل) بریتیە لە کردەوەیەك کە دەکرێ، زۆرجار ئامانج و مەبەستی لە پشتەوە نیە.

ب- (عمل) بریتیە لە کردەوەیەك کە دەکرێ، ئامانج و مەبەستی لە پشتەوەیە.

ج- (صنع) بریتیە لە کردەوەیەك کە دەکرێ، بە وردەکاریی و لێزانیی و کارامەیی.

واتــە: پیــاوان هەرچەنــدە بــە کارامەیــی وریایــی و بــە لێزانیــی شــت بکــەن، لــە ســەرنجدانی ئافرەتــان، بــەڵام خــوا ﷻ شــارەزایەو دەزانــێ، هەڵبەتــە لێــرەدا مەبەســت پێــی چاوتێهەڵەنگوتــن نیــە، چونکــە لــەم فەرموودەیــەدا هاتــووە:

{عَــنْ جَرِيــرِ بْــنِ عَبْداللــه رَضِيَ اللــهُ عَنْــهُ، قَــالَ: سَــأَلْتُ رَسُــولَ اللــهِ ﷺ عَــنْ نَظْــرَةِ الْفَجْــأَةِ؟ فَأَمَــرَنِي أَنْ أَصْرِفَ بَــصَرِي}، (أخرجــه مســلم: ٢١٥٩، وأبــو داود: ٢١٤٨، والترمــذي: ٢٧٧٦، وإبــن حبــان: ٥٥٧١).

واتــە: جەریــری کــوڕی عەبدوڵــڵا (خــوا لێــی ڕازی بــێ)، دەڵــێ: لــە پێغەمبــەری خــوام ﷺ پرســی لــە بــارەی ڕوانینــی کــت و پــڕەو؟ (واتــە: چــاو تێهەڵەنگوتــن)، فەرمانــی پێکــردم کــە چــاوی خــۆم لابــدەم.

٥)- ﴿ وَقُل لِّلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَغۡضُضۡنَ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِنَّ ﴾، بە هەمان شێوە بە ئافرەتانی بڕواداریش بڵێ: کە لە نیگای چاوەکانیان بگرنەوە، کەم بکەنەوە.

٦)- ﴿وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ﴾، هەروەها با داوێنی خۆشیان بپارێزن، لە هەموو ئەو شتانەی دەبنە مایەی گوناهباریی، لە تێرکردنی ئارەزووی جینسیی خۆیاندا.

٧)- ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾، (بە نسبەت ئافرەتانەوە ئەوەش زیادەیە)، با جوانیی خۆشیان دەرنەخەن، مەگەر ئەوەی کە دەردەکەوێ، بە پیاوانی نەفەرمووە: با جوانیی خۆیان دەرنەخەن، لەبەر ئەوەی بە سروشت پیاوان زیاتر عەودالّی ئافرەتانن، ئەوە گومانی تێدانیە، ئەو جوانیی و نەرم و ناسکیی و پێ سەرسام بوونەی لە ئافرەتانیشدا هەیە، بە نسبەت پیاوانەوە، لە پیاواندا نیە بەو شێوەیە، زیاتریش پیاوان عەودالّی ئافرەتانن و بەدوایاندا دەچن و، داوایان دەکەن، بۆیە پێویستە ئافرەت وەك باغی پەرژین کراو، خۆی مەحکەم بکات، تاکو کەس بە حەرامیی دەستی نەیگاتێ.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾، وەك دوایـی باسـی دەکەیـن، واتـە: ئـەوەی کـە بـە عـادەت و بـە شـێوەی حاڵەتـی ئاسـایی دەردەکـەوێ و، لـە حاڵەتـی عیبادەتـدا دەردەکـەوێ، کـە دەم و چـاوو هـەردووك لەپـە دەسـتێ تاکـو مەچـەك، هەندێکیشـیان گوتوویانـە: تاکـو نیـوەی قـۆڵ (نصـف الـذراع) وەك لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە.

٨)- ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾، هەروەها با سەرپۆشەکانیان بەسەر سنگ و بەرۆکیاندا بدەن، (خُمُر) کۆی (خِمَار)ە، یانی: سەرپۆش، (خَمَرَ)، یانی: (سَتَرَ)، (خُمُر)یش، بۆیە پێی دەگوترێ: (خَمْر)، چونکە عەقڵی ئینسان دادەپۆشێ، (خِمَار)یش، سەری ئافرەت دادەپۆشێ، با بە سەرپۆشەکانیان سینگ و بەرۆکیان داپۆشن، (جیوب)، کۆی (جَیْب)ە، ئەویش (شق القمیص) ئەو دابڕاوابیەی لە کراسدا هەیە، بۆ ئەوەی ئینسان بتوانێ لەبەری بکات، یانی: با زیادەی سەرپۆشەکانیان بخەنەوە سەر سینگ و بەرۆکەکانیان و پێیان دایانپۆشن.

هەندێـك لەوانـەی کـە هـەر بـە دوای ئـەوەدا دەگەڕێـن، سەفسـەتە بکـەن، یـان خۆیـان بـە گرنـگ و نـاوازە پێشـان بـدەن، کـە یەکێـك لەوانـە (جـمال البَنّا)یـە، لـە

میسڕو هەندێك كۆلكە عەلمانیی خۆشمان، یان هەندێك مسوڵمانی لاساكەرەوەی خۆشمان، كە هەر بە دوای قسەی غەریب و عەجیبدا دەگەڕێن، گوتوویانە: ئافرەت مولزەم نەكراوە، قژی سەری داپۆشێ، بەڵكو بەس مولزەم كراوە سینگ و بەرۆكی داپۆشێ! بێ خەبەر لەوەی كە خوا دەفەرموێ: با بە سەرپۆشەكانیان سینگ و بەرۆكیان داپۆشن، كەواتە: سەرەتا سەرپۆشەكان هەن و، سەرپۆشەكان (خمر) قژی سەریان داپۆشیوە، بۆیە ئەو ناوەیان لێنراوە: (بِخُمُرِهِنَّ) لەچكەكەو سەرپۆشەكە، ئەگەر لەسەر نەبێ، پێی ناگوترێ: (خِمَار) چونكە چی داپۆشیوە؟ دەبێ پێشێ سەریان داپۆشن، بە سەر پۆشەكانیان، ئنجا بە زیادەكەیان سینگ و بەرۆكی خۆیان و، یەخەی خۆیانی پێ داپۆشن.

٩)- ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ﴾، هەروەها با جوانیی خۆیان دەرنەخەن مەگەر بۆ مێردەكانیان، (بعولة)، كۆی (بَعْل)ە، (البَعلُ: الزَّوجُ والسَّيدُ)، (بعل) بە مانای هاوسەر دێ و، بە مانای گەورەش دێ، هەر وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، لە صەحیحی بوخاریی و موسلیمدا دەفەرموێ: {إِذَا وَلَدَتِ الأَمَةُ بَعْلَهَا} (أخرجه مسلم: ١٠٧)، كاتێك كە كەنیزەك گەورەی خۆی دەبێ، كاتێ خۆی كە كەنیزەك هەبوون، ئەگەر كەسێك لەگەڵ كەنیزەكەكەی جووت بووبێ و، كوڕی بووبێ، پێی گوتراوە: (أُمُّ الوَلَد)، دایكی كوڕ، ئەو كاتە بە شێوەیەكی ئۆتۆماتیكیی دایكەكەی ئازاد بووەو، چونكە ئەو منداڵە كە نێرینەیە، بۆتە هۆی ئازادكردنی دایكەكەی، وەك ئەو گەورەی بێ وایە.

١٠)- ﴿أَوْ ءَابَآئِهِنَّ﴾، یان بۆ باببیان، هەروەها بابی بابیشیان تاكو سەرێ، هەڵبەتە ئەو جوانییەی ئافرەت بۆ مێرد دەری دەخات، جیایە لەو جوانییەی بۆ بابی دەری دەخات، یانی: بۆ بابی، ئەگەر سەرپۆشی لەسەر نەبێ و، قۆڵ و باسكی دیار بن، بۆ باب و باپیرو ئەوانە، قەیناكات.

١١)- ﴿أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾، یان بابی مێردەكانیان، واتە: خەزووریان.

١٢)- ﴿أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ﴾، یان كوڕەكانیان.

١٣)- ﴿أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾، یان کوڕانی مێردەکانیان، واتە: کوڕی مێردەکانیان لە ژنی دیکە، هەروەها کوڕانی کوڕانیشیان، کوڕانی کوڕانی خۆیان، یاخود هی مێردیان، لە ژنی دیکەیان.

١٤)- ﴿أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ﴾، یان برایەکانیان.

١٥)- ﴿أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ﴾، یان کوڕانی برایەکانیان، هەروەها ئەوانیش بەرەو خوارتریش، واتە: نەوەی برایەکانیشیان.

١٦)- ﴿أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ﴾، یان کوڕانی خوشکەکانیان، هەروەها کوڕانی کوڕانی خوشکەکانیان، واتە: نەوەی خوشکەکانیشیان.

١٧)- ﴿أَوْ نِسَآئِهِنَّ﴾، یان ژنەکانیان، ئافرەتەکانیان، واتە: ئافرەتانی مسوڵمان لە ئازادو لە کەنیزەك، بە ڕای زۆربەی زانایان ئافرەتانی غەیری خۆیان، واتە: ئافرەتانی نامسوڵمان لێ دەچنە دەرێ، بۆیان نیە جگە لەوەی لە حاڵەتی ئاسایی دەردەکەوێ، بۆ ئافرەتانی دیکە، دەری بخەن.

١٨)- ﴿أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ﴾، یان ئەوانەی کە بە دەستی ڕاستیانەوەن (بەردەستیانن)، کە مەبەست پێیان کۆیلەکانە، ئنجا ئایا بەس کەنیزەکان، یاخود کۆیلەکانیش؟ نێرو مێ، یاخود هەر مێینەکانیان، بۆیان هەیە عەورەتیان ببینن؟ لەوەدا ڕاجیایی هەیە.

١٩)- ﴿أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ﴾، یان پیاوانێکی شوێنکەوتوو کە پێویستیی جینسییان نەبێ، پێویستییان بە ئافرەتان نەبێ، وەك پیاوی بە تەمەن و بەعزە پیاوێکی مەیلەو گێلۆکە کە ئارەزووی جینسیی نیە، یاخود لەبەر نەخۆشیی ئارەزووی جینسیی نەماوە، یان خەسێندراوە، یان لەبەر ئەوەی لەو ماڵەدا خزمەت دەکات و، خۆی لە پلەیەکی نزمتردا دەبینێ، لە خۆی ناوەشێنێتەوە بە ئارەزووەوە تەماشای ئەو ئافرەتە بکات، کە گەورەیەتی لەو ماڵەدا - بە ڕای هەندێك لە زانایان - گرنگ ئەوەیە ئەو ئارەزووە جینسییەی نیە، پاڵی پێوە بنێ بە ئارەزووەوە تەماشای ئەو ئافرەتە بکات، ئەگەرنا ئەو کاتە حوکمەکەی دەگۆڕێ.

٢٠)- ﴿ أَوِ ٱلطِّفۡلِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يَظۡهَرُواْ عَلَىٰ عَوۡرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ﴾، یاخود ئەو منداڵانەی کە شارەزای عەورەتی ئافرەتان نین، (ٱلطِّفۡلِ)، لێرەدا: (إسم جنس بمعنى الجمع)، ناوی جنسەو بە مانای کۆیە، بە بەڵگەی ئەوەی دوایی دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ لَمۡ يَظۡهَرُواْ عَلَىٰ عَوۡرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ﴾، ئەو منداڵانەی کە جارێ شارەزای کاروباری ئافرەتان نین، لە ڕووی جینسییەوە.

٢١)- ﴿ وَلَا يَضۡرِبۡنَ بِأَرۡجُلِهِنَّ لِيُعۡلَمَ مَا يُخۡفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ﴾، هەروەها با ئافرەتان پێیان بە زەویدا نەکوتن، تاکو ئەو جوانییەی شاردوویانەتەوە، پێی بزانرێ.

ئنجا ئەمە کاتی خۆی ئافرەتان خڕخاڵیان لە پێدا بووەو زرینگەی هاتووە، یان خشڵی دیکەیان لەبەردا هەبووە، خرینگەو زرینگەی هاتووە، لە کاتێکدا ڕۆیشتوون، یاخود ئێستا کە پێڵاوەکەیان بەرز بێ و بە جۆرێك تەقە تەقی بێت، سەرنجی پیاوان ڕابکێشێ، بە هەر حاڵ، هەر جۆرێك ئافرەتان سەرنجی پیاوان ڕابکێشن، یان لەنجەو لار کردنیان، بە هەر شێوەیەك بێ، سەرنجی پیاوان ڕابکێشێ، ئەوە ڕێی لێگیراوە.

٢٢)- ﴿ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾، تێکڕاش ئەی بڕوادارینە! بۆ لای خوا بگەڕێنەوە، وشەی ﴿ أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (أَيُّهُ المؤْمِنُون).

٢٣)- ﴿ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾، بەڵکو سەرفرازبن.

لێرەدا خوای پەروەردگار فەرمانی کردوە بە تێکڕای بڕواداران بگەڕێنەوە بۆ لای خواو تەوبە بکەن و، زانایان هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە تەوبە کردن و گەڕانەوە بۆ لای خوا، لەسەر هەموو کەس پێویستە، ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (النساء)دا کورتە باسێکمان لە بارەی تەوبەوە کردووەو بەڕێزان حەواڵەی ئەوێ دەکەین لەو بارەوە[1].

---

(١) هەروەها کتێبێکی سەربەخۆمان لەوبارەوە هەیە بەناوی [گەڕانەوە بۆ لای خوا]، کە هەتە ئێستا شەش جاران چاپکراوەتەوەو هەرچی پێویستە لەبارەی تۆبەوە، تێدا باسمان کردووە.

## کورتە باسێک لە بارەی
## سنووری عەورەتی پیاوو ئافرەتەوە

لە چوار بڕگەدا، ئەم کورتە باسە دەخەینە ڕوو:

### ١- مەترسیی ڕوانینی حەڕام:

ئەگەر پیاو یان ئافرەت تەماشای یەکدی بکەن بە شێوەیەکی حەڕام، واتە: بە شێوەیەکی ئارەزوومەندانە، بە هاندەری جینسیی، بێگومان حەڕامەو مەترسیی گوناهی گەورەتریشی هەیە، جارێ هەر ئەوە کە خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

أ)- ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ۝٣٠﴾.

دوایی دەفەرموێ:

ب)- ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ ۝٣١﴾.

هەر ئەم دوو ڕستە قورئانییە، کە هەر یەکەی بەشێکن لە ئایەتێک، بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنن، کە ڕوانینی حەڕامی پیاوان و ئافرەتان بۆ یەکدی، دەروازەیەکە بەرەو زینا، چونکە دەفەرموێ: بە پیاوانی بڕوادار بفەرموو: لە نیگای چاوەکانیان بگرنەوەو، داوێنیان بپارێزن.

بە ئافرەتانی بڕوادار بفەرموو: لە نیگای چاوەکانیان بگرنەوەو، داوێنیان بپارێزن، کەواتە: وەك گوتراوە: (العينُ بريدُ الزِّنا)، یان (النظرُ بريدُ الزِّنا)، ڕوانینی حەڕام، پۆستەی زینایە بەرەو داوێن پیسیی سەردەکێشێ، ئەگەر مرۆڤ لەسەری

بەردەوام بێ، چونکە خوا ﷻ بە دوای یەکدا باسی کردوون، با ئەوە نەکەن، ئنجا ئەوەش نەکەن.

فەرموودەش لە بارەی مەترسیی ڕوانینی حەڕامەوە، زۆرن، بۆ نموونە:

{إِنَّ اللهَ كَتَبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ حَظَّهُ مِنَ الزِّنَا، أَدْرَكَ ذَلِكَ لاَ مَحَالَةَ، فَزِنَا الْعَيْنَيْنِ النَّظَرُ، وَزِنَا اللِّسَانِ النُّطْقُ، وَالنَّفْسُ تَمَنَّى وَتَشْتَهِي، وَالْفَرْجُ يُصَدِّقُ ذَلِكَ أَوْ يُكَذِّبُهُ}، (أخرجه البخاري: ٦٦١٢، ومسلم: ٢٦٥٧، وأبو داود: ٢١٥٣، وإبن حبان: ٤٤٢٠).

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خوا لەسەر مرۆڤ، بەشی خۆی لە زینا نووسیوەو هەر دەیگاتێ: چاوەکان زینا دەکەن و زیناکەشیان بریتیە لە ڕوانین (ڕوانینی بە حەڕامیی) زینای زمانیشی دوانە (قسەی خراپ کردنە)، نەفسیش خۆزگە دەخوازێ و ئارەزوو دەکات، داوێنیش ئەوە یان بە ڕاست دەگێڕێ، یان بە درۆی دەخاتەوە.

یانی: یان یەکجاریی تووشی گوناهە گەورەکە دەبێ، یان لە شوێنێك دەوەستێ.

## ٢- سنووری عەورەتی پیاوو ئافرەت:

با لەو بارەوە ئەم قسەیەی (القرطبي)، بێنین:

گوتوویەتی: {أَجْمَعَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى أن السوأتين عَوْرَةٌ مِنَ الرَّجُلِ وَالْمَرْأَةِ، وَأَنَّ الْمَرْأَةَ كُلُّهَا عَوْرَةٌ، إِلَّا وَجْهَهَا وَيَدَيْهَا، فَإِنَّهُمُ اخْتَلَفُوا فِيهِمَا، وَقَالَ أَكْثَرُ الْعُلَمَاءِ فِي الرَّجُلِ: مِنْ سُرَّتِهِ إِلَى رُكْبَتِهِ عَوْرَةٌ، لَا يَجُوزُ أَنْ تُرَى}[1].

واتە: (القرطبي)، دەڵێ: مسوڵمانان یەکدەنگن لەسەر ئەوە کە پاش و پێشی پیاو و ئافرەت عەورەتن، ئافرەتیش هەمووی جەستەی عەورەتە، جگە لە دەم و چاوی و هەردوو دەستی، بەڵام لەو بارەوە ڕاجیاییان هەیە، (واتە: هەندێکیان

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٢، ص١٩٩.

دەڵێن: دەم و چاوو هەردووك دەستیش عەورەتن، بەڵام زۆربەی هەرە زۆر بە عەورەتیان دانانێن)، زۆربەی زانایان لە بارەی پیاوەوە دەڵێن: لە نێوکی هەتا ئەژنۆیەکانی عەورەتەو، نابێ ببیترێ.

منیش دەڵێم: هەندێ لە زانایانیش دەڵێن: ڕانی پیاو بە عەورەت دانانرێ، هەندێکیان دەڵێن: بەس پاش و پێشی بە عەورەت دادەنرێ و، ئێمەش کاتی خۆی لە کتێبی: (ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا)و لە کتێبی: (چەند بابەتێکی هونەریی)دا، لەو بارەوە بە درێژیی قسەمان کردوە.

(الطبري) لە بارەی سنووری عەورەتی پیاوو ئافرەتەوە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾، با ئافرەتان جوانیی خۆیان دەرنەخەن، جگە لەوەی دەردەکەوێ، چوار ڕای هێناون، دەڵێ: ئەوەی کە دەردەکەوێ مەبەست پێی:

١- (زينة الثِّياب الظاهرة)، جوانیی ئەو پۆشاکەیە کە بە دەرەوەیە.

٢- (الْكُحْلُ وَالْخَاتَمُ وَالسِّوَارَان وَالْوَجْهُ) بریتیە لە کلێك لە چاو دەکرێ و ئەنگوستیلەو بازنەکان و دەم و چاو.

٣- (الْكَفَّانِ وَالْوَجْه)، هەردوو لەپە دەست و ڕوو (دەم و چاو).

٤- (الْوَجْهُ والشياب)، دەم و چاوو، ئەو پۆشاکەی لەبەر دەکرێ.

دوایی (الطبري) زیاتر ڕوونی دەکاتەوەو، ڕای خۆیشی لەو بارەوە دەڵێ:

(وَأَوْلَى الْأَقْوَالِ فِي ذَلِكَ بِالصَّوَابِ: قَوْلُ مَنْ قَالَ: عُنِيَ بِذَلِكَ الْوَجْهُ وَالْكَفَّانِ، يَدْخُلُ فِي ذَلِكَ إِذَا كَانَ كَذَلِكَ الْكُحْلُ، وَالْخَاتَمُ، وَالسِّوَارُ، وَالْخِضَابُ، وَإِنَّمَا قُلْنَا ذَلِكَ أَوْلَى الْأَقْوَالِ فِي ذَلِكَ بِالتَّأْوِيلِ، لِإِجْمَاعِ الْجَمِيعِ عَلَى أَنَّ عَلَى كُلِّ مُصَلٍّ أَنْ يَسْتُرَ عَوْرَتَهُ فِي صَلَاتِهِ، وَأَنَّ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَكْشِفَ وَجْهَهَا وَكَفَّيْهَا فِي صَلَاتِهَا، وَأَنَّ عَلَيْهَا أَنْ تَسْتُرَ مَا عَدَا ذَلِكَ مِنْ بَدَنِهَا، إِلَّا مَا رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ أَبَاحَ لَهَا أَنْ تُبْدِيَهُ مِنْ ذِرَاعِهَا إِلَى قَدْرِ

النِّصْفِ، فَإِذْ كَانَ ذَلِكَ مِنْ جَمِيعِهِمْ إِجْمَاعًا، كَانَ مَعْلُومًا بِذَلِكَ أَنَّ لَهَا أَنْ تُبْدِيَ مِنْ بَدَنِهَا، مَا لَمْ يَكُنْ عَوْرَةً، كَمَا ذَلِكَ لِلرِّجَالِ؛ لِأَنَّ مَا لَمْ يَكُنْ عَوْرَةً، فَغَيْرُ حَرَامٍ إِظْهَارُهُ. وَإِذَا كَانَ لَهَا إِظْهَارُ ذَلِكَ، كَانَ مَعْلُومًا أَنَّهُ مِمَّا اسْتَثْنَاهُ اللَّهُ تَعَالَى ذِكْرُهُ، بِقَوْلِهِ: ﴿إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾، لِأَنَّ كُلَّ ذَلِكَ ظَاهِرٌ مِنْهَا..)[1].

(الطبري)، عادەتی وایە زۆر جوان مەبەستەكان ڕوون دەكاتەوە، دەڵێ:

لە پێشترین قسە لەو بارەوە لە ڕاستییەوە، قسەی ئەو كەسەیە كە گوتوویەتی: ﴿إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾، مەبەست پێی ڕوو و هەردوو لەپە دەستێ، ئنجا كە واش بێ، هەم كلێ كە لە چاو دەكرێ و، هەم ئەنگوستیلەو، هەم بازن (كە لە دەست دەكرێ)و، هەم خەنە، هەمووی دەگرێتەوە، بۆیەش گومان: ئەو نیزیكترینی قسەكانە لە ڕاستییەوە، چونكە هەموویان لەسەر ئەوە یەكدەنگن (هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن)، كە هەر نوێژكەرێك لەسەری پێویستە عەورەتی خۆی لە نوێژدا داپۆشێ و، ئافرەت بۆی هەیە لە نوێژدا، دەم و چاوو هەردوو لەپە دەستی دەربخات و، لەسەری پێویستە غەیری ئەوە لە جەستەی خۆی هەمووی داپۆشێ، جگە لەوەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە، گێڕدراوەتەوە كە ڕێگەی داوە: ئافرەت دەستیشی دەربخات تاكو نیوەی قۆڵی، (باسكی تاكو نیوەی قۆڵی)، ئنجا مادام هەموویان لەو بارەوە یەكدەنگن، كەواتە: بەوەوە دەزانرێ كە ئافرەت بۆی هەیە ئەوەی كە عەورەت نیە، دەری بخات، چۆن پیاو بۆی هەیە ئەوەی عەورەتی نەبێ، دەری بخات، چونكە ئەوەی كە عەورەت نەبێ، لێی قەدەغە نەكراوە دەری بخات، ئنجا كە بۆی هەبێ ئەوەی عەورەت نەبێ دەری بخات، كەواتە: ئەوەی كە خوای بەرز هەڵیواردوەو جیای كردۆتەوە بە فەرمایشتی خۆی، كە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾، جگە لەوەی كە لێی دەردەكەوێ، كەواتە: ئەوە دەم و چاوو دەستی و پۆشاكی و ئەو شتانەیە، چونكە هەموو ئەوانە بە حاڵەتی ئاسایی دیارن.

---

(١) جامع البيان: ج١٨، ص١٢٧.

یانی: ئافرەت هەم دەم و چاوی دیارە، هەم دەستی دیارە، هەم پۆشاکی دیارە، هەروەها ئەوەی کە لەسەر دەم و چاو هەردووك دەستیشیەتی، وەك کلێك کە لە چاوی دەکاو، خەنەیەك کە لە دەستی دەداو، ئەنگوستیلەو، بازن، هەموو ئەوانە دیارن.

(ابْنُ عَطِيَّةَ)، کە (القرطبي)، لێی دەخوازێتەوە دەڵێ: (قَالَ ابْنُ عَطِيَّةَ: وَيَظْهَرُ لِي بِحُكْمِ أَلْفَاظِ الآيَةِ أَنَّ الْمَرْأَةَ مَأْمُورَةٌ بِأَلَّا تُبْدِيَ شيئاً، وَأَنْ تَجْتَهِدَ فِي الإِخْفَاءِ لِكُلِّ مَا هُوَ زِينَةٌ، وَوَقَعَ الاسْتِثْنَاءُ فِيمَا يَظْهَرُ بِحُكْمِ ضَرُورَةِ حَرَكَةٍ، فِيمَا لَا بُدَّ مِنْهُ، أَوْ إِصْلَاحِ شَأْنٍ وَنَحْوِ ذَلِكَ، فَمَا ظَهَرَ، عَلَى هَذَا الْوَجْهِ، مِمَّا تُؤَدِّي إِلَيْهِ الضَّرُورَةُ فِي النِّسَاءِ فَهُوَ الْمَعْفُوُّ عَنْهُ)[1].

واتە: بە حوکمی بێژەکانی ئایەتەکە، بۆم دەردەکەوێ، کە ئافرەت لەسەری پێویستە هیچ شتێکی خۆی دەرنەخات و، هەوڵبدات هەر شتێك کە لەودا جوانییە، بیشارێتەوە، بەڵام هەڵاواردنەکە بە پێی ئەوەی کە بۆ من دەردەکەوێ، دەکەوێتە سەر ئەوەی کە بە حوکمی ناچاریی جموجۆڵی ئافرەت، یاخود خۆچاککردنێکی، یان وێنەی ئەوانە دەردەکەوێ، کە ئەویش بریتیە لە دەم و چاوی، چونکە ئافرەتان ناچارن دەم و چاویان دیار بێ، بۆیە لەوە بووردراوە.

(القرطبي) وەك قسەکردن لەسەر قسەکەی (ابْنُ عَطِيَّةَ)، دەڵێ: (قُلْتُ: هَذَا قَوْلٌ حَسَنٌ، إِلَّا أَنَّهُ لَمَّا كَانَ الْغَالِبُ مِنَ الْوَجْهِ وَالْكَفَّيْنِ ظُهُورُهُمَا عَادَةً وَعِبَادَةً، وَذَلِكَ فِي الصَّلَاةِ وَالْحَجِّ، فَيَصْلُحُ أَنْ يَكُونَ الاسْتِثْنَاءُ رَاجِعًا إِلَيْهِمَا)[2].

واتە: دەڵێ: ئەو قسەیەی (ابْنُ عَطِيَّةَ)، قسەیەکی جوانە، بەڵام چونکە بە زۆریی وایە، دەم و چاو هەردوو دەست دەردەکەون، هەم بە عادەت و هەم لە حاڵەتی عیبادەتدا، لە نوێژداو لە حەجیشدا، (ئافرەت فەرزە لە حەجدا رووی

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٢، ص٢٢٩.

(٢) الجامع لأحكام القرآن: ج١٢، ص٢٢٩.

و دەسـتی دیـار بـن و لـە نوێژیشـدا بـە هەمـان شـێوە)، بۆیـە هەڵواردنەکـە دەبـێ بگەڕێتـەوە بـۆ هەردووکیـان، (واتـە: بـۆ دەم و چـاوو، بـۆ هـەردووك دەسـت).

## ٣- چەند فەرموودەیەك لە بارەی سنووری عەوڕەتی ئافرەتانەوە:

بـا چەنـد فەرموودەیـەك لـە بـارەی سـنووری عەوڕەتـی ئافرەتـەوە بێنیـن، بـە نسـبەت پیـاوەوە زۆربـەی زانایـان دەڵێـن: نێـوان نێـوك و ئەژنۆیـەتی، بـەڵام هەندێکیـان گوتوویانـە: بـۆ پیـاو ڕانیـش عـەوڕەت نیـە، بـە نسـبەت ئافرەتـەوە ئـەم دوو دەقـە دێنیـن، پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ:

١)- **{لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ إِذَا عَرَكَتْ، أَنْ تُظْهِرَ إِلَّا وَجْهَهَا وَيَدَيْهَا، إلى ها هنا وَقَبَضَ عَلَى نِصْفِ الذِّرَاعِ}، (أخرجه ابن جرير الطبري: ٢٥٩٢٢).**

واتـە: بـۆ هـەر ئافرەتێـك بـڕوای بـە خـواو ڕۆژی دوایـی بـێ، کاتێـك کـە باڵـغ دەبێـت، بـۆی نیـە جگـە لـە دەم و چـاوی و، دەستەکانیشـی، تاکـو ئێـرە، کـە نیـوەی باسـکی گـرت، جگـە لـەوە بـۆی نیـە دەری بخـات.

٢)- **{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دَخَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَعَلَيْهَا ثِيَابٌ رِقَاقٌ، فَأَعْرَضَ عَنْهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ لَهَا: يَا أَسْمَاءُ! إِنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا بَلَغَتِ الْمَحِيضَ، لَمْ يَصْلُحْ أَنْ يُرَى مِنْهَا إِلَّا هَذَا، وَأَشَارَ إِلَى وَجْهِهِ وَكَفَّيْهِ}، (أخرجه أبو داود: ٤١٠٤).**

واتـە: دایکـمان عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: ئەسـمائی کچـی ئەبـوو بەکـر (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، هاتـە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ پۆشـاکێکی تەنکـی لەبـەردا بـوو، پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕووی لـێ وەرگێـڕاو پێـی فەرمـوو: ئـەی ئەسـماء! ئافـرەت دوای ئـەوەی باڵـغ دەبـێ، ناگونجـێ لێـی ببیـنرێ مەگـەر ئێـرەی: ئامـاژەی کـرد بـۆ دەم و چـاوو هـەردووك لەپـە دەسـتی.

٤- سنووری عەورەتی ئافرەت لەگەڵ مێردو مەحرەمەکانیدا، جیاوازە:

هەرچەندە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئافرەت نابێ جوانیی خۆی دەربخات: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ ...﴿٣١﴾﴾، بەڵام بە تەئکید ئەوەی کە ئافرەت بۆ مێردی دەری دەخات، جیایە لەوەی بۆ باب و براو برازاو ئەوانی دیکە - کە مەحرەمن - دەری دەخات، بۆیە (القرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆی دا دەڵێ: [وَتَخْتَلِفُ مَرَاتِبُ مَا يُبْدِي لَهُمْ، فَيُبْدِي لِلْأَبِ، مَا لَا يَجُوزُ إِبْدَاؤُهُ لِوَلَدِ الزَّوْجِ][1].

واتە: ئەندازەی ئەوە کە لە عەورەتی ئافرەت دروستە، پیاوو مەحرەمەکان ببینن، پلەکانی جیان، باب دروستە ئەندازەیەك لە جەستەی کچەکەی ببینێ، بەڵام کوڕی مێرد ئەو ئەندازەیەی بۆ نیە ببینێ.

واتە: کوڕی مێرد لە ژنێکی دیکەی، هەروەها من ئەوەشی دەخەمە سەرێ کە ژن و مێردیش بۆیان هەیە هەموو شوێنێکی یەکدی ببینن، بەڵام غەیری ئەوان بە تەئکید وا نیە.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٢، ص٦١.

**مەسەلەی سێیەم:**

**لەسەر مسوڵمانان (وەك كۆمەڵگاو قەوارەی سیاسیی) پێویستە هاوكاریی ئافرەتان و پیاوانی بێ هاوسەر بكەن بۆ هاوسەرگیریی و، ئەوانەی دەستیان ناڕوات، دەبێ خۆیان پاك ڕابگرن، كاتێ خۆیشی لەسەر مسوڵمانان فەرز بووە، ئەو كۆیلەو كەنیزەكانەی هەوڵی خۆ ئازادكردن دەدەن، هاوكارییان بكەن و، قەدەغەش بووە كەنیزەكەكان ناچار بكەن بۆ لەشفرۆشیی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ ۚ إِن يَكُونُوا۟ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٢﴾ وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَـٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ ۚ وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٣﴾﴾.

**شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ﴾، ئەوانەتان كە بێ هاوسەرن، هاوسەرگیرییان بۆ بكەن، (أَيِّم)، واتە: مرۆڤی بێ هاوسەر، چ پیاو بێ و ژنی نەبێ، چ ئافرەت بێ و مێردی نەبێ، (الطبري)، لە تەفسیرەكەی خۆیدا گوتوویەتی: {وَزَوِّجُوا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ! مَنْ لَا زَوْجَ لَهُ مِنْ أَحْرَارِ رِجَالِكُمْ وَنِسَائِكُمْ، وَمِنْ أَهْلِ الصَّلَاحِ مِنْ عَبِيدِكُمْ وَمَمَالِيكِكُمْ، وَالْأَيَامَى: جَمْعُ أَيِّمٍ، وَإِنَّمَا جُمِعَ أَيَامَى، وَالْأَيِّمُ يُوصَفُ بِهِ الذَّكَرُ وَالْأُنْثَى، يُقَالُ: رَجُلٌ أَيِّمٌ، وَامْرَأَةٌ أَيِّمٌ وَأَيِّمَةٌ: إِذَا لَمْ يَكُنْ لَهَا زَوْجٌ}[1].

واتە: ئەی بڕوادارینە! هەموو ئەو پیاوو ئافرەتانەی لە ئازادەكان، كە هاوسەریان نیە، هەروەها كۆیلەكانتان و كەنیزەكەكانتان، ئەوانەی چاكن

---

(١) جامع البيان: ج١٨، ص١٣٢.

(هاوسەریان نیە)، هاوسەرداریان بکەن، (ٱلۡأَيَٰمَىٰ)، کۆی (الأَيِّمْ)ە، کە هەم نێرینەو هەم مێینەی پێ وەصف دەکرێ، دەگوترێ: (رجلٌ أيِّم وامرأة أيِّم و أيِّمة)، واتە: پیاوێکی بێ هاوسەرو ئافرەتێکی بێ هاوسەر.

٢)- ﴿ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنۡ عِبَادِكُمۡ وَإِمَآئِكُمۡ ﴾، هەروەها ئەوانەتانە کە چاکن لە کۆیلەکانتان و کەنیزەکەکانتان، (ئەوانیش هاوسەردار بکەن) چونکە جاری وابووە هەندێك کۆیلەو کەنیزەکان، بە کەڵکی ئەوە نەهاتوون، هاوسەرگیریان پێ بکرێ و بۆ بکرێ، لەبەر هەر هۆیەك بێ.

٣)- ﴿ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ ﴾، ئەگەر ئەوانە هەژاربن، واتە: ئەو پیاوو ئافرەتانە کە هاوسەریان نیەو، پێویستە هاوسەرگیریان بۆ بکەن، ئەگەر هەژاربن، با هەژارییەکەیان ڕێتان لێ نەگرێ، مشووریان لێ بخۆن و هاوسەرداریان بکەن.

٤)- ﴿ يُغۡنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾، خوا لە بەخششی خۆی بێ نیازیان دەکات، ئەم وشەیە: (يُغْنِهِمُ)، خوێندراوەتەوەو (يُغْنُهُم)یش خوێنراوەتەوە، (الطبري)، لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، هێناویەتی کە گوتوویەتی: [عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: الْتَمِسُوا الْغِنَى فِي النِّكَاحِ، يَقُولُ اللَّهُ: ﴿ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغۡنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾][1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مسعوود گوتوویەتی: بە هۆی هاوسەرگیرییەوە، هەوڵبدەن دەوڵەمەندبن، چونکە خوا فەرموویەتی: ئەگەر هەژاربن، خوا بە بەخششی خۆی دەوڵەمەندیان دەکات.

کەواتە: با لەبەر هەژاریی و نەداریی و تەنگ دەستیی، واز لە هاوسەرگیریی نە هێنن.

٥)- ﴿ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ﴾، خواش فراوانی زانایە، واتە: سیفەت فراوانی زانایە، هەموو سیفەتە پەسندەکانی ڕەهاو فراوان و بێ سنوورن: بەخششی، بەزەیی، حیکمەتی،

---

(١) جامع البیان: ج١٨، ص١٣٣.

دەسەلاتی خوا، ڕەهاو بێ سنوورن، (الطبري) دەڵێ: [وَاللَّهُ وَاسِعُ الْفَضْلِ جَوَادٌ بِعَطَايَاهُ][1]، واتە: خوا بەخششی فراوانی هەیەو، زۆرریش بەخشندەیە، بەو شتانەی دەیانبەخشێ.

٦)- ﴿ وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا ﴾، ئەوانەشیان کە توانای هاوسەرگیرییان نیە، با خۆیان پاك ڕابگرن، (الطبري)، دەڵێ: [لِيَتَعَفَّفِ الَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ مَا يَنْكِحُونَ بِهِ النِّسَاء، عَنْ إِتْيَان مَا حَرَّمَ اللَّه عَلَيْهِمْ مِنَ الْفَوَاحِش][2]، واتە: ئەو پیاوانەش کە ئەو توانایەیان نیە کە ژنانی پێ مارە بکەن (پێ بێنن)، با خۆیان پاك ڕابگرن لە بەرانبەر ئەو گوناهە دزێوو خراپانەدا، کە خوا لێی قەدەغە کردوون، لە بواری جینسییدا.

٧)- ﴿ حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ﴾، تاکو خوا لە بەخششی خۆی بێ نیازو دەوڵەمەندیان دەکات.

٨)- ﴿ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ﴾، هەروەها ئەوانەش کە بە دەستی ڕاستتانەوەن و لەبەر دەستتانن، (کۆیلەو کەنیزەکەکانتان)، کە دەیانەوێ موکاتەبەتان لەگەڵدا بکەن، (دوایی وردتر باسی موکاتەبە دەکەین)، واتە: ڕێکەوتنێکتان لەگەڵدا بکەن ئەندازەیەك پارەتان بۆ بێنن و خۆیان بکڕنەوەو، خۆیان ئازاد بکەن.

٩)- ﴿ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ﴾، ئێوە موکاتەبەیان لەگەڵدا بکەن، ڕێککەوتنیان لەگەڵدا بکەن، ئەگەر چاکەتان پێوە شك بردن و تێتان ڕابینین، بۆیە (الطبري)، دەڵێ: [وَاجِبٌ عَلَى سَيِّدِ الْعَبْدِ أَنْ يُكَاتِبَهُ إِذَا عَلِمَ فِيهِ خَيْرًا، وَسَأَلَهُ الْعَبْدُ الْكِتَابَةَ.... وَالْخَيْرُ: الْقُدْرَةُ عَلَى الإِكْتِسَاب][3]، واتە: لەسەر خاوەن و گەورەی کۆیلەکە پێویستە، موکاتەبەی لەگەڵدا بکات، ئەگەر چاکەی تێدا بینی و کۆیلەکەش داوای لێ کرد ڕێکەوتنی لەگەڵدا بکات، مەبەستیش لە:

(خیر)، بریتیە لە توانا هەبوون لەسەر کارو کاسبیی و، پیشەیەك، پەیداکردنی پارەیەك کە لەسەری لەگەڵیدا ڕێك دەکەوێ، لەگەڵ گەورەکەی.

---

(١ ) جامع البيان: ج١٨، ص١٣٤.

(٢ ) جامع البيان: ج١٨، ص١٣٤.

(٣ ) جامع البيان: ج١٨، ص١٣٥.

١٠)- ﴿ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ ﴾، لەو سامانەش کە خوا پێی داون، پێیان بدەن، واتە: خاوەنی کۆیلەکە یان کەنیزەکەکە، پێویستە ئەندازەیەك هاوکاریی بکات، یان نیوەی (١/٢) یان یەك لەسەر سێی (١/٣) یان یەك لەسەر چواری (١/٤)، هەر چەندێکی بێ، دەشگونجێ ئەمە ڕووی لە دەوڵەت بێ، کە لە پشکی زەکات، یان لە خەزێنەی دەوڵەت، پارمەتیی ئەو کۆیلەو کەنیزەکانە بدات، کە دەیانەوێ خۆیان ئازاد بکەن، چونکە یەك لەسەر هەشتی (١/٨)ی زەکات، خوای پەروەردگار دایناوە بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان (فِي الرِّقَابِ): ﴿ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَٰرِمِينَ وَفِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ۖ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦٠﴾ ﴾التوبة، کەواتە: یەك لەسەر هەشتی (١/٨)ی زەکات، دەبێ تەرخان بکرێ بۆ ئازادکردنی کۆیلان، ئەگەر کۆیلە هەبن، کە لەم ڕۆژگاری ئێمەدا مەگەر دەگمەن، ئەگەرنا نەماون، هەرچەندە بە داخەوە زۆر لە حیزبە عەلمانییە خۆسەپێنەکان، وەك کۆیلە مامەڵە لەگەڵ ئەندامەکانی خۆیان و شوێنکەوتوانی خۆیاندا دەکەن و، زۆر لە ڕژێمەکانیش وەك کۆیلە، مامەڵە لەگەڵ هاووڵاتییان و هاونیشتمانییانی خۆیاندا دەکەن.

١١)- ﴿ وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا ﴾، هەروەها کچەکانتان لەسەر لەشفرۆشیی ناچار مەکەن، لە حاڵێکدا کە ئەوان پاکییان دەوێ [بۆ ئەوە تۆزێك لە سامان و بەرژەوەندیی ژیانی دنیا بخوازن و دابین بکەن، بە هۆی ناچارکردنی ئەو ئافرەتانە لەسەر لەشفرۆشیی].

وشەی (بغاء)یش بە: (الزِّنا بأجرة) پێناسە کراوە، بە کوردیی دەڵێن: لەشفرۆشیی.

﴿ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا ﴾، ئەگەر پاکییان ویست، ئەمە: (وهذا القيد وصفي وليس احترازياً، وبيانٌ للواقع)، ﴿ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا ﴾، لە حاڵێکدا کە ئەو کچانەتان، ئەو کەنیزەکانەتان، پاکییان دەوێ، ئێوە ناچاریان مەکەن لەسەر لەشفرۆشیی، نەك بفەرموێ: ئەگەر پاکییان

ویست، ناچاریان مەکەن، نا یانی: لە حاڵێکدا کە پاکییان دەوێ، ئەگەرنا ئەگەر خۆشیان پاکییان نەوێ، دەبێ خاوەن و گەورەکەیان هەوڵبدات پاکیان ڕابگرێ، بۆیە ئەمە وەك بەیانی واقیعە، نەك وەك قەیدێك لەسەری، کە دوایی یەکێك بڵێ: ئەو کەنیزەکە پاکیی ناوێ، قەیناکات ئەو گوناهەی پێبکە!.

١٢)- ﴿لِّتَبۡتَغُواْ عَرَضَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾، تاکو - بەو هۆیەوە - سامان و بەرژەوەندییەکی دنیایی داوا بکەن.

واتە: کاسبیی بەو کەنیزەکانەو داوێنیانەوە بکەن و، پارەیان پێ پەیدا بکەن.

١٣)- ﴿وَمَن يُكۡرِههُّنَّ﴾، هەر کەسێکیش ناچاریان بکات، یانی: (وَمن یقهرهن)، ناچاریان بکات و بە زۆر ناچاری لەشفرۆشییان بکات.

١٤)- ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعۡدِ إِكۡرَٰهِهِنَّ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾، بە دڵنیایی خوا لە دوای ئەوەی ناچار کراون و زۆریان لێکراوە، بەرانبەر بەو کەنیزەکانە، لێبوردەیەو بە بەزەییە، گوناهیان ناگاتێ مادام زۆریان لێ دەکرێ، بەڵام بێگومان خاوەنە بێ غیرەت و بێ ناموسەکانیان، سزای سەختیان هەیەو گوناهی ئەوانیش هەڵدەگرن.

## کورتە باسێک دەربارەی
## هاوسەرگیریی و پێنج مەسەلەی هەستیار

### ١- هاوسەردارکردنی پیاوان و ئافرەتانی ڕەبەن:

فەرمایشتی خوا کە دەفەرمووێ: ﴿ وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ ﴾، بە ڕوونیی لێی وەردەگیرێ، کە کۆمەڵگاو دەوڵەتی مسوڵمانان پابەندە، بە هاوکاریی کردنی ئەو پیاوو ئافرەتانەی نەیانتوانیوەو، ناتوانن بە توانای خودیی خۆیان، هاوسەرگیریی بکەن، دەوڵەت و، کۆمەڵگای مسوڵمان لەسەری پێویستە مشووریان لێ بخوات و، ئاسانکارییان بۆ بکات و هاوکارییان بکات، پێشتریش قسەکەی (الطبري)مان هێنا، کە دەڵێ:

**أ)- [وَزَوِّجُوا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ مَنْ لاَ زَوْجَ لَهُ مِنْ أَحْرَارِ رِجَالِكُمْ وَنِسَائِكُمْ، وَمِنْ أَهْلِ الصَّلاَحِ مِنْ عَبِيدِكُمِ وَمَمَالِيكِكُمْ. وَالأَيَامَى: جَمْعُ أَيِّم، وَإِنَّمَا جُمِعَ أَيَامَى وَالأَيِّمُ يُوصَفُ بِهِ الذَّكَرُ وَالأُنْثَى، يُقَالُ: رَجُلٌ أَيِّمٌ، وَامْرَأَةٌ أَيِّمٌ وَأَيِّمَةٌ: إِذَا لَمْ يَكُنْ لَهَا زَوْجٌ]**[1].

**کە پێشتر مانامان کرد.**

**ب)- (وهبة الزُّحَيْلي)، گوتوویەتی: [زوجوا أيها الأولياء والسادة، أو أيتها الأمة جميعاً بالتعاون وإزالة العوائق، من لا زوج له من الرجال والنساء الأحرار والحرائر، ومن فيه صلاح من غلمانكم وجواريكم، وقدرة على القيام بحقوق الزوجية، وساعدوهم على الزواج بالإمداد بالمال]**[2].

---

(١) جامع البيان: ج١٨، ص١٢٣.

(٢) تفسير المنير: ج٩، ص٥٦٦.

واتـە: ئـەی سەرپەرشـتیاران و خاوەنـانی کۆیلـەو کەنیزەکـەکان، یاخـود ئـەی ئوممـەت بـە گشـتیی! پێکـەوە هـاوکار بـن بـۆ لابردنـی کۆسـپەکان کـە هەمـوو ئـەو پیـاوو ئافرەتـە ئازادانـەو، هەروەهـا ئەوانـەی چاکەیـان تێـدا شـک دەبـەن لـە کۆیلـەکان و لـە کەنیزەکەکانتـان، توانایـان تێـدا شـک دەبـەن لـەوەدا کـە مافـی هاوسـەردارییەتی جێبەجـێ بـکات، هاوکارییـان بکـەن بـۆ هاوسـەرگیریی، بـەوە کـە دەسـتباری هاوکاریـی مادییـان بگـرن و، بـە مـاڵ و سـامان هاوکارییـان بکـەن.

## ٢- هاوسەرگیریی کردن و حوکمە جۆراو جۆرەکانی:

ئایـا هاوسـەرگیریی کـردن: پیـاو هاوسـەرگیریی بـکات، ئافـرەت هاوسـەرگیریی بـکات، حوکمەکـەی چۆنـە؟ زانایـان لـە بـارەی حوکمـی هاوسـەرگیرییەوە، قسـەو باسـی زۆریـان کـردوە، لـە نێـوان ڕەوابـوون و، پەسـند بـوون و، پێویسـت بـوون (المباحـة والنـدب والوجـوب)دا، سـەرەتا بـا چەنـد دەقێکـی سـوننەت بێنیـن:

١)- پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا کە بوخاریی و موسلیم لێی دەگێڕنەوە، بەسەرهاتێکی هەیە، لە کۆتاییەکەیدا دەفەرموێ: **{لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي} (أخرجه البخاري: ٥٠٦٣ ، ومسلم: ١٤٠١).**

واتـە: بـەڵام مـن بـە ڕۆژووش دەبم (ڕۆژووی سـوونەت)، بـەڵام جاری وایـە بەڕۆژووش نابـم، شـەونوێژیش دەکـەم و، شـەو ئیسـراحەتیش دەکـەم و دەشـخەوم، هاوسـەرگیرییش لەگـەڵ ژنـان دەکـەم، هـەر کەسـێك لـە ڕێبـازی مـن لابـدات، لـە مـن نیە.

واتە: لەو حاڵەدا کە لە لادەدا، لە من نیە.

٢)- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{ثَلَاثَةٌ حَقٌّ عَلَى اللهِ عَوْنُهُمْ: الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَالنَّاكِحُ يُرِيدُ الْعَفَافَ، وَالْمُكَاتَبُ يُرِيدُ الْأَدَاءَ} (أخرجه أحمد: ٩٦٢٩، والترمذي برقم ١٦٥٥، وقال: حسن، والنسائي: ٣١٢٠، وابن ماجه: ٢٥١٨، والحاكم: ٢٨٥٩، وقال: صحيح على شرط مسلم، وابن حبان: ٤٠٣٠).**

واتە: سێ کەس، هەر سێکیان لەسەر خوا پێویستە هاوکارییان بکات، (خوا لەسەر خۆی پێویستی کردوە)، کەسێك کە لە ڕێی خوادا تێدەکۆشێ، جەنگ دەکات، (یاخود تێدەکۆشێ بە گشتیی، چ لە ڕووی بانگەوازەوە، چ لە ڕووی فێرکردنی خەڵکەوە، چ لە ڕووی هۆشیارکردنەوەیانەوە، چ فەرمانکردن بە چاکەو ڕێگریی کردن لە خراپە، هەمووی دەگرێتەوە)، هەروەها پیاوێك کە دەیەوێ بەهۆی هاوسەرگیرییەوە خۆی پاك ڕابگرێ و، کۆیلەیەك موکاتەبە لەگەڵ گەورەکەیدا دەکات، ڕێکەوتنێکی لەگەڵدا دەکات و، دەشیەوێ ئەو ماڵ و سامانەی بڕیارە لە بەینیاندا، پێی بدات، هەر سێکیان خوا هاوکارییان دەکات.

٣)- پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکی دیکەدا دەفەرموێ: {يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ! مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ، فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ، فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ؛ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ} (أخرجه البخاري: ٥٠٦٥، ومسلم: ١٤٠٠).

واتە: ئەی کۆمەڵی گەنجان! هەر کامێك لە ئێوە توانای مەسرەف کێشانی هاوسەرگیریی هەبوو، با ژن بێنێ، ئەوە باشترە بۆ چاویشی لە ڕوانینی حەرام بگرێتەوەو بۆ داوێنیشی لە خراپە بیپارێزێ، بەڵام هەر کەسێك نەیتوانی، (توانای ماددیی نەبوو)، با بەڕۆژوو بێ، ئەوە دەبێتە هۆی شکاندنی ئارەزووی و کەمکردنەوەی.

٤)- هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکی دیکەدا دەفەرموێ: {الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَخَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ} (أخرجه مسلم: ١٤٦٧، والنسائي: ٣٢٣٢، وابن ماجه: ١٨٥٥).

واتە: دنیا هەمووی ڕابواردنێکی کەمە، باشترین شتێکیش کە لە ژیانی دنیادا هەیە، ئافرەتێکی چاکە.

٥)- هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ، فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الأُمَمَ} (أخرجه أبو داود: ٢٠٥٠، والحاكم: ٢٦٨٥، وابن حبان: ٤٠٥٦).

واتـە: ئافرەتێـک کـە مێـردی خـۆی خـۆش بـوێ و منداڵـی ببـێ و بـە زاوزێ بـێ، بیهێنـن، چونکـە پێشـبڕکە دەکـەم بـە زۆریـی ئۆممەتـم لەگـەڵ ئۆممەتەکانـی دیکەدا.

لـە بـارەی حوکمـی هاوسـەرگیرییشـەوە بـە کورتیـی دەڵێیـن: کـە ئەمـە ڕای خۆمـە لـە کـۆی ئایەتـەکان و فەرمایشـتەکان و، کـۆی ڕای زانایانـم هەڵێنجـاوە:

هاوســەرگیریی پێنــج حوکمــە شــەرعییەکانی بــە ســەردا دەچەســپێن، هەڵبەتــە مەرجیـش نیـە بـەس ڕای بەنـدە بـێ، پێـم وایـە ژمارەیەکـی زۆر لـە زانایـان وا دەڵێـن:

١)- کەسێك توانای هاوسەرگیریی هەبێ (توانای ماددیی و جەستەیی و دەروونیی)و بزانێ ئەگەر هاوسەرگیرییش نەکات، تووشی گوناهو لادان دەبێ، لەسەری پێویستە هاوسەرگیریی بکات.

٢)- بەڵام کەسێك توانای هەبێ و، بشزانێ کە ئەگەر هاوسەگیرییش نەکات، سەلامەت دەبێ، بۆی پەسندە.

٣)- کەسێکیش توانای هەبێ، بەڵام لە توانای خۆی دڵنیا نەبێ، ئەوە بۆی ڕەوایە.

٤)- کەسێکش گومانی هەبێ لەوەی بتوانێ هەقی هاوسەرو منداڵەکانی بدات و، ترسی گوناهیشی نەبێ، ئەگەر هاوسەرگیرییش نەکات، ئەوە ناپەسند (مکروە)ە، هاوسەرگیریی بکات.

٥)- کەسێکیش دڵنیا بێ، ناتوانێ ئەرکەکانی هاوسەرگیریی ڕاپەڕێنێ، ئەوە بۆی حەڕامە هاوسەرگیریی بکات، چونکە ئافرەتێك گرفتار دەکات و، ئەگەر منداڵیشیان بێ، ئەوانیش گرفتار دەبن، هەڵبەتە هەندێك حاڵەتیش هەن شوێنی نیجتیهادن.

### ٣- خۆپاكڕاگرتنی ئەوانەی توانای هاوسەرگیرییان نیە:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ ﴾، ئەوانەی توانای هاوسەرگیرییان نیە، (واتە: توانای ماددییان نیە لە پیاوان، یاخود لە ئافرەتان، ئەوانە کە بۆیان نەڕەخساوە هاوسەرگیریی بکەن، کەسێکی بە دڵی خۆیان نەچۆتە داخوازییان، یان لەبەر هەر هۆیەك بێ، بۆیان هەڵنەسووڕاوە)، با خۆیان پاك ڕابگرن، هەتا خوا لە بەخششی خۆی بێ نیازیان دەکات، بە نسبەت پیاوانەوە، توانای ماددییان بۆ دەڕەخسێنێ و، هەل و مەرجیان بۆ هەموار دەکات، کە هاوسەرگیریی بکەن، بە نسبەت ئافرەتانیشەوە، خوا دەرووی خێریان لێ دەکاتەوە، کە پیاوێکی بە دڵی خۆیانیان لێ هەڵبکەوێ، پێشتریش فەرموودەکەمان هێنا، کە دەفەرموێ: [يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ؛ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ]، (أخرجه البخاري: ٥٠٦٥، ومسلم: ١٤٠٠).

پێشتر مانامان کرد، هەڵبەتە فەرمایشتەکە ڕوو لە گەنجانی کوڕ دەکات، بەڵام بە تەنکید ئافرەتانیش هەر کامێکیان بۆی ڕەخسا، دەیگرێتەوە، چونکە فەرمایشتەکە ئاوا دەفەرموێ: ئەی کۆمەڵی گەنجان! هەر کامێك لە ئێوە توانای هاوسەرگیریی هەبوو، با هاوسەرگیریی بکات، بۆ ڕوانینی چاویشی باشترە (کە تەماشای ئافرەتان یان پیاوان نەکات، بە ئارەزووەوە، مادام هاوسەری خۆی هەیە)، هەروەها بۆ داوێنیشی پارێزەرترە، هەر کەسێك نەیتوانی با بە ڕۆژوو بێ، باشترە ڕۆژوو ئارەزووەکەی کەم دەکاتەوەو دەیشکێنێ.

ئەوە بۆ کوڕانیش و بۆ کچانیش وایە.

شایانی باسە وشەی: (وَلْيَسْتَعْفِفِ)، یانی: با عیففەت لە خۆیاندا پەیدا بکەن، عیففەت یانی: پاکیی، پاکیی لە ڕووی جینسییەوە، جاری واش هەیە یانی: پاکیی لە ڕووی نەوسنییەوە، یان چاو لە دەستی خەڵك نەبوون و نەفس بەرز بوون،

ئەمە لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتوە: [ وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفُّهُ اللهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللهُ] (أخرجه البخاري: ١٤٢٧، ومسلم: ١٠٣٤).

واتە: هەر کەسێك خۆی لەسەر پاکیی ڕابێنێ، کار لەسەر خۆی بکات، خوا پاکیی پێ دەبەخشێ و، هەر کەسێك خۆی لەسەر بێ نیازیی ڕابێنێ، خوا بێنیازی دەکات، (دڵی دەوڵەمەند دەکات).

شایانی باسیشە: بەڕێزان! لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا خۆ پاکڕاگرتنی مرۆڤ لە ڕووی جینسییەوە، بە تایبەت بۆ گەنجان، لە هەردوو ڕەگەزەکە، ئاسان نیە، بەڵام چەند هۆکارێك لەو بارەوە دەتوانین بڵێین زۆر کاریگەرن، ئەگەر گەنجەکان ڕەچاویان بکەن، بە تایبەت گەنجەکان بە کوڕو کچەوەو بە گشتییش پیاوان و ئافرەتان:

١)- سەرگەرمبوون بە خوا پەرستیی و طاعەتەوە، جگە لەوەی لە خودی خۆیدا خوا ئیمەی بۆ بەندایەتیی لەم سەر زەوییە داناوە، کە ئەوە حیکمەت و ئامانجی دروستکرانی مرۆڤە، بەڵام جگە لەوەو وێڕای ئەوەش لە بەرەکەتی سەرگەرمبوون بە طاعەتەوە ئینسان زیاتر خۆی کۆنترۆڵ دەکات و ئیرادەی بەهێزتر دەبێ، ڕووحی پاکتر دەبێ، لە خوا ﷻ نزیکتر دەبێ، ئەوەی لە خواش نزیك بێ، لە شەیتانەکان دوورەو، ئەوەش کە لە خوا نزیك بێ، زیاتر خۆی کۆنترۆڵ دەکات، چ لە ڕووی غەریزەی جینسییەوە، چ لە ڕووی هەموو هەڵس و کەوتەکانی دیکەیەوە.

٢)- هاوەڵێتیی خەڵکی پاك و چاك و، خۆپاراستن لە خەڵکی خراپ، وەك فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ کە چەند جارێك هێناومانە: [إِنَّمَا مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالْجَلِيسِ السُّوْءِ، كَحَامِلِ الْمِسْكِ وَنَافِخِ الْكِيرِ] (أخرجه البخاري: ٥٢١٤، ومسلم برقم ٢٦٢٨، عَنْ أَبِي مُوسَى).

واتە: وێنەی هاوەڵی چاك و هاوەڵی خراپ، وەك عەتر فرۆش (بۆن فرۆش)و وەك ئاسنگەر (یان کورەچیی) وایە، دوایی لە درێژەی فەرمایشتەکەدا دەفەرموێ: بابای عەتر فرۆش یان لێی دەکڕی، یان دەتداتێ، (دەڵێ: بزانە ئەو بۆنە چۆنە؟

تۆزێکت تێ دەدا)، یاخود بۆنی خۆشت هەر بۆ دێ، (لێی نیزیك بیەوە، بۆنی خۆشت هەر بۆ دێ)، کابرای ئاسنگەرو کورەچییش، یان بەرگت دەسووتێنێ بە پریشکە ئاگرەکان، یاخود بە تەقە تەقەکەی جاڕس دەبی و، بۆنی ناخۆشت بۆ دێ.

هەندێك کەس لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێن: پارە دین دەریشەو دین بەریشە، بەڵام لە ڕاستییدا هاوەڵ و برادەریش، دەگونجێ دین بۆ ئینسان بێنێ، ئابڕوو و کەرامەتی بۆ بێنێ، ڕەوشتی بەرزیی بۆ بێنێ، عیلم و مەعریفەتی بۆ بێنێ، ئەگەر چاك بێ، دەشگونجێ هەموو ئەوانەی لێ بستێنێ، ئەگەر خراپ بێ، زۆر کەس هەبووە، ئینسانی باش بووەو پاك بووە، لە ئەنجامی هاوەڵایەتیی کردنی ئینسانێکی خراپدا، ئەگەر پیاو بووە، ئەگەر ئافرەت بووە، سەرەنجام خلیسکاوەتە نێو زەلکاو و باتڵاغی گوناهو تاوانەوەو، کەتۆتە نێو گێژی سەر بە فەتارەت چوونەوە.

٣)- سەرگەرمبوونی کارو کاسبیی و، لە بۆشاییدا نەبوون، ئەمیش هۆکارێکی گرنگە بۆ خۆ پاکڕاگرتنی مرۆڤ، کە سەرگەرمی پەیداکردنی بژیوی حەڵاڵ بێ و چاوی لە دەستی خەڵك نەبێ و، لە بۆشاییدا نەبێ.

٤)- بە قورئانەوە سەرگەرمبوون، هەڵبەتە بە قورئانەوە سەرگەرمبوون بە پلەی یەکەم، ئەگەرنا سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ بە هەمان شێوە، قورئان بخوێنێ و هەوڵبدا باشی بخوێنێ، یان لەبەری بکات، یان لێی تێبگات، هەروەها سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ هەوڵبدات پێی ئاشنا بێ، دەقەکانی سوننەت لەبەر بکات و تێیان بگات.

٥)- بە مزگەوتەوە پەیوەست بوون، وەك لە شوێنەواردا هاتوە: {إِذَا رَأَيْتُمُ الرَّجُلَ يَعْتَادُ الْمَسَاجِدَ، فَاشْهَدُوا لَهُ بِالْإِيمَانِ}[1]، واتە: ئەگەر پیاوتان بینی هۆگری مزگەوت بوو، شایەدیی ئیمانی بۆ بدەن، ئینسان ئەگەر بە مزگەوتەوە هۆگر بێ، چ پیاو چ ئافرەت و، لەگەڵ ئەهلی مزگەوتدا تێکەڵ بێ، بە تەئکید لە خراپە بە دوور دەبێ.

---

(١) {إذا رأيتم الرجل يلزم المسجد، فلا تَحْرَجُوا أن تشهدوا أنه مؤمن، فإن الله يقول: { إنما يعمر مساجد الله من آمن بالله } أخرجه الحاكم: ٣٢٨٠ ، هذا حديث صحيح الإسناد و لم يخرجاه، تعليق الذهبي في التلخيص: صحيح.

٦)- خوێندنەوەی سیرەی پێغەمبەری خاتەم ﷺو پێغەمبەران بە گشتیی و، پێشەوایان و زانایان و صاڵحان بە گشتییتر.

٧)- بە وریایی مامەڵەکردن لەگەڵ ئینتەرنێت و تەکنۆلۆژیادا بە گشتیی مۆبایلە، بە هەموو شێوەکانیانەوە، ئینتەرنێتە، باقی ئەو ئامێرانە کە تەکنۆلۆژیای ئێستا بەرهەمی هێناون، کە زۆر کەس لە ئەنجامی خراپ بەکارهێنانی ئەو ئامێرانەوە، عەیبەی هاتۆتەوە سەر، گوناهبار بووە، عەیبدار بووە، تووشی سەر ئێشەو گرفتاریی بووە، بەڵکو خزمەکانی و خێزانەکەشی تووشی گرفتاریی و سەر ئێشە کردوون، عەیبداریی و گوناهباری کردوون، بە پێچەوانەشەوە: دەگونجێ ئینسان ئینتەرنێت و تەکنۆلۆژیاو ئامێرەکانی دیکە بەکاربێنێ بۆ چاکە، ئەوانە وەك چەکێکی دوو دەم وان، بە هەردوو دیواندا دەبڕن، ئەگەر بە دەست خەڵکی چاکەوە بن و، بۆ مەبەستی چاك بەکاربێن، خێر دەدەنەوەو، ئەگەر بە دەست خەڵکی خراپەوە بن و، بۆ ئامانجی خراپ بەکار بێن، دەرەنجام و دەرهاویشتەی خراپیان لێ دەکەوێتەوە.

## ٤- موکاتەبە کردن لەگەڵ کۆیلەو کەنیزەکاندا:

سەرەتا با پێناسەی موکاتەبە بکەین:

(القرطبي)، دەڵێ: [مَعْنَى الْمُكَاتَبَةِ فِي الشَّرْعِ: هُوَ أَنْ يُكَاتِبَ الرَّجُلُ عَبْدَهُ عَلَى مَالٍ يُؤَدِّيهِ مُنَجَّماً عَلَيْهِ، فَإِذَا أَدَّاهُ فَهُوَ حُرٌّ][١].

واتە: مانای موکاتەبە کردن لە شەرعدا ئەوەیە کە: پیاوێك ڕێکەوتن بکات لەگەڵ کۆیلەکەیدا، لەسەر ئەندازەیەك ماڵ، کە لە چەند ماوەیەکی جیاوازدا بۆی بێنێ و، هەر کاتێ ماڵەکەی تەسلیم کرد، ئازادە.

هەڵبەتە ئەو وای هێناوە کە تەنیا کۆیلە، نێرینەی کۆیلان، بەڵام لە ڕاستییدا بۆ کەنیزەکیش هەر وایە، وەك دوایی لەو بارەوە فەرمایشت دێنین.

---

(١ ) الجامع لأحكام القرآن: ج١٢، ص٢٠٦.

خـوا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَبۡتَغُونَ ٱلۡكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَكَاتِبُوهُمۡ إِنۡ عَلِمۡتُمۡ فِيهِمۡ خَيۡرٗاۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ ءَاتَىٰكُمۡ ﴾:

**١)- ئەمە یەکێك بووە لە دەروازەکانی لێوە بنبڕکردنی کۆیلایەتیی، وەك تەفسیری سوورەتی (النساء)دا بە درێژیی باسی کۆیلایەتییمان کردوە لە ئیسلامدا، هەروەها لە تەفسیری سوورەتی (محمد)یش دا، کورتە باسێکمان لەو بارەوە، کردوە، چونکە ئیسلام، (جاء بالعتق، ولم يأتِ بالرق)، ئیسلام ئازادکردنی هێنا، نەك بە کۆیلەکردن، بەڵام ئیسلام کە هات سیستمی دنیای ئەو کاتە، یەکێك لە شادەمارەکانی، یەکێك لە پایە گرنگەکانی بریتیی بوو لە کۆیلایەتیی لە هەموو دنیادا، ئیسلام چی لێ بکات! بە نووکە قەڵەمێك لە لای خۆیەوە، لە گۆشەیەکی دنیاوە، ئەوەی پێ هەڵناوەشێتەوە، ئیسلام سەرەتا مامەڵەی لەگەڵدا کرد، بەڵام دوایی لە لای خۆیەوە هەڵسا بە وشککردنی ئەو سەرچاوانەی کە کۆیلایەتییان لێ دێ، لێرەدا پێویست ناکات دووبارە بچینەوە نێو وردەکارییەکان.**

**٢)- لەو بارەوە کە ئایا لەسەر گەورەی کۆیلەکان، گەورەی کەنیزەکەکان، خاوەنەکەیان پێویستە ئەگەر داوایان کرد موکاتەبەیان لەگەڵدا بکات، لە سەری پێویستە، یان نا؟ (الطبري)، دەڵێ: [هَلْ قَوْلُه: ﴿ فَكَاتِبُوهُمۡ إِنۡ عَلِمۡتُمۡ فِيهِمۡ خَيۡرٗاۖ ﴾، عَلَى وَجْهِ الْفَرْضِ أَمْ هُوَ عَلَى وَجْهِ النَّدْبِ؟ ... وَأَوْلَى الْقَوْلَيْنِ فِي ذَلِكَ عِنْدِي بِالصَّوَابِ قَوْلُ مَنْ قَالَ: وَاجِبٌ عَلَى سَيِّدِ الْعَبْدِ أَنْ يُكَاتِبَهُ إِذَا عَلِمَ فِيهِ خَيْرًا وَسَأَلَهُ الْعَبْدُ الْكِتَابَةَ]**[1].

دەڵـێ: ئایـا کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَكَاتِبُوهُمۡ إِنۡ عَلِمۡتُمۡ فِيهِمۡ خَيۡرٗاۖ ﴾، ئەگـەر چاکەتـان تێـدا شـك بـردن، ئـەو بڕیارنامـەو ڕێکەوتننامەیـان لەگەڵـدا بکـەن، (کـە ئەندازەیـەك مـاڵ و سـامانتان بـۆ بێنـن، کـە پێـی دەگوتـرێ: موکاتەبـە)، ئایـا ئەمـە پێویسـتە یاخـود شـتێکی پەسـندە؟ ... دەڵـێ: نیزیکترینـی هـەردوو ڕایـەکان لـە لای مـن لـە ڕاسـتییەوە، قسـەی ئـەو کەسـەیە کـە گوتوویەتـی: لەسـەر خاوەنـی کۆیلەکـە پێویسـتە ئـەو ڕێککەوتنـەی لەگەڵدا بـکات، ئەگـەر چاکـەی تێدا بینـی و، کۆیلەکەش خـۆی داوا کردبـوو کـە ئـازاد بکـرێ، لـە بەرانبـەر ئەندازەیـەك ماڵـدا.

---

(١) جامع البيان: ج١٨، ص١٣٤، ١٣٥.

٣)- کە دەفەرموێ: ﴿إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا﴾، ئەگەر چاکەتان تێدا شك بردن، ئەمە مەبەست پێی چییە؟ زانایان ئاوایان لێکداوەتەوە: (القُدْرَةُ عَلَى الإِكْتِسَابِ وَالإِحْتِرَافِ لأَدَاءِ مَا كُوتِبوا عَلَيْه)، بریتیە لە توانا هەبوون لەسەر کاسبیی کردن و، هەبوونی پیشەو توانای ماڵ پەیداکردن، بۆ ئەوەی ئەو ماڵ و سامانەی کە لەسەری ڕێك کەوتوون، بیدا بە خاوەنەکەی، بتوانێ پەیدای بکات، ئەگەر ئەوەتان تێدا شك بردن و، تێتان ڕا بینین، ئەوە لەسەرتان پێویستە ئەو ڕێکەوتنەیان لەگەڵدا بکەن.

٤)- کە دەفەرموێ: ﴿وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ﴾، لەو سامانی خوایەی پێی داون، پێیان بدەن، هاوکارییان بکەن، ئەمە سێ واتایان دەگەیەنێ:

أ- واتە: با گەورەو خاوەنەکەیان بۆیان داشکێنێ، بۆ وێنە: (١/٢)، یان (١/٣)، یان (١/٤)، (١/٥)...هتد، ئەندازەیەکیان بۆ داشکێنن و پێیان بدەن.

ب- یاخود هەر ئەندازەیەك ماڵیان پێ بدەن، بڵێن: ئەوەندە سامانەم بۆ بێنەو ها من پێشەکیی ئەوەندەت بدەمێ، بۆ خۆشت کەسابەت بکە.

ج- یاخود: دەوڵەت و کۆمەڵگای مسوڵمان لەسەری پێویستە لە پشکی زەکات، کە بۆ کۆیلان تەرخان کراوە، لەوە پێیان بدەن، چونکە ئایەتەکەمان هێنا، لە سووڕەتی (التوبة)دا کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَٰرِمِينَ وَفِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٦٠﴾﴾.

کەواتە: یەکێك لە هەشت جۆرە کەسەکان کە دەبێ زەکاتیان بدرێتێ، کۆیلەکانن (فِي الرِّقَابِ)، ئنجا خوا نەشیفەرمووە: بدرێ بە خۆیان، بەڵکو بەکاربهێنرێ بۆ ئازادکردنی ئەو کۆیلانە، ئەگەر دەوڵەوت و قەوارەی سیاسیی ئیسلامیی هەبێ و، کۆیلەش هەبن، دەبێ (١/٨)ی زەکاتی هەموو مسوڵمانان دابنرێ بۆ ئازادکردنی ئەو کۆیلانەی هەن، کاتێ خۆی وابووە، کە ئیش بە شەریعەت کراوەو، ئەو حوکمڕانە دادگەر بووەو، پابەند بووە بە شەریعەتەوە.

٥)- وەك چۆن كۆیلە بۆی هەیە موكاتەبە بكات، لەگەڵ گەورەكەی خۆیدا، كەنیزەكیش بۆیان هەبووە موكاتەبە بكەن، وەك لەم دەقەوە دەبینرێ، بەڵام لە تەفسیرەكاندا نەمبینی ئاماژەی پێكرابێ، بەس باسی كۆیلە دەكەن، باسی پیاو دەكەن، بەڵام باسی كەنیزەك ناكەن، لە حاڵێكدا كە ئەم دەقە زۆر بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ و، ئایەتەكەش لێی دەفامرێتەوە بە گشتیی: {عَنْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: دَخَلَتْ عَلَيَّ بَرِيرَةُ فَقَالَتْ: إِنْ أَهْلِي كَاتَبُونِي عَلَى تِسْعِ أَوَاقٍ فِي تِسْعِ سِنِينَ، كُلَّ سَنَةٍ أُوقِيَّةٌ، فَأَعِينِينِي ...} (أخرجه البخاري: ٢٥٦٣، ومسلم: ١٥٠٤).

واتـە: عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، دەڵـێ: بەریـرە هاتـە لام (كـە دوایـی دەبێتـە یەكێـك لـە ئـەو ئافرەتانـەی كـە لـە عائیشـەوە خـوا لێـی ڕازی بـێ، نیزیـك بـووە، كـە پێـی دەگوتـرێ: (مـولاة)، واتـە: ئـازادی كـردوە، هاوكاریـی كـردوە بـۆ ئازادكردنـی، كـە ئـەو پێـی لـە پێشـتر دەبـێ)، گـوتی: موكاتەبەیـان لەگەڵـدا كـردووم، لەسـەر نـۆ ئۆقیـە (لـە زێـڕ یـان لـە زیـو)، لـە مـاوەی نـۆ سـاڵاندا، هـەر سـاڵێ ئۆقیەیـەك، تـۆ هاوكارییـم بكـە بـۆ ئـازاد بوونـم.

دایكـمان عائیشـەش (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، هاوكاریـی دەكات و، دوایـی لـە ماڵـی پێغەمبـەردا ﷺ دەبێـت، نـەك وەك كەنیـزەك، بەڵكـو وەك ئافرەتێـك كـە لـە ماڵـی وانـدا دەبـێ و، خزمـەت دەكات و ئەوانیـش ڕێـزی دەگـرن.

## ٥- زۆر لێکردنی کەنیزەکان لەسەر لەشفرۆشیی قەدەغەیە:

ئایەتەکە زۆر بە ڕوونیی دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، واتە: کچەکانتان لەسەر لەشفرۆشیی ناچار مەکەن، لە حاڵێکدا کە ئەوان پاکییان دەوێ، بۆ ئەوەی کە شمەکێك لە ژیانی دنیا، (ئەندازەیەك لە ماڵ و سامان) وە دەست بێنن، بەو هۆیەوەو هەر کەسێك ناچاریان بکات، خوا دوای ناچارکردنەکەیان لێبووردەی میهرەبانە بەرانبەریان.

ئەم مەسەلەیە لە پێنج خاڵ دا دەتوێژینەوە:

یەك: خوا فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى﴾، (فتياتكم)، کۆی (فتاة)ە، یانی: کچ، نەیفەرمووە: (جَوَارِيكُم)، یان نەیفەرمووە: (إماءكم)، واتە: ئەوانە کچتانن، دەبێ وەك کچی خۆتان مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (وَلَا يَقُلْ أَحَدُكُمْ: عَبْدِي أَمَتِي، وَلْيَقُلْ فَتَايَ فَتَاتِي )، (أخرجه أحمد: ٨١٨٢، والبخاري: ٢٤١٤، ومسلم: ٢٢٤٩)، واتە: با یەکێکتان نەڵێ: کۆیلەکەم، کەنیزەکەکەم، بەڵکو با بڵێ: کوڕەکەم، کچەکەم، یان کوڕە گەنجەکەم، کچە گەنجەکەم، یانی: پێغەمبەر ﷺ هەر لە ناو هێنانیان دا، کارێکی کردوە کە هەست بە ئازادیی و، کەرامەت و ڕێزی خۆیان بکەن، کە جیاواز نین لەوانی دیکە.

دوو: وشەی (بغاء)، لە کوردییدا بە لەشفرۆشیی لێك دەدرێتەوە، واتە: پارە پەیدا کردن بە داوێن پیسیی، لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمان کرد، کە (عبدالله بن أبي بن سلول) سەرۆکی مونافیقەکان - کە ئەو جۆرە کارانە، هەر لە مونافیقەکان و دەغەڵ و دڵ نەخۆش و سەرۆکی مونافیقەکان دەوەشێنەوە - دوو کەنیزەکی هەبوون، بە ناوی موسەیکەو ئومەیمە (عبدالله بن أبي بن سلول)، ناچاری دەکردن بچن لەشفرۆشیی بکەن، زینا بکەن بە پارە، کە ڕەنگە خەڵکی دیکەش هەر بووبێ و، زانایان گوتوویانە: (إن خصوص السّبب لا يمنع شمول المعنى)، تایبەتمەندبوونی هۆکاری هاتنە خوار، ڕێ ناگرێ لە گشتیربوونی واتایەکەی.

سێ: کە دەفەرموێ: ﴿ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا ﴾، زانایان گوتوویانە: (هَذَا قَيْدٌ وَصْفِيٌّ وَلَيْسَ قَيْدًا احترازياً)، ئەمە قەیدێکی وەسفییە، نەك بۆ خۆلێ پاراستن، یانی: لە حاڵێکدا کە ئەو ئافرەتانە خۆپاك ڕادەگرن و پاکییان دەوێ، ئێوە ناچاری داوێن پیسیی و لەشفرۆشییان مەکەن، نەك مەبەست ئەوەبێ: تەنیا لە حاڵێکدا کە ئەوان ویستیان پاك بن، لەشفرۆشییان پێ مەکەن، بەڵکو ئەگەر ئەوانیش گریمان نەیانەوێ پاك بن، ئێوە هەر دەبێ پاکیان ڕابگرن و نابێ هانیان بدەن، بۆ زینا کردن، بەڵام لە حاڵێکدا کە ئەوان حاڵ و واقیعیان وایە کە خۆیان پاك ڕادەگرن، بۆ ئێوە زۆر زۆر ناجوامێریی و نامەردایەتییە، لەشفرۆشییان پێ بکەن!!

چوار: ئنجا لە بەرانبەر چی دا؟ ﴿ لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، بۆ ئەوەی شتێك لە بەرژەوەندیی دنیا، شتێك لە تەماعی دنیا داوا بکەن، کە ئەندازەیەك پارە بووە، پەیدایان کردوە!

پێنج: ﴿ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، هەر کەسێك ناچاریان بکات و، زۆریان لێ بکات، خوا دوای ناچارکردنیان، لێبوردەی میهرەبانە، واتە: بەرانبەر بەوان، ئایەتەکە زۆر بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ، ئەگەرنا ئەوەی کە ناچاری کردوون، ئەوە لە ڕاستییدا هەم لە ڕووی ڕواڵەتی شەرعەوە ڕێی لێ دەگیرێ، هەم لە لای خوای پەروەردگاریش، زۆر بە عەیبدارو ناجوامێرو نامەرد لە قەڵەم دەدرێ.

**مەسەلەی چوارەم:**

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوا ئایەتانێکی ڕۆشن و ڕوونکەرەوەی بۆ مسوڵمانان دابەزاندوون، وێڕای بەسەرهاتی سەرسووڕهێنەری گەلانی پێشوو، ئامۆژگارییش بۆ پارێزکاران:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدۡ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ ءَايَٰتٖ مُّبَيِّنَٰتٖ وَمَثَلٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلِكُمۡ وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَلَقَدۡ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ ءَايَٰتٖ مُّبَيِّنَٰتٖ ﴾، بەدڵنیاییش ئایەتانێکی ڕۆشن و ڕوونکەرەوەمان بۆ لاتان دابەزاندوون.

ئەمە بیرخستنەوەیە بۆ گەورەیی ئێوەڕۆك و هەستیاری ئەم ئایەتانەی سووڕەتی (النور)، یان مەبەست کۆی ئایەتەکانی سووڕەتەکانی قورئانە، (وَلَقَدۡ) بە (ل) و (قد) بۆ دڵنیا کردن و جەختکردنەوەن، ئێمە بۆ لای ئێوەمان دابەزاندوە چی؟

﴿ ءَايَٰتٖ مُّبَيِّنَٰتٖ ﴾، ئایەتانێکی ڕوون و ڕۆشنکەرەوە، خوێندراویشەتەوە: (مُبَيَّنَات)، واتە: ڕۆشنکراوە، کە ئایەتەکانی قورئان هەم ڕۆشنکراوەن، هەم ڕۆشنکەرەوەشن بۆ مەبەستەکان، واتە: دڵنیابن ئەو ئایەتانە، هەم ڕۆشنکەرەوەن هەم ڕۆشنکراوەن، کەواتە: ڕێزیان بگرن، وەك بۆ پێگەی بەرزی فەرمایشتی خوا، پێویستە، ئاوا مامەڵە بکەن لەگەڵ فەرمایشتەکانی خوادا.

٢)- ﴿ وَمَثَلٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلِكُمۡ ﴾، هەروەها وێنەش لە گەلانێك کە لە پێش ئێوەدا ڕابردن، (بۆ ئێوەمان دابەزاندوە).

(المثَلُ: النَّظِيرِ وَالشَّبِيهُ، والحالة العجيبة)، (مَثَل) هەم بە مانای وێنە دێ، هەم بە مانای وێچوو دێ، هەم بە مانای حاڵەتی سەرسووڕهێنەر دێ، کە مەبەست

پێـی بەسـەرهاتی گەلـە پێشـووەکانە، کـە وەك پەنـد (مثـل) خـوای پـەروەردگار دایڕشـتوە، وەك پەنـدی پێشـینان، کـە وشـەکانی کـە مـن، بـەڵام واتـای زۆرە، ئـەو بەسـەرهاتانەش کـە خـوا لـە قورئانـدا لـە بـارەی گەلـە پێشـووەکانەوە، بـۆ ئێمـەی گێڕاونـەوە، شـێوەی پەنـد دەکـەن، واتایـان زۆرەو وشـەکانیان کەمـن.

٣)- ﴿ وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴾، هەروەها خوا ئامۆژگارییشی بۆ پارێزکاران (بۆتان دابەزاندوە)، (موعظة): بریتیە لە قسەیەك کە مرۆڤ بە هۆیەوە هەڵەکەی خۆی پێ بزانێ و، خۆی ڕاست بکاتەوە، بەڵام هەندێك گوتوویانە: (المَوْعِظَة: كَلاَمٌ مقترنٌ بتَرغيب وترهيب)، (موعظة) قسەیەکە جووت بێ لەگەڵ ئارەزوومەند کردن و ترساندندا، هەروەها گوتراوە: (الوعظ: كلامٌ يرقُّ له القَلْبُ)، (وعظ) قسەیەکە دڵ بۆی نەرم بێ و هەست جووڵێن و دڵبزوێن بێ.

سُبْحَانَك اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە دوازدە (١٢) ئایەت پێك دێ، كە بریتین لە ئایەتەكانی: (٣٥ - ٤٦)، ئەو دوازدە ئایەتە، خوا ﷻ تێیاندا، پێنج بابەتی جۆراو جۆری خستوونە ڕوو:

١- وەسفكرانی خوا بە ڕووناكیی ئاسمانەكان و زەوی و، وێنە هێنانەوە بۆ ڕووناكیی خوا، بە چرایەك لە تاقێكدا كە شووشەكەی وەك گەوهەرو، زەیتەكەشی زۆر ڕوون و ... هتد.

٢- باسی مزگەوتەكان كە پیاوانێكی هەڵبژاردە، یادی خوایان تێدا دەكەن، كە بازرگانیی و كڕین و فرۆشتن لە یادی خواو نوێژكردن و زەكاتدان، بێ ئاگایان ناكات و، پاداشتێكی بێ ئەژماریشیان هەیەو، خوا لە بەخششی خۆی بۆشیان زیاد دەكات.

٣- باسی سەرەنجامی شووم و تاریكی بێبڕوایان، لە دنیاو دوا ڕۆژداو، وێنە بۆ هێنرانەوەیان بە تراویلكەی بیابان و، تاریكایی دەریا..

٤- خستنە ڕووی چەند دیاردەو دیمەنێكی سەرنجڕاكێش، لە بارەی زانیاریی و دەسەڵات و میهرەبانیی خوای بەرزو مەزنەوە.

٥- دووبارە جەختكرنەوە لەسەر گەورەیی و گرنگیی ئایەتە ڕوون و ڕوونكەرەوەكانی قورئان و، ئەوە كە خوا مرۆڤەكان بەرەو ڕاستە شەقام ڕێنمایی دەكات.

﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ ۖ ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ ۖ
ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا
يُضِىٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ۗ يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَٰلَ

لِلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٣٥﴾ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرۡفَعَ وَيُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ يُسَبِّحُ
لَهُۥ فِيهَا بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ ﴿٣٦﴾ رِجَالٞ لَّا تُلۡهِيهِمۡ تِجَٰرَةٞ وَلَا بَيۡعٌ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ
وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوۡمٗا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلۡقُلُوبُ وَٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴿٣٧﴾ لِيَجۡزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحۡسَنَ مَا
عَمِلُواْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضۡلِهِۦۗ وَٱللَّهُ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَعۡمَٰلُهُمۡ
كَسَرَابِۭ بِقِيعَةٖ يَحۡسَبُهُ ٱلظَّمۡـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمۡ يَجِدۡهُ شَيۡـٔٗا وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ
حِسَابَهُۥۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿٣٩﴾ أَوۡ كَظُلُمَٰتٖ فِي بَحۡرٖ لُّجِّيّٖ يَغۡشَىٰهُ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ مَوۡجٞ
مِّن فَوۡقِهِۦ سَحَابٞۚ ظُلُمَٰتُۢ بَعۡضُهَا فَوۡقَ بَعۡضٍ إِذَآ أَخۡرَجَ يَدَهُۥ لَمۡ يَكَدۡ يَرَىٰهَاۗ وَمَن لَّمۡ يَجۡعَلِ ٱللَّهُ
لَهُۥ نُورٗا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلطَّيۡرُ صَٰٓفَّٰتٖۖ
كُلّٞ قَدۡ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسۡبِيحَهُۥۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَفۡعَلُونَ ﴿٤١﴾ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِلَى
ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٤٢﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزۡجِي سَحَابٗا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيۡنَهُۥ ثُمَّ يَجۡعَلُهُۥ رُكَامٗا فَتَرَى ٱلۡوَدۡقَ
يَخۡرُجُ مِنۡ خِلَٰلِهِۦ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٖ فِيهَا مِنۢ بَرَدٖ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَصۡرِفُهُۥ عَن مَّن
يَشَآءُۖ يَكَادُ سَنَا بَرۡقِهِۦ يَذۡهَبُ بِٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴿٤٣﴾ يُقَلِّبُ ٱللَّهُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّأُوْلِي
ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴿٤٤﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٖ مِّن مَّآءٖۖ فَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ بَطۡنِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ رِجۡلَيۡنِ
وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰٓ أَرۡبَعٖۚ يَخۡلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٤٥﴾ لَّقَدۡ أَنزَلۡنَآ
ءَايَٰتٖ مُّبَيِّنَٰتٖۚ وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٤٦﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{خـوا ڕووناکیـی ئاسـمانەکان و زەوییـە، وێنـەی ڕووناکییەکـەی وەك ئەوەیـە تاقەیـەك چرایەکـی تێدابـێ، چرایەکـە لـە شووشـەیەك دابـێ، شووشـەکە وەك ئەسـتێرەیەکی گەوهـەر ئاسـابێ، سـووتەمەنییەکەی هـی درەختێکـی بـە پێـزی زەیتـوون بـێ، کـە هـەم لـە کاتـی هەڵهاتـن و، هـەم لـە کاتـی ئاوابوونیـدا، تیشـکی خـۆر لێـی بـدات، زەیتەکـەی (هێنـدە سـاف بـێ) نیزیـك بـێ، بـێ ئـەوەی ئاگـری بگاتـێ دابگیرسـێ و ڕۆشـن بـێ، ڕووناکیـی لەسـەر ڕووناکییـە، خـوا هـەر کەسـی بـوێ بـەرەو ڕووناکیـی خـۆی ڕێنمایـی دەکات و، خـوا وێنـان بـۆ خەڵکـی دێنێتـەوەو، خـوا بـە هەمـوو شـتێك زانایـە ﴿٣٥﴾ (ڕووناکیـی ڕێنمایـی خـوا) لـە ماڵانێـك دایـە، کـە خـوا فەرمانـی کـردوە بـەرز ڕابگیرێـن و، نـاوی ویـان تێـدا بهێـنرێ، کـە تێیانـدا بەیانیـان و ئێـواران بـە پاکـی دەگـرن ﴿٣٦﴾ پیاوانێـك کـە بازرگانیـی و کڕیـن و فرۆشـتن لـە یـادی خـواو بەرپاکردنـی نوێـژو زەکاتـدان، نایانخافڵێنـێ (و بـێ ئاگایـان نـاکات) لـە ڕۆژێـك دەترسـێن دڵان و چاوانـی تێـدا هەڵدەگەڕێنـەوە ﴿٣٧﴾ (بۆیـە وا دەکـەن) تاکـو خـوا پاداشـتی باشـترین کردەوەکانیـان بداتـەوەو، لـە بەخششـی خۆیشـی بۆیـان زیـاد بـکاو، خـواش هـەر کەسـێکی بـوێ، بـە بـێ ژمـاردن پاداشـتیی دەداتـەوە ﴿٣٨﴾ کردەوەکانـی ئەوانـەش کـە بێبـڕوان، وەك تراویلکـەی دەشـتێکە کـە بابـای تینـوو پێـی وایـە ئـاوە، بـەڵام کـە دێتـە لای، هیـچ نابینـێ و پـەروەردگاری لـەوێ دەبینـێ و، سـزای پـڕ بـە پێسـتی دەدات و، خـواش لێپرسـینەوەی خێرایـە ﴿٣٩﴾ یـان (کردەوەکانیـان) وێنـەی تاریکاییەکانـی دەریایەکـی قووڵـی شـەپۆلاوییە، کـە شـەپۆلێك دایدەپۆشـێ، لەسـەرروویەوە شـەپۆلێك هەیـەو، لەسەرووشـیەوە هـەور، کۆمەڵێـك تاریکایـی لەسـەر یـەك کەڵەکـە بـوون (تاریکاییەکـە هێنـدە خەسـتەو ئەنگوسـتە چـاوە کـە) ئەگـەر (کەسـێك) دەسـتی دەربێنـێ، نیزیکـە نەیبێنـێ، کەسـێکیش خـوا ڕووناکیـی نەداتـێ،

ڕووناكیی نابێ ﴿٤٠﴾ ئایا نابینی (بە چاوی عەقڵ و دڵ) كە خوا هەر كەس لە ئاسمانەكان و زەویدایە، بە پاكی دەگرێ و، باڵندەكانیش باڵەكانیان پان ڕاگرتوون و ڕیز كردوون، هەر كامێكیان پاڕانەوەو (خوا) بە پاككرتنی خۆی دەزانێ و، خواش دەزانێ چی دەكەن ﴿٤١﴾ حوكمڕانیی ئاسمانەكان و زەوییش تەنیا هی خوایەو، سەرەنجامیش تەنیا بۆ لای خوایە ﴿٤٢﴾ ئایا (بە چاوی عەقڵ و دڵ) نابینی (ئەی مرۆڤ !) كە خوا هەورەكان لێدەخوڕێ (بە نەرمیی)، دوایی پێكیانەوە ناوێتە دەكات (متوربەیان دەكات)و، لەسەر یەكیان كەڵەكە دەكات و، سەرەنجام باران لەمیانیدا دێتە دەرێ و، لەسەرێشەوە لە چەند هەورێكی چیا ئاسا كە تێیدان، لە تەرزە دادەبارێنێ و، هەر كەسێك بیەوێ (بەو تەرزەیە) لێی دەدات و، لە هەر كەسێكیشی بوێ، لایدەدات، نیزیكە ڕووناكیی بروسكەكەی چاوان نەهێڵێ (كوێریان بكات) ﴿٤٣﴾ خوا شەوگارو ڕۆژگار جێگۆڕكەو، كورت و درێژ پێ دەكات، لەوەدا پەندێكی گەورە هەیە بۆ خاوەن دیتنان (بە عەقڵ و دڵ) ﴿٤٤﴾ هەروەها خوا هەموو ژیاندار (و پیرۆ)یەكی لە ئاوێ دروستكردوە، ئنجا هەیانە لەسەر سكی دەخشێ و، هەیانە بە دوو لاقان دەڕوات و، هەشیانە لەسەر چوار لاقان دەڕوات، خوا هەرچی بیەوێ دروستی دەكات، بە دڵنیایی خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە ﴿٤٥﴾ مسۆگەر ئایەتانێكی ڕوون و ڕۆشنكەرەوەمان دابەزاندوون و، خواش هەر كەسێكی بوێ، دەیخاتە سەر ڕاستە ڕێ ﴿٤٦﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(نُورُ): (النُّورُ: الضَّوءُ الْمُنْتَشِرُ الَّذِي يُعِيْنُ عَلَى الإِبْصَارِ، وَهُوَ نَوْعَانِ: مَعْقُولٌ بِعَيْنِ البَصِيْرَةِ، مَحْسُوسٌ بِعَيْنِ البَصَرِ، وَسَمَّى اللهُ نَفْسَهُ نُوراً، مِنْ حَيْثُ إِنَّهُ هُوَ الْمُنَوِّر)، (نـور) بـەو ڕووناکییـە بڵاوبـووەوە دەگوتـرێ، کـە هاوکاریـی ئـەوە دەکات مـرۆڤ ببینـێ، ئەویـش دوو جـۆرە: ڕووناکییـەکی مەعقـووڵ، یـان مەعنەویـی کـە بـە چـاوی دڵ دەبیـنرێ، ڕووناکییـەکی بەرهەسـت، کـە بـە چـاوی سـەر دەبیـنرێ، خـواش ﷻ خـۆی نـاو نـاوە: نـوور، لـەو ڕووەوە کـە ئـەو ڕۆشـنکەرەوەیە.

ڕۆشـنکەرەوەی گەردوونـە بـە ڕووناکیـی بەرهەسـت، هەروەهـا ڕۆشـنکەرەوەی گەردوونـە، بـە ڕووناکیـی مەعنەویـی.

(كَمِشْكَوٰةٍ ): (المِشْكَاةُ: كَوَّةٌ غَيْرُ نَافِذَة)، (مِشْكَاة) تاقێکـە کـە دەرەو دیـو نەبـێ، لـە کوردەواریـی دا (تـاق)ی پـێ دەڵێـن و، ئەگـەر دەرەو دیـو بـێ، پەنجـەرەی پـێ دەڵێـن.

(مِصْبَاحٌ ): (السِّرَاج)، واتە: چرا، ئەو چرایەی دەئایسێ.

(زُجَاجَةٍ): (الزجـاج: حَجَـرٌ شَـفَّافٌ الوَاحِـدَة: زُجَاجَـة)، (زُجَـاج) بەردێکـی ڕوونـە، تاکەکـەی (زُجَاجَـة)ی پـێ دەگوتـرێ.

( كَوْكَبٌ ): کۆیەکـەی (كَوَاكِـب)ە، (النُّجُـوم البَادِيَـة)، بـە ئەسـتێرە بـەدەرەوەکان دەگوتـرێ: (كَوَاكِـب)و پێیـان ناگوتـرێ: (كَوَاكِـب)، تاکـو دیـار نەبـن.

(دُرِّيٌّ): (مَنْسـوْبٌ إِلَى الـدُّرِّ، دِرِي، دُرِي: مِـنَ الـدَّرْء)، وەك دوایـی بـاس دەکەیـن بـە چەنـد شـێوەیەك خوێنراوەتـەوە:

أ- پاڵدراوەتە لای (دُرّ) گەوهەر. ب- (دِرِي). ج- (دُرِي) بە بێ گیرە (شدة)، لە (الدَّرْء)ەوە هاتوە، واتە: پاڵ پێوەنان، لەبەر ئەوەی ڕووناکییەکەی (درِ) بە تاریکیی دەدات.

(كَسَرَابٍ): (السَّرَابُ: اللاَّمِعُ فِي المَفَازَةِ، وذَلِكَ لانْسِرابِه فِي مَرْأَى العَيْنِ، وَهُوَ عَكْسُ الشَّرَابِ الَّذِي لَهُ حَقِيْقَتُه)، (سَرَاب) یانی: بە كوردیی دەڵێن: تراویلكە، ئەوەیە كە لە دوورەوە دەدرەوشێتەوە، لە دەشت و بیایان، (ئەویش لە هەموو شوێنێك نا)، لەبەر ئەوەی بە چاو دەیبینی بڵاودەبێتەوە، كە پێچەوانەی (شَرَابُ)ە، یانی: ئەوە كە حەقیقەتی هەیە، بەڵام (سَرَاب) تراویلكەیە، بە چاو وا دیارە، ئەگەرنا لە ڕاستییدا وانیە.

(بِقِيعَةٍ): (القِيعُ وَالقَاعُ: المُسْتَوِ مِنَ الأَرْضِ جمعهُ: قِيْعَان)، (قِيعُ وَقَاعُ)، بریتیە لە زەوییەكی تەخت كە بە (قِيْعَان)، كۆدەكرێتەوە.

(لُجِّيٍّ): (مَنْسُوبٌ إلى لُجَّةِ البَحْرِ، وَاللُّجُّ هُوَ مُعْظَمُ البَحْرِ)، (لُجّي) واتە: شەپۆلاویی، پاڵ دراوەتە لای (لُجَّةِ البَحْرِ)، شەپۆلی دەریا، (لَجٌّ) بریتیە لە زۆربەی دەریا.

(صَٰٓفَّٰتٍ): (أي مُصْطَفَّةً أَجْنِحَتَهَا) باڵەكانیان ڕیز كردوون، یاخود پان ڕاخستوون.

(يُزْجِي): (التَزْجِيَة: دَفْعُ الشَّيءِ لِيَنْسَاقَ كَتَزْجِيَةِ رَدِيءِ البَعِيْرِ)، (تَزْجِيَة) بریتیە لە پاڵ پێوەنانی شتێك كە بە لە باریی بڕوات، وەك چۆن حوشترێكی خراپ كە لاوازە، یاخود چاك ناڕوات، لێدەخوڕدرێ.

(سَنَا): (الضَّوْءُ السَّاطِع)، تیشكێكی زۆر درەوشاوە.

(دَآبَّةٍ): (دَابَّة: مَا دَبَّ عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ، أي: مَشَى)، (دَابَّة) هەر شتێك كە لەسەر ڕووی زەوی بڕوات.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـەم دوازدە ئایەتـە موبارەکـەدا، پێنـج بابـەتی گـەورەو گرنگـی جـۆراو جـۆری خسـتوونە ڕوو، لـە بـواری خواناسـیی و، تەنیا پەرسـتراني و، ڕێبـازی ڕاسـت و ڕوونی بەندایەتیی بـۆ کـراني و، ڕێچکـەو کوێـرە ڕێیەکانداو...هتـد، سـەرەتا دەفەرموێ: ﴿ اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾، زانایـان گوتوویانـە: ئایـا دەبێ چۆنیەتیی پەیوەسـت بوونـی ئـەم ڕسـتە موبارەکـەو، ڕسـتەکاني دیکـەی کـە لـە دوایـی دێـن، لەگـەڵ ئایەتەکانـی پێشـێ دا، چـۆن بـێ؟ خـوا ﷻ سـەرەتا باسـی حوکمـی زینـاو بوختان کـردن و، پاشـان لیعـان و، دوایـی ڕووداوی بوختـان پێکـراني دایکـمان عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بێـت)، ئنجـا حوکمـی سـەردان و هاموشـۆی ماڵـی یەکـدی و، مەسـەلەی نەڕوانیـن بـە حەرامیـی پیـاوان و ئافرەتـان بـۆ یەکـدی و، خـۆ پاراسـتن لـە زینـاو، چەنـد بابەتێکـی دیکـە، دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾، بەشـێك لـە زانایـان جوانیـان گوتـوە، گوتوویانـە: لەبـەر ئـەوەی بـە هـۆی شـوێنکەوتنی شـەریعەتەوە، کۆمەڵـگا ڕۆشـن دەبێتـەوەو، کۆمەڵـگا پـاك دەبێتـەوە، لـە لادانـە جینسـییەکان و، لادانەکانـی دیکـەو، کۆمەڵـگا دەڕازێتـەوە بـە ئـەدەب و ڕەوشـت و جوانـەکان، ئنجـا خـوا ﷻ دەیـەوێ پێـمان بفەرمـوێ: وەك چـۆن خـوا گەردوونـی ڕۆشـن کردۆتـەوە، ژیانـی ئێـوەش ڕۆشـن دەکاتـەوە بـە هـۆی ئـەو ڕووناکییـە مەعنەوییـەوە، کـە بـۆی دابەزانـدوون، کـە قورئانـە، چونکـە خـوا ناویشـی لـە قورئـان نـاوە نـوورو، ناویشـی لە پێغەمبـەر ﷺ نـاوە نـوورو، ناویشـی لـە ئیسـلام نـاوە نـوور، کەواتـە: ئـەی مرۆڤـەکان! بـە دوای ئیسـلام و، بـە دوای قورئـان و، بـە دوای پێغەمبـەر ﷺ بکـەون، لـە ڕووی جێبەجـێ کردنـی حوکمـە شـەرعییەکانەوە، لـە بوارەکانـی: خێزانیـی و، کۆمەڵایەتیـی و، سیاسـیی و، هەمـوو هەڵـس و کەوتەکانتانـدا، تاکـو وەك چـۆن گـەردوون ڕۆشـنە بـە ڕۆشـنکردنەوەی خـوای پـەروەردگار، چ لـە ڕووی مادديـی، چ لـە ڕووی مەعنەوییـەوە، ژیـانی ئێـوەش و، کۆمەڵـگای ئێـوەش، ڕۆشـن و شـوعلەوەر بـێ!

خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾.

خـوا ڕووناکیـی ئاسـمانەکان و زەوییـە، هەڵبەتـە دوایـی ئێمـە وردتـر ئـەم ڕسـتە موبارەکـە شـی دەکەینـەوە، کـە ئایـا مەبەسـت پێـی چییـە؟ ئێسـتا هـەر وا کورتەیەکی لـێ دەڵێیـن:

١- خوا ڕووناکیی ئاسمانەکان و زەوییە، واتە: خوا ئاسمانەکان و زەوی لە تاریکیی نەبوون هێناونە دەر، بۆ ڕووناکیی بوون.

٢- خوا ﷻ ئاسمانەکان و زەوی ڕووناك کردوونەوە، بەو ڕووناکییە بەر هەستەی دەیبینین.

٣- خوا ﷻ کاروباری گەردوون بەڕێوە دەبات بە سیستەم و بە ڕێکیی و، ڕوونی کردۆتەوە بە هۆی ئەو ڕێك و پێکیی و سیستەمەوە.

٤- خوا سەرپەرشتیی کاروباری گەردوون دەکات و، ڕوونی کردۆتەوەو، نەیهێشتوە تاریکیی بێ یاسایی و بێ سەرو بەرەیی تێدا بێ.

٥- خوا مایەی ڕووناکییە، ڕووناکیی مەعنەویی کە لە گەردووندا هەیە، کە بریتیە لەوەی خوا بناسرێ و، بەندایەتیی و ملکەچیی بۆ خوا بکرێ، ئەوەش ئەو ڕووناکییە مەعنەوییە کە لە گەردووندا هەیەو، خوا ﷻ ئەم گەردوونەی بۆ هێنانەدی ئەو ڕووناکییە مەعنەوییە، ڕەخساندوە.

ئنجا خوا ﷻ وێنەی ڕووناکییەکەی خۆی بۆ ئێمە دێنێتەوە:

﴿ مَثَلُ نُورِهِۦ ﴾، وێنـەی ڕووناکییەکـەی ڕووناکیی خـوا، وەك چی وایە؟ ﴿ كَمِشۡكَوٰةٖ فِيهَا مِصۡبَاحٌ ﴾، وەك تاقێـك وایـە، (المِشْكَاة: كوَّة غَيْرُ نَافِذَةٍ)، تـاق، ئەگـەر دەرو دیـو بـێ، پەنجـەرەی پـێ دەڵێـن، بـەڵام (كوَّة)، ئەوەیـە کـە سـێ لای بەسـترابن و لایەکـی دیـار بـێ، لایەکـی بـۆش بـێ، کـە چرایەکـەی تێدەخـرێ، ﴿ فِيهَا مِصۡبَاحٌ ﴾، چرایەکـی تێـدا بـێ، ﴿ ٱلۡمِصۡبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ ﴾، چرایەکـە لـە نێـو شووشـەیەك دابـێ، ﴿ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوۡكَبٞ دُرِّيّٞ ﴾، شووشـەکە هێنـدە ڕوون و سـاف بـێ، وەك ئەسـتێرەیەکی

تیشـکدەر بـێ، ئەسـتێرەیەك بـێ زۆر تیشـك دەربـێ، ئەسـتێرەکە وەك گەوهـەر بدرەوشـێتەوە، ﴿يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَـٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ﴾، ئـەو چرایـە سـووتەمەنیی بـۆ بهێـنرێ لـە درەختێکـی پـڕ پیـت و پێـزەوە، ئـەو درەختـەش درەختـی زەیتـوون بـێ، زەیتـی زەیتـوون کاتـی خـۆی بـۆ سـووتاندنی چـراش بەکارهاتـوە، ﴿لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ﴾، ئـەو درەختـە زەیتوونـە، ئـەوە نیـە تەنهـا ڕۆژهەڵاتیـی بـێ، یـان بـەس ڕۆژئاوایـی بـێ، واتـە: ئـەوە نیـە: کـە تەنیـا لـە کاتـی خۆرهەڵاتنـدا، تیشـکی ڕۆژ لێـی بـدات، یـان تەنیـا لـە کاتـی خـۆر ئاوابووونـدا، بەڵکـو لـە کاتـی ڕۆژهەڵاتـن و ڕۆژئاوابوونیشـدا، باخـی ئـەو زەیتوونـە، تیشـکی خـۆر لێـی دەدات، بۆیـە زەیتوونەکـە باشـترین درەخـت دەبـێ و، باشـترین بـەری دەبـێ و، باشـترین زەیتـی دەبـێ، ﴿يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ﴾، خەریکـە زەیتەکـەی بنایسـێ، ڕوونـاك بـێ، بـێ ئـەوەی ئاگریشـی بگەیەنرێتـێ و دابگیرسـێ.

﴿نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ﴾، ڕووناکیـی لەسـەر ڕووناکیـی، هـەم تاقەکـە ڕووناکییەکـە کـۆ دەکاتـەوە، هـەم چرایەکـە، شووشـەکەی زۆر ڕوونـە، هـەم زەیتەکـەی زۆر سـافە، ﴿يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾، خـوا بـەرەو ڕووناکیـی خـۆی، واتـە: بـەرەو ڕووناکیـی مەعنەویـی خـۆی، کـە: قورئانـە، ئیسـلامە، پێغەمبـەرە ﷺ، بـەرەو ڕووناکیـی خـۆی، هـەر کەسـێ بیـەوێ ڕێنمایـی دەکات، ﴿وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَـٰلَ لِلنَّاسِ﴾، خـواش وێنان بـۆ خەڵکـی دێنێتـەوە، ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾، خـواش بـە هەمـوو شـتێك زانایـە.

ئنجـا ئایـا ئـەو ڕووناکییـە مەعنەوییـەی خـوا، لـە کـوێ چنـگ دەکـەوێ؟ ﴿فِى بُيُوتٍ﴾، یـان: ئایـا ئـەو چرایـە کـە خـوا کـردی بـە وێنـە بـۆ پێشـاندانی ڕووناکییەکەی خـۆی بـۆ ئێمـە، لـە کـوێ چنـگ دەکـەوێ؟ لـە ماڵانێکـدا ﴿أَذِنَ ٱللَّهُ﴾، کـە خـوا فەرمانـی کـردوە، یـان: خـوا مۆڵەتـی داوە، ﴿أَن تُرْفَعَ﴾، ئـەو ماڵانـە بـەرز بکرێنـەوە، بـەرز ڕابگیرێـن، ﴿وَيُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ﴾، نـاوی ئەویـان تێـدا بهێـنرێ، ﴿يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ رِجَالٌ﴾، پیاوانێـك لـەو ماڵانـەدا، بەیانیـان و ئێـواران خـوا بـە پـاك دەگـرن، ئنجـا ئایـا ئـەو پیاوانـە چۆنـن؟ ﴿لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَـٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ

ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ ﴾، نـە بازرگانیـی، نـە کڕیـن و فرۆشـتن، لـە یـادی خـواو لـە نوێـژ بەرپاکـردن و زەکات دان، بـێ ئاگایـان نـاکات، نایانخافڵێنـێ، ﴿ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَٰرُ ﴾، لـە ڕۆژێـك دەترسـێن، كـە دڵـەكان و چـاوەكان تێیـدا هەڵدەگەڕێنـەوە، هەڵدەسـووڕێن، ئینسـان ئەگـەر زۆر ترسـی هەبـێ، هـەر جـارە تەماشـای لایـەك دەكات، ﴿ لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ ﴾، بۆیـەش ئـەو كردەوانـە ئەنجام دەدەن، تاكـو خـوا بـە باشـترینی كردەوەكانیـان پاداشـتیان بداتـەوە، ﴿ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦ ﴾، لە بەخششـی خۆیشـی بۆیـان زیـاد بـكات، ﴿ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾، خـواش هـەر كەسـێكی بیـەوێ، بـە بـێ ژمـاردن بژیـوی دەدات، ڕزق و ڕۆزیـی بـۆ دەڕەخسـێنێ، چ لـە دنیـادا، چ لـە دوا ڕۆژدا، كـە لێـرەدا مەبەسـت پێـی ڕۆژی دواییـە، بـە نسـبەت بڕوادارانـەوە، بـەو شـێوەیەن.

﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَعْمَٰلُهُمْ كَسَرَابٍۭ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ ٱلظَّمْـَٔانُ مَآءً ﴾، بـەڵام ئەوانـەی بێبـڕوان، كردەوەكانیـان وەك تراویلكەیەكـە لـە بیابـان و دەشـتێكدا، بابـای تینـوو بـە ئـاوی تـێ دەگات، كـە لـە دوورەوە دەیبینـێ دەدرەوشـێتەوە، وادەزانـێ ئـاوە، شـەپۆل دەدات، ئەوانـەی كـە بـە بیابانـدا ڕۆیـین لـە كەشـی هاوینـدا، دەزانـن كـە تەماشـا دەكـەی دەڵێـی: ڕەنگـە ئـەوە دەریاچـە بـێ لـەوێ، بـەڵام نەخێـر، هـەر شـەپۆلی گەرمایـە لەسـەر ڕووی بیابـان دەردەكـەوێ، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا ﴾، تاكـو كاتێـك كـە دەچێتـە لای هیـچ شـتێكی لـێ هەڵنەكـەوت، یـەك تـۆزە ئـاوی لـێ نـەدی، ﴿ وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥ ﴾، خـواش لـەوێ بینـی، ئەویـش لێپرسـینەوەی تـەواوی لەگەڵـدا كـردو سـزای پـڕ بـە پێسـتی دا، ﴿ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴾، خـواش لێپرسـینەوەی زۆر خێرایـە.

ئەمـە وێنەیەكـی وشـكانیی و بیابانییـە، ئنجـا وێنەیەكـی دەریاییشـیان بـۆ دێنێتـەوە، بـۆ چۆنیەتـی زایـە بوونـی كـردەوەی كافـرەكان و بـێ ئەنجامبوونـی هـەوڵ و ڕەنجیـان، دەفەرمـوێ: ﴿ أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ﴾، یـان حاڵـی كافـرەكان و كردەوەكانیـان، وەك چەنـد تاریكاییەكـن لـە

دەریایەکی شەپۆلاویی قووڵدا، کە شەپۆلێك دایدەپۆشێ، لەسەروویەوە شەپۆلێکی دیکە دایدەپۆشێ، لە سەرووی شەپۆلەکانەوەش هەور هەیە، ﴿ظُلُمَٰتُۢ بَعۡضُهَا فَوۡقَ بَعۡضٍ إِذَآ أَخۡرَجَ يَدَهُۥ لَمۡ يَكَدۡ يَرَىٰهَاۗ﴾، تاریکایی هەندێکی لەسەر هەندێکی کەڵەکە بووە، هێندە تاریکە: ﴿إِذَآ أَخۡرَجَ يَدَهُۥ لَمۡ يَكَدۡ يَرَىٰهَاۗ﴾، ئەگەر دەستی دەربێنێ، نیزیکە نەیبینێ، یاخود: هەر نزیك نیە بیشیبینێ، هەردوو واتاکەی هەن، هێندە تاریکە شەوێکی ئەنگوستە چاوە، حاڵی کافرەکان ئاوایە، ﴿وَمَن لَّمۡ يَجۡعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورٗا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ﴾، هەر کەسێکیش خوا ڕووناکیی پێ نەدات، ڕووناکیی نابێ، کە مەبەست پێی ڕووناکیی مەعنەوییە.

ئنجا خوای زاناو توانا وێنەیەکی دیکە دێنێتەوە لە بارەی دروستکراوەکانی خۆی و، دەسەڵات و میهرەبانیی و دەست ڕۆیشتوویەتی خۆیەوە لە گەردووندا: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، ئایا نابینی، بە چاوی عەقڵ و دڵ نابینی: هەر کەسێك کە لە ئاسمانەکان و زەوییدا هەیە، خوا بە پاك دەگرێ، ﴿وَٱلطَّيۡرُ صَٰٓفَّٰتٖۖ﴾، باڵندەکانیش بە گشتیی باڵیان پان کردوون، یان: باڵیان ڕیز کردوون، بە ڕیز دەوەستن لە ئاسمان، ﴿كُلّٞ قَدۡ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسۡبِيحَهُۥۗ﴾، هەر کامێك لەوانەی کە لە ئاسمانەکان و زەوییدا هەن، لە خاوەن عەقڵەکان و، هەروەها باڵندەکانیش، هەر کامێکیان پاڕانەوەی خۆی و خوا بە پاکڕاگرتنی خۆی دەزانێ.

﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَفۡعَلُونَ﴾، خواش دەزانێ چی دەکەن.

﴿وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ﴾، حوکمڕانیی و دەستڕۆیشتوویەتیی لە ئاسمانەکان و زەوییدا، بەس هی خوایە، سەرەنجامیش تەنیا بۆ لای خوایە.

ئنجا دیمەن و دیاردەیەکی دیکەمان دەخاتە بەرچاو: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزۡجِي سَحَابٗا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيۡنَهُۥ ثُمَّ يَجۡعَلُهُۥ رُكَامٗا فَتَرَى ٱلۡوَدۡقَ يَخۡرُجُ مِنۡ خِلَٰلِهِۦ﴾، ئایا (بە چاوی عەقڵ و دڵ) نابینی (یان بە چاوی سەر)، چۆن خوا هەورەکان پاڵ پێوە دەنێ بە نەرمیی، دوایی پێکیانەوە دەلکێنێ، پێکیانەوە دەنووسێنێ، موتوربەیان

دەكات، دوایی لەسەر یەكیان كەڵەكە دەكات، دوایی باران دەبینی، لەمیانی ئەو هەورە دێتە دەرێ، ﴿ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِنۢ بَرَدٍ ﴾، هەروەها لە سەرێوە لە هەوری چیا ئاسا، هەورانێك كە وەك چیا وان، وەك گردۆلكەو چیا وان، لەوێوە تەرزە دەبارێنێ، ﴿ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَصۡرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُ ﴾، هەر كەسێكی بوێ ئەو تەرزەیەی لێ لادەدات و، لە هەر كەسێكیشی بوێ لایدەدات، ﴿ يَكَادُ سَنَا بَرۡقِهِۦ يَذۡهَبُ بِٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴾، خەریكە ڕۆشنایی برووسكەكەی (هی هەورەكان) چاوان لە بەین دەبات، چاوان كوێر دەكات، ﴿ يُقَلِّبُ ٱللَّهُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴾، خوا شەوگارو ڕۆژگار هەڵدەگێڕێتەوەو، جێگۆڕكەیان پێدەكات، كورت و درێژییان پێدەكات، بە ڕاستیی لەوەدا پەند هەیە بۆ خاوەن دیتنان (بە چاوی عەقڵ و دڵ).

﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٖ مِّن مَّآءٖ ﴾، هەروەها خوا هەموو پێڕۆیەكی لە ئاوێك هێناوەتە دی، لە تنۆكە ئاوێك، واتە: لەو تۆوەی لە ئاوە، ﴿ فَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ بَطۡنِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ رِجۡلَيۡنِ وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰٓ أَرۡبَعٖ ﴾، ئنجا هەیانە لەسەر سك دەخشێ و دەڕوات و، هەیانە لەسەر دوو پێیان و هەیانە لەسەر چوار پێیان، ﴿ يَخۡلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴾، خوا هەر شتێكی بوێ، دروستی دەكات و دەیهێنێتە دی، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾، بە دڵنیایی خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە.

لە كۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدۡ أَنزَلۡنَآ ءَايَٰتٖ مُّبَيِّنَٰتٖ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئایەتە ڕۆشنكەرەوەكانمان دابەزاندوون، یان: (مُبَيَّنَات)، ئایەتە ڕۆشنەكانمان دابەزاندوون، هەردوو خوێندنەوەكەی هاتوون، ﴿ وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾، خواش هەر كەسێكی بوێ، بەرەو ڕاستە شەقامی خۆی ڕێنمایی دەكات، یاخود: هەر كەسێكی بوێ دەیخاتە سەر ڕاستە شەقامی خۆی، كە لە قورئانی خواو ڕێبازی پێغەمبەری پێشەوادا ﷺ بەرجەستەیە.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**وەسفكردنی خوا بە ڕووناكیی ئاسمانەكان و زەوی و، وێنە هێنانەوە بۆ ڕووناكییەكەی بە چرایەكی زۆر تیشكدەر، كە لە تاقێكدا دانراوەو، سووتەمەنییەكەی ڕۆن زەیتێكی زۆر باشە، پاشان باسی ماڵانێك كە پیاوانێك بەردەوام یادی خوایان تێدا دەكەن، كە بازرگانیی و مامەڵە لە یادی خواو نوێژو زەكات نایانخافڵێنن و، مەترسیی قیامەتیان هەیەو، خواش باشترین پاداشتیان دەداتەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشۡكَوٰةٖ فِيهَا مِصۡبَاحٌۖ ٱلۡمِصۡبَاحُ فِي زُجَاجَةٍۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوۡكَبٞ دُرِّيّٞ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٖ مُّبَٰرَكَةٖ زَيۡتُونَةٖ لَّا شَرۡقِيَّةٖ وَلَا غَرۡبِيَّةٖ يَكَادُ زَيۡتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوۡ لَمۡ تَمۡسَسۡهُ نَارٞۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٖۚ يَهۡدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَيَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَٰلَ لِلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٣٥﴾ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرۡفَعَ وَيُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ ﴿٣٦﴾ رِجَالٞ لَّا تُلۡهِيهِمۡ تِجَٰرَةٞ وَلَا بَيۡعٌ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوۡمٗا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلۡقُلُوبُ وَٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴿٣٧﴾ لِيَجۡزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحۡسَنَ مَا عَمِلُواْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضۡلِهِۦۗ وَٱللَّهُ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴿٣٨﴾ ﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست (٢٠) بڕگەدا:

١)- ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، خوا ﷻ ڕووناكیی ئاسمانەكان و زەوییە، ئێمە دواتر كورتە باسێك لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەكەوە دەكەین، بە تایبەت ئەم ڕستەیەی: ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، بەڵام ئێستاش وەك پێش دەستیی، چەند شتێكی لە بارەوە دەڵێین:

یەکەم: (الطبري)، پێشەوای ڕوونکەرەوەکانی ماناو مەبەستەکانی ئایەتەکانی قورئان، سێ واتای بۆ ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، هێناون:

١- دەڵێ: ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾: {هَادِي مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، فَهُمْ بِنُورِهِ إِلَى الحَقِّ يَهْتَدُونَ، وَبِهُدَاهُ مِنْ حَيْرَةِ الضَّلَالَةِ يَعْتَصِمُونَ}[1].

واتە: ڕێنماییکارو ڕاستە ڕێکاری هەر کەسێك کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، کە بە ڕووناکیی خوا ڕێ بەرەو هەق دەدۆزنەوەو، بە هۆی ڕێنمایی خواوە، لە سەرگەردانیی و گومڕایی خۆیان دەپارێزن.

٢- ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، یانی: {أللهُ مُدَبِّرُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، فِيهِمَا نجومهما وَشَمْسهما وَقَمَرهما}[2]، خوا ﷻ کارو باری گەردوون، ئاسمانەکان و زەوی، بە ئەستێرەکان و خۆرو مانگەوە، هەڵدەسووڕێنێ و مشووریان دەخوات.

٣- ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾: {الضياء: ضِيَاء السَّمَوَات وَالأَرْض}[3]، خوا ڕۆشنایی ئاسمانەکان و زەوییە.

دووەم: خاوەنی (البحر المديد في تفسير القرآن المجيد)، کە بە (إبن العجيبة)، ناسراوە، لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ: {﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، أي: مُنَوِّرُ أهْلِهما بنور الإسلام، لأهل الإسلام، وبنور الإيمان لأهل الإيمان، وبنور الإحْسَانِ لأهل الإحْسَان}[4].

واتە: خوا ڕۆشنکەرەوەی خەڵکی ئاسمانەکان و زەوییە، ئەهلی ئیسلام بە ڕووناکیی ئیسلام و، ئەهلی ئیمان بە ڕووناکیی ئیمان ڕووناك دەکاتەوەو، ئەهلی ئیحسانیش بە ڕووناکیی ئیحسان (کە ئیحسان باشترین جۆری ئیمان و دینداریيە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە).

---

(١ ) جامع البيان: ج١٨، ص١٤٥، ١٤٦.

(٢ ) جامع البيان: ج١٨، ص١٤٥، ١٤٦.

(٣ ) جامع البيان: ج١٨، ص١٤٥، ١٤٦.

(٤ ) البحر المديد في تفسير القرآن المجيد: ج٥، ص١٧٧.

**سێیەم: (محمد الطاهر بن عاشور)، دەڵێ: [وَالنُّورُ: حَقِيقَتُهُ الْإِشْرَاقُ وَالضِّيَاءُ، وَهُوَ اسْمٌ جَامِدٌ لِمَعْنًى، فَهُوَ كَالْمَصْدَرِ، فَالإِخْبَارُ عَنِ اللهِ تَعَالَى بِأَنَّهُ نُورٌ، إِخْبَارٌ بِمَعْنًى مَجَازِيٍّ لِلنُّورِ لاَ مَحَالَةَ بِقَرِينَةِ أَصْلِ عَقِيدَةِ الإِسْلامِ، أَنَّ اللهَ تَعَالَى لَيْسَ بِجِسْمٍ، وَلا جَوْهَرٍ وَلا عَرَضٍ][1].**

دەڵێ: ڕووناکیی چییەتەکەی بریتییە لە ڕووناککردنەوەو درەوشانەوە، وشەی (نُورُ)یش ناوێکی قاڵب بەستوویە بۆ مانایەك، لەبەر ئەوەی وەك چاوگ وایە، بۆیە هەواڵدان لە بارەی خوای بەرزەوە کە ڕووناکییە، هەواڵدانە بە مانایەکی مەجازیی بۆ (نور)، هیچ گومانی تێدا نیە، [نابێ بڵێی: ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، واتە: ئەو ڕووناکییە کە ئێمە دەیبینین]، بە بەڵگەی ئەوە کە لە عەقیدەی ئیسلامییدا وایە: خوای بەرز نە جیسمە، نە جەوهەرە، نە عەرەزە، [جەوهەر ئەوەیە شتێك لە زاتی خۆیدا هەبێ، عەرەزیش سیفەتی ئەو شتەیە وەك: (گوڵ)و، (بۆن)ەکەی و (ڕەنگ)ەکەی].

کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، هیچ گومانی تێدا نیە، مەبەست ئەو ڕووناکییە نیە کە لە مانگ و خۆرو ئەستێرەکان دایە، چونکە ئەوە شتێکی ماددییە، دواییش زیاتر ڕوونی دەکەینەوە، کەواتە: ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، دەتوانین بڵێین: بە پێنج شێوە دەگونجێ مانا بکرێ:

**١- (ألله موجد السماوات والأرض)، يان (خالق السماوات والأرض)، خوا پەیداکەرو بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە، کە ئاسمانەکان و زەوی لە تاریکیی نەبوون دەرهێناون بۆ ڕووناکیی بوون.**

**٢- (ألله مُنوِّر السموات والأرض بالنجوم)، خوا ڕوونکەرەوەی ئاسمانەکان و زەوییە، بە ئەستێران، ئەستێرەکانیش ئاسمانەکان پێك دێنن و، خۆرو مانگیش بە نسبەت ئێمەوە، خوا ئەو گەردوونەی ڕووناك کردۆتەوە.**

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٨، ص٢٣١.

٣- (ألله هادي السموات والأرض ومن فيهن)، خوا ڕێنماییکارو ڕێپێشاندەری ئاسمانەکان و زەویی و، خەڵکی نێو ئاسمانەکان و زەوییە.

٤- (ألله مدبِّر السموات والأرض ومن فيهن)، خوا هەڵسوڕێنەرو مشوورخۆری گەردوون و، خەڵك و دانیشتووانی نێو گەردوونە، بە فریشتەو مرۆڤ و جندەوەو، بە هەر دروستکراوێکی دیکەی خوالوە، کە ئێمە نایانزانین.

٥- (ألله جاعل العدل والإتزان في السموات والأرض)، خوا ڕۆشنایی ئاسمانەکان و زەوییە، یانی: خوا ئەم گەردوونەی بە هاوسەنگیی داناوەو دادگەریی تێدا بەر قەرار کردوە، هەروەك لە زمانی زۆر لە میللەتاندا عورفێکی باوە، کە دادگەریی بە ڕووناکیی و، زوڵم و ستەم بە تاریکیی تەعبیر دەکرێن، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {اتَّقُوا الظُّلْمَ، فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ}، (أخرجه أحمد: ١٤٥٠١، وعبد بن حميد: ١١٤٣، والبخاري في الأدب: ٤٨٣، ومسلم: ٥٧٨)، واتە: خۆتان لە ستەم بپارێزن، ستەم تاریکیی ڕۆژی قیامەتە، ئەوە بە نسبەت ئەم ڕستەیەوە، کە دواتریش هەر زیاتر قسەی لەسەر دەکەین.

ئنجا خوا ﷻ بۆ ئەوەی تێمان بگەیەنێ: چۆن خوا ڕووناکیی ئاسمانەکان و زەوییە؟ وێنە دێنێتەوە بۆ ڕووناکییەکەی خۆی:

٢)- ﴿مَثَلُ نُورِهِۦ﴾، وێنەی ڕووناکیی خوا، (المثلُ: تشبيهُ حَالٍ بحَال)، کە ڕووناکیی خوا بریتیە لە چوێنراو (مُشَبَّه)، تاقەکەش کە چرایەکی تێدایە، وێچوێنراو (مشبَّه به) ە و ئەوەیە کە ڕووناکیی خوای وێچوێندراوە، ئنجا خوا ڕوونی دەکاتەوەو دەفەرموێ، ڕووناکیی خوا ﷻ:

٣)- ﴿كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ﴾، وەك تاقێکە چرایەکی تیدایە، (مِشْكَاة)، یانی: تاقێك کە دەرەو دیو نەبێ: (المِشْكَاة كُوَّة غَيْرِ نَافِذَة)، ئەگەر دەرەو دیو بێ، پەنجەرەی پێ دەڵێن (شُبَّاك)، بەڵام ئەگەر لایەکی کراوە بێ و سێ لای داخراو بن، تاق(كوَّة)ی، پێدەڵێن.

(مصباح) ناوە بۆ ئەو دەفرە کە زەیتەکەی تێ دەکرێ، (مصباح)، لەسەر کێشی (مِفتاح)ە، لە (صبح)ەوە هاتوە، (صُبْح): سپێدەی بەیان، درەوشاوەیی بەیان، ئنجا ئایا ئەو چرایە لە چی دایە؟

٤)- ﴿ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ﴾، ئەو چراو ڕووناکییە لە نێو شووشەیەك دایە، (زجاجة)ش، ناوە بۆ ئەو دەفرە، کە ڕووناکییەکەی تێدایە، شۆقەکەی تێدایە.

٥)- ﴿ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ﴾، شووشەکە وەك ئەستێرەیەکی گەوهەریی وایە، ئەستێرەیەك کە وەك چۆن گەوهەر دەدرەوشێتەوە، ئاوا بدرەوشێتەوە، بە نسبەت تێمەوە، ئەگەرنا ئەستێرەکان حیسابیان لەوەدا نیە کە بەس بدرەوشێنەوە! (الكَوْكَبُ: النَّجْمُ، الدُرّي: وَاحِد الدَّرارِي، وَهِيَ الكَوَاكِبُ السَّاطِعَة مَنسُوبَةٌ إلى الدُّرِّ هي صفَاء اللَّونِ وَبَيَاضِه)، (کوکب)، یانی: ئەستێرە، (دُرّي)یش، یەك دانەی (الدَّراري)یە، کە ئەو ئەستێرانەن زۆر درەوشاوەن و، پاڵ دراونە لای (الدُرّ)، یانی: گەوهەر، لە سافیی ڕەنگەکەیان و سپێتیی و درەوشاوەییاندا، گەوهەریین.

وشەی (دُرِّىٌّ) خوێنراویشەتەوە: (دُرِيٌّ)و خوێنراویشتەوە: (دِريٌّ)، ئنجا ئەگەر (دُرِّىٌّ)، بێت، واتە: گەوهەریی، بەڵام ئەگەر (دُرِيٌّ)، یان (دِريٌّ) بێ، لە (دَرْء)ەوە هاتوە، واتە: دڕ بە تاریکیی دەدات و تاریکیی لادەبات، بە هۆی شەوق و ڕۆشنایییەکەیەوە.

٦)- ﴿يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ﴾، (ئەو چرایە کە لە نێو ئەو شووشەیە دایە، کە وەك گەوهەر وایە، وەك ئەستێرەیەکی گەوهەریی وایە)، لە درەختێکی پڕ پیت و پێزەوە سووتەمەنییەکەی بۆ دێ، ئنجا ئایا ئەو درەختە پڕ پیت و پێزە چییە؟!

٧)- ﴿زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ﴾، درەختێکی زەیتوونە، نە ڕۆژهەڵاتییەو نە ڕۆژئاوایی، واتە: ئەوە نیە کە تەنیا لە کاتی خۆرهەڵاتن دا، تیشکی خۆری لێبدات و، واش نیە کە تەنیا لە کاتی خۆر ئاوابووندا، تیشکی خۆر لێبیدات، بەڵکو هەم لە کاتی ڕۆژهەڵاتدا، پێش نیوەڕۆ، هەم دوای نیوەڕۆ، ئەو باخی زەیتوونە، تیشکی خۆری دەکەوێتێ، لە شوێنێکی

بەرزی وایە، کە نە تەنها ڕۆژهەڵاتییەو نە تەنیا ڕۆژئاوایی، بەو واتایە کە بەس پێش نیوەڕۆ خۆری لێبدات، یان بەس دوای نیوەڕۆ، بەڵکو پێش نیوەڕۆو دوای نیوەڕۆ، تیشکی خۆری دەکەوێتێ، ئەو کاتەش ئەو درەختە بە تەئکید چاکتر دەبێ، بەرهەمەکەی باشتر دەبێ و ئەو درەختی زەیتوونانە، زەیتەکەیان ڕوونتر دەبێ، واتە: لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادایە، نە بە تەنیا ڕۆژهەڵاتییەو، نە بە تەنێ ڕۆژئاواییە، ئەوە وەك ئەو تەعبیرە وایە کە دەڵێ: (لا حَرٌ ولا قَرٌ)، نە گەرمەو نە ساردەو، لە نێوانیان دایە.

٨)- ﴿ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ﴾، نیزیکە زەیتەکەی بدرەوشێتەوە، بێ ئەوەی ئاگری بگاتێ، زەیت دەبێ ئاگری بگاتێ، ئنجا دادەگیرسێ، کاتێ خۆی زەیتیان بەکارهێناوە بۆ چرا، لە جیاتی نەوت کە ئێستا بەکاردێ، دەفەرموێ: زەیتەکەی هێندە ساف و ڕوونە، خەریکە خۆی گڕ بگرێ، بێ ئەوەی ئاگری بگاتێ.

٩)- ﴿ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ﴾، واتە: (هُوَ نُورٌ عَلَى نُور)، ئەو ڕووناکییە، ڕووناکییەکی لەسەر یەك کەڵەکە بووە، ڕووناکییەکی چەند قاتە.

١٠)- ﴿ يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ ﴾، خوا بەرەو ڕووناکیی خۆی، هەر کەسێکی بوێ ڕاستە ڕێی دەکات، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ ﴾، چونکە لێرەدا پرسیارێك دەکرێ: باشە مادام ڕووناکیی خوا ﷻ وێنەی بەوە بۆ هێنراوەتەوە: تاقێك چرایەکی تێدا دانرابێ، ئەو چرایە لە نێو شووشەیەك دابێ، شووشەکە وەك ئەستێرەیەکی درەوشاوەی گەوهەریی وابێ و، بە زەیتێك بئایسێ، کە ئەو زەیتە لە درەختێکی زەیتوونەوە بێ، هەم ڕۆژهەڵاتیی و هەم ڕۆژئاوایی بێ و، هێندە ساف و چاك بێ خەریك بێ بۆ خۆی دابگیرسێ، بێ ئەوەی ئاگری بگاتێ، مادام ڕووناکیی خوا ئاوایە، هیدایەتی خوا ئاوایە، (کە بێگومان مەبەست لە ڕووناکیی لێرەدا یانی: ڕووناکیی هیدایەتی خوا)، ئەدی بۆچی هەندێ کەس ئەو هیدایەتە وەرناگرن و پێی ڕاستە ڕێ کراو (مهتدي) نابن و؟ بەر پێی خۆیانی پێ نابینن؟ خوا عزوجل، وەڵامی ئەوە دەداتەوە: ﴿ يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ ﴾، خوا بۆ ئەو ڕووناکیی هیدایەتەی خۆی، هەر کەسێکی بیەوێ ڕاستە ڕێی

دەكات و، دەیخاتە بەر شۆق و ڕۆشنایی ئەو هیدایەتەی خۆی، كە بریتیە لە قورئان و ئیسلام و، ئەو پەیامەی خوا بە پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ ناردوویەتی.

١١)- ﴿ وَيَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَٰلَ لِلنَّاسِ ﴾، خواش وێنان بۆ خەڵكی دێنێتەوە، تاكو بە هۆی وێنە هێنانەوەوە، ماناو مەبەستە مەعنەوییەكان، لە قاڵبێكی ماددییدا بەرجەستە بن و، مرۆڤ باشتر لێیان تێبگات.

١٢)- ﴿ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴾، خواش بە هەموو شتێك زانایە، واتە: هیچ شتێكی لێ ون نابێ، ئنجا لە نێو ئەو شتانەدا كە لێی ون نابن، ئەو كەسانەن كە ئەو هیدایەتەی خوا، بەو ڕۆشنیی و، درەوشاوەییە، قبووڵ ناكەن و لێی بەهرەمەند نابن!

١٣)- ﴿ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرۡفَعَ ﴾، لە ماڵانێكدا خوا مۆڵەتی داوەو فەرمانی كردوە: بەرز ڕابگیرێن.

ئایا ئەم ( فِي بُيُوتٍ ) پەیوەست دەبێتەوە بە كوێوە؟ زانایان لەو بارەوە چەند ڕایەكیان هەن:

١- هەندێكیان گوتوویانە: ڕووناكیی هیدایەتی خوا، لە ماڵانێكدایە، كە مەبەست پێیان مزگەوتەكانە، یانی: لەوان دا بۆی بگەڕێن.

٢- هەندێكیش گوتوویانە: ئەو تاقە، كە ئەو چرایەی تێدایە، لە ماڵانێكدایە، كە مزگەوتەكانن.

٣- هەندێكیش گوتوویانە: ئەو چرایە لە ماڵانێك دایە.

٤- هەندێكیش گوتوویانە: پەیوەست دەبێتەوە بە پیاوانێك (رجال) كە دوایی دێ، پیاوانێك یادی خوا دەكەن لە نێو ماڵانێك، مزگەوتانێك دا، ﴿ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرۡفَعَ ﴾، ئەو ماڵانە خوا مۆڵەتی داوەو، فەرمانی كردوە كە بەرز بكرێنەوە، ئەویش سێ واتای هەن:

أ- لە كاتی بنیاتنان دا بەرز بكرێنەوە، بە بەرزكردنەوەی بەرهەست و ماددیی.

ب- بە مەزن بگیرێن و ڕێزو حورمەتیان لێ بگیرێ، بە بەرزكردنەوەی مەعنەویی بەرز بكرێنەوە.

ج- هەردوو واتایەکەی پێکەوەو وێکرا: هەم لە ڕووی مادییەوە، باش دروست بکرێن و بەرز بکرێنەوە، هەم لە ڕووی مەعنەوییەوە، ڕێزیان لێ بگیرێ و، پاک ڕابگیرێن و بەندایەتیی خوایان تێدا بکرێ.

١٤)- ﴿ وَيُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ ﴾، هەروەها ناوی خوایان تێدا بهێنرێ، یانی: خوا فەرمانی کردووەو مۆڵەتی داوە: ئەو ماڵانە: هەم بەرز بکرێنەوە، هەم بەرز ڕابگیرێن، هەم ناوی ویبان تێدا بهێنرێ.

١٥)- ﴿ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْآصَالِ رِجَالٌ ﴾، کە لەو ماڵانەدا، لەو مزگەوتانەدا، پیاوانێك خوا بە پاك دەگرن، بەیانیان و ئێواران.

﴿ رِجَالٌ ﴾، پیاوانێك، کە مەبەست پێیان هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرە ﷺ بە پلەی یەکەم.

(غدوّ) کۆی (غَدوَة)، یانی: بەرەبەیان، لەو کاتەوە کە خەڵك دەردەچێ بۆ ئیش و کار، (الآصَالِ)یش، کۆی (أَصیل)ە، واتە: نیوەی دووەمی ڕۆژگار، دوای نیوەڕۆ، بەیانیان و ئێواران، پێش نیوەڕۆیان و دوای نیوەڕۆیان، پیاوانێك خوا بە پاك دەگرن، لەو ماڵانەی خوادا، کە چۆنن؟

١٦)- ﴿ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ ﴾، نە بازرگانیی، نە کڕین و فرۆشتن، سەرقاڵیان ناکات، لە یادی خوا، (بە گشتیی)، هەروەها (بە تایبەت) لە بەرپا کردنی نوێژ، هەروەها لە زەکات دان.

یادی خوا گشتییە، بەڵام بەرپاکردنی نوێژ شتێکی تایبەتە، لە ڕووی مەعنەوییەوەو، زەکات دان و ماڵ بەخشین، شتێکی تایبەتە لە ڕووی مادییەوە، یادی خواو بەندایەتیی بۆ خواش دەبێتەوە بەو دوو بەشە: ڕووی مەعنەویی، ڕووی مادديی، یاخود وەك پەیوەندیی لەگەڵ خواو پەیوەندیی لەگەڵ خەڵکی خوادا، کە نوێژ تایبەترین جۆری پەیوەندییە لەگەڵ خوادا ﷻ، ئەو بەندایەتییەی

مـرۆڤ لـە نوێـژدا بەرجەسـتە دەبـێ، چ لـە ڕاوەسـتاندا، چ لـە چەمینـەوەدا، چ لـە کڕنـووش بردنـدا، چ لـە تەحییـات خوێندنـدا، لـە هیـچ شـتێکی دیکـەدا ئـەو هەمـوو ملکەچیـی و، خـۆ بـە کـەم گرتنـەو بەندایەتیـی مـرۆڤ بـۆ خـوا، بەرجەسـتە نابـێ، زەکاتیـش بەرجەسـتە کـەری لایەنـی ماددیـی دینداریيـە، یاخـود ڕوونکـەرەوەی جـۆری پەیوەندیـی مرۆڤـە بـە خەڵکـەوە، کـە بریتیـە لـەوەی هاوکاریـان بـێ و مـاڵ و سـامانی خـۆی پێیـان ببەخشـێ.

ئنجـا ئایـا چ شـتێك هانـدەرو پاڵنەریانـە ئـەو پیاوانـەی لـەو ماڵانـەی خـوادا بـەو شـێوەیە یـادی خـوا دەکـەن و، بازرگانیـی و کڕیـن و فرۆشـتن بێئاگایـان نـاکات لـە یـادی خـواو، لـە نوێـژ بەرپاکـردن و زەکاتـدان؟

١٧)- ﴿يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَـٰرُ﴾، لە ڕۆژێك دەترسێن، دڵەکان و چاوەکان تێیدا هەڵدەگەڕێنەوە، واتە: لە بەڵاو ناڕەحەتیی و مەترسییەکانی ڕۆژێك دەترسێن، نەك لە خودی ڕۆژەکە بترسێن، یانی: لێرەدا پاڵدراو (مضاف)ێك فڕتێنراوە، (يَخَافُونَ أَهْوَالَ يَومٍ)، کە مەبەست پێی ڕۆژی دواییە، ئایا لەو ڕۆژەدا چی ڕوودەدات؟!، دڵەکان و چاوەکان تێیدا هەڵدەگەڕێنەوە، چاوەکان و دڵەکان تێیدا ئۆقرە ناگرن، دێن و دەچن، ئنجا ئینسان کاتێ دەکەوێتە نێو مەترسییەوە، هەم دڵی زیاتر لێ دەدات و، جووڵە جووڵ دەکات، هەم چاویشی لەسەر یەك شت چڕ داناگرێ، بەڵکو تەماشای ئەملا دەکات، تەماشای ئەولا دەکات، چاوی دەسوورێ، داخۆ مەترسییەکە لە کوێوە دێ؟!

١٨)- ﴿لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟﴾: تاکو خوا بەپێی باشترینی ئەوەی کردوویانە، پاداشتیان بداتەوە.

أ- ئەمە دەگونجێ پەیوەست بێتەوە بە ڕستەی: ﴿لَّا تُلْهِيهِمْ﴾، واتە: بۆیە بازرگانیی و کڕین و فرۆشتن لە یادی خواو لە نوێژو زەکات، بێ ئاگایان ناکات، تاکو خوا بە پێ باشترینی کردەوەکانیان پاداشتیان بداتەوە.

ب- یاخود: پەیوەستە بە: ﴿ يَخَافُونَ ﴾، یانی: بۆیە دەترسێن لەو ڕۆژە، تاکو خوا ﷻ بە باشترینی کردەوەکانیان پاداشتیان بداتەوە.

﴿ لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ ﴾، ئەمەش دوو واتای هەن:

أ- تاکو خوا پاداشتی باشترینی ئەوەی کردوویانە، بیانداتەوە، کە مەبەست کردەوە باش و پەسندەکانیانە.

ب- خوا باشترینی کردەوەکانیان دەکاتە پێوەر بۆ پاداشت دانەوەیان.

١٩)- ﴿ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦ ﴾، هەروەها لە بەخششی خۆی بۆشیان زیاد دەکات.

٢٠)- ﴿ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾، خواش بژیو بە هەر کەسێك دەدات، بە بێ ژماردن و دیارییکردن، بەنسبەت بەندەکانەوە، ئەگەرنا هەموو شتێك بۆخوا ژمێردراو و زانراوە، هەڵبەتە مەبەستیش لە (بِغَيْرِ حِسَابٍ ) زۆریی پاداشتەکەیە، چونکە شتی زۆر ناژمێررێ.

(رِزق) بژیو، بریتیە لە بەخششی خوا، چ پەیوەندیی بە دنیاوە هەبێ، کە ئەویش ماڵ و سامانە، عەقڵە، زانیارییە، ڕەوشتە، ...هتد، چ پەیوەندیی بە ڕۆژی دواییەوە هەبێ، بژیوی ڕۆژی دواییش لە بەهەشتداو لە نازو نیعمەتەکانی بەهەشتدا، بەرجەستە دەبێ.

## کورتە باسێک
## دە (١٠) دەقی سوننەت لە بارەی
## مامەڵەکردنەوە لەگەڵ مزگەوتان دا

لێرە بە پێویستی دەزانم کە باسی ماڵەکان کرا (ماڵەکانی خوا، مزگەوتەکان)، چەند فەرموودەیەك لە بارەی مزگەوتەوە بێنین، کە سەرجەم دە (١٠) فەرموودەن و، تیشکمان بۆ دەخەنە سەر چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ماڵەکانی خوادا:

**١- {عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَتَّخِذَ الْمَسَاجِدَ فِي الدُّورِ، وَأَنْ تُطَهَّرَ وَتُطَيَّبَ}، (أخرجه أبو داود: ٤٥٥، والترمذي: ٥٩٤، وابن ماجه: ٧٥٩).**

واتە: دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین، کە لە گەڕەکەکاندا مزگەوتان دروست بکەین و، پاك ڕابگیرێن و، بۆن خۆش بکرێن (پاك و چاك ڕابگیرێن).

٢- پێغەمبەر ﷺ هۆشداریی دەدات بە موسوڵمانان، کە مزگەوت دروست کردن نەکەنە شوێنی پێشبڕکەو خۆ هەڵنان و، خۆ بەسەر یەکدیدا هەڵکێشان، دەفەرموێ: **{لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَبَاهَى النَّاسُ فِي الْمَسَاجِدِ} (أخرجه أحمد: ١٢٤٠٢، وأبو داود: ٤٤٩، وابن ماجه: ٧٣٩، والدارمي: ١٤٠٨، وابن خزيمة برقم ١٣٢٢، وأبو يعلى: ٢٧٩٨، وابن حبان: ١٦١٤).**

واتە: ئاخیر زەمان نایەت (ئەو کاتەی دنیا تێیدا کۆتایی دێ نایەت) تاکو خەڵك بە مزگەوتانەوە، یاخود لە مزگەوتاندا خۆیان هەڵدەکێشن.

یانی: بە دروستکردنی مزگەوتان خۆیان هەڵدەکێشن، ناوی خۆیانیان لێ دەدەن، ئەو مزگەوتە کەسێك پارەیەکی زۆری لێ سەرف دەکات بۆ ئەوەی بڵێن: کێ دروستی کردوە؟ بڵێن: فڵانکەس، نەك مەبەستی ئەوە بێ: بەندایەتیی بۆ

خوا تێدا بکرێ، بەڵکو ڕەنگە هی وا هەبێ - هەر چەندە ئەو ڕەنگە کەمیش بێ - مزگەوتیش دروست بکات، بەڵام بۆ خۆی ئەهلی مزگەوت نەبێ!.

مانایەکی دیکەشی هەیە، کە بریتیە لە: خۆهەڵکێشان و خۆ بادان بەسەر خەڵک دا لە مزگەوتان دا!

**٣- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {مَنْ أَكَلَ الْبَصَلَ، وَالثُّومَ، وَالْكُرَّاثَ، فَلا يَقْرَبَنَّ مسْجِدَنَا، فَإِنَّ الْمَلائِكَةَ تَتَأَذَّى مِمَّا يتأَذَّى مِنْهُ بَنُو آدمَ} (أخرجه البخاري: ٨٥٤، ومسلم: ٥٦٤).**

واتە: هەر کەسێك پیوازو سیرو کەوەری خوارد، با توخنی مزگەوتەکەمان نەکەوێ، چونکە فریشتەکانیش ناڕەحەت دەبن، بەوەی کە وەچەی ئادەم پێی ناڕەحەت دەبن (واتە: بە بۆنی ناخۆش)!.

هەڵبەتە پێم وانیە بۆن خڵتەی جگەرە، هەروەها بۆن ئارەقەی چەند جار دووبارە بووەوە، کە کابرا خۆی ناشوات، لە بۆنی پیوازو سیرو کەوەر، ناخۆشتر نەبێ، کەواتە: ئەوانیش هەمان حوکمیان هەیە، هەر بۆیەش لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە فەرموویەتی[1]: چی دەبێ، ئەگەر یەکێکتان دوو پۆشاکی هەبن، یەکیان بۆ ئیش و کاری، ئەوی دیکەشی بۆ مزگەوت و چوونە کۆڕو مەجلیسی موسڵمانان! تاکو خەڵك بە بۆنی ئارەقەو ناخۆشی، بێزار نەبن.

**٤- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ هَذِهِ الْمَسَاجِدَ لاَ يَصْلُحُ فِيهَا شَيْءٌ مِنْ كَلَامِ النَّاسِ، إِنَّمَا هِيَ التَّسْبِيحُ وَالتَّكْبِيرُ وَقِرَاءَةُ الْقُرْآنِ}، (أخرجه أحمد برقم ٢٣٨١٣، ومسلم: ٢٣٧، وأبو داود: ٩٣٠، والنسائي: ١٢١٨).**

واتە: ئەم مزگەوتانە هیچ شتێك لە قسەی خەڵکیان تێدا شایستە نیە، (واتە: ئەو قسانەی کاتی ئاسایی و لەشوێنە ئاساییەکاندا دەکرێن)، بەڵکو تەنیا شوێنی خوا بە پاککرتن و، خوا بە گەورە گرتن و، قورئان خوێندنە.

---

(١) {عَنْ نَافِعٍ عَنْ ابْنِ عُمَرَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْ قَالَ قَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ إِذَا كَانَ لِأَحَدِكُمْ ثَوْبَانِ فَلْيُصَلِّ فِيهِمَا فَإِنْ لَمْ يَكُنْ إِلَّا ثَوْبٌ وَاحِدٌ فَلْيَتَّزِرْ بِهِ وَلَا يَشْتَمِلْ اشْتِمَالَ الْيَهُودِ} أخرجه أبو داود: ٦٣٥، وصححه الألباني.

٥- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ، فَلْيَقُلْ: اَللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ، وَإِذَا خَرَجَ، فَلْيَقُلْ: اَللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ} (أخرجه مسلم: ٧١٣، وأبو داود: ٤٦٥، والدارمي برقم ٢٦٩١، والبزار: ٣٧٢٠، وابن حبان: ٢٠٤٨).

واتـە: ئەگـەر یەکێکتـان چـووە مزگـەوت، بـا بڵـێ: ئـەی خوایـە! دەروازەکانـی بـە بەزەیـی خۆتـم بـۆ بکـەوە، کاتێـك لـە مزگەوتیـش چـووە دەرێ، بـا بڵـێ: ئـەی خوایـە! لـە بەخششـی تـۆ داوا دەکـەم.

یـانی: ڕزقـی حەڵاڵـم بـە قسـمەت بکـە، کارو کاسـبیم بـۆ ئاسـان بکـە، بـۆ ئـەوەی ڕزقـی حەڵاڵـم دەسـت بکـەوێ، کـە ئەویـش بەخششـی تۆیـە.

کەواتـە: ئینسـانی مسـوڵمان کـە دەچێتـە ماڵـی خـوا، داوای بەزەیـی خـوا دەکات، لـە دەرەوەی ماڵـی خـواش داوای بەخششـی خـوا دەکات.

٦- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ} (أخرجه البخاري: ٤٤٤، ومسلم: ٧١٤).

واتە: هەر کات یەکێکتان چووە مزگەوت، با پێش ئەوەی دابنیشێ، دوو ڕکات بکات.

پێی دەگوترێ: (رَكْعَتَيْ تحيّة الْمَسْجِدِ)، دوو ڕکاتی سڵاوکردن لە مزگەوت.

٧- {كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ، يَقُولُ: «بِسْمِ اللَّهِ وَالسَّلَامُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي، وَافْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ»، وَإِذَا خَرَجَ قَالَ: «بِسْمِ اللَّهِ، وَالسَّلَامُ عَلَى رَسُولِ اللهِ، اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي، وَافْتَحْ لِي أَبْوَابَ فَضْلِكَ} (أخرجه الترمذي: ٧١٤، وابن ماجه: ٧٧١).

واتـە: پێغەمبـەر ﷺ کـە دەچـووە مزگـەوت دەیفەرمـوو: بـە نـاوی خـوا، سـەلام لەسـەر پێغەمبـەری خـوا، ئـەی خوایـە! لـە گوناهەکانـم ببـوورە، دەروازەکانـی بەزەیـی خۆتـم بـۆ بکـەوە، کاتێـك لـە مزگەوتیـش دەچـووە دەرێ، دەیفەرمـوو: بـە نـاوی خـواو، سـەلام لەسـەر پێغەمبـەری خـوا ﷺ، ئـەی خوایـە! لـە گوناهەکانـم ببـوورە، دەروازەکانـی بەزەیـی و بەخششـی خۆتـم بـۆ بکـەوە.

٨- پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویَ: [مَنْ غَدَا إِلَى الْمَسْجِدِ أَوْرَاحَ، أَعَدَّ اللهُ لَهُ نُزُلَهُ مِنْ الْجَنَّةِ، كُلَّمَا غَدَا أَوْ رَاحَ] (أخرجه البخاري: ٦٦٢، ومسلم: ٦٦٩).

واتـە: هـەر کەسـێك بەیانیـان بچێتـە مزگـەوت، یـان ئێـواران، (یانـی: لـە هـەر کاتێکـدا)، خـوا مەنزڵێکـی لـە بەهەشـت بـۆ دادەنـێ، هـەر کاتێـك بەیانـی چـوو، یاخـود ئێـوارە چـوو، (یاخـود هـەر کاتـێ چـوو بـۆ مزگـەوت و لـە مزگـەوت هاتـەوە، لـە هـەردوو حاڵانـدا، خـوا پاداشـتی مەزنـی بـۆ دادەنـێ).

٩- [مَنْ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِهِ، ثُمَّ مَشَى إِلَى بَيْتٍ مَنْ بُيُوتِ اللهِ، لِيَقْضِيَ فَرِيضَةً مِن فَرَائِضِ اللهِ، كَانَتْ خَطْوَتَاهُ إِحْدَاهُمَا تَحُطُّ خَطِيئَةً، وَالأُخْرَى تَرْفَعُ دَرَجَةً] (أخرجه مسلم: ٦٦٦، وابن ماجه: ٧٧٤، ابن حبان: ٢٠٤٤).

واتـە: هـەر کەسـێك خـۆی پـاك بکاتـەوە، (مەبەسـتی ئەوەیـە دەسـت نوێـژ بگـرێ، یـان خـۆش بشـوات)، دوایـی بچێتـە ماڵێـك لـە ماڵەکانـی خـوا، بـۆ ئـەوەی فەرزێـك لـە فەرزەکانـی خـوا جێبەجـێ بـکات، دوو هەنگاوەکانـی، (واتـە: کـە پێیـەك هەڵدێنـێ و پێیـەك دادەنـێ)، یەکێکیـان خـوا گوناهـی پـێ دەسـڕێتەوەو، ئـەوی دیکەشـیان پلەیەکـی پـێ بـەرز دەکاتـەوە.

١٠- [صَلَاةُ الرَّجُلِ فِي جَمَاعَةٍ، تَزِيدُ عَلَى صَلَاتِهِ فِي بَيْتِهِ وَصَلَاتِهِ فِي سُوقِهِ، بِضْعًا وَعِشْرِينَ دَرَجَةً]، (أخرجه أحمد: ٧٤٢٤، والبخاري: ٤٦٥، ومسلم: ٦٤٩، وأبو داود: ٥٥٩، وابن ماجه: ٧٩٩، وابن حبان: ٢٠٤٣).

واتـە: نوێـژی پیـاو بـە کۆمـەڵ، (واتـە: لـە مزگەوتـدا)، خێـری زیاتـرە لـە نوێژەکـەی لـە ماڵـێ، یاخـود لـە نوێژەکـەی لـە دووکانەکـەی و لـە بازاڕەکـەی دا، بـە بیسـت و ئەوەنـدە پلـە.

لـە ڕیوایەتەکانـی دیکـەدا هاتـوە بـە بیسـت و پێنـج (٢٥) پلـەو، لـە هەندێـك ڕیوایەتانـدا هاتـوە، بـە بیسـت و حـەوت (٢٧) پلـە.

## کورتە باسێک لە بارەی
## ئایەتی (٣٥)ی (النور)ەوە: ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾

لێرەدا کورتە باسێك لە بارەی ئایەتی (٣٥) سوورەتی (النور)ەوە، دەکەین، کە پێشتریش هەر قسەمان لێکرد، بەڵام پێویستی بەوە هەیە، تیشکی زیاتری بخەینە سەر، جارێ ئەم ئایەتە کە بە ئایەتی نوور ناسراوە، هەروەها سوورەتی (النور)یش، هەر بەوە ناو نراوە، زانایانی ئیسلام زۆریان قسە لە بارەوە کردوە، ئێمەش هەوڵ دەدەین لەم کورتە باسەدا لە هەشت (٨) بڕگەدا ئەوەی بە پێویستی بزانین لە بارەیەوە بیڵێین، چ وەك پوختەو گوشراوی قسەی زانایان، چ وەك ڕاو بۆچوونی تایبەتی خۆشمان:

### ١- ئەم ئایەتە بە ئایەتەکانی پێش خۆیەوە پەیوەستە:

بەڕێــــــــزان!

هەمیشە ئایەتەکانی قورئان پێکەوە پەیوەستن و، ئەوە نیە وەك گوتراوە: (هەر تیرە لە کەندالێك)، بەڵکو وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك، وەك دەنکەکانی تەسبیحێك پێکەوە پەیوەستن، بەڵام زۆر جاران بۆ دۆزینەوەی چۆنیەتی پێکەوە پەیوەست بوونیان، پێویستیی بە ڕامان و قووڵ دا چوون دەکات، بۆیەش خوا ﷻ ئەوەندە فەرمانمان پێ دەکات کە ورد بینەوە لە قورئان وتێوەی ڕامێنین:

أ- ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾ص.

ب- ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ ﴾محمد.

لێرەش خوا ﷻ دوای ئەوەی حوکمە پێشووەکانی ڕوونکردنەوە، کە هەموویان حوکمی گەورەو هەستیار بوون، ئنجا خوا ﷻ لەم ئایەتی (٣٥)دا، ڕایدەگەیەنێ کە وەك چۆن بە هۆی وەحیی و هیدایەتی خواوە، ژیانی مرۆڤەکان ڕۆشن دەبێتەوە، خواش ﷻ ڕوونکەرەوەی سەرتاپای بوونە بە سەرو خوارییەوە، واتە: ئایەتەکانی پێشێ ڕوونکەرەوەی ژیانی مرۆڤ بوون، ژیانی خێزان و کۆمەڵگا بوون، بە هۆی ئەو حوکمە شەرعییانەوە، کە دەیانپارێزن لە هەڵەو لادان، یان کاتێك تووشی گرفت و کێشەیەك بوون، ئەو حوکمە شەرعییانە، ئەو گرفت و کێشەیان بۆ چارەسەر دەکەن، تاکو زیاتر لێیان نەئاڵۆزکێن، بە هەمان شێوەش خوا ﷻ وەك چۆن ژیانی مرۆڤەکانی بە ئایەتەکانی و، حوکمە شەرعییەکانی ڕۆشن کردۆتەوە، گەردوونیشی بە ڕووناکی خۆی ڕۆشن کردۆتەوە، ئنجا چ مەبەست ئەوە بێ کە لە تاریکی نەبوون دەری هێناوە، بۆ ڕووناکیی بوون، چ مەبەست پێی سیستماتیك کردن و ڕێنمایی کردنی گەردوون بێ، چ مەبەست پێی ڕێنمایی کردنی ئەوانە بێ، کە لە نێو گەردوون دان، لە فریشتەکان و لە جنەکان و مرۆڤەکان، کە بە تەئکید وەك چۆن سیستم و ڕێك و پێکیی، ڕووناکییە، پاشا گەردانیی و فەوزاو بێ سەروبەرییش، تاریکییە.

هەروەها خوا ﷻ ئەو گەردوونەی ڕۆشن کردۆتەوە، کە بەرەو ئەو ئامانجەی خوای کارزان بۆ هەر کام لە دروستکراوەکانی داناوە، بۆی بچێ، بە تایبەت و کۆی گەردوونیش بە گشتیی، خوا ﷻ بێگومان بۆ هەر کام لە دروستکراوەکان، حیکمەت و ئامانجیکی داناوەو، بۆ کۆی گەردوونیش حیکمەت و ئامانجێکی داناوە، ئنجا هەموو ئەوانە بەرەو هێنانە دی ئەو ئامانجە لە جووڵە دان، خوا ﷻ بەو شێوەیە ئاسمانەکان و زەوی، یاخود گەردوونی بە سەرو خوارییەوە ڕۆشن کردۆتەوە.

**٢- خوا مایەی ڕووناکیی ئاسمانەکان و زەوییە، چ لەڕووی ماددیی و بە هەست و، چ لەڕووی پەنهان و مەعنەوییەوە:**

أ- لە ڕووی ماددیی و بەرهەستەوە، خوا فەرموویەتی: ﴿ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾طه، کاتێك فیرعەون لە مووساو هاڕوون (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ)، دەپرسێ: ﴿ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ ﴾طه، ئایا پەروەردگاری ئێوە، کێیە ئەی مووسا؟ مووسا عليه السلام وەڵامێکی زۆر کورت و پوخت و پڕ واتا دەداتەوە، دەفەرموێ: ﴿ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴾، پەروەردگارمان ئەو زاتەیە کە بوونی بە هەر شتێك داوەو، ڕێنماییشی کردوە، واتە: سیستمی بۆ داناوە، چۆن بەڕێوە بچێ؟ یانی: هەم بەهرەمەندی کردوە لە نیعمەتی بوون و، لە تاریکی نەبوون دەری هێناوە بۆ ڕووناکیی بوون (وجود)، هەم لە تاریکیی بێ سەرەو بەرەیی دەریهێناوە، بۆ ڕووناکیی سیستم و یاساداریی، هەر شتێك لە دروستکراوەکانی، خوا هەر لە گەردیلەوە تاکو کاهکەشان، هەمووی خوا جل جلاله ڕێنمایی کردوە.

هەروەها لە ڕووی ماددیی و بەر هەستەوە، خوا چۆن دروستکراوەکانی ڕۆشن کردوونەوە، لە سوورەتی (الأعلى)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴿١﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴿٣﴾ ﴾، ناوی پەروەردگاری هەرە بەرزت بە پاك بگرە، ئەو زاتەی کە هەموو شتێکی هێناوەتە دی و ڕێکیخستوە، ئەو کەسەی هەموو شتێکی ئەندازەگیریی کردووەو، ڕێنمایی کردوە.

ب- لە ڕووی مەعنەویی و نابەرهەستیشەوە، خوا فەرموویەتی: ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ۗ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤٤﴾ ﴾الإسراء، واتە: حەوت ئاسمانەکان و زەوی و هەر کەس کە تێیان دایە، خوا بە پاك دەگرێ و، هیچ شتێك نیە مەگەر بە ستایشکردنەوە خوا بە پاك دەگرێ، بەڵام ئێوە لە بە پاکگرتنەکەیان تێناگەن، بێگومان خوا هێدییمەندی لێبوردەیە.

کە ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (الإسراء)دا، کورتە باسێکمان لەو بارەوە کردوە.

**٣- وشەی نوور لە قورئاندا، خوا ﷻ هەم بۆ خۆی و، هەم بۆ سەرجەم ئەو شتانەی بەکارهێناوە، کە بە خواوە پەیوەستن، بەڵام بە واتا مەعنەوییەکەی:**

یەك: خوا ﷻ بۆ خۆی وشەی نووری بە کار هێناوە: ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، خوا ڕووناکیی ئاسمانەکان و زەوییە (بە واتا مەعنەوییەکەی).

دوو: هەروەها خوا ﷻ وشەی نووری بۆ قورئان بە کارهێناوە، وەك لە سووڕەتی (المائدة)دا، دەفەرموێ: ﴿قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ﴿١٥﴾﴾، بە دڵنیایی لە خواوە ڕووناکیی و کتێبێکی ڕۆشنکەرەوەتان بۆ هاتوە، یان: کتێبێکی ڕۆشن.

دیسان لە سووڕەتی (الأعراف)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ﴿١٥٧﴾﴾، واتە: شوێن ئەو ڕووناکییە بکەون کە لەگەڵیدا، (لەگەڵ موحەممەدادا ﷺ) دابەزێنراوە، کە بە تەئکید مەبەست پێی قورئانە.

سێ: هەروەها هیدایەتی خواش وشەی نووری بەکار هاتوە، وەك لە سووڕەتی (الأنعام) دا، دەفەرموێ: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيۡتٗا فَأَحۡيَيۡنَٰهُ وَجَعَلۡنَا لَهُۥ نُورٗا يَمۡشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيۡسَ بِخَارِجٖ مِّنۡهَاۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلۡكَٰفِرِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٢٢﴾﴾، واتە: ئایا کەسێك کە مردوو بوو، زیندووومان کردەوەو، ڕووناکییەکمان پێدا، کە لە نێو خەڵکی دا پێی بڕوا، وەك وێنەی ئەو کەسە وایە کە لە تاریکییان دایەو، لێیان دەرباز نابێ؟ کەواتە: هیدایەتی خواش ڕووناکییە، هەر وەك گومڕایی و دوورکەوتنەوە لە هیدایەتی خوا، تاریکییە.

چوار: دیسان خوای پەروەردگار بۆ ئیسلامیش وشەی نووری بەکارهێناوە، وەك لە سووڕەتی (الزمر)دا دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٖ مِّن رَّبِّهِۦۚ

﴿ فَوَيْلٌ لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ﴿٢٢﴾ ﴾، واته: ئایا كەسێك كە خوا سینەی گوشاد كردوە بۆ ئیسلام و كەوتۆتە سەر ڕووناكییەك لە پەروەردگارییەوە، (وەڵامەكەی، بەرانبەرەكەی قرتێنراوە، یانی: ئایا وەك ئەو كەسە وایە كە بە پێچەوانەوەیە؟)، ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: سزای سەخت بۆ ئەوانەی دڵیان لە ئاست یادی خوادا ڕەقە، كە بە تەئكید ئەو كەسەی خوا سینەی گوشاد كردوە بۆ ئیسلام و، كەوتۆتە سەر ڕۆشنایی خوا، ڕووناكیی هیدایەتی خوا، وەك ئەو كەسە نیە كە دڵی لە ئاست هیدایەتی خوادا، تاریكەو لە بەرانبەر یادی خوادا، دڵی سەخت و ڕەقە.

هەروەها هەر لە سوورەتی (التوبة)دا دەفەرمووێ: ﴿ يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ ... ﴿٣٢﴾ ﴾، واتە: دەیانەوێ ڕووناكیی خوا بەزاریان بكوژێننەوە، خەفە بكەن، كە مەبەست لە: (نُورَ ٱللَّهِ)، ئیسلامە، دوایی دەفەرمووێ: ﴿ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾، خواش ڕازیی نابێ مەگەر ڕووناكییەكەی تەواو بكات، واتە: ئەو ئیسلامە هەر دەبێ بچەسپێ و، دەبێ ئیسلام سەقامگیر بێ، هەر چەندە كافرەكانیش پێیان ناخۆش بێ، واتە: بۆ ئیسلامیش خوا وشەی نووری بەكارهێناوە.

پێنج: هەروەها خوا بۆ پێغەمبەری كۆتاییش (موحەممەد ﷺ) هەر وشەی ڕووناكیی بەكارهێناوە، وەك لە سوورەتی (الأحزاب)دا دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾ ﴾، واتە: (ئەی موحەممەد! ﷺ) ئێمە تۆمان ناردوە كە شایەد بی و، موژدەدەر بی و، ترسێنەر بی و، بانگەوازكار بی بۆ لای خوا، بە مۆڵەتی خواو، چرایەكی تیشكدەر (ڕۆشنكەرەوە) بی.

شەش: هەروەها خوا وشەی نووری بۆ ئیمانیش بەكارهێناوە، وەك دەفەرمووێ: ﴿ ٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴿٢٥٧﴾ ﴾البقرة، واتە: خوا دۆست و پشتیوانی ئەوانەیە كە بڕوایان هێناوە، لە تاریكاییان دەریان دێنێ بۆ ڕۆشنایی.

ڕۆشنایی ئیمان، لە بەرانبەر تاریكایی كوفرو گومڕایی و نیفاق و شیرك دا.

**٤- بە دڵنیایی: مەبەست لە نوور بوونی خوا، بۆ ئاسمانەکان و زەوی، بە واتا مەعنەوییەکەیەتی، نەك ماددییەکەی:**

چونکە خوا دەفەرموێ:

یەك: ﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١ ﴾، الشعراء، هیچ شتێك وەك وێنەی خوا نیەو، ئەو بیسەری بینەرە.

یانی: هەرچی تۆ بە زەینت دا دێ، خوا وانیە، زانایان گوتوویانە: (وَكُلُّ مَا جَرَى بِبَالِك، فَاللهُ لیس كذَلِك)، هەرچی بە ئەندێشەو خەیاڵت دا دێ، خوا ﷻ وانیە، چونکە خەیاڵدانی تۆ، تەنیا وێنەی شتە بەرهەستەکانی تێدایە، لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە، زانیاریی کۆکراوەتەوە لە مێشکی تۆدا، لە خەیاڵدانی تۆدا، بۆیە تۆ هەرچی بە خەیاڵتدا دێ و، هەر وێنەی شتە بەرهەست و دروستکراوەکانە، خوای پەروەردگاریش: ﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ ﴾.

دوو: هەروەها لە سوورەتی (طه)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلۡمٗا ١١٠ ﴾، واتە: خوا ﷻ ئەوەی لە پێش دەستیانەوەیەو ئەوەی لە دوایانەوەیە، (ئەوەی دێ و ئەوەی ڕابردوە)، هەمووی دەزانێ، ﴿ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلۡمٗا ﴾، بەڵام زانیاریی ئەوان، دەوری خوا نادات، ئەمە بە مانای: (خوا ناناسن) نیە، بەڵکو یانی: ناتوانن چییەتی خوا ﷻ دەرك بکەن.

بەڵام ئێمە دەزانین ڕووناکیی چییە، کەواتە: بە دڵنیایی خوا ئەو ڕووناکییە ماددییە نیە، ڕووناکیی یەکێکە لە دروستکراوەکانی خوا، با دروستکراوی بەرهەستی مەزنی خواش بێ، بەڵام هەر دروستکراوی خوایە.

بەڵام ئایا بۆچی خوا ﷻ وشەی نووری بۆ خۆی بەکارهێناوە، بە مانا مەعنەوییەکەی، نەك بە مانا بەرهەستەکەی؟ لەبەر ئەوەی نوور، ئەوەی ئێمە پێی ئاشناین، واتە: ئەو ڕووناکییەکەی کە بەرهەستەو، ئێمە بە پێنج هەستەکان، بە تایبەت بە هەستی بینین، هەستی پێ دەکەین، چەند تایبەتمەندییەکی هەن:

١)- ڕووناکیی (نور) جوانترین و لەتیفترین دروستکراوی ماددیی خوایە.

٢)- ڕووناکیی هۆی بینرانی سەرجەم دروستکراوەکانەو، بە بێ ڕووناکیی هیچ شتێك نابینرێ، کاتی خۆی وایاندەزانی، مرۆڤ کە شتێك دەبینێ، چاو تیشك دەنێرێ، بەڵام ئێستا دەرکەوتوە، نەخێر، ئەگەر ڕووناکیی نەبێ، هیچ شتێك نابینرێ، لە شتەکانەوە وێنە دەنێردرێ بۆ چاو، لەوێوە دەبێ ڕووناك بێ و شتەکە دیار بێ، ئنجا وێنەکە دێ بۆ نێو چاو.

٣)- ڕووناکیی خێراترین دروستکراوی ماددیی خوایە، هەتا ئەم تاو (لحظة)ەی ئێمە تێیداین، چونکە ڕووناکیی لە چرکەیەکدا (٣٠٠،٠٠٠)کم دەبڕێ، کە لە هەموو دروستکراوەکانی خوا، کە تاکو ئێستا بۆ مرۆڤ کەشف بوون، خێراترە، یانی: دروستکراوە ماددییەکان، ئەگەر نا بە تەئکید جیبریل ﷺ هەروەها پێغەمبەر ﷺ کە لە شەوی میعراج دا چووە بۆ ئاسمانەکان، بە تەئکید زۆر لە خێرایی تیشك خێراتر بووە، هەروەها فریشتەکان بە گشتیی، دیسان ڕووحیش وا پێدەچێ خێراتریش جووڵە بکات، بەڵام بۆ شتە بەرهەستەکانی کە ئێمە دەیانبینین تاکو ئێستا، تیشك خێراترین شتە: (٣٠٠،٠٠٠)کم لە یەك چرکەدا دەبڕێ.

٤)- ڕووناکیی و تیشك سەرچاوەی سەرجەم ژیانداران و گەشەکردن و بوونیانەو، بەبێ ڕووناکیی هیچ کام لە دروستکراوەکان نەدەگونجا بین، بە تایبەت ژیانداران، نە ڕووەك و نە مرۆڤ و نە ئاژەڵ و نە پەلەورو ژیانداران بە گشتیی.

٥)- سەرجەم ڕەنگەکان بە هۆی ڕووناکییەوە دەبینرێن، ئەگەر ڕووناکیی نەبێ، دنیا هەمووی تاریك و تەڵەمەو، ڕەنگەکان هەموویان بە هۆی ڕووناکییەوە دەزاندرێن.

٦)- تیشك و ڕووناکیی سەرچاوەی تێکڕای وزەکانە، وزە (طاقة)، هەمووی لە تیشك و ڕووناکییەوە دێ.

٧)- تیشك و ڕووناکیی، هۆکاری سەرەکیی پاکڕاگرتنی زەوی و ژیانی مرۆڤەو، لە بەین بردنی میکرۆب و دژەکانی مرۆڤە.

کەواتە ڕووناکیی ئەو حەوت تایبەتمەندییەی هەن، بەڵکو تایبەتمەندیی دیکەشی زۆرن، چونکە ئێستا زانایان ماددەش دەگێڕنەوە بۆ وزە، دەیگێڕنەوە بۆ تیشك، کە ئەوە باسێکی دوورو قووڵە، ئێمە سوپاس بۆ خوا، لە مەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و، پوچەڵیی ئیلحاد، لەبەر تیشکی زگماك و عەقڵ و زانست و وەحییدا)، بە درێژیی لەو بارەیەوە دواوین، بۆیە خوا ﷻ ئەم وشەی ڕووناکیی (نور)ی هەڵبژاردوە بۆ خۆ پێوە وەسفکردنی، ڕووناکیی بۆ ئێمە بەو چەمکەی دەیزانین، بەڵام بۆ خوای پەروەردگار، بە تەئکید مانایەکی مەعنەویی هەیە، کە شایستەی خوایە ﷻ.

**٥- ئەووێنەیەی خواهێناویەتەوە،بۆدەرخستنی چۆنیەتیی ڕۆشنکردنەوەی خوایە بۆ گەردوون، نەك ڕووناکیی خۆی، کە نازانین چۆنەو وەسف ناکرێ:**

خوا کە دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشۡكَوٰةٖ فِيهَا مِصۡبَاحٌۖ ٱلۡمِصۡبَاحُ فِي زُجَاجَةٍۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوۡكَبٞ دُرِّيّٞ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٖ مُّبَٰرَكَةٖ زَيۡتُونَةٖ لَّا شَرۡقِيَّةٖ وَلَا غَرۡبِيَّةٖ يَكَادُ زَيۡتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوۡ لَمۡ تَمۡسَسۡهُ نَارٞۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٖۚ يَهۡدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَيَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَٰلَ لِلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ٣٥﴾، مەبەست لەو وێنە هێنانەوەیەو لە وەصف کردنی خۆی بە ڕووناکیی ئاسمانەکان و زەوی، مەبەست ئەوەیە: خوا چۆن گەردوونی ڕووناك کردۆتەوە، لە ڕووی مەعنەویی و لە ڕووی بەرهەست و ماددییەوە؟ نەك مەبەست پێی ڕووناکیی زاتی خۆی بێ، کە خوای پەروەردگار: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ ١١﴾الشعراء، نازانین ڕووناکیی خوای پەروەردگار چۆنەو، بە تەئکید وەصف ناکرێ.

(الشعراوي)، لەو بارەوە لە تەفسیرەکەی[1] خۆیدا، قسەیەکی جوان دەکات دەڵێ: {والمَثَلُ هُنَا لَيْسَ لِنُورِ اللهِ، إنما لتنويره للسموات وللأرض، أمّا نورهُ تَعَالى

---

(١) خواطر الشعراوي: ج١٧، ص١٠٢٧٣.

فشيء آخر فوق أنْ يُوصَف، وما المَثَل هُنا إلا لتقريب المسألة إلى الأذهان)، واتە: كە دەفەرموێ: ﴿مَثَلُ نُورِهِۦ﴾، لێرەدا مەبەست وێنەی ڕووناکیی خوا نیە، بەڵکو وێنەکە بۆ ڕووناککردنەوەی خوایە بۆ ئاسمانەکان و زەوی، بەڵام نووری خوای بەرز، شتێکی دیکەیە، لەسەروو ئەوەوەیە پێناسە بکرێ، بەڵام لێرەدا ئەو وێنەیە کە خوا هێناویەتەوە بۆ نیزیک خستنەوەی مەسەلەکەیە لە عەقڵەکانەوە.

قسەکەشی زۆر جوان و بە جێیە.

## ٦- بێگومان خوا نوورەکەشی وەك سەرجەم سیفەتەکانی دیکەی، وەك زاتیەتی و بۆ ئێمە زانراو نیە:

با سەرنجی ئایەتێك و چوار دەقی سوننەت بدەین لەو بارەوە:

یەك: لە سوورەتی (الأعراف)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٤٣﴾، هەڵبەتە من ئەو ئایەتەو ئایەتەکەی سوورەتی (الأنعام): ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَ ١٠٣﴾، لە سوورەتی (الأنعام)دا لە کورتە باسێکدا لە بارەی بینینی خواوە، لە دنیاو دوا ڕۆژدا، باش تیشکم خستوونە سەر، بەڵام لێرە خوا دەفەرموێ:

کاتێك مووسا بۆ ژوانگەی پەروەردگاری هات و فەرمایشتی لەگەڵ پەروەردگاریدا کرد، گوتی: پەروەردگارم! خۆتم پێشانبدە، با تەماشات بکەم، (خوا) فەرمووی: هەرگیز ناتوانی بمبینی، بەڵام تەماشای ئەو چیایە بکە، ئەگەر خۆی ڕاگرت، تۆش دەتوانی بمبینی، ئنجا کاتێك پەروەردگاری بۆ چیایەکە دەرکەوت، وردو خاشی کردو مووساش لە هۆش خۆی چوو، کاتێك هاتەوە هۆش، گوتی:

پاکیی بۆ تۆ ئەی پەروەردگارم! بۆ لای تۆ گەڕامەوەو من یەکەمی بڕوادارانم، (یەکەمی بڕواداران بەوە کە مرۆڤ ناتوانێ لەژیانی دنیادا تۆ ببینێ).

دوو: پێغەمبەری خواش ﷺ کە دەفەرمویٚ: {اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ، أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ} (أخرجه البخاري: ١١٢، ومسلم: ٧٦٩).

واتە: ئەی خوایە! ستایش بۆ تۆ، تۆ ڕووناکیی ئاسمانەکان و زەوی.

بە دڵنیایی مەبەست پێی ڕووناکیی مەعنەویی و، ڕووناکییەکی تایبەتی خوای پەروەردگارە.

سێ: هەروەها لەو بارەوە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکراوە، دوای ئەوەی لە سەفەری میعراج گەڕاوەتەوە: {هَلْ رَأَيْتَ رَبَّكَ؟ فَقَالَ: رَأَيْتُ نُورًا}، (أخرجه مسلم: ١٧٨، والترمذي: ٣٢٨٢).

واتە: (پرسیاری لێکرا)، ئایا پەروەردگاری خۆتت بینی، (لە شەوی شەوڕۆو بەرزبوونەوەدا (الإسراء والمعراج)دا)، فەرمووی: ڕووناکییم بینی.

چوار: هەروەها لەو بارەوە ئەم دەقەش هاتوە: {نُورٌ أَنَّى أَرَاهُ} (أخرجه مسلم: ١٧٨، والترمذي: ٣٢٨٢).

واتە: (خوا) ڕووناکییە چۆنی ببینم!

پێنج: هەر لەو بارەوە ئەم فەرمایشتەش هاتوە: {عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِخمس كَلِمَاتٍ فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنَامُ وَلاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَنَامَ، يُخْفِضُ الْقِسْطَ وَيَرْفَعُهُ، يُرْفَعُ إِلَيْهِ عَمَلُ النَّهَارِ قَبْلَ عَمَلِ اللَّيْلِ، وَعَمَلُ اللَّيْلِ قَبْلَ عَمَلِ النَّهَارِ، حِجَابُهُ النُّورُ، «وَفِي رِوَايَةٍ: النَّارُ» لَوْ كَشَفَهُ لأَحْرَقَتْ سُبُحات وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ}، (أخرجه: مسلم: ١٧٩).

واتە: ئەبوو مووسای ئەشعەریی دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك لە نێوماندا هەڵسا، پێنج وشەی فەرموون، (پێنج ڕستە)، فەرمووی:

١- بێگومان خوا ناخەوێ و ناشگونجێ بخەوێ، (لێی ناوەشێتەوە).

٢- تەرازوو نزم دەکات و بەرز دەکات (تەرازووی کردەوەکان).

٣- کردەوەی شەوێی پێشی ڕۆژێ بۆ لا بەرز دەکرێتەوەو، کردەوەی ڕۆژێی پێشی شەوێ بۆ لا بەرز دەکرێتەوە، (لەحزە بە لەحزە خوا ﷻ ئاگای لە هەڵس و کەوتی بەندەکان هەیە).

٤- پەردەی خوا ڕووناکییە، «لە ڕوایەتێکدا ئاگرە».

٥- ئەگەر پەردەکە لابدات، پرشنگی ڕووی خوا، هەرچی کە دیتنی خوا بەدی دەکات، هەمووی دەسووتێنێ.

واتـە: دروسـتکراوەکان هەمـوو لـە بەیـن دەچـن، چونکـە هیـچ شـتێك نیـە خـوا نەیبینـێ، کەواتـە: خـوا ﷻ ڕووناکییەکـی تایبەتـی هەیـە، کـە ئـەو دروسـتکراوانە هیچیـان بەرگـەی ئاگـرن و، ڕووناکییەکـی ماددیـی نیـە، کـە بـۆ ئێمـە زانـدراوە، ڕووناکییەکـە شایسـتەی خوایـە، هـەروەك هەمـوو سـیفەتەکانی خـوا: خـوا زانیاریـی هەیـە، بـەڵام وەك زانیاریـی ئێمـە نیـە، خـوا بیسـتنی هەیـە، دیتنـی هەیـە، ژیانـی هەیـە، فەرمایشـتکردنی هەیـە، بەزەیـی هەیـە، حیکمەتـی هەیـە، دەسـەڵاتی هەیـە، ویسـتی هەیـە، هەمـوو ئـەو سـیفەتانەی هـەن، هەمـوو ئـەو نـاوە بـەرزو چاکانـەی هـەن، کـە هەندێکیـان دەزانیـن و زۆربەیـان نازانیـن، بـەڵام هیچیـان وەك هـی دروسـتکراوەکان نیـن.

### ٧- بەراوردێکی نێوان ڕووناکیی هیدایەتی خواو، ئەو وێنەیەی بۆی هێنراوەتەوە:

ئەمەم لە تەفسیرەکەی[1] (محمد الطاهر بن عاشور)ەوە، هێناوە، بەڵام بە پوخت کردنەوەوە، دەڵێ: کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

١)- وێنەی ڕووناکیی خوا، وەك تاقێکە، چرای تێدا دانرابێ، چرایەکە لە نێو شووشەیەکدایەو تاکو کۆتایی، پاراستنی خوا بۆ قورئان و هەبوونی چوارچێوەی ڕوونی وشەکانی قورئان و دەلالەتیان لەسەر واتاکانیان، لە بەرانبەر تاقەکە دایە، ئنجا ئەو تاقەیە چۆن ڕووناکییەکەی کۆکردۆتەوە، خوای پەروەردگاریش کە قورئان دەپارێزێ و، ئەو وشانەی قورئانیش چوار چێوەیەکیان هەیە لە واتاو دەلالەت، تاقەکە چۆن ڕووناکییەکە دەپارێزێ، ئەو وشانەی قورئانیش و دەلالەتیان و، پاراستنی خواش بۆ قورئان، بە هەمان شێوەیە کە خوا ئەو ڕووناکیی و هیدایەتەی خۆی بەو شێوەیە دەپارێزێ.

٢)- ماناو مەبەستەکانی قورئان و ڕێنمایی نێویان: لە بەرانبەر چرایەکە دان، هەروەك چۆن، بێژەکان و دەلالەتی بێژەکان و پاراستنی خوای پەروەردگاریش بۆ دەستکاریی نەکرانی وشەو بێژەکانی قورئان، لە بەرانبەر تاقەکەدایە.

٣)- پارێزرانی هیدایەتی خوا لە گومان و تۆمەتەکان، لە بەرانبەر شووشە ڕوونەکە دایە، شووشەکە چەند ڕوونە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿كَأَنَّهَا كَوۡكَبٞ دُرِّيّٞ﴾، خوای پەروەردگاریش کە هیدایەتی خۆی، لە گومان و تۆمەتەکان دەپارێزێ، وەك شووشەکە وایە، کە شووشەکە ڕوون و سافەو هیچ خڵتەو ژەنگ و تۆزو خۆڵی پێوە نیە.

٤)- وەحیی خوا کە ڕاستییەکانی ئیسلامی گرتوونە نێو خۆی، لە بەرانبەر درەختە بە پێزەکە دایە، کە میوەیەك دەردەکات زەیتی لێ بەرهەم دێ، واتە: وەحیی خوا ﷻ لە قورئاندا بەرجەستەیەو لە ڕێبازی پێغەمبەردا ﷺ، لە بەرانبەر: ﴿شَجَرَةٖ مُّبَٰرَكَةٖ﴾،

---

(١ ) التحرير والتنوير: ج١٨، ص٢٤٣، ٢٤٤.

درەختە بە پیزەکە دایە، کە میوەیەك دەردەکات، دوایی لە ئەنجامی گوشرانی ئەو میوەیەدا، کە زەیتوونە، زەیت بەرهەم دێ و دەبێتە سووتەمەنی ئەو چرایە.

٥)- پاکیی ئیسلام و سەغڵەتیی تێدا نەبوونی و سەماحەتەکەی، لە بەرانبەر درەختە میانجییەکەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دایە، ئیسلامیش لە نێوان شلگیریی و سەختگیریی دایە، ﴿ زَيۡتُونَةٖ لَّا شَرۡقِيَّةٖ وَلَا غَرۡبِيَّةٖ ﴾، ئیسلامیش نە بە لای توندیی دایە، نە بە لای شلیی دایە، وەك من هەموو جار دەڵێم: بڵێن: شەرعڕەویی، ئنجا شەرع جاری وایە، پێت دەڵێ: توند بە، جاری واش هەیە، پێت دەڵێ: نەرم بە، ئەو قورئانەی کە بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡ ﴿١٥٩﴾ ﴾آل عمران، هەر ئەویش پێی دەفەرموێ: ﴿ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡ ﴿٧٣﴾ ﴾التوبة، لەوێ دەفەرموێ: بە هۆی بەزەیی خواوە نەرم بووی بۆ خەڵك، لەولاش لە سوورەتی (**التوبة**)و لە سوورەتی (**التحريم**) دا دەفەرموێ: ﴿ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡ ﴿٧٣﴾ ﴾، لە دژی کافرو مونافیقەکان تێبکۆشەو زبر بە لەسەریان، زبریی لە جێی خۆی و، نەرمیی لە جێی خۆی، بەڵام ئەوانەی کە پێیان وایە دەبێ لە هەموو ژیانتدا هەر نەرمڕەو بی و، هەر میانەڕەو بی و، هەر شلگیر بی! لێی حاڵیی نەبوون، هەر وەك چۆن ئەوانەش حاڵیی نەبوون، کە پێیان وایە دەبێ هەر زبرو ڕەق و تەق بی و، هەر توند بی، نەخێر، توندیی لە جێی خۆی، نەرمیی لە جێی خۆی، وەك پێشینانی خۆمان دەڵێن: « کەنگرو ماست بە وەختی خۆی»، هەر شتەو بە کاتی خۆی و لە شوێنی خۆیدا.

٦)- بەردەوامیی ڕێنمایی ئیسلام و تازەبوونەوەشی، لە بەرانبەر سووتەمەنیی تێخستنی، (**إيقاد**)ی چرایەکە دایە، ئیسلام هیدایەتەکەی بەردەوام دەبێ و، تازەش دەبێتەوە، هەر وەك چۆن زەیتی نێو چرایەکە، ئەگەر کەم بوو تێی دەکرێتەوە.

٧)- فێرکردنی پێغەمبەریش ﷺ بۆ ئوممەتەکەی، کە قورئان و حوکمە شەرعییەکانی، لە بەرانبەر زەیتەکە دایە، زەیتەکە ڕوونەو نیزیکە پێویستیی بە ئاگر نەبێ، بە هەمان شێوەش فێرکردنی پێغەمبەریش ﷺ، بۆ ئەو هیدایەتەی هێناویەتی، هەر بۆ خۆی ڕوونەو نیزیکە پێویستیی بە فێرکار نەبێ، وەك زەیتەکە چۆن خەریکە پێویستیی بە ئاگر نەبێ.

٨)- هەوڵدانی پێغەمبەر ﷺ بۆ فێرکردنی قورئان بە ئۆممەتەکەی، لە بەرانبەر ئاگر پێکەیاندن و داگیرساندنی زەیتەکە دایە، کە دەبێ ئەو ئیرشادو ڕێنماییەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئۆممەتی هەر بەردەوام بێ، وەك چۆن چرایەکەش ئەگەر زەیتەکەی بەردەوام تێ نەکرێ، داناگیرسێ.

٩)- ئیجتیهادو یاسا دەرهێنانی زانایان بە جیاوازیی ڕۆژگارەکان، لە بەرانبەر درەختی زەیتوون (شجرة زيتون)، دایە، وەك چۆن زەیتەکە بە گوشین و کارکردن دێتە دەست، ئیجتیهادو یاسا دەرهێنانیش لە قورئان و سوننەت، لە وەحیی خوا، ئەویش دیسان دەبێ عەقڵەکان کاری لەسەر بکەن، وەك چۆن زەیتەکە دەبێ بگووشرێ و لە گوشەر (عصارة) بدرێ لە کارگەدا، قورئان و سوننەتیش، وەحیی خوای پەروەردگاریش، دەبێ خاوەن عەقڵەکان لێی ورد ببنەوەو، هەڵگێڕو وەرگێڕی بکەن و سەرنجی بدەن، تاکو یاسای تازەو، ڕێنمایی تازە لە وەحیی خوای پەروەردگار، بە پێی گۆڕانی ڕۆژگارەکان، دەربێنن.

## ٨- قسەی پێنج زانایەك لە بارەی ئەو ئایەتە بە پێزەوە:

ویستم لە کۆتاییدا - هەر چەند پێم وایە چەمك و واتایەکەی، باش ڕوون بۆوە - بەڵام پێنج قسەی پێنج لە زانایان بێنم:

یەك: (أبو حامد الغزالي) لە (مشكاة الأنوار)[1]دا، دەڵێ: [النُّورُ هُوَ الظَّاهِرُ الَّذِي بِهِ كُلُّ ظُهُورٍ، أَيْ الَّذِي تَنْكَشِفُ بِهِ الأَشْيَاءُ وَتَنْكَشِفُ لَهُ وَتَنْكَشِفُ مِنْهُ، وَهُوَ النُّورُ الحَقِيقِيُّ وَلَيْسَ فَوْقَهُ نُورٌ. وَجَعْلُ اسْمِهِ تَعَالَى النُّورَ دَالٌّ عَلَى التَّنَزُّهِ عَنِ العَدَمِ وَعَلَى إِخْرَاجِ الأَشْيَاءِ كُلِّهَا عَنْ ظُلْمَةِ العَدَمِ إِلَى ظُهُورِ الوُجُودِ، فَآلَ إِلَى مَا يَسْتَلْزِمُهُ اسْمُ النُّورِ مِنْ مَعْنَى الإِظْهَارِ وَالتَّبْيِينِ فِي الخَلْقِ وَالإِرْشَادِ وَالتَّشْرِيعِ][2].

---

(١) کتێبێکە لەبوو حامدی غەزالی تایبەتی کردوە، بە تەفسیر کردنی ئایەتی ژمارە (٣٥)ی سووڕەتی (النور)ەوە.

(٢) التحرير والتنوير، ج١٨، ص١٣٢.

دەڵێ: ڕووناكیی بریتیە لەو ئاشكرایەی كە هەموو شتێك بەوەوە ئاشكرا دەبێ، (هەموو شتێك بە هۆی ئەوەوە دەردەكەوێ)، هەموو شتێك بەوی دەردەكەوێ و هەموو شتێك لەوەوە دەردەكەوێ، ئەویش بریتیە لەو ڕووناكییە ڕاستەقینەیەی كە لە سەرووی ئەوەوە هیچ ڕووناكییەك نیە، ئنجا ئەوە كە ناوی خوای بەرز نراوە: نوور، بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە خوا پاكەو، دوورە لەوەی نەبوون ڕووی تێ بكات و، دەلالەت لەسەر ئەوەش دەكات كە خوا ﷻ هەموو شتەكانی لە تاریكیی نەبوون دەرهێناون، بۆ ڕووناكیی بوون، كەواتە: سەرەنجامەكەی وا دەبێ كە ناوی نوور بۆ خوا ﷻ، مانای دەرخستن و ڕوونكردنەوە لە نێو دروستكراوەكانیداو، ڕێنمایی كردن و یاسا دانان، (یانی: خوا نوورە بەو واتایە كە دروستكراوەكان لە تاریكیی نەبوون دەردێنێ بۆ ڕووناكیی بوون)، پاشان شەریعەتی خۆی و یاساكانی خۆییان بۆ ڕوون دەكاتەوەو، ڕێنماییەكانی خۆییان بۆ ڕوون دەكاتەوە (تاكو بەو ئامانجە بگەن كە خوای پەروەردگار بۆی لەبەر چاو گرتوون و، پەسەند كردوون).

دوو: (محمد الطاهر بن عاشور)، دەڵێ:

[فَأَحْسَنُ مَا يُفَسَّرُ بِهِ قَوْلُهُ تَعَالَى: اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، أَنَّ اللَّهَ مُوجِدٌ كُلِّ مَا يُعَبَّرُ عَنْهُ بِالنُّورِ، وَخَاصَّةً أَسْبَابُ الْمَعْرِفَةِ الْحَقَّةِ، وَالْحُجَّةُ الْقَائِمَةُ، وَالْمُرْشِدُ إِلَى الْأَعْمَالِ الصَّالِحَةِ الَّتِي بِهَا حُسْنُ الْعَاقِبَةِ فِي الْعَالَمَيْنِ الْعُلْوِيِّ وَالسُّفْلِيِّ، وَهُوَ مِنِ اسْتِعْمَالِ الْمُشْتَرَكِ فِي مَعَانِيهِ][1].

دەڵێ: باشترین شتێك كە فەرمایشتی خوای بەرز: ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، پێ تەفسیر بكرێ، (پێ ڕوون بكرێتەوە)، ئەوەیە كە خوا پەیداكەری هەموو ئەوەیە كە بە نوور تەعبیری لێ دەكرێ، بە تایبەت هۆكارەكانی زانستیی هەق و، بەڵگەی چەسپاوو، ڕێنمایی بۆ كردەوە باشەكان، كە بە هۆی

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٨، ص٢٣٢.

ئەوەوە سەرەنجامی باش لە جیهانی سەرێ و خوارێدا، دەستەبەر دەبێ، کەواتە: وشەی (نُورٌ)، لێرەدا بەکارهێنراوە بە هەموو واتا هاوبەشەکانی.

واتە: هەم ڕووناکیی بەرهەست، هەم ڕووناکیی مەعنەویی، کە هیدایەتی خوای پەروەردگارە، سەرجەم ئەو واتایانەی دیکەش کە باسمان کردن، وەك: دەرهێنانی دروستکراوەکان لە تاریکیی نەبوون، بۆ ڕووناکیی بوون، دیسان سەرپەرشتییکردنی خوا ﷻ بۆ گەردوون و ڕێنمایی کردنی و ڕێکخستنی، هەموو ئەو واتایانە، بە شێوەیەك لە شێوەکان وشەی نوور دەیانگرێتەوە.

سێ: (إبن عجيبة)، دڵێ: [اعْلَم أَنَّ الكَوْنَ كُلَّهُ مِنْ عَرْشِهِ إلى فَرْشِهِ، قِطْعَةٌ مِنْ نُورِ الحَقِّ، وَسِرٌّ مِنْ أَسْرَارِ ذَاتِهِ، مُلْكٌ، وَبَاطِنُهُ مَلَكُوتٌ، فَائِضٌ مِنْ بَحْرِ الجَبَرُوتِ، فالكَائِنَاتُ كلها: أَللهُ نُورهَا وَسِرّهَا، وَهُوَ القَائِمُ بِهَا][1].

واتە: بزانە کە گەردوون هەمووی لە عەرشی تاکو فەرشی، (واتە: لە سەرێ تاکو خوارێ)، پارچەیەکە لە ڕووناکیی هەق و، نهێنییەکە لە نهێنییەکانی زاتی هەق، ڕواڵەتەکەی موڵکەو، دیوە پەنهانەکەشی مەلەکووتە، کە لە دەریای جەبەڕووتەوە سەرچاوەی گرتوە، ئنجا هەموو دروستکراوەکان، خوا ﷻ ڕووناکییانەو، نهێنییانەو خوا سەرپەشتییکارو ڕاگیر کاریانە.

ئەمە زیاتر تەعبیرێکی ڕووحیی و مەعنەویی ئەهلی تەصەووفە.

چوار: (القرطبي)، لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ:

[فَيَجُوزُ أَنْ يُقَالَ: لِلَّهِ تَعَالَى نُورٌ مِنْ جِهَةِ الْمَدْحِ، لِأَنَّهُ أَوْجَدَ الْأَشْيَاءَ وَنُورُ جَمِيعِ الْأَشْيَاءِ مِنْهُ ابْتِدَاؤُهَا وَعَنْهُ صُدُورُهَا، وَهُوَ سُبْحَانَهُ لَيْسَ مِنَ الْأَضْوَاءِ الْمُدْرَكَةِ جَلَّ وَتَعَالَى عَمَّا يَقُولُ الظَّالِمُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا][2].

---

(١) البحر المديد في تفسير القرآن المجيد: ج٥، ص٧٩.

(٢) الجامع لأحكام القرآن: ج١٢، ص٢١٥.

واتە: دەگونجێ بگوترێ: خوا ڕووناکیی هەیە، لە ڕووی مەدح و ستایشەوە، چونکە خوا هەموو شتەکانی پەیدا کردوون ڕووناکیی و هەموو شتەکان لە خواوەیە، لەوەوە دەستیان پێکردوەو هاتوون، بەڵام خوا ﷻ وەك ئەو ڕووناکییانە نیە کە بەرهەستن، بەرزیی بۆ خوا لەوەی ستەمکاران دەیڵێن، بە بەرزییەکی گەورە.

پێنج: (رشيد الخطيب الموصلي)، ئەویش تەفسیرێکی هەیە[1]، لە بارەی ئەو ئایەتەوە قسەی زۆری کردوون، پوختەکەیان ئەوەیە:

گەردوون وەك تاقەکەیە، خوا ﷻ وەك چرایەکەیە، کە تاقەکەی ڕۆشن کردۆتەوە، واتە: کە دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ﴾، تاقێك کە چرایەکی تێدا دادەنرێ، ڕۆشنی دەکاتەوە، خواش ﷻ لەم گەردوونەدا، بە هۆی خواوە ئەم گەردوونە هەیە، لە تاریکایی نەبوون هاتۆتە ڕووناکیی بوون و، بە هۆی خواوە سیستمی بۆ دانراوەو، بەس خوای پەروەردگاریش گەردوونی ڕۆشن کردۆتەوە بە هەموو ماناکانی ڕۆشن، چ ماددیی چ مەعنەویی.

---

(١) أولى ما قيل في آيات التنزيل: ج٥، ص٣٢٤.

**مەسەلەی دووەم:**

**وێنە هێنانەوە بۆ کردەوەی کافران بە تراویلکەی بیابان و، تاریکاییەکانی نێو دەریایەکی قووڵی شەپۆلاوی، کە تاریکاییەکی خەستی نەنگوستە چاوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاءً حَتَّى إِذَا جَاءَهُ لَمْ يَجِدْهُ شَيْئًا وَوَجَدَ اللَّهَ عِندَهُ فَوَفَّاهُ حِسَابَهُ وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿٣٩﴾ أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە دوازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان کردەوەکانیان، وەك تراویلکەیەك لە دەشتێکی تەخت دا، لە بیابانێکی گۆڕو هەمواردا.

٢)- ﴿ يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاءً ﴾، بابای تینوو بە ئاوی تێدەگات، وا دەزانێ ئاوە شەپۆلان دەدات!.

٣)- ﴿ حَتَّى إِذَا جَاءَهُ لَمْ يَجِدْهُ شَيْئًا ﴾، هەتا (ئەو کەسە کە تراویلکەی دەشت و بیابان دەبینێ و وادەزانێ ئاوە شەپۆل دەدا) کە گەیشتە لای تراویلکەکە، هیچ شتێکی (لە ئاوی لە شێوەی سەراب دا بینراوی)، نەدی.

٤)- ﴿ وَوَجَدَ اللَّهَ عِندَهُ ﴾، بەڵکو خوای لەوێ بینی، ئەو خوایەی ئەو لە دەستی ڕایکردوە، لەوێ دەیبینێ.

٥)- ﴿ فَوَفَّاهُ حِسَابَهُ ﴾، خواش بە تەواویی لێپرسینەوەی لەگەڵدا کرد، سزای شایستەی دا.

٦)- ﴿ وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴾، خواش لێپرسینەوەی زۆر خێرایە.

## شەش کورتە هەڵوەستە

١- وشەی: (السَّرَابُ)، (وَالسَّرَابُ: رُطُوبَةٌ كَثِيفَةٌ تَصْعَدُ عَلَى الأَرْضِ وَلاَ تَعْلُو فِي الْجَوِّ، تَنْشَأُ مِنْ بَيْنِ رُطُوبَةِ الْأَرْضِ وَحَرَارَةِ الْجَوِّ فِي الْمَنَاطِقِ الْحَارَّةِ الرَّمْلِيَّةِ، فَيَلُوحُ مِنْ بَعِيدٍ كَأَنَّهُ مَاءٌ)، (سَرَابُ)، بە کوردیی تراویلکەی پێ دەڵێن، بریتیە لە شێ و تەڕاییەکی چڕ، لە زەوی هەڵدەستێ، بەڵام بەرز نابێتەوە بۆ سەرێ و، لەسەر ڕووی زەوی دەمێنێتەوە، کە لە شێ و تەڕایی زەوی پەیدا دەبێ و، لە گەرمایی کە لە هەوادا هەیە، لە شوێنە لماوییە گەرمەکان، لە دوورەوە وەك ئاو دێتە بەرچاو.

بەڵام سەرابەو ئاو نیە.

خـوا ﷻ کـردەوەی کافـرەکان وەك ئـەو تراویلکەیـە وێنـا دەکات، وەك چـۆن تراویلکەکـە ئـاو نیـە، کەسێك کـە بـە تەمـای تراویلکەیـەك بچـێ، لـەوێ تێـر ئـاو بـێ و تینوویەتیـی بشـکێ، سـەری بـە فەتـارەت دەچـێ، کافرەکانیـش بـە تەمـای ئـەو کردەوانـەی کردوویانـن لـە دنیـادا، کـە لەسـەر بناغـەی ئیمان دایاننەنـاون، لـە دوا ڕۆژدا وەك تراویلکەیـەك وان، کـە بـە حیسـاب کردەوەیـان هەیـەو پاداشـتیان بدرێتـەوە، بـەڵام خـوا سـزایان دەدات، چونکـە کردەوەکانیـان لەسـەر بناغـەی ئیمان بنیـات نەنـاون.

ئنجا دەگونجێ بگوترێ:

کـردەوەی کافـرەکان وەك تراویلەکـە وایـەو ئـاو نیـە، بابـای کافریـش وەك بابـای تینـوو وایـە، وەك چـۆن بابـای تینـوو بـە دەم تراویلکـەوە دەچـێ، تێـراو بـێ، دوایـی دەسـتی لـە بنـی هەمبانـەی خاڵییەوە دەردەچـێ و، دەسـتخەڕۆ دەبێ، بابـای کافریش لـە ڕۆژی دواییـدا بـە تەمـای کردەوەکانـی بـێ، کـە بەبـێ ئیـمان ئەنجامـی داون و

بـە خوایـەوە پەیوەسـت نەکـردوون، وەك ئـەو بابـا تینـووەی لـێ دێ، کـە بـە دەم تراویلکـەوە دەچـێ، بـەڵام هیچـی لـێ نیـە، ئنجـا کابـرای تینـوو، ئەگـەر دوژمنێکـی هەبـێ، لـەو شـوێنەی کـە وەك تراویلکـەی هاتۆتـە بـەر چـاوو وایزانیـوە ئـاوە، لـەوێ خـۆی بـۆ مـەڵاس دابـێ، کتوپـڕ بیگـرێ، بـە هەمـان شـێوە، بابـای کافریـش وەك ئـەو کەسـە وایـە کـە لـە ڕۆژی دواییـدا دەچـێ بـە حیسـاب پاداشـتی کردەوەکانـی بدرێتـەوە، بـەڵام خـوا تونـد دەیگـرێ و دەفەرمـوێ: وەرە ئـەو کردەوانـەت لەسـەر بناغـەی ئیـمان دانەنـاون! یاخـود: ئـەو کردەوانـەت مـۆری شـەرعیان پێـوە نەبـووە، مـۆری ئیخلاصیـان پێـوە نەبـووەو بـۆ مـن نەبـوون، لەبـەر ئـەوە لـە جیاتـی ئـەوەی پاداشـت بدرێیـەوە لـە سـەریان، سـزا دەدرێـی.

هەڵبەتـە تراویلکـەش مـەرج نیـە تەنیـا لـە بیابانـەکان بـێ، بەڵکـو بـە تایبـەت لـە دوای چێشـتەنگاوەوە تاکـو لای عـەسر، لـە هـەر شـوێنێکی دەشـتایی بێـت، دەگونجێ ئـەو تراویلکەیـە، بێتـە بـەر چـاو.

٢- کە دەفەرموێ: ﴿لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا﴾، (شَيْـًٔا)، یانی: (الموجود المعلوم)، هەبووی زانراو: ﴿لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا﴾، (أي: لَم يَجِدْ شَيْئاً مَاءً)، هیچ ئاوی چنگ نەکەوت، چونکە ئەو شتە (شَيْـًٔا)ی ئەو بۆی چوو، (ئاو) نەبوو، مانای وایە هیچی لێ نەبوو.

٣- وشەی (قیعة)، یانی: زەوییەکی پان کە هیچ گردۆلکەی لێ نەبێ، وشەی (قاع)ش هەر هەمان مانای هەیە، هەندێکیش گوتوویانە: وشەی (قیعة)، کۆی (قاع)ە، وەك (جیرة)، دراوسێیەکان کۆی (جارٌ)ە، دراوسێ.

٤- کە دەفەرموێ: ﴿وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ﴾، ئەمە وێچواندنە، واتە: وەك چۆن بابایەك کە بە دەم تراویلکەیەکەوە دەڕوات، بەڵام لەوێ دوژمنێکی خۆی بۆ مەڵاس داوە، کەسێك کە لێی دەخەفتێ، خۆی بۆ مەڵاس داوە، ئینسانی بێبڕواش لە ڕۆژی دواییدا کە بە حیساب دەچێ کردەوەکانی پاداشت بدرێنەوەو، پاداشتیان لەسەر وەربگرێتەوە، سزای خوای دادگەر دەیگرێ.

٥- کە دەفەرموێ: ﴿ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥ ﴾، واتە: (أَعْطَاهُ جَزَاءَ كُفْرِهِ وَافِيًا)، خوا سزای کوفرەکەی بە تەواویی دایەوە، سزای پڕ بە پێست.

٦- ﴿ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴾، واتە: خوا وەخران ناکات لە لێپرسینەوەدا، لە کاتێکدا کە پێویست بکات بە خێرایی ئەو حیساب و کیتابە تەواو دەبێ.

ئەمە وێنەیەکی زەمینیی بوو، ئنجا خوا وێنەیەکی دەریاییش دێنێتەوە، بۆ کردەوەی کافرەکان کە چۆن دەستخەڕۆ دەبن، لەبەر ئەوەی ئیمانیان نیەو کردەوەکانیان پەیوەست نەکردوون بە خواوە، کردەوەکانیان نە مۆری تەنیا خوا پێ مەبەست بوون (إخلاص)یان پێوەیە، نە مۆری شوێنکەوتن (إتباع)و بە پێی شەرع بە ڕێوە چوونیان پێوەیە، ئنجا وێنەیەکی دەریایی دێنێتەوە:

٧)- ﴿ أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ ﴾، واتە: حاڵی کافرەکان و، کردەوەکانیان لە ڕۆژی دواییدا، وەك چەند تاریکاییەکن لە دەریاییەکی قووڵی شەپۆلاوییدا.

٨)- ﴿ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ ﴾، ئەو دەریا قووڵە شەپۆلاوییە، شەپۆلێك دایدەپۆشێ، لە سەرووی ئەو شەپۆلە قووڵە ژێر دەریاییەوە، شەپۆلێکی دیکە هەیە.

٩)- ﴿ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ﴾، لە سەرووی شەپۆلە سەرووەکەشەوە، هەور هەیە.

١٠)- ﴿ ظُلُمَٰتٌۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ ﴾، چەند تاریکاییەکن، هەندێکیان لەسەر هەندێکیان، لەسەر یەکدی کەڵەکە بوون.

١١)- ﴿ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ يَرَىٰهَا ﴾، ئەگەر دەستی دەربێنێ، نیزیك نیە دەستی ببینێ، واتە: تاریکییەکی ئەوەندە خەست و خۆڵ و تەنگوستە چاوە، ئەگەر مرۆڤ دەستی دەربێنێ، نەك هەر نایبینێ، بەڵکو نزیکیش نیە ببینێ.

١٢)- ﴿ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴾، کەسێکیش خوا ڕووناکیی بۆ نەڕەخسێنێ، هیچ ئەندازەیەك ڕووناکیی بۆ نابێ و، لە تاریکاییان دا گرفتار دەبێ.

**ئێستا تۆزێك ئەو وشانە، شی دەكەینەوە:**

**١) (ظُلُمَٰتٌ) كۆی (ظلمة)یە، كە خوا دەفەرموێ: (ظُلُمَٰتٌ)، تاریكییەكان، بۆیە بە كۆ بەكارهاتوە، تاكو مانای تاریكییەكەی زۆر خەست و خۆڵ بگەیەنێ.**

**٢) (بَحۡرٍ)، دەریایە، (لُّجِّيّٖ)، پاڵدراوەتە لای (لُجّة)، كە بریتیە لە شەپۆل، (لُّجِّيّٖ)، یانی: شەپۆلاویی، ئاشكراشە كاتێك دەریا شەپۆلی دەبێ، كە قووڵ بێ، ئەگەر تەنك بێ، شەپۆلی لێ هەڵناستێ، (اللجّ: هُوَ مُعْظَمُ البَحْر)، (اللّجّ)، بە مانای زۆربەی دەریایە، (لُّجِّيّٖ)، یانی: دەریایەكی قووڵ.**

**٣) ﴿يَغۡشَىٰهُ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ مَوۡجٞ﴾، ئەو دەریایە شەپۆلێك دایدەپۆشێ لە بنەوە، ﴿مِّن فَوۡقِهِۦ مَوۡجٞ﴾، لە سەریشیەوە شەپۆلێكی دیكە هەیە، (المَوْجُ: اسْمُ جَمْعِ مَوْجَةٍ، وَهِيَ: مَقَادِيرُ مِنْ مَاءِ البَحْرِ أَوِ النَّهْرِ تَتَصَاعَدُ عَلَى سَطْحِ المَاءِ)، (موج)، ناوی كۆی (موجة) یە، شەپۆل، شەپۆلەكان، شەپۆل ئەندازەیەك ئاوە لەسەر ڕووی دەریا یان ڕووبار بەرز دەبێتەوە، شەپۆلێك دێ، شەپۆلێكی دیكەی بە دوادا دێ، كە با دەیجووڵێنێ، لێرەدا خوا دەفەرموێ: ئەو دەریایە دوو جۆرە شەپۆلی هەن:**

**أ- شەپۆلێكی ژێر دەریایی.**

**ب- شەپۆلێكی سەرو دەریایی، لە سەرووشیەوە هەور هەیە، بۆیە دەفەرموێ: تاریكایی هەندێكی لەسەر هەندێكی كەڵەكە بووە، تاریكییەكە جۆرێكە، ئەگەر ئەو مرۆڤە دەستی دەربێنێ، نیزیك نیە ببینێ.**

**ئەمە واتایەكی، یاخود: دەیبینێ، بەڵام دوای زەحمەتییەكی زۆر، هەردوو واتایەكەیان بۆ كردوون، ﴿لَمۡ يَكَدۡ يَرَىٰهَا﴾، یانی: نیزیك نیە ببینێ، یاخود: دەیبینێ، بەڵام خەریك بوو نەیبینێ و زۆر بە زەحمەت بینی.**

**كە دەفەرموێ: ﴿وَمَن لَّمۡ يَجۡعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورٗا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ﴾، هەر كەسێك خوا ڕووناكیی پێ نەدا، هیچ ڕووناكییەكی نابێ، مەبەست پێی هیدایەتە، هیدایەتی**

ژیانی دنیایی، یاخود مەبەست ڕووناکیی قیامەتە کە پێی بڕوا، یانی: کەسێك خوا لە دنیادا هیدایەتی پێ نەبەخشێ و، لە دوا ڕۆژدا ڕووناکیی پێ نەدات پێی بڕوا، بە تەئکید هیدایەت و ڕووناکیی نابێت.

لێرەشدا ئەو وێکچواندنە بەو شێوەیە:

١- گومڕاییەکانی بابای کافر، وەك تاریکاییەکانن.

٢- کردەوەکانیشی وەك دەریا قووڵەکەن.

٣- ئنجا کافرەکان جاری وایە کردەوەی باشیشیان کردوە، صەدەقەیان کردوە، میوانداریيان کردوە، ئنجا ئەوەی تێکەڵیان کردوە بە کردەوە باشەکانیان، لە شتی خراپ، وەك قوربانیی سەربڕین بۆ بت و صەنەم و شیرك و گوناە، ئەویش وەك شەپۆلەکەیە.

٤- ئنجا ئەوەی کە بەسەر کردەوەکانیان دا دێ، وەك شەپۆلی دووەمە.

٥- ئەوەش کە دەوری دەدات، لە بیروڕاو بۆچوونی خراپ، وەك هەورەکە وایە.

٦- ئەوە کە هەوڵدەدات بەهرە وەربگرێ لەو کردەوانەی خۆی و، لەو حاڵەی خۆی، وەك دەرهێنانی دەستی بابای نێو ئەو تاریکاییانە وایە، کە دەستی ببینێ و نزیك نیە ببینێ، یاخود: زۆر بە زەحمەت دەستی خۆی بۆ بەدی دەکرێ.

شایانی باسیشە: لێرەدا کە خوا باسی شەپۆلە ژێریی و سەریی (**الموجات التحتية والفوقية**)ەکانی دەریا دەکات، ئیعجازێکی عیلمیی تێدایە، کە لە ساڵی (١٩٠٠ز)دا لە لایەن دەریاوانە ئیسکەندەنافییەکانەوە دۆزرایەوەو، دوای ئەوەی چوونە ژێر دەریا، گوتیان: تەنیا ئەو شەپۆلانە نین کە لەسەر دەریان، بەڵکو لە ژێر دەریاشدا شەپۆلە ژێرییەکان هەن، (د. **محمد راتب النابلسي**)، تەفسیرەکەی[1] دەڵێ:

لە ئۆقیانووسی هادیی دا شیوێك هەیە، پێی دەگوترێ: (**وادي مريان**)، کە قووڵییەکەی زیاتر لە دوازدە هەزار مەترە، واتە: (١٢)کم قووڵە، غەوواسەکانیش

---

(١ ) تفسير النابلسي، ج٥، ص١٦٩.

ناتوانن لە دوو سەد (٢٠٠)م زیاتر دابەزنە ژێر دەریا، ئەگەرنا فشار (ضغط)ی ئاو تێکیان دەشکێنێ، بەڵام جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کە ماسیی لە بنی ئەو ئۆقیانووسەدا دێ و دەچێ، واتە: لە ژێر فشاری ئاوی (١٢٠٠٠)م قووڵدا، بەبێ ئەوەی تێک بشکێ، ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە ئەو ماسییە، لە هەناویدا کیسی هەوایی هەیە، کاتێک کە کیسە هەواییەکان بەتاڵ دەکات، دەچێتە بنەوەو، کاتێک بیەوێ بێتەوە سەرێ، کیسە هەواییەکان پڕ دەکاتەوەو سەر دەکەوێتەوە، کە کۆئەندامی هەرسکردنی ماسیی، لە خواردن، ئەو هەوایە دروست دەکات، هەرکاتێک بە پێویستی زانی، ئنجا ئەو ماسییانەی لە تەختی بنی ئەو ئۆقیانووسە قووڵانەدان، واتە: لە ژێر قووڵایی (١٢)کم، (١٢٠٠٠)م، چاویان نیە، چونکە لەو تاریکاییەدا (١٢٠٠٠)م قووڵ، زۆر زۆر تاریکەو پێویستییان بە چاو نیە بۆیە خوای پەروەردگار چاوی بۆ دروست نەکردوون، بەڵکو لە ڕێی بیستنەوە، ئیش و کارەکانی خۆیان دەکەن، بە هۆی شەپۆلەکانەوە، هەر دەنگ و هەست و خوستێك بێ، لە ڕێی بیستنەوە مەداری خۆیان ساز دەکەن، خوای پەروەردگار ئەوەی بۆ دروستکردوون کە ئەوان پێویستییان پێیەتی، بەڵام ئەوەی پێویستییان پێی نیەو، گریمان چاویشیان هەبێ، پێی نابینن لەو هەموو تاریکاییەدا، خوای پەروەردگار چاوی بۆ دروست نەکردوون، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ۝٥٠ ﴾طـه، پەروەردگارمان ئەو زاتەیە، بوونی بە هەر شتێك داوەو، ڕێنماییشی کردوە، فێری کردوەو توانای پێداوە: چۆن پێ بەڕێوە بچێ!

**مەسەلەی سێیەم:**

**سەرنجڕاکێشانی مرۆڤان بۆ ئەوە، کە هەر کەس کە لە ئاسمانەکان و زەویدایەو، باڵندەکانیش هەموویان خوا بە پاکدەگرن و حوکمڕانیی ئاسمانەکان و زەوی هی خوایەو، سەرەنجامیش بەس بۆ لای خوایە، ئنجا خستنە رووی چۆنیەتی باران و تەرزە بارین و، گۆڕینی شەوو ڕۆژان و، دروستکردنی هەموو ژیاندارێك لە ئاوو، دووبارە جەختکردنەوە لەسەر ئەوە کە خوا ئایەتانێکی ڕوونکەرەوەو ڕۆشنی دابەزاندوون و، هەر ئەویش بەرەو ڕاستە ڕێ ڕێنمایی دەکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلطَّيْرُ صَٰٓفَّٰتٍ ۖ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسْبِيحَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٤١﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزْجِى سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُۥ ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ رُكَامًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِنۢ بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَصْرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُ ۖ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِۦ يَذْهَبُ بِٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٣﴾ يُقَلِّبُ ٱللَّهُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُو۟لِى ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٤﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٍ مِّن مَّآءٍ ۖ فَمِنْهُم مَّن يَمْشِى عَلَىٰ بَطْنِهِۦ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِى عَلَىٰ رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِى عَلَىٰٓ أَرْبَعٍ ۚ يَخْلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤٥﴾ لَّقَدْ أَنزَلْنَآ ءَايَٰتٍ مُّبَيِّنَٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست و حەوت بڕگەدا:

لێرەدا خوا ﷻ دێتە سەر خستنە ڕووی ژمارەیەك لە نیشانەکانی و چاکەو نیعمەتەکانی و دیاردەو دیمەنە سەرنجڕاکێش و دڵ بزوێنەکان، کە دەستەڵاتی خواو، زانیاریی خواو، میهرەبانیی خواو، حیکمەتی خواو، زۆری دیکە لە سیفەتەکانی خوایان تێدا دەدرەوشێنەوە، سەرەتا دەفەرموێ:

١)- ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، ئایا نازانی، یان: ئایا نەتبینیوە (بە چاوی عەقڵ و دڵ)، هەر کەسێك کە لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە، خوا بە پاك دەگرێ، واتە: ئەو کافرانەی بەو شێوەیەن کە پێشتر باسکرا، با پێیان وانەبێ خوا ﷻ یەکی بەوان دەکەوێ، چونکە هەر کەس کە لە ئاسمانەکان و زەوییدا هەیە، خوا بە پاك دەگرێ و ستایشی دەکات و، قەدری خوا ﷻ دەزانێ، یانی: فریشتەکان بە پلەی یەکەم، ئنجا مرۆڤ و جندی مسوڵمان و ڕوو لە خوا.

٢)- ﴿ وَٱلطَّيْرُ صَٰٓفَّٰتٍ ﴾، باڵندەکانیش باڵەکانی خۆیان ڕیز کردوون، یاخود: باڵەکانی خۆیان پان ڕاخستوون، باڵندەکان کە لەنگەر دەگرن لە کاتی پێکەوە فڕین دا، باڵەکانیان پان ڕادەخەن و ڕیزیان دەکەن.

کاتی خۆیشی لە تەفسیری سوورەتی (النحل)دا، لە کورتە باسێك دا باسی باڵندەکان و، جۆرەکانیان و چۆنیەتی پێکهاتەی جەستەیان و، شێوازو میکانیزمی فڕینیان و...هتدمان کرد.

٣)- ﴿ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسْبِيحَهُۥ ﴾، هەر کامێك لە باڵندەکان و، لەو خاوەن شعوورو هەستانەی، لە ئاسمانەکان و زەوییدا هەن، لە فریشتەکان و، مرۆڤ و جندی ئیماندار، هەر کامێکیان پاڕانەوەی خۆی و خوا بە پاککرتنی خۆی دەزانێ، یاخود: هەر کامێك لەوان بە دڵنیایی دەزانێ چۆن نوێژی خۆی دەکات و، چۆن خوا بە پاك دەگرێ. یاخود: ﴿ قَدْ عَلِمَ ﴾، ڕاناوە شێرراوە (الضّمیر المُستَتِر)ەکەی بۆ خوا دەچێتەوە، یانی: (قد علم الله)، خوا دەزانێ هەر کامێکیان چۆن نوێژی خۆی دەکات و، چۆن خوا بە پاك دەگرێ، یاخود: (صَلَاتَهُۥ)، بە مانای پاڕانەوەیە، خوا پاڕانەوەو بە پاککرتنی، هەر کامیان دەزانێ.

٤)- ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴾، بە دڵنیایی خوا زانایە بەوەی دەیکەن، واتە: هەرچی تێکڕای دروستکراوە خاوەن هەستەکان پێی هەڵدەستن، خوا پێی دەزانێ و بە وردیی ئاگادارییانە.

وەك لە شوێنی دیکەدا فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾، المؤمنون، واتە: ئێمەش لە دروستکراوان بێ ئاگا نین.

٥)- ﴿ وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾، واتە: خواش حوکمڕانیی و دەست ڕۆیشتوویەتیی لە ئاسمانەکان و زەوییدا هەیەو، هیچ وردو درشتێك نیە لەبەر دەستی ویدا نەبێ و، خۆی دروستی نەکردبێ و بەسەریشی ڕانەگات.

٦)- ﴿ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ ﴾، سەرەنجامیش هەر بۆ لای خوایە.

ئێمە لە تەفسیری ئایەتی (٤٤)ی سووڕەتی (الإسراء)دا، بە درێژیی باسی چۆنیەتی بە پاککرتن و ستایشکردنی دروست کراوەکانمان کرد، بۆ خوا، کە ئەمەش دەقی ئایەتەکەیە: ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ۗ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤٤﴾ ﴾، بۆیە کەسێ بیەوێ وردتر لە مانای بە پاککرتنی دروستکراوەکان بۆ خواو، ستایشکردنیان بۆ خواو پاڕانەوەیان لە خوا، حاڵیی بێ، با بگەڕێتەوە بۆ تەفسیری ئایەتی ژمارە (٤٤)ی سووڕەتی (الإسراء).

دوایی خوا ﷻ باسی دیاردەو دیمەنێکی زۆر گەورەو گرنگ دەکات، کە ژیانی مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەك هەمووی بەوەوە پەیوەستەو، ئەگەر ئەوە نەبووایە، هیچ ژیاندارێك ژیانی لەسەر زەوی نەدەبوو، دەفەرموێ:

٧)- ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا ﴾، ئایا نابینی، کە خوا هەورانێك لێدەخوڕێ، ئەم بینینە، وێڕای دیتنی عەقڵ و دڵ، دەشگونجێ بینینی چاو بێ، چونکە چاو هەورەکان دەبینێ، بەڵام ئەوەی پێشێ دیتنی عەقڵ و دڵ بوو، ئایا بە چاوی عەقڵ و دڵ نابینی! خوا هەوران زۆر بە نەرمیی پاڵ پێوە دەنێ، لێدەخوڕێ، (يُزْجِي): (يسوق بلطفٍ)، بە نەرمیی لێیان دەخوڕێ، پاڵیان پێوە دەنێ.

٨)- ﴿ ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ﴾، دوایی پێکیانەوە دەنووسێنێ، یانی: موتوربەیان دەکات.

٩)- ﴿ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَامًا ﴾، دوایی لەسەر یەکیان کەڵەکە دەکات، کۆیان دەکاتەوە سەریەك.

١٠)- ﴿فَتَرَى ٱلۡوَدۡقَ يَخۡرُجُ مِنۡ خِلَٰلِهِۦ﴾، ئنجا باران دەبینی لەمیانی ئەو هەورە دێتە خوار، یاخود: (ٱلۡوَدۡقَ)، دەشگونجێ بە مانای ئاو بێ: ئاو دەبینی لە میانی دا دێتە خوار، ئنجا ئەویش بە شێوەی باران و بەفرو تەرزە.

لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزۡجِي سَحَابٗا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيۡنَهُۥ ثُمَّ يَجۡعَلُهُۥ رُكَامٗا فَتَرَى ٱلۡوَدۡقَ يَخۡرُجُ مِنۡ خِلَٰلِهِۦ﴾، باسی پرۆسەی دروستکردنی هەوران و داباراندنی ئاو (باران و بەفرو تەرزە) لە میانی هەورەکان دا دەکات: ئاشکرایە کە تیشکی خۆر لە ناوی ئۆقیانووس و دەریا گەورەکان دەدات و، هەڵم پەیدا دەکات، ئنجا لە ئەنجامی فشاری هەواو بەرزیی و نزمیی کردنی و، هەڵکشان و داکشانی ئاویش دا، بە هۆی هێزی کێشندەی نێوان مانگ و زەوییەوە، دەریاکان دەجووڵێن و شەپۆل دروست دەبن و، سەرەنجام با دروست دەبێ، ئەو بایەش ئەو هەڵمە لەگەڵ خۆی دا بەرەو شوێنە ساردەکان دێنێ، ئنجا ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزۡجِي سَحَابٗا﴾، ئایا نابینی خوا بە نەرمیی هەورەکان لێدەخوڕێ، ﴿ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيۡنَهُۥ﴾، دوایی بەشەکانی هەڵمی ئاو (**جزیئات بخار الماء**)، کە لە نێو هەوردا هەڵواسراون، وردە وردە لێك نیزیك دەبنەوە، بۆ وێنە: هەورێك کە درێژییەکەی حەوت (٧)کم و، بەرزەییەکە چوار پێنج (٤ - ٥) کم بێ، چل (٤٠) تەن ئاو هەڵدەگرێ لە نێو هەوادا! ئنجا دوایی دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يَجۡعَلُهُۥ رُكَامٗا﴾، دوایی هەورەکان لەسەر یەکدی کەڵەکە دەکات، هەورەکان کە کەڵەکە بوون، بارانیان پێوەیە، تەنیا ئەو هەورانە بارانیان پێوەیە، کە لەسەر یەك کەڵەکە دەبن و موتوربە دەبن، وشەی (**الركام**)یش لە: (**الركم**)ە، یانی: (**الضم والجمع**)، کۆ کردنەوەو لەسەر یەك کەڵەکە کردن، کە دەفەرموێ: ﴿فَتَرَى ٱلۡوَدۡقَ يَخۡرُجُ مِنۡ خِلَٰلِهِۦ﴾، (**الخلال: الفتوق**)، لە کەلێنەکانی هەورەکان، ئەو ئاوە دێتە خوار، ئەوە بە نسبەت بارانەوە بە تایبەت و، بە گشتیی ئاو، دوایی دێتە سەر باسی تەرزە.

١١)- ﴿ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٖ فِيهَا مِنۢ بَرَدٖ ﴾، هەروەها خوا ﷻ لە سەرێوە لە چیاییەکان کە لە سەرێن، (مەبەست پێی هەورەکانە، کە لە شێوەی چیادان)، لە تەرزە دادەبەزێنێ، (وَيُنَزِّلُ)، خوێنراویشتەوە: (وَيُنْزِلُ)، هەردووکیان یەك واتایان هەیە.

﴿ مِن جِبَالٖ فِيهَا ﴾، لە چەند چیایەك كە لە ئاسمانن، یانی: سەرێن، لێرەدا هەورەکان تەشبیە كراون بە چیاو گردۆلكەوە، کە هەرواشەو ئەوانەی سواری فڕۆکە بوون، لە سەرێوە كە تەماشای هەورەکان دەكەی، وەك گردۆلكەو چیا، چۆن بەرزیی و نزمییان هەیە، هەورەکانیش، ئاوا دێنە بەرچاو، هەندێکیش لە زانایان گوتوویانە: كە دەفەرموێ: ﴿ مِن جِبَالٖ فِيهَا ﴾، واتە: لەبەر زۆریان هەورەکان ئاوان، چونكە هەر شتێك زۆر بێ، عەرەب وشەی (جبل وجبال)ی بۆ بەكاردێنن، گوتوویانە: (مثل الجبل).

﴿ مِنۢ بَرَدٖ ﴾، لە تەرزە (دادەبەزێنێ)، (مِنْ)ی بەشكردن (تبعیض)یشی خستۆتە سەر، چونكە هەر وایەو، هەرچی تەرزەیە هەمووی پێکەوە داناباریێ.

١٢)- ﴿ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَصۡرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُۖ ﴾، خوا هەر كەسێكی بوێ، ئەو تەرزەیەی لێ دەدات و، هەر كەسێكیشی بوێ، ئەو تەرزەیەی لێ لادەدات.

لە سۆنگەی ئەوەوە كە تەرزە زۆرجاران بە توندیی لە مرۆڤ دەدات، لە شت دەدات، بە تایبەت ئەگەر دەنكەكانی گەورە بن، بۆیە وشەی لێدەدات (یصیب)ی بەكارهێناوە!

﴿ وَيَصۡرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُۖ ﴾، یاخود ئەو تەرزەیە لادەدات لە هەر كەسێك كە بیەوێ و، ناهێڵێ پێی بكەوێ و، تووشی ئازارو زیان ببێ.

١٣)- ﴿ يَكَادُ سَنَا بَرۡقِهِۦ يَذۡهَبُ بِٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴾، خەریكە ڕووناكیی برووسكەكەی چاوان لە بەین دەبات، چاوان دەبات، یانی: هەستی دیتنیان تێدا ناهێڵێ، ئنجا ئەو كاتە وەك خۆیان نەمابن وایە.

(سَنَا)، ئەگەر بە ئەلیفی مەقصوورە بێ: (سَنَا)، یانی: (ضوء البرق والنهار)، تیشكی برووسكەو ڕۆژگار، بەڵام بە ئەلیفی مەمدوودە: (السّناء)، یانی: بەرزیی (الرفعة).

لێـره دەفەرمـوێ: ﴿ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِۦ يَذْهَبُ بِٱلْأَبْصَـٰرِ ﴾، نیزیکـه تیشـك و شـۆقی برووسـکەکەی چـاوان بـەرێ و لایانبـات، بـەڵام لـه سـوورەتی (البقـرة)دا، فەرمـووی: ﴿ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَـٰرَهُمْ ﴿٢٠﴾ ﴾، واتـه: نیزیکـه برووسـکەکه چاوەکانیـان برفێنـێ.

چونکـه لـەوێ باسـی مونافیقـەکان و دڵ نەخۆشـەکان و ئەوانـەی کـه دژی ئیسـلام بـوون، بـوو، بـەڵام لێـرەدا خـوا بـه گشـتیی بـاس دەکات، هەروەهـا لـەوێ وەك جۆرێـك لـه سـزادان، بـاس دەکات، بـەڵام لێـره باسـی لابردنـی تیشـکی برووسـکه بـۆ چـاوەکان دەکات، وەك مەدحـی بەهێزیـی شـۆق و تیشـکەکەی، چونکـه بـاس باسـی کافـران نیـه، بەڵکـو باسـی ڕوونکردنـەوەی ئایـەت و نیشـانەکانی خوایـه.

دوایی خوا ﷻ دێته سەر بابەتێکی دیکه:

١٤)- ﴿ يُقَلِّبُ ٱللَّهُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴾، خوا شەوو ڕۆژان هەڵدەگێڕێتەوە، واته: له حاڵێکەوە بۆ حاڵێك دەیانگۆڕێ، به پێچەوانەوە، یاخود: درێژیی و کورتییان پێ دەکات، یان: شەو دێته جێی ڕۆژ و، ڕۆژ دێـته جێی شەو، به دەوری خڕۆکەی زەویدا، شەوو ڕۆژ بەخێرایی یەکدی ڕاو دەنێن، وەك له شوێنێك دەفەرموێ: ﴿ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا ﴿٥٤﴾ ﴾ الأعراف، بەشەوگار ڕۆژگار دادەپۆشێ، بەخێرایی دوای دەکەوێ، ئەگەر ئینسان له دەرەوەی خڕۆکەی زەوی تەماشا بکات، دەبینێ: شەو به دوای ڕۆژێ دەکەوێ و، ڕۆژ به دوای شەوێ دەکەوێ و، به خێرایی یەکدی ڕاودەنێن، به خێرایی (سرعة)ی سیی کیلۆمەتر (٣٠)کلم له خولەکێکداو (١٨٠٠)کلم له سەعاتێك دا.

١٥)- ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُو۟لِى ٱلْأَبْصَـٰرِ ﴾، به ڕاستیی لەوەدا پەند هەیه بۆ خاوەن عەقڵان، (ٱلْأَبْصَـٰرِ)، کۆی (بصر)ە‌و، به مانای چاوە، بەڵام لێرەدا به مانای چاوی عەقڵە، بۆ خاوەن عەقڵان، لەوەدا که باسکرا پەندو عیبرەت هەیه.

ئنجـا خـوای بـەرزی مـەزن دێتـه سـەر خسـتنەڕووی بابەتێـکی دیکـەی گـەورەو گرنـگ:

١٦)- ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٖ مِّن مَّآءٖ﴾، هەروەها خوا هەموو زیندەوەرێکی لە ئاوێ دروست کردوە، لێرەدا مەبەست لە ئاو (ماء) نوتفەیە، (ماء التناسل)، ئاوێ کە وەچەی لێ پەیدا دەبێ، بۆیەش دەفەرموێ: (مِّن مَّآءٖ)، لە ئاوێك، بەنەزانراو (نكرة) هێناویەتی، واتە: هەر کامێکیان لە جۆرێك لە ئاو، لە جۆرێك لە نوتفە دروست دەبێ.

١٧)- ﴿فَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ بَطۡنِهِۦ﴾، ئنجا هەیانە لەسەر سك دەڕواو دەخشێ، کە خشۆکەکانن، وەك مارو مارمێلکەو هەشتا پێیەو تیمساح و..هتد.

١٨)- ﴿وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ رِجۡلَيۡنِ﴾، هەشیانە لەسەر دوو پێیان دەڕوات، وەك باڵندەکان.

١٩)- ﴿وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰٓ أَرۡبَعٖ﴾، هەشیانە لەسەر چوار پێیان دەڕوات، وەك ئاژەڵەکان.

٢٠)- ﴿يَخۡلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ﴾، خوا هەرچی بیەوێ دروستی دەکات، نەك هەر ئەوانە، بەڵکو خوا هەر شتێکی بیەوێ دروستی دەکات و تواناى خوا بێ سنوورە.

٢١)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾، بە دڵنیایی خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە.

٢٢)- ﴿لَّقَدۡ أَنزَلۡنَآ ءَايَٰتٖ مُّبَيِّنَٰتٖۚ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئایەتە ڕۆشنکەرەوەکانمان، یان ئایەتە ڕۆشنەکانمان، چونکە (مُّبَيِّنَٰتٖ)، خوێندراوەتەوەش: (مُبَيَّنات)، (مُّبَيِّنَٰتٖ)، ڕۆشنکەرەوەکان و، (مُبَيَّنَاتٍ)یش، ڕۆشنکراوەکان، یانی: ئایەتە ڕۆشنکەرەوەکان و ڕۆشنکراوەکانمان بۆ دابەزاندوون.

٢٣)- ﴿وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾، خواش هەر کەسێکی بیەوێ، بەرەو ڕاستە شەقام، ڕاستە ڕێی دەکات، لێرەدا (يهدي) بە مانای: ڕێنماییکردن نیە، چونکە خوا هەموو لایەکی بەرەو ڕێی ڕاستی خۆی ڕێنمایی کردوە، کەواتە: هەر کەسێ بەم ئایەتانەی خوا ڕێ نەبینێتەوە، ئەوە لەبەر ئەوەیە خوا نەیویستوە هیدایەتی تایبەتیی بدات، خوای پەروەردگاریش بۆیە نەیویستوە هیدایەتی تایبەتیی بدات و ڕاستە ڕێی بکات، چونکە ڕێنمایی خوای ڕەفز کردوە، کەسێکیش ڕێنمایی خوا (هداية الله)، قبووڵ نەکات، ڕێ بەرەو ڕاستە شەقامی خوا دەرناکات، وەك فەرموویەتی: ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ

﴿ فَهَدَيْنَاهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ﴾، فصلت - ١٧ -، واتە: ئێمە گەلی ثەموودمان ڕێنمایی کرد بوو، بەڵام کوێرییان بەسەر ڕێنمایی دا هەڵبژارد! بێگومان بێجگە لە شوێنکەوتنی ئەم ئایەتە موبارەکانەش، ڕێ بەرەو ڕاستە شەقامی خوا نیەو، بەس لە ڕێی ئایەتەکانی خواوە، ئینسان دەتوانێ ڕاستە شەقامی خوا بدۆزێتەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان کە یازدە (١١) ئایەت دەگرێتە خۆی: (٤٧ - ٥٧)، سێ تەوەرە:

تەوەری یەکەم: تەوەری سەرەتا، باسی کەسانێکە کە خۆیان بە بڕوادارو مسوڵمان دادەنێن، بەڵام لە ڕاستیدا وانین، بە بەڵگەو نیشانەی ئەوە کە ئامادە نین، کاتێك کە بانگ دەکرێن بۆ دادوەریی لە نێواندا کران لە لایەنی خواو پێغەمبەرەوە ﷺ ئامادە نین ملکەچ بکەن بۆ بڕیارو حوکمی دادوەرییەکە، مەگەر بە پێی ئارەزووی خۆیان بێ! دوایش خوا ﷻ هەڵوێستی ڕاست و دروستی بڕوادارانی ڕاستەقینە، لە بواری ڕازیبوون بە دادوەریی و حوکم و بڕیاری خواو پێغەمبەرەکەی دا ﷺ دەخاتە ڕوو و، ئامۆژگارییەکی زۆر باشی ئەو جۆرە کەسانەش دەکات، کە ئەگەر بیانەوێ مسوڵمان بن و بە بڕوادار لە قەڵەم بدرێن، دەبێ ئاوا بن.

لە تەوەری دووەمیش دا: خوا ﷻ باسی گفت و بەڵێنی خۆی بۆ بڕوادارانی چاکەکار دەکات، کە دەستڕۆیشتوویان دەکات لە زەوییدا و ئایینەکەیان بۆ دەچەسپێنێ، وەك چۆن گەلانی ڕابردوو کە پابەند بوون بە ئایین و بەرنامەی خواوە، دەستڕۆیشتووی کردوون و، بەرنامەکەی بۆ چەسپاندوون، هەروەها خوا هێمنیی و ئاساییشیشیان بۆ دەڕەخسێنێ، بەڵام بە مەرجێك خواپەرست بن، بێ ئەوەی هاوبەش بۆ خوا دابنێن.

لە تەوەری سێیەم و کۆتاییشدا: فەرمان بە مسوڵمانان دەکات کە:

نوێژ بەرپابکەن و، زەکات بدەن و، فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکەن، بۆ ئەوەی شایستەی بەزەیی و میهرەبانیی خوای پەروەردگار بن و، دڵنیاشیان دەکاتەوە کە:

کافران دەستەوسانکەری خوانین و، لێی دەرباز نابن، لە چنگی قوتار نابن، کاتێك بیەوێ سزایان بدات، چ لە دنیاو چ لە دوارۆژداو، سەرەنجامیشیان لە دوا رۆژدا بریتیە لە ئاگری دۆزەخ.

﴿ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَآ
أُو۟لَـٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٨﴾
وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ يَأْتُوٓا۟ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ ﴿٤٩﴾ أَفِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرْتَابُوٓا۟ أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ
ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُۥ ۚ بَلْ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ
وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ
وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٥٢﴾ ۞ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ لَئِنْ
أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ ۖ قُل لَّا تُقْسِمُوا۟ ۖ طَاعَةٌ مَّعْرُوفَةٌ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٥٣﴾ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ
وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ ۖ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا۟ ۚ
وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَـٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ
لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ
ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ۚ وَمَن
كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُوا۟
ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٥٦﴾ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَمَأْوَىٰهُمُ
ٱلنَّارُ ۖ وَلَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٥٧﴾ ﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{(دەغەڵ و دڵ نەخۆشەکان) دەڵێن: بڕوامان بە خواو پێغەمبەر هێناوەو فەرمانبەرین، کەچی کۆمەڵێکیان دوای ئەوە: پشت هەڵدەکەن و، ئا ئەوانەش بڕوادار نین ﴿٤٧﴾ کاتێکیش بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی بانگ بکرێن، تاکو دادوەرییان لە نێواندا بکات، کۆمەڵێک لەوان لامل دەبن و ڕوو وەردەگێڕن ﴿٤٨﴾ بەڵام ئەگەر هەق بۆ ئەوان بێ (لەو کێشەو دادوەرییەدا) بە ملکەچیی دێن بۆ لای ﴿٤٩﴾ ئایا دڵیان نەخۆشیی تێدایە، یان دوو دڵن (لە بارەی دادوەریی پێغەمبەرەوە) یان دەترسن خواو پێغەمبەرەکەی، ناهەقییان لێ بکەن؟ بەڵکو ئەوانە ستەمکارانن ﴿٥٠﴾ قسەی بڕواداران کاتێک بانگ دەکرێن بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی، تاکو دادوەرییان لە نێواندا بکات، تەنیا ئەوەیە کە بڵێن: بیستمان و فەرمانبەرین و، هەر ئەوانەش سەرفرازن ﴿٥١﴾ هەر کەسێکیش فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکات و، ترس و سامی بەرانبەر بە خوا هەبێ و، پارێزی لێ بکات، ئا ئەوانەن دەربازبووان (و بە ئامانج گەیشتووان) ﴿٥٢﴾ سوێندی زۆر قورسیشیان بە خوا خوارد، کە ئەگەر فەرمانیان پێ بکەی (بە دەرچوون لە ماڵ و سامانیان، یان ڕۆیشتن بۆ جەنگ و جیهاد، یان بە جێهێشتنی نیشتیمان)، دەردەچن، بڵێ: سوێند مەخۆن، فەرمانبەریی ئێوە زانراوە چۆنە! بێگومان خوا بەوەی دەیکەن شارەزایە ﴿٥٣﴾ بڵێ: فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن، ئنجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، بە دڵنیاییی ئەو (پێغەمبەر) ئەرکی خۆی لەسەرەو، ئێوەش ئەرکی خۆتانتان لەسەرەو، ئەگەر بە قسەی بکەن، (فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن) ڕێی ڕاست دەگرن و، پێغەمبەریش تەنیا گەیاندنی ڕوون و ئاشکرای لەسەرە ﴿٥٤﴾ خوا بەڵێنی بەوانەتان داوە کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکان دەکەن، کە وەک چۆن ئەوانەی پێش ئەوانی کردە جێنیشین، بیانکاتە جێنیشین

لە زەوییداو، ئەو بەرنامەیەی بۆی پەسند کردوون، بۆیان بچەسپێنێ و، ترس و لەرزیان بۆ بگۆڕێ بە هێمنیی و ئاساییش، (مادام وابن کە) دەمپەرستن و، هیچ شتێك ناکەنە هاوبەشم و، هەر کەسێکیش دوای ئەوە بێبڕوا بێ (یان: سپڵە بێ)، هەر ئەوانەن لادەرو لارێ ﴿٥٥﴾ (ئەی مسوڵمانینە!) نوێژ بەرپا بکەن و زەکات بدەن و، فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵ بنوێنرێ ﴿٥٦﴾ (برواداربنە!) پێتان وا نەبێ ئەوانەی بێبڕوان دەستەوسانکەر (ی خوا)ن، لە زەوییدا (دەربازیان دەبێ)و، شوێنی حەوانەوەیان ئاگری (دۆزەخ)ەو، خراپترین سەرەنجامیش ئەوێیە ﴿٥٧﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(مُذْعِنِينَ): واتە: ملکەچانە، (نَاقَةٌ مِذْعَان أي: مُنْقَادَة)، حوشترێکی (مِذعَان)، واتە: ملکەچ و دەستەمۆ، زوو یەخ بوو، کەواتە: (مُذْعِنِينَ)، یانی: (مُنْقَادِين)، تەسلیم بووان یان: (خَاضِعِيْن)، ملکەچان.

(يَحِيفَ): ﴿أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَرَسُولُهُۥ﴾، واتە: خواو پێغەمبەری خوا ﷺ ناهەقییان لێ بکەن، لە دادەوەرییدا، (الحَيْفُ: المَيْلُ فِي الحُكْمِ، والجُنُوحُ إلى أحَدِ الجَانِبَيْنِ، والحَيْفُ: الظُّلْم والجَورُ فِي الحُكُومَة)، (حَيْف) بە مانای لادان و لایەنگیریی دێ بەرەو یەکێك لە دوو لایەکاندا، هەروەها (حَيْف) بە مانای ستەم و ناهەقیی دێ، لە دادوەریی کردندا.

(حُمِّلَ): یانی: (كُلِّفَ أَنْ يَتَحَمَّلَ)، داوای لێکراوە ئەو ئەرکە هەڵبگرێ.

(وَلَيُمَكِّنَنَّ): واتە: (لَيُوَطِّدنَّ)، (لَيُرَسِّخَنَّ)، خوا بۆیان دەڕەخسێنێ، ئاینەکەیانیان بۆ بەرقەرارو سەقامگیر دەکات.

(وَلَيُبَدِّلَنَّهُم): ﴿ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ أَمۡنٗا ﴾، واتە: لە دوای ئەوەی ترسیان هەبووە، ترسەکەیان بۆ دەگۆڕێ بە هێمنیی و ئاسایش، (أَبْدَلَهُ: جَاءَ بِبَدَلٍ عَنْهُ)، (أبْدلهُ) جێداری بۆ هێنا: (وَلَيُبَدِّلَنَّهُم)، (لَيُغَيِّرَنَّ حالَهُم)، خوا حاڵیان دەگۆڕێ لەوەی کە تێیدان، کە حاڵەتی ترس و لەرزە، بۆ حاڵێکی دیکە کە هێمنیی و ئاسایشە.

﴿ أَمِ ٱرۡتَابُوٓاْ ﴾، (الإرْتِيَاب)، کەوتنە دوو دڵیی، دوو دڵیی ئەوەیە ئینسان بە هیچ لایاندا، ئەگەری هیچ کام لە دوو لایەکان، زاڵ نەکات بەسەر لایەکیاندا، بەڵام گومان (ظن) ئەوەیە کە لایەکیان زاڵبکات بەسەر لایەکیاندا، (رَيْب) و (شَكّ) یش، زۆر لێک نزیکن، هەرچەندە زۆرێک لە خەڵکی ئەوانە هەموویان تێکەڵ دەکەن، بگرە هەندێک لە زانایانیش!

(ٱلۡبَلَٰغُ): یانی: گەیاندن، (البلاغُ: اسْمُ مَصْدَرٍ بِمَعْنَى التَّبْلِيْغ)، (بلاغ) ناوی چاوگە بە مانای گەیاندن.

(جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ): یانی: ئەوپەڕی توانایان بەکار دێنن لە سوێندەکەیاندا، (طَاقَةَ مَا قَدَرُوا أنْ يَحْلِفُوا)، بەوپەڕی توانایان و، زۆر بە جەختکردنەوەوە سوێندەکەیان دەخۆن.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١- ئەم ئایەتە کە خوا تێیدا دەفەرموێ: ﴿ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ ۖ قُل لَّا تُقْسِمُوا۟ ۖ طَاعَةٌ مَّعْرُوفَةٌ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾.

ئەم بەسەرهاتەی لە بارەوە هاتوە:

{عَنِ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: أَتَى قَوْمٌ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! لَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نَخْرُجَ مِنْ أَمْوَالِنَا لَخَرَجْنَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ ۖ قُل لَّا تُقْسِمُوا۟ ۖ طَاعَةٌ مَّعْرُوفَةٌ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾}[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: کۆمەڵێك هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ گوتیان: ئەی پێغەمبەر خوا! ﷺ ئەگەر فەرمانمان پێ بکەی لە ماڵ و حاڵی خۆمان بچینە دەر، لێی دەچینە دەر، (واتە: لە پێناوی خوادا دەست لە هەموو شتێك هەڵدەگرین)، خواش ئەم ئایەتەی نارده خوار: ﴿ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ... ﴾، واتە: زۆر بە تۆخیی سوێندیان بە خوا خوارد، ئەگەر فەرمانیان پێ بکەی، دەردەچن، (بە پێی ئەم هۆی هاتنە خوارەوە: کە دەردەچن لە ماڵ و حاڵیان، یان ماڵ و سامانەکانیان و دەبەخشن، یاخود لە ماڵ و حاڵ و نیشتیمانیان دەردەچن، یان بۆ جەنگ و جیهاد دەردەچن، هەموویان دەگرێتەوە)، بڵێ: سوێند مەخۆن، فەرمانبەریی تێوە دیارو زاندراوە، چۆنە، (یاخود: فەرمانبەرییەکی پەسندو چاك بکەن، پێویست بە سوێند خواردن ناکات، بەلام هەمیشە ئینسان ئەگەر لە مەیدانی کردەواندا تێی دۆڕاند، هەوڵدەدا لە مەیدانی قساندا قەرەبووی بکاتەوە)!.

---

(١) ذكره السيوطي في «الدر المنثور» ج٦، ص٢١٤، ونسبه لابن مردويه.

٢- لە بارەی هۆی دابەزینی ئەو ئایەتەوە کە خوا تێیدا دەفەرموێ: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْـًٔا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾.

ئەم بەسەرهاتە گێردراوەتەوە:

{عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَصْحَابُهُ الْمَدِينَةَ وَآوَتْهُمُ الْأَنْصَارُ، رَمَتْهُمُ الْعَرَبُ عَنْ قَوْسٍ وَاحِدَةٍ، فَكَانُوا لَا يَبِيتُونَ إِلاَّ بِالسِّلَاحِ، وَلاَ يُصْبِحُونَ إِلاَّ فِيهِ، فَقَالُوا: تَرَوْنَ أَنَّا نَعِيشُ حَتَّى نَبِيتَ آمِنِينَ مُطْمَئِنِّينَ لَا نَخَافُ إِلَّا اللهَ؟ فَنَزَلَتْ: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْـًٔا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾}[1].

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺو هاوەڵانی هاتن بۆ مەدینەو پشتیوانەکان حەواندیانەوە، عەرەب هەمووی لە یەک کەوانەوە تیریان تێگرتن، (واتە: هەموویان لەسەریان کۆبوونەوەو هەموویان لە دژیان بوونە یەک بەرەو، کەلە کۆمەکییان لە دژ کردن)، ئنجا هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، شەو هەر بە چەکەوە دەخەوتن، بەیانی هەر بە چەکەوە، لە خەویان بێدار دەبوونەوە، بۆیە گوتیان: پێتان وایە ئێمە بژین تاکو کاتێک بێ، شەو بخەوین، دڵنیاو ئارام بین و، جگە لە خوا لە کەس نەترسین و، پێویست نەکات بە چەکەوە بخەوین و بە چەکەوە بێدار بینەوە، دەبێ ڕۆژێکی وا بێ؟! ئنجا خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارێ: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ

---

(١) أخرجه الطبراني في المعجم الأوسط: ٧٠٢٩، والواحدي في أسباب النزول ص ٢٢٢، والحاكم في المستدرك: ج٢ ص٤٠، والضياء المقدسي في: الأحاديث المختارة: ١١٤٥، قال الحاكم: هذا حديث صحيح الإسناد، ولم يخرجاه ووافقه الذهبي.

ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾﴾، کە بەڵێ، ڕۆژێکی وا دێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

پێشتریش گوتمان: ئەم دەرسەمان، تەوەری سەرەتا و یەکەمی ئایەتەکانی پێشەوە، هەشت ئایەتی یەکەم، بریتیە لە خستنە ڕووی هەڵوێستی کەسانێکی، یان بە تەواویی مونافیق و دەغەڵ، یاخود دڵنەخۆش و دوو دڵ، لە بەرانبەر خواو پێغەمبەری خوادا ﷺ بە تایبەت لە بواری دادوەریی دا، کاتێك کێشەو مشتومڕێك دەبێ، کە دیارە پێغەمبەر ﷺ خۆی دادوەر بووە، هەر وەك چۆن سەرۆکی قەوارە سیاسیی و دەوڵەتەکەش بووەو، هەوڵیداوە کێشەو گرفتەکانیان لە نێواندا چارەسەر بکات، ئنجا ئەوانە ئەگەر شتەکەیان بە دڵ بووبێ، بۆی ملکەچ بوون و، ئەگەر بە دڵیشیان نەبووبێ، ڕەخنەیان لێگرتوەو لامل بوون، هەشت ئایەتی یەکەم: ئایەتەکانی: (٤٧ - ٥٤) هەموویان لەو بارەوە هاتوون.

دوایی ئایەتێکیش (٥٥) لە بارەی بابەتێکی دیکەوەیە، کە بریتیە لە سەقامگیر کردنی ئیسلام لە زەوییداو، دەسترۆیشتوو کردنی مسوڵمانان.

پاشان دوو ئایەتی (٥٦ و ٥٧)یش، تەوەرێکی دیکەی سێیەمن کە خوا تێیاندا فەرمان بە بڕواداران دەکات بە نوێژو زەکات و دڵنیابوونیش لە شکستی بێبڕوایان و بێ ئاکامییان، شایانی باسیشە: ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (النساء)، ئایەتەکانی: (٦٠ - ٧٠)دا:

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ
يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن
يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ
رَأَيْتَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا ﴿٦١﴾ فَكَيْفَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌۢ
بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ثُمَّ جَآءُوكَ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّآ إِحْسَٰنًا وَتَوْفِيقًا ﴿٦٢﴾
أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعْلَمُ ٱللَّهُ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ وَقُل لَّهُمْ فِىٓ
أَنفُسِهِمْ قَوْلًۢا بَلِيغًا ﴿٦٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَلَوْ
أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ
لَوَجَدُوا۟ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿٦٤﴾ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ
بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ وَلَوْ
أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ ٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ أَوِ ٱخْرُجُوا۟ مِن دِيَٰرِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ ۖ
وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا۟ مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾ وَإِذًا لَّءَاتَيْنَٰهُم مِّن لَّدُنَّآ
أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيْنَٰهُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٦٨﴾ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ
ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّۦنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُو۟لَٰٓئِكَ
رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ ٱلْفَضْلُ مِنَ ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ عَلِيمًا ﴿٧٠﴾﴾.

لەوێ باسی هۆی هاتنە خواری ئەو یازدە ئایەتەمان کرد، کە نێوەڕۆکی ئەو یازدە ئایەتەی (النساء)، زۆر دەشوبهێتە نێوەڕۆکی ئەم هەشت ئایەتەی (النور)ەوە، کە لەوێ بە تەفصیل قسەمان لێ کردوون، واتە: لە بەرگی سێی ئەم تەفسیرەدا (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز).

خوا دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ﴾، دەڵێن: بروامان بە خواو بە پێغەمبەریش هێناوە، کێن وا دەڵێن؟ بە سیاق و بە سەلیقە دەزاندرێ و،

دواییش هەڵوێستەکە دەخاتە ڕوو، کە ئەوانە کەسانێکی یان موونافیقی تەواو بوون، یاخود کەسانێك بوون دوو دڵ بوون، دڵ نەخۆش بوون، ئەگەرنا ئەو هەڵوێستانەی خوا دەیانخاتە ڕوو، هی موونافیق و دڵ نەخۆش و دوو دڵان نەبێ، هی کەسی دیکە نین، مسوڵمانانی ڕاستەقینە، هەرگیز هەڵوێستیان وا نییە، دەفەرموێ: ئەو جۆرە کەسانە دەڵێن: بڕوامان بە خوا هێناو بە پێغەمبەر ﷺ هێنا، ﴿ وَأَطَعْنَا ﴾، هەروەها ملکەچ و فەرمانبەریشین، گوێڕایەڵیشین، ﴿ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ﴾، کەچی لە دوای ئەوە، کۆمەڵێکیان پشت هەڵدەکەن، ڕوو وەردەگێڕن، ﴿ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، ئا ئەوانەش بڕوادار(ی ڕاستەقینە) نین، (المؤمنين)، کە (ألـ)ی ناساندن (تعريف)ی لەسەرە، واتە: ئەو ئیماندارانە نین کە لە لای خوای پەروەردگار ناسراوو زاندراون، کە ئیماندارانی ڕاستەقینەن، یاخود (ألـ) بۆ (عهد)ە، یانی: ئەو ئیماندارانە نین، کە مەعهوودن و ناسراون بۆ خەڵك.

﴿ وَإِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ﴾، کاتێك بانگ بکرێن بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆ ئەوەی دادوەرییان لە نێوان بکات، یانی: پێغەمبەر ﷺ بەڵام بۆچی باسی خوای پەروەردگاریش دەکات؟ چونکە پێغەمبەریش ﷺ حوکمی خوای پەروەردگاری جێبەجێ کردوە، کەواتە: کە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بانگکراون، پێغەمبەر ﷺ دادوەرییەکەی کردوە، بەڵام خوا ﷻ ناوی خۆیشی خستۆتە گەڵ، چونکە کەسێك کە بە حوکمی پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبووبێ، مانای وایە بە حوکمی خوا ڕازی نەبووە، پێغەمبەر ﷺ نوێنەری خوایە، ڕەوانەکراوی خوایەو، حوکم و بەرنامەی خوا جێبەجێ دەکات، دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴾، یەکسەرو کت و پڕ کۆمەڵێکیان پشت هەڵدەکەن و ڕوو وەردەگێڕن، ﴿ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ يَأْتُوٓاْ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ ﴾، بەڵام ئەگەر هەقیان لەلا بێ، بزانن هەقەکە هی ئەوانە، لە دادوەرییەکەدا دەیبەنەوە، زۆر بە ملکەچیی و زۆر بە دەستەمۆیی دێن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ چونکە دەزانن دادوەرییەکە لە بەرژەوەندییانە، واتە: ئەوەی کردوویانەتە پێوەر، بەرژەوەندیی خۆیانە، بەرژەوەندییانی تێدا بێ،

دێن، ئەگەرنا نایەن، مانای وایە ئەوان شوێن بەرژەوەندیی خۆیان دەکەون، نەك شوێن شەریعەتی خوا، كە بەرژەوەندیی ئەوانیش و هی بەرانبەرەكانیش دابین دەكات!

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرۡتَابُوٓاْ أَمۡ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَرَسُولُهُۥ ﴾، ئەو هەڵوێستەیان لە یەكێك لە سێ سەرچاوانەوە دێ:

أ- ئایا دڵیان نەخۆشیی تێدایە؟.

ب- یان دوو دڵن؟.

ج- یاخود دەترسێن خواو پێغەمبەرەكەی ﷺ ناهەقییان لێ بكەن لە دادوەرییدا؟.

﴿ بَلۡ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، بەڵكو ئەوانە ستەمكارن، واتە: خواو پێغەمبەری خوا ﷺ ناهەقیی ناكەن، ئەو ترسەیان لە جێی خۆی دا نیە، بەڵام خۆیان ستەمكارن و لە هەمبانەی خۆیاندا گوێز دەژمێرن، بابای دز پێی وایە: هەموو كەس دزە، ئەوانیش لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای پێغەمبەری خوا ﷺ دەكەن، واتە: لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿ بَلۡ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، (بَلْ)، بۆ (إضرابٌ)ە، واتە: گواستنەوە لە حاڵێك بۆ حاڵێكی ئەولاتر، واتە: مەسەلە ئەوە نیە كە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ ناهەقییان لێ بكەن لە دادوەرییدا، بەڵام خۆیان ستەمكارن و لە هەمبانەی خۆیاندا گوێز دەژمێرن.

كەواتە: دەگونجێ ئەو سێ هۆكارەیان هەر سێكیان پێكەوە، لە یەك كاتدا تێدابن: هەم دڵیان نەخۆشیی تێدابێ، هەم دوو دڵ بن، هەم ترسیشیان هەبێ بەرانبەر بە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ چونكە: (مَنْ سَاءَ عَمَلُهُ، سَاءَتْ ظُنُونُهُ)، واتە: كەسێك كردەوەی خراپ بێ، گومانیشی خراپ دەبن.

دوایی خوا ﷻ بڕوادارانی ڕاستەقینە دەخاتە ڕوو، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا كَانَ قَوۡلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ أَن يَقُولُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَا ﴾، بێگومان

هەڵوێستی بڕواداران، (بڕوادارانی ناسراوو زاندراوو ڕاستەقینە)، هەر ئەوەیە کە ئەگەر بانگ بکرێن بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ تاکو دادوەریان لە نێواندا بکات، بڵێن: بیستمان و فەرمانبەرین، ئەوە حوکم و بڕیارەکەمان بیست و، ملکەچ و فەرمانبەریشین، جێ بەجێی دەکەین، ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾، هەر ئەوانەش سەرفرازن.

ئنجا خوا ﷻ حوکمەکە گشتییتر دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخۡشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقۡهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴾، هەر کەسێك فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات، ترس و سام و هەیبەتی بەرانبەر خوا هەبێ و، پارێز لە خوا بکات، ئەوە ئا ئەوانەن دەرباز بووان و بە ئامانج گەیشتووان.

ئنجا خوا هەڵوێستێکی دیکەی ئەو دڵنەخۆش و دڵ پڕ لە گومانانە باس دەکات:

﴿ وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ ﴾، زۆریش بە سوێندی بەهێز سوێندیان بە خوا خوارد، واتە: ئەوپەڕی توانای خۆیان بەکارهێنا لە سوێندەکەیانداو، سوێندەکەیان زۆر توخ کردەوە، زۆر جەختیان تێدا کردەوە، ﴿ لَئِنۡ أَمَرۡتَهُمۡ لَيَخۡرُجُنَّ ﴾، ئەگەر فەرمانیان پێ بکەی دەردەچن، بۆ کوێ دەردەچن؟:

أ- لە ماڵ و سامانیان دەردەچن و هەمووی دەبەخشن.

ب- یاخود: لە نیشتیمانیان دەردەچن، لە ماڵ و حاڵیان دەچنە دەرێ، بۆ جەنگ و جیهاد.

ج- یان: هەرچی تۆ پێیان بڵێی وا دەکەن و، هەر شتێك تۆ پێیان بڵێی، دەستی لێ هەڵدەگرن: ماڵ و سامانە، نیشتیمانە، گیانە، هەرچی هەیە.

﴿ قُل لَّا تُقۡسِمُواْۖ ﴾، بڵێ: سوێندێ مەخۆن، ﴿ طَاعَةٞ مَّعۡرُوفَةٌ ﴾، ئەمە دەگونجێ بەو واتایە بێ، واتە: فەرمانبەریی ئێوە فەمارنبەرییەکی زانراوەو دەزانین چۆنە، سوێندیش بخۆن، هەر دەتانناسین، یاخود ﴿ طَاعَةٞ مَّعۡرُوفَةٌ ﴾، واتە: ئێوە فەرمانبەرییەکی پەسندو

باش بکەن، پێویست بە سوێند خواردنێ ناکات، ئینسان ئەگەر لە کردەواندا تێی دۆڕاند، دەیەوێ لە قساندا تێی هەڵێنێتەوە، بە قسەی درۆ، بەڵام کەسێك لە مەیدانی کردەواندا ئەسپی تاو دابێ و، بە کردەوە ئەوەی دەیەوێ، سەلماندبێتی، زۆر پێویستیی بە قسان ناکات، بۆیە بە زۆریی ئەوانە زۆر سوێندان دەخۆن، کە ڕاست نەبن، یان لە خۆیان بە گومان بن، یان کەسایەتییەکی بێهێزیان هەبێ، بۆیە خوا ﷻ زۆر سوێند خواردنی بە پەسند نەزانیوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ ﴾القلم، فەرمانبەریی هەر زۆر سوێند خۆرێکی سووك مەکە، ئینسان کە زۆریشی سوێند خواردن، خەڵك لێی بێ متمانە دەبێ، بگرە خۆیشی متمانەی بە خۆی نیە، هەمیشە پێویست بەوە دەکات قسەکانی بە سوێندەکەی پاڵپشت بکات، هەڵبەتە جاری واش هەیە پێویست دەکات سوێند بخۆی، بۆ دڵنیا کردنەوەی لایەنی بەرانبەر، بەڵام مرۆڤ دەبێ هەوڵبدات خۆی زۆر بە سوێند خواردنەوە ڕانەهێنێ، مەگەر ناچار بێ و پێویست بکات، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾، بێگومان خوا بەوەی دەیکەن، شارەزایە، واتە: خوا تەماشای کردەوەکەتان دەکات، نەك سوێندەکانتان و قسەکانتان، شارەزای کردەوەکانیشتانە، ﴿ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ ﴾، بڵێ: فەرمانبەریی خوا بکەن و، فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکەن، گوێڕایەڵ بن بۆ خواو پێغەمبەری خوا ﷺ.

﴿ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ ﴾، ئنجا ئەگەر پشتییان هەڵکرد، لاملی بوون، بێگومان ئەو (پێغەمبەر) تەنیا ئەوەی پێی ئەرکدار کراوەو خراوەتە سەر شانی، ﴿ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ ﴾، ئێوەش ئەوەی پێی ئەرکدار کراون و خراوەتە سەر شانتان، وەك ئەرکێك، ئێوەش ئەو ئەرکەتان لەسەرە، ﴿ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا۟ ﴾، ئەگەر گوێڕایەڵیی بۆ بکەن و فەرمانبەریی بۆ بکەن، بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەوە ڕێی ڕاست دەگرن، ﴿ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴾، پێغەمبەریش ﷺ تەنیا گەیاندنی ڕوون و ئاشکرای لەسەرە، یاخود: تەنیا گەیاندنی ئاشکراکەری لەسەرە، چونکە (ٱلْمُبِينُ) دەگونجێ بە مانای ڕوون و ئاشکرا بێ، دەشگونجێ بە مانای ڕوونکەرەوەو ئاشکراکەر بێ، واتە: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بە ڕوونیی و بە ئاشکرایی،

پێی گەیاندن، ئەوە ئەرکی خۆی جێبەجێ کردوە، ئنجا دەکەوێتە سەر ئێوە، ئێوەش ئەرکی خۆتان جێبەجێ بکەن.

ئنجا دێتە سەر بابەتێکی دیکە (تەوەری دووەم) کە بریتیە لە بەڵێن دانی خوا ﷻ بە بڕوادارانی کردار باش، کە دەستڕۆیشتوویان دەکات لە زەوییداو، ئایینەکەیان بۆ دەچەسپێنێ و، ترسیان بۆ دەگۆڕێ بۆ هێمنیی و ئاسایش، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەشدا باسمان کرد: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، خوا بەڵێنی داوە بەوانەتان کە بڕوایان هێناوەو، کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، کە لە زەوییدا بیانکاتە جێنیشین، دەستڕۆیشتوویان بکات، دەستەڵاتداریان بکات، ﴿ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، وەك چۆن ئەوانەی پێش ئەوانی کردە جێنیشین و دەستڕۆیشتووی کردن، کێن ئەوانەی پێش ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ؟ هەموو ئەوانەن کە بە دوای پێغەمبەران کەوتوون و لە ڕۆژگاری خۆیانداو، خوا دەسەڵاتی پێ داون و دەستڕۆیشتووی کردوون، دواتریش زیاتر ڕوونی دەکەینەوە.

﴿ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ ﴾، هەروەها ئەو بەرنامەیەی بۆی پەسند کردوون، بۆیان دەچەسپێنێ، بۆیان سەقامگیر دەکات لە زەوییدا، ﴿ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ﴾، دوایی حاڵەکەیان لە ترس و بیمەوە بۆ دەگۆڕێ بە هێمنیی و ئاسایش، ﴿ يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْـًٔا ﴾، بەڵام بە مەرجێك ئەوانیش حاڵیان بەو شێوەیە بێ: بەندایەتیی بۆ من بکەن، تەنیا من بپەرستن و، هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشم، ﴿ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ ﴾، هەر کەسێ دوای ئەوەش بێبڕوا بێ، یاخود سپڵە بێ، (كَفَرَ)، دەگونجێ لە (کفران)ەوە بێ، بە مانای سپڵەیی و بێ وەفایی و بێ نەمەکیی بێ، دەشگونجێ لە (کفر)ەوە بێ و بە مانای بێبڕوایی بێ، هەر کەسێك دوای ئەوە بێبڕوا بێ، یاخود سپڵە بێ، ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾، بەس ئەوانەن لە ڕێ دەرچووان، دەرچووان لە حوکمی زگماك و عەقڵ و شەریعەت.

دوایی خوا ﷻ لە تەوەری سێیەم و کۆتاییدا، چوار شتان بە بڕواداران دەفەرموێ:

﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾، یەکەمیان: نوێژ بەرپا بکەن، دووەمیان: زەکات بدەن، سێیەمیان: فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکەن، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵ بنوێندرێ، ئەوە بە نسبەت خۆیانەوە، نوێژ بەرپا بکەن، واتە: با پەیوەندییتان لەگەڵ خوادا مەحکەم و توندو تۆڵ بێ، هەروەها زەکات بدەن و لە بەینی خۆتاندا بە ڕەحم و بەزەیی بن و هاوکاریی یەکدی بکەن، دەوڵەمەندەکان هاوکاریی ئەوانی دیکە بکەن، ئنجا هەمووشتان: ﴿ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ ﴾، فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکەن، کە بێگومان پێغەمبەر ﷺ نوێنەری خوایەو، پەیامی خواتان پێ ڕادەگەیەنێ، ﴿ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵ بنوێنرێ.

چوارەمیان: بە نسبەت دەرەوەی خۆشتان، بە نسبەت ناحەزانتان و دوژمنانیشتانەوە: ﴿ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان پێتان وا نەبێ دەستەوسانکەرن لە زەوییدا، واتە: دەستەوسانکەری خوا نین، (مُعْجِز)، کەسێکە بەرانبەرەکەی خۆی (عاجز) بێ توانا بکات، واتە: ئەوان دەستەوسانکەرو بێتواناکەر نین لە زەوییدا بۆ خواو دەرباز نابن لە خوا، هەر کات خوا سزایان بدات، ﴿ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ﴾، سرەوتگاشیان، ئەو شوێنەی تێیدا دەحەوێنەوە، ئاگرە، ﴿ وَلَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾، خراپترین سەرەنجام و شوێنیش کە مرۆڤی بۆ دەچێ (يصيرُ إليهِ)، بریتییە لە دۆزەخ، خوا پەنامان بدات.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**هەڵوێستی دڵنەخۆش و دەغەڵەکان لە بواری دادوەریی کردنی پێغەمبەری خوادا ﷺ، ئەوەیە کە ئەگەر حوکم و بڕیارەکە لە بەرژەوەندیی خۆیاندا ببینن، بۆی ملکەچ دەبن، ئەگەرنا هەرچەندە لافی ئیمان بە خواو بە پێغەمبەر ﷺو، لافی گوێڕایەڵیی بۆ پێغەمبەر لێ دەدەن، پشت هەڵدەکەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَمَآ أُو۟لَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ يَأْتُوٓا۟ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ ﴿٤٩﴾ أَفِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرْتَابُوٓا۟ أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُۥ ۚ بَلْ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە (١٠) بڕگەدا:

١)- ﴿ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ﴾، هەروەها دەڵێن: بڕوامان بە خواو بە پێغەمبەر هێناو فەرمانبەریشمان کرد.

دیار نیە ئەوانەی وا دەڵێن کێن؟ بەڵام بە پێی سیاق و سەلیقە دەزانرێ کە مونافیق و دەغەڵەکانن، چونکە ئەوان لافی ئیمان لێ دەدەن، بەڵام وەك ئیمانداران مامەڵە ناکەن، بەڵکو دوو دڵن لە حوکم و بڕیاری خواو پێغەمبەری خوا ﷺو، پێیان وایە: خواو پێغەمبەری خوا ﷺ ستەمیان لێ دەکەن و، دڵیان نەخۆشیی تێدایە، ئەوانە دەغەڵ و مونافیقەکانن، کە بە تەواویی مونافیق و دەغەڵ بوون، یاخود بە لای کەمەوە: جۆرێك لە دوو دڵیی و نەخۆشیی و گومانیان لە دڵدا

هەبووە، یاخود هەندێکیان مونافیقی تەواو بوون و هەندێکیشیان مسوڵمانی بە لەقە لەق بوون و، دوو دڵ بوون و، نەخۆشیی لە دڵ و دەروونیاندا هەبووە.

﴿ وَأَطَعْنَا ﴾، ملکەچیی و، گوێڕایەڵییشمان کرد بۆ خواو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُونَ ﴾، یانی: پشك و بەشی ئەوان لە مسوڵمانەتیی و لە ئیماندا، تەنیا بریتیە لە قسە (قول)، بەڵام کردەوەی لەگەڵدا نیە، بەس لاف لێدانە، بەڵام ئیسپات و سەلماندنی لەگەڵدا نیە، چونکە دوایی دەفەرموێ:

٢)- ﴿ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ﴾، دوایی کۆمەڵێك لەوانە پاش ئەو (لافلێدان) ە، پشت هەڵدەکەن، ڕوو وەردەگێڕن، ڕوو وەردەچەرخێنن.

(ثُمَّ) لێرەدا: (للترتيب الرُّتبي)، بۆ ڕیزبەندیی پێگەییە، یانی: دوای ئەوەی ئەو قسەیە دەکەن، کەچی دوای ئەوە پشت هەڵدەکەن و ڕوو وەردەچەرخێنن.

بۆچی دەفەرموێ: ﴿ فَرِيقٌ مِّنْهُم ﴾؟ چونکە هەموویان هەر کێشەو داوایان نەبووە، بانگ بکرێن بۆ دادوەریی لە نێواندا کران، تەنیا ئەوانەیان کە کێشەو مشتومڕێکیان بووە، بانگکراون، بۆیە دەفەرموێ: کۆمەڵێکیان، چونکە دڵ نەخۆش و دەغەڵەکان، هەموویان وێکڕا نەچوون بۆ دادوەریی.

٣)- ﴿ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، تا ئەوانەش بڕوادار نین، واتە: ئەو بڕوادارانە نین کە ناسراون، کە بڕوادارانی ڕاستەقینەن.

کە دەفەرموێ: ﴿ مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ﴾، یانی: دوای ئیعلانی ئیمان و دوای ئەو لاف لێدانە، کەچی پشتیش هەڵدەکەن و ڕووش وەردەگێڕن! بۆیە خوا دەفەرموێ: ئەوانە بڕوادار نین.

٤)- ﴿ وَإِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ﴾، هەروەها کاتێك بانگ بکرێن بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، تاکو دادوەریان لە نێواندا بکات، واتە: پێغەمبەر ﷺ دادوەریی بکات، بەڵام بۆیە خوای پەروەردگار باسکراوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بە حوکم و شەریعەتی

خوا دادوەریی دەکات و، بۆ ڕێزدارکردن (تشريف)ی پێغەمبەرە، کاتێك بانگ بکرێن بۆ لای خواو پێغەمبەری خوا ﷺ.

٥)- ﴿ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴾، یەکسەرو کت و پڕ کۆمەڵێکیان پشت هەڵدەکەن، لە ئایەتی پێشتردا فەرمووی: ﴿ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ﴾، دوایی کۆمەڵێکیان دوای ئەوە پشت هەڵدەکەن و ڕوو وەردەگێڕن، بەڵام لێرە دەفەرموێ: ﴿ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴾، کۆمەڵێکیان ڕوو وەردەچەرخێنن، بۆچی؟ چونکە: (أعْرَضَ: أبْلَغ مِنْ تولى)، (تولّى)، یانی: پشتی هەڵکرد، بەڵام (أعْرَضَ)، یانی: ڕووی وەرچەرخاند، ڕووی وەرگێڕا، واتە: بەس ئەوەندە نەبووە ئەو فەرمانە جێبەجێ نەکات، بەڵکو ئەصڵەن لای بە لادا نەکردۆتەوەو هەر ڕووی تێ نەکردوە، ئەوە لە حاڵێکدا کە پێیان وابێ دادوەرییەکە لە بەرژەوەندیی ئەوان، تەواو نابێ.

٦)- ﴿ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ يَأْتُوٓا۟ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ ﴾، بەڵام ئەگەر مافی ئەوان بێ، یانی: ئەگەر پێیان وابێ مافی وانی تێدادەبێ و، دادوەرییەکە لە قازانجی ئەوان تەواو دەبێ و بە قازانجی ئەوان دەشکێتەوە، ﴿ يَأْتُوٓا۟ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ ﴾، بە بە ملکەچیی و بە دەستەمۆیی دێن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵام جاری وایە کە کێشەو مشتومڕێك دەبێ، مەرج نیە، هەمیشە ئینسان لەسەر هەق بێ، تاکو هەقی پێ بدرێ، جاری وایە لەسەر ناهەقەو هەق دەدرێ بە بەرانبەرەکەی، بەڵام ئەوان بەو مەرجە دێن بۆ لای دادوەریی پێغەمبەر ﷺو بۆی ملکەچ دەبن، کە دڵنیاو مسۆگەربن لە بەرژەوەندیی و قازانجی ئەوان تەواو دەبێ، هەقیان بێ یان ناهەقیان بێ، گرنگ ئەوەیە ئەوان براوەبن و قازانج بکەن! بۆیە خوا دەفەرموێ: ئەوانە ئەو هەڵوێستەیان، سێ ئەگەران هەڵدەگرێ:

٧)- ﴿ أَفِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴾، ئایا دڵیان نەخۆشیی تێدایە؟ کە مەبەست نەخۆشیی نیفاق و دەغەڵییە.

٨)- ﴿ أَمِ ٱرْتَابُوٓا۟ ﴾، یاخود کەوتوونە دوو دڵییەوە، (شكُّوا في حُكْم الرسول)، ئایا دوو دڵن لە دادوەریی پێغەمبەر ﷺو بڕیارەکەی دا؟.

٩)- ﴿أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُۥ﴾، یاخود دەترسێن خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ ناهەقییان لێ بکەن لە دادوەرییدا، (الْحَيْفُ: الْمَيْلُ فِي الحُكُومَة)، (حَيْف) لادانە بە لایەکدا، لایەنگیریی کردنە لە دادوەریی کردن دا، ئنجا وەك پێشتریش گوتمان: (من ساء عَمَلُهُ ساءت ظنونه)، هەر کەسێك کردەوەی خراپ بێ، گومانیشی خراپ دەبن، لەو بارەوە شاعیرێك[1] دەڵێ:

إِذَا سَاءَ فِعْلُ الْمَرْءِ سَاءَتْ ظُنُونُهُ وَصَدَّقَ مَا يَعْتَادُهُ مِنْ تَوَهُّمِ

واتە: مرۆڤ هەر کاتێك کردەوەی خراپ بوو، گومانەکانیشی خراپ دەبن و، ئەوەی کردوویەتی بە عادەت، وەك خەیاڵێك لە مێشکی خۆیدا، بە ڕاستی دەزانێ.

ئەوانە چونکە کردەوەکەیان خراپ بووە، لە هەمبانەی خۆیاندا گوێزیان ژماردوون و، پێیان وابووە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ لایەنگرییان لە دژ دەکەن!!

١٠)- ﴿بَلْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾، بەڵکو حەقیقەتی مەسەلە ئەوەیە، ئەوانە ستەمکارن، بە هۆی ستەمی خۆیانەوە، پێیان وابووە پێغەمبەریش ﷺ ستەمیان لێ دەکات، بە زۆریی وایە مرۆڤ خۆی چۆن بێ، خەڵکیش وا دەبینێ، پێشینانمان جوانیان گوتوە: «هەر کەسە لە هەمبانەی خۆیدا گوێز دەژمێرێ»، ئینسان خۆی چۆن بێ، خەڵکیش وا دەبینێ، دز پێی وایە هەموو کەس دزە، ئینسانی چاك پێی وایە هەموو کەس چاکە، گێڕراوەتەوە:

جارێك یەکێك لە زانایانی سەرناس و شارەزا دەگاتە کەسێك لە شارێکەوە دێ، ئەویش لێی دەپرسێ: خەڵکی ئەو شارە چۆنن؟ ئنجا لەبەر ئەوە ئەو کەسەی پێی گەیشتوە ڕێبوارە، ئینسانێکی باش بووە، دەڵێ: خەڵکی ئەو شارە، هەموویان باشن، ئینسانی زۆر چاك و نەجیب و ڕێکن، دوای وی دەگاتە کەسێکی دیکە، دەڵێ: خەڵکی ئەو شارە چۆنن؟ پێم خۆشە بیانناسم پێش ئەوەی بچم بۆ نێویان، دەڵێ: خەڵکێکی زۆر خراپن، هەموویان شەڕو دڕو دزو خراپەکارن، ئەو زانایەش دیارە پیاوێکی بە سەلیقەو دوور بین بووە، دەزانێ کە هی یەکەمیان

---

(١) کە (المتنبي)یە.

لەبەر ئەوەی خۆی ئینسانی چاك بووە، وایزانیوە خەڵكی شارەكە هەموویان چاكن، كە بە تەكید خەڵكی شارێك چاكیان تێدا هەیە، بەڵام خراپیشیان تێدا هەیە، ئەو لە هەمبانەی خۆیدا گوێزی ژماردوون، هەر لەگەڵ چاكەكاندا تێكەڵ بووە، وایزانیوە هەموویان چاكن، هی دووەمیشیان لەبەر ئەوەی خۆی خراپ بووەو، لەگەڵ خراپاندا تێكەڵ بووە، وایزانیوە خەڵك هەموویان خراپن.

بۆیە ئەوانەش بەرانبەر بە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ ترسیان هەبووە، ستەمیان لێ بكەن، لایەنگیرییان لە دژ بكەن لە دادوەرییدا، بەڵام هۆكارەكەی ئەوەیە كە خۆیان ستەمكار بوون، بۆیە ئەو گومانەیان بەرانبەر بە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ دروست بووە، ئنجا خوای پەروەردگار كە هەرسێكیانی هێناون، هەرسێ حاڵەتەكەشیان بوون: ڕەنگە هەیانبووبێ نەخۆشیی نیفاقی تەواوی لە دڵدا بووبێ و، هەیانبووە دوو دڵ بووەو، هەشیان بووە لە ڕووداوێكی دیاریكراودا، لە دادوەرییەكی دیاریكراودا، ترسی ئەوەی هەبووە پێغەمبەر ﷺ ناهەقیی لە دژ بكات، هەرسێ حاڵەتەكان بوون، ئنجا ئایا حاڵەتەكان هەر سێكیان دابەش دەبن، بەسەر چەند پۆلێكی ئەو جۆرە كەسانەدا، یاخود هەرسێ حاڵەتەكە، لە یەك كاتدا، لە یەك كەسدا هەن؟ چونكە ئینسان ئەگەر دڵی نەخۆش بوو، دوو دڵیش دەبێ و بەد گومانیش دەبێ.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بكەم بە هەڵوێستی سێ تەفسیر لە تەفسیری شیعەكان، تاكو ئەگەر كەسێك قسەی ئەوانەی كەوتە بەرچاو، پێیان هەڵنەخەڵەتێ:

یەك: **(الطبرسي)** لە تەفسیرەكەی خۆی **(مجمع البیان)**دا، لە **(البلخي)**یەوە دێنێ: دەڵێ: لە نێوان عەلی و عوسماندا (خوا لێیان ڕازی بێ) كێشەو مشت و مڕێك بوو، عەلی دەیگوت: با بچین بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، **(الحكم بن العاص)**یش، كە ئومەوی بووە، بە عوسمانی دەگوت و بۆی پێشنیار دەكرد، نەخێر، مەچۆ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، لەبەر ئەوەی عەلی خزمیەتی و ئامۆزایەتی، بە لای ویدا دایدەشكێنێ!

کـە بێگومـان بـەس لـە تەفسـیری شـیعەکاندا ئـەو جـۆرە درۆو دەلەسـەو ئەفسـانانە دەسـت دەکـەون، ئەگەرنا چـۆن عوسـمان (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، گومانـی وای پـێ دەبـردرێ! هەتـا بـۆ (الحكـم بـن العاص)یـش، دەبـێ بەڵگـە هەبـێ، بـەڵام عوسـمان خەلیفـەی ڕاشـیدی پێغەمبـەرە ﷺو، پێغەمبـەر دووان لـە کچەکانـی خـۆی داونـێ: ڕوقییـەو ئومـم کەلثووم، ئایـا ئـەو گومانـەی پـێ دەبـردرێ: ئەچـێ بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺ بـۆ دادوەریـی و گومانـی خراپـی بەرانبـەر بـە پێغەمبـەر ﷺ هەبـێ کـە بـە لای ئامۆزایەکەیـدا، بـە لای عەلییـدا دادەشـکێنێ؟! بـە ئەئکیـد شـتی وا لـە عوسـمان ناوەشـێتەوە.

دوو: تەفسیری دووەم کە ئەو حیکایەتەی هێناوە، تەفسیری (المیزان)ە، هی (محمد حسین الطباطبائي)[1]، ئەویش هەمان حیکایەت و بەسەرهاتی هێناوە.

سێ: تەفسیرێکی فارسیشیان هەیە، (تەفسیری نمونە)[2]، ئەویش هەمان حیکایەت و بەسەرهات دێنێ.

ئـەوەی مـن تێبینیـم کردوە: تەفسـیری شـیعەکان دەگەڕێـن، چ شـتێك زیانی هەبێت حیکایەتێـك، گێڕدراوەیـەك، سـەنەدی هەبـێ و نەبـێ، بـەس بزانـن زیانی هەیە بـۆ یەکێك لـە هـاوەڵان، بـە تایبـەت بـۆ سـێ خەلیفـە ڕاشـیدەکان: ئەبـوو بەکـرو عومـەرو عوسـمان (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، یـان بـۆ دایکـمان عائیشـە خـوا لێـی ڕازی بـێ، یـان بـۆ یەکێـك لـە کەسـایەتییە بەرجەسـتەکانی ئیسـلام، کـە ئـەوان کەیفیـان پێیـان نایـەت، دەیهێنـن، کـە بـە داخـەوە، ئـەوان لـە نێـو هەمـوو هاوەڵانـدا، ژمارەیەکـی کەمیـان هێشـتوونەوە، متمانەیـان بەوانـی دیکـە نیـە، لەبـەر ئـەوەی گومانیـان، بەرامبەریـان خراپـە، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا دڵ و دەروونەکەیـان تـەواو نیـە بەرانبـەر بـە هـاوەڵان (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، ئەگـەر نـا ئێمـەش ناڵێیـن: هـاوەڵان پارێـزراو (معصـوم) بـوون لـە هەڵـە، بـەڵام واش نین وەك شـیعە گومانیـان پـێ دەبـەن و، لـە پشـت پـەردەی ڕەشـەوە تەماشـایان دەکـەن.

---

(١) ج١٥، ص١٥٨.

(٢) ج١٤، ص٥١٢.

لێرەدا قسەیەکی مەلای گەورەی کۆیە (مامۆستا مەلا موحەممەد)م، (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، هاتەوە یاد، کە دەڵێ: کەسێك تەفسیری شیعان بخوێنێتەوە، وادەزانێ قورئان شانامەیە، وەك چۆن شانامەی فیردەوسیی، هەمووی باسی ڕۆستەم و زۆراب و ئەوانە دەکات، وا دەزانێ قورئان شانامەیە، چونکە شیعە هەموو ئایەتەکان پەیوەست دەکەنەوە بە عەلییەوە، (خوا لە عەلی ڕازی بێ)، عەلییش پیاوێکی پایەداری ئیسلامەو، چوارەمین جێنیشینی پێغەمبەری خوایە ﷺ بەڵام ئەوەی کە شیعە بۆی دەڵێن، زۆر لە ئایەتەکان وا تەفسیر دەکەن، کە ئەوە لەگەڵ عەلییەتی، یان لەگەڵ دوازدە ئیمامەکانیەتی، یان لەگەڵ حەسەن و حوسەینیەتی، یان لەگەڵ فلانکەسیەتی، هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نیە.

ئەهلولبەیت و خزمانی پێغەمبەریش ﷺ بێگومان هەر کەسێك مسوڵمان بێ ڕێزو خۆشەویستیی و تەقدیری زۆری لە دڵدا دەبێ بۆیان، ئنجا چۆن دەبێ ئینسان خزمەکانی پێغەمبەری خوای ﷺ خۆشنەوێن؟ ئەو خزمانەی کە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بوون، بەڵام لەو لاشەوە: دیسان چۆن دەبێ ئینسان هاوەڵەکانی پێغەمبەری ﷺ خۆش نەوێن، ئەو هاوەڵانەی لە پیاوان و ئافرەتان کە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بوون و، پێغەمبەری خوا ﷺ لە چەندان فەرموودەی دا مەدح و ستایشیان دەکات، ئەو هاوەڵانەی لە دوای پێغەمبەر ﷺ جێنیشینایەتییان کردو، لە دوای وی پەیام و بەرنامەکەییان خزمەت کردو، بە مرۆڤایەتییان گەیاند، کەسێك ئینصاف و ویژدانی هەبێ، ناگونجێ هاوەڵەکانی پێغەمبەری ﷺ خۆشنەوێن، هەروەها ناشگونجێ خزمان و نیزیکانیشی خۆش نەوێن، خوا لێیان ڕازی بێ، ئەوانەی کە بە ڕێی پێغەمبەردا ﷺ ڕۆیشتوون و، وەفادار بوون بۆ ڕێبازو بەرنامەکەی.

**مەسەلەی دووەم:**

**خستنە ڕووی هەڵوێستی ڕاست و شەرعییانەی مسوڵمانانی ڕاستەقینە لە بەرانبەر دادوەریی و بڕیاری پێغەمبەری خوادا ﷺ کە بریتییە لە: گوێ بۆ گرتنی و جێبەجێ کردنی (بیستمان و فەرمانبەرین)، کە بڵێن: بڕیارەکەمان بیست و تێی گەیشتین و حاڵیی بووین، ئنجا فەرمانبەرو گوێڕایەڵین و جێبەجێی دەکەین:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٥٢﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:**

١)- ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾، بە دڵنیایی قسەی بڕواداران، هەر کات بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی بانگکران تاکو دادوەرییان لە نێوان دا بکات، ئەوەیە کە بڵێین: بیستمان و فەرمانبەرین، (إِنَّمَا)، وەك زۆر جار گوتومانە: (أَدَاةُ الحَصْر والإثبات)، ئامرازی کورتهەڵێنان و چەسپاندنە، یانی: قسەی بڕواداران تەنیا ئەو قسەیە، بڕوادارانی ڕاستەقینە، (ٱلْمُؤْمِنِينَ)، (أل)ەکەی بۆ ناساندنە، ئنجا یان بۆ جینسەو مانای هەموو گرتنەوە (إستغراق) دەگەیەنێ، واتە: هەموو بڕواداران ئەوە قسەیان دەبێ، بڕوادارانی تەواو، یاخود (أل)ەکە بۆ عەهدە، واتە: بڕوادارانێك کە ناسراون و دەزانرێ کێن؟ ئەوە قسەیانە، لە چ کاتێکدا؟

﴿إِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ﴾، کاتێك بانگ بکرێن بۆ لای خواو بۆ لای پێغەمبەرەکەی ﷺ تاکو دادوەرییان لە نێواندا بکات، واتە: پێغەمبەر ﷺ دادوەرییان لە بەینــدا بکات، قسەکەیان چییە؟ دەبێ تەنیا چ قسەیەك بکەن؟

﴿ أَن يَقُولُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ﴾، ئەوەیە کە بڵێن: بیستمان و فەرمانبەرین، واتە: ئەوەی کە پێمان گوترا، بیستمان، لێی حاڵی بووین و تێی گەیشتین، جێبەجێشمان کردو، ئێمە فەرمانبەرین بۆی.

٢)- ﴿ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾، تەنیا ئا ئەوانەش سەرفرازن، وشەی (مُفْلِح) کە لەسەر کێشی (مُفْعِل)ەو، بە مانای بکەر (فاعل)ە، لە (فَلاح)وە هاتوە، (فَلاح)، یانی: سەرفرازیی و بە مراد گەیشتن، بە ئامانج گەیشتن، ئنجا (مُفْلِح): ئەو کەسەیە بە ئامانج و مراد دەگات، بە کام و مرادی خۆی دەگات.

٣)- ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾، هەر کەسێك فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات و، ترس و سامی بەرانبەر بە خوا هەبێ و، پارێز لە خوا بکات.

ئا ئەوانە دەربازبووانن، سەرکەوتوو (فَائِز): کەسێکە (مَفَازة)ی بڕیبێ، یانی: کە لە بیابانێکی بێ ئاوەوە دەربازو قوتار بووبێ، ئا ئەوانە کەسانێکن، بە ئامانج گەیشتوون.

(القرطبي)، لێرەدا بەسەرهاتێك دەگێڕێتەوە: لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەکەوە، دەڵێ:

{ذَكَرَ أَسْلَمُ أَنَّ عُمَرَ رضي الله عنه، بَيْنَمَا هُوَ قَائِمٌ فِي مَسْجِدِ النَّبِيِّ ﷺ وَإِذَا رَجُلٌ مِنْ دَهَاقِينِ الرُّومِ قَائِمٌ عَلَى رَأْسِهِ وَهُوَ يَقُولُ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: مَا شَأْنُكَ؟ قَالَ: أَسْلَمْتُ لِلَّهِ. قَالَ: هَلْ لِهَذَا سَبَبٌ! قَالَ: نَعَمْ! إِنِّي قَرَأْتُ التَّوْرَاةَ وَالزَّبُورَ وَالإِنْجِيلَ وَكَثِيرًا مِنْ كُتُبِ الأَنْبِيَاءِ، فَسَمِعْتُ أَسِيرًا يَقْرَأُ آيَةً مِنَ القُرْآنِ، جَمَعَ فِيهَا كُلَّ مَا فِي الكُتُبِ المُتَقَدِّمَةِ، فَعَلِمْتُ أَنَّهُ مِنْ عِنْدِ اللهِ، فَأَسْلَمْتُ، قَالَ: مَا هَذِهِ الآيَةُ؟ قَالَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ ﴾، فِي الفَرَائِضِ، ﴿ وَرَسُولَهُۥ ﴾، فِي السُّنَنِ، ﴿ وَيَخْشَ ٱللَّهَ ﴾، فِيمَا مَضَى مِنْ عُمُرِهِ، ﴿ وَيَتَّقْهِ ﴾، فِيمَا بَقِيَ: ﴿ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾، وَالفَائِزُ مَنْ نَجَا مِنَ النَّارِ وَأُدْخِلَ الجَنَّةَ. فَقَالَ عُمَرُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أُعْطِيتُ جَوَامِعَ الكَلِمِ[١]}[٢].

---

(١) أخرجه: البخاري: ٦٩٩٦، ومسلم: ٥.

(٢ ) الجامع لأحكام القرآن: ج١٢، ص٢٥٠.

(القرطبي)، دەڵێ: (أَسْلَمُ)، باسی کردوە (کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین و شوێن کەوتووانی هاوەڵان)، دەڵێ: ڕۆژێك عومەری کوڕی خەتتاب لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ ڕاوەستابوو، یەکێك لە (دَهَاقِین)، [کۆی: (دِهْقَان)، کار بەردەستێك، بەرپرسێك]ی ڕۆمەکان، لەسەر سەری وەستابوو، دەیگوت: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)، شایەدی دەدەم کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیەو، شایەدی دەدەم کە موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە، عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) لێی پرسی، چیتە، بۆچی وادەڵێی؟ گوتی: مسوڵمان بووم، لێی پرسی: هۆیەکی هەیە، ئەو مسوڵمان بوونەت؟ گوتی: بەڵێ، ئنجا بۆی باسکرد، گوتی: من تەورات و زەبوورو ئنجیل و زۆرێك لە کتێبی پێغەمبەرانی پێشووم خوێندوونەوە، بەڵام گوێم لە دیلێك بوو، (دیلێکی مسوڵمان کە لە لای ڕۆمەکان بووە)، ئایەتێکی لە قورئان دەخوێندەوە، کە هەرچی لە کتێبە پێشووەکاندا هەیە، لەم ئایەتەدا کۆکراوەتەوە، زانیم کە ئەو قورئانە (لە ئایەتێکیدا نێوەڕۆکی کتێبە پێشووەکانی هەموو کۆکردۆتەوە)، لە لایەن خواوەیە، بۆیە مسوڵمان بووم، عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: ئەو ئایەتە کامەیە؟ کابرای (دِهْقَان)، گوتی: قسەی خوای بەرز کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾، گوتی: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ ﴾، هەر کەسێ فەرمانبەریی خوا بکات، (فِي الْفَرَائِضِ)، لە جێبەجێ کردنی فەرزەکاندا، ﴿ وَرَسُولَهُۥ ﴾، فەرمانبەریی پێغەمبەرەکەشی بکات، (فِي السُّنَنِ)، لە ڕێبازەکەیدا، ﴿ وَيَخْشَ ٱللَّهَ ﴾، ترس و سام و هەیبەتیشی بەرانبەر بە خوا بوو بێ، لەو تەمەنەی دا کە ڕابردوە، ﴿ وَيَتَّقْهِ ﴾، پارێزیش لە خوا بکات، لەوەدا کە دێ لە تەمەنی، ﴿ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾، ئا ئەوانە دەربازبووان و بە ئامانج گەیشتووانن، گوتی: (الْفَائِزُ)یش کەسێکە لە ئاگری دۆزەخ دەرباز بووبێ و، خرابێتە بەهەشتەوە، عومەریش (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (أُعْطِيتُ جَوَامِعَ الْكَلِمْ)، من وشە کۆکەرەوەکانم پێ دراون.

واتــە: ئــەو وشــانەی مانایــەکان کــۆ دەکەنــەوە، کــە فەرموویەتــی: پێمــدراون (أُعْطِيْتُ)، عومـەر (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، وای لێکداوتـەوە کـە مەبەسـت پێـی قورئانە، وشــەکانی قورئــان هەمــوو مانایــەکان کۆدەکەنــەوە، بــەڵام هەندێــك لــە زانایــان ئــەم فەرمایشــتەی پێغەمبــەر ﷺ وا مانــا دەکــەن کــە مەبەســتی فەرمایشــتەکانی خۆیەتـی، کـە بـە تەئکیـد هیـچ فەرمایشـتێك وەك فەرمایشـتی خـوا کۆکـەرەوە نیـە، بـۆ مانـاو مەبەسـتەکان، بێگومـان پێناسـەی تـەواوی (جَوَامِعُ الكَلِمْ)، بەسـەر قورئانـدا دەچەسـپێ، بــەڵام فەرمایشــتی پێغەمبەریــش ﷺ لــە چــاو قســەی خەڵکــی دیکــە، ئەویــش کۆکــەرەوە بــوون، بــۆ زۆر لــە مانــاو مەبەســتەکان.

**مەسەلەی سێیەم:**

**دووبارە باسی هەڵوێستی دیکەی دەغەڵ و دڵنەخۆشەکان کە بەوپەڕی تواناوە سوێند خواردنیانە لەسەر فەرمانبەریی کردنیان و، ئامۆژگاریی کردنیان بە فەرمانبەریی کردنی بە کردەوە، ئەگەرنا خۆیان بەرپرسیارن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ قُل لَّا تُقْسِمُوا طَاعَةٌ مَّعْرُوفَةٌ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٥٣﴾ قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴿٥٤﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:**

**١)- ﴿وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ﴾، ئەو جۆرە خەڵکانە (کە پێشتر باسمان کردن و دەغەڵ و دڵنەخۆش و دوو دڵەکانن)، بەو پەڕی توانایانەوە سوێندیان خوارد.**

**(الجَهْدُ: مُنْتَهى الطَّاقَة)، (جَهْد) ئەو پەڕی توانایە، یانی: (جَاهِدِينَ أَنْفُسَهُمْ، أَيْ بَالِغِينَ بِهَا أَقْصَى الغَايَة)، زۆر خۆیان ماندوو کردو گەیاندیانە ئەو پەڕی، هەموو توانای خۆیان بەکارهێنا لە سوێند خواردنەکەیاندا.**

**ئایا سوێندیان لەسەر چی خوارد، ئەو سوێندە بەقوەت و بەهێزە؟.**

**٢)- ﴿لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ﴾، (گوتیان:) ئەگەر تۆ فەرمانیان پێ بکەی، ئەوان دەردەچن، لە کوێ دەردەچن و بۆچی دەردەچن؟ لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمان کرد یانی: لە ماڵ و سامانیان دەردەچن، بەڵام ئەو تەعبیرە سێ واتایان دەگەیەنێ:**

**یەك: دەردەچن لە هەموو ماڵ و سامانیاندا لە پێناوی خوادا.**

**دوو: دەردەچن لە نیشتیمان و ماڵ و حاڵیان و، بە جێی دەهێڵن لە پێناوی خوادا، ئامادەن کۆچ بکەن.**

سێ: دەردەچن لە ماڵێ، بۆ جەنگ و جیهادو ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمنان.

كە هەر سێكیان، كاری زۆر گەورەن.

٣)- ﴿ قُل لَّا تُقۡسِمُواْ ﴾، خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: پێیان بفەرموو: سوێند مەخۆن، واتە: ئەو سوێندەتان كە خواردوە، خواردوە، بەڵام جارێكی دیكە سوێند مەخۆن، یاخود ئەو سوێندەشتان كە خواردوە، پێویستیی نەدەكردو، پێویست ناكات ئاوا بە جەختكردنەوەوە سوێند بخۆن، بۆچی؟.

٤)- ﴿ طَاعَةٞ مَّعۡرُوفَةٌ ﴾، ئەم ڕستەیە دوو واتای هەن:

أ- فەرمانبەریی ئێوە زانراوەو ناسراوە، چۆنە! سوێند بخۆن و نەخۆن دەتانناسین، (أي: إنّ طَاعتَكم معلومةٌ كَيْفَ هيَ؟)، فەرمانبەرییەكەتان زاندراوە چۆنە! بۆیە بە سوێند خواردن بۆتان ناپۆشرێ و، ئەو بێهەڵوێستییە، لە بواری كردەوەدا، بە سوێند خواردنی سەر زارەكیی، بۆتان قەرەبوو نابێتەوەو بۆتان ناپۆشرێ.

ب- واتەیەكی دیكەی ئەوەیە: ﴿ طَاعَةٞ مَّعۡرُوفَةٌ ﴾، یانی: با لە ئێوەوە فەرمانبەرییەكی پەسندو چاك هەبێ، ئەو كاتە حەوجێی ئەو سوێند خواردنە نابن، لە جیاتی ئەوەی زۆر خۆتان ئەزیەت بدەن بە سوێندی قورس و تۆخ و جەخت لەسەر كراوە، بە كردەوە پابەندو فەرمانبەربن، تا ئەوە ئامانجتان بۆ دەپێكێ.

٥)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴾، چونكە بە دڵنیایی، خوا شارەزایە بەوەی دەیكەن، واتە: ئەو تەماشای كردەوەكەتان دەكات، داخۆ چۆنە، ئنجا ئەگەر كردەوەكەتان باش بێت، ئەوە باشە، ئەگەر نا، مادام كردەوەتان خراپ بێ، هەرچەندە سوێندی قورس و بە زەحمەت بخۆن، بەو پەڕی تواناتانەوە سوێند بخۆن، لە لای خوا بایی فلسێكە، چونكە خوا ﷻ دڵتان دەبینێ و كردەوەكەتان دەبینێ، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {إِنَّ اللهَ لاَ يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ، وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ}، (أخرجه مسلم: ٢٥٦٤، عنْ أبِي هريرةَ)، واتە: خوا تەماشای دیمەن و ماڵ و سامانتان ناكات، بەڵكو تەماشای دڵ و كردەوەكانتان دەكات.

کەواتـە: ئـەوەی شـوێنی سـەرنجی خوایـە، ئـەوێ چـاك بکـەن، کـە دڵـە، بـا دڵەکانتـان پـاك و چـاك بـن، نەخۆشـیی و گومـان و دوو دڵییـان تێـدا نەبـێ، هەروەهـا کردەوەکانیشـتان پـاك و چـاك بکـەن، کـە لـە لای خـوای پـەروەردگار پێـوەر کردەوەیە، نـەك قسـە، هەڵبەتـە قسـەی مرۆڤیـش بەشـێکە لـە کـردەوەی، بـەڵام ئـەوەی جێـی سـەرنجی خـوای پـەروەردگارە: دڵ و کردەوەیـە.

٦)- ﴿ قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ ﴾، بڵێ: فەرمانبەریی خوا بکەن و، فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکەن، واتە: ملکەچ بن بۆ قورئان و بۆ ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ.

٧)- ﴿ فَإِن تَوَلَّوْا ﴾، ئنجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، ڕوویان وەرگێڕا، (أَعْرَضُوا عَنِ الإِلْتِزَام)، ڕوویان وەرچەرخاند لە پابەندیی.

٨)- ﴿ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ ﴾، بە دڵنیایی ئەو (پێغەمبەر) تەنیا ئەوەی خراوەتە سەر شانی، لەسەریەتی جێبەجێی بکات.

٩)- ﴿ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ ﴾، ئێوەش ئەوەی کە خراوەتە سەر شانتان، دەبێ جێبەجێی بکەن.

ئـەوەی خراوەتـە سـەر شـانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەوەیـە: پەیـام و بەرنامـەی خـوای پەروەردگارتـان بـۆ ڕوون بکاتـەوە، بـە ڕوونیـی و بـە ئاشـکرایی پێتـان بگەیەنێ، ئێـوەش لـە سـەرتانە جێبەجـێ بکـەن، واتـە: هـەر کەسـە بەرپرسـیارە، بەرانبـەر بـە ئەرکـی خـۆی.

١٠)- ﴿ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا ﴾، بە دڵنیایی ئەگەر فەرمانبەریی وی (پێغەمبەر ﷺ) بکەن، ڕێی ڕاست دەگرن، (تَهْتَدُوا)، یانی: دەکەونە سەر ڕاستە ڕێ، دەکەونە سەر ڕێی هیدایەت، (إِهْتَدى: سَلَكَ الطَّرِيْقَ القَوِيْم)، (اهتدى) ڕێی ڕاستی گرت.

١١)- ﴿ وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴾، پێغەمبەریش ﷺ تەنها گەیاندنی ڕوون و ڕوونکەرەوەی لەسەرە، (البَلَاغ: اسْمُ مَصْدَرٍ بِمَعْنى التَّبْلِيْغ)، (بلاغ) ناوی چاوگە بە مانای

گەیاندن، وەك (أداء) یانی: (تأدِيَة)، جێبەجێکردن ئەمە ڕوونکردنەوەی ئەوەیە کە لەسەر پێغەمبەرە ﷺ، ئایا ئەرکی وی چییە؟ ﴿ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴾، گەیاندن و پێڕاگەیاندنی ڕوون و ئاشکرا، یاخود ڕوونکەرەوە، ئەوە ئەرکی ویە، دوایی ئەوە دەکەوێتە سەر ئێوە، کە هەرچی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی گەیاندوون، جێبەجێی بکەن و پێی هەڵسن.

**مەسەلەی چوارەم:**

**بەڵێندانی خوا بە بڕوادارانی کردار باش، کە بیانکاتە جێنیشین لە زەویداو، باڵادەستیان بکات، وەك گەلانی دەسترۆیشتووی پێشوو، هەروەها چەسپاندنی بەرنامەیان و هێمنیی بۆ ڕەخساندنیان، بەڵام بە مەرجی خواپەرستیی بێ خڵتەی شیرك، ئنجا فەرمانکردن بە بڕواداران کە نوێژ بەرپا بکەن و زەکات بدەن و، فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکەن، بۆ ئەوەی شایستەی بەزەیی خوابن و، دڵنیاش بن: کافران لە چنگی خوا، کاتێك بیەوێ سزایان بدات، دەرباز نابن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٥٦﴾ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۖ وَلَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٥٧﴾ ﴾.

**شیکرنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، خوا بەڵێنی داوە بەوانەتان کە بڕوایان هێناوەو، کردەوە باشەکانیان کردوون، [چ بەڵێنێك، چ گفتێك، چ موژدەیەکی پێ داون؟]، کە بیانکاتە جێنیشین، جێنیشینی خۆی لە زەویدا، واتە: دەسترۆیشتوویان بکات بە جۆرێك کە لەسەر زەوی حکومڕان بن و، خاوەن دەسەڵات بن.

٢)- ﴿ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، وەك چۆن ئەوانەی پێش ئەوانی کردنە جێنیشین و دەسترۆیشتوو و حوکمڕانی کردن.

**ئەوانی پێش ئەوان کێن؟:**

**أ- هەندێك لە زانایان گوتوویانە: مەبەست پێی بەنوو ئیسرائیلە.**

**ب- هەندێك گوتوویانە: لە نێو بەنوو ئیسرائیل دا مەبەست پێی داوودو سولەیمانە، کە ئەوانە پادشاش بوون و، پێغەمبەریش بوون (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم).**

**ج- هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێی مووسایە ﷺ.**

**بەڵام چونکە خوا بە گشتیی فەرموویەتی، واتە: هەموو ئەوانەی خوا دەستڕۆیشتووی کردوون لە زەویدا لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمَ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و، لە شوێنکەوتووانی پێغەمبەران هەمووان دەگرێتەوە، بەڵکو دەگونجێ بڵێین: جگە لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمَ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و، شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانیش، هەموو ئەوانەی کە خوای باڵا دەست دەستەڵاتی پێداون لە زەوییدا، یانی: وەك چۆن خەڵکی دیکە لە پێشوواندا دەستڕۆیشتوو بووەو، حوکمڕان بووە، خوا ئاوا ئێوەش کە ئەگەر ئیماندارین و کردەوەی باش بکەن، دەتانکاتە حوکمڕان لە زەوییدا.**

**ئەوەی دواییم بۆیە گوت، هەرچەند لە تەفسیرەکان دا نەمبینیوە، چونکە کوا کامە لە پێغەمبەران دەسەڵاتدار بوون و حوکمڕان بوون لە زەوییدا؟ ئەوەی کە دیارە بە ئاشکرا هەر داوودو سولەیمان (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)ن، بەڵام شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانیش دەگرێتەوەو، هەموو ئەوانەش کە لە پێش ئۆممەتی ئیسلامدا، خوا بە جۆرێك لە جۆرەکان دەستەڵاتی پێداون، ئنجا چ دەسەڵاتەکەیان بە هەق بە کارهێنابێ، کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و، شوێنکەوتوانیان بوون، جێنیشینەکانیان بوون، چ بە ناهەق بەکاریان هێنابێ، کە جگە لە وان بوون بە زۆریی، چونکە ئەوانیش حوکمڕانی دادگەرو چاکیان تێدا هەبوون و هی ستەمکارو خراپیشیان هەبوون.**

٣)- ﴿ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ ﴾، ئەو ئایینەی بۆشی پەسند کردوون، بۆیان دەچەسپێنێ، (وَلَيُمَكِّنَنَّ)، یانی: (ليوَطِّنَنَّ لَهُمْ دِيْنَهُم، يَعْني: مِلَّتَهُم التي ارتضاها لَهُم)، ئەو ئایین و ڕێبازەی خوا بۆی پەسند کردوون، بۆیان دەچەسپێنێ و سەقامگیری دەکات.

٤)- ﴿ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ﴾، دوای ئەوەش کە ترس و لەرزیان لەسەرە ئێستا، بۆیان دەگۆڕێ بۆ هێمنیی و ئاسایش، (الطبري)، گوتوویەتی: (لَيُبَدِلَنَّهُم: لَيُغَيِّرَنَّ حالَهُم، أَبْدَلَهُ جَاءَ بِبَدَلٍ عَنْهُ)، (لَيُبْدِلَنَّهُم)، واتە: جێگرەوەیان بۆ دێنێ، شتێکی دیکە، حاڵێکی دیکە، جیا لەوەی ئێستا تێدان.

٥)- ﴿ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ﴾، ئەوانیش بەندایەتیی بۆ من دەکەن و، هیچ شتێك ناکەنە هاوبەشم، واتە: ئەوە مەرجی خوای پەروەردگارە بۆیان یاخود: لە حاڵێکدا خوا ئەو بەڵێنەتان بۆ جێبەجێ دەکات، کە ئیماندارو کردەوە باش بن و، بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و، هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشی.

٦)- ﴿ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴾، هەر کەسیش لە دوای ئەوە، دوای ئەو حەقیقەتانەی ڕوونکرانەوە، بێبڕوابێ، یاخود سپڵە بێ، ئا ئەوان دەرچووان، (كَفَرَ) دەگونجێ مەبەست پێی: (كُفْرَانُ النِعْمَةِ)، بێ، واتە: سپڵەیی و بێ ئەمەکیی، دەشگونجێ مەبەست بێبڕوایی بێ بەرانبەر بە خواو پێغەمبەر ﷺو ئیسلام، هەر کەسێك بێبڕوابێ یاخود سپڵە بێ.

﴿ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴾، ئا ئەوانە دەرچووانن، لە چی دەرچوون؟

أ- لە حوکمی خواڕسك و زگماك.

ب- لە حوکمی عەقڵی سەلیم.

ج- لە حوکمی شەریعەت دەرچوون.

٧)- ﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾، نوێژیش بەرپا بکەن، [ئەوە بەشێکی گەورەو گرنگی مافی خوای پەروەردگارە]، زەکاتیش بدەن، ئەویش بەشێك لە مافی خەڵکە.

٨)- ﴿ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ ﴾، فەرمانبەریی پێغەمبەریش بکەن، یانی: بە قسەی قیادەی خۆشتان بکەن: هەقی خوا جێبەجێ بکەن و، هەقی خەڵك جێبەجێ بکەن و، بە قسەی سەرپەرشتیاران و مشوورخۆرانی خۆشتان بکەن، کە ئەو کاتە پێغەمبەر ﷺ بووە، دوایی هەر کەسێکی دیکە لە ڕێی پێغەمبەرەوە ﷺ سەرپەرشتیی خەڵك دەکات و، پێش خەڵك دەکەوێ، بە ڕێی شەریعەتدا، کە دوو پایە سەرەکییەکەی بریتین لە: نوێژ، وەك هەقی مەعنەویی خوا، زەکات: وەك هەقی خەڵکی خوا.

٩)- ﴿ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵدا بنوێنرێ.

بە نسبەت نێو خۆتانەوە ئاوابن، بە نسبەت دوژمنان و ناحەزانیشتانەوە:

١٠)- ﴿ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، پێت وانەبێ ئەوانەی بێبڕوان، دەرباز بوون، ڕۆیشتوون و لە دەست دەرچوون، بە دڵنیایی ئەوان دەستەوسانکەر نین بۆ خوا ﷻ لە زەوییدا، ئەوان دەستەوسانکەر نین بۆ خوا کاتێك بیەوێ بیانفەوتێنێ و سزایان بدات لە دنیادا، یان لە دواڕۆژدا، لە دەستەڵاتی خوا قوتار نابن.

١١)- ﴿ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ وَلَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾، شوێنی حەوانەوەیان دۆزەخەو، خراپترین سەرەنجامیشە.

## کورتە باسێک

## ئایەتی (٥٥)و چوار ڕاستیی مەزن

بەڕێـــزان!

چـوار ڕاسـتیی مـەزن لـەم ئایەتـی ژمـارە (٥٥) وەردەگریـن: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْـًٔا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾:

### یەکەم: ئیعجازێکی مێژوویی:

پێشـتریش باسـمان کـرد: ڕای زیاتـری زانایـان وایـە کـە ئـەم سـوورەتی (النـور)ە، لـە سـاڵی شەشـەمی کۆچییـدا، واتـە: چـوار پێنـج سـاڵ پێـش کۆچـی دوایـی پێغەمبـەر ﷺ دابەزیـوە، کـە ئـەو کاتـە مسـوڵمانان حـاڵ و باڵیـان وابـووە، لـە ژێـر تـرس و لـەرزدا بـوون و، لـە هـەر چـوار لای دنیـاوە هەڕەشـەیان لـێ کـراوە لـە لایـەن دەوڵەتـی ڕۆمـەوە، لـە لایـەن دەوڵەتـی فارسـەوە، لـە لایـەن مونافیقەکانـەوە، لـە لایـەن جوولەکەکانـەوە، زۆر لـە حاڵەتێکـی ناخۆشـدا بـوون، زۆر جـۆرە فشـاریان لەسـەر بـوون، بـەڵام تـا لـە ئـەو کاتـەدا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: خـوا بەڵێنـی داوە بەوانەتـان کە ئیمانیـان هێنـاوەو، کـردەوە باشـەکان دەکـەن کـە بیانکاتـە جێنیشـین لـە زەوییـدا، وەك چـۆن ئەوانـی پێـش ئەوانـی کردۆتـە جێنیشـین لـە زەوییـداو، ئایینەکەیـان کـە بـۆی هەڵبـژاردوون، بۆیـان بچەسـپێنێ و، ترسیشـیان بـۆ بگـۆڕێ بـە هێمنیـی و ئاسـاییش.....

ئـەو بەڵێنـەی خـوا داویەتـی بـە هـاوەڵان، دوایـی ئـەو بەڵێنـە هاتۆتـە دی، لەسـەردەمی ئەبـوو بەكـرو عومـەرو عوسـمان و عەلـی دا (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، لـە سـەردەمی چـوار خەلیفـە ڕاشـیدەكان، كـە بـە نـاوی خەلیفـەش نـاسراون، لـە سـەردەمی ئەوانـدا، خـوا ﷻ كردنـی بـە جێنیشـین و تایینەكەشـی چەسپاندو تـرس و لەرزیشـی بـۆ گۆڕیـن بـە هێمنیـی و ئاسایش، ئەمـە ئیعجازێكـی مێژووییـە، چونكـە لـە كاتێكـدا خـوا ئـەو بەڵێنـەی بـە مسـوڵمانان داوەو، ئـەو موژدەیـەی پێـداون، كـە مسـوڵمانان حاڵیـان ئـەوە بـووە، لـە هەمـوو لاوە دوژمـن سـەریان تێنـاون و، مەترسـییان هەبـووە لـە ڕۆم و فـارس و، لـە دوژمنانـی نێـو خـۆو دەرەكیـی، ئنجـا بـا لـەو بـارەوە ئـەم دوو دەقـەش بێنیـن:

**١- (دَخَلَ عَدِيُّ بْنُ حَاتِمٍ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ لَهُ: «يَا عَدِيُّ! أَمَا إِنِّي أَعْلَمُ مَا الَّذِي يَمْنَعُكَ مِنَ الإِسْلَامِ، تَقُولُ: إِنَّمَا اتَّبَعَهُ ضَعَفَةُ النَّاسِ، وَمَنْ لَا قُوَّةَ لَهُ، وَقَدْ رَمَتْهُمُ الْعَرَبُ، أَتَعْرِفُ الْحِيرَةَ؟ قَالَ: قُلْتُ: لَمْ أَرَهَا، وَقَدْ سَمِعْتُ بِهَا. قَالَ: «فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَيُتِمَّنَّ اللَّهُ هَذَا الأَمْرَ، حَتَّى تَخْرُجَ الظَّعِينَةُ مِنَ الْحِيرَةِ، حَتَّى تَطُوفَ بِالْبَيْتِ فِي غَيْرِ جِوَارِ أَحَدٍ، وَلَيُفْتَحَنَّ كُنُوزُ كِسْرَى بْنِ هُرْمُزَ» قَالَ: قُلْتُ: كِسْرَى بْنُ هُرْمُزَ؟ قَالَ: «نَعَمْ، كِسْرَى بْنُ هُرْمُزَ، وَلَيُبْذَلَنَّ الْمَالُ حَتَّى لاَ يَقْبَلَهُ أَحَدٌ» قَالَ عَدِيُّ بْنُ حَاتِمٍ: «فَهَذِهِ الظَّعِينَةُ تَخْرُجُ مِنَ الْحِيرَةِ، فَتَطُوفُ بِالْبَيْتِ فِي غَيْرِ جِوَارٍ، وَلَقَدْ كُنْتُ فِيمَنْ فَتَحَ كُنُوزَ كِسْرَى بْنِ هُرْمُزَ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَكُونَنَّ الثَّالِثَةُ، لِأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ قَالَهَا)، (أخرجه: أحمد: ١٨٢٨٦، تعليق شعيب الأرنؤوط: بعضه صحيح وهذا إسناد حسن).**

واتـە: ڕۆژێـك عەدیـی كـوڕی حاتەمـی طائیـی ئـەو كاتـەی كـە مسـوڵمان دەبـێ، دەچێتـە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ، (دوای ئـەوەی خوشـكەكەی نامـەی بـۆ دەنووسـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ مـن دیـل بـووم، منـی ئـازادی كـردم لەبـەر ئـەوەی كـە كچـی حاتەمـی طائیـی بـووم، زۆر ڕێـزی لێگرتـم، تـۆش وەرە بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕێـزت دەگـرێ، ئنجـا عەدیـی كـوڕی حاتەمـی طائیـی چـوو بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە درێـژەی چەنـد قسـەیەكدا)، پێـی فەرمـوو: ئـەی عەدیـی!

من دەزانم چ شتێك ڕێ لە تۆ دەگرێ کە بێیە نێو ئیسلامەوە، دەڵێی: ئەوانەی شوێن ئیسلام کەتوون خەڵکی بێهێزو بێ توانان و، عەرەبیش هەمووی دژیانە (مسوڵمانانە)، بەڵام ئەی عەدی! ئایا شارەزای (حِيرَةَ)ی (ئە کاتە شارێك بووە)، گوتم: نەمبینیوە، بەڵام بیستوومە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، خوا ئەم ئایینە تەواو دەکات، تاکو ئافرەتی کەژاوەدار بە تەنێ لە (حِيرَةَ)وە دەچێ بۆ مەککە، تەوافی بەیت دەکات، بەبێ ئەوەی لە پەنای کەسدا بێ، خەزێنەکانی کیسرای کوڕی هورموزیش دەگیرێن، گوتم: کیسرای کوڕی هورموز؟ (واتە: پادشای فارس)، فەرمووی: بەڵێ، کیسرای کوڕی هورموز، هەروەها ماڵ و سامان دەبەخشرێتەوەو کەس وەری ناگرێ، (دەگوترێ: وەرن کێ زەکاتی دەوێ؟ کەس پێویستیی پێی نابێ)، (عەدیی کوڕی حاتەم دەڵێ:) ئنجا ئەوە ئێستا من دەیبینم، ئافرەتی کەژاوەدار لە (حِيرَةَ)ەوە دەچێ تەواف دەکات بە دەوری کەعبەدا، بە بێ ئەوەی لە پەنای کەسدا بێ، (ئەوەیان ئاوا هاتۆتە دی)، هەروەها خۆشم لەگەڵ ئەوانەدا بووم کە خەزنەکانی کیسرای کوڕی هورموزمان گرتن، سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، سێیەمیشیان هەر دەبێ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی.

سێیەمیان ئەوەیە کە ماڵ و سامان دەبەخشرێتەوەو کەس نابێ وەری بگرێ، کە ئەویش لە سەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا هاتە دی، دەیانگوت: ڕەحمەت لەو کەسە بێ زەکاتی دەوێ بیدەینێ، کەس نەبوو وەری بگرێ.

ئەم فەرمایشتە وەك لە کتێبی پێنجەمی مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع دا) باسم کردوە، لێی وەردەگیرێ، یەکێکە لەو بەڵگانەی کە ئافرەت دەگونجێ بە تەنێ سەفەر بکات، سەفەری دووریش، بەڵام، بە مەرجێك ڕێیەکە ئەمین بێ، یاخود ئەو ئامرازەی پێی دەچێ، جێی دڵنیایی بێ، کاتی خۆی کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {لاَ يَحِلُّ لامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ، أَنْ تُسَافِرَ مَسِيرَةَ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، لَيْسَ مَعَهَا حُرْمَةٌ} (أخرجه البخاري:

١٠٣٨)، واتە: هەر ئافرەتێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێ، بۆی نیە بۆ ماوەی شەوو ڕۆژێك بە سەفەر بچێ، مادام خزمێكی مەحرەمی لەگەڵ نەبێ.

مەبەستی پێ ئەو كاتە بووە، كە ئەو كاتە ڕێگایەكە جێی دڵنیایی نەبووەو، ئامرازی سەفەركردنەكەش وڵاخ بووەو، ئەو كاتە پیاویش بە تەنێ بە زەحمەت سەفەری بۆ كراوە، چ جای ئافرەت، بەڵام كە واقیعەكە دەگۆڕێ، حوكمەكەش دەگۆڕێ، چونكە (**القرافي**)، لە كتێبی: (**الإحكام في تمييز الفتاوى عن الأحكام وتصرُّفات القاضي والإمام**)دا، دەڵێ: ئەو حوكمانەی [ نەگەر گوتبای: ئەو فەتوایانەی باشتر بوو]، كە بناغەیان لەسەر عورف و عادەتە، هەر كاتێك عورف و عادەتەكە، حاڵ و واقیعەكە گۆڕا، ئەو فەتواو حوكمەكەش ئۆتۆماتیكی دەبێ بگۆڕێ[1]، پێغەمبەر ﷺ كاتی خۆی كە فەرموویەتی: با ئافرەت بە تەنێ سەفەر نەكات، لەبەر ئەوەی هەل و مەرجەكە وایخواستوە، ئافرەت مەترسیی ڕێی لەسەر هەبووە، تووشی ستەم لێكران و زیناو نارەحەتیی ببێ، بەڵام كە شێوازی سەفەر كردنەكە دەگۆڕێ، حاڵ و واقیعەكە دەگۆڕێ، حوكمەكەش دەگۆڕێ، پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو كاتە وایفەرمووە، نەگەرنا نەوەتا دوایی كە ئیسلام زۆر پەرەی گرتوەو سەقامگیر بووە، فەرموویەتی: ئافرەتی كەژاوەدار [(**الظَّعِينَةُ**)، ئافرەتێك كە بە سواری وڵاخی بە كەژاوەدار سەفەر دەكات]، بە تاقی تەنیا لە (**حِيرة**)وە دەچێ بۆ كەعبەو لەوێش تەواف دەكات، كەواتە: دروستە ئافرەت بە تەنێش سەفەر بكات، بە مەرجێك ڕێیەكەی ئەمین بێ و، لە خۆی دڵنیا بێ و، لە مەترسیی دوور بێ.

**٢- [عَنْ أَبِي العَالِيَة قَالَ: مَكَثَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ خَائِفاً، يَدْعُوُ إِلَى اللهِ سِرًا وَعَلاَنِيَةً، قَالَ: ثُمَّ أُمِرَ بِالْهِجْرَةِ إِلَى الْمَدِينَةِ، قَالَ: فَمَكَثَ بِهَا هُوَ وَأَصْحَابُهُ خَائِفُونَ، يُصْبِحُونَ فِي السِّلاَحِ وَيُمْسُونَ فِيهِ، فَقَالَ رَجُلٌ: مَا يَأْتِي عَلَيْنَا يَوْمٌ نَأْمَنُ فِيهِ، وَنَضَعُ السِّلاَحَ؟ فَقَالَ النَّبِي ﷺ: لاَ تَغْبُرُوْنَ إِلاَّ يَسِيراً حَتَّى يَجْلِسَ الرَّجُلُ مِنْكُمْ فِي الْمَلَإِ الْعَظِيمِ مُحْتَبِيًا فِيهِ، لَيْسَ فِيهِ حَدِيدَةٌ، وَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ]**[2].

---

(١) ص ٣١٨، ٣١٩.

(٢ ) جامع البيان: ج١٨، ص١٧٠، رقم: ٢١١٣٣.

واتــە: ئەبــوو عالیــە دەگێڕێتــەوە دەڵــێ: پێغەمبــەری خــوا ﷺ دە (١٠) ســاڵان مایــەوە، ترســی هەبــوو، (واتــە: لــە مەککــە)، خەڵکــی بــە ئاشــکراو بــە پەنهانیــی بانــگ دەکــرد بــۆ لای خــوا، دوایــی خــوا فەرمانــی پێکــرد کــۆچ بــکات بــۆ مەدینــە، خــۆی و هاوەڵانــی، دیســان لــە ترســدا بــوون، ڕۆژیــان دەکــردەوە هــەر بــە چەکــەوە، شــەویان لــێ دادەهــات هــەر بــە چەکــەوە، [واتــە: شــەوو ڕۆژ هــەر چەکیــان پێبــوو]، پیاوێــك گوتــی: دەبــێ ڕۆژێــك بــێ، لــە خۆمــان دڵنیــا بیــن و چــەك دابنێیــن؟ پێغەمبــەر ﷺ فەرمــووی: تەنیــا کەمێکــی پــێ دەچــێ، پیاوێکتــان لــە کــۆڕو مەجلیســێکی مەزنــدا دادەنیشــێ، دەســتی لــە ئەژنــۆی وەرهێنــاوە [(مُحْتَبِيًا)، واتــە: دوو دەســتی بــە ئەژنۆیەکانــی گرتــوون، بــۆ ئــەوەی پشــتی ئیســڕاحەت بــکات]، کــە لــەو کــۆڕو مەجلیســەدا ئاســنەواڵەیەکی تێــدا نیــە.

واتە: چەکی تێدا نیەو پێویست ناکات چەك هەڵبگرن.

## دووەم: ڕەوایەتیی حوکمڕانیی چوار خەلیفەکان:

ئــەم ئایەتــە بەڵگــەی ڕەوایەتیــی خەلیفایەتیی و پێشــەوایەتیی چوار جێنیشــینەکانی پێغەمبــەرە ﷺ: ئەبــوو بەکــرو عومــەرو عوســمان و عەلــی (خــوا لێیــان ڕازی بــێ)، بۆچــی؟

چونکــە دوێنراوەکان، هــاوەڵان بــوون، کــە خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴿٥٥﴾ ﴾، ئایــا خــوا کێــی دوانــدوە؟ بێگومــان هاوەڵانــی دوانــدوون (خــوا لێیــان ڕازی بــێ)و، لــە ڕۆژگاری ئەوانیشــدا، چــوار خەلیفــەکان حوکمیــان کــردوەو، هــەر ســێ موژدەکانیشــیان کــە خــوا پێــی داون، بۆیــان هاتوونــە دی:

١- (الإسْتخْلافُ فـي الأرضْ)، کرانە جێنیشین لە زەویدا.

٢- (التَمْكينُ للدِّين)، سەقامگیر کرانی ئایین.

٣- (تَبْدِيْل الخَوْفِ بِالأَمْن)، ترس و لەرز گۆڕدران بە هێمنیی و ئاسایش.

هەر سێ موژدەکە هاتوونە دی، لە ڕۆژگاری هاوەڵاندا (خوا لێیان ڕازی بێ).

کەواتە: چوار خەلیفەکان (خوا لێیان ڕازی بێ)، هەر چواریان بە پێی گفت و بەڵێنی خوا ﷻ وەك موژدەیەك کە بە تایبەت بە هاوەڵانی داوەو، بە گشتیی بە ئیماندارانی ئەو کاتەی داوە، کە زۆربەیان هاوەڵان بوون، بە پیاوان و ئافرەتانەوە، بوونە حوکمڕان، مانای وایە ئەوە، ئەو چاکەو نیعمەتە بووە، چونکە خوا وەك چاکەو نیعمەتێك بۆ هاوەڵانی خستۆتە ڕوو، کەواتە: جێنیشینایەتیی چوار جێنیشینەکان:

ئەبوو بەکر، عومەر، عوسمان، عەلی، نیعمەتێکی گەورەی خوا بووەو بەڵێن و موژدەیەکی خوا بووە بۆ هاوەڵان، کە بۆی هێناونە دی، ئنجا هەر سێ موژدەکەش هاتوونە دی: هەم ئەوان بوون بە جێنیشین، هەم ئایینەکە چەسپاوەو سەقامگیر بووە، هەم ترس و لەرزیشیان بۆ گۆڕدراوە بە هێمنیی و ئاسایش، هەر سێکیان هاتوونە دی.

ئنجا ئەمە لە ڕاستیدا وەڵامێکی ددان شکێنە بۆ شیعە[1]، ئەوانەی تانە دەدەن لە ڕەوایەتیی حوکمڕانیی هەرسێ خەلیفەکان: ئەبوو بەکرو عومەرو عوسمان، بێگومان عەلییش چوارەمین خەلیفەی ڕاشیدە (خوا لێی ڕازی بێ)، بەڵام لەبەر ئەوەی شیعە، بەس ئەو بە حوکمڕانی ڕاست و شەرعیی و ڕەوا دەزانن، بۆیە باسی ئەو ناکەین - خوا ﷻ لە سەردەمی چوار خەلیفەکان و هاوەڵاندا ئەو گفت و بەڵێنەی خۆی هێناوەتە دی و، ئەو نیعمەتە بۆ ئەهلی ئیسلام هاتۆتە دی، کە باشترین شێوازی حوکمڕانییان لە دوای شێوازی پێغەمبەر ﷺ پێشکەش بە مرۆڤایەتیی کردوە، کە ببێتە چرایەك و سەرمەشقێك بۆ هەموو ئەوانەی دەیانەوێ حوکمڕانییەکی شەرعییانە بکەن، دەبێ لە دوای پێغەمبەر

---

(١) شیعەی دوازدە ئیمامیی.

ﷺ تەماشای ئەبوو بەکرو عومەرو عوسمان و عەلی بکات (خوا لێیان ڕازی بێ)، بۆیە هەر کەسێك تانە لەوان بدات، لە ڕاستییدا تانەکەی بەسەر خۆیدا دەشکێتەوە، چونکە ئەوەی کە خوا هێناویەتە دی بۆ ئەوان، مژدەو بەڵێنی خوای پەروەردگارە.

من جار جار تەماشای تەفسیرە شیعییەکانیش دەکەم، سێ لە تەفسیرە شیعییەکانم لەلان:

١- (المیزان)ی (محمد حسین الطباطبائي)،

٢- (تفسیر نمونه) کە فارسییە، هی (ناصر مکارم شیرازی)

٣- (الکاشف)ی (محمد جواد مغنیة)،

هیچ کامیان لە کاتی تەفسیرکردنی ئەم ئایەتەدا، بەلای ئەوەدا ناچن کە مەبەست پێی حوکمڕانیی و خەلیفایەتیی چوار خەلیفە ڕاشیدەکانە، بە تایبەتیی سێیەکان: ئەبوو بەکرو عومەرو عوسمان (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە بێگومان هۆکاری ئەوە جگە لە بوغزو کینەو دڵڕەشیی، هیچی دیکە نیە، ئەگەرنا ئەوەتا دیارە: لە دوای پێغەمبەر ﷺ هاوەڵان لەسەر ئەبوو بەکر ڕێك کەوتوون، دوای ئەبوو بەکر، لەسەر عومەر ڕێك کەوتوون، دوای عومەریش لەسەر عوسمان ڕێك کەوتوون، لە دوای عوسمانیش لەسەر عەلی ڕێك کەوتوون، ئنجا عەلی (خوا لێی ڕازی بێ)، لە (نهجُ البلاغة)[1]دا، ئەوە دەکاتە بەڵگەی ڕەوایەتیی حوکمڕانیی و جێنیشینایەتییەکەی خۆی: دەڵێ: هەر ئەوانە منیان هەڵبژاردوە، کە ئەبوو بەکرو عومەرو عوسمانیان هەڵبژاردوون! نەك وەك ئەوەی شیعە دەڵێن: خوای زاناو شارەزا فڵان ئایەت و فڵان ئایەتی لە بارەوە دابەزاندن و، پێغەمبەریش ﷺ

---

(١) نهج البلاغة، ص ٣٧٥، الخطبة (٢٠٥) [... والله ما کانت لي في الخلافة رغبة ولا في الولایة إربة، ولکنکم دعوتموني إلیها، وحملتموني علیها...] هەروەها بڕوانە: ص ٤٢١، الکتاب رقم: ٦ [إنه بایعني القوم الذین بایعوا أبابکر وعمر وعثمان، علی ما بایعوهم علیه...].

فەرمووبێتی: تۆ لە دوای من ئیمامی! ئەگەر ئەو بەڵگانە هەبوونایە، عەلی (خوا لێی ڕازی بێ)، لە (نهجُ البلاغة)دا، باسی دەکردن، کە هیچ کام لەو بەڵگانەی نەهێناونەوە، بەڵکو دەڵێ: ئەوانەی بەیعەتیان بە من داوە، هەر ئەوانەش بەیعەتیان بە ئەبوو بەکرو عومەرو عوسمان داوە، واتە: ڕەوایەتیی حوکمڕانیی من، لە بەیعەت و لە بەڵێن پێدانی خەڵك و جەماوەرەوە هەڵدەقوڵێ و، هەر ئەوانیش ڕەوایەتییان دا، بە سێ جێنیشینەکەی پێش من (خوا لە هەموویان ڕازی بێ).

**سێیەم: لەم ئایەتە موبارەکە وەردەگیرێ: کە چوار خەلیفە ڕاشیدەکان: ئەبوو بەکرو عومەرو عوسمان و عەلی، خواپەرستی ڕاست و ساغ و دوور لە شیرك بوون.**

چونکە خوا ﷻ لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْـًٔا ﴾، ئەمە دوو واتای هەن:

أ- (حاڵتان وایەو بۆیە خوا ئەوەتان بۆ دەکات، ئەو بەڵێنەو ئەو سێ موژدەیەتان پێ دەداو، بۆتان دێنێتە دی)، چونکە ئێوە بەندایەتیی بۆ من دەکەن و، هیچ شتێك ناکەنە هاوبەشم، ئەوە واتایەکی، یانی: خوا هەواڵ دەدا کە ئێوە ئاوان، بۆیە خوای پەروەردگار واتان بۆ دەکات، کەواتە: ئەو چوار خەلیفەیە چاك بەندایەتییان بۆ خوا کردووەو هیچ جۆرە شیرکێکیان، نە شیرکی گەورە، نە شیرکی گچکەیان تێدا نەبووە.

ب- دەشگونجێ مەبەست مەرج بێ، واتە: بە مەرجێك ئەوەتان بۆ دەکەم، ئێوەش بەندایەتیی بۆ من بکەن و، هاوبەشم بۆ پەیدا نەکەن، ئنجا مادام خوا بەڵێنەکانی هێناونە دی، کەواتە: دیارە مەرجەکەش هاتۆتە دی، (**إذا تَحَقَّقَ الشَّرْطُ تَحَقَّقَ المَشْرُوط، وتَحَقُّق المَشْرُوط دَلِيلٌ عَلَى تَحَقُّق الشَّرْطِ**)، ئەگەر بە مەرج گیراو هاتە دی، مانای وایە مەرجەکەش هاتۆتە دی، جاری وا هەیە مەرج دادەنرێ و، مەرج گیراو نایەتە دی،

بەڵام ئێستا بە مەرج گیراوەکە، یاخود گفت و بەڵێنەکە هاتۆتە دی، کە بریتیە لەوەی خوای پەروەردگار بیانکاتە خەلیفە لەسەر زەوی و، دینەکەیان بۆ بچەسپێنێ و، ترسیان بۆ بگۆڕێ بە هێمنیی و ئاسایش، ئەو بەڵێنە هاتۆتە دی، کەواتە: دیارە مەرجەکەش هاتۆتە دی، کە بریتیە لە بەندایەتیی بۆ خوا کردن، بە بێ هاوبەش بۆ دانانی.

**چوارەم: ئەوانەی بەرانبەر بەو نیعمەتەی خوا سپڵەو ناسوپاس بوون، دووچاری لادان (فسق) بوون:**

﴿ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾، هەر کەسێك لە دوای ئەوە سپڵە یان بێبڕوا بێ، ئا ئەوانەن لە ڕێ دەرچووان، هەڵبەتە دەشگونجێ مەبەست لە کوفر: ﴿ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ ﴾، بێبڕوایی بێ، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێی کوفرانی نیعمەت بێ، واتە: سپڵەو ناسوپاس بێ، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە: لە ڕۆژگاری ئومەوییەکانەوە، کە لە ڕێبازی چوار خەلیفە ڕاشیدەکان لایان دا - کە هەر هەمان ڕێبازی پێغەمبەری خاتەمە ﷺو ئەوان درێژە پێدەری ڕێبازەکەی پێغەمبەر ﷺ بوون لە حوکمڕانییدا - لە سەردەمی بەنی ئومەییەوە کە حوکمی ئیسلامیی لە شوڕاییەوە گۆڕا بۆ میراتیی و بنەماڵەیی، ئا ئەوە جۆرێك لە سپڵەیی بوو بەرانبەر بە نیعمەتی خوای پەروەردگارو، جۆرێك لە دەرچوون بوو لە ڕێبازەکەی پێغەمبەر ﷺو، حوکمی زگماك و عەقڵیش، چونکە شوکرانی نیعمەت، شوکری نیعمەتی ئیسلام ئەوە بوو، کە لە سەر هەمان ئەو ڕێبازەی چوار خەلیفە ڕاشیدەکان بڕۆن، بەڵام بە داخەوە لە سەردەمی موعاوییەوە، کە لە بارو دۆخێکی نائاساییدا بووە بە حوکمڕان، دواییش لە کاتێکدا کە خۆی لە ژیاندا مابوو، چوار پێنج ساڵ پێش ئەوەی بمرێ، یەزیدی کوڕی بە زۆر سەپاند بەسەر موسوڵماناندا، لە ڕاستییدا ئەوە جۆرێك بوو لە سپڵەیی بەرانبەر بەو نیعمەتی ئیمان و ئیسلامە، بەرانبەر بەو ڕێبازە نوورانیی و درەوشاوەیەی کە پێغەمبەر ﷺ هێنای و چوار

خەلیفە ڕاشیدەکانی درێژەیان پێدا، بەڵێ حوکمڕانیی ئیسلامیی لە سەردەمی بەنوو ئومەییەوە لادان و خلیسکانی تێ کەوت، لە شێوازی حوکمڕانییدا، بە تایبەت لە شێوازی دانانی حوکمڕاندا کە پێشێ بە ڕاوێژ (شوری) بوو: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ٣٨﴾ الشوری، بەڵام لە موعاویە بەو لاوە، کرا بە حوکمی بنەماڵەیی و میراتیی و لەسەر ڕێبازە ڕاست و ڕوونەکەی پێغەمبەری خواو چوار خەلیفە ڕاشیدەکانی نەما، هەرچەندە زۆر بە جەختکردنەوە، پێغەمبەری خوا فەرمووبووی: [عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ مِنْ بَعْدِي، وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ] (أخرجه أحمد: ١٧١٨٤، وأبو داود: ٤٦٠٧، والترمذي: ٢٦٧٦، وقال: حسن صحيح، وابن ماجه: ٤٢، والحاكم: ٣٢٩، وقال: صحيح)، واتە: ڕێبازی من و ڕێبازی خەلیفە سەر ڕاستە ڕاستە ڕێ کراوەکانم بگرن، دانانی لەسەر ڕۆبگرن.

بێگومانیش مەبەست لە (ڕێباز) شێوازی حوکمڕانییە، بۆیەش باسی خۆی و جێنشینەکانی کردوە، ئەگەرنا هاوەڵان بەگشتیی لەسەر ڕێبازە گشتییەکەی بوون.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان کە دەرسی کۆتاییە لە سووڕەتی (النور)، حەوت ئایەت دەگرێتە خۆی: (٥٨ - ٦٤) کە پێنج بابەتی سەرەکییان تێدا خراونە ڕوو:

١- باسی ئەوە کە دەبێ مسوڵمانان کۆیلەکانیان، بە نێرو مێوەو، منداڵەکانیان چ باڵغ بن چ نە باڵغ نەبن، لەسەر مۆڵەت وەرگرتن ڕابهێنن، لە کاتێکدا دەچنە ژوورە تایبەتییەکانیانەوە، بە تایبەت لەو کاتە تایبەتییانەدا، کە تێیاندا پشوو دەدەن: پێش نوێژی بەیانیی، کاتی نوێژی نیوەڕۆ، دوای نوێژی خەوتنان.

٢- ژنانێك کە گەیشتوونە حاڵەتی نائومێدیی لە منداڵبوون و شوکردن و....هتد، مۆڵەتدراون کە لە ڕووی پۆشتەییەوە سەختگیریی نەکەن و، خۆیان لە هەندێك پۆشاك سووك بکەن، بەڵام ئەگەر ئەو مۆڵەتەش وەرنەگرن بۆ ئەوان باشترە.

٣- لە بارەی خواردن و خواردنەوەوە، سەغڵەتیی ناخرێتە سەر: کوێرو شەل و نەخۆش و ساغەکان، کە لە ماڵی خۆیان و خزم و نیزیکانیان و، متمانە پێکەرو برادەرانیان بخۆن، بە کۆمەڵ یان تاك تاك و، پێویستە لە کاتی چوونە ژووریشدا سڵاو بکەن.

٤- کاتێك مسوڵمانان بۆ کارێکی کۆکەرەوەو هەرەوەزیی کۆدەبنەوە، نابێ بە بێ مۆڵەتی پێغەمبەر ﷺ (هەروەها کەسێك کە لە شوێنیەتی) بەولاو لادا بڕۆن.

٥- نابێ مسوڵمانان بانگ کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆیان، یان بانگکردنیان بۆی، واتە: چ پێغەمبەر ﷺ بانگیان بکات، چ ئەوان بانگی پێغەمبەر ﷺ بکەن، وەك بانگکردنی هەندێکیان بۆ هەندێکیان تەماشا بکەن و، ئەوانەش کە بێ فەرمانیی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن، دەبێ چاوەڕێی بەڵایەکی دنیایی، یان سزایەکی دوا ڕۆژیی بکەن.

لە کۆتاییشدا خوا هۆشداریی بە مسوڵمانان دەدات، کە خوا ئاگاداری هەموو حاڵ و باڵێکیانەو، لە ڕۆژی بۆ لا گەڕانەوەیدا، هەواڵیان پێ دەدات کە چییان کردوەو چییان نەکردوە!

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِيَسۡتَـٔۡذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَبۡلُغُواْ ٱلۡحُلُمَ مِنكُمۡ
ثَلَٰثَ مَرَّٰتٖۚ مِّن قَبۡلِ صَلَوٰةِ ٱلۡفَجۡرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعۡدِ صَلَوٰةِ ٱلۡعِشَآءِۚ
ثَلَٰثُ عَوۡرَٰتٖ لَّكُمۡۚ لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ وَلَا عَلَيۡهِمۡ جُنَاحُۢ بَعۡدَهُنَّۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيۡكُم بَعۡضُكُمۡ
عَلَىٰ بَعۡضٖۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ (٥٨) وَإِذَا بَلَغَ ٱلۡأَطۡفَٰلُ مِنكُمُ
ٱلۡحُلُمَ فَلۡيَسۡتَـٔۡذِنُواْ كَمَا ٱسۡتَـٔۡذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦۗ
وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ (٥٩) وَٱلۡقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا يَرۡجُونَ نِكَاحٗا فَلَيۡسَ عَلَيۡهِنَّ
جُنَاحٌ أَن يَضَعۡنَ ثِيَابَهُنَّ غَيۡرَ مُتَبَرِّجَٰتِۢ بِزِينَةٖۖ وَأَن يَسۡتَعۡفِفۡنَ خَيۡرٞ لَّهُنَّۗ وَٱللَّهُ
سَمِيعٌ عَلِيمٞ (٦٠) لَّيۡسَ عَلَى ٱلۡأَعۡمَىٰ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡأَعۡرَجِ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞ
وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ أَن تَأۡكُلُواْ مِنۢ بُيُوتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أُمَّهَٰتِكُمۡ
أَوۡ بُيُوتِ إِخۡوَٰنِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَعۡمَٰمِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ
عَمَّٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَخۡوَٰلِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمۡ أَوۡ مَا مَلَكۡتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ
أَوۡ صَدِيقِكُمۡۚ لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَأۡكُلُواْ جَمِيعًا أَوۡ أَشۡتَاتٗاۚ فَإِذَا دَخَلۡتُم
بُيُوتٗا فَسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ تَحِيَّةٗ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةٗ طَيِّبَةٗۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ
ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ (٦١) إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ
وَإِذَا كَانُواْ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمۡرٖ جَامِعٖ لَّمۡ يَذۡهَبُواْ حَتَّىٰ يَسۡتَـٔۡذِنُوهُۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَـٔۡذِنُونَكَ أُوْلَٰٓئِكَ
ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ فَإِذَا ٱسۡتَـٔۡذَنُوكَ لِبَعۡضِ شَأۡنِهِمۡ فَأۡذَن لِّمَن شِئۡتَ مِنۡهُمۡ
وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمُ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ (٦٢) لَّا تَجۡعَلُواْ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيۡنَكُمۡ
كَدُعَآءِ بَعۡضِكُم بَعۡضٗاۚ قَدۡ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمۡ لِوَاذٗاۚ فَلۡيَحۡذَرِ ٱلَّذِينَ

يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِى
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ قَدْ يَعْلَمُ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟
وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿٦٤﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! بـا کۆیلـەو بەردەسـتەکانتان و ئەوانـەش کـە باڵـغ نەبـوون (لـە منداڵەکانتـان چ کـوڕ چ کـچ) سـێ کەڕەتـان (لـە سـێ کاتتانـدا، بـۆ هاتنـە ژوورەوەکانتـان) مۆڵەتتـان لێوەربگـرن: پێـش نوێـژی بەیانیـی و، کاتێـك پۆشـاکەکانتان دادەنێـن، لـە نیـوەڕۆدا (بـۆ سـەرخەو شـکاندنی قەیلوولـە)و، دوای نوێـژی خەوتنـان، ئەمانـە سـێ (کاتـی دەرکەوتنـی) عەوڕەتتانـن، جگـە لـەو کاتانـە، تێـوەش و ئەوانیـش بـە هـۆی بەسـەر بەیەکدیـەوە گەڕانـەوە، گوناهتـان ناگاتـێ، بـەو شـێوەیە خـوا ئایەتەکانتـان بـۆ ڕوون دەکاتـەوەو، خـواش زانـای کارزانـە ﴿٥٨﴾ هـەر کاتێکیـش منداڵەکانتـان باڵـغ بـوون بـا مۆڵـەت وەربگـرن (بـۆ هاتنـە ژوور) وەك ئەوانـەی پێـش وان مۆڵەتیـان وەرگـرت، بـەو شـێوەیە خـوا ئایەتەکانیتـان بـۆ ڕوون دەکاتـەوەو، خـواش زانـای کاربەجێیـە ﴿٥٩﴾ ئافرەتانێکـی بـە تەمەنیـش کـە بـە تەمـای هاوسـەرگیریی نیـن، ئەگـەر (بەشـێك لـە) پۆشـاکەکانیان دابنێـن (وەك سـەرپۆش) گوناهیـان ناگاتـێ، بـەڵام نـەك جوانیـی خـۆ دەرخەرانـە، هەرچەنـدە ئەگـەر خۆیـان بپارێـزن، (خۆیـان لـە پۆشـاك سـووك نەکـەن) بۆیـان باشـترەو، خـواش بیسـەری زانایـە ﴿٦٠﴾ بابـای کوێـر گوناهـی ناگاتـێ و، شـەل گوناهـی ناگاتـێ و، نەخـۆش گوناهـی ناگاتـێ، هەروەهـا خۆشـتان گوناهتـان ناگاتـێ کـە: لـە ماڵەکانـی خۆتـان بخـۆن، یـان لـە ماڵەکانـی بابەکانتـان، یـان ماڵەکانـی دایکەکانتـان، یـان ماڵەکانـی مامەکانتـان، یان ماڵەکانـی پوورەکانتـان (خوشـکی بـاب) یـان ماڵەکانـی خاڵەکانتـان، یـان ماڵەکانـی

پلکەکانتان (خوشکی دایك)، یان ماڵێك کە کلیلەکانیتان بە دەستە، یان (ماڵی) برادەرتان، گوناهتان ناگاتێ هەمووتان پێکەوە (خواردن) بخۆن، یان بە بڵاویی (تاك تاك)، ئنجا هەر کاتێك چوونە ماڵانەوە، سەلام لە خۆتان بکەن، سڵاوێك کە لە لایەن خواوەیە بە پیرۆز پاك و چاکە، بەو شێوەیە خوا ئایەتەکانتان بۆ روون دەکاتەوە، بەڵکو بفامن (تێیان بگەن و کاریان پێ بکەن) ﴿٦١﴾ بە دڵنیایی تەنیا ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینەن، کە بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکەی هێناوەو، هەر کات بۆ کارێکی کۆکەرەوە (گشتیی و هەرەوەزیی)ش لەگەڵی بوون، هەتا مۆڵەتی لێوەرنەگرن (بەملاولادا) ناڕۆن، ئەوانەی (بۆ ڕۆیشتن) مۆڵەتت لێ وەردەگرن، ئا ئەوانە بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکەی هەیە، ئنجا هەر کات مۆڵەتیان لێوەرگرتی، بۆ هەندێك ئیش و کاریان، هەر کامیانت ویست، مۆڵەتی بدەو، داوای لێبوردنیشیان بۆ لە خوا بکە، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەییە ﴿٦٢﴾ (ئەی مسوڵمانینە!) بانگکردنی پێغەمبەر لە نێوانتاندا، با وەك بانگکردنی هەندێکتان بۆ هەندێکتان نەبێ، بە دڵنیایی خوا ئەوانەتان دەزانێ کە بە خۆتێکگرتنەوە خۆیان دەدزنەوە (بە پەنهانیی دەڕۆن)، ئنجا با ئەوانەی سەرپێچیی لە فەرمانی وی (پێغەمبەر) دەکەن، بترسن و، وریا بن کە بەڵایەکیان (لە دنیادا) تووش بێ، یان سزایەکی بە ئێش (لە ڕۆژی دواییدا) ﴿٦٣﴾ ئەها، ئاگادار بن! هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، هی خوایەو، باشیش دەزانێ لە چ حاڵێك دان و چی دەکەن! ئەو ڕۆژەش کە دەگێردرێنەوە بۆ لای، هەواڵیان پێدەدات چییان کردووە، خواش بە هەموو شتێك زانایە ﴿٦٤﴾].

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱلْحُلُمَ): (الحُلُمْ: زَمَنُ بُلُوغٍ وَسمِّيَ الحُلُمَ، لِكَوْنِ صَاحِبِهِ جَدِيراً بِالحِلْم، حَلَم فِي نَوْمِهِ يَحْلُمُ حُلُماً)، وشەی: (حُلُمْ)، یان (حُلْمْ)، بە كاتی باڵغ بوون دەگوترێ و، بۆیە پێی گوتراوە: (حُلُمْ)، چونكە خاوەنەكەی شایستەی ئەوەیە كە هێدیی مەندو نارام بێ، حەلیم بێ، دەگوترێ: (حَلَمَ فِي نَوْمِهِ يَحْلُمُ حُلُماً)، واتە: خەونی بینی، بە تایبەت كاتی ئیحتیلام بوون، باڵغ بوون.

(عَوْرَٰتٍ): كۆی (عَوْرَة)یە، (العَوْرَةُ: سَوْءَةُ الإِنْسَانِ وذَلِكَ كِنَايَةٌ، وَأَصْلُهَا مِنَ العَارِ، وَالعَوْرَةُ شَقٌّ فِي الشَّيءِ)، (عورات) كۆی (عَوْرَة)یە، (عَوْرَة) بە پاش و پێشی مرۆڤ دەگوترێ، كە (كِنَايَة)یە، بنەڕەتەكەی لە (العَار)ەوە هاتوە، لەبەر ئەوەی مرۆڤ پێی شەرمە، پاش و پێشی دەركەون، (عَوْرَة) بە كەلێن و درزی شتێك دەگوترێ، لەبەر ئەوەی پاش و پێش ئینسانیش دەكەوێتە نێوان دوو ڕانەكانی.

(طَوَّٰفُونَ): (الطَّوْفُ: المَشْيُ حَول الشَّيءِ وَمِنْهُ الطَّائِفُ، وَالطَّوَّافُونَ: الخَدَم)، (طَواف) بریتیە لە ڕۆیشتن بە دەوری شتێكدا، بە دەوری شتێكدا سووڕانەوە، وەك (طَائِفُ)، واتە: سووڕاوە، (طَوَّافُونَ)، ئەوانەی كە زۆر دەسووڕێنەوە، واتە: خزمەتكار، یان منداڵ كە خزمەتی دایكی و بابی دەكات.

(وَٱلْقَوَٰعِدُ): (جَمْعُ قَاعِد: لِمَن قَعَدَت عَنْ الحَيْضِ وَالتَّزَوجِ، مِثْلُ: حَائِض وَحَامِل، فَإِذَا أُرِيدَ القُعُودُ قِيْلَ: قَاعِدَةٌ)، (قَوَاعِد) كۆی (قَاعِد)ە، بە ئافرەتێك دەگوترێ: لە حەیز چووبێتەوەو، بە تەمای هاوسەرگیریی نەبێ، لەبەر تەمەن، هەروەك دەگوترێ: (حَائِضْ وَحَامِل)، ئەو شتانەی تایبەتن بە ئافرەتەوە، پێویستیان بە (ة)ی مێینە (التأنیث)، ناكات، چونكە هەر ئافرەت دەكەوێتە حەیزەوە، دەگوترێ: (حَائِضْ)، هەروەها بەس ئافرەت تۆڵدار دەبێ، دەگوترێ: (حَامِل)، هەروەها دەگوترێ:

(قَاعِـد)، بـەڵام ئەگـەر بیوسـترێ بگوتـرێ: ئافرەتێکـی دانیشـتوو (جالسـة)، دەگوتـرێ: (قَاعِـدة)، چونکـە هـەر ئافـرەت دانانیشـێ، پیاویـش دادەنیشـێ: (رَجُـلٌ قَاعِـدٌ، وامـرأةٌ قَاعِـدة)، بـەڵام ئەگـەر مەبەسـت لـە (قَاعِـد)، ئافرەتێـك بـێ کەتۆتـەوە تەمەنـەوەو لـە حەیـز چۆتـەوە، کـە پێـی دەگوتـرێ: (یائسـة)، حاڵەتـی ئائومێدیـی، تـازە منداڵـی نابـێ، ئـەوە هـەر دەگوتـرێ: (قَاعِـد)، کۆیەکـەی (قَواعِـد)ە.

(جُنَاحٌ ): (الإثْـم: لأنَّـهُ يَمِيْـلُ بِالإنْسَـان)، (جنـاح)، یانـی: بـاڵ، کـە بـە (أجنحـة) کۆدەکرێتـەوە، بـەڵام (جُنَاحٌ )، لەبـەر ئـەوەی وەك چـۆن باڵـی باڵنـدە هـەر یەکـەی لـە لایەکیـەتی، گوناهیـش بریتیـە لـە مەیلکردنـی مـرۆڤ و، لـە ڕێـی ڕاسـت لادانـی بـەرەو گونـاە و تـاوان.

(أَشْـتَاتًا): (مُتَفَرِّقِيْنَ: شَـتٌّ جَمْعُهُـمْ شَـتاً وَشَـتَاتاً)، واتـە: بـە پـرژو بڵاویـی، بـە جیـا جیایـی.

(تَحِيَّـةً ): واتـە: سـڵاوکردن، لـە (حَيَّـاكَ اللـه)ەوە هاتـوە، (أي: جَعَـلَ اللهُ لَـكَ حَيَـاةً)، خـوا ژیانـت پـێ بـدات، بەردەوامـت بـکا لـە ژیانـدا، (وَذَلِـكَ إخْبَـارٌ وَيُقْصَـدُ بِـهِ الدُّعَـاء)، کـە دەگوتـرێ: (حَيَّـاكَ اللـه)، خـوا تـۆی ژیانـد، ئەمـە هەواڵدانـە، بـەڵام مەبەسـت پێـی دووعایـە، واتـە: خـوا تـۆ بژیەنـێ، (حَيَّـا فـلانٌ فُلآنـاً تحيـةً إذا قـال لـهُ ذلِـك)، بـەڵام (حَيَّـا فـلانٌ فلانـاً)، فـڵان سـڵاوی لـە فـڵان کـەس کـرد، ئەگـەر وای پێگـوت.

( يَتَسَلَّلُونَ ): واتـە: خۆیـان دەدزنـەوە بـە پەنهانیـی، (سَـلُّ الـشَّيءَ مِـنَ الـشَّيء إذَا نَزَعَـهُ، وَمِنـهُ قِيْـلَ للوَلَـدِ سَـليْل)، ئەگـەر شـتێك لـە شـتێك دابڕنـی، دەگوتـرێ: (سَـلُّ الـشَّيءَ مِـنَ الـشَّيء)، یانـی: لێـی دارنـی، بۆیـە بـە منـداڵ و ڕۆڵـە دەگوتـرێ: (سَـليْل)، چونکـە لـە بـاب و دایکیـەوە هاتـوە، لەوانـەوە داڕنـاوەو وەرگیـراوە.

(لِوَاذًا): (لاوَذَ بكـذا يـلاوِذُ لِـواذاً ومُـلَاوَذَةً: إذَا اسْـتَتَرَ بِـهِ)، ئەگـەر کەسـێك خـۆی لـە کەسـێك، یـان لـە شـتێك بگـرێ، دەگوتـرێ: (لاوَذَ)، چاوگەکـەی (مُلاوَذَةً)یـە، (لِـواذاً)، واتـە: خۆتێگرتـن و خـۆ پەنهانکـردن لـە پەنـای شـتێکدا، کـە ئایەتەکـە مەبەسـتی

ئەوەیـە، هەندێـك لەوانـەی دڵنەخـۆش بـوون، یـان نیـمان بێهێـز بـوون، جـاری وا هەبـوو کـە لـە کارێکـی هەرەوەزیـی و گشـتییدا دەبـوون، دوایـی هەڵدەسـتان خۆیان تێـك دەگـرت، هەندێـك خۆیـان لـە پەنـای هەندێکیانـدا پەنهـان دەکـرد، بـۆ ئـەوەی دیـار نەبـن لـە کـۆڕو مەجلیسـدا، یاخـود لـەو کارە گشـتییەدا.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

لـە بـارەی ئەو ڕسـتە موبارەکـەوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَٰنِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَعْمَٰمِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخْوَٰلِكُمْ أَوْ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمْ أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ أَوْ صَدِيقِكُمْ... ﴾.

ئەو گێڕدراوەیە هاتوە:

أ)- (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: لَمَّا أَنْزَلَ اللهُ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾النساء، فَقَالَ الْمُسْلِمُونَ: إِنَّ اللهَ قَدْ نَهَانَا أَنْ نَأْكُلَ أَمْوَالَنَا بَيْنَنَا بِالْبَاطِلِ، وَالطَّعَامُ هُوَ أَفْضَلُ الْأَمْوَالِ، فَلَا يَحِلُّ لِأَحَدٍ مِنَّا أَنْ يَأْكُلَ عِنْدَ أَحَدٍ، فَكَفَّ النَّاسُ عَنْ ذَلِكَ فَأَنْزَلَ اللهُ بَعْدَ ذَلِكَ: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ ﴾النور: ٦١، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ ﴾). (أخرجه الطبري فـي تفسيره: ٢٦١٧٣، وابن أبي حاتم فـي تفسيره: ١٤٨٨٦، قال مؤلفا الإستيعاب في بيان الأسباب: قلنا: وهذا إسناد حسن، ج٢، ص٥٩٢).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەفەرموێ: کاتێك خوا ﷻ ئەوەی دابەزاند: [ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ماڵی خۆتان لە بەینی خۆتاندا بە ناهەق مەخۆن، مەگەر بازرگانییەك بێ، بە دڵپەسندی هەردوولا].

مسوڵمانان گوتیان: خوا ﷻ لێی قەدەغە کردووین ماڵ و سامانمان لە بەینی خۆماندا بە ناهەق بخۆین، خواردن و خۆراکیش باشترینی ماڵ و سامانمانە، بۆیە هیچ کاممان بۆی حەڵاڵ نیە، بۆی ڕەوا نیە لە لای کەسی دیکە، خۆراك بخوات، ئیدی خەڵك دەستیان لەوە هەڵگرت لە لای یەکدی خۆراك بخۆن، (بانگهێشت بن، شین و شایی و بۆنەیەك)، بەڵام خوا ﷻ دوای ئەوە ئەو ئایەتەی ناردە خوار: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا۟ .... ﴾

کە ئەوە مانای ئەوە نیە هی پێشێ نەسخ کراوەتەوە، وەك هەندێك لە زانایان گوتوویانە، بەڵکو ئەوەی پێشێ هەر لە جێی خۆیەتی، خواردن بە ناهەق هەر نابێ بخورێ، بەڵام خوای پەروەردگار بۆی ڕوونکردونەوە: ئەگەر بابای شەل، بابای کوێر، بابای نەخۆش، یاخود ساغ لە ماڵی خۆی، یان لە ماڵی بابی، یان دایکی، تا کۆتایی بخۆن، ئەوە گوناهیان ناگاتێ و شتێکی ڕەوایە، واتە: ئایەتی (٢٩)ی سووڕەتی (النساء)، بە هەڵە لێیی تێمەگەن، مەبەست بە ناهەق و بەتاڵ لە ماڵی یەکدی خواردن، ئەوەیە کە بە شێوەی زوڵم بێ، بە شێوەی دزیی بێ، بە شێوەی لێستاندن بێ، بە شێوەیەکی ناشەرعیی بێ، ئەگەرنا مادام بە ڕەزامەندیی بێ، خوا فەرموویەتی: ﴿ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ ﴾، مادام بە ڕازیی بوونی هەردووك لایان بێ، ئەوە بە ناهەق نیەو بە هەقە.

ب)- هەر لەو بارەوە ئەم گێڕدراوەیەش هاتوە: [عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ الْمُسْلِمُونَ يَرْغَبُونَ فِي النَّفِيرِ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَيَدْفَعُونَ مَفَاتِيحَهُمْ إِلَى ضُمَنَائِهِمْ، وَيَقُولُونَ قَدْ أَحْلَلْنَا لَكُمْ أَنْ تَأْكُلُوا مِمَّا احْتَجْتُمْ إِلَيْهِ، وَكَانُوا يَقُولُونَ: إِنَّهُ لَا يَحِلُّ لَنَا أَنْ نَأْكُلَ، إِنَّهُمْ أَذِنُوا لَنَا عَنْ غَيْرِ طِيبِ أَنْفُسِهِمْ، وَإِنَّمَا نَحْنُ أُمَنَاءُ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ وَلَا عَلَىٰٓ

أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَـٰتِكُمْ ﴾، إلى قوْلِهِ ﴿ أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ ﴾[(١)].

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: مسوڵمانان حەزیان دەکرد لە کاتی دەرچوونی گشتییدا، لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ دەربچن، (سەفەر دەبوو، جەنگ دەبوو، هەرچی دەبوو)، کلیلەکانیان دەدایە دەست ئەمیندارەکانیان، (ئەوانەی لێیان دڵنیان)و پێیان دەگوتن: ئەوە بۆمان حەڵاڵ کردن، هەرچی پێویستتان بوو لە ماڵی ئێمە بیخۆن، بە ئەمیندار داندراوەکانیش دەیانگوت: بۆمان حەڵاڵ نیە بخۆین، چونکە ئەوانە کە مۆڵەتیان داوین، بە دڵخۆشییەوە نەبووە، ئەوەك پێی دڵ ناسوودە نەبووبن و ئێمەش ئەمیندارین نابێ بیخۆین، ئیدی خوا ﷻ ئەم ئایەتەی ناردە خوار: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا۟ ... ﴾.

---

(١) أخرجه البزار: ٢٢٤، وابن أبي حاتم في تفسيره: ١٤٨٧٥، وأبو داود في المراسيل ص:٣٢٥،٣٢٤، وصحّحه الضياء المقدسي، وقال الهيثمي في مجمع الزوائد: ج٧، ص٨٣، رواه الطبراني في الأوسط، ورجاله وذكره السيوطي في الدر المنثور، ج٦، ص٢١٥، ٢١٦، و زاد نسبه لابن المنذر، وقال مؤلفا الإستيعاب: ج٢، ص٥٩٣،٥٩٢، صحيح.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لە کۆتایی سووڕەتی (النور)دا - کە پێشتر باسمان کرد، ئەم سووڕەتی (النور)ە، پڕە لە یاسا شەرعییەکان، ئەو یاسایانەی کە ژیانی خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی مسوڵمانان ڕێك دەخەن - خوا ﷻ لە کۆتایی ئەم سووڕەتە موبارەکەدا، لە حەوت ئایەتی کۆتاییدا، ئایەتەکانی (٥٨ تاکو ٦٤)، وەك لە پێناسەی ئەم حەوت ئایەتەدا گوتمان: پێنج حوکمی شەرعیی گەورەو گرنگ دەخاتە ڕوو، سەرەتا ئاوا دەست پێ دەکات، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، ئەی ئەوانەی براواتان هێناوە! واتە: برواتان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بروایان پێ بهێنرێ، ﴿ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا۟ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٍ ﴾، با ئەوانەی کە بە دەستی ڕاستتانەوەن، بەردەستانن، واتە: کۆیلەو کەنیزەکەکان، ﴿ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا۟ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٍ ﴾، ئەوانەش کە نەگەیشتوونە ڕاددەی باڵغ بوون لە خۆتان، واتە: کوڕو کچەکانتان، با سێ جاران مۆڵەتتان لێ وەربگرن، ﴿ مِّن قَبْلِ صَلَوٰةِ ٱلْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعْدِ صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِ ﴾، پێش نوێژی بەیانیی، با مۆڵەتتان لێ وەربگرن، ئەگەر بیانەوێ بێنە ژووره تایبەتییەکانتان، هەروەها کاتێك بۆ نیوەڕۆ، بۆ سەر خەوشکاندنی نیوەڕۆ، کە پێی دەگوترێ: قەیلوولە، پۆشاکەکانتان دادەنێن، خۆتان سووك دەکەن لە پۆشاك، لەو کاتەشدا با مۆڵەتتان لێ وەربگرن، پێش ئەوەی بێنە ژوورەکەتان، ﴿ وَمِنۢ بَعْدِ صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِ ﴾، هەروەها دوای نوێژی خەوتنان، دوای نوێژی خەوتنان کاتی خەوتن و ئیسراحەتە، ئەو کاتەش با بەبێ مۆڵەت وەرگرتن، نەیەنە ژووره تایبەتییەکانتان، چونکە دەگونجێ لە حاڵەتێکی نائاسایی و لە حاڵەتی ئیسراحەت دابن، یان ئەگەر ژن و مێرد بن، لە حاڵەتی تایبەتتر دان، ﴿ ثَلَٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ ﴾، ئەو سێ کاتە، سێ کاتی دەرکەوتنی عەورەتی ئێوەن، واتە: ئەو ئەندازەیە لە جەستەتان

کە پێتان عەیبە دەربکەوێ، کە مەرج نیە تەنیا پاش و پێش بێ، چونکە سنووری عەورەتی پیاو، نێوانی نێوک و ئەژنۆیەتی، هی ئافرەتیش هەموو جەستەیەتی، جگە لە دەم و چاوو دوو دەستی، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ثَلَٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ﴾، سێ عەورەتن، واتە: سێ کاتی دەرکەوتنی عەورەتی ئێوەن، بۆیە با کتوپڕ لێتان بە ژوور نەکەون، ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّ﴾، نە ئێوە، نە ئەوان گوناهتان ناگاتێ جگە لەو سێ حاڵەتە، واتە: جگە لەو سێ حاڵەتە، گوناهتان ناگاتێ بەبێ مۆڵەت وەرگرتن بێنە ژووری، کاتی نان خواردنە، کاتێ دانیشتوون، دەزانن کاتی ئیسراحەت نیە، چونکە قورسە هەموو دەمێ دوای مۆڵەت وەرگرتن و بێنە ژووری، ﴿طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾، ئەوان بە سەرتانەوە دەگەڕێن، بەسەرتاندا دێن و دەچن، هەندێکتان بەسەر هەندێکتاندا دێن و دەچن، حیکمەتی خوا ﷻ لەوەدا کە ئەو سێ حاڵەتەی هەڵواردوون و دەبێ تەنیا لەو سێ حاڵەتەدا پابەند بکرێن، کۆیلەو کەنیزەکەکان و منداڵەکان: کوڕو کچەکان، کە بە بێ مۆڵەت نەچنە ژووری تایبەتیی باب و دایکیان، ئەوەیە کە زۆر بەسەر یەکدا دێن و دەچن و، ناڕەحەتکەر دەبوو ئەگەر فەرمووبای: دەبێ هەر کاتێ هاتنە ژووری، هەر دەبێ مۆڵەت وەربگرن، ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ﴾، ئاوا خوا ئایەتەکانتان بۆ ڕۆشن دەکاتەوە، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾، خواش زانای کارزانە.

﴿وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾، هەر کاتێ منداڵەکانتان گەیشتنە سنووری باڵغ بوون (ئیحتیلام بوون)، با مۆڵەت وەربگرن، وەک چۆن ئەوانەی پێش وان (کۆیلەو کەنیزەك و منداڵە نابالغەکان) مۆڵەتیان وەردەگرت، با ئەمانیش کە دەگەنە ڕاددەی باڵغ بوون، لە پێشتریشن کە مۆڵەت وەربگرن، ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾، ئاوا خوا ئایەتەکانیتان بۆ ڕۆشن دەکاتەوەو، خواش زانای کاربەجێیە.

ئەوە حوکمی یەکەم بوو.

ئنجا دێته سەر باسی حوکمی دووەم: ﴿ وَٱلۡقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا يَرۡجُونَ نِكَاحٗا فَلَيۡسَ عَلَيۡهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعۡنَ ثِيَابَهُنَّ غَيۡرَ مُتَبَرِّجَٰتِۭ بِزِينَةٖۖ ﴾، ئافرەتانێكی دانیشتووش، دانیشتوو (قاعد) لێرەدا بە واتای: (جلوس) نیە، بەڵكو بە مانای لە حەیز چوونەوەو، لە منداڵ بوون چوونەوەیە، كە گەیشتنە تەمەنی نائومێدیی (عمر اليأس)ی لە منداڵ بوون و لە شوو كردن و....هتد، گوناهیان ناگاتێ كە پۆشاكەكانیان دابنێن، بەڵام بە مەبەستی جوانیی خۆ دەرخستن نەبێ، واتە: هەندێك لە پۆشاكەكانیان دابنێن، سەرپۆشیان، یاخود پۆشاكێك كە پێی دەچنە دەر، با لە ماڵێ مادام ئافرەتەكە بە تەمەن بێ، با خەڵكی نامەحرەمیش لە ماڵەكەدا هەبێ، مادام ئافرەتەكە بە تەمەنەو، جێی تەماع نیەو، بۆ خۆشی تەماعی لە پیاواندا نیە، ﴿ وَأَن يَسۡتَعۡفِفۡنَ خَيۡرٞ لَّهُنَّۗ ﴾، بەڵام ئەگەر خۆیان پاك ڕابگرن و ئەو مۆڵەتەش بەكار نەهێنن، بۆ ئەوان باشترە، ﴿ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴾، خواش بیسەری زانایە، بەڵام كە خۆشیان لە هەندێك لە پۆشاكەكانیان سووك دەكەن، نابێ مەبەستیان جوانیی خۆ دەرخستن بێ، ﴿ غَيۡرَ مُتَبَرِّجَٰتِۭ بِزِينَةٖۖ ﴾، مەبەستیان ئەوە نەبێ جوانیی خۆیان دەربخەن و پیشان بدەن.

ئەوەش حوكمی دووەم.

ئنجا دێتە سەر حوكمی سێیەم، دەفەرموێ: ﴿ لَّيۡسَ عَلَى ٱلۡأَعۡمَىٰ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡأَعۡرَجِ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ أَن تَأۡكُلُواْ مِنۢ بُيُوتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أُمَّهَٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ إِخۡوَٰنِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَعۡمَٰمِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَخۡوَٰلِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمۡ أَوۡ مَا مَلَكۡتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ أَوۡ صَدِيقِكُمۡۚ ﴾.

واتە: كوێر گوناهی ناگاتێ و سەغڵەتیی نایەتە سەری، هەروەها شەل گوناهی ناگاتێ و، سەغڵەتیی نایەتە سەری، هەروەها نەخۆش گوناهی ناگاتێ و سەغڵەتیی نایەتە سەری، هەروەها خۆشتان ئەی دوێتراوەكان (كە ساغن)،

ئێوەش گوناهتان ناگاتێ و، سەغڵەتییتان لەسەر نیە، لە چ حاڵێکدا؟ ﴿أَن تَأْكُلُواْ مِنۢ بُيُوتِكُمْ﴾، کە لە ماڵی خۆتان خواردن بخۆن، واتە: ماڵی خۆتان کە بەشی ماڵ و خێزانیشی پێوەیە، هەندێکیش گوتوویانە: ﴿بُيُوتِكُمْ﴾، یانی: ماڵی کچ و کوڕەکانتان، ئەوانیش هی ئێوەن، ئەگەرنا ئینسان لە ماڵی خۆی خواردن بخوات، هەر دیارە کە گوناهی ناگاتێ، بەڵام ﴿بُيُوتِكُمْ﴾، مەبەست پێی ماڵی کچ و کوڕەکانتان، یان ماڵی هاوسەرەکانتان کە هی خۆتانن، چونکە ئەو خۆراکە بەشی وانیشی پێوەیە، یان ماڵی بابەکانتان، (بابەکان (آباء) بە کۆ هێناویەتی، واتە: هەر کامێکیان بابی خۆی هەیە، یان ماڵی دایکەکانتان، یان ماڵی برایەکانتان، یان ماڵی خوشکەکانتان، یان ماڵی مامەکانتان، یاخود ماڵی پوورەکانتان (خوشکی بابەکانتان)، یان ماڵی خاڵەکانتان، یان ماڵی پلکەکانتان (خوشکی دایکەکانتان)[1]، هەروەها کەسێك کە کلیلەکانی ماڵەکەیتان لە لایە، مادام کراون بە ئەمیندارو مۆڵەتتان دراوە، گوناهتان ناگاتێ لە ماڵەکەیان بخۆن، ﴿أَوْ صَدِيقِكُمْ﴾، یان ماڵی هاوەڵتان، برادەرتان، ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَأْكُلُواْ جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا﴾، گوناهتان ناگاتێ هەمووتان پێکەوە بخۆن، وێکڕا، لەسەر سفرەو خوانێك، ﴿أَوْ أَشْتَاتًا﴾، یاخود بە بڵاویی و تاك تاك هەر کەسە بە تەنێ، ﴿فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا﴾، ئنجا هەر کاتێك چوونە ماڵانێکەوە، چ ماڵی خۆتان، چ ماڵی ئەوانەی باسمان کردن، ﴿فَسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ﴾، سڵاو لە خۆتان بکەن، ﴿تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةً طَيِّبَةً﴾، سڵاوێك لە خواوە بە پێزەو پاك و چاکە، بڵێن: (السلام علیکم ورحمة الله)، ئەگەر کەسیشی لێ نەبوو، بڵێن: (السلام علینا وعلى عبادالله الصّالحين)، وەك دوایی باسی دەکەین، ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾، ئاوا بەو

---

(١) من پوور بە خوشکی باب بەکاردێنم و، پلك بە خوشکی دایك بەکاردێنم، کە بە عەرەبیی بە خوشکی باب دەڵێن: (عمة)و بە خوشکی دایك دەڵێن: (خالة)، لە هەندێك شوێن، لە ناوچەی بادینان بە خوشکی باب دەڵێن: عەمەت و، بە خوشکی دایك دەڵێن: خاڵەت، کە هەر لە عەرەبییەکەوە وەریان گرتوە.

شێوەیە خوا ئایەتەکانتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بەڵکو بفامن، بەڵکو تێیان بگەن، یان: ئومێد وایە کە تێیان بگەن و کاریان پێ بکەن.

ئنجا دێتە سەر حوکمی چوارەم (لەم دەرسەماندا)، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ﴾، بە دڵنیاییی بڕواداران تەنها ئەوانەن کە بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی هێناوەو، کاتێک لە خزمەت پێغەمبەردا دەبن بۆ کارێکی کۆکەرەوە، کارێکی هەرەوەزیی و گشتیی، ﴿لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ﴾، بەملاو لادا ناڕۆن تاکو مۆڵەتی لێ وەرنەگرن، ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، ئەوانەی مۆڵەتت لێ وەردەگرن، ئنجا بەملاولادا دەچن، (لە کاتێکدا کە کۆبوونەوە بۆ کارێکی هەرەوەزیی و گشتیی)، ئا ئەوانە بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی هەیە، ﴿فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، ئنجا هەر کات بۆ هەندێک ئیش و کاریان مۆڵەتیان لێ وەرگرتی، هەر کامێکیانت ویست مۆڵەتی بدەو، داوای لێبوردنیشیان بۆ لە خوا بکە، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

کەواتە: ئەمەش یەکێکە لە خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی مسوڵمانان، کە کاتێک لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەبن، لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ، یاخود لەگەڵ ئەو کەسەدا دەبن، لەگەڵ بەرپرسێکدا دەبن، کە لە شوێنی پێغەمبەردا ﷺ دانیشتوەو، لە جیاتی پێغەمبەر ﷺ شەریعەت و بەرنامەی خوا بەسەر کۆمەڵگادا پیادە دەکات، یان بەسەر کۆمەڵە خەڵکێکدا، خەسڵەتێکی بنەڕەتیی مسوڵمانانە، کە بەبێ مۆڵەتی ئەو سەرکردەو سەرپەرشتیارە، بەملاولادا نەچن، لە کاتێکدا بۆ کارێکی گشتی کۆبوونەوە، نەک: (کەس بە ڕەی کەس نەپێوێ و، کەس لە مەڕی کەس نەخێوێ)و (هەر کەسە بە شێوێکدا بڕوات)، هەرگیز نە دینداریی و نە دنیاداریی ئاوا ناکرێ.

ئنجا دێتە سەر حوكمی پێنجەم و كۆتایی، دەفەرمویّ: ﴿ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ﴾، (ئەی بڕوادارینە!) بانگكردنی پێغەمبەر ﷺ لە نێوانتاندا، وەك بانگكردنی هەندێكتان بۆ هەندێكتان دامەنێن، چ پێغەمبەر ﷺ بانگتان بكات، چ ئێوە بانگی پێغەمبەر ﷺ بكەن، ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ بانگتان بكات، وای دامەنێن وەك چۆن یەكێك بانگتان دەكات، هەر ئەوەندە ئیعتیباری بۆ دابنێن! یاخود كە بانگی پێغەمبەر ﷺ دەكەن و دەیدوێنن، با بەو شێوازە نەبێ كە یەكدی پێ بانگ دەكەن و، یەكدی پێ دەدوێنن، بەڵكو دەبێ بە شێوەكی شایستەو گونجاو لەگەڵ پایەو پێگەی بەرزی پێغەمبەری خوادا ﷺ بێ، بۆ وێنە: بە ناوی كەسیی بانگی نەكەن (یا موحەممەد!) بە كونیەكەی: (یا أبا القاسم!)، بەڵكو دەبێ بەو نازناوە كە خوا لێی ناوە: (یا نبي الله!)، (یا رسول الله!) بانگی بكەن.

﴿ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ﴾، بە دڵنیایی خوا ئەوانەتان دەزانێ كە بە خۆتێكگرتنەوە خۆ دەدزنەوەو بە پەنهانیی دەڕۆن، ﴿ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، ئنجا با ئەوانە وریا بن و، لەسەر هەست بن، كە سەرپێچیی لە فەرمانی دەكەن، (فەرمانی پێغەمبەر ﷺ)، كە بەڵایەكیان (لە دنیایە) تووش نەیەت، یاخود ئازارێكی بە ئێشیان تووش نەیەت (لە ڕۆژی دوایی دا)، یاخود: بەڵایەكەش لە دنیاداو ئازارە بە ئێشەكەش لە دنیادا (با وریابن كە تووشیان نەیەت)، بە هۆی سەرپێچییان لە فەرمانی پێغەمبەرەوە ﷺ.

(تسلّل) ئەوەیە كەسێك بە پەنهانیی و پەنامەكیی خۆی لە شتێك بدزێتەوە، (لِوَاذًا)، ئەوەیە كە كەسێك خۆی لە شتێك بگرێ، لە شەخصێك، لە وڵاخێك، لە هەر شتێك، خۆی تێبگرێ و، لە پەنایدا خۆی بشارێتەوەو بڕوات.

لە كۆتایی دا خوا دەفەرمویّ: ﴿ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، ئەها ئاگاداربن! بە دڵنیایی هەرچی لە ئاسمانەكان و زەوییدا هەیە، هی خوایە،

﴿ قَدْ يَعْلَمُ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ ﴾، بە دڵنیایی دەشزانێ ئەو حاڵەتەی ئێوە لەسەرینی، ﴿ وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا ﴾، ئەو ڕۆژەش کە بۆ لای دەگێردرێنەوە، هەواڵیان پێ دەدات بەوەی کە کردوویانە، ﴿ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾، خواش بە هەموو شتێك زانایە.

کەواتە: با بزانن بە چییەوە دەچنەوە خزمەت خوا؟ چۆن دەچنەوە خزمەت خوا ﷻ؟ هەروەها پێش ئەوەش با بزانن کە لە هەر حاڵێکدا بن، خوای پەروەردگار دەیانبینێ، دەیانبیستێ، ئاگاداریانە، ئنجا با لە حاڵێکدا نەبن، پێیان شەرم بێ، خوای پەنهانزان لەسەر ئەو حاڵەتە بیانبینێ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**لەسەر مسوڵمانان پێویستە کۆیلەکانیان و منداڵەکانیان، چ نابالغ، بن چ بالغ بن، ڕابهێنن لەسەر مۆڵەت لێوەرگرتنیان بۆ لێوەژوورکەوتنیان (بۆ ژووری تایبەتیان)، لە سێ کاتاندا، کە کاتی پشوودانیانن: پێش نوێژی بەرەبەیان و، کاتی قەیلوولەی نیوەڕۆ، دوای نوێژی خەوتنان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِيَسۡتَـٔۡذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَبۡلُغُواْ ٱلۡحُلُمَ مِنكُمۡ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٖۚ مِّن قَبۡلِ صَلَوٰةِ ٱلۡفَجۡرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعۡدِ صَلَوٰةِ ٱلۡعِشَآءِۚ ثَلَٰثُ عَوۡرَٰتٖ لَّكُمۡۚ لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ وَلَا عَلَيۡهِمۡ جُنَاحُۢ بَعۡدَهُنَّۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيۡكُم بَعۡضُكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٥٨﴾ وَإِذَا بَلَغَ ٱلۡأَطۡفَٰلُ مِنكُمُ ٱلۡحُلُمَ فَلۡيَسۡتَـٔۡذِنُواْ كَمَا ٱسۡتَـٔۡذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٥٩﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:

بەڵام پێش ئەوە دەمەوێ بڵێم: ئەگەر تەماشای ئەم سووڕەتی (النور) بکەین، وەك نموونەیەك لە سووڕەتەکانی قورئان، بە تایبەت لە سووڕەتە مەدینەییەکان، بۆمان دەردەکەوێ کە ئیسلام وردو درشتی ژیان: ژیانی تاك، خێزان، کۆمەڵگا، ڕێك دەخات، ئنجا خوا ﷻ هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بۆ خۆی فەرمایشتیان لە بارە بفەرموێ، نوختەی تێدا خستوونە سەر پیت و، بۆ پێغەمبەریشیان ﷺ لێنەگەڕاوە، پێغەمبەریش ﷺ ئەرکەکەی ئەوە بووە، ئەوەی خوا پێی فەرمووە:

جێبەجێی بکات و، ڕوونی بکاتەوە چۆن جێبەجێ دەکرێ، ئەوەی پەیوەندیی بە لایەنی کردەییەوە هەیە، ئەگەر شتێکیش تەم و مژێکی لەسەر بوو بێ، یاخود ڕوون نەبێ، چەمك و واتایەکەی ڕوون بکاتەوە، ئەگەرنا پێغەمبەر ﷺ هەر ئەوەی کردوە، کە قورئان فەرموویەتی، کەواتە کە خوا فەرموویەتی: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾النحل، واتە: زیکرمان بۆ لات دابەزاندوە، تاکو ئەوەی بۆیان دابەزێندراوە، بۆیان ڕوون بکەیەوەو، بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە.

وەك زۆر جاری دیکە گوتوومانە: مەبەست ئەوە نیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەفسیری قورئانمان بۆ بکات، چونکە قورئان خۆی ڕۆشنە: ﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ وَقُرْءَانٍ مُّبِينٍ ﴿١﴾﴾الحجر، ﴿قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾﴾ الأنعام، ... هتد.

بەڵکو مەبەست لە ڕوونکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە، ئەگەر ڕستەیەك، ئایەتێك، هاوەڵان لێیان ئیشکال بووبێ، یان پێویستی کردبێ، پێغەمبەر ﷺ تیشکی بخاتە سەر، ئەگەرنا بە گشتیی قورئان هەمووی ڕوونە، بەڵام مەبەست لە ڕوونکردنەوەکەی، چۆنیەتی جێبەجێ کردنی قورئانە، لە ڕووە کردەییەکەیەوە، بۆ نموونە: پێغەمبەر ﷺ لەسە مینبەر نوێژی کردوە، بە لای کەمەوە دوو جاران لەسەر مینبەر نوێژی کردوە، وەك لە فەرمایشتی صەحیحدا هاتوە، فەرموویەتی: {صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي}، (أخرجه البخاري: ٦٣١)، واتە: وەك چۆن منتان بینی نوێژم کرد، ئاوا نوێژ بکەن، (بەو شێوەیە ڕابوەستن، بەو شێوەیە بچنە ڕکووع، بەو شێوەیە هەڵسنەوەو، بچنە هەردوو سەجدەکان و، تەحییات و....هتد).

هەروەها لەبەر چاوی هاوەڵانی بەڕێزی (خوا لێیان ڕازی بێ)، حەجی کردوەو فەرموویەتی: {لِتَأْخُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُمْ}، (أخرجه مسلم: ١٢٩٧)، بۆ ئەوەی خواپەرستییەکانی حەجم لێ فێربن، (تەماشام بکەن! چۆن حەج دەکەم)،

شتەکانی دیکەش بە هەمان شێوە، ئەگەرنا ئەوەی پێویستی بە ڕوونکردنەوە نەبوو بێ، قورئان بۆ خۆی ڕوونە، ئنجا با تەماشا بکەین:

١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ، واتە: ئەی مسوڵمانینە! ئەی بڕوادارینە! کە هەم لە دڵ و دەروونەوە بڕواتان هێناوە، هەم ئەو ئیمانە لەسەر ڕواڵەت و جەستەشتان دەرکەوتوە.

٢)- ﴿ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ﴾، با ئەوانەی بە دەستی ڕاستتانەوەن (بەردەستتانن) مۆڵەتتان لێ وەربگرن، ئەمە زاراوەیەکە بەکارهێنراوە بۆ کۆیلەو کەنیزەکەکان، کە وەك پێشتریش چەند جار گوتوومانە: ئەوە سیستمێکی باوی جیهانیی بووە، ئەگەرنا ئیسلام زۆر بە ناخۆشحاڵیی مامەڵەی لەگەڵ ئەو حاڵەتەدا کردوەو، هەوڵیشیداوە بنبڕی بکات و هەموو سەرچاوەکانیشی وشك کردوون، بەڵام وەك واقیع دەبووایە وا مامەڵەی لەگەڵدا بکات.

٣)- ﴿ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُواْ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ﴾، (با ئەو بەردەستانەتان، ئەو کۆیلەو کەنیزەکانەتان، مۆڵەتتان لێوەربگرن)، هەروەها ئەوانەشتان کە نەگەیشتوونە ڕاددەی باڵغ بوون، منداڵە کوڕو کچەکانتان.

٤)- ﴿ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٍ ﴾، سێ کەڕەتان (مۆڵەتتان لێ وەربگرن)، بۆ هاتنە ژووری تایبەتییتان، ئەگەرنا کە لە ماڵێ پێکەوە دانیشتوون، ئەوە دانیشتوون، بەڵام باب و دایك کە ژووری تایبەتیان هەیە، منداڵەکان نابێ یەکسەر خۆ بە ژوورێ دا بکەن، با گچکەش بن، هەروەها کۆیلەو کەنیزەك و خزمەتکارو بەردەستیش، نابێ یەکسەر خۆ بە ژووریدا بکەن، بە تایبەت لە سێ حاڵەتاندا، کە خوای پەروەردگار بە سێ کەڕەت: سێ جار ﴿ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٍ ﴾ی ناو هێناوە، واتە: لە سێ حاڵەتاندا، لە سێ کاتاندا، ئەوانیش:

٥)- ﴿ مِّن قَبْلِ صَلَوٰةِ ٱلْفَجْرِ ﴾، پێش نوێژی بەیانیی، واتە: شەوگار هەمووی، لە دوای نوێژی خەوتنانەوە، هەمووی تاکو نوێژی بەیانیی.

٦)- ﴿وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ﴾، هەروەها کاتێ پۆشاکەکانتان دادەنێن، لە کاتی نیوەڕۆدا، واتە: بۆ سەرخەو شکاندنی نیوەڕۆ، لە کاتی نیوەڕۆشدا لە لای زۆربەی میللەتان عادەت وایە، بە تایبەت ئەو کاتانەی ڕۆژ درێژن، خەڵك لە نێوەڕاستی ڕۆژدا، چ پێش نیوەڕۆیەکەی، چ پاش نیوەڕۆیەکەی، سەرخەوێك دەشکێنێ و پشوو دەدات و ئەو خەوە (قیلولة)ی پێدەگوترێ یانی: خەوێکی کەم، بە کوردیی: سەر خەو شکاندن و چاو گەرمکردن.

٧)- ﴿وَمِنۢ بَعْدِ صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِ﴾، هەروەها لە دوای نوێژی خەوتنان، واتە: لە دوای نوێژی خەوتنانەوە تاکو بەیانیی، شەوگارەکە هەمووی، دوایی دەفەرموێ:

٨)- ﴿ثَلَٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ﴾، ئەو سێ کاتە، سێ عەوڕەتی ئێوەن، هەڵبەتە عەوڕەت لە مانای باوی دا بە مانای پاش و پێشی مرۆڤ دێ، ئەو بەشە لە جەستەی مرۆڤ، کە پێی ناخۆشە دەربکەوێ، شەرمی پێ دێ دەربکەوێ، دەنا عەوڕەت لە ئەصڵدا بە مانای: کەلێن و بۆشایی و نوقصانیی دێ، واتە: ئەو سێ کاتە، سێ کاتن، مەزەنەی ئەوەیان لێ دەکرێ، عەوڕەتتان دەربکەوێ، بەشێك لە جەستەتان کە پێتان ناخۆشبێ خەڵکی دیکە ببینێ، دەربکەوێ لە کاتی خەوتندا، یان کاتێ کە ژن و مێرد دەچن بۆ لای یەکدی و پێکەوە ئاوێزان دەبن.

٩)- ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّ﴾، نە ئێوەو نە ئەوان، (واتە: نە ئێوەو نە بەردەستەکانتان و منداڵەکانیشتان: کوڕو کچەکانیشتان) دوای وان گوناهتان ناگاتێ.

(بَعْدَهُنَّ)، یانی: جگە لەو سێ کەڕەتە، جگە لەو سێ حاڵەتە.

١٠)- ﴿طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾، بەسەر یەکدییەوە دەگەڕێن، ئێوەش و ئەوانیش، لە جگە لەو سێ حاڵەتە تایبەتەدا، (طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم): (خبرٌ مبْتَدأ محذُوف: أي هُم طوّافُون عَلَيْكُم)، ئەوان بەسەرتانەوە دەگەڕێن، دوایی کە دەفەرموێ: ﴿بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾، هەندێکتان بەسەر هەندێکتانەوە دەگەڕێن، ئەوە وەك پۆزش و پاساو هێنانەوەیە بۆ ئەوە، کە ناگونجێ لە هەموو وەختاندا، مۆڵەت وەربگرن، چونکە ئیشتان

بە یەك دەبێ، منداڵ و کوڕو کچ، دێن بۆ لای دایك و بابیان، هەروەها خزمەتکارو بەردەست، بە هەمان شێوە.

١١)- ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ﴾، ئاوا بەو شێوەیە خوا ئایەتەکانتان بۆ ڕۆشن دەکاتەوە، (كَذَٰلِكَ)، ئایا ئەمە بە چی چوێنراوە، بە چی تەشبیە کراوە؟ واتە: بەم شێوە ڕوونکردنەوەیە کە بە گوێتان دادەدەین، کە ئەگەر بویسترێ بە شتێك بچوێنرێ، جگە لە خۆی وێچوێنراوێکی باشتر نیەو، هەر دەبێ بە خۆی بچوێنرێ، واتە: وەك ئەو شێوەیە کە بۆمان ڕوونکردوونەوە، ڕوونی دەکەینەوەو، ڕوونکردنەوەیەکی زۆر زۆر باشە.

١٢)- ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾، خواش ﷻ زانایە، کارزانە، ئەمەش بۆ ئەوەیە: ئەم حوکمانە، ئەم یاسایانە کە خوا ﷻ بۆتان دەردەکات، بزانن کە لە زانیاریی بێسنووری خواوەو، لە کاربەجێیی خواوەوە سەرچاوە دەگرن، متمانەتان پێیان بێ و جێبەجێیان بکەن.

دوایی دەفەرموێ:

١٣)- ﴿وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ﴾، هەر کاتێك منداڵەکانتان، منداڵەکان لە ئێوە، گەیشتنە ڕاددەی باڵغبوون، (بلغوا الحلم: أي إذا بلَغُوا الإحتلامَ)، ئەو کاتە حوکمەکەیان لە حوکمی منداڵەوە دەگۆڕێ بۆ حوکمی پیاوو ئافرەت.

بۆیـــە:

١٤)- ﴿فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾، با مۆڵەت وەربگرن وەك چۆن ئەوانەی پێش وان مۆڵەتیان وەرگرت، پێشێ باب و دایك پابەند کرابوون بەوەی منداڵەکانیان، کۆیلەو کەنیزەکانیان وا ڕابێنن و مەشق پێ بکەن و پەروەردەیان بکەن، بەڵام ئەمجارە: ئەرك لەسەر خۆیانەو، با خۆیان مۆڵەت وەربگرن، نەك ئێوە پێیان بڵێن، هەروەك ئەوانی پێش خۆیان مۆڵەتیان وەرگرت، با ئەوانیش مۆڵەت وەربگرن، ئنجا ئەمە دوو واتای هەن:

یەکەم: وەك کەنیزەك و کۆیلەو منداڵەکان، کە ڕایان دێنن و پەروەردەیان دەکەن، با وەك وان مۆڵەت وەربگرن.

دووەم: دەشگونجێ ئەمە پەیوەست بێتەوە بە ئایەتی (٢٧) لە سوورەتی (النور)، کە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُوا۟ وَتُسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! مەچنە ماڵانێك جگە لە ماڵەکانی خۆتان، تاکو هۆگرانە مۆڵەت وەرنەگرن، (تاکو دڵنیا بن ئەوان پێیان خۆشە بچنە لایان)، وەك چۆن ئەوان پابەند کرابوون، ئەوانەشتان کە باڵغ بوون، با بەو شێوەیە وەك پیاوی باڵغ و ئافرەتی باڵغ، مامەڵە بکەن.

١٥)- ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ ﴾، ئاوا خوا ئایەتەکانیتان بۆ ڕۆشن دەکاتەوە.

١٦)- ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾، خواش زانای کارزانە.

لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: (لِيَستَأذنكم)، ئەو (ل) بۆ فەرمانە، یانی: با مۆڵەتتان لێ وەربگرن، ئەوانەی کە بەردەستانن و ئەو منداڵانەتان کە نەگەیشتوونە ڕاددەی باڵغ بوون، یانی: ئێوە پەروەردەیان بکەن لەسەر ئەوەو ڕایان بێنن و مەشقیان پێ بکەن، ئەوە ئەرکی باب و دایکەو، ئەرکی سەرپەرشتیاری ماڵە، بەڵام دوایی، کە منداڵەکان باڵغ دەبن، ئنجا ئەرکی سەرشانی خۆیانە، خۆیان ئەرکدار(مکلّف)ن، کە دەبێ بەو شێوەیە مامەڵە بکەن، کە خوا ﷻ بۆی دیاریی کردوون.

**مەسەلەی دووەم:**

**ئافرەتانی بە تەمەنی بێ هیوا (لە هاوسەرگیریی و) لێچووەوە لە حەیز، ئەگەر خۆیان لە پۆشاکیان سووك بکەن، بە مەرجێك بۆ جوانیی خۆدەرخستن نەبێ، گوناهیان ناگات، بەڵام خۆپارێزییان لە سووککردنی خۆیان لە بەشێك لە پۆشاکەکانیان، بۆ ئەوان باشترە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِى لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَٰتٍۭ بِزِينَةٍ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٦٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾، ئافرەتانێکی دانیشتووش لە شووکردن و بێ هیوا لە منداڵبوون، ئافرەتانێك کە لەسەر دەستی خۆیان دانیشتوون و کەوتوونە تەمەنەوە، (**الْقَوَاعِدُ: جَمْعُ قَاعِدٍ بِدُونِ تَاءِ تَأْنِيثٍ مِثْلَ: حَامِلٍ وَحَائِضٍ، لِأَنَّهُ وَصْفٌ نُقِلَ لِمَعْنَى خَاصٍّ بِالنِّسَاءِ، وَهُوَ الْقُعُودُ عَنِ الْوِلَادَةِ وَعَنِ الْمَحِيضِ**)، (**قاعد**)، بە (**قَوَاعِدُ**)، کۆدەکرێتەوە، پێویست ناکات (**تَاءِ تَأْنِيثٍ**)، پێوە بنووسێرێ، وەك: (**حَامِل و حَائِض**)، چونکە بەس ئافرەت دەکەوێتە حەیزەوەو، بەس ئافرەت تۆلدار دەبێ، بە هەمان شێوەش هەر ئافرەتیش وای لێدێ کە لە منداڵ بچێتەوە، لە حەیز بچێتەوەو، بە تەمای هاوسەرگیریی نەبێ، لەبەر ئەوەی ئەمە وەصفێکە مانایەك نەقڵ دەکات کە تایبەتە بە ئافرەتانەوە، کە بریتیە لە دانیشتن لە منداڵ بوون و حەیز، کەواتە پێویست ناکات (**تَاءُ التَّأْنِيثِ**)، پێوە بنووسێندرێ، بەڵام ئەگەر گوترا: (**إِمْرَأَةٌ قَاعِدَة**)، یانی: ئافرەتێکی دانیشتوو، (**إِمْرَأَةٌ قَائِمَةٌ**): یانی: ئافرەتێکی ڕاوەستاو، هەروەك دەگوترێ: (**رَجلٌ قَاعِدٌ**) و (**رَجلٌ قَائِمٌ**).

٢)- ﴿ ٱلَّٰتِى لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا ﴾، ئەو (ئافرەت)انەی بە تەمای هاوسەرگیریی نین، ئەمە وەصفێکی دەرخەرە بۆ (**قَوَاعِد**)، نەك بەند (**قید**)بێ، واتە: لەبەر ئەوەی بە تەمای هاوسەرگیریی نین، نا، بەڵکو حاڵەتەکەیان وایە.

٣)- ﴿ فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ ﴾، گوناهیان ناگاتێ، (جُنَاحٌ)، مەیل کردنە بە لای ناهەقیدا.

٤)- ﴿ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ ﴾، کە پۆشاکەکانیان دابنێن، بە تەئکید لێرەدا یانی: بەشێك لە پۆشاکەکانیان دابنێن، نەك هەر خۆیان ڕووت بکەنەوە، بەشێك لە پۆشاکیان، وەك: سەرپۆش، پۆشاکی دەرێ، (وضْع) بریتیە لەوەی شتێك لەسەر شتێك دابندرێ، بەڵام ئەگەر (وضع) بە (عَنْ) بەرکار بخوازێ، مەبەست پێی لابردنی شتێکە لە شوێنی خۆی، (وُضِعَ عَنْهُ)، یانی: لەوێی لابرد، بەڵام (وَضَعَهُ)، یانی: داینا.

٥)- ﴿ غَيْرَ مُتَبَرِّجَٰتٍ بِزِينَةٍ ﴾، بە جوانیی خۆ دەرخەرەوانە نەبن، یا بە تەمەنیش بن، کاتێك خۆیان لە پۆشاك سووك دەکەن، مەبەستیان ئەوە نەبێ جوانیی خۆیان دەربخەن، (التّبَرج: التّكَشُّف)، خۆ دەرخستن، ﴿ غَيْرَ مُتَبَرِّجَٰتٍ بِزِينَةٍ ﴾، واتە: مەبەستیان جوانیی خۆ دەرخستن نەبێ.

ئەم ڕستەیە دوو واتای هەن:

أ- یانی: کە هەندێك لە پۆشاکیان دادەنێن، مەبەستیان دەرخستنی جوانیی خۆیان نەبێ، کە شێردراوەتەوە.

ب- کاتێك کە دەچنە دەر لە ماڵەکانی خۆیان، ئەو بەشێك لە پۆشاکی کە دایدەنێن لە ماڵێ، لە دەرێش داینەنێن، واتە: کە لە ماڵ دەچنە دەرێ، ئەو مۆڵەتە کە لە ماڵێ کاری پێدەکەن، کە بەشێك لە پۆشاك: سەرپۆش، یان بەرگی سەرەوە، کە دایدەنێن لە دەرێ داینەنێن و ئەوە تایبەتە بە ماڵێ.

٦)- ﴿ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ ﴾، ئەگەر خۆشیان پاك ڕابگرن (و ئەو مۆڵەتە کارپێ نەکەن)، بۆ ئەوان باشترە، زیادکردنی (س)و (ت)ی سەر (يَسْتَعْفِفْنَ)، بۆ زێدەڕۆییە، یانی: ئەگەر باش خۆیان پاك ڕابگرن، لەوەی بەشێك لە پۆشاکیان دابێن، ئەوە بۆ ئەوان باشترەو خێری زیاتری تێدایە.

٧)- ﴿ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾، خواش بیسەری زانایە، خوا بیسەری قسەکانیان و، زانای نیازو مەبەستیان و هەڵس و کەوتیشیانە

**مەسەلەی سێیەم:**

**بابای کوێرو شەل و نەخۆش، وێڕای هی ساغ، گوناهیان ناگات کە لە ماڵی خۆیان، یان کوڕو کچیان و باب و دایك و براو خوشك و مام و پوورو خاڵ و پلك و، کەسێك کە کلیلی ماڵیانی بە دەستەو، برادەریان، خواردن بخۆن، هەروەها گوناهیان ناگات کە پێکەوەو بە کۆمەڵ، یان بە جیا جیاو، بە تەنیا خواردن بخۆن و، پێویستە کە وەژووریش کەوتن، سڵاو بکەن لە خۆیان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَٰنِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَعْمَٰمِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخْوَٰلِكُمْ أَوْ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمْ أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ أَوْ صَدِيقِكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَأْكُلُوا۟ جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا ۚ فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةً طَيِّبَةً ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦١﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە بیست بڕگەدا:**

**١)- ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ ﴾، کوێر گوناهی ناگاتێ و سەغڵەت ناکرێ.**

**٢)- ﴿ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ ﴾، هەروەها شەلیش سەغڵەت ناکرێ و گوناهی ناگاتێ.**

وشەی (حَرَجٌ) لە ئەصڵدا بە باغێکی چڕوپڕ دەگوترێ، کە درەختەکانی تێك ئاڵابن و سەریان لێك دابێ و، ڕێ نەبێ بچیە تێی.

**٣)- ﴿ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ ﴾، هەروەها بابای نەخۆش، دیسان سەغڵەت ناکرێ و گوناهی ناگاتێ.**

٤)- ﴿ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ ﴾، خۆشتان گوناهتان ناگاتێ و، سەغڵەت ناکرێن، لە چی؟

٥)- ﴿ أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ ﴾، کە خواردن بخۆن لە ماڵەکانتان دا، واتە: هەر کامێك لەوانە، چ ئەوانەی کە کەمئەندامن و، خاوەن پێداویستیی تایبەتن، چ ئەوانەی ساغن، بۆیان ڕەوایە خواردن بخۆن لە ماڵی خۆیان، یان لە ماڵی کوڕیان، یان لە ماڵی کچیان، یان نەوەیان، هەروەها لە ماڵی ئەوانەی کە نزیکیانن: وەك:

٦)- ﴿ أَوْ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمْ ﴾، یان ماڵەکانی بابانتان.

٧)- ﴿ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَٰتِكُمْ ﴾، یان ماڵەکانی دایکانتان.

٨)- ﴿ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَٰنِكُمْ ﴾، یان ماڵەکانی برایانتان.

٩)- ﴿ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمْ ﴾، یان ماڵەکانی خوشکانتان.

١٠)- ﴿ أَوْ بُيُوتِ أَعْمَٰمِكُمْ ﴾، یان ماڵەکانی مامەکانتان

١١)- ﴿ أَوْ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمْ ﴾، یان ماڵەکانی پوورەکانتان،

١٢)- ﴿ أَوْ بُيُوتِ أَخْوَٰلِكُمْ ﴾، یان ماڵەکانی خاڵەکانتان.

١٣)- ﴿ أَوْ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمْ ﴾، یان ماڵەکانی پلکەکانتان.

١٤)- ﴿ أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ ﴾، یان ماڵێك کە کلیلەکانی ئەو ماڵە لە لاتانن و بە ئەمیندار دانراون.

١٥)- ﴿ أَوْ صَدِيقِكُمْ ﴾، یان ماڵی برادەرتان.

١٦)- ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَأْكُلُوا۟ جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا ﴾، گوناهتان ناگاتێ خواردن بخۆن لەو شوێنانە، وێکڕا یان بە پرژو بڵاویی (تاك تاك)، ئێمە لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا گێڕراوەیەکمان باسکرد، کە تیشك دەخاتە سەر چەمك و واتای ئەم ئایەتە موبارەکە، بەڵام لێرەدا با قسەیەکیش لە (الطبري)یەوە بێنین: دەڵێ: [وَأَشْبَهُ الأَقْوَالِ الَّتِي

ذَكَرْنَا فِي تَأْوِيلِ قَوْلِهِ: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ أَوْ صَدِيقِكُمْ ﴾، الْقَوْلُ الَّذِي ذَكَرْنَا عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَنَّهُ لاَ حَرَجَ عَلَى هَؤُلاَءِ الَّذِينَ سُمُّوا فِي هَذِهِ الآيَةِ، أَنْ يَأْكُلُوا مِنْ بُيُوتِ مَنْ ذَكَرَهُ اللَّهُ فِيهَا، عَلَى مَا أَبَاحَ لَهُمْ مِنَ الأَكْلِ مِنْهَا]<sup>(١)</sup>.

واتـە: وێچووترینـی قسـەكان كـە باسـمان كـردن، لـە لێكدانـەوەی فەرمـوودەی خـوادا، كە دەفەرمـوێ: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ ﴾، تاكـو دەگاتـە: ﴿ أَوْ صَدِيقِكُمْ ﴾، ئـەو قسـەیە كـە لـە (الزُّهْرِيُّ)یـەوە هێنامـان، (یەكێكـە لـە زانایانـی شـوێنكەوتووان، جیلـی دوای هـاوەڵان (تابعین))، كـە گوتوویەتـی: ئەوانـەی باسـكران و ناوهێـنران لـەم ئایەتـەدا، گوناهیـان ناگاتـێ لـە ماڵـی ئەوانـەی خـوای بـەرز باسـی كـردوون، بخـۆن، لەوەدا كـە خـوای پـەروەردگار بـۆی ڕەواكـردوون لێـی بخـۆن.

لـە هـۆی هاتنـە خوارەوەكەیـدا ڕیوایەتێكـمان لـە دایكـمان عائیشـەوە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) هێنـا، لـە بـارەی ئەوانـەوە كـە بـە ئەمینـدار دادەنرێـن و كلیلیـان لـە لایـە، ڕیوایەتێكیـش لـە عەبدوڵڵای كـوڕی عەبباسـەوە (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ)، كـە ئـەوە بـوو مسـوڵمانان بـە هـۆی ئایەتـی (٢٩)ی سـوورەتی (النسـاء)ەوە كـە دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَـٰطِلِ ﴾، جۆرێـك هەسـتیارییان پەیدابـووەو، پێیـان وابـووە كـەس بـۆی نیـە لـە ماڵـی كـەس بخـوات، چونكـە ئـەوە دەچێتـە چوارچێـوەی خواردنـی بـە ناهـەق، بـەڵام دوایـی خـوا ﷻ ئـەم ئایەتـەی ناردۆتـە خـوارو بـۆی ڕوونكردوونـەوە، كـە نەخێـر، ئـەو چەمـك و واتایـەی ئێـوە لێـی تێگەیشـتوون، لـە ئایەتـی (٢٩)ی سـوورەتی (النسـاء)، وانیـە، بـە تایبەتـی كـە ئایەتەكـە خۆیشـی ئـەوە ڕووندەكاتـەوەو دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَـٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَـٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ ﴿٢٩﴾ ﴾، ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! سـامانەكانتان لـە نێوتـان دا بـە

---
(١) جامع البيان: ج١٨، ص١٨٢.

ناهەق مەخۆن، مەگەر بازرگانییەك بێ بە ڕەزامەندیی، تێوانتان بێ، كەواتە: مادام بە ڕەزامەندیی بێ، ناچێتە قاڵبی خواردنی بە ناهەقەوە.

## سەرنجدانێكی خێرا لە پێنج وشەی ئەم ئایەتە:

یەكەم: كە دەفەرموێ: ﴿وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞ﴾، خوا بۆ كوێرو شەل و نەخۆش، وشەی (حَرَجٌ)ی بەكارهێناوە، هەروەها بۆ خۆشیان، (الزجّاج) گوتوویەتی: (الحَرَجُ: الضَّيقُ، وَفِي الدِّيْنِ الإِثْمُ)[1]، واتە: (حَرَج) لە ڕووی زمانەوانییەوە، بە مانای شوێنی تەنگەبەرو سەغڵەت و تەسك، دێ، بەڵام لە دیندا، لە زاراوی دینداریی دا، ئەو وشەی (حَرَجْ)، خوازراوەتەوە بۆ مانای گوناح، چونكە ئینسان بە هۆی گوناهەوە، سەغڵەت دەبێ و هەست بە سەغڵەتیی دەكات لە بەرانبەر خوای پەروەردگاردا.

دووەم: كە دەفەرموێ: ﴿أَن تَأۡكُلُواْ مِنۢ بُيُوتِكُمۡ﴾، سەغڵەتیی و گوناهتان لەسەر نیە (كە خواردن) لە ماڵەكانتان دا بخۆن، یەكێك بۆی هەیە بڵێ:

ئایا پێویست بەوە دەكات خوا ﷻ پێمان بفەرموێ: گوناهتان ناگاتێ لە ماڵی خۆتاندا خواردن بخۆن؟! هەموو كەس دەزانێ كە لە ماڵی خۆ خواردن، گوناح نیە!! بۆیە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ﴿أَن تَأۡكُلُواْ مِنۢ بُيُوتِكُمۡ﴾[2]، (أي: بيوتُ أبنائكم وبناتكم)، ماڵەكانی كوڕەكانتان و كچەكانتان، چونكە كوڕو كچ هەر وەك خودی خۆیان وان، بۆ باب و دایك، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ أَطْيَبَ مَا أَكَلَ الرَّجُلُ مِنْ كَسْبِهِ، وَإِنَّ وَلَدَهُ مِنْ كَسْبِهِ}، (أخرجه النسائي: ٤٤٤٩، وابن ماجه: ٢١٣٧، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، وصَحّحه الألباني).

واتە: حەڵاڵترین و باشترین شتێك كە مرۆڤ بیخوات، ئەوەیە كە خۆی وەدەستی هێنابێ و، ڕۆڵەی مرۆڤیش (چ كچ چ كوڕ)، لە وەدەست هێندراوی مرۆڤە.

---

(١) جامع البيان: ج١٨، ص١٨٢.

(٢) وشەی (بُيُوت) لە هەموو ئایەتەكەدا بە (بُيُوت)و بە (بِيُوت)یش، خوێنراوەتەوە.

کەواتە: لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ ﴾، ئەمە دوو واتای هەن:

١- یانی: ماڵەکانی کوڕو کچەکانتان و نەوەکانتان.

٢- ئەگەر ڕواڵەتەکەشی بگرین، بڵێین: مەبەست پێی ماڵی خۆیە، لەبەر ئەوەیە: پیاوێك کە ماڵ و خێزانی هەیە: کوڕی هەن، کچی هەن، ڕەنگە نەوەی هەبن لەوێداو باب و دایکی لەوێ بن، ئنجا ئەوەك وابزانێ دەبێ هەموویان لەوێ بن، ئنجا بۆی هەبێ بخوات، بەڵکو ئەگەر ئەوانیش لەوێ نەبن، چونکە بەشی بەو ماڵەوە هەیە، بەڵکو خاوەنی ئەو ماڵەیە، بۆی هەیە لەو ماڵە بخوات بەبێ ئاگاداریی ژنەکەی، کوڕو کچەکانی، باب و دایکی، یاخود خەڵکی دیکە کە لە ماڵەکەدا هەبن.

ئنجا من ئەو بۆچوونەم پێ جوانترە کە مەبەست پێی ماڵی کوڕو کچەکانە، ئەگەرنا ماڵی خۆ، ئەوە بەڵگە نەویستەو ئاشکرایە، بە بەڵگەی ئەوەش کە خوا ﷻ دوایی باسی ماڵی باب و ماڵی دایك و ماڵی خوشك و ماڵی خاڵ و ماڵی مام و ئەوانە دەکات، کەواتە کوڕو کچ لە پێشترن کە باب و دایك لێیان بەهرەمەند بن و لە ماڵیان نان بخۆن، تاکو باب و دایك و براو خوشك و مام و پوورو خاڵ و پلك...

ئنجا هەر لەو بارەوە کە کوڕو کچ، وەك خودی باب و دایك وان، لەو ڕووەوە کە باب و دایك بۆیان هەیە خاوەندارێتیی کوڕو کچەکان بکەن و، بەشیان بە ماڵەکانیانەوە هەیە، بە تایبەت ئەگەر پێویستییان بێ، کوڕو کچ لەسەریان فەرزە باب و دایکیان خزمەت بکەن و بژیەنن، ئەگەر باب و دایکیان بێ توانا بوون و ئەوانیش تواناداربوون، لەو بارەوە ئەم دەقەش دێنین:

[عَنْ عَائِشَةَ، رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: أَنَّ رَجُلاً أَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ، يُخَاصِمُ أَبَاهُ فِي دَيْنٍ عَلَيْهِ، فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: «أَنْتَ وَمَالُكَ لِأَبِيكَ»] (أخرجه ابن حبان: ٤١٠، قال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح).

واتــە: دایكـمان عائیشــە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: پیاوێـك هاتـە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ كێشـەی هەبـوو لەگـەڵ بابـی دا، لەسـەر قەرزێـك كە لەسـەر بابـی بـوو، پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە كوڕەكـەی فەرمـوو: تـۆ خـۆت وماڵەكـەت هـی بابـتن.

هەڵبەتـە كاتێـك بابێـك بیـەوێ سـتەم لـە كوڕەكـەی بـكات، لـە كچەكـەی بـكات، ماڵیـان لـێ زەوت بـكات، ئـەوە جیایـەو حوكمێكـی دیكـەی هەیـە، بـەڵام لـە حاڵەتـی ئاسـاییدا، كـوڕو كـچ نابـێ مـاڵ و سـامانی خۆیـان لـە بـاب و دایكیـان وەچـاو بـێ، بەڵكـو دەبـێ بزانـن كـە لەسـەریان پێویسـتە خزمەتـی بـاب و دایكیـان بكـەن.

ئنجـا بـە نسـبەت هەمـوو ئەوانەشـەوە، ئـەم فەرمایشـتەی پێغەمبـەر ﷺ وەك بنچینەیـەك دەبـێ كاری پـێ بكـرێ:

**{عَنْ عَمْرِو بْنِ يَثْرِبِيٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: أَلاَ وَلاَ يَحِلُّ لِامْرِئٍ مِنْ مَالِ أَخِيهِ شَيْءٌ، إِلَّا بِطِيبِ نَفْسٍ مِنْهُ} (أخرجه أحمد: ٢١١١٩)**[١].

واتــە: عەمـری كـوڕی یەسریبـی (خوا لێـی ڕازی بـێ)، دەگێڕێتەوە: دەڵـێ: پێغەمبەری خـوا ﷺ وتـاری بـۆ دایـن، فەرمـووی: ئاگاداربـن! بـۆ هیـچ مرۆڤێـك لـە ماڵـی برایەكـەی هیـچ شـتێك حـەڵاڵ نیـە، مەگـەر بـە دڵخۆشـیی و دڵ ئاسـوودەیی پێـی بدات.

واتــە: ئەگـەر لـە ڕوودا بمێنـێ، یاخـود بـە زۆر لێـی بسـتێنێ، یـان بـە شـێوەیەك لـە شـێوە ناهەقـەكان، لێـی قەدەغـە دەبێ.

سێیەم: كە دەفەرموێ: ﴿أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُ﴾، كە خوێنراویشەتەوە: (مِفْتَاحَهُ)، هەم بە كۆ، هەم بە تاك خوێنراوەتەوە، ئەو ماڵەی كە ئێوە كلیلەكانیتان بە دەستە، یان كلیلەكەیتان بە دەستە، ئەمە هەم دەگونجێ وەكیل بێ، یان هاوبەش بێ، یان كەسێكی متمانە پێكراو بێ، هەموو ئەوانە دەگرێتەوە.

---

(١) قال شعيب الأرنؤوط: شطره الأول صحيح لغيره.

چوارەم: کە دەفەرموێ: ﴿أَوۡ صَدِيقِكُمۡ﴾، یاخود برادەرتان، دەڵێ: (الصَّدِيْق: فَعِيْلٌ بِمَعْنَى فَاعِل، وَهُوَ الصَّادِقُ فِي المَوَدَّة)، (صَدِيْق)، لەسەر کێشی (فَعِيْل)ە، بەڵام بە مانای: (فَاعِل)ە، کەسێکە لە خۆشەویستییدا لەگەڵتدا ڕاست بکات، گوتراویشە: (صَدِيْقُكَ مَنْ صَدَقَكَ، لاَ مَنْ صَدَّقَكَ)، واتە: برادەرت ئەوەیە لەگەڵت ڕاست بکات، نەك هەر بڵێ: ڕاست دەکەی، هەر کەس هەر دەستی بۆ بە مل دادای، مەرج نیە ئەوە برادەرت بێ، بەڵام برادەرت ئەوەیە کە لەگەڵت ڕاست بکات، شتێك کە عەقڵی نەیبڕی و، پێی چاك نەبوو بۆ تۆو، زانی زیانی تۆی تێدا هەیە، بڵێ: نا ئەوەیان زیانی هەیە، ئەوە هاوەڵ برادەری بە ڕاستیی و دڵسۆزە، پێشینانی خۆشمان دەڵێن: (دۆست ئەو کەسەیە دەتگریەنێ و، دوژمن ئەو کەسەیە دەتهێنێتە پێکەنین).

پێنجەم: کە دەفەرموێ: ﴿لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَأۡكُلُواْ جَمِيعًا أَوۡ أَشۡتَاتٗا﴾، گوناهتان ناگاتێ کە هەمووتان پێکەوە بخۆن، یاخود بە پرژو بڵاویی، (أَشْتَاتاً: جَمْعُ شَتٌّ، أَي: التَّفَرُّق، وَشَتَّى: جَمْعُ شَتِيت)، (أَشْتَاتاً)، کۆی (شَتٌّ)ە، بە مانای بڵاوبوون، بەڵام (شَتَّى) کۆی (شَتِيت)ە، بڵاو، بەش، (أشتاتاً)، یانی: بە بڵاویی، تاك تاك خواردن بخۆن هەر ڕەوایە، پێکەوەش بخۆن بە تەئکید هەر ڕەوایە، ئایا کام حاڵەتیان باشترە؟ بێگومان حاڵەتی پێکەوە خواردن، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {وطَعَامُ الإِثْنَيْنِ يَكْفِي الأَرْبَعَةَ} (أخرجه أحمد:١٤٢٦٠، والدارمي: ٢٠٤٤، ومسلم: ٢٠٥٩، والترمذي برقم ١٨٢٠، وقال: حسن صحيح، وابن حبان: ٥٢٣٧).

واتە: خواردنی دووان، بەشی چواران دەکات.

ئەگەر پێکەوە بخۆن، بەرەکەتی دەکەوێتێ، من پێم سەیرە هەندێك کەس مەگەر ناچاربێ، ئەگەرنا چۆن بە تەنێ نانی بۆ دەخورێ، چونکە مرۆڤ بەس جەستە نیە، تەنیا گەدەی تێر بکات، مرۆڤ هەست و نەستە، دڵ و دەروونە، ڕەوشت و ئاکارەو، ڕووح و عەقڵەو، ئەوانە هەموویان پێویستییان بە تێرکردنەو بە هۆی پێکەوە دانیشتن و قسەی خۆش و، خۆشەویستیی لەگەڵ یەك دەربڕین و

دڵسۆزیی بۆ یەکدی نواندنەوە، عەقڵ و دڵ و ڕووح و دەروونیش تێر دەبن و، جەستەش ئەو کاتە کەمتر پێویستیی بە خواردن دەبێ و، پێکەوە خواردن بە تەنکید بەرەکەت دەخاتە نێو خواردنەکەوەو، مرۆڤیش پێی ئاسوودەتر دەبێ و خواردنەکەی باشتر بە گیان دەکەوێ.

١٧)- ﴿فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا﴾، ئنجا هەر کات چوونە ماڵانێکەوە، یانی: هەر کام لەو ماڵانە کە باسکران، یاخود ئەوانەو جگە لەوانەش، چی بکەن؟

١٨)- ﴿فَسَلِّمُوا عَلَىٰ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً﴾، (ئەگەر کەسیان تێدا نەبوو)، سەلام لە خۆتان بکەن، (بڵێن: (السلام علينا وعلى عبادالله الصالحين))، ئەوە سڵاوێکە لە خواوە، بە پێزەو پاك و چاکە بۆتان دانراوە، بەڵام ئەگەر خەڵکیان تێدا بێ بڵێن: (السلام عليكم ورحمة الله)، یان (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته).

١٩)- ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ﴾، ئاوا بەو شێوە (جوان و ڕێکە، کە هەر دەبێ بە خۆی بچوێندرێ، ئەو ڕوونکردنەوەیەو، وێچوێنراو (مشبّه به) ێك نیە پێی بچوێنرێ، مەگەر هەر بە خۆی بچوێنرێ)، خوا ئایەتەکانتان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

٢٠)- ﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾، بەڵکو بفامن، یانی: (رَجَاءَ أَنْ يَحْصِلَ لَكُمُ الفَهْمُ والعِلْمُ بِمَا فِيْهِ كَمَالُ شَأْنِكُم)، بە ئومێدی ئەوەی تێگەیشتن و زانیارییتان بۆ دروست بێ، بە شتێك کە حاڵی خۆتانی پێ چاك و تەواو دەبێ.

بەڵکو بفامن و تێبگەن و دوایی کاری پێ بکەن.

تیشك خستنە سەر چوار وشە:

١- (سَـــلَام):

(السَّلَامُ: مُشْتَقٌ مِنْ السَّلَامَةِ، فَهُوَ دُعَاءٌ بالسَّلَامَة، وَتأْمِيْنٌ لَهُ بالسَّلَام)، سەلام، لە سەلامەتییەوە هاتوە، کە لە لایەکەوە پاڕانەوەیە بۆ ئەو کەسەی تۆ سەلامی لێ دەکەی، کە سەلامەت و بێمزەڕەت و بێ زیان بێ، هاوکاتیش دڵنیای دەکەیەوە کە لە لایەن تۆوە سەلامەت دەبێ، لە دەست و زمانی تۆ سەلامەت دەبێ.

کەواتە: (السلام علیکم)، هەم پاڕانەوەیە بۆی و، هەم دڵنیاکردنەوەیە بۆی، چەند جوانە! ئەوە لە کوێ و ئەوە لە کوێ: بەیانییت باش، نیوەڕۆت باش، ئێوارەت باش، شەو باش، (Good morning)، (Good evening)، ئەوەی ئیسلام دەیڵێ بەرنامەیە، پاڕانەوەیە، دڵنیاکردنەوەیە، پەیامی ئاشتیی ناردنە بۆ لایەنی بەرانبەر، بۆیە خوا ﷻ لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا ﴿٩٤﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر لە ڕێی خودا ڕۆیشتن (بۆ جەنگ و جیهاد)، چاو ورد بکەنەوە، بەر پێی خۆتان ببینن، کەسێك سەلامی لێ کردن، مەڵێن: بڕوادار نی!

ئەدی ئەوە نیە سەلامتان لێ دەکات و ئاشتییتان لەگەڵ ڕادەگەیەنێ!!

٢- (تَحِيَّة):

(التحيَّةُ: حَالٌ مِنَ التَّسْلِيمِ الَّذِي يَتَضمَّنه)، یانی: کە دەفەرموێ: ﴿ فَسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ تَحِيَّةٗ ﴾، (تحيّة): حاڵە، یانی: ئەو سەلام کردنە، سڵاوکردنێکە ﴿ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ ﴾، لە خواوەیە ﷻ، خوا دایناوە بۆ ئەوەی بەو جۆرە سڵاو لە یەکدی بکەن.

٣- (مُبارَكة):

(المُبارَكة: المجْعُولَة فِيْها البَرَكَة وَهِيَ وَفْرة الخَيْر)، (مبارکة)، یانی: پێزی تێدایە، پێزدارە، پێزیش بریتیە لە خێرو سوودی زۆر.

٤- (طَيِّبَة):

(ذاتُ طَيِّبٍ)، خاوەنی پاکیی و چاکیی، (طَيِّب)، یانی: پاك و چاك.

شایانی باسە، وەك پێشتریش گوتمان: کە دەفەرموێ: ﴿ فَسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ ﴾، ئەمە دوو واتای هەن:

أ- ئەگەر کەسیان تێدا نەبوو، بڵێن: (السَّلَامُ عَلَيْنَا، وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ).

ب- سەلام لە خۆتان بکەن، وەك مسوڵمانان چونکە مسوڵمانان هەموویان یەکن، برایەکەشت تۆی، خوشکەکەش تۆی، تۆش هەر براو خوشکەکەتی، وەك لە ئایەتەکەی بەسەرهاتی (إفك)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا ﴿١٢﴾ ﴾النور، واتە: دەبووایە کە دەتانبیست، پیاوانی برواداراو ئافرەتانی بروادار گومانی باشیان بە خۆیان بردبایە، خۆیان، یانی: دایکیان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)و برایەکەیان صەوفوانی کوڕی موعەتتەلی سەهمیی، دەبوو گومانی چاکیان بەوان بردبایە، ئەوانیش هەر خۆیانن و خۆیانیش ئەوانن، (الطبري)، لە بارەی کۆی ئایەتەکەوە دەفەرموێ: {أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ تَرْخِيصاً لِلْمُسْلِمِينَ فِي الأَكْلِ مَعَ الْعُمْيَانِ، وَالْعُرْجَانِ، وَالْمَرْضَى وَأَهْلِ الزَّمَانَةِ مِنْ طَعَامِهِمْ}[1].

واتـە: ئـەم ئایەتـە دابەزێـنرا، وەك مۆڵەتـدان بـۆ مسـوڵمانان کـە لەگەڵ کوێـرەکان و، شـەلەکان و، نەخۆشـەکان و، بـە تەمەنەکانـدا لـە خواردنیـان، بخـۆن، لەگەڵیـان بخـۆن، چونکـە هەندێـك لـە مسـوڵمانان هەسـتیان بـە سـەغڵەتیی دەکـرد کـە: ئەوانـە کوێـرن، شـەلن، نەخۆشـن، بـە تەمەنـن، ئێمـە ئەگـەر لـە گەڵیـان بخۆیـن، ڕەنگـە سـتەمیان لـێ بکەیـن و زیـاد لـەوان بخۆیـن.

لـە لایەکـی دیکـەوە: هەندێـك لـەو کەمئەندامانـە: شـەل و کوێـرو نەخـۆش و بـە تەمەنـەکان دەیانگـوت: ئەگـەر لەگـەڵ سـاغەکان بخۆیـن، ڕەنگـە بێزمـان لـێ بکـەن، یاخـود سـتەم لـەوان بکەیـن و کام خواردنـی باشـە، دەسـتی بـۆ بەریـن و ئـەوە بخۆیـن، بـەڵام خوا ﷻ ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوار کـە: نەخێـر بـا نـە سـاغەکان و، نـە کەمئەنـدام و نەخۆشـەکان و خـاوەن پێداویسـتیی تایبەتـەکان، هەسـت بە سـەغڵەتیی نەکـەن و بۆیـان هەیـە پێکـەوە بخـۆن، هەموویـان بـراو خوشـکی یەکدیـن.

---

(١) جامع البيان: ج١٩، ص٣١٩.

**مەسەلەی چوارەم:**

**بڕوادارانی ڕاستەقینە ئەوانەن کە بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ هەیەو، لە کاتێکیشدا بۆ کارێکی کۆکەرەوەو هەرەوەزیی، کاری گشتیی لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دەبن، بە بێ مۆڵەت لێوەرگرتنی، بەملاو لادا ناچن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، بڕواداران تەنها ئەوانەن کە بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ هێناوە.

(إِنَّمَا): (أداة الحصر والإثبات)، ئامرازی کۆکردنەوەو چەسپاندنە، (**إنَّما تَقْصرُ مَوصُوفاً عَلَى صِفَةٍ**)، (إِنَّمَا) وەسفکراو (**مَوصُوف**)ێک لەسەر ئاوەڵناو (**صِفَة**)یەک کورت هەڵدێنێ، ئاسانديش لە: (**المؤمنين**)دا، بۆ جینسە، یاخود بۆ عەهدە، یانی: کۆی بڕوادارانی ڕاستەقینە، یاخود: ئەو بڕوادارانەی ناسراون و زانراون، ئەوانە کەسانێکن کە بەو شێوەیەن: بڕوایان بە خواو ڕۆژی دوایی هێناوەو، کاتێکیش لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دەبن، بۆ کارێکی گشتیی، کە بۆی کۆبوونەتەوە، بە بێ مۆڵەت وەرگرتن بەملاولادا ناچن.

٢)- ﴿وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ﴾، لە کاتێکدا لەگەڵیدا دەبن بۆ کارێکی کۆکەرەوە، کارێکی گشتیی و هەرەوەزیی، ﴿عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ﴾، (**الأَمْرُ: الشَّأْنُ وَالحَالُ المُهِمّ**)، کارێك و حاڵێکی گرنگ، وشەی: (**جَامِع**)یش، ﴿عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ﴾، ئەوەیە کە خەڵك بۆی کۆبێتەوە، ڕاوێژی تێدا بکەن، چ بۆ فێربوون، چ بۆ جێبەجێ کردن.

٣)- ﴿ لَمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ﴾، ناڕۆن هەتا مۆڵەتی لێ وەرنەگرن، تا ئەوانە بە ڕاستیی بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناوە.

٤)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی مۆڵەت لە تۆ وەردەگرن.

٥)- ﴿ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾، ئەوانە بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی ﷺ هەیە، یانی: ئەم خەسڵەتە یەکێکە لە خەسڵەتە بەرزەکانیان.

٦)- ﴿ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ ﴾! ئنجا ئەگەر بۆ هەندێك لە ئیش و کاریان مۆڵەتیان لێ وەرگرتی.

٧)- ﴿ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ ﴾، مۆڵەتی هەر کامێکیان ویستت، بدە، یانی: تۆ سەرپشکی بۆ هەر کامێك لەوانەی مۆڵەتت لێ وەردەگرن، بۆت هەیە هەر کامێکیان ویستت مۆڵەتی بدەی.

٨)- ﴿ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ﴾، داوای لێبوردنیشیان بۆ لە خوا بکە، چونکە ڕەنگە مۆڵەتت لێ وەربگرن، بەبێ ئەوەی کارەکە پێویست بێ، یاخود جۆرێك لە کەمتەرخەمیی لە لایەن وانەوە هەبێ، بۆیە داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکە.

٩)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، بێگومان خوا لێبوردەی بەبەزەییە.

# سێ کورتە سەرنج

لێرەدا پێویستە سێ کورتە سەرنج بخەینە ڕوو:

یەك: ڕستەی: (إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ)، مەبەست پێی ئەوە نیە کە هەر کەس مۆڵەتی لە پێغەمبەر ﷺ وەرگرت، بڕوادارە، بەڵام ئەگەر مۆڵەتی وەرنەگرت بڕوادار نیە! چونکە ئیمان پێناسەکەی و پایەکانی دیارن، بەڵکو مەبەست ئەوەیە، بابای مۆڵەت وەرگر لەو هەڵوێستەیدا ئیمانداریی و مسوڵمانیی بەرجەستە کردوە، ئنجا ئەوە زیاتر تانەدان بووە لە موونافیق و دەغەڵ و دڵنەخۆشەکان، نەك پێناسەی ئیمان، واتە: ئەی دەغەڵ و دڵنەخۆشەکان! ئا ئەوە سیفەتی بەرزی مسوڵمانانە، کە وێڕای ئەوەی بڕوایان بە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە، بەبێ مۆڵەت وەرگرتنیش، کاتێ خەریکی کارێکی گشتیین، بەملاو لادا ناچن.

دوو: ئەم ئایەتە تەنیا تایبەت نیە بە ڕۆژگاری پێغەمبەرەوە ﷺ، بەڵکو بنچینەیەکی گشتییەو، بناغەیەکە بۆ کاری هەرەوەزیی و چۆنیەتیی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا، چونکە زانایانی (أصول الفقه) لەسەر ئەوە یەکدەنگن: ئەو شتانەی کە لە ڕۆژگاری خۆیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ وەك ئەرك لەسەر شانی بوون، هەر کەسێك دێتە شوێنی پێغەمبەر ﷺ، لە قەدەر خۆی ئەرکن بۆ ئەویش، مەگەر بە بەڵگەیەك تایبەت کرابن بە پێغەمبەرەوە ﷺو، لە تایبەتمەندییەکانی ئەوبن، ئەگەرنا هەرچی ئەرکی پێغەمبەرە ﷺ، ئەرکی هەر کەسێکیشە کە لە شوێنی پێغەمبەر ﷺ دەبێ، بۆ سەرپەرشتیی کردنی کۆمەڵگا.

سێ: ئەم ئایەتە ئەدەبێکی گەورەو گرنگ فێری مسوڵمانان دەکات بۆ کۆبوونەوەکانیان، کە لە کاتی خۆیدا بچن و، پابەند بن بە شوێنەکەوەو، بە کاتەکەوەو کاتی یەکدی بە فیڕۆ نەدەن، هەمووشیان وەك یەك تیم (فريق) کار بکەن و، پێکەوە هاوکاربن، نەك وەك دڵۆپەی کە لە بان دێتە خوارێ، یەکێك ئێستا بێ، دوایی یەکی دیکە بێ! بەو جۆرە کاتی زۆریان لێ بە زایە دەچێ.

بەڵێ ئەم ئایەتە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە مسوڵمانان لە کاتی کۆبوونەوەو، کارە هەرەوەزییەکاندا، دەبێ هەموویان پێکەوە بن وەك یەك تیم و، پابەندبن بە یەکدییەوەو پابەندبن بە شوێن و کاتەوە، نەك بە گوێرەی میزاجیان بجووڵێنەوەو (کەس بە ڕبەی کەس نەپێوێ و، کەس لە مەڕی کەس نەخێوێ)و، هەر کەسە بە شێوێکدا بڕوات! هەرگیز دینداریی ڕاستەقینە و دنیاداریی چاك، ئاوا ناکرێ.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**نابێ مسوڵمانان وەك چۆن بانگی یەكدی دەكەن، ئاواش بانگی پێغەمبەر ﷺ بكەن، یاخود بانگكردنی پێغەمبەر بۆیان، وەك بانگكردنیان بۆ یەكدی تەماشا بكەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ۚ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ۚ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ﴾، واتە: ئەی بڕوادارینە! بانگكردنی پێغەمبەر ﷺ لە نێوانتاندا، وەك بانگكردنی هەندێكتان بۆ هەندێكتان، دامەنێن، ئەمە دوو واتای هەن، چونكە وشەی (دُعَآءَ):

أ- پاڵدانی چاوگە بۆ لای بكەرەكەی (إِضَافةُ المَصْدرِ إلى فَاعِلِهِ)، واتە: با بانگكردنی ئێوە بۆ پێغەمبەر ﷺ ، وەك بانگكردنی هەندێكتان بۆ هەندێكتان، نەبێ.

ب- پاڵدانی چاوگە بۆ لای بەركارەكەی (إِضَافةُ المَصْدرِ إلى مَفْعولِهِ)، واتە: بانگكردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئێوە، وەك بانگكردنی هەندێكتان بۆ هەندێكتان، دامەنێن، واتایەكی دیكەشیان بۆ لێك داوەتەوە: (دعاء)یان، هەر بە پاڕانەوە لێكداوەتەوە، واتە: كە پێغەمبەر ﷺ دوعاتان بۆ دەكات، یان دوعاتان لێ دەكات، لە كاتێكدا كە ڕقی هەڵدەستێ، یاخود كەسێك كە شایستەی ئەوەیە نزای خراپی لێ بكات، وامەزانن دوعاكردنی پێغەمبەر ﷺ چ بە باری ئەرێنیی و، چ بە باری نەرێنیی دا، وەك پاڕانەوەی ئێوە وایە! بەڵام وا پێدەچێ زیاتر مانای یەكەم و دووەم مەبەست بن:

أ- كە بانگی پێغەمبەر ﷺ دەكەن، با وەك ئەوە نەبێ كە بانگی یەكدیی دەكەن و مەڵێن: (يَا مُحَمَّدُ!)، وەك چۆن بە ناوی كەسیی بانگی یەكدی دەكەن، بەڵكو بڵێن:

(يَا رَسُولَ اللهِ! يَا نَبِيَّ اللهِ!)، بە ڕێزو حورمەتەوە، ئنجا ئەوە لە ڕووی ناوهێنانەوە، لە ڕووی شێوازو میکانیزمەکەشەوە، وەك لە سوورەتی (الحجرات)دا خوا ئەو ئایەتەی ناردە خوار: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ۝٤ ﴾، ئەوانەی کە لە پشت ژوورەکانەوە بانگت دەکەن، زۆربەیان ناقامن، چونکە ئەوانە کۆمەڵێك بوون لە ناوەختدا چوونە ماڵی پێغەمبەرو ﷺ دەیانگوت: (يَا مُحَمَّدُ! اخْرُجْ إِلَيْنَا) ئەی موحەممەد! وەرە دەرێ بۆ لامان، بۆیەش خوا فەرمووی: ئەوانەی لە پشت ژوورەکانەوە بانگت دەکەن، زۆربەیان ناقامن.

ب- یاخود بانگکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئێوە، وەك بانگکردنی هەندێکتان بۆ هەندێکتان، دامەنێن، کاتێ پێغەمبەر ﷺ بانگت دەکات، تۆ ئەرکداری و پابەند کراوی کە بڵێی: (لبيك) لە خزمەتدام ئەی پێغەمبەر! ﷺو بە دەنگیەوە بچی، یەکێکتان بانگی یەکێکتان دەکات، ئەگەر کەمتەرخەمییش بکات و نەچێ، یاخود بە درۆ پاساوێك بێنێتەوە، بەهەرحاڵ، بەڵام بە نسبەت پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوە گوناهەو نابێ بەو شێوەیە بێ.

ڕستەی: ﴿ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ﴾، (ظرف)ە، بۆ (دُعَاء) چ بە مانای بانگکردنی ئەوان بێ بۆ پێغەمبەر ﷺ، چ بە مانای بانگکردنی پێغەمبەر ﷺ بێ بۆ ئەوان، یاخود پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ بێ بۆیان، یان لێیان، ئەوە (ظرف)ی ئەو کارەیەو، ئەو کاتەیە کە ئەو کارەی تێدا ئەنجام دەدرێ.

٢)- ﴿ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ﴾، بە دڵنیایی خوا ئەوانەتان دەزانێ کە بە ئەسپایی، بە شێنەیی دەڕۆن و خۆ تێکگرانە خۆیان دەدزنەوە.

( يَتَسَلَّلُونَ ): بە پەنهانیی دەڕۆن، لە (تسلّل)ەوە هاتوە، ئەویش لە (سلَّ يَسُلُّ: نَزَعَ يَنْزَعُ)، دایڕنی دایدەڕنی.

﴿ لِوَاذًا ﴾، واتە: خۆ تێکدەگرن، خۆیان تێکدا پەنهان دەکەن، (اللَّوذُ: مَصْدَر لاوَذَهُ)، کە بریتیە لە خۆپەنهان کردن، بەڵام (لاذ بە)، واتە: پەنای پێبرد، ئەمە چاوگەکەی (لِياذ)ە، بەڵام (اللَّوذ)و (الملاوَذَة)، چاوگی (لاوذَ)یە، (لاوذَ)، یانی: خۆی

تێکـرت، هەندێـك لـە موونافیـق و دڵنەخـۆش و ئیـمان لاوازەکان کاتێـك ویسـتوویانە کـۆڕو مەجلیسـەکە، یاخـود کارە گشـتییەکە بەجـێ بهێڵـن، خۆیـان پەنهـان کـردوەو خۆیـان لـە شـتێك گرتـوە، یـان خۆیـان تێکگرتـوەو، پێکـەوە ڕۆیشـتوون و، خۆیـان دزیوەتـەوە.

٣)- ﴿ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ ﴾، با ئەوانەی سەرپێچیی لە فەرمانی وی پێغەمبەر ﷺ دەکەن، بترسێن و وریا بن.

لە چی بترسێن و وریابن؟.

٤)- ﴿ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ ﴾، کە بەڵایەکیان تووش بێ لە دنیادا، ئاشووب و ئاژاوەیەکیان تووش بێ.

٥)- ﴿ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، یان لە دواڕۆژدا ئازارێکی بە ئێشیان تووش بێ، هەڵبەتە لێرەدا خوا باسی دنیاو دواڕۆژی نەکردوە، بەڵام بە سیاق و سەلیقە دەڵێین، ئەگەرنا دەشکونجێ هەم بەڵایەکە، هەم ئازارە بە ئێشەکە، لە دنیادا دابن، یاخود هەردووکیان لە قیامەتدابن، یان یەکیان لە دنیاو، یەکیان لە قیامەتدا بێ.

وشـەی (مخالفـة)، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ ﴾، (وَالْمُخَالَفَـةُ: الْمُغَايِـرَةُ فِي الطَّرِيـقِ الَّتِـي يَمْـشِي فِيهَـا، ضُمِّـنَ مَعْنَـى الصُّـدُودِ بِمَـا عُـدِّيَ بِـ «عَـنْ»).

(مخالفـة) یـانی: جیاوازیـی لـە ڕێـەك دا کـە پێیـدا دەچـێ، مانـای (لادان) خراوەتـە نێـو بـە هـۆی بـەرکار خواسـتنەوە بـە هـۆی (عـن)ەوە.

﴿ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ ﴾، لـە ئەسـڵ دا: (يُخَالِفُـونَ أَمْـرَهُ)، سـەرپێچیی لـە فەرمـانی دەکـەن، پێویسـتیی بـە پیتـی (عَـنْ) نـاکات، تێپـەڕی پـێ بـکات بـۆ بـەرکار (مفعـول بـە)، بـەڵام بۆچـی بـە پیتـی (عَـنْ)، بـەرکاری (مفعـول بـە)، خواسـتوە؟ چونکـە مانـای لادانـی خراوەتـە نێـو (ضُمِّـنَ مَعْنَى الصُّـدُودِ)، یانی: (يُخَالِفُـونَ أَمْـرَهُ وَيَصُدُّونَ عَـنْ أَمْرِهِ)، سـەرپێچیی لـە فەرمانەکـەی دەکـەن و، لـە فەرمـانی لا دەدەن، خۆیـان یاخـود خەڵـك

لادەدەن، چونکە (صَدَّ)، هەم حاڵەتی (لازم)ی هاتووە، هەم حاڵەتی (متعدّي)، (صَّدَ عَنِ الطَّرِيْقِ)، خۆی لایدا لە ڕێیەکە، (صَّدَ فُلَاناً عَنِ الطَّرِيْقِ)، فڵانکەسی لە ڕێیەکە لادا، لێرەدا هەردووکیان دەگونجێن، واتە: سەرپێچیی لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ دەکەن و، لە ڕێی پێغەمبەر ﷺ لادەدەن، یاخود: سەرپێچیی لێ دەکەن و، خەڵکی لێ لادەدەن، ئنجا ئا ئەوانە با بترسێن کە بەڵایەکیان تووش بێ لە دنیادا، یاخود ئازارێکی بەئێش لە ڕۆژی دواییدا.

## چوار کورتە سەرنج

١- وشەی ( يَتَسَلَّلُونَ )، (تسلّل)، وەك (تدرُّج وتدخُّل)، پلە پلە، کەم کەم، دەستێخستن، ( يَتَسَلَّلُونَ )، واتە: دەکشێنەوە، بەڵام بە ئەسپایی و بە شێنەیی.

٢- وشەی (لِوَاذًا)، (منصوب على الحالية)، چونکە لە ڕووی ئیعرابەوە حاڵە بۆیە مەنصووبە، واتە: خۆتێککرانە، (لِوَاذ)و (مَلَاوَذَه)ش ئەوەیە یەکێك خۆی لەو بگرێ و، ئەوی دیکە خۆی لە تەنیشت ئەو بشارێتەوە، مەبەست ڕۆیشتنیانە بە شێوەیەکی پەنهان و بە دزیی.

٣- (عَنْ أَمْرِهِۦٓ )، وشەی ( أَمْرِهِۦٓ )، وشەیەکی هاوبەشە، دەگونجێ مەبەست پێی فەرمانی پێغەمبەربێ ﷺ کە بە زارەکیی فەرموویەتی، یاخود ( أَمْرِهِۦٓ )، مەبەست پێی حاڵ بێ، کار بێ، کەواتە: (أمره) فەرمانی پێغەمبەر ﷺ: هەم فەرمایشتەکەی، هەم کردەوەکەی، هەم ڕێبازەکەشی، دەگرێتەوە.

٤- وشەی (فِتْنَةٌ ) بە مانای تاقیکردنەوە، دێ، بەڵام لێرەدا بە مانای ئاشووب و ئاژاوەو بەڵا، دێ، ﴿ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، یانی: ئازارێکی بە ئێش، وا پێدەچێ زیاتر مەبەست لە (بەڵا)یەکە لە دنیادا بێ، بەڵام ئازارە بە ئێشەکە لە ڕۆژی دوایی بێ.

**مەسەلەی شەشەم و کۆتایی:**

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە موڵکی ئاسمانەکان و زەوی هی خوایە، خوا ئێستاو واقیعی ئێستای مرۆڤەکان دەزانێ و کاتێك دەگێڕدرێنەوە بۆ لاشی، هەواڵی کۆی کردەوەکانیان پێ دەدات و، خوا ﷻ بە هەموو شتێك زانایەو، پەنهان بینەو هیچ شتێکی لێ ون نابێ:**

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قَدْ يَعْلَمُ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿٦٤﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:**

١)- ﴿ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، ئەها ئاگاداربن! بە دڵنیایی هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە هی خوایە، واتە: هەم ئەو دروستی کردوون، هەم ئەو خاوەنیانە، هەم ئەو سەرپەرشتییان دەکات و، هەم بەڕێوەیانەوە دەبات و مشووریان دەخوات.

٢)- ﴿ قَدْ يَعْلَمُ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ ﴾، ئەو حاڵەش کە ئێوە لەسەرینی چاك دەیزانێ، وشەی (قَدْ)، (حَرفُ تحقيقٍ)، یانی: بە دڵنیایی خوا دەزانێ ئێستا ئێوە لە چ حاڵێکدان، ئەو حاڵەی ئێوە لە چاك و خراپ، تێیدان، خوا باش حاڵەکەتان دەزانێ، چی دەکەن و چۆن دەکەن و، لە چ بارودۆخێك دا ژیانتان دەگوزەرێنن، ئاگاداری وردو درشتتانە.

٣)- ﴿ وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ ﴾، ئەو ڕۆژەش کە دەگێڕدرێنەوە بۆ لای، هەواڵیان پێ دەدا بەوەی دەیانکرد، واتە: پاداشتیان دەداتەوە لەسەر چاکەو، سزایان دەدات لەسەر خراپە.

٤)- ﴿ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌۢ ﴾، خواش بە هەموو شتێك زانایە.

لەو ئایەتە موبارەکەدا، کە ئایەتی کۆتاییە لە سوورەتی (النور)، وام دێتە بەرچاو: خوا ﷻ بیەوێ بە ئێمەی ئیماندارو مسوڵمان بفەرموێ:

خـوا خاوەنـی ئاسـمانەكان و زەوییـە، هەموویـان هـی خۆینـی، خـۆی هێناونیـە دی، خـۆی خاوەنیانـە، خـۆی بەڕێوەیـان دەبـات، كەواتـە: بڕیارێكیـش كـە خـوا ﷻ بـۆ ئێـوەی دەدات، یاسـایەكتان كـە بـۆ دادەنـێ، ئێـوەش بەشـێكن لـە موڵكـی خـوا، ئـەو موڵكـە فراوانـەی خـوا، هیچـی لـە فەرمانـی خـوا دەرناچـێ، ئێـوەش لـە فەرمانـی خـوا دەرمەچـن، خـوا ﷻ مشـووری هەمـوو گەردوونـی خـواردوەو، مشـووری ئێـوەش دەخـوات، ئـەی مرۆڤـەكان! هەروەهـا جنەكانیـش! كـە لەم سـەر زەوییـە دانـاون، بەڵكو خـوا مشـووری تایبەتتـان لـێ دەخـوات، نەوەتـا بـەس بەوەنـدە لـێ نەگـەڕاوە، كـە بـە هـۆی غەریزەكانتـان و، یاسـا گەردوونییـەكان و، بـە هـۆی عەقـڵ و زگماكتانـەوە، بەڕێـوە بچـن، بەڵكـو پەیـام و شـەریعەتیی خۆیشـی بـە پێغەمبەرانـدا (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّلَام)، بـۆ نـاردوون، كەواتـە: ئاگاداربـن! ﴿ قَـدْ يَعْـلَمُ مَآ أَنتُمْ عَلَيْـهِ ﴾، ئێـوە لـە چ حاڵێكـدا بـن ئـەو دەیزانـێ، لـە گوناهــ دابـن، یـان لـە چاكـەدا بـن، لـە مزگـەوت بـن، لـە بـازاڕ بـن، لـە خێـردا بـن، لـە شـەڕدا بـن، لـە هەمـووی ئـاگادارە.

﴿ وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ ﴾، ئـەو ڕۆژەش كـە دەگێڕدرێنـەوە بـۆ لای، هەواڵیـان پـێ دەدا بـەوەی دەیانكـرد.

لێـرەدا پێشـێ بـە شـێوازی دوانـدان (خطـاب)، ئنجـا بـە شـێوازی نادیـار (غائـب) خـوای موتەعـال دەماندوێنـێ، كـە ئەمـە ئاوڕدانـەوە (إلتفـات)ی پـێ دەڵێـن، واتـە: ئێسـتاتان دەزانـێ و، كاتێكیـش دەگەڕێنـەوە بـۆ لای، هەواڵتـان پـێ دەدات بـە هەرچـی كـە دەتانكـرد، خـواش بـە هەمـوو شـتێك زانایـە.

كەواتـە: ئێـوەش وەك مسـوڵمانان وریـا بـن و، بـا موناف‌یـق و دڵنەخۆشـەكانیش، بزانـن كـە خـوا ئێسـتا هەمـوو شـتێكیان دەزانـێ، دەرو دەروونیـان دەزانـێ، چـاك و خـراپ و، خێـرو شـەڕیان دەزانـێ، كاتێكیـش دەگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوا هەواڵیـان پێـدەدات، بـەوەی كـە دەشـیان شـاردەوە لـە مسـوڵمانان و بـە پەنامەكیـی دەیانكـرد، خـوا نەوەشـیان دەخاتـەوە بەرچـاوو، لەسـەر ئـەوەش سـزایان دەدات، هەروەهـا

کەسێکیش بە پەنامەکیی چاکەیەکی کردبێ، خوا پاداشتی دەداتەوە، با خەڵکیش پێی نەزانیبێ، بەڵام خوا پێی دەزانێ.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی، پتر هیدایەتی ئێمە بدات و، زیاتر دڵمان رۆشن بکات و، چاکتر عەقڵمان هۆشیارو دڵمان بێدار بکات و، یارمەتییمان بدات قووڵتر لە قورئان تێبگەین، لە رێبازی پێغەمبەر ﷺ حاڵیی بین و هەرچی دەشیزانین، یارمەتییمان بدات بیتوانین و، لە خۆماندا بیکەینە حاڵ، لەسەر ئاستی تاکیی، خێزانیی، کۆمەڵایەتیی، سیاسیی، بۆ ئەوەی شایستەی ئەوە بین بڵێین: ئێمە بەندەی خواین و، شوێنکەوتووی پێغەمبەری پێشەواین ﷺ.

لێرەشدا دێینە کۆتایی تەفسیر کردنی ئایەتە موبارەکەکانی سوورەتی (النور).

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

بەڕێـــــزان!

خـوا پشـتیوان بـێ ئەمـڕۆ کـە (٢٢)ی مانگـی ڕەمـەزانی سـاڵی (١٤٤٠)ی کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٧)ی مانگـی (٥)ی سـاڵی (٢٠١٩)ی زایینـی، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیر کـردنی سـوورەتی (الفرقـان).

## نێوەڕۆکی سوورەتی (الفرقان) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە تەنیـا یـەك نـاوی هەیـە سـوورەتی (الفرقـان)، چونکـە هەندێـك لـە سـوورەتەکان زیاتـر لـە ناوێکیـان بـۆ بەکارهێـنراوە، بـەڵام ئـەم لـە ڕۆژگاری پێغەمبـەری خواشـدا ﷺ هـەر ئـەو نـاوەی هەبـووە، وەك لـەم دەقـەی سـوننەتەوە دیـارە، کـە دەیهێنیـن، هەرچەنـدە تۆزێـك درێـژە، بـەڵام تیشـکمان بـۆ دەخاتـە سـەر ئـەوە، کـە ئـەم سـوورەتە لـە سـەردەمی پێغەمبـەری خواشـدا ﷺ نـاوی (فوڕقـان)ی بـۆ بەکارهاتـوەو هـەر ئـەو نـاوەشی هەبـووە، هەروەهـا هەنـدێ شـتی دیکەشـمان بـۆ ڕوون دەکاتـەوە:

**{عَـن عُمَـرَ بـنِ الخَطَّـابِ رَضِيَ اللهُ عَنـهُ قَـالَ: سَـمِعتُ هِشَـامَ بـنِ حَكِيـم، يَقـرَأُ سُـورَةَ الفُرقَـانِ فِي حَيَـاةِ رَسُـولِ اللـهِ ﷺ فَاستَمَعتُ لِقِراءَتِـهِ، فَـإِذَا هُـوَ يَقـرَءُ عَـلى حُـرُوفٍ كَثِـيرَةٍ لَـم يُقرِئنِيهَـا رَسُـولُ اللـهِ ﷺ فَكِـدتُ أُسَـاوِرُهُ فِي الصَّـلاةِ، فَتَصَـبَّرتُ حَتَّـى سَـلَّمَ، فَلَبَّبْتُـهُ بِرِدَائِـهِ، فَقُلـتُ: مَـن: أَقْـرَأَكَ هَـذِهِ السُّـورَةَ الَّتِـي سَـمِعتُكَ تَقـرَأُه؟ قَـالَ: أَقرَأَنِيهَـا رَسُـولُ اللـهِ ﷺ فَقُلْـتُ: كَذَبـتَ، فَـإِنَّ رَسُـولُ اللـهِ ﷺ قَـد أَقرَءَنِيهَـا عَـلَى غَـيرِ مَـا قَرَءتَـه، فَانطَلَقـتُ بِـهِ أَقُـودُهُ إِلى رَسُـولُ اللـهِ ﷺ فَقُلـتُ: إِني سَـمِعتُ هَـذَا يَقـرَأُ سُـورَةَ الفُرقَـانِ عـلَى حُـرُوفٍ لَـم تُقرِءنِيهَـا، فَقَـالَ: رَسُـولُ اللـهِ ﷺ أَرسِـلْهُ، أَقـرأْنِي يـا هِشَـام، فَقَـرَأَ عَلَيْـهِ القِـرَاءَةَ الَّتِـي**

سَمِعتُهُ يَقرَأ، فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ ﷺ كَذَلِكَ أُنزِلَت، ثُمَّ قَالَ: أَقرِءنِي يا عُمَر، فَقَرءتُ القِراءَةَ الَّتِي أَقرَءَنِي، فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ ﷺ كَذَلِكَ أُنزِلَت، إِنَّ هَذَا الْقُرآنَ أُنزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ، فَاقْرَءُوا مِنْهُ مَا تَيَسَّرَ ]، (أخرجه البُخَارِي برقم: ٢٤١٩، ومسلِم برقم: ١١٨، وأَبُو دَاوُد برقم: ١٤٧٥، والترمذي برقم: ٢٩٤٣، وَالنسائي برقم: ٣٨٣).

واتە: لە عومەری کوڕی خەتتابەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: گوێم لە هیشامی کوڕی حەکیم بوو، سوورەتی (الفرقان)ی دەخوێند، لە ڕۆژگار و ژیانی پێغەمبەری خوادا ﷺ، گوێم لە خوێندنەکەی بوو، تەماشام کرد چەند وشەیەك بە شێوەیەك دەخوێنێ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیە بۆ منی نەخوێند بوو (فێری منی نەکرد بوو) منیش خەریك بوو هەر لە نوێژەکەدا بەگژیدا بچم (واتە: یەخەی بگرم) بەڵام خۆم ڕاگرت، تاکو سڵاوی دایەوە، کە سڵاوی دایەوە، عەبایەکەم تێوەرپێچا، (عەبایەکەی خۆی، یەخەم گرت و)، گوتم: کێ ئەم سوورەتەی کە بیستم خوێندت، فێری کردووی و بۆی خوێندوویەوە؟ ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا پێی خوێندووم و فێری کردووم، گوتم: بە هەڵەدا چووی، {وشەی (كَذَبتَ)، یانی: درۆت کرد، بەڵام ئەوان مەبەستیان ئەوە بووە: هەڵەت کرد}، چونکە پێغەمبەری خوا بە شێوەیەکی دیکەی جیا لەوەی تۆ خوێندت، فێری منی کردوە، ئیدی بردم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتم: گوێم لەم پیاوە بووە، سوورەتی فورقانی دەخوێند، چەند وشەیەکی بە جۆرێك دەخوێندن، کە تۆ ئاوات فێری من نەکردوە، پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: بەریدە (لێیگەڕێ) هیشام! بخوێنە، هیشام بەو شێوەیە کە لێم بیستبوو، ئاوا خوێندی بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خوا فەرمووی: بەو شێوەیە دابەزیوە، دوایی گوتی: عومەر تۆش بخوێنە، منیش بەو شێوەیە کە پێشتر فێری کردبووم و بۆی خوێندبووم، خوێندم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئاواش دابەزیوە، دوایی فەرمووی: ئەم قورئانە لە سەر حەوت پیتان دابەزیوە (بە حەوت شێوان دابەزیوە) ئنجا ئەوەندەی لە تواناتاندا هەیەو، بۆتان ئاسانە، بیخوێنن.

واتە: هەندێك وشەی دەگونجێ بە حەوت جۆر بخوێنرێن، یان كۆی جۆرە خوێندنەكانی هەموو وشەكان حەوتن، یاخود زیاتریشن، هەندێك لە زانایان دەڵێن: مەبەستی لە (سَبعَة) تەنیا ژمارەیەكی دیاریكراو نەبووە، بە كورتیی: دەگونجێ هەندێك لە وشەكانی قورئان بە زیاتر لە جۆرێك بخوێنرێن، گرنگ ئەوەیە هەمووی لەگەڵ ڕێنووسی موصحەفدا بگونجێ و، لەگەڵ ئەو بەسەردا خوێنرانەوە موتەواتیرەدا كە بە ئێمە گەیشتوە، ڕێك بێ.

لە بابەتی فراوانی: (قورئانی مەزن لە نۆزدە تەوەر)دا، بە درێژیی لەوبارەوە دواوین.

## دووەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و هاتنەخواردا:

ئەم سوورەتە لە ڕیزبەندیی موصحەفدا، ژمارە (٢٥)ی بۆ دانراوە، واتە: لە سوورەتی (**الفاتحة**)وە، كە دێی لە لای ڕاستەوە، ژمارە (٢٥)ە و، لە ڕیزبەندیی هاتنە خوار (**ترتیب النزول**)یش دا، لە لای زۆرێك لە زانایان - چونكە لەو بارەوە ڕاجیایی هەیە - ژمارە (٤٢)ی هەیە، واتە: (٤٢)ەمین سوورەتە كە دابەزیوە، پێش سوورەتی (**فاطر**) و دوای (**یس**).

## سێیەم: شوێنی دابەزینی:

ئەم سوورەتە مەككەییەو، لەوبارەوە ئەم دوو دەقە دێنین:

١)- {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَزَلَتْ سُورَةُ الفُرْقَانِ بِمَكَّةَ}[1].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتوویەتی: سوورەتی فورقان لە مەككە هاتە خوار.

---

(١) ذَكَرهُ السّيوطي في (الدر المنثور) (٢٣٤/٦)، ونسبه لابن الضريس والنحاس وابن مردويه والبيهقي في (دلائل النبوة).

٢)- {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَزَلَتْ بِمَكَّة سُورَة الفُرْقَانِ}[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتوویەتی: لە مەککەدا سوورەتی فورقان هاتە خوار.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمارەی ئایەتەکانی حەفتا و حەوت (٧٧)ە، لە سەرجەم ژماردنەکاندا، چونکە جاری وا هەیە کە سەرژمێرکردنی خەڵکی مەککە، لەگەڵ هی خەڵکی مەدینە، هی مەککەو مەدینە، لەگەڵ هی خەڵکی کووفەدا، جیایە، واتە: زانایان لە شارە گەورەکانی ئەو کاتەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا، هەندێك جار ڕاجیاییان هەبووە، پێشتریش باسمان کردوە، کە کەمیی و زۆریی ژمارەی ئایەتەکان، نەگەڕاوەتەوە بۆ ئەوەی کە یەکێکیان بڵێ: ئەم ئایەتە نیە، یان ئەم ڕستەیە لە قورئاندا نیەو، یەکێکی دیکەیان بڵێ: هەیە، بەڵکو مەسەلەکە ئەوە بووە، لە کوێ دەوەستی؟ بۆ وێنە: ڕستەیەك لە قورئان کە دێ، زانایەك گوتوویەتی: دەبێ لێرە بوەستی، یەکێکی دیکەیان گوتوویەتی: نەخێر، دەبێ ئەو تەواوکەرەشی بێتە گەڵ، ئنجا بوەستی، بۆ وێنە:

لە سوورەتی: (المؤمنون)دا، کە خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ أُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ١٠ ﴾المؤمنون، هەندێکیان لەوێ وەستاون، هەندێکیشیان گوتوویانە: ﴿ أُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ١٠ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ١١ ﴾المؤمنون، کە ئەگەر لەسەر ﴿ ٱلۡوَٰرِثُونَ ﴾، بوەستی، تاکو ئێرە، دەبێتە دە (١٠) ئایەت، ئنجا ڕستەی: ﴿ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ١١ ﴾المؤمنون، دەبێتە ئایەتی یازدەیەم، بەڵام ئەگەر هەمووی بەیەکەوە بڵێی: دەبێتە دە (١٠) ئایەت، واتە: ئایەتێك فەرق دەکات.

---

(١) ذكره السيوطي في (الدر المنثور) (٢٣٤/٦) ونسبه لابن مردويه.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

نێـوەڕۆکی ئـەم سـوورەتەش، وەك هـی سـەرجەم سـوورەتە مەککەییەکانـەو بابەتـەکانی: خـوا بەیەکگرتـن و، پێغەمبەرایەتیـی و، وەحیـی، پاشـان ڕۆژی دوایـی و، سـزاو پاداشـتی خـوا و، بەسـەرهاتی پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)و، خسـتنە ڕووی ژمارەیـەك لـە دیـاردە سروشـتییەکان، وەك نیشـانەکانی ناسـینی خـوا و، تێیـان دا درەوشـانەوەی نـاوە هـەرە پەسـندەکانی خـوا و، سـیفەتە هـەرە بـەرزەکانی خـوا ﷻ، لـەم سـوورەتەدا هاتـوون.

بـەڵام تـەوەری سـەرەکیی کـە لـەم سـوورەتەدا جەختـی لەسـەر کراوەتـەوە، بـاسی: پێغەمبەرایەتیـی و، وەحیـی و قورئانـە، چونکـە جگـە لـە باسـکردنی بەبـێ ناوهێنـان (بـە ئامـاژەو ڕانـاو) چەنـد جارێـك بـاسی قورئـان کـراوە، بـۆ وێنـە:

أ- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ ٱفْتَرَىٰهُ ﴿٤﴾ ﴾، کە ناوی ئاماژە (هذا) بۆ قورئان دەچێتەوە،

ب- خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجَٰهِدْهُم بِهِۦ ﴿٥٢﴾ ﴾، واتە: بە قورئان، لە دژیان تێکۆشە، هەروەها بێجگە لە باسکردنی قورئان بە ڕاناو، یان بە ئاماژە (بەبێ ناوهێنان) شەش جاریش ناوی قورئان هێنراوە، لەم سوورەتەدا، کە قەبارەکەشی هێندە گەورە نیەو (٧٧) ئایەتە:

١- شوێنی یەکەم بە (الفرقان): ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ ﴿١﴾ ﴾الفرقان.

٢- شوێنی دووەم بە (القرآن): ﴿ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوْمِى ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ مَهْجُورًا ﴿٣٠﴾ ﴾ الفرقان.

٣- شوێنی سێیەم بە (القرآن): ﴿ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ﴿٣٢﴾ ﴾الفرقان.

٤- شوێنی چوارەم بە (ذِكر): ﴿ نَسُواْ ٱلذِّكْرَ ﴿١٨﴾ ﴾الفرقان.

٥- شوێنی پێنجەم بە (ذِكر): ﴿ أَضَلَّنِى عَنِ ٱلذِّكْرِ ﴿٢٩﴾ ﴾الفرقان.

٦- شوێنی شەشەم بە (آیات): ﴿ ذُكِّرُوا۟ بِـَٔایَـٰتِ رَبِّهِمۡ ﴿٧٣﴾ ﴾الفرقان، (ئایات)یش کە لەم سیاقەدا هاتوە، ڕستەکانی قورئان دەگرێتەوە و، نیشانە بەرهەستەکانیش دەگرێتەوە، وەك دوایی باسی دەکەین.

## شەشەم: تایبەتمەندییەكانی:

ئــەم ســوورەتە حــەوت تایبەتمەندیــی هــەن، کــە تەنیــا ئــەم ســوورەتە بــەم شــێوەیەو، ئــەو حــەوت جــۆرە تایبەتمەندییــەی هــەن:

١- تایبەتمەندیی یەکەم: لەم سوورەتەدا سێ جاران وشەی: ﴿ تَبَارَكَ ﴾، دووبارە بۆتەوە:

أ: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِی نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ لِیَكُونَ لِلۡعَـٰلَمِینَ نَذِیرًا ﴿١﴾ ﴾.

ب: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِیۤ إِن شَاۤءَ جَعَلَ لَكَ خَیۡرࣰا مِّن ذَ ٰلِكَ جَنَّـٰتࣲ تَجۡرِی مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَـٰرُ وَیَجۡعَل لَّكَ قُصُورَۢا ﴿١٠﴾ ﴾.

ج: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِی جَعَلَ فِی ٱلسَّمَاۤءِ بُرُوجࣰا وَجَعَلَ فِیهَا سِرَ ٰجࣰا وَقَمَرࣰا مُّنِیرࣰا ﴿٦١﴾ ﴾.

وشــەی: ﴿ تَبَارَكَ ﴾، واتــە: بــەردەوام بــەرزو بــە پیــت و پێــزە، خــاوەن خێــر و چاكەیــە.

٢- تایبەتمەندیی دووەم: وشەی ﴿ حِجۡرࣰا مَّحۡجُورࣰا ﴾، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە و، لە دوو شوێناندا:

أ/ ﴿ یَوۡمَ یَرَوۡنَ ٱلۡمَلَـٰۤىِٕكَةَ لَا بُشۡرَىٰ یَوۡمَىِٕذࣲ لِّلۡمُجۡرِمِینَ وَیَقُولُونَ حِجۡرࣰا مَّحۡجُورࣰا ﴿٢٢﴾ ﴾.

ب/ ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِی مَرَجَ ٱلۡبَحۡرَیۡنِ هَـٰذَا عَذۡبࣱ فُرَاتࣱ وَهَـٰذَا مِلۡحٌ أُجَاجࣱ وَجَعَلَ بَیۡنَهُمَا بَرۡزَخࣰا وَحِجۡرࣰا مَّحۡجُورࣰا ﴿٥٣﴾ ﴾.

﴿ حِجۡرࣰا مَّحۡجُورࣰا ﴾: (مَمنُوعٌ مَنْعاً)، بــە تۆخیــی قەدەغەیــە، یــان: ڕێ لێگیــراوە زۆر بــە ســەختیی.

٣- تایبەتمەندیی سێیەم: تەنیا لەم سوورەتەدا فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ کراوە، کە بە هۆی قورئانەوە جیهادێکی گەورە لەگەڵ کافرەکاندا بکات: ﴿ فَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَجَٰهِدْهُم بِهِۦ جِهَادًا كَبِيرًا ﴿٥٢﴾ ﴾، واتە: فەرمانبەریی کافرەکان مەکەو، جیهادێکی گەورەیان بە هۆی قورئانەوە لەگەڵدا بکە، واتە: بە شێوەیەکی گەورە لەگەڵیاندا تێ بکۆشە.

٤- تایبەتمەندیی چوارەم: تەنیا لەم سوورەتەدا ئاوی ئاسمان بە ﴿ مَآءً طَهُورًا ﴾، وەسف کراوە، وەك لە ئایەتی (٤٨)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا ﴾، واتە: لە ئاسمانەوە ئاوێکی پاك و پاککەرەوەمان دابەزاندوە.

٥- تایبەتمەندیی پێنجەم: تەنیا لەم سوورەتەدا، پازدە خەسڵەتی سەرەکیی مسوڵمانان (مسوڵمانانی بەندەی خوای بە بەزەیی)، خراونە ڕوو، پێم شك نایەت لە هیچ سوورەتێکی دیکەدا، ئەوەندە سیفەتە بەدوای یەکدا خرابنە ڕوو، هەڵبەتە لە سوورەتی (الإسراء) دا، (٢٤) سیفەت باس کراون، بەڵام دوازدەیان گوناهو تاوان و هەڵەن و، دوازدەشیان سیفەتی باشن.

هەڵبەتە لێرەشدا خوا ﷻ هەندێك لە سیفەتەکانی بە باری نەرێنیی دا هێناون، بەڵام بەو واتایە کە بەندەکانی خوا، خۆیان لەو سیفەتە خراپانە دەپارێزن، کە ئەگەر وەك کۆی سیفەتەکان باس بکەین، دیارە ئەوانەی لە سوورەتی (الإسراء)دا، هاتوون زیاترن، کە (٢٤)ن، بەڵام ئەگەر وەك خەسڵەتە تایبەتییەکانی بەندەکانی خوای خاوەن بەزەیی باس بکەین، لێرەدا پازدە (١٥)ن و، لەو ڕووەوە هی ئێرە زیاترن، کە لە ئایەتەکانی: (٦٣ - ٧٦)، واتە: (١٤) ئایەت دا، ئەو سیفەتانە باس دەکەن.

٦- تایبەتمەندیی شەشەم: تەنیا لەم سوورەتەدا، باسی سکاڵای پێغەمبەر ﷺ کراوە لە چەنگ خەڵکەکەی، کە پشتیان لە قورئان کردوە، یاخود قورئانیان بە قسەی ناشایستە پێکوتراو، گرتوە: ﴿ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوْمِى ٱتَّخَذُوا۟ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ مَهْجُورًا ﴿٣٠﴾ ﴾،

واتە: پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پەروەردگارم! خەڵکەکەم ئەم قورئانەیان پشتگوێ خستوە، یاخود: ﴿ مَهۡجُورٗا ﴾، یانی (هُجْر)ی لە بەرانبەردا دەڵێن، واتە: قسەی ناشایستی پێ دەڵێن.

٧- تایبەتمەندیی حەوتەم و کۆتایی: کە تێمە لێرەدا باسمان کردەوەو بەدیمان کردوە، تەنیا لەم سووڕەتەدا، باسی ئەوە کراوە کە ئەگەر لەبەر خواپەرستیی و پاڕانەوەی بەندەکان نەبێ، خوا بایەخیان پێ نادات: ﴿ قُلۡ مَا يَعۡبَؤُاْ بِكُمۡ رَبِّي لَوۡلَا دُعَآؤُكُمۡ ﴿٧٧﴾ ﴾، واتە: بڵێ: پەروەردگارم گرنگیی و بایەختان پێ نادات، ئەگەر پاڕانەوەتان لە خوا نەبێ و، بەندایەتییتان بۆ خوا نەبێ، واتای دیکەشی هەن، دوایی باسیان دەکەین.

ئەوانە حەوت تایبەتمەندیی سەرەکیین و، دەتوانین هی دیکەش هەڵبهێنجین، بەڵام من ئەو حەوتەم کەوتوونە بەر چاو، ئەمە وەك پێناسەو نێوەڕۆکی سووڕەتی (الفرقان).

## حەوتەم: دابەشکردنی ئەم سوووڕەتە بۆ چەند دەرسێك:

دەرسی یەکەم: ئایەتەکانی: (١ - ٢٠)، چوار بابەتی سەرەکییان گرتوونە خۆیان: باسی خوا بە یەکگرتن، باسی قورئان، باسی پێغەمبەر ﷺ باسی ڕۆژی دوایی.

دەرسی دووەم: ئایەتەکانی: (٢١ - ٣٤)، واتە: چواردە (١٤) ئایەت، کە تێیان دا باسی داواکاریی بێ جێی کافرەکان، کراوە، کە خوا ببینن و، فریشتەیان بۆلا دابەزن، هەروەها باسی قیامەت و، باسی پەشێمانیی کافران و، باسی سکاڵای پێغەمبەر ﷺ لە دەست خەڵکەکەی، کە قورئانیان پشتگوێ خستوە، یاخود: قسە بە قورئان دەڵێن، قسەی ناشایست و، بیانوو هێنانەوەی کافرەکان لە بارەی قورئانەوە، کە بۆچی بە یەك جار دانەبەزیوە، وەڵامدانەوەی خوای پەروەردگار بۆ ئەو بیانووە.

دەرسی سێیەم: ئایەتەکانی: (٣٥ - ٤٤)، واتە: دە (١٠) ئایەت، کە تێیان دا ئاماژەیەکی کورت کراوە بە ژمارەیەك لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) و

گەلەکانیان، مووساو هارِوون، نووح صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، پاشان گەلەکانی عاد و ثەموود و (أَصحَابُ الرَّسِ) - (رَسّ) بە مانای بیرە - هەروەها گەلی (لوط) و، باسی ئارەزوو پەرستیی کافرانیش کراوە.

دەرسی چوارەم: ئایەتەکانی: (٤٥ - ٦٢)، کە هەژدە (١٨) ئایەتن، باسی ژمارەیەك لە دیاردە سروشتییەکان، وەك چاکەو نیعمەتی خواو، باسی هەڵوێستی نەرێنیی و سپڵەییانەی کافرەکان لە بەرانبەر خاوەنەکەیاندا، کراوە.

دەرسی پێنجەم و کۆتایی: ئایەتەکانی: (٦٣ - ٧٧)، کە پازدە (١٥) ئایەتن، باسی پازدە (١٥) سیفەتی گەورەو گرنگی بەندە پەسندو هەڵبژاردەکانی خوای بە بەزەیی کە شایستەی پێشەوایەتیین، کراوە و، باسی ئەوەش کراوە کە خوا ﷻ بەبێ خواپەرستیی، گرنگیی و، بایەخ، بە مرۆڤەکان نادات.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە بیست (٢٠) ئایەتی سەرەتای سوورەتی (الفرقان) پێك دێ: (١ - ٢٠)، لەو بیست (٢٠) ئایەتەدا، سەرەتا خوا ﷻ باسی دابەزاندنی فورقان دەكات، بۆ سەر بەندەی خۆی موحەممەد ﷺ كە بە تەئكید مەبەست لە (الفرقان) قورئانە، چونكە وەك لە شوێنی دیكەدا باسمان كردوە، خوا پێنج ناوی سەرەكیی بۆ قورئان بەكارهێناون: (القُرآن، الفُرْقَان، الكِتَاب، الذِّكْر، كلام الله)، بەڵام وەك سیفەت و وەسف، خوا بە وەسفی زۆر پێناسەی قورئانی كردوە.

ئنجا خوا ﷻ دوایی باسی چەند بابەتێكی پێكەوە پەیوەست دەكات، لەم (٢٠) بیست ئایەتەدا، كە دەتوانین بڵێین: شەش بابەتی سەرەكیین:

١- یەكتایی خوا لە بەدیهێنەرایەتیی و، پەروەردگارێتیی و، پەرستراوێتیی دا.

٢- بەرپەرچدانەوەی قسەی كافرەكان لە بارەی هەڵبەسترانی قورئانەوە، لەلایەنی موحەممەدەوە ﷺ كە گوایە خەڵكی دیكە هاوكاریی كردوە، كە ئەوە لە چەند شوێنێكی دیكەی قورئانیشدا باسكراوە بۆ وێنە: لە سوورەتی (النحل)دا و لە سوورەتی (الأنعام)دا.

٣- قسەی كافرەكان لە بارەی پێغەمبەرەوە ﷺ، كە بۆچی خواردن دەخوات و، بە بازاڕدا دەڕوات و، كار و كاسبیی دەكات؟ ئنجا بەرپەرچدانەوەی ئەو قسەیان.

٤- باسی ئاخیر زەمان و پاشان قیامەت و، باسی دۆزەخ و بەهەشت و، ئەوەی كە خوا بۆ بڕواداڕانی داناوەو، ئەو سزایەی چاوەڕێی بێبڕوایان و ستەمكاران دەكات.

٥- سەرزەنشتكردنی خوا بۆ بێبڕوایەكان، ڕەخنە لێگرتنی و سەركۆنەكردنی بۆیان، لە ڕۆژی دوایی دا.

٦- باسی عادەتی خوا لە بواری ناردنی پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) کە بەس مرۆڤی ناردوون و، مرۆڤیش پێویستیی بە خواردن و خواردنەوە دەکات و، پێویستیی بە گەڕان و سووڕان و چوونە بازاڕ و چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە، دەکات.

﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا (١) الَّذِي لَهُ مُلْكُ
السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ
تَقْدِيرًا (٢) وَاتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً لَّا يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ وَلَا يَمْلِكُونَ
لِأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَلَا يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلَا حَيَاةً وَلَا نُشُورًا (٣) وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ
هَٰذَا إِلَّا إِفْكٌ افْتَرَاهُ وَأَعَانَهُ عَلَيْهِ قَوْمٌ آخَرُونَ فَقَدْ جَاءُوا ظُلْمًا وَزُورًا (٤) وَقَالُوا
أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا (٥) قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي
يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا (٦) وَقَالُوا مَالِ هَٰذَا الرَّسُولِ
يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ لَوْلَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُ نَذِيرًا
(٧) أَوْ يُلْقَىٰ إِلَيْهِ كَنزٌ أَوْ تَكُونُ لَهُ جَنَّةٌ يَأْكُلُ مِنْهَا وَقَالَ الظَّالِمُونَ
إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا (٨) انظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا لَكَ الْأَمْثَالَ فَضَلُّوا فَلَا
يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا (٩) تَبَارَكَ الَّذِي إِن شَاءَ جَعَلَ لَكَ خَيْرًا مِّن ذَٰلِكَ جَنَّاتٍ تَجْرِي
مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَيَجْعَل لَّكَ قُصُورًا (١٠) بَلْ كَذَّبُوا بِالسَّاعَةِ وَأَعْتَدْنَا لِمَن كَذَّبَ
بِالسَّاعَةِ سَعِيرًا (١١) إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا (١٢) وَإِذَا أُلْقُوا مِنْهَا
مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْا هُنَالِكَ ثُبُورًا (١٣) لَّا تَدْعُوا الْيَوْمَ ثُبُورًا وَاحِدًا وَادْعُوا ثُبُورًا
كَثِيرًا (١٤) قُلْ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ الْخُلْدِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ كَانَتْ لَهُمْ جَزَاءً
وَمَصِيرًا (١٥) لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَاءُونَ خَالِدِينَ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْئُولًا (١٦) وَيَوْمَ
يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ فَيَقُولُ أَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِي هَٰؤُلَاءِ أَمْ هُمْ

ضَلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿١٧﴾ قَالُوا۟ سُبْحَـٰنَكَ مَا كَانَ يَنۢبَغِى لَنَآ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَآءَ
وَلَـٰكِن مَّتَّعْتَهُمْ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ نَسُوا۟ ٱلذِّكْرَ وَكَانُوا۟ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٨﴾ فَقَدْ كَذَّبُوكُم
بِمَا تَقُولُونَ فَمَا تَسْتَطِيعُونَ صَرْفًا وَلَا نَصْرًا ۚ وَمَن يَظْلِم مِّنكُمْ نُذِقْهُ عَذَابًا
كَبِيرًا ﴿١٩﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ
وَيَمْشُونَ فِى ٱلْأَسْوَاقِ ۗ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ۗ وَكَانَ
رَبُّكَ بَصِيرًا ﴿٢٠﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، بەردەوام بەرزو بەپێزە ئەو کەسەی فورقانی دابەزاندۆتە سەر بەندەکەی، تاکو ببێتە ترسێنەر و ورياکەرەوەی جیهانییان ﴿١﴾ ئەو کەسەی حوکمڕانیی ئاسمانەکان و زەوی هی ویەو، هیچ رۆڵەیەکی نیە (و هەڵنەبژاردوە) و، هیچ هاوبەشێکی نیە، لە حوکمڕانیی داو، هەموو شتێکی دروستکردوە، بە ئەندازەگیرییەکی تەواو ئەندازەی گرتوە ﴿٢﴾ (کافرەکان) جگە لەوی (جگە لە خوا)، پەرستراوانێکیان گرتوون، هیچ دروست ناکەن و خۆشیان دروست دەکرێن، زیان و سوودی خۆیشیانیان بە دەست نیەو، مردن و ژیان و زیندوو کردنەوەشیان بە دەست نیە ﴿٣﴾ هەروەها ئەوانەی بێبڕوان گوتیان: ئەم قورئانە بەس درۆیە (درۆیەکە موحەممەد هەڵیبەستوەو)، کۆمەڵێکی دیکەش هاوکارییان کردوە، لە سەری! بە دڵنیایی بە (کردنی) ئەو قسەیان ستەم و درۆیان کردوە ﴿٤﴾ هەروەها گوتیان: قورئان ئەفسانەکانی پێشینانە، کە بەیانیان و ئێواران بەسەریدا خوێنراونەوەو، ئەویش داوای کردوە بۆی بنووسرێنەوە ﴿٥﴾ بڵێ: قورئان ئەو کەسە دایبەزاندوە، کە

نهێنیی نێو ئاسمانەکان و زەوی دەزانێ، بە دڵنیایی ئەو (خوا) لێبوردەی بە بەزەییە ﴿٦﴾ هەروەها گوتیان: بۆچی ئەو پێغەمبەرە خۆراك دەخوات و، بە بازاڕاندا دەڕوات، (بۆ کار و کاسبیی)؟ دەبووایە فریشتەیەکی بۆ لا دەبەزێ و وریا کەرەوە (ترسێنەر) بێ لەگەڵیدا ﴿٧﴾ یان دەبووایە خەزنەیەکی بۆ فڕێ بدرێ لە ئاسمانەوە، یان باغێکی هەبێ لێیبخوات [تاکو حەوجێی کار و کاسبیی نەبێ] هەروەها ستەمکاران گوتیان: ئێوە بەس شوێن پیاوێکی جادوو لێکراو دەکەون ﴿٨﴾ سەرنج بدە! چۆن وێنانت بۆ دەهێننەوە! سەرەنجام گومڕا بوون و، توانای ڕێی دیتنەوەیان نیە ﴿٩﴾ بەردەوام بەرزو بەپێزە ئەو کەسەی ئەگەر بیەوێ لەوە (کە دەیڵێن) چاکترت بۆ دەڕەخسێنێ، باغگەلێك کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن و، کۆشکانیشت بۆ دەڕەخسێنێ ﴿١٠﴾ بەڵکو (هۆی بەهانە گرتنیان ئەوەیە کە) بڕوایان بە ئاخیر زەمان نیەو، ئاگرێکی بڵێسەداریشمان بۆ هەر کەسێك ئامادە کردوە، کە بڕوای بە ئاخیر زەمان نیە ﴿١١﴾ هەر کات (دۆزەخ) لە شوێنێکی دوورەوە بەدیی کردن، دەنگ و گرمەی خەشم و تووڕەیی و هەناسە هەڵکێشانی دەبیستن ﴿١٢﴾ کاتێکیش بە دەست و پێ پێکەوە بەستراویی، فڕێ دەدرێنە شوێنێکی تەنگەبەری دۆزەخەوە، لەو حاڵەدا هاوار و ڕۆ ڕۆ دەکەن ﴿١٣﴾ ئەمڕۆ بەس هاوار و ڕۆیەك مەکەن و، داد و فیغانی زۆر بکەن (شایستەتانە) ﴿١٤﴾ بڵێ: ئایا ئەوە باشترە، یان بەهەشتی نەبڕاوە؟ کە بەڵێن بە پارێزکاران دراوە، دەبێتە پاداشت و سەرەنجامیان! ﴿١٥﴾ تێیدا هەمیشەیین و، لەوێدا هەرچی دەیانەوێ هەیانە، ئەوە گفتێکی لێپرسراوانەی پەروەردگارتانە ﴿١٦﴾ ئەو ڕۆژەش کە خوا (کافرەکان) خۆیان و ئەوانەی لە جیاتی خواش دەیانپەرستن، کۆیان دەکاتەوە، پێیان دەفەرموێ: ئایا ئێوە ئەو بەندانەی منتان گومڕا کردن، یاخود خۆیان ڕێیان (ون) بزر کرد؟ ﴿١٧﴾ (پەرستراوەکان) گوتیان: تۆ بە پاك دەگرین، ئێمە بۆمان نەبوو، جگە لە تۆ سەرپەرشتیار و دۆستان بگرین. بەڵام تۆ خۆیان و باب و باپیرانیانت بەهرەمەند کرد و ژیاند، هەتا قورئانی بیرخەرەوەیان لە یاد

کرد و، بوونە کۆمەڵێکی فەوتاو ﴿١٨﴾ (ئەی پەرەستەرەکان!) بێگومان پەرستراوەکانتان لەوەدا کە گوتتان، بە درۆیان خستنەوە، ئێستاش نە توانای لادانی سزای خواتان هەیە لە خۆتان و، نە توانای سەرکەوتنیشتان هەیە، هەر کەسێکیشتان ستەم بکات، سزایەکی گەورەی پێ دەچێژین ﴿١٩﴾ ئەی موحەممەد! لە پێش تۆشدا هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە، مەگەر خۆراکیان خواردووەو، بە بازاڕانیشدا ڕۆیون (بۆ کار و کاسبیی) هەندێکشتانمان بۆ هەندێکتان کردۆتە مایەی تاقیکردنەوە، ئایا لەسەر (ڕاستە ڕێ) خۆتان ڕادەگرن! پەروەردگاریش بینەر (ی هەموو شتێک)ە ﴿٢٠﴾}

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(تَبَارَكَ ): واتە: بەردەوام بەرزو بەپێزە، چونکە لە (مُفْرَدات ألفاظُ القُرآن) و، لە تەفسیرەکاندا بە چەند شێوەیەك مانای (تَبَارَكَ )یان کردوە، هەندێکیان گوتوویانە: (تَكَاثَرَ خَيْرُهُ، وَتَعَاظَمَ بَرَكَتُهُ) و، هەروەها هەندێکیان گوتوویانە: (تَعَالَى وَتَعَاظَمَ)، هەندێکیش گوتوویانە: (تَبَارَكَ: إِخْبَارٌ عَنْ عُلُوِّ اللهِ وَعَظَمَتِهِ وَكَمَالاَتِهِ)، (تَبَارَكَ) هەواڵ دانە لە بەرزیی و مەزنیی و تێر و تەواوییەکانی خوا.

یاخود: (تَبَارَكَ: تَنْبِيهٌ عَلَى اخْتِصَاصِهِ بِالخَيْرَاتِ)، واتە: (تَبَارَكَ) ئاگادار کردنەوەیە کە خوا هەرچی خێر و چاکەیە تایبەتە بەوەوە.

(اَلْفُرْقَانَ): (إِسْمٌ لاَ مَصدَرٌ)، ناوە، نەك چاوگ بێ، (يَوْمُ الفُرقَان: اليَوْمُ الَّذِي يُفْرَقُ فِيهِ بَيْنَ الحَقِّ وَالبَاطِلِ، وَالحُجَّةِ وَالشُّبْهَةِ، وَالفُرْقَان: كَلاَمُ اللهِ، لِفَرْقِهِ بَيْنَ الحَقِّ وَالبَاطِلِ، وَالصِّدْقِ وَالكَذِبِ وَالصَّالِحِ وَالطَّالِحِ، وَالحَلاَلِ وَالحَرَامِ).

(يَومُ الفُرقَان)، واتە: ئەو ڕۆژەی کە هەق و ناهەقی تێدا لێك جیا دەبنەوە، کە مەبەست پێی جەنگی بەدرە و، بەڵگەو گومانی پێ لێك جیا دەبنەوە و،

(فُرقَان) نـاوە بـۆ فەرمایشـتی خـوا، چونکـە هـەق و باطیـڵ، ڕاسـت و درۆ، چـاك و خـراپ، حـەڵاڵ و حـەرام، ... هتـد، لـە یـەك جیـا دەكاتـەوە، ئـەو شـتە پێچەوانـەو دژانـە، لـە یـەك جیـا دەكاتـەوە.

(نَذِيرًا): واتـە: ترسـێنەر، وریـا کـەرەوە، (الإنـذَارُ: إخبَـارٌ فِيـهِ تَخوِيـفٌ)، (إنـذَار) بریتیـە لـە هەواڵدانێـك كـە ترسـاندن و، ڕاچڵەكانـدنی تێـدا بـێ.

(نُشُورًا): واتـە: زینـدوو كرانـەوەو بڵاوكردنـەوە، (نَـشَرَ اللهُ المَيِّـتَ وَ أنـشَرَهُ)، واتـە: خـوا مردووەكـەی بـڵاو كـردەوەو زینـدووی كـردەوە، هێنایـەوە دەر، (نَـشَرَ وَأنـشَرَ)، واتـە: هـەم بـە سـیانیی (ثُلاثِي)ی هـەم بـە چواریـی (رُبَاعِـي)، یـەك واتایـان هەیـە، (وَ نَـشرُ اللـهِ المَيِّـت، مُسـتَعَارٌ مِـنْ نَـشر الثَّـوبِ)، بـڵاو كردنـەوەی خـوا بـۆ مـردوو، خوازراوەتـەوە لـە بڵاوكردنـەوەی پۆشـاك، كەسـێك پۆشـاكێك پێشـانی كەسـێك بـدات، بـڵاوی دەكاتـەوەو لێكیدەكاتـەوە.

(وَزُورًا): (زور) بـە مانـای درۆ دێ، (زُوراً: كَذِبَـاً لِكَـونِ الكَـذِبِ مَائِـلاً عَـن جِهَتِـهِ)، (زۆر) لـە ئەسـڵدا بـە مانـای لادان دێ، لەبـەر ئـەوەی درۆ بریتیـە لـە لادان لـە ڕاسـتیی بـەرەو ناڕاسـتیی، بۆیـە ئـەو وشـەیەی بـۆ بەكارهاتـوە.

(اكْتَتَبَهَا): واتـە: داوای كـردوە بـۆی بنووسرێتـەوە، ئەمەیـان بـە دوو شـێوە واتـا كـردوە:

أ- (الإكتِتَابُ، مُتَعَارَفٌ فِي المُختَلَقِ)، وشەی (إكتِتاب) مانا باوەكەی: بەكاردەهێنرێ بۆ شتێك كە هەڵبەسترا بێ.

ب- (اكْتَتَبَهَا)، (طَلَبَ كِتَابَتَهَا)، داوای كردوە بۆی بنووسرێتەوە.

(تُمْلَىٰ عَلَيْـهِ): یـانی: (تُقـرَأُ، تُتـلَى عَلَيـهِ لِيَكتُـبَ)، بەسـەریدا خوێنراوەتـەوە، بـۆ ئـەوەی بینووسـێتەوە، هەڵبەتـە مەبەسـتیان ئـەوە نەبـووە كـە پێغەمبـەر ﷺ خـۆی نووسـیویەتەوە، زانیویانـە خوێنـدن و نووسـینی نیـە، بـەڵام یـانی: بەسـەر پێغەمبـەردا ﷺ خوێنراوەتـەوە لەبـەری بـكات و، خەڵكێـكی دیكـەش بـۆی بنووسـێتەوە.

(تَغَيُّظًا): (الغَيْظُ: أَشَدُّ الغَضَبِ)، (غَيظ) بريتيە لە ئەوپەڕی تووڕەیی.

(وَزَفِيرًا): (زَفِير: إمتِدَادُ النَّفَسِ وَ إدخَالُ النَّفَسِ، وَشَهِيقٌ إخرَاجُ النَّفَس)، (زَفِير) هەناسە درێژکردنەوەو هەناسە هەڵکێشانە (شَهِيق)یش، بريتيە لە هەناسە دانەوە، هەناسە دەردان.

(مُقَرَّنِينَ): واتە: پێکەوە جووتکراو، (الإقتِرَانُ كَالإزدِوَاجِ، فِي كَوْنِهِ اجتِمَاعُ شَيْئَيْنِ)، (إقتِران) وەك (إزدِواج) وایە، لەبەر ئەوەی دوو شت پێکەوە دەبن، ئنجا لە ئایەتەکەدا، یان مەبەست ئەوەیە: کافرەکان دوو دوو بەیەکەوە کەلەپچە دەکرێن، یان مەبەست ئەوەیە: دەست و پێیان پێکەوە جووت دەکرێن و لە کەلەپچەدا دەبن.

(ثُبُورًا): (الثُّبُورُ: الهَلَاكُ وَالفَسَادُ)، (ثُبُور) بە مانای فەوتان و تێکچوون دێ.

(بُورًا): (بور) لە (بَوَار)ەوە، هاتوە، (البَوَارُ: فَرْطُ الكَسَادِ، وَالبَوَارُ: الهَلَاكُ، وَبَارَ الشَّيءُ يَبُورُ بَوَاراً وَبَوَراً)، (بَوَار) ئەوەیە شتێك زۆر زیان بکات، (بَوَار)، بە مانای فەوتان و سەر بە فەتارەت چوون دێ، (بَارَ الشَّيءُ يَبُورُ بَوَاراً وَبَوَراً)، واتە: ئەو شتە فەوتا، لە بەین چوو، زیانی کرد، بە لەبەین چوون.

(صَرْفًا): (الصَّرْفُ: رَدُّ الشَّيءِ مِنْ حَالَةٍ إلى حَالَةٍ أو إبْدَالُهُ بِغَيرِهِ)، (صَرْف) بريتيە لەوەی شتێك لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك بگۆڕدرێ، یاخود شتێکی دیکەی بهێنرێتە جێ و، ئەو لابىرێ.

(فِتْنَةً): (فِتنَة) بە مانای:١- تاقیکردنەوە دێ و، ٢- بە مانای بەڵاش دێ و، ٣- بە مانای سەختییش دێ و، ٤- بە مانای سزاش دێ، بە چەند واتایەك دێ، بەپێی ئەو سیاقە جۆراو جۆرانەی کە تێیاندا دێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەك لـە خسـتنە رووی پێناسـەو باسـکردنی نێـوەڕۆکی ئـەم سوورەتەشـدا باسـمان کـرد، خـوا ﷻ لـەم بیسـت ئایـەتی سـەرەتای سـوورەتی (الفرقـان)دا، بـاسی شـەش بابـەتی سـەرەکیی کـردوە، ئەم سـوورەتە موبارەکـە وەك هەمـوو سـوورەتەکانی قورئان، کۆمەڵێـك تایبەتمەندیـی هـەن، کـە باسـمان کـردن، یەکێـك لـە تایبەتمەندییـەکانی ئەوەیـە بـە ﴿ تَبَارَكَ ﴾ دەسـتی پێکـردوە، هـەروەك چـۆن سـوورەتی (الملك)یـش، بـە ﴿ تَبَارَكَ ﴾، دەسـت پـێ دەکات، بـەڵام لـەم سـوورەتەدا، سـێ جـاران وشـەی ﴿ تَبَارَكَ ﴾، دووبـارە بۆتـەوە، ئـاوا دەسـت پێـدەکات: ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە: بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی و بەخشـندە دەسـت پێدەکـەم، وەك هەمـوو جـارێ گوتوومانـە: ئەمـە چەنـد واتایـەك دەگرێتـە خـۆی:

١- من ئەو کارەی دەیکەم بە ناوی خوا دەستی پێ دەکەم، نەك بە ناوی خۆم، یان بە ناوی کەسێکی دیکە.

٢- ئەم کارە کە دەیکەم، بۆ ڕازییکردنی خوا ئەنجامی دەدەم.

٣- ئەم کارە کە دەیکەم، بەپێی ئایین و بەرنامەی خوا دەیکەم.

٤- ئەم کارە کە ئەنجامی دەدەم بە یارمەتییدان و ئاسانکاریی خوا ئەنجامی دەدەم، نەك بە شان و شەوکەتی خۆم، ئەم چوار واتایە، پێویستە لە کاتی گوتنی: ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾دا، بە زەین و دڵدا بهێنرێن.

دوایـی خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴾، واتـە: بـەردەوام بـەرزو بەپێـزە، خـاوەن هەمـوو خێـر و بەرەکـەت و چاکەیـە،

﴿ ٱلَّذِي ﴾، ئـەو کەسـەی ﴿ نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ ﴾، فورقـانی دابەزاندۆتـە سـەر بەندەکـەی خـۆی، بەندەکـەی خـۆی موحەممـەدە ﷺ.

ئایـا بۆچـی بـۆی دابەزانـدوە؟ ﴿ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴾، تاکـو ئـەو بەندەیـەی خـوا کـە موحەممـەدە ﷺ بـۆ هەمـوو جیهانییـان ببێتـە ترسـێنەر و هۆشـیارکەرەوە.

جێـی سـەرنجە کـە خـوا ﷻ لـە مەقامـی زۆر بـەرزدا بـە نازنـاوی بەنـدە (عبـد) بـاسی موحەممـەد ﷺ دەکات، بـۆ وێنـە:

أ- لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِي بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ ﴿١﴾ ﴾.

ب- لە سوورەتی (الكهف)یشدا، دەفەرموێ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ﴿١﴾ ﴾.

کەواتـە: بەنـدە بـوونی مـرۆڤ بـۆ خـوا، بەرزتریـن پێگـەو مەقامـە، بۆیـە خـوا ﷻ لـە کاتێکـدا بـاسی دابەزانـدنی قورئـان دەکات، لـە سـوورەتی (الفرقـان) و، لـە سـوورەتی (الكهف)دا و، لـە کاتێکـدا بـاسی شـەورۆ و بـەرز بوونـەوەی پێغەمبـەر ﷺ دەکات، لـە سـوورەتی (الإسراء)دا، کـە سـەفەرێکی یەکجـار گـەورەو گرنـگ بـووە، بـە بەنـدە (عبـد) بـاسی پێغەمبـەر ﷺ موحەممـەد دەکات و دەیناسـێنێ.

هەروەهـا لێـرەدا جێـی سـەرنجە کـە خـوا ﷻ هـەر لـە قۆناغـی مەککـەوە، ڕایگەیاندوە، لە چەندان شـوێنی دیکەی سـوورەتە مەککەییەکاندا: لە سـوورەتی (سبأ) دا، لێـرەدا (الفرقـان)، لـە سـوورەتی (العنكبـوت)دا، لـە ژمارەیـەك لـە سـوورەتەکاندا، خـوا ﷻ ڕایگەیانـدوە کـە موحەممـەد ﷺ بـۆ هەمـوو مرۆڤایەتیـی نێـردراوە و، ئـەم قورئانـەش بـۆ هەمـوو مرۆڤایەتیـی دابەزێـنراوە و، تایبـەت نیـە بـە ناوچەیەکـەوەو، تایبـەت نیـە بـە گـەل و کۆمەڵگایەکـەوە و، تایبـەت نیـە بـە قۆنـاغ و ڕۆژگارێکـەوە، بەڵکـو قورئـان لـە هەمـوو ڕۆژگارەکانـدا بـە پانایـی زەمیـن و بـە درێژایـی زەمـان، بـۆ

هەمـوو گـەل و کۆمەڵگایـەکان، هاتـوە، وەك بەرنامـەی ژیـان و، موحەممەدیـش ﷺ وەك هەڵگـری ئـەو پەیامـەو ترسـێنەری خەڵـك و هۆشـیارکەرەوەیان، لەلایـەن خـوای پـەروەردگارەوە.

ئنجـا خـوا ﷻ پێناسـەی خـۆی دەکات: ﴿ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَمۡ يَتَّخِذۡ وَلَدٗا ﴾ ئـەو زاتـەی کـە حوکمڕانیـی و موڵـکی ئاسـمانەکان و زەوی هـی ویـە و، هیـچ ڕۆڵـەی نیـە (نـە کـوڕ نـە کـچ)، بەپێچەوانـەی ئـەوەوە کـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان دەیانگـوت: شـەیتانەکان کـوڕانی خـوان و فریشـتەکان کچـانی خـوان، ﴿ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٞ فِى ٱلۡمُلۡكِ ﴾ لـە حوکمڕانیـی و دەسـەڵاتیی دا، هاوبـەشی نیـە، ﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَىۡءٖ فَقَدَّرَهُۥ تَقۡدِيرٗا ﴾ هەمـوو شـتێکیشی هێناوەتـە دی و، ئەندازەگیریـی بـۆ کـردوە، بـە ئەندازەگیرییـەکی تێـر و تـەواو و ورد.

دوایـی کورتـە باسـێك دەربـارەی ئەندازەگیریـی خـوا دەکەیـن، لـە گـەردوون و دەوروبـەر و مرۆڤـدا.

ئنجـا خـوا ﷻ دێتە سـەر بـاسی هەڵوێسـتی کافـرەکان: ﴿ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗ لَّا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ وَلَا يَمۡلِكُونَ لِأَنفُسِهِمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا وَلَا يَمۡلِكُونَ مَوۡتٗا وَلَا حَيَوٰةٗ وَلَا نُشُورٗا ﴾، هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان، کافـرەکان، گرتیـان و پەیدایـان کـرد، ﴿ مِن دُونِهِۦٓ ﴾، جگـە لـەو، (جگـە لـە خـوا)، چییـان پەیداکـرد و گـرت؟ ﴿ ءَالِهَةٗ ﴾ چەنـد پەرسـتراوێك، وەك زۆرجـار گوتوومـە: هەڵەیـە بگوتـرێ: چەنـد خوایـەك، خـوا، یەکـە، بـەڵام پەرسـتراوەکان، زۆر و جـۆراو جـۆرن، ئەگەرنـا خـوا ﷻ یەکـە، (ألله) یەکـە، (God) یەکـە، (خُـدا) بـە فارسـیی، یەکـە، بـەڵام ئـەوەی زۆر و جـۆراو جـۆرە، پەرسـتراوەکانن، کـە دەکرێنـە هاوبـەشی خـوا و وەك خـوا مامەڵەیـان لەگەڵـدا دەکـرێ، ئنجـا ئـەو پەرسـتراوانە چۆنـن؟ ﴿ لَّا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴾، هیـچ شـتێك دروسـت ناکـەن و خۆیـان دروسـت دەکرێـن، ﴿ وَلَا يَمۡلِكُونَ لِأَنفُسِهِمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا ﴾، نـەك بـۆ پەرسـتەرەکانیان، بگـرە: بـۆ خۆشـیان نـە زیانیـان بـە دەسـتە،

لـە خۆیـانی دووربخەنـەوە، نـە سـوودیان بـە دەسـتە بـۆ خۆیـانی بێنـن. ﴿ وَلَا يَمۡلِكُونَ مَوۡتٗا وَلَا حَيَوٰةٗ وَلَا نُشُورٗا ﴾، نـە مردنیـان بـە دەسـتە، نـە ژیانیـان بـە دەسـتە، نـە زیندووکردنـەوەو نەبڵاوکردنەوەشـیان بـە دەسـتە، هیچیـان بـە دەسـت نیـە، کەواتـە: شایسـتەی پەرسـتران و بەندایەتیـی بـۆ کـران نیـن.

ئـەوە بـاسی خـوا بـە یەکگرتـن (توحیـد) لـە بەدیهێنەرایەتیـی و پەروەردگارێتیـی و، خاوەندارێتیـی و، حوکمڕانێتیی ڕەهـاو پەرسـتراوێتییش دا.

ئنجـا دێتـە سـەر بـاسی قورئـان و پێغەمبەرایەتیـی، کـە کافـرەکان چـۆن تەماشـایان کـردوە و، بەرپەرچدانەوەیـان لەلایـەن خـوای پـەروەردگارەوە: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ إِفۡكٌ ٱفۡتَرَىٰهُ ﴾، هەروەهـا ئەوانـەی بێبـڕوان، گوتیـان: ئەمـە تەنیـا درۆیەکـەو هەڵیبەسـتوە، واتـە: قورئـان تەنیـا درۆیـەو موحەممـەد هەڵیبەسـتوە، حاشـای موحەممـەد ﷺ و حاشـای قورئـان! ﴿ وَأَعَانَهُۥ عَلَيۡهِ قَوۡمٌ ءَاخَرُونَ ﴾، کۆمەڵێـکی دیکـەش هاوکارییـان کـردوە، بـۆ هەڵبەسـتنی ئـەو قسـەیەی فێریـان کـردوە، وەك لـە سـوورەتی (النحـل)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّهُمۡ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٞۗ لِّسَانُ ٱلَّذِي يُلۡحِدُونَ إِلَيۡهِ أَعۡجَمِيّٞ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيّٞ مُّبِينٌ ١٠٣ ﴾، واتە: ئێمـە دەزانیـن دەڵێـن: مرۆڤێـك فێـری کـردوە، بـەڵام ئـەوەی کـە ئامـاژەی بـۆ دەکـەن نەعجەمییـە، (غەیـری عەڕەبـە)، بـەڵام ئـەم قورئانـە زمانێـکی عەڕەبیـی زۆر ڕۆشـنە.

ئنجـا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَقَدۡ جَآءُو ظُلۡمٗا وَزُورٗا ﴾، بەدڵنیایـی سـتەم و درۆیـان هێنا، کـە ئـەوە پاڵدەدەنـە لای قورئـان، کـە درۆیـەو هەڵبەسـتراوە و، ئـەوە پـاڵ دەدەنە لای موحەممـەد ﷺ کـە خەڵکێـکی دیکـە هاوکاریـی کـردوە، ﴿ وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٱكۡتَتَبَهَا ﴾، هەروەهـا گوتیـان: قورئـان ئەفسـانەی پێشـینانەو، موحەممـەد ﷺ داوای کـردوە، بـۆی بنووسرێتـەوە، ﴿ فَهِيَ تُمۡلَىٰ عَلَيۡهِ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا ﴾، ئنجـا بەیانیـان و ئێواران بەسـەریدا خوێندراوەتـەوە، ئەویـش نووسـەرێکی هەبـووەو بـۆی نووسـیوەتەوە!!

خوا ﷻ وەڵامێکی ددان شکێنیان دەداتەوە، دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَنزَلَهُ ٱلَّذِي يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ ﴾، بڵێ: ئەو کەسە دایبەزاندوە، کە نهێنیی نێو ئاسمانەکان و زەوی دەزانێ، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴾، بەڕاستیی ئەو لێبوردەی بە بەزەییە، ئەگەرنا دەبووایە لەسەر ئەو قسانەتان زۆر سزاتان بدات.

دەپرسین: بۆچی خوا باسی ئەوە دەکات کە ئەو کەسە دایبەزاندوە، نهێنیی نێو ئاسمانەکان و زەوی دەزانێ؟ چونکە لە قورئاندا باسی نهێنییەکانی ئاسمان و زەوی کراوە، باسی سەرەتای ژیان کراوە، باسی سەرەتای گەردوون کراوە، باسی کۆتایی گەردوون کراوە، بە ئاماژە، وەك کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (یونس) دا، کۆمەڵێ بابەتمان لەو بارەوە باسکردوون، هەروەها دواتر لە تەفسیری سوورەتەکانی (الشعراء) و (فصلت) و (الرحمن)یش دا.

﴿ وَقَالُواْ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأۡكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشِي فِي ٱلۡأَسۡوَاقِ ﴾، کافرەکان گوتیان: ئەوە چییە ئەم پێغەمبەرە، خواردن دەخوات و، بە بازاڕانیشدا دەڕوات (بۆ کار و کاسبیی)؟ ﴿ لَوۡلَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَلَكٞ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ﴾، بۆچی فریشتەیەکی بۆ لا دانەبەزێندراوە، کە لەگەڵیدا ئەویش وریاکەرەوەو ترسێنەر بێ! ﴿ أَوۡ يُلۡقَىٰٓ إِلَيۡهِ كَنزٌ أَوۡ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٞ يَأۡكُلُ مِنۡهَا ﴾، یان دەبووایە خەزنەیەکی بۆ فڕێ بدرێ لە ئاسمانەوە، یاخود باغ و بێستانێکی هەبێ، لێی بخوات و پێویستیی بە کار و کاسبیی نەبێ.

﴿ وَقَالَ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا مَّسۡحُورًا ﴾، ستەمکارەکان (کافرە ستەمکارەکان)، گوتیان: ئێوە تەنیا بەدوای پیاوێکی جادوو لێکراو دەکەون، ﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَٰلَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا ﴾، سەرنج بدە! چۆن وێنانت بۆ دێننەوە، بۆیە گومڕابوون و ناتوانن ڕێ بدۆزنەوە، یان: تازە ناتوانن بگەڕێنەوە، هێندە دوور ڕۆیشتوون لە گومڕایی دا.

﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِيٓ إِن شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيۡرٗا مِّن ذَٰلِكَ ﴾، بەردەوام بەرزو بەپێزە، ئەو کەسەی ئەگەر بیەوێ لەوە چاکترت بۆ دەڕەخسێنێ، کە ئەوان پێشنیاری دەکەن،

﴿ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَيَجۡعَل لَّكَ قُصُورَۢا ﴾، چەند باغێك كە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن و، كۆشكانت بۆ دروست دەكات.

ئەمە لە دنیادا دەتوانێ ئەوەت بۆ بكات و، لە دواڕۆژیشدا ئەوەت هەر مسۆگەرە.

﴿ بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلسَّاعَةِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴾، بەڵكو هۆی ئەو قسانەو ئەو هەڵوێستە خراپەی ئەو كافرە ستەمكارانە، ئەوەیە، كە بڕوایان بە ئاخیر زەمان نیە، (ساعَة) ئەو كاتەی كە دنیای تێدا كۆتا دێ، بڕوایان بە ئاخیر زەمان نیە و، بەوەی كە لە دوای ئاخیر زەمانیش دێ، كە زیندووبوونەوەو هەڵسانەوەیە، ﴿ وَأَعۡتَدۡنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴾، كەسێك كە بڕوای بە ئاخیر زەمان نیەو بە دەرەنجامەكانی نیە، ئێمە ئاگری كڵپەدارمان بۆ ئامادە كردوە، ئایا ئەو دۆزەخە كە ئاگرێكی كڵپەداری تێدایە، چییە؟ ﴿ إِذَا رَأَتۡهُم مِّن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ سَمِعُواْ لَهَا تَغَيُّظٗا وَزَفِيرٗا ﴾، هەركات لە شوێنێكی دوورەوە دیتنی، كافرەكانی ببینێن، دەنگی تووڕە بوون و خەشمێكی زۆر و دەنگی هەناسە هەڵمژینیشی لێ دەبیستین.

﴿ وَإِذَآ أُلۡقُواْ مِنۡهَا مَكَانٗا ضَيِّقٗا مُّقَرَّنِينَ ﴾، هەروەها كاتێك فڕێ دەدرێنە شوێنێكی تەنگەبەر و تەسكی دۆزەخەوە بە جووتكراویی، واتە: دوو دوو پێكەوە كەلەپچە دەكرێن، یاخود دەست و پێیان پێكەوە كەلەپچە دەكرێن و جووت دەكرێن، ﴿ دَعَوۡاْ هُنَالِكَ ثُبُورٗا ﴾، لەو كاتەدا داوا دەكەن بفەوتێن، یان دەڵێن: (وَا ثُبُورَا)، ئای فەوتان! ئای فەوتان! وەرە ئێستا كاتیەتی، ﴿ لَّا تَدۡعُواْ ٱلۡيَوۡمَ ثُبُورٗا وَٰحِدٗا وَٱدۡعُواْ ثُبُورٗا كَثِيرٗا ﴾، ئەمڕۆ هەر جارێك داوای فەوتان و سەر بە فەتارەت چوون، مەكەن، بەڵكو زۆر جار داوا بكەن، شایستەتانە.

﴿ قُلۡ أَذَٰلِكَ خَيۡرٌ أَمۡ جَنَّةُ ٱلۡخُلۡدِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلۡمُتَّقُونَۚ ﴾، پێیان بڵێ: ئایا ئەمە باشترە؟ یان بەهەشتی هەمیشە تێدا مانەوەی بەڵێن دراو بە پارێزكاران؟ ﴿ كَانَتۡ لَهُمۡ جَزَآءٗ وَمَصِيرٗا ﴾، كە بۆیان دەبێتە پاداشت و سەرەنجام.

﴿ لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ خَٰلِدِينَ ﴾، هەرچی بیانەوێ بۆ ئەوان لەو بەهەشتانەدا هەیە، هەر ماویشن تێیان دا، ﴿ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْـُٔولًا ﴾، ئا ئەوە لەسەر پەروەردگارت گفت و بەڵێنێکە لێی دەپرسرێتەوە، واتە: گفت و بەڵێنێکی بەرپرسانەیە.

﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، ئنجا باسی چۆنیەتی کۆکردنەوەیان دەکات، لە ڕۆژی دوایی دا: ئەو ڕۆژەی خۆیان و ئەوانەی لە جیاتی خوا پەرستوویانن، کۆیان دەکاتەوە، خڕیان دەکاتەوە، ﴿ فَيَقُولُ ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى هَٰٓؤُلَآءِ أَمْ هُمْ ضَلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴾ ئنجا (خوا) پێیان دەفەرموێ: ئایا ئێوە ئەم بەندانەی منتان گومڕا کردن، یان خۆیان ڕێیان ون کرد؟ ﴿ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ مَا كَانَ يَنۢبَغِى لَنَآ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَآءَ ﴾، گوتیان: پاکیی بۆ تۆ، ئێمە بۆمان نیە لە جگە لە تۆ سەرپەرشتیاران و مشوورخۆرانێکی دیکە بگرین، ﴿ وَلَٰكِن مَّتَّعْتَهُمْ وَءَابَآءَهُمْ ﴾، بەڵام تۆ ئەوان و باب و باپیرانیانت، پێشینانیانت بەهرەمەند کرد لە ژیاندا، نازو نیعمەتت پێدان، ﴿ حَتَّىٰ نَسُوا۟ ٱلذِّكْرَ ﴾، هەتا (لە جیاتی ئەوەی شوکرانە بژێرییت بۆ بکەن) بیرخەرەوەیان ئەو قورئانەی ڕاستییەکانیان بیردەخاتەوە، فەرامۆشیان کرد و لە بیریان چوو، ﴿ وَكَانُوا۟ قَوْمًۢا بُورًا ﴾، بوونە کۆمەڵێکی فەوتاوو، دوا بڕاو و، سەر بە فەتارەت چوو، ﴿ فَقَدْ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ ﴾، (خوا بە پەرستراوەکان دەفەرموێ:) ئەوە بە درۆیان خستنەوە لەوەدا کە گوتتان، کە ئەوانتان پەرستوە، گوایە پێیان چاك بووە، یان پێیان گوتوون، ﴿ فَمَا تَسْتَطِيعُونَ صَرْفًا وَلَا نَصْرًا ﴾، ئێستاش ناتوانن نە سزا لە خۆتان لابدەن و، نە خۆشتان سەربخەن، ﴿ وَمَن يَظْلِم مِّنكُمْ نُذِقْهُ عَذَابًا كَبِيرًا ﴾، هەر کامێکیش لە ئێوە ستەم بکات، سزایەکی گەورەی پێ دەچێژین.

لە کۆتایی دا جارێکی دیکە خوا ﷻ باسی ئەو تۆمەتەی کافرەکان دەکاتەوە کە بۆ پێغەمبەریان دەکرد ﷺ، دەیانگوت: بۆچی خواردن دەخوات و بە بازاڕاندا دەڕوات؟ دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ

ٱلطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِى ٱلْأَسْوَاقِ ﴾، لە پێش تۆدا هیچ کام لە پێغەمبەرانمان ڕەوان نەکردوون، مەگەر خواردنیان خواردوەو بە بازاڕانیشدا ڕۆیشتوون، کارو کاسبییان کردوە، چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانیان بوون، ﴿ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً ﴾، هەندێکتانمان بۆ هەندێکتان گێڕاوە بە (مایەی) تاقیکردنەوە ﴿ أَتَصْبِرُونَ ﴾، ئایا خۆتان ڕادەگرن، لەسەر ڕاستە شەقامی خوا؟ ﴿ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ﴾، پەروەردگاریشت هەر بینەر بووە، بۆ حاڵ و واقیعی هەموو لایەکتان.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**قورئان وەك جیاکەرەوەی هەق و ناهەق دابەزێنراوەتە سەر موحەممەد ﷺ، خواش خاوەنی ڕەهای ئاسمانەکان و زەوییەو، ڕۆڵەو هاوبەشی نیە و، هەموو شتێکی بە ئەندازە دروستکردووەو، ئەو شتانەش کە جگە لە خوا دەپەرسترێن، نە بەدیهێنەری هیچ شتێکن، نە خاوەنی هیچ شتێك و، نە زیان و سوود و، مردن و ژیان و ژیاندنەوەن، هیچ کام لەوانەیان بە دەست نیە، بۆیە شایستەی پەرستران نین:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴿١﴾
ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَخَلَقَ
كُلَّ شَىْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾ وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً لَّا يَخْلُقُونَ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ وَلَا
يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَلَا يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلَا حَيَوٰةً وَلَا نُشُورًا ﴿٣﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ ﴾، بەردەوام بەرزو بەپێزە، خاوەنی هەموو خێر و چاکەو بەرەکەتێکە، ئەو کەسەی جیاکەرەوە (فرقان)ی دابەزاندۆتە سەر بەندەکەی.

کە مەبەست پێی قورئانە، چونکە قورئان: هەق و باطیڵ، چاك و خراپ، ڕاست و چەوت، حەڵاڵ و حەرام، دۆست و دوژمن، کوفر و ئیمان، شیرك و تەوحید، هەموو ئەوانە لێك جیادەکاتەوە، هەر کامێکیان لە شوێنی خۆی دادەنێ و، کاو دانی هەموو شتەکان لێك جیا دەکاتەوە، وشەی ﴿ تَبَارَكَ ﴾، یانی: بەردەوام بەرزو بەپێزە، کە هەندێك

لە زانایان ئاوایان لێکداوەتەوە: (تَعَاظَمَ وَتَعَالَى وَكَثُرَ خَيْرُهُ)، خێر و چاکەو پیتی خوا، مەزنە بەرزە، زۆرە. ئەمە هەواڵدانە لە مەزنیی خواو، لە تەواویی خێر و چاکەی خوا ﷻ.

دەگونجێ ﴿ تَبَارَكَ ﴾، فێرکردن بێ، واتە: ئێوە وا بڵێن، دەشگونجێ هەر ستایش و سەناو پێدا هەڵگوتنی خوای پەروەردگار بێ، (فورقان)یش ناوە، هەندێکیشیان گوتوویانە: چاوگی (فَرَّقَ)ـە، یانی: جیاکەرەوە، یان جیاکردنەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ ﴾، بۆ سەر بەندەکەی خۆی، لێرەدا خوا ﷻ کە موحەممەد ﷺ بە بەندەکەی ناودەهێنێ، بۆ پێکانی چوار ئامانجانە:

یەك: بزانرێ بەرزترین پێگەو مەقام مرۆڤ پێی بگات، بریتیە لە بەندە بوون بۆ خوا.

دوو: هەروەها ئەمە هۆشدارییشە بۆ کافرەکان: ئەی هاوبەشدانەرو کافرەکان! بەهانە بە موحەممەد ﷺ مەگرن و شتی وای لێ داوا مەکەن، کە کاری ئەو نیەو هی پەروەردگارە، چونکە ئەو بەندەی خوایە.

سێ: موحەممەد ﷺ گوێ نادا بەو بیانووگرتنانەی ئێوە، چونکە ئەو بەندەیەکی گوێڕایەڵ و فەرمانبەرە بۆ خوا.

چوار: تەماشای موحەممەد ﷺ بکەن، لەگەڵ ئەو پێگە بەرزەی دا، کە پێغەمبەری خوایەو سەروەری پێغەمبەرانەو باشترین ئینسانە، کەچی چاکترین بەندەی خواشە، کەواتە: ئێوەش خۆتان پێ لەوە بەرزتر نەبێ، بەندەی خوابن، لە حاڵێکدا کە موحەممەد ﷺ بەو پێگەو مەقامە بەرزەیەوە، بەندەی خوایە.

ئنجا ئایا بۆچی خوا فورقانی دابەزاندۆتە سەر ئەو بەندەیەی خۆی؟.

٢)- ﴿ لِيَكُونَ لِلۡعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴾، تاکو بۆ جیهانییان ببێتە ترسێنەر، هۆشیارکەرەوە، وریاکەرەوە، (النَّذِيرُ: الْمُخْبِرُ بِالسُّوءِ يَقَعُ، فَعِيل بِمَعنَى مُفعِل، بِصِيغَةِ اسمِ الفَاعِل، وَالمَقَامُ مَقَامُ التَّهدِيدِ لِذَا لَم يُذكَرِ البَشِير)، (نَذِير) یانی: کەسێك کە هەواڵ دەدات بەوەی خراپەیەك دەقەومێ، لەسەر کێشی (فَعِيل)ە، بەڵام بە مانای (مُفْعِل) دێ: (مُنْذِر)، کە

ئەویش ناوی بکەر (إسم القَاعِل)ە، چونکە ڕەوت و حاڵەکەش هی هەڕەشە کردنە، بۆیە وشەی (بَشِير) بەکارنەهاتوە، ئەگەرنا لە شوێنەکانی دیکە ﴿ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴿١١٩﴾ ﴾البقرة، واتە: موژدەدەر و دڵخۆشکەر، بەڵام لێرە حاڵەکە هی ترساندن و هۆشیارکردنەوەو ورياکردنەوەیە.

٣)- ﴿ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، ئەو زاتەی حوکمڕانیی لە ئاسمانەکان و زەویی دا، سەڕافەت و سەرپەرشتیی لە ئاسمانەکان و زەوی دا، بەس هی ئەوە.

٤)- ﴿ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا ﴾، هیچ ڕۆڵەشی نەگرتوە (بۆ خۆی) نە نێر نەمێ، بەڵکو تاك و پاك و، بێنیازو جێی نیاز و، بێ هاوەڵ و هاوتایە.

٥)- ﴿ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ ﴾، لە حوکمڕانیی و، موڵك و دەسەڵاتیی دا، هیچ هاوبەشی نین.

٦)- ﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ﴾، هەموو شتێکیشی وەدیهێناوە، هەموو شتێك ئەو پەیدای کردوە.

٧)- ﴿ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴾، بە ئەندازەگیرییەکی چاك و ڕێك، ئەندازەگیریی کردوە، هەر شتێك کە دروستیکردوە، بە ئەندازەگیریی و نەخشەو بە بەرنامە دروستیکردوە، کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ خۆی بە پێنج سیفەت پێناسە کردوە:

١- ﴿ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، حوکمڕانیی و دەسەڵات لە ئاسمانەکان و زەویی دا هی ئەوە.

٢- ﴿ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا ﴾، ڕۆڵەی نیە، نە کوڕ نە کچ.

٣- ﴿ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ ﴾، لە حوکمڕانیی و دەسەڵات و موڵکیدا، هاوبەشی نیە، پێچەوانەی ئەوە کە هاوبەش بۆ خوا دانەران گومان دەبەن.

٤- ﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ﴾، هەموو شتێکی بەدیهێناوە، هیچ کەسێکی دیکەو هیچ شتێکی دیکە، هیچی وەدینەهێناوە، هەموو شتێك بەدیهێنەرەکەی خوایە.

٥- ﴿ فَقَدَّرَهُۥ تَقۡدِيرٗا ﴾، هەر شتێك كە بەدیهێناوە، ئەندازەگیریی بۆ كردوە، بە ئەندازەگیرییەكی زۆر ورد و ڕێك و پێك، كە ئەو پەڕەكەی هیچ كەس پێی ناگات.

ئنجا خوا ﷻ دوای ئەوەی پێناسەی خۆی كرد و باسی خۆی كرد، باسی ئەوانە دەكات كە جگە لە خوا دەپەرستن و، باسی پەرستراوەكانیشیان دەكات:

٨)- ﴿ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗ ﴾، جگە لەو پەرستراوانی دیكەیان پەیداكردن، هەڵیانبژاردن، (إتّخاذ) (إفتِعال)ە لە (أخذ)، یانی: گرتن، (أَخَذَ) گرتی، (إتّخَذَ) یانی: گرتی، بەڵام بە مەبەستەوە، یانی: هەڵیبژارد و پەیدای كرد.

٩)- ﴿ لَّا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴾، ئەو پەرستراوانە هیچ شتێك دروست ناكەن بەڵكو خۆشیان دروست دەكرێن.

لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە كە دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗ ﴾، باسی كەس نەكراوە، بەڵام دەزانرێ كە مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانە، هەروەها كە دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا ﴾، هیچ شتێك دروست ناكەن، یانی: هەر شتێك بێ، گچكە یان گەورە.

﴿ وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴾، بەڵكو خۆشیان دروستدەكرێن و، پەیدادەكرێن.

١٠)- ﴿ وَلَا يَمۡلِكُونَ لِأَنفُسِهِمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا ﴾، بۆ خۆشیان نە سوودیان بەدەستە، نە زیانیان بە دەستە.

١١)- ﴿ وَلَا يَمۡلِكُونَ مَوۡتٗا وَلَا حَيَوٰةٗ وَلَا نُشُورٗا ﴾ هەروەها نە مردن و نە ژیان و، نە زیندوو كردنەوەو بڵاوكردنەوەش (هیچ كام لەوانەیان بەدەست نیە).

كەواتە: ئەو پەرستراوانەی لە جیاتی خوا دەپەرسترێن، خوای تاك و پاك حەوت سیفەتیان لێ هەڵدەدان، هەموویان خاڵی زۆر بێ هێزن و، هەر كامێكیان بەسە بەڵگە بێ، كە ئەو شتانە بە كەڵكی پەرستن نایەن:

١- ﴿لَا يَخۡلُقُونَ شَيۡـًٔا﴾، ئەوان هیچ شتێك بەدیناهێنن، بەڵام پەرستراو دەبێ بەدیهێنەربێ.

٢- ﴿وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ﴾، خۆشیان بەدیهێنراون.

٣و٤- ﴿وَلَا يَمۡلِكُونَ لِأَنفُسِهِمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا﴾، بۆ خۆشیان زیانیان بە دەست نیە و، سوودیشیان بە دەست نیە، چ جای بۆ پەرستەرەکانیان.

٥- ﴿وَلَا يَمۡلِكُونَ مَوۡتٗا﴾، هەروەها مردنیان بە دەست نیە.

٦- ﴿وَلَا حَيَوٰةٗ﴾، دیسان ژیانیشیان بە دەست نیە.

٧- ﴿وَلَا نُشُورٗا﴾، هەروەها زیندوو کردنەوەو بڵاو کردنەوەشیان بە دەست نیە، کەواتە: شایستەی ئەوە نین بپەرسترێن.

# کورتە باسێک لە بارەی
# ئەندازەگیریی خواوە ﷻ بۆ گەردوون و پێکهاتەکانی

بەڕێزان! ئەم کورتە باسە لە پێنج تەوەردا پێشکەش دەکەین:

## تەوەری یەکەم: چەند ئایەتێکی قورئان:

سەرەتا با تەماشای چەند ئایەتێکی موبارەك بکەین، چونکە خوا ﷻ ئەم ڕاستییەی - کە گەردوون و پێکهاتەکانی گەردوونی بە وردو درشتەوە، بە ئەندازەگیریی دروستکردوون - لە گەلێك ئایەتدا ئەوەی ڕاگەیاندوەو، ڕوونکردۆتەوەو گرنگیی و بایەخیی تایبەتی پێداوە:

١- ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا﴾الفرقان، واتە: هەموو شتێکی بەدیهێناوەو، ئەندازەگیریی کردوە، بە ئەندازەگیرییەکی تەواو.

٢- ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾القمر، واتە: ئێمە هەموو شتێکمان دروستکردوە، بەڵام بە ئەندازەگیرییەوە.

٣- ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴿١﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴿٣﴾﴾الأعلى، واتە: ناوی پەروەردگاری بەرزت بە پاك بگرە، هەموو شتێکی هێناوەتە دی و ڕێکیخستوە و، ئەو کەسەش کە ئەندازەگیریی بۆ (هەموو شتێك) کردوەو ڕێنمایی کردوە.

٤- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلْكَرِيمِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِى خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِىٓ أَىِّ صُورَةٍ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾﴾الإنفطار، واتە: ئەی ئینسان! چ شتێك تۆی بەرانبەر بە پەروەردگاری بەخشندەو خاوەن ڕێزی بێ سنوورت بۆغرا کردوە، (لە کەوڵی خۆتی دەرچواندووی)، ئەو پەروەردگارەی تۆی هێناوەتە دی (بە جەستە و ڕووحەوە و) تۆی ڕێکخستوە، {ئەندامەکانی بۆ داناویی نەك پارچە گۆشتێك بی، هەروەها لە ڕووی

ڕووحەوە، ئەو هەموو توانا شێردراوانەی خستوونە نێو ڕووحەوە) ئنجا تۆی هاوسەنگ کردوە (ئەندامێکت لە ئەندامێکت گەورەتر نیە) لە هەر وێنەیەکدا کە ویستوویەتی، تۆی پێکهێناوە، کەواتە: خوا بە چوار قۆناغ مرۆڤی هێناوەتە دی: دروستکردن، ڕێکخستن، هاوسەنگ کردن، وێنە پێدان.

٥- هەروەها خوا ﷻ لە سوورەتی (السجدة)دا، چۆنیەتی دروستکردنی هەمووشتێکمان بۆ ڕوون دەکاتەوەو دەفەرمویّ: ﴿ ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ... ﴿٧﴾ ﴾، واتە: هەر شتێك کە خوا دروستی کردوە، بە چاکترین شێوە دروستی کردوە، ئەوپەڕی وردەکاریی و ڕێك و پێکیی سیستمی تێدایە.

٦- هەروەها لە سوورەتی (النمل)دا، دەفەرمویّ: ﴿ صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَيۡءٍ ﴿٨٨﴾ ﴾، واتە: (ئەوە) دروستکراوی خوایە، کە هەموو شتێکی بەوپەڕی وردەکاریی و، کارامەیی و، لێزانییەوە هێناوەتە دی.

٧- هەروەها خوا ﷻ سەرنجمان بۆ هەرکام لە خڕۆکەی زەویی و وردەکارییەکانی و، خۆشمان ڕادەکێشێ و دەفەرمویّ: ﴿ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ ءَايَٰتٞ لِّلۡمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾الذاريات، واتە: لە زەویدا نیشانە زۆرن بۆ کەسانێك خاوەنی زانیارییەکی دڵنیاکەر، بن، هەروەها لە خۆشتاندا، بۆچی سەرنج نادەن، بۆچی نابینن؟

## تەوەری دووەم: وردەکارییەکانی گەردوون بەگشتیی:

ئێستا با سەرنجێك بدەینە هەندێك لە ئەندازەگیرییەکانی خوا ﷻ کە لە گەردووندا داینـاون، سەرەتا سەرنجی هەموو لایەك ڕادەکێشم کە ئێمە لە مەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پوچەڵیی ئیلحاد، لەبەر ڕۆشنایی زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی)دا، لەو بارەوە زۆر قسەمان کردوە، دەربارەی: گەردوون و، جەستەی مرۆڤ و، ژیانداران بە گشتیی و، زیندەوەران و پەڕەوران (باڵندان) هەروەها لە دروستکراوەکانی دیکەی خوا ﷻ ، باسی چەند لایەنێکی وردەکارییانمان کردووەو

سیستم و ڕێك و پێكییەی خوا لە گەردووندا، لە ئاسمان و لە زەویی دا، پاشان لە ژیاندارانـدا و، لە هەمـوو دروستكراوەكاندا ڕەچاوی كردووەو داینـاوە.

لێرەش با لە بارەی گەردوونەوە، چەند شتێك بڵێین:

**١- سەرەتاو چۆنیەتی دروستبوونی گەردوون:**

زانایـان دوا بیـردۆزە كـە زۆربەیـان لەسـەری ڕێككەوتـوون و پێـی گەیشـتوون، دەربـارەی هاتنـە دی ئـەو گەردوونـەی ئێمـە، دەڵێـن: ئـەو گەردوونـەی ئێمـە، لـە شـتێكی زۆر بچووكـەوە هاتـوە، كـە (سـینگولارتی sunolarty) پـێ دەڵێـن، واتـە: هێلكـەی گەردوونیـی، تـۆوی گەردوونیـی، تـاكی گەردوونیـی، (البَيْضَة الكَونِيَّة، البِذْرَة الكَونِيَّة، المُفْرَدَة)، ئـەو تەعبیرانـەی هەمـوو بـۆ بەكارهاتـوون، كـە بـێ سـنوور بـووە: لـە ڕووی بچووكیـی و، لـە ڕووی گەرمیـی و، لە كاتێـكی بـێ سـنوور كەمـدا، ئـەو تـاكی گەردوونییـە تەقیوەتـەوە و، سـەرەنجام ئـەو گەردوونـەی ئێمـە لـەوەوە هاتـوە، كـە بـە مەزەنـنـە هەندێكیـان كـە كـەم دەڵێـن: (دە ملیـار) سـاڵ لەمـەو پێـش و، ئەوانـەی زۆر دەڵێـن: (بیسـت ملیـار) سـاڵ، بـەڵام زۆربەیـان دەڵێـن: (پـازدە ملیـار) سـاڵ و، هەندێكیشـیان دەڵێـن: (سـێزدە ملیـار و حـەوت سـەد یـان هەشـت سـەد ملیـۆن) سـاڵ لەمـەو پێـش، هیـچ شـتێك نەبـووە، هیـچ شـتێك نـاوی لـە كوولەكـەی تـەڕدا نەبـووە، خـوا ﷻ ئـەم گەردوونـەی لـەو شـتە بچووكـەوە هێنـاوە، كـە ئـەوە ئایـەتی ژمـارە (٣٠) لـە سـوورەتی (الأنبیـاء)دا ئامـاژەی پێـدەكات، كـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ كَانَتَا رَتۡقٗا فَفَتَقۡنَٰهُمَا ﴾، واتـە: ئایـا ئەوانـەی بێبـڕوان، سـەرنج نـادەن، (نابینـن بـە چـاوی عەقـڵ و دڵ) كـە ئاسـمانەكان و زەوی پێكـەوە لـكاو بـوون، لێكـمان جیـا كردنـەوە؟

ئەمـەش ئاماژەیەكـی ڕوونـە بـەوەی پێیدەگوتـرێ: تەقینـەوەی گـەورە (الإنفجـار الكبیـر - Big Bang).

**٢- هێزە پێکهێنەرەکانی گەردوون:**

شایانی باسە: گەردووناسان و فیزیك زانەکان دەڵێن: چوار هێزی سەرەکیی هەن لە گەردووندا، هەموو گەردوونیان لە گەردیلە (atum)ەوە تاکو کەهکەشان و، گەلە کە هکەشانەکانیان پێوە وەستاون:

١- هێزی کێشکردن (قوة الجاذبية).

٢- هێزی کەهرۆموگناتیسیی (القوة الكهرومغناطية).

٣- هێزی نێوکیی بێ هێز (القوة النووية الضعيفة).

٤- هێزی نێوکیی بەهێز (القوة النووية القوية).

ئەمەش کورتە پێناسەیەکی هەرکام لەو چوار هێزە:

١- هێزی کێشندە (قوة الجاذبية): بێهێزترینی ئەو چوار هێزەیە، ئەو هێزی کێشندەیەی کە بە هۆی وییەوە، هەم ئەستێرەکان و، هەم کەشهکەشانەکان و، گەلە کەهکەشانەکان، پێکەوە پەیوەستن و بەڕێوە دەچن، لە حاڵێك دا کە لە هەر چوار هێزەکەی دیکەی بێهێزترە!

٢- هێزی کەهرۆموگناتیسیی (القوة الكهرومغناطيّة): ئەویش ئەو هێزەیە وایکردوە ئەلیکترۆنەکان لە سوورگەی نێوکەکاندا بخولێنەوە و، گەردیلەی هیدرۆجین و هیلیۆم دروست بن و، ئەلیکترۆنە بەرهەڵدراوەکان نەمێنن و، ڕێگاش بگرێ لەوەی کە گەردیلەکان پێکەوە ناوێتە بن[1]، هەروەها هێزی کەهرۆموگناتیسیی ئەو هێزەیە، کە کارلێك دەکات لەگەڵ تەنۆلکەکاندا، کە بارگەی کارەباییان هەیە، وەك ئەلیکترۆنەکان و کوارکەکان، بەڵام ئەو تەنۆلکانەی بارگەی کارەباییان نیە، وەك گراتوفیتات، لەگەڵیاندا کارلێك ناکات، ئنجا هێزی کەهرۆموگناتیسیی زۆر زۆر لە هێزی کێشندە بەهێزترە، بە ئەندازەی ژمارەی: ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن ($١٠^{٤٢}$) یانی: ژمارە یەك (١) چل و دوو

---

(١) الكون بين القرآن والعلم: ص٦٠، للقصاب، هەروەها تأريخ موجز للزمن: ص٦٩ -٧٢، ستیفن هوکینگ.

سفری هەبێت! واتە: یەك (١) لەسەر ژمارە یەك، كە چل و دوو سفری هەبێ، ئەوە هێزی كێشندەیە، ئەوی دیكەش هێزی كەهرۆموگناتیسییە، كە بەم شێوەیە دەنووسرێ:

(١/١٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠).

**٣- هێزی نێوكیی بێهێز (القوة النووية الضعيفة):** ئەویش ئەو هێزەیە كە بەرپرسیارە لە چالاكییە تیشكییەكان، كە لە توخمەكان هەندێكیان دەگۆڕێن بۆ هەندێكیان، یاخود لە بەین دەچن و تیشك دەدەنەوە، وزە دەدەنەوە.

**٤- هێزی نێوكیی بەهێز (القوة النووية القوية):** ئەویش ئەو هێزەیە كە كوارِكەكان لەگەڵ پرۆتۆن و نیۆترۆنەكان دا پێكەوە گرێ دەدات، هەروەها پرۆتۆن و نیۆترۆنەكان پێكەوە دەچەسپێنێ و، لە نێو نێوك و نێو جەرگەی گەردیلەدا دەیانهێڵێتەوە و، بەوەش گەردیلە دروست دەبێ.

ئنجا ئەو چوار هێزە هەر كامیان، بە تۆسقاڵێك كەمتر یان زیاتر بووایە، ئەم گەردوونەت نەدەبینی، یانی: ئەگەر هێزی ڕاكێشان لەو ئەندازەیەی كە ئێستا هەیە، كە هێزی ڕاكێشان (قُوَّةُ الجاذِبِيَّة)، ئەم كەهكەشانانەی هەموو ڕاگرتوون، بێ هێزترین هێزە، لەنێو چوار هێزەكەدا، هەروەك هێزی كەهرۆموگناتیسیی و هێزی نێوكیی بەهێز، ئەوانە بەهێزترین هێزن، كە نێو ماددە، نێو گەردیلە ڕادەگرن، ئنجا دەڵێن: هەر كامێك لەوانە، یەك تۆز كەمتر بووایە، یان زیاتر بووایە، بە كەڵك نەدەهات.

**٣- ژمارەی كەهكەشانەكانی گەردوون:**

ئەم گەردوونەی ئێمە، دوا بیردۆزە كە زانایان پێی گەیشتوون، لە بارەی ژمارەی كەهكەشانەكانەوە، ئەوەیە كە ژمارەی كەهكەشانەكانی گەردوون بریتیە: لە (یەك ملیۆن ملیۆن)، (یەك تریلیۆن)، واتە: یەك تریلیۆن كەهكەشان، دەشتوانین بڵێین: (هەزار ملیار)، پێشتر پێیان وابوو چەند ملیۆنێكن، دوایی گوتیان: نەخێر،

چەند ملیارێکن، دوایی گەیاندیانە دوو سەد ملیار، بەڵام دوا بیردۆزە ئەوەیە کە بەلای کەمەوە هەزار ملیار کەهکەشان لە گەردووندا هەیە، واتە: ژمارەیەك دابنێین دوازدە سفری لەپێشەوە بێ (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠)، ئەوەندە کەهکەشان لە گەردووندا هەیە، ئەو کەهکەشانانە لەچی پێکهاتوون؟ کەهکەشانەکەی ئێمە کە پێی دەگوترێ: ڕێی کاکێشان، بە عەرەبیی: (دَرْبُ التَّبَّانْ)، هەروەها بە ئینگلیزیی پێی دەگوترێ: (milk way)، واتە: ڕێی شیریی، بە فارسیش پێی دەگوترێ: (راهی شیری)، ئەو کەهکەشانەی ئێمە ژمارەی ئەستێرەکانی بریتیە: لە (یەك تریلیۆن) ئەستێرە، یەکێك لە ئەستێرەکانی، خۆرەکەی ئێمەیە، خۆری ئێمە یەکێکە لە ئەستێرەکان، لە سووچێکی ئەو کەهکەشانەوە، خۆری ئێمەش خۆی و کۆمەڵەکەی، کە نۆ خڕۆکەی بە دەوردا دەسووڕێنەوە، یەکێ لە خڕۆکەکان کە بە دەوریدا دەسووڕێتەوە، بریتیە: لە زەوی، ئەوانی دیکەش: (مەرریخ و زوحەل و عەتتاردو موشتەریی و ئۆرانۆس و نیبتۆن و بلۆتۆو زوهەرە)، ئنجا خۆری ئێمە یەکێکە لە (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ئەستێرە کە لە کەهکەشانی ڕێی کاکێشاندا هەن، ئەستێرەکانی دیکەشی وەك خۆرن و هەیە گەورەترەو هەیە گچکەترە.

کەهکەشانەکانی دیکەش هەر بەو شێوەیەن و بگرە هەیانە زۆر لە کەهکەشانی (ڕێی کاکێشان) گەورەترە.

کەواتە: ئەم گەردوونە زۆر قەڵەباڵغە، زۆر فراوانە و، بەردەوامیش لێك دەکشێ، کە ئەویش لە سوورەتی (الذاريات)دا خوا ئاماژەی پێ دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ۝٤٧ ﴾، واتە: ئێمە ئاسمانمان بە هێزی خۆمان دروست کردووەو ئێمە لێکیشیدەکێشینەوە، فراوانی دەکەین.

ئەوەش نوێترین بیردۆزەیە، کە گەردوون بەردەوام لە لێککشانیش دایە.

## تەوەری سێیەم: خۆر و کۆمەڵەی خۆر:

ئنجا دێینە سەر باسی خۆر و کۆمەڵەی خۆر:

**١- دووریی نێوان زەویی و خۆر:**

ئەو ماوە (مسافة)یەی نێوان خۆر و زەوی، بریتییە لە سەدو پەنجا ملیۆن (١٥٠,٠٠٠,٠٠٠) کیلۆمەتر، واتە: ئێمە (١٥٠,٠٠٠,٠٠٠) کیلۆمەتر لە خۆرەوە دوورین، تیشکی خۆریش بە هەشت خولەك دەگاتە ئێمە، تیشکی خۆر کە لە چرکەیەکدا (٣٠٠٠٠٠) کیلۆمەتر دەبڕێ، بە هەشت خولەك لە خۆرەوە دەگاتە زەوی و، ئەو سەدو پەنجا ملیۆن کیلۆمەترە دەبڕێ، ئنجا ئەگەر ئەو ماوەیەی ئێمە لە خۆرەوە دوورین، نیزیکتر بووایە، ژیان بە کەڵك نەدەهات و سەر زەوی دەپڕووکا، ئەگەر دوورتریش بووایە بە کەڵك نەدەهات و سەر زەوی دەبووە بەستەڵەك، بەڵام خوا ﷻ مەسافەیەکی بۆ هەڵبژاردوە نە بسووتێ، نە ببێتە بەستەڵەك و ژیانی مرۆڤ لەسەری بسووڕێ، ئەوەش ئەندازەگیرییەکەیە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾ القمر، ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا﴾.

**٢- دووریی نێوان مانگ و زەوی:**

لە نێوان سێ سەدو هەشتا هەزار (٣٨٠,٠٠٠) کیلۆمەتر تاکو چوار سەد هەزار (٤٠٠,٠٠٠) کیلۆمەترە، یان چوار سەدو بیست هەزار (٤٢٠,٠٠٠) کیلۆمەتر، چونکە مانگ کاتێ بە دەوری زەوییدا دەخولێتەوە، دوور دەکەوێتەوەو نیزیك دەکەوێتەوە، هەر لە یەك سووڕگەدا نییە، دووریی و نیزیکیی دەبێ، ئنجا ئەو ماوەیە ئەگەر زۆرتر بووایە، هەڵکشان و داکشان (المدُّ والجَزْر) ئۆقیانووسەکان زیاتر دەبوو، کە ئێستا دەوری: دە دوازدە (١٠ - ١٢) مەتر بەرز دەبنەوە، ئەو کاتە ئەگەر نزیکتر بووایە (٣٠٠)، (٤٠٠) مەتر، هەڵدەکشان و زۆربەی ئەو وڵاتانەی کە لە کەنارەکانی دەریاکانن، غەرق دەبوون، ئەگەر دوورتریش بووایە، ئەو کاتە ئەو

هەڵکشان و داکشانە بەو شێوەیە نەدەبوو، واتە: ئەو هێزی کێشندەیەی نێوان زەویی و مانگیش بەستراوەتەوە بەو ئەندازە دوورییەوە کە خوا دیاریکردوە، کە لە نێوانی سێ سەدو هەندێك هەزار کیلۆمەتر، تاکو چوار سەدو هەندێك هەزار کیلۆمەتر دایە.

٣- هێزی کێشندەی نێوان زەویی و مانگ:

ئەو هێزی کێشندەیەی زەویی و مانگ پێکەوە دەبەستێتەوە، یەکجار بەهێزە، بە قەدەر کێبڵێك کە تیرەکەی پەنجا (٥٠) کیلۆمەتر بێ و لە ماددەی پۆڵا بێ، ئەو هێزی کێشندەی کە زەویی و مانگ پێکەوە دەبەستێتەوە، کە ڕاستەوخۆ کاریگەریی هەیە بۆ سەر هەڵکشان و داکشانی زەریاکان، دەیانشڵقێنێ بەردەوام، هەروەها کاریگەریی هەیە بۆ سەر بەرگە ئاویی و، بەرگە هەوایی دەوری زەوی.

## تەوەری چوارەم: خڕۆکەی زەوی:

ئنجا دێین بۆ باسی زەوی خۆمان:

**یەك: سێ بەرگەکەی زەوی:**

**١- زەوی بە سێ بەرگ (غلاف) دەورە دراوە:**

**أ- بەرگە هەوایی:**

ئەو بەرگە هەواییە بەرزییەکەی تاکو هەزار (١٠٠٠) کیلۆمەتر دەڕوا، بەڵکو هەندێك دەڵێن: زیاتریش، ئەو بەرگە هەواییەش حەوت چینە، زەوی بۆ هەر شوێنێك دەڕوات ئەو بەرگە هەواییەی هەر بە دەورەوەیە، ئەگەر ئەو بەرگە هەواییە نەبووایە، چیمان لێ دەهات؟

**یەکەم:** ئێمە ئۆکسجینمان دەست نەدەکەوت، وەك خڕۆکەکانی دیکە، هەر چەندە باس دەکەن، ئەوە خەڵك ناوی خۆی نووسیوە بۆ سەر مەرریخ! ئنجا هەندێ کەس وایان

زانیوە ناوی خۆیان نووسیوە بۆ ئەوەی بچن، نازانن ناوی خۆیان نووسیوە: ناوەکەیان بچێ بۆ ئەوێ، نەك خۆیان بچن، بە هەر حاڵ، نەك بۆ سەر مەرریخ، بۆ مانگیش کە دەچن، دەبێ لێرەوە لە هەوای زەوییەوە هەوا (ئۆکسجین) لەگەڵ خۆیان دا ببەن، ئەگەرنا لە بەرگە هەوای دەوری مانگ، نەك هەر ئۆکسجینی هێندە تێدا نیە، کە هەڵیمژن، بەڵکو هەر گوێیان لە قسەی یەکدیش نابێ و، دەبێ بە جیهاز قسە لەگەڵ یەکدیدا بکەن، چونکە هەوای لێ نیە قسەکان نەقڵ بکات، شەپۆلی دەنگەکە نەقڵ بکات و ببیستێ، بە ئامێر نەبێ لەوێ کەس گوێی لە قسەی کەس نابێ.

دووەم: ئەو بەرگە هەوایە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ۖ وَهُمْ عَنْ ءَايَٰتِهَا مُعْرِضُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾الأنبياء، واتە: سەرەوەی ئەوامان کردوە بە سەقفێکی پارێزراو، بەڵام ئەوانە لە ئایەتەکان (نیشانەکان)ی ئاسمان پشت هەڵدەکەن، سەرنجیان نادەن (یان: وەك نیشانەی خوا تەماشایان ناکەن).

زانایان دەڵێن: ئەگەر ئەو بەرگە هەوایە نەبووایە، سەر زەوی ئێمە دەبوو بە خۆڵەمێش، ڕۆژانە بەلای کەمەوە ملیۆنێك پارچە پارچە ئەستێرەو خڕۆکە دێنە نێو مەودای هێزی ڕاکێشانی زەوییەوە، بەرەو زەوی دێن، بەڵام ئەو بەرگە هەواییە کە بە هەزار (١٠٠٠) کیلۆمەتر بەرز مەزەندە دەکرێ، هەموو ئەوانە دەسووتێنێ، جار جارێك ئەگەر پارچەیەك زۆر گەورە بێ، بەشێکی لێ دەکەوێتە زەوی، وەك کاتی خۆی لە (سیبیریا) یەکێك کەوتوە، لە ئەمریکا یەکێك کەوتوە و، ئەوەش جار جارێك، بۆ ئەوەی خوای میهرەبان پێمان بفەرموێ: ئەو پارچانەی بەرەو زەوی دێن، ئەگەر ئەو بەرگە هەوایە نەبووایەو ئەمان سووتاندبانایە، زۆر خراپتان بەسەر دەهات.

سێیەم: ئەو بەرگە هەواییە، کاتێك هەڵمی ئاو لە دەریاکانەوە دێ بەهۆی تیشکی خۆرەوەو بەرزبێتەوە، ئەو بەرگە هەواییە لە نێو خۆیدا هەورمان بۆ دروست دەکات.

چوارەم: دیسان بەرگە هەواییە کە لە تیشکە زیان بەخشەکانمان دەپارێزێ، بەتایبەت چینی ئۆزۆن، کە تیشکی ژێر سوور و تیشکی سەرووی وەنەوشەیی، ڕێگا نادات بێنە

مەودای زەوییەوە، جگە لەو ئەندازەیەی پێویستە بۆ ژیان، بۆیە کاتێك بەشەر دەستکاریی سروشت دەکات و، دەستکاریی ژینگە دەکات بە خراپە، لەبەر تەماع کە کارگەکانی چەك ئەو دووکەڵ و ژەهرانە فڕێ دەدەنە نێو هەوا، دەبێتە هۆی بێ هێزکردن و کونکردنی چینی ئۆزۆن و، سەرەنجام ئەوە ڕوو دەدات کە ئێستا دەیبیستین، کە بەستەڵەکەکانی سەرووی دنیا دەتوێنەوە و، ئەو تیشکە زیان بەخشانە دێنە نێو مەودای هێزی ڕاکێشانی زەوییەوە و، بەشەر و ژیانداران بە گشتیی و، ڕووەکیش هەموویان لێی تووشی زەرەر دەبن، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾الروم، واتە: تێکدان و خراپەکاریی و وشکانیی و دەریای گرتەوە، بە هۆی کردەی دەستی خەڵکەوە، تاکو بەشێك لەوەی دەیکەن، پێیان بچێژێ، بەڵکو بگەڕێنەوە.

پێنجەم: ڕێژەی توخمەکانی نێو بەرگە هەوا: ئۆکسجین لە سەدا (٢١)ی بەرگە هەوا پێك دێنێ، نایترۆجین لە سەدا (٧٨)ی پێك دێنێ، بە نیزیك کراوەیی، بەڵام دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لە سەدا سفر و لە دەیا سێ (٠،٣٪)، پێك دێنێ و، ئەوەی دەشمێنێتەوە توخمەکانی دیکە پێکی دێنن، ئنجا ئەگەر ڕێژەی ئۆکسجین لە سەدا (٢١٪) زیاتر بووایە، دەنکە شقارتەیەکت لێدابایە، دنیا گڕی دەگرت و، ئەگەر دووەم ئۆکسیدی کاربۆن زیاتر بووایە، خەڵك تەنگە نەفەس دەبوو.

شەشەم: پاشان ئەو هاوسەنگییەی نێوان ژیانداران و ڕووەك: دووم ئۆکسیدی کاربۆن مرۆڤ دەیداتەوەو وەك زبڵ و پاشەڕۆك، فڕێی دەدات، بەڵام دارستان و ڕووەك شیناورد، دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دەخۆن، وەك خۆراك، ئەوەی زبڵی ئێمەیە خۆراکی ئەوانە، بە پێچەوانەوە: ڕووەك و دارو درەختەکان ئۆکسجین فڕێ دەدەن، وەك زبڵ و ئێمەش وەك خۆراك دەیخۆین، کە ئەگەر ئەو هاوسەنگییە نەبووایە، لە مێژ بوو هەناسە هەڵمژینی مرۆڤ و ژیانداران، ئۆکسجینیان تەواو کردبوو لە بەرگە هەوادا، هەر وەك لە مێژیش بوو، هەناسە هەڵمژین و تیشکە پێکهاتنی کە ڕووەك دەیکات بەهۆی دووەم ئۆکسیدی کاربۆنەوە، دووەم ئۆکسیدی کاربۆنیان تەواو کردبوو، بەڵام خوا ئەو هاوسەنگییەی بەو شێوەیە ڕاگرتوە، ئەوەش هەمووی لە ئەندازەگیرییەکانی خوای پەروەردگارە.

**ب- بەرگە ئاویی دەوری زەویی:**

ئەگەر بێینە سەر بەرگی دووەم، لە دوای بەرگە هەوا، بەرگە ئاوییشمان هەیە، بەرگێکی ئاویی (غلاف مائي) دەوری زەوی داوە، زەوی هەمووی یەک لەسەر چوار (٤/١)ی وشکانییەو، سێ لەسەر چوار (٤/٣)ی دەریایە، ئەگەرنا ئێمە ئاوی شیرینمان لە کوێ دەبێ! دەبێ تیشکی خۆر لەو زەریاو ئۆقیانووسە گەورانە بدات، کە سێ لەسەر چواری زەوییان داپۆشیوە، ئنجا هەڵم لەسەر ئەو زەریاو ئۆقیانووسانە پەیدا دەکات و، ئەو شەپۆلانەی پەیدا دەبن بە هۆی فشاری جۆراوجۆری هەواو هەڵکشان و داکشانی زەریاکانەوە، لە ئەنجامی هێزی ڕاکێشانی نێوان مانگ و زەوییەوە، ئەو شەپۆلانە، با دروست دەکەن، ئەو بایەش ئەو هەڵمە لەگەڵ خۆی دەبات، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَامًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ ﴿٤٣﴾ ﴾النور، واتە: ئایا نابینی چۆن خوا هەورەکان لێ دەخوڕێ! دوایی پێکیەوە دەنووسێنێ (پارچەکان (جزئيات)ی ئەو هەڵمە ناوە) دوایی کەڵەکەی دەکات لەسەر یەك، دوایی ئاو دەبینی لێی دێتە خوارێ.

ئەوە بەنسبەت چۆنیەتی دروستبوونی هەور و بارانەوە، بەنسبەت پاڵپێوەنانی هەورانیش بەهۆی (با)وە فەرموویەتی: ﴿ وَاللَّهُ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَاهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ ﴿٩﴾ ﴾فاطر، واتە: خوا بایەکان دەنێرێ، هەوران پەیدا دەکەن، هەوران دەورووژێنن، ئنجا دەیبەین بۆ وڵاتێك کە مردووە، لە شوێنێکی دیکەدا دوای باسی ئاوو هەوران و داباریی ئاوی شیرین، دەفەرموێ: ﴿ فَأَنشَرْنَا بِهِ بَلْدَةً مَّيْتًا ﴿١١﴾ ﴾الزخرف، زەوییەکی مردوومان پێ زیندوو کردەوە.

کەواتــــە:

یەکەم: ئەو بەرگە ئاوییەش سوودی هەرەگەورەی پەیدابوونی (ئاوی شیرین)ە، ئەگەرنا ئاوی ئۆقیانووسەکان هەمووی تاڵ و سوێرەو، هەر کەسێك کە بیخواتەوە هەر پێی

دەمرێ، بەڵام ئاوی شیرینمان لە ڕێی تەرزە و بەفر و بارانەوە دەست دەکەوێ، کە بەرهەمی هەورانن و، ئەوانیش بەرهەمی ئەو هەڵمەن کە لە ئۆقیانووسە گەورەکانەوە کە تیشکی خۆر لێیان دەدات و، دەبێتە هەڵم و با لەگەڵ خۆی دەیهێنێ، پەیدا دەبن بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾الواقعة، واتە: ئایا ئەو ئاوە دەبینن کە دەیخۆنەوە، ئایا ئێوە لە هەور ناردووتانە خوارێ، یان ئێمە ناردوومانەتە خوار؟ ئەگەر ویستبامان تاڵ و تفتمان دەکرد، {یانی: نەماندەپاڵاوت و هەر بە تاڵ و تفتیی دەهاتە خوار} بۆچی سوپاسگوزاریی ناکەن؟

دووەم: ئەو بەرگە ئاوییە، ئەو هەموو ژیاندارانەی تێدان، کە ژیانی زۆر کەس لەسەر بەرهەمی دەریاکانە، هەر لە ماسییەوە تاکو هەموو ژیاندارەکانی دیکە.

سێیەم: ئەو هەموو سەفەر و هاتن و چوون و، کەل وپەل گواستنەوەیە بە دەریایەکاندا، هەروەك چۆن بە هەواشدا بە فڕۆکە، سەفەر و هاموشۆیەکی زۆری بەشەر هەیە.

ج- بەرگە خاکیی زەوی:

زەوی بەرگێکی دیکەشی هەیە کە بریتییە لە: بەرگی گڵیی، خاکیی (الغِلافُ الـتُّرابِي) ئەو بەرگە گڵییە، ئەویش لە هەندێ شوێن چەند کیلۆمەترێك قووڵە و، ئەو بەرگە گڵییەش هەموو ژیانی ئێمەی پێوە بەستراوە، کشتوکاڵی لەسەر دەکەین، ئاودێریی لەسەر دەکەین و، هەموو جۆرەکانی ڕووەك، دار و درەخت، دانەوێڵە و دەغڵ و دان، میوەجات، سەوزە و تەرەکار، هەموویی پەیوەندیی بەو بەرگە گڵییەوە هەیە، ئەگەرنا ئەگەر ئەو گڵ (تراب)ە نەبووایە، هیچ شتێك سەوز نەدەبوو لەسەر زەوی، ئەوە بە نسبەت سێ بەرگەکەی زەوییەوە.

دوو: جووڵەو سووڕانەوەکانی زەوی:

ئنجا با بێینە سەر باسی جووڵەکانی زەوی، کە ژیانی ئێمە زۆر بەو جووڵانەوانەی زەوییەوە پەیوەستە.

١- زەوی لە دەقیقەیەکدا، دەوری (٣٠) کیلۆمەتر دەبڕێ و بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، ئنجا لە ئەنجامی ئەو خوولانەوەیەی بە دەوری خۆیدا، لە بەرانبەری خۆردا، شەو و ڕۆژ دروست دەبن، کە ئەگەر خێراتر خولابایەوە، شەو و ڕۆژ لە جیاتی بە هاوکۆ (معدّل) ی (١٢) بە (١٢) سەعات بن، کە ئەوانیش کورت و درێژییان دەبێ و یەکێکیان دەگاتە (٨)، ئەوی دیکە دەبێتە (١٦)ەو، یاخود دەبێتە (١٠)ەو، ئەوی دیکە دەبێتە (١٤)ەو، کورت و درێژیی دەکەن[1]، بەڵام بە هاوکۆیی (١٢) بە (١٢) سەعاتن، ئنجا ئەگەر زەوی خێراتر خولابایەوە بە دەوری خۆیدا، لە بەرامبەری خۆردا، شەو و ڕۆژ خێراتر دەهاتن و، ئەگەر سستتر خولابایەوە، شەو و ڕۆژ درەنگتر دەهاتن، ئەگەر شەوو ڕۆژ خێراتر هاتبان ژیانی بەشەر وەك ئێستا نەدەبوو، ئینسان دەفریای هیچ نەدەکەوت، ئەگەر سستتریش خولابایەوە، بەڕۆژێ دنیا زۆر گەرم دەبوو، بەشەوێش دنیا زۆر سارد دەبوو.

٢- زەوی وێڕای ئەوەی بەدوای خۆیدا دەخولێتەوە، لە ماوەی (٢٤) سەعاتدا، خولێك بە دەوری خۆیدا دەکات لە بەرانبەری خۆردا بە خێرایی دەورێ (٣٠) کیلۆمەتر لە دەقیقەیەکدا، بە دەوری خۆریشدا دەسووڕێتەوە بە خێرایی (٣٠) کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا، واتە: شەست ئەوەندەی خێرایی خولانەوەی بە دەوری خۆیدا، بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە و، لە چرکەیەکدا (٣٠) کیلۆمەتر دەبڕێ، کە لە ئەنجامی سووڕانەوەشی بە دەوری خۆردا، چوار کەشەکانی ساڵ و کۆمەڵێك گۆڕانکاریی دیکە لەسەر زەوی دەبن، کە بۆ ژیانی مرۆڤ پێویستن.

---

(١) بەڵام لەلای دوو جەمسەری باکوور و باشووری زەویی، ڕێژەی درێژیی و کورتیی شەوگار و ڕۆژگار زۆر زیاترە، بۆ نموونە: لە ساڵی (٢٠١٤ز)دا سەفەرێکی سوێد و فنلەندا و نەرویجیان کرد، ڕۆژ دەوری بیست (٢٠) سەعات و، شەو دەوری چوار (٤) سەعات، بوون!

## تەوەری پێنجەم: جەستەی مرۆڤ:

بێگومان تێکڕای دروستکراوانی خوا جێی تێڕامان وردبوونەوەن، چونکە خوا هەرکامیانی بە باشترین شێوە دروستکردوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ﴾ النمل -٨٨-، چ سەرنجی رووەکەکان بدەین، چ تەماشای ژیانداران بکەین: ژیاندارانی ژێر زەوی، ئەو هەموو بەکتریاو میکرۆب و کرم و دەعبایە هەن، کە بۆ زەوی پێویستن، زەوی شی دەکەنەوە، پاشان ژیاندارانی سەر زەوی کە چەندان جۆرە ژیاندارن، هەندێکیان دەخشێن، خشۆکن، هەندێکیان بە دوو پێیان دەڕۆن، هەندێکیان بە چوار پێیان دەڕۆن، هەندێکیان بە زیاتر لەوانە دەڕۆن، لە زیندەوەران، پاشان ژیاندارانی نێو دەریا و، ئنجا ژیاندارانی نێو هەوا، کە هەر جۆرێکیان بە ملیارانن، هەر کامێك لەوانەش خوا ﷻ بە شێوەیەك دروستیکردوە و ژیانی ڕێکخستوە و ڕێنمایی کردوە، کە شایستەی حیکمەت و لێزانیی و زانیاریی بێ سنووری خوای پەروەردگارە، کە لەو سەرچاوەیەدا کە ئاماژەم پێدا[1]، چەند نموونەیەکم هێناوەتەوە لە: پەڕەوەران، زیندەوەران، ژیانداران بەگیشتیی.

بە نسبەت مرۆڤیشەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الذاریات، هەروەها لە خۆتاندا بۆچی سەرنج نادەن؟ چۆن دروست بوون و لەچی پێکهاتوون؟ لە ڕاستییدا جەستەی مرۆڤ دەتوانین بیچوێنین بە شارێکەوە، بەڵکو بە دەوڵەتێکەوە نەك بە شارێکەوە، چونکە هەموو ئەو وەزارەتانەی کە لە دەوڵەتێکدا هەن، بەرامبەرەکانیان لە جەستەی مرۆڤدا هەن، بۆ وێنە:

عەقڵ و مێشکی مرۆڤ، دەوری وەزارەتی نەخشە دانان و پلان دانان دەبینێ.

هەروەها پێنج هەستەکان، دەوری وەزارەتەکانی پەیوەندییەکان، دەبینن، لەڕێی چاوەوە پەیوەندیی دەکەی و، لە ڕێی گوێوە پەیوەندیی دەکەی و... هتد.

زمان دەوری وەزارەتی ڕاگەیاندن دەبینێ.

---

(١) درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد.

هەروەها کۆئەندامەکانی هەرس، هەناسەدان، سووڕی خوێن، جیهازی لیمفاویی، پەیکەری ئێسک، پێست، هەر کامێک لەوانە تەشبیە دەکرێ بە یەکێك لە وەزارەتەکانی کە لە دەوڵەتێکدا هەیە، بۆیە شاعیرێك دەڵێ:

أَتَحْسَبُ أَنَّكَ جُرْمٌ صَغِيرٌ        وَفِيكَ انطوى العَالَمُ الأَكْبَرُ

تۆ پێت وایە شتێکی بچووکی، لە حاڵێکدا کە جیهانی گەورە لە تۆدا پوختەبۆتەوە، ئەی مرۆڤ!

هەڵبەتە ئەوە کورتەو گوشراوێکی زۆر کەم بوو، لە بارەی ڕوونکردنەوەی چەمکی ئەو ئایەتە موبارەکە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴾، خوا هەموو شتێکی هێناوەتە دی و، ئەندازەگیریی بۆ کردوە، بە ئەندازەگیرییەکی زۆر سەرسوڕهێنەر.

**مەسەلەی دووەم:**

**تۆمەتبارکردنی بێبڕوایان بۆ قورئان، کە درۆی هەڵبەستراوە، بە هاوکاریی کەسانی دیکە و، ئەفسانەی پێشینانەو، بەسەر موحەممەددا خوێندراوەتەوەو داوای کردوە بۆی بنووسرێتەوە! وەڵامدانەوەی خوای زاناش بۆ ئەو تۆمەتانە، کە دابەزێنەری قورئان: زانای نهێنییەکانی نێو ئاسمان و زەوییە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ ٱفْتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيْهِ قَوْمٌ ءَاخَرُونَ ۖ فَقَدْ جَآءُو ظُلْمًا وَزُورًا ﴿٤﴾ وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ٱكْتَتَبَهَا فَهِىَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٥﴾ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ ﴾، هەروەها ئەوانەی بێبڕوان گوتیان، لێرەدا خوا ﷻ بە نازناوی ﴿ كَفَرُوٓاْ ﴾، ئەوانە ناو دێنێ، چونکە: (**الإِظْهَارُ لإِفَادَةِ عِلَّةِ قَوْلِهِم: إِنَّهُم كَافِرُونَ**)، لێرە ناوەکەیانی دەرخستوە، ئەگەرنا پێشێ ناوەکەیانی دەرنەخستوە، ئەمە بۆ ئەوەیە، ئەوە بگەیەنێ کە بۆچی قسەی وا دەکەن؟ ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ ﴾، ئەوانەی کە هەق دەپۆشن، یان: ﴿ كَفَرُوٓاْ ﴾، ئەوانەی سپڵەو ناسوپاسن، چونکە (كُفر)، بە مانای (بێبڕوایی) دێ، کە بێبڕوایی لە ئەصڵی زماندا لە: (كَفَرَ): (سَتَرَ)ەوەیە، هەروەها (كُفر) بە مانای سپڵەییش دێ، کە ئەویش یانی: چاکەی خوای پەروەردگار نادیدە بگیرێ، هەردووکیان دەچنەوە بۆ ڕیشە زمانەوانییەکە، ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان، ئەوانەی ناسوپاسن، گوتیان، واتە: لەبەر ئەوەی بێبڕواو ناسپاسن، بۆیە وایانگوت، بۆیە خوای کارزان لێرەدا لەجیاتی پەنهانکراو (مُضمَر)، دەرخراو (مُظْهَر)ی، بەکار هێناوە.

٢)- ﴿ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ ٱفْتَرَىٰهُ ﴾، واتە: ئەم قورئانە، تەنیا درۆیەکەو هەڵیبەستوە، (**الإِفْكُ: الكَذِبُ، وَالإِفْتِرَاءُ: الإِختِلاقُ**)، (إفك) درۆیەو، (إفتراء) هەڵبەستنە، ئەمە هەم لە

سوورەتی (الأنعام)دا، خوای پەروەردگار باسی کردوە: ﴿ قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾، واتە: ئێمە بە دڵنیایی دەزانین ئەوەی کە دەیڵێن تۆ دڵتەنگ دەکات، ئەوان تۆ بە درۆ نازانن، بەڵکو نکووڵیی لە ئایەتەکانی خوا دەکەن.

لە سووڕەتی (النحل)یشدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئێمە دەزانین ئەوان دەڵێن: ئەوە مرۆڤێك فێری کردوە، بەڵام ئەوەی کە ئاماژەی پێدەکەن (تۆی فێر کردوە) ئەعجەمییە، (غوڵامێکی نەصرانیی بوو، ئاسنگەر بوو، ناوی یەسار بوو، یان ناوی نەصر بوو، لە چەند ڕیوایەتێکدا هاتوە، گوایە پێغەمبەر ﷺ لەوەوە فێر بووە! خوا دەفەرموێ: بەڵام گرفتەکە ئەوەیە ئەو عەرەبیی نازانێ و ئەعجەمییە) بەڵام ئەم قورئانە زمانێکی عەرەبیی زۆر ڕۆشنە!! زمانی عەرەبیی یانی: ڕۆشن، (أَعرَبَ عَن رَأيِهِ)، واتە: ڕای خۆی ڕۆشنکردەوە و دەریخست، زمانی عەرەبیی بۆیە عەرەب ناویان لە زمانی خۆیان ناوە: زمانی عەرەبیی، چونکە زمانەکەی خۆیان پێ ڕۆشن بووە و، غەیری زمانەکەی خۆیان ناوناوە (عەجەمیی) یان (ئەعجەمیی)، لەبەرئەوەی پێیان نارۆشن بووە، ئنجا هەموو کەس زمانەکەی خۆی پێ ڕۆشنە و، زمانێ کە تێی ناگات، پێی نارۆشنە.

٣)- ﴿ وَأَعَانَهُۥ عَلَيْهِ قَوْمٌ ءَاخَرُونَ ﴾، هەروەها دەیانگوت: کەسانێکی دیکە، کۆمەڵێکی دیکە، هاوکاریی (موحەممەد)یان کردوە (بۆ هەڵبەستنی ئەم قورئانە)!!

٤)- ﴿ فَقَدْ جَآءُو ظُلْمًا وَزُورًا ﴾، خوا تەنیا ئەوەندە وەڵام دەداتەوە، دەفەرموێ: بەڕاستیی ئەوان ستەم و درۆیان هێنا (لەو قسەیاندا).

کە دەفەرموێ: ﴿ جَآءُو ﴾، خوا ﷻ دەیتوانی بفەرموێ: (فَقَد ظَلَمُوا وَقَالُوا زُورًا)، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ جَآءُو ظُلْمًا وَزُورًا ﴾، ستەمیان هێناو درۆیان هێنا،

چونکە هێنان مەجازە بۆ گرنگیی دان بەکارێك، کەسێك بە مەبەستەوە بیهێنێ، چونکە کەسێك بیەوێ گرنگیی بە شتێك بدات، بۆ لای دەچێ و دەیهێنێ.

کەواتە: ﴿فَقَدْ جَآءُو ظُلْمًا وَزُورًا﴾، واتە: زۆر بە نەخشەو پلانەوە، ئەو قسە ستەمکارانەیە و ئەو قسە درۆیانە دەکەن، خوی زانا و شارەزا بەس ئەوەندە بە کاف دەزانێ، ناو لە قسەکەیان بنێ ستەم و درۆ، چونکە بەڕاستیی کەسێك بڵێ: موحەممەد ﷺ کابرایەکی عەجەمیی فێری کردوە، یان لە غەیری خۆی فێری بووە، یان: خۆی قورئانی داناوە، وەك لە هەندێ شوێنی دیکەدا وا دەڵێن: ﴿ٱفْتَرَىٰهُ﴾، هەر کەسێك ئەو تۆمەتە پاڵداتە لای موحەممەد ﷺ و پاڵداتە لای قورئان، بەڕاستیی درۆو ستەمی کردوە:

أ- بە نسبەت قورئانەوە ئەوە دیارە، باشە ئەگەر موحەممەد هەڵیبەستوە، ئێوەش فەرموون هەڵبەستن، خوای باڵادەست تەحەددای ئینس و جینی کردوە، پێشێ فەرمووی: وێنەی قورئان بێنن، دوایی فەرمووی: وێنەی دە سوورەت، نەیانتوانی، ئنجا فەرمووی: سوورەتێك بێنن، وەك سوورەتی (العصر)، سوورەتی (الكوثر)، سوورەتی (النصر) کە یەکێ سێ ئایەتن، وێنەی ئەوە بێنن، هەر نەیانتوانی، ئنجا کە نەتانتوانی، کەواتە: واز لەو قسەیە بێنن، بڵێن: بۆ خۆی هەڵیبەستوە، یان کەسی دیکە فێری کردوە، ئەوە بە نسبەت قورئانەوە.

ب- بە نسبەت خودی پێغەمبەریشەوە ﷺ، موحەممەد بە شایەدیی دوژمن و ناحەزەکانی بە (الصَّادِقُ الأَمِين) ڕاستگۆی ئەمیندار، ناسراوە (الأخنس بن شُرَيْق) و ئەبوو جەهل، واتە: عەمری کوڕی هیشام، کە ئەبوو لحەکەمیان پێگوتوە، مشتومڕێکیان دەبێ، ئەخنەس دەڵێ: پێت وایە موحەممەد درۆ بکات؟ (حاشای ئەو)، دەڵێ: نەخێر، درۆمان لێ نەبیستوە! دەڵێ: ئەدی بۆچی بڕوای پێ ناهێنی؟ دەڵێ: ئاخر عەشیرەتی ئێمەو عەشیرەتی (واتە: بنو عبدالشمس) لەگەڵ (بنو هشام)دا، پێشبڕکێمان بوو، ئەوان وایانکردوە، ئێمەش وامانکردوە، ئەوان چاکەیان بووە، ئێمەش چاکەیەکمان کردوە، ئێستا ئەوان دەڵێن: ئێمە

پێغەمبەرێکمان هەیە، ئێمەش چۆن بە دوای پێغەمبەری ئەوان بکەوین، لەو شەڕە عەشیرەتەدا ئێمە دەدۆڕێین، ئەگەر بە دوای پێغەمبەری ئەوان بکەوین[1]، کەواتە: بە نسبەت موحەممەدیشەوە ﷺ کە بڵێن: هەڵیبەستوە، یان لە خەڵکی دیکەوە وەریگرتوە و فێری بووە، شتێکی ستەمەو درۆیە، شتی وا پاڵ بدرێتە لای وی.

٥)- ﴿ وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ٱكْتَتَبَهَا ﴾، هەروەها گوتیان: ئەفسانەی پێشینانە، داوای کردوە بۆی بنووسرێتەوە، ﴿ أَسَٰطِيرُ ﴾، کۆی (أسطورة)یە، واتە: بەسەرهاتێك کە نووسراوەتەوە و گێڕدراوەتەوە، بەڵام بنەمایەکی نیە، ﴿ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، واتە: پێشووەکان.

٦)- ﴿ ٱكْتَتَبَهَا ﴾، (الإكتِتَابُ: إفتِعَالٌ مِنَ الكِتَابَةِ، وَهِيَ تَدُلُّ عَلَى التَكَلُّفِ لِحُصُولِ الفِعلِ، أَي: سَأَلَ مَن يَكتُبُهَا لَهُ أَنْ يَنقُلَهَا، فَكَانَ إِسْنَادُ الكِتَابَةِ إِلَيْهِ مَجَازِيًّا)، دیارە پێغەمبەر ﷺ ئەوان زانیویانە کە خوێندن و نووسینی نیە، بۆیە نەیانتوانیوە بڵێن: خۆی نووسیویەتەوە، بەڵام گوتوویانە: ﴿ ٱكْتَتَبَهَا ﴾ داوای کردوە بۆی بنووسرێتەوە.

وشەی (إكتِتَاب)، (إفتِعَال)ە، لە (كِتَابة)، نووسین، وشەی (إفتِعَال)یش دەلالەت لەسەر تەکەللوف و خۆ ئەزیەتدان دەکات، تاکو ئەو کردەوەیە پەیدادەبێ، واتە: موحەممەد ﷺ داوای کردوە لە کەسێك کە بۆی نەقڵ بکات، کەواتە: نووسینەوەی قورئان، کە پاڵیان داوەتە لای پێغەمبەر ﷺ شتێکی مەجازییە، یانی: داوای کردوە بۆی بنووسرێتەوە.

٧)- ﴿ فَهِىَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴾، کەوابوو بەیانیان و ئێواران بە سەریدا دەخوێندرایەوە، بۆ خۆی دەیبیست و کەسێکیش بۆی دەنووسیەوە! ﴿ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ ﴾، (الإملَاء، وَالإملَال)، بریتییە: لەوە کە قسەیەك بکرێ و، کەسێکی دیکە بێژەکانی بنووسێتەوە و، یاخود لەبەریان بکات.

خوای پەروەردگار ئاوا وەڵامی ئەو قسەو قاڵانە دەداتەوە:

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام، ج١ ص ١٥٩.

٨)- ﴿ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، بلێ: ئەو کەسە دایبەزاندوە، کە نهێنیی نێو ئاسمانەکان و زەوی دەزانێ، ﴿ ٱلسِّرَّ ﴾، کە (أل)ی ناساندن (تعريف)ی لەسەرە و بۆ (جنس)ە، یانی: کەسێك قورئانی دابەزاندوە کە هەرچی نهێنییە لە هەموو ئاسمانەکان و زەوی دا دەیزانێ، واتە: لە گەردووندا، لە ژیانی بەشەردا، لە ژیانی ئاژەڵدا، لە ژیانی ڕووەکدا، لە گەردیلەوە تا کەهکەشان، خوا هەموویان نهێنییەکان دەزانێ و، خوا ﷻ ئەم گەردوونەی بە ئەندازەگیریی دروستکردوە و، جار جار لەم قورئانەدا ئاماژە دەکات بە هەندێك لە نهێنییەکانی کە لە گەردووندا هەن، کە دوای چەندان سەدە، هەندێکیان دوای چواردە سەدە، ئنجا مرۆڤ پێیانگەیشتوە، ئەو نهێنییەی کە بەشەر دوای زەحمەت و لێکۆڵینەوەیەکی زۆر پێی گەیشتوە، خوای پەروەردگار خستوویەتە نێو نێواخنی ڕستەیەکی فەرمایشتەکەیەوە، کە نهێنییەکی زۆر گەورەی گەردوونیشە، کەواتە: کەسێك ئەو قورئانەی دابەزاندوە، کە نهێنیی نێو ئاسمانەکان و زەوی دەزانێ.

٩)- ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

ئەمە لە لایەکەوە: تەماع وەبەرنانیانە کە بگەڕێنەوە، خوا لێبوردەی بە بەزەییە، ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای، لە لایەکی دیکەشەوە: جۆرێکە لە هەڕەشە، واتە: خوا زۆر لێبوردەو بە بەزەییە نەگەرنا، لەسەر ئەو تۆمەت هەڵبەستنە بۆ قورئان، سزای دەدان، بۆیە بترسێن لەوەی دوایی بکەونە بەر کاریگەریی سیفەتەکانی دیکەی خوای پەروەردگار و، شایستەی لێبوردن و بەزەیی نەبن، بەڵکو شایستەی تۆڵە لێستاندنەوەو سزادان بن!

**مەسەلەی سێیەم:**

**بیانووگرتنی کافرەکان بۆ بڕوا نەهێنانیان، بەوە کە پێغەمبەر ﷺ چۆن دەبێ خواردن و خواردنەوەو چوونە بازاڕی هەبێ؟ دەبوایە فریشتەی لەگەڵ بێ، وەك هۆشیارکەرەوە، یان خەزنەی هەبێ، یان باغێکی هەبێ لێی بخوات، بۆ ئەوەی پێویستیی بە کار و کاسبیی و چوونە بازاڕ نەبێ! وەڵامدانەوەی خواش ﷻ کە پێغەمبەر ﷺ لەو شتانە باشتری دەبێ، لە ڕۆژی دوایی دا، پاشان ڕوونکردنەوەی هۆکاری ڕاستەقینەی بێبڕوایی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، کە بریتیە: لە بە درۆ دانانی ڕۆژی دوایی، ئنجا باسی سەرەنجامی شوومی بێبڕوایان و، سەرەنجامی خێری پارێزکاران، لە ڕۆژی دوایی دا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأْكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشِى فِى ٱلْأَسْوَاقِ
لَوْلَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ﴿٧﴾ أَوْ يُلْقَىٰٓ إِلَيْهِ كَنزٌ أَوْ تَكُونُ لَهُۥ
جَنَّةٌ يَأْكُلُ مِنْهَا ۚ وَقَالَ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٨﴾ ٱنظُرْ
كَيْفَ ضَرَبُوا۟ لَكَ ٱلْأَمْثَٰلَ فَضَلُّوا۟ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴿٩﴾ تَبَارَكَ ٱلَّذِىٓ إِن
شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيْرًا مِّن ذَٰلِكَ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَيَجْعَل لَّكَ قُصُورًۢا ﴿١٠﴾ بَلْ
كَذَّبُوا۟ بِٱلسَّاعَةِ ۖ وَأَعْتَدْنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴿١١﴾ إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ سَمِعُوا۟
لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا ﴿١٢﴾ وَإِذَآ أُلْقُوا۟ مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْا۟ هُنَالِكَ ثُبُورًا ﴿١٣﴾ لَّا
تَدْعُوا۟ ٱلْيَوْمَ ثُبُورًا وَٰحِدًا وَٱدْعُوا۟ ثُبُورًا كَثِيرًا ﴿١٤﴾ قُلْ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ ٱلْخُلْدِ
ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۚ كَانَتْ لَهُمْ جَزَآءً وَمَصِيرًا ﴿١٥﴾ لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ خَٰلِدِينَ ۚ
كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْـُٔولًا ﴿١٦﴾ ﴾

## شیکردنەوەی ئەم دە ئایەتە، لە بیست و چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقَالُواْ ﴾، هەروەها (بێبڕوایەکان) گوتیان، کە دەفەرموێ: گوتیان، کێ گوتی؟ ئەمە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، چونکە پێشتر باسیان کراوە: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ إِفۡكٌ ٱفۡتَرَىٰهُ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان گوتیان: ئەم قورئانە تەنیا درۆیەکە هەڵیبەستوە، واتە: پێغەمبەرﷺ موحەممەد هەڵیبەستوە.

٢)- ﴿ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأۡكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشِي فِي ٱلۡأَسۡوَاقِ ﴾، ئەم پێغەمبەرە چییەتی، بۆچی خواردن دەخوات و بە بازاڕاندا دەڕوا؟ ﴿ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ ﴾، ئەمە پرسیارکردنە، پرسیارکردنێکی سەر سوڕماندن (إستِفهامٌ تَعجِيبِيٌّ)، کە بەکارهێنراوە نەك وەك خودی خۆی، بەڵکو لە شتێکدا کە پەلکێشی دەکات و پێویستی دەکات، کە بریتیە لەوەی ئەو موحەممەدە، مادام خواردن دەخوات و بە بازاڕاندا دەڕوات، کەواتە: پێغەمبەر نیە، چونکە سەر سوڕماندن و سەرسوڕمان، نیشانەی ڕاست نەبوونی شتێکە، بەزۆریی وایە لە عورف و باوی زمانی هەموو نەتەوەکاندا، کە گوتت: ئەوە چییە؟ یانی: نکووڵیی لێ دەکەی، هەڵبەتە ئەوان بە توانجەوە گوتووشیانە: ﴿ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ ﴾، چونکە دانیان بەوەدا نەهێناوە، کە ئەوە ڕەوانەکراو و نوێنەری خوای پەروەردگارە، چونکە بە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەو سەرسوڕماندن، پرسیاریان کردوە، دەزانرێ کە مەبەستیان ئەوە نەبووە، دان بەوەدا بێنن کە موحەممەد ﷺ ڕەوانەکراوی خوایە.

کە دەڵێن: ﴿ يَأۡكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشِي فِي ٱلۡأَسۡوَاقِ ﴾، خواردن دەخوات و بە بازاڕاندا دەڕوات، واتە: حاڵی وەك حاڵی خەڵکە، کەواتە: چۆن دەبێ شتێکی لە خەڵك زیاد داوا بکات؟ داوایەکی هەبێ کە جیا بێ لە هی خەڵکی ئاسایی؟ کە بریتیە لەوەی ڕەوانەکراو و، نوێنەری خوایە.

ئنجا ئەوانە سێ شتان پێشنیار دەکەن بۆ پێغەمبەر ﷺ:

٣)- ﴿ لَوۡلَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَلَكٌ ﴾، دەبووایە فریشتەیەکی بۆلا دابەزێ، ﴿ لَوۡلَآ ﴾، لێرەدا: (حَرفُ تَحضِيضٍ مُستَعمَلٌ فِي التَّعجيزِ)، واتە: پیتی هاندانە، بەڵام بەکارهێنراوە

بۆ دەستەوسانکردن، ﴿ لَوْلَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ ﴾، دەبووایە فریشتەیەکی بۆ لا دابەزێ، بۆچی؟

٤)- ﴿ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ﴾، کە لەگەڵیدا ببێتە ترسێنەر و هۆشیارکەرەوە، واتە: هاوکاری بێ.

٥)- ﴿ أَوْ يُلْقَىٰٓ إِلَيْهِ كَنزٌ ﴾، یاخود خەزنەیەکی بۆ فڕێ بدرێ، واتە: خەزنەیەکی بۆ دابەزێنرێ لە ئاسمانەوە.

٦)- ﴿ أَوْ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٌ يَأْكُلُ مِنْهَا ﴾، یاخود باغێکی هەبێ، لێی بخوات، ئەمە خوێندراویشەتەوە: (أَو تَكُونُ لَهُ جَنَّةٌ نَأكُلُ مِنهَا)، لێی بخۆین هەموومان.

ئەم سێ پێشنیارە بۆ پێغەمبەری خوا دەکەن:

١- یان فریشتەیەکی بۆ لا دابەزێ، کە لەگەڵییدا هۆشیارکەرەوە و ئاگادارکەرەوە بێ و هاوکاری بێ.

٢- یاخود خەزنەیەکی لە ئاسمانەوە بۆ دابەزێنرێ، بۆ ئەوەی پێویستیی بە چوونە بازاڕو کار و کاسبیی نەبێ.

٣- یاخود باخێکی هەبێ خۆی لێی بخوات، یاخود خۆشیی و ئێمەش لێی بخۆین.

ئایا خوا ﷻ چۆن وەڵام دەداتەوە؟

٧)- ﴿ وَقَالَ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴾، هەروەها ستەمکارەکان گوتیان: ئێوە بەس شوێنی پیاوێکی جادوو لێکراو دەکەون. کەواتە: وێڕای ئەو ڕەخنەیەی لێیان گرت و گوتیان: ﴿ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأْكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشِى فِى ٱلْأَسْوَاقِ ﴾، ئنجا ﴿ وَقَالَ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، کە بێگومان هەر ئەوانن، بەڵام خوای کاربەجێ لێرەدا باسی ستەمەکەشیان دەکات، ئەگەرنا هەر هاوبەش بۆ خوا دانەر و کافرەکانن، بەڵام بۆیە ناوونیشانەکەی گۆڕیون، تاکو پێغەمبەر ﷺ بزانێ و هەر کەسێك کە قورئان دەخوێنێ،

بزانێ، کە ئەوانە، وێڕای کوفر و هاوبەش بۆ خوا پەیداکردن، سیفەتی ستەمیشیان هەبووە، ستەم لە خۆیان، ستەم لە پێغەمبەر ﷺ، ستەم لە ئایینی خوا.

ستەمکارەکان گوتیان: ئێوە تەنیا شوێن پیاوێکی جادوو لێکراو دەکەون، ئنجا مرۆڤ کە جادووی لێکرا، شێت دەبێ و تێك دەچێ، لێرەش دیسان مەبەست پەیوەست (لازم)ە کەیەتی، کەسێك جادووی لێکرا، جادووەکە پەلکێشی دەکات بەرەو شێت بوون و، حاڵی عەقڵ و هۆش، تێکچوون.

٨)- ﴿ اُنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا لَكَ الْأَمْثَالَ ﴾، سەرنج بدە، چۆن وێنەیان بۆ تۆ هێنانەوە؟ واتە: چۆن تۆیان چواند بە پیاوی جادوو لێکراوەوە، بە پیاوی شێتەوە، تەماشا بکە! تۆ لە لووتکەی عەقڵ و دانایی و وەستایی و فامیدەیی و ڕەوشت بەرزیی و ئاکار پەسندیی دای، کەچی وێنەی کێیان بۆ تۆ هێناوە؟ وێنەی پیاوێکی جادوو لێکراو، یاخود شێت و تێکچوو!

٩)- ﴿ فَضَلُّوا فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴾، گومڕابوون و ناتوانن بەڕێی ڕاست دا بڕۆن، لە ئەنجامی ئەوەدا کە تۆیان وەك حەقیقەتی خۆتیان نەناسی و، تۆیان بەڕاستیی نەناساند، یان خۆیان لە گێلیی دا، ﴿ فَضَلُّوا ﴾، لە ئەنجامی ئەوەدا گومڕا بوون و ڕێیان ون کرد، یان لە ڕێ ون بوون، لە گەیشتنە هەق، یاخود لە دیتنەوەی بەڵگەو نیشانە، لەسەر ئەوە کە ئایا تۆ پێغەمبەری خوای ﷺ؟ کە وای لە واقیع دا، یاخود وەك ئەوان گومان دەبەن، تۆ کەسێکی لافێك لێ دەدەی و داوایەك دەکەی کە هەقت نیە؟ ﴿ فَضَلُّوا ﴾، گومڕا بوون، ﴿ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴾، ئێستا ناتوانن ڕێیە پەیدابکەن، ناتوانن ڕێیە بدۆزنەوە، ئینسان ئەگەر لە ڕێی ئاسایی خۆیەوە بۆ شتێك نەچوو، ئەگەر هەر کەسێك و هەر شتێك وەك حاڵ و واقیعی خۆی لە سەریەتی، نەیناسی و، بەرگێکی دیکەی وەهمیی بەبەردا دەکرد، بە تەئکید ئەو کاتە تووشی سەر گەردانیی و سەر لێشێوان دەبێ، ئنجا ئەو بەرگ بە بەردا کردن و ئەو بەهەڵە ناسینە، چ بەڕاستیی بێ و، ئەو کەسە قەناعەتی وابێ، یاخود خۆ لێ گێل کردن و خۆ لەگێلیی دان بێ، کە بە تەئکید ئەوەی عەرەبە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ خۆ لەگێلیی دان بووە و، لە پشت

پەردەی ڕەشەوە تەماشا کردن و، هەوڵدان بووە بۆ چەواشەکاریی، لەگەڵ خەڵکە ڕەش و ڕووتەکەدا، ئەگەرنا زلە زلەکانیان باش باش موحەممەدیان ﷺ ناسیوە، کە چەند پیاوێکی ڕاستگۆیە و، نەجیبە و، ڕەوشت بەرزە، وەك یەکێکیان جارێك گوتوویەتی: موحەممەد تاکو ئێستا تەمەنی گەیشتۆتە چل (٤٠)ساڵیی درۆی لەگەڵ مرۆڤاندا نەکردوە، تۆ بڵێی لە دوای چل ساڵیی درۆ بە ناوی خواوە بکات؟! (حاشای ئەو) زانیویانە، چۆنە؟ بەڵام لە ئەنجامی دەمارگیریی هۆزو خێڵ گەرایەتییەوە، ئامادە نەبوون، بەڵکو زۆرێك لە بەنوو هاشمیش هەر بڕوایان پێ نەهێناوە، لە ئەنجامی دەمارگیریی و لاساییکردنەوەی کوێرانەی پێشینانیان و، دەست پێوەگرتنی ئەوەی کە باب و باپیران و پێشینانیان لەسەری بینیوە و، دەست لێ بەرنەدانی، ئەوە بۆتە پەرچ و کۆسپێك لەبەردەم بڕوا هێنانیاندا.

ئنجا خوا ﷻ لە وەڵامی کۆی ئەو قسانەیاندا، دەفەرموێ:

١٠)- ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِيٓ إِن شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيۡرٗا مِّن ذَٰلِكَ ﴾، واتە: بەردەوام بەرزو بە پێزە، یاخود بەرزیی و بەپێزیی و بەرەکەتداریی بۆ ئەو زاتەی، کە ئەگەر بیەوێ چاکتر لەوەی پێشنیاری دەکەن، بۆ تۆی دادەنێ، واتە: لە ڕۆژی دوایی دا، چونکە دنیا شوێنی تاقیکردنەوەیە، بەڵام ئەگەر ئەوان پێیان وابێ تۆ مادام پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خوای، دەبێ خوا ڕێزت لێبگرێ، خوا ڕێزت لێدەگرێ، بەڵام لەم دنیایەدا ڕێز لێگرتنی خوا، لەوەدا بەرجەستە نابێ، کە بەهەشتت بۆ بێنێ و، کۆشك و تەلار و خەزنەت بۆ ببارێنێ، چونکە ئێرە شوێنی تاقیکردنەوەیە، بەڵکو ئەو ڕێزو حورمەت و پلەو پایە بەرزەی کە خوای پەروەردگار بە تۆی دەدات، لە ڕۆژی دوایی دا بەرجەستە دەبێ، وەك خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الضحى)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلضُّحَىٰ ۝١ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ۝٢ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ۝٣ وَلَلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لَّكَ مِنَ ٱلۡأُولَىٰ ۝٤ وَلَسَوۡفَ يُعۡطِيكَ رَبُّكَ فَتَرۡضَىٰٓ ۝٥ ﴾، واتە: سوێند بە چێشتەنگاو و، بە شەو کە دادەپۆشێ. پەروەردگارت نەوازی لێهێناوی و نەلێت تووڕە بووە، ڕۆژی دوایی بۆ تۆ لە دنیا چاکترە و، پەروەردگارت هێندەت پێ دەبەخشێ، تاکو ڕازی دەبی.

نا ئەوە لە ڕۆژی دوایی دایە، بۆیە دەفەرموێ: بەردەوام بەرزو بە پێزە ئەو زاتەی، ئەگەر ویستبای چاکتر لەوەی ئەوان پێشنیاری دەکەن، بۆ تۆی دەگێڕاو بۆی دادەنای.

١١)- ﴿ جَنَّٰتٍ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾، چەند باخێك کە ڕووبار گەلیان بەژێردا دەڕۆن، واتە: بەژێر درەختەکانیان دا دەڕۆن، یاخود: بەژێر ئەو کۆشك و تەلارانەدا کە تێیاندان.

١٢)- ﴿ وَيَجۡعَل لَّكَ قُصُورًۢا ﴾، هەروەها چەندان کۆشکیش بۆ تۆ دادەنان، بەڵام ئەوە لە ڕۆژی دوایی دا، ﴿ وَيَجۡعَل لَّكَ قُصُورًۢا ﴾، خوێندراویشەتەوە: (وَيَجعَلُ لَكَ قُصُورًا)، واتە: نەك بە زەنە (جزم)، بەڵکو بە بۆر (ضمّة).

١٣)- ﴿ بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلسَّاعَةِ ﴾، بەڵکو ئەوان ئاخیرزەمان، قیامەت بە درۆ دادەنێن.

خوا ﷻ دێتە سەر باسی هۆکاری ڕاستەقینەی بێبڕوایی ئەوانە، دەفەرموێ: ﴿ بَلۡ ﴾، (إضرَابٌ عَن ضَلالِهِم فِي مَعرِفَةِ الرَّسُول)، واتە: نەك هەر بە هەڵەداچوون و گومڕابوون لە ناسینی تۆدا، لە دۆزینەوەی هەقدا، هۆکارەکە ئەوە نیە کە تۆ نەناسن، یاخود: نەزانن کە قورئان هەقە، ﴿ بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلسَّاعَةِ ﴾، بەڵکو بێبڕوان بە (ساعة)، ئنجا (ساعة) چ مەبەست پێی ئەو کاتە بێ، کە دنیایی تێدا بە کۆتا دێ (ئاخیر زەمان) یاخود: مەبەست پێی کۆی ڕۆژی دوایی بێ، هەم ئەو کاتەی کە دنیای تێدا بە کۆتا دێ، هەم قیامەت و زیندووبوونەوەو هەڵسانەوە، بڕوایان بەوە نیە.

١٤)- ﴿ وَأَعۡتَدۡنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴾، ئەوانەش کە بێبڕوان بە ئاخیر زەمان، یاخود بە ڕۆژی دوایی، ئێمە ئاگرێکی کڵپەدارمان {کە دۆزەخە} بۆ ئامادە کردوون، (سَعِير)، بریتیە لە کڵپە ساندن، گڕو کڵپە، (فَعِيلٌ بِمَعنَى مَفعُول)، یانی: (مَسْعُور)، یانی: کڵپە ساندوو، کڵپە پێسەنراو، داگیرسێنراو، کە مەبەست پێی دۆزەخە، (سَعِير)، یەکێکە لە ناوەکانی دۆزەخ.

ئنجا باسی ئەو دۆزەخە بە کڵپە و بڵێسەیە، دەکات:

١٥)- ﴿إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ﴾، کاتێك دۆزەخ ئەوان دەبینێ لە شوێنێکی دوورەوە، واتە: کاتێك دۆزەخ ئەو بێبڕوایانە دەبینێ، هەر لە دوورڕا:

١٦)- ﴿سَمِعُوا۟ لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا﴾، گوێ بیستی تووڕەیی و پەستییەکەی و هەناسە دانەوەکەی دەبن، هەناسە دەردانی دەبن، دەڵێ: (التَّغَيُّظُ: شِدَّةُ الغَيْظِ، وَهُوَ الغَضَبُ الشَّدِيد)، (تَغَيُّظ)، واتە: زۆر پەستیی، کە بریتیە لە زۆر تووڕەیی، (وَالزَّفِير: إِخْرَاجُ النَّفَس)، (زَفِير)یش، بریتیە لە هەناسە دەردان، هەروەك (شَهِيق) هەناسە هەڵکێشانە، واتە: هەر لە دوورڕا کە دۆزەخ دەبینن، گوێیان لە تووڕەیی و پەستییەکەی دەبێ، کە چۆن دەکوڵێ لەبەر خۆیەوە و ڕقی لێیانە، هەروەها گوێیان لە هەناسە دەردانی دەبێ، ئنجا ئەمە یان هەر بە حەقیقەت وایە، یاخود خوا ﷻ لێرەدا دۆزەخ دەچوێنێ بە دڕندەیەك، یاخود بە مرۆڤێکی زۆر تووڕە، کە ڕقی لە کەسێکە و بەرەو ڕووی دێ و، پیشانی لێ دەخواتەوە، چونکە ئینسان کاتێ زۆر تووڕەو پەست دەبێ، بە قووڵیی هەناسە دەدات و، بە قوڵیی هەناسە هەڵدەکێشێ.

١٧)- ﴿وَإِذَآ أُلْقُوا۟ مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا﴾، کاتێك فڕێ دەدرێنە نێو شوێنێکی تەنگەبەرو تەسکی دۆزەخەوە، ﴿ضَيِّقًا﴾، خوێندراویشەتەوە: (ضَيْقًا)، بەبێ گیرە (شدّة)، ﴿أُلْقُوا۟﴾، یانی: (رُمُوا بِإِهَانَةٍ)، یانی: فڕێ دەدرێن بە سووکیی و بێ نرخییەوە.

١٨)- ﴿مُّقَرَّنِينَ﴾، بە جووتەییەوە، یانی: دوو دوو کەلەپچە کراون، یاخود هەر کامێکیان دەست و پێی پێکەوە کەلەپچە کراون.

١٩)- ﴿دَعَوْا۟ هُنَالِكَ ثُبُورًا﴾، لەو کاتەدا داوای فەوتان دەکەن، ﴿دَعَوْا۟﴾، (الدُّعَاءُ: النِّدَاءُ بِأَعْلَى الصَّوتِ)، (الدعاء) بانگکردنە بە دەنگی هەرە بەرز، چی بانگ دەکەن؟ (ثُبوراً)، (الثُّبُورُ: الهَلاكُ)، دەڵێن: ئەی فەوتان و مەرگ، وەرە دەربازمان بکە لەو حاڵەی تێیداین، بەڵام وەك خوا ﷻ لە بارەی دۆزەخەوە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿١٣﴾﴾الأعلى، دوایی نە تێیدا دەمرێ، نە تێیدا دەژی، نە تێیدا دەمرێ دەربازی بێ، نە تێشیدا دەژی، ئەو ژیانەی کە پێی بگوترێ: ژیان.

ئنجا خوا دەفەرموێ:

٢٠)- ﴿ لَّا تَدْعُوا۟ ٱلْيَوْمَ ثُبُورًا وَٰحِدًا وَٱدْعُوا۟ ثُبُورًا كَثِيرًا ﴾، ئەمڕۆ تەنیا جارێك فەوتان و لەبەین چوون داوا مەکەن، بەڵکو زۆر جاری داوا بکەن، واتە: حاڵ و باڵتان لە دۆزەخدا هی ئەوە نیە، تەنیا جارێك مەرگ بە ئاوات بخوازن، بەڵکو هی ئەوەیە زۆر بە ئاواتی بخوازن، چونکە مەرگ دەبێتە فریاد ڕەسێکی باش بۆ ئێوە کە دەربازتان بکات، لەو حاڵە، ئنجا وای بە حاڵی کەسێك کە مردنی تێدا بە ئاوات بخوازێ! مردنی پێ چاکتر بێ لەو حاڵەی کە تێیدایە، دیارە حاڵێکە لە مردنیش ناخۆشتر!

ئنجا خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

٢١)- ﴿ قُلْ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ ٱلْخُلْدِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾، بڵێ: (لێیان بپرسە) ئایا ئەوە (حاڵێك کە باسکرا، ئەو دۆزەخە بەو شێوەیە) باشترە، یاخود بەهەشتی تێدا هەمیشە مانەوە، بەهەشتی تێدا هەرماو بوون، ئەوەی کە گفت و بەڵێن بە پارێزکاران دراوە (بیچنەتێ) .

وشەی ﴿ خَيْرٌ ﴾، لە ئەسڵدا (أخير)ە، هەر وەك چۆن وشەی (شَرّ)یش، (أشَرّ)ە، بەڵام هەردووکیان هەمزەکەیان لابراوە، چونکە زۆر بەکاردەهێنرێن، کەواتە: ﴿ خَيْرٌ ﴾، یانی: چاکتر، هەر وەك (شَرّ)، یانی: خراپتر، ئایا ئەو حاڵە باشترە کە باسکرا، یاخود بەهەشتێك کە تێیدا هەر ماو و هەمیشەیی دەبن؟

﴿ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾، ئەو (بەهەشت)ەی کە گفت بە پارێزکاران دراوە، یانی: گفت و بەڵێن و موژدە دراوە بە پارێزکاران کە بیچنەتێ.

٢٢)- ﴿ كَانَتْ لَهُمْ جَزَآءً وَمَصِيرًا ﴾، کە ئەو بەهەشتە بۆیان دەبێتە پاداشتیش و دەبێتە سەرەنجامیش، یان: دەبێتە ئەو پاداشتەی پڕ بە پێستیانەو شایستەیانە و، دەبێتە ئەو سەرەنجامەش کە بۆ لای دەچن و پێی دەگەن.

ئنجا ئەو بەهەشتە چۆنە؟ خوا ﷻ بە دوو ڕستەی کورت پێناسەی بەهەشت دەکات:

٢٣)- ﴿ لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ ﴾، بۆ وان لەوێدا هەیە هەرچی بیخوازن!

سبحان اللـه! لـەو پێناسـە کـورت و پـڕ بـە پێسـت و گشـتگیر و هەمـە لایەنـە! ﴿ لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ ﴾، بـۆ وان لـەو بەهەشـتەدا هەیـە، هەرچـی بیانـەوێ، وەك لـە جێیـەکی دیکـەدا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ ...وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ وَأَنتُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٧١﴾ ﴾الزخـرف، واتـە: لـە بەهەشـتدا هەیـە، هـەر شـتێك کـە نەفـس بیخـوازێ و، چـاو لـە دیتنـی لـەززەت بـکات و، ئێـوەش لەوێـدا بـە هەمیشـەیی دەمێننـەوە.

هەروەهـا لـە سـوورەتی (السـجدة)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾، واتـە: هیـچ نەفسـێك نازانـێ ئـەوەی کـە بـۆی پەنهـان کـراوە، لـە شـتێك کـە فرمێسـکی شـادیی بـۆ دێنـێ، یاخـود لـە شـتێك کـە دەبێتـە مایـەی چـاو ڕوونیـی و چاوگەشـیی و دڵخۆشـیی.

٢٤)- ﴿ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْـُٔولًا ﴾، ئەوەش لەسەر پەروەردگارت بەڵێنێکە لێی دەپرسرێتەوە، ﴿ مَّسْـُٔولًا ﴾ واتە: داوای لێ دەکرێ، لێی دەپرسرێتەوە، هەڵبەتە هیچ کەسێك لە خوای بەرزو بە توانا ناپرسێتەوە: ﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾الأنبياء، واتە: ئەو لێی ناپرسرێ لەوەی کە دەیکات و، ئەوان لێیان دەپرسرێ، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە خوا ﷻ لە کەرەم و بەخششی خۆی، ئەو بەڵێنەی وا داناوە، کە لێی بپرسرێتەوە و، بەندەکانی چاوەڕوانییان لێی هەبێ، خوا ﷻ بۆ خۆی وای داناوە، نەك لەبەر ئەوەی مرۆڤەکان بۆیان هەبێ، لە خوا ﷻ بپرسنەوە، یان شتێکی لێ داوا بکەن، کە خۆی نەیفەرمووبێ، چونکە خوا کاربەجێیە و، ئەو پەڕی حیکمەت و زانیاریی هەیە و، ئەو پەڕی میهرەبانیی و بەزەیی هەیە، هەر کەسێك شایستەی هەر شتێك بێ، خوا بە زیادەوە پێی دەدات و، پێویست ناکات خۆی داوای بکات.

**مەسەلەی چوارەم:**

**پرسیارلێکردنی خوای بەرز و مەزن لە پەرستراوانی ساختە: کە ئایا ئەوان بەندەکانی خوایان گومڕا کردوون؟ کە مەبەست سەرزەنشتکردنی پەرستەرەکانە و، وەڵامی ئەوانیش: کە نەخێر، بەڵکو پەرستەرەکان خەتای خۆیان بووە و، بەهۆی خۆشگوزەرانییەوە، قورئانێک کە بیرخەرەوەیە، فەرامۆشیان کردوە و، بە چاو دادانەوەی هاوبەشدانەران کە ئەوە پەرستراوەکانتان بە درۆتان دەخەنەوە، ئێستاش هیچ شتێکتان لە دەست نایەت، نە ئەوە کە سزایەکە لە خۆتان لابدەن، نە ئەوەش کە خۆتان لەم حاڵە دەرباز بکەن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَقُولُ
ءَأَنتُمۡ أَضۡلَلۡتُمۡ عِبَادِي هَٰٓؤُلَآءِ أَمۡ هُمۡ ضَلُّواْ ٱلسَّبِيلَ ﴿١٧﴾ قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ مَا كَانَ يَنۢبَغِي
لَنَآ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنۡ أَوۡلِيَآءَ وَلَٰكِن مَّتَّعۡتَهُمۡ وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ نَسُواْ ٱلذِّكۡرَ وَكَانُواْ
قَوۡمَۢا بُورٗا ﴿١٨﴾ فَقَدۡ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ فَمَا تَسۡتَطِيعُونَ صَرۡفٗا وَلَا نَصۡرٗاۚ وَمَن
يَظۡلِم مِّنكُمۡ نُذِقۡهُ عَذَابٗا كَبِيرٗا ﴿١٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، یادبکەوە: ئەو ڕۆژە کە ئەوان و ئەوەی کە لە جیاتی خوا دەیپەرستن، کۆیان دەکاتەوە، خوێندراویشەتەوە: (**نَحشُرُهُم**)، کۆیان دەکەینەوە، ئەو ڕۆژە چی دەفەومێ؟ چی تێدا ڕوو دەدات؟ هەڵبەتە کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَعۡبُدُونَ ﴾، (**ما: موصولة**) یانی: (**الَّذِي يَعبُدُونه**)، ئەوەی کە دەیپەرستن، ئنجا هەموو جۆرە پەرستراوەکان دەگرێتەوە: مرۆڤ بن، فریشتە بن، شەیتان بن، دار و بەرد بن، ئەستێرە بن، هەواو ئارەزوو بێ، حیزبی کافربێ، ڕژێمی ستەمکار بێ ... هتد.

٢)- ﴿ فَيَقُولُ ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِي هَٰٓؤُلَآءِ ﴾، (خوا ﷻ) دەفەرموێ: ئایا ئێوە ئا ئەم بەندانەی منتان گومڕا کردن؟.

﴿ فَيَقُولُ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (فَنَقُولُ)، ئەگەر ئەوەی پێشێ (وَيَومَ نَحشُرُهُم) بێ، ئەمەشیان (فَنَقُولُ)، دەڵێین: ئایا ئێوە ئەو بەندانەی منتان گومڕا کردن؟ لەڕێتان لادان؟ هەڵبەتە ئەو پرسیارکردنە لێرەدا، پرسیار کردنێکە بۆ بەرانبەرەکە دانی پێدا بێنێ (إستفهام تقريري) ئەگەرنا خوا ﷻ چاوەڕێی وەڵام نیە، ئەو دانی پێدا بێنێ و قسە بکات.

٣)- ﴿ أَمْ هُمْ ضَلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴾، [ئایا ئێوە گومڕاتان کردن؟] یاخود خۆیان ڕێیان ون کرد؟.

٤)- ﴿ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ ﴾، [پەرستراوەکان هەرچی بن] گوتیان: پاکیی بۆ تۆ.

چونکە لەو ڕۆژەدا، هەم دار و بەرد دێتە گۆ، هەم ڕووەك، هەر شتێك کە پەرسترا بێ، مرۆڤ بێ، جند بێ، فریشتە بێ، هەرچی بێ، دێتەگۆ بەڵام هەندێ لە زانایان گوتوویانە: لێرەدا وا پێدەچێ، وەڵامدەرەوەکان کەسانی خاوەن هۆش بن، فریشتە، یاخود مرۆڤ، یاخود جند، بەڵام پێم وایە: خوا ﷻ هەر شتێك پەرسترا بێ، بۆ خوا ﷻ سێنایە بیهێنێتە گۆ و، حاشا لە پەرستراوەکانی خۆیان بکەن، هەڵبەتە لێرەدا کە دەڵێن: ﴿ سُبْحَٰنَكَ ﴾ (أي: نُسَبِّحُكَ تَسبِيحاً)، واتە: تۆ بە پاك دەگرین بە پاککرتن، ئنجا هەر چەندە ﴿ سُبْحَٰنَكَ ﴾، وشەی بە پاکگرتنە، بەڵام کنارەیە بۆ سەرسوڕمان، یانی: شتێکی سەیرە و سەرمان سوڕ دەمێنێ.

٥)- ﴿ مَا كَانَ يَنۢبَغِى لَنَآ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَآءَ ﴾، ئێمە بۆمان نەبوو، جگە لە تۆ، دۆستانی دیکە بگرین، وشەی ﴿ يَنۢبَغِى ﴾، (بَغَاهُ): (طَلَبَهُ)، یانی: داوای کرد، ﴿ يَنۢبَغِى ﴾، (انبغى مطاوع)ی (بَغَى)یە، یانی: گونجاو و شایستە نیە و نەبوو، لە دنیادا کە ئێمە جگە لە تۆ، دۆستانی دیکە بگرین، کەسانێك کە لێیان نزیك بین و بیانکەینە مشوور خۆر و سەرپەرشتیار و پەرستراو.

٦)- ﴿ وَلَٰكِن مَّتَّعۡتَهُمۡ وَءَابَآءَهُمۡ ﴾، بەڵام تۆ ئەو (کافر)انەو باب و باپیرانیشیانت بەهرەمەند کرد بوو، خۆشگوزەرانت کردبوون، کەواتە: ئەوانە سپڵە بوون بەرانبەر بە چاکەو نیعمەتەکانی تۆ، بەرامبەر بە بەهرەمەند کردنی تۆ، بۆیە ئەوان لە دنیادا، لە جیاتی ئەوەی شوکرانە بژێر بن، سپڵەو ناسوپاس بوون.

٧)- ﴿ حَتَّىٰ نَسُواْ ٱلذِّكۡرَ ﴾ [لەسەر ئەو خۆشگوزەرانیی و ڕابواردنی خۆیان و، لەززەت وەرگرتن لەو نازو نیعمەتەی تۆ ئەوانت پێ تاقیکردەوە، بەردەوام بوون] هەتا زیکریان لەبیر چۆوە.

(ذِکر)، یەکێکە لە ناوەکانی قورئان، بە مانای بیرخەرەوە دێ، یاخود لێرەدا (ذِکر) مەبەست پێی یادی خوایە، تاکو یادی تۆیان لەبیر چوو، ئنجا بەشێك لەوەی یادی خوایە، بریتیە لە قورئان، نەگەرنا، یادی خوا فروانترە لە قورئانیش.

٨)- ﴿ وَكَانُواْ قَوۡمَۢا بُورٗا ﴾، ئەوان بوونە کۆمەڵێکی فەوتاو، (بُور: جَمعُ بَائِر)، وەك (العُوذ: جَمعُ عائِذ)، (عوذ) واتە: ئەوانەی پەنا دەبەن، (عائِذ)، واتە: پەنابەر، پەنا بردوو، (بور) یش، یانی: فەوتاوان، کۆی (بائر)ە، یانی: فەوتاو، واتە: فەوتان و سەریان بە فەتارەت چوو، (وَالبَائِرُ: الَّذِي أَصَابَهُ البَوَارُ، أَيَ: الهَلاكُ)، (بَائِر)، کەسێکە کە (بَوَار)ی، تووش بووبێ، وەك لە سوورەتی (ئیبراهیم)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَحَلُّواْ قَوۡمَهُمۡ دَارَ ٱلۡبَوَارِ ﴿٢٨﴾ ﴾إبراهيم، واتە: خەڵکەکەی خۆیان بردە مەنزڵگای فەوتان و سەر بە فەتارەت چوون، کەواتە: (بَائِر)، کەسێکە (بَوَار)ی، تووش ببێ، واتە: لەبەین چوون و سەر بە فەتارەت چوون، ئەوان (پەرستراوەکان) ئاوا وەڵامی خوای پەروەردگار دەدەنەوە، کە: نەخێر هەر خۆیان گومڕا بوون، نەك ئێمە ئەوانمان گومڕا کردبێ.

٩)- ﴿ فَقَدۡ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ ﴾، خوا ﷻ وەك سەرزەنشتکردن پێیان دەفەرموێ: لەوەدا کە گوتتان، بەدرۆیان خستنەوە، ئێوەیان بە درۆ دانا.

١٠)- ﴿ فَمَا تَسۡتَطِيعُونَ صَرۡفٗا وَلَا نَصۡرٗا ﴾، ئێستاش نە توانای لادانی سزاتان هەیە، لە خۆتان و، نە توانای سەرکەوتنیشتان هەیە.

١١)- ﴿وَمَن يَظْلِم مِّنكُمْ نُذِقْهُ عَذَابًا كَبِيرًا﴾، هەر کامێك لە ئێوەش ستەم بکات، ئازارێکی گەورەی پێ دەچێژین، کە دەفەرموێ: ﴿فَقَدْ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ﴾، ئەوان ئێوەیان بە درۆ دانا لەوەدا کە گوتتان، ﴿بِمَا تَقُولُونَ﴾، یانی: (فِيمَا تَقُولُون)، لێرەدا پیتی (ب) لەجێی (ف)ی بەکارهێنراوە، ئەوە لە زمانی عەرەبیی دا زۆرە، یاخود (ب) هەر لە شوێنی خۆیەتی و (ب)ی (السببية)یە، واتە: بە هۆی قسەکەتانەوە، ئێوەیان بە درۆ خستەوە و بە درۆ دانا، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَظْلِم مِّنكُمْ﴾، دیارە هەر کامێك لە شیرك و کوفر و درۆ، ستەمە، واتە: هەر کەسێك لە ئێوە شیرك بکات، کوفر بکات، درۆ بکات، ئازارێکی گەورەی پێ دەچێژین.

**مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:**

**ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم) هەموویان خواردن و خواردنەوەو کارو کاسبیی و چوونە بازاڕیان هەبووە، خواش ﷻ پێغەمبەران و خەڵك بە یەکدی تاقیدەکاتەوە و، بینەری هەموو لایەکیشە، چی دەکەن و چۆن دەکەن؟:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمۡ لَيَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشُونَ فِي ٱلۡأَسۡوَاقِۗ وَجَعَلۡنَا بَعۡضَكُمۡ لِبَعۡضٖ فِتۡنَةً أَتَصۡبِرُونَۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرٗا ﴿٢٠﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:**

١)-- ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾، عادەتمان وابووە لە پێش تۆدا هیچ کام لە پێغەمبەرانمان نەناردوە، هیچ کامیان.

٢)- ﴿إِلَّآ إِنَّهُمۡ لَيَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشُونَ فِي ٱلۡأَسۡوَاقِ﴾، مەگەر هەر کامێك لەو پێغەمبەرانە خواردنیشی خواردوە و، بە بازاڕانیشدا ڕۆیشتوە، واتە: وەك خەڵکی ئاسایی ژیانی دنیایان گوزەراندوە و، لە چوارچێوەو بازنەی یاساکانی شەریعەتدا، بەڵام خواردنیان خواردوە و، خواردنەوەیان خواردۆتەوە و، خەوتوون و بەرگ و پۆشاکیان پۆشیوە و، بە بازاڕدا ڕۆیشتوون، کار و کاسبییان کردوە، کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّآ إِنَّهُمۡ لَيَأۡكُلُونَ﴾، ئەم جەختکردنەوەیە بە (إِنَّ) و بە (ل)، بۆ ئەوەیە کە کاتێك هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، تانە لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم) دەدەن، چونکە خواردن دەخۆن و بە بازاڕاندا دەڕۆن، وەك لەبیریان چووبێتەوە کە حاڵی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم) هەموویان هەر وابووە، یانی: لێرەدا خوا ﷻ وای مامەڵە لەگەڵدا کردوون، کە ئەو حەقیقەتەیان هەر نەزانیبێ، بۆیە خوا بۆی جەختکردوونەوە.

٣)- ﴿ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً ﴾، خوا دەفەرموێ: هەندێکتانمان بۆ هەندێکتان کردۆتە مایەی تاقیکردنەوە، واتە: هەر کامێکتان بەوی دیکە تاقی دەکرێتەوە، یانی: پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) و خەڵك، بەیەکدی تاقی دەکرێنەوە، کێ بڕوایان پێ دێنێ! کێ بڕوایان پێ ناهێنێ! کێ دژایەتییان دەکات! کێ دۆستایەتییان دەکات؟ پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بوونە مایەی تاقیکردنەوە بۆ خەڵك، کە ئایا ئەو پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) خۆیان ڕادەگرن لەسەر کوفرو عینادیی و کەللە ڕەقیی ئەو خەڵکە، یانی: هەم پێغەمبەران بە خەڵکی تاقی دەکرێنەوە و، هەم خەڵك بە پێغەمبەران تاقی دەکرێتەوە، خەڵك ئایا شوێنیان دەکەوێ، یان شوێنیان ناکەوێ؟ پێغەمبەرانیش، ئایا چۆن پەیامی خوایان بە ڕاستیی پێ دەگەیەنن، یاخود لە ژێر فشاریی هەڕەشەو گوڕەشەو ترس و تەماعدا، هەندێك لە پەیامی خوا پەنهان دەکەن و نایگەیەنن؟! خوا هەم پێغەمبەران تاقیدەکاتەوە بە خەڵك، هەم خەڵکیش تاقیدەکاتەوە، ئایا خەڵکیش دەست هەڵدەگرن، لە بیرو بڕوا پووچەکانیان، لە بۆچوونە بە کەڵك نەهاتوەکانیان، لە لاساییکردنەوەی کوێرانەی پێشینانیان، ئایا دەست بەرداری بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانیان دەبن، کە شەریعەتی خوا هاتوە، تاکو ژیانی ڕێك و ڕاستیان بێ و، نازو نیعمەتەکانی خوا بۆ هەموویان بن و، قۆرخکاریی نەبێ، گەندەڵیی نەبێ، ستەم نەبێ، خۆ سەپاندن نەبێ، ئایا خەڵکەکە ئامادەن، دەستبەرداری حاڵ و باڵە ناشەرعییەکانی خۆیان بن و، بێنە ژێرباری شەریعەت، کە بۆ هەموو لایەکیان بۆ دنیاو دوارۆژیان، مایەی خێر و خۆشیی و بەختەوەرییە، یاخود نا؟!

دوایی خوای پەنهانزان دەفەرموێ:

٤)- ﴿ أَتَصْبِرُونَ ﴾، ئایا خۆتان ڕادەگرن؟ ئەمە پرسیارکردنە، بەڵام بۆ هاندانە، ئایا خۆتان ڕادەگرن؟ ئایا پێغەمبەران خۆیان ڕادەگرن لەسەر گەیاندنی پەیامی خوا و، شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) خۆیان ڕادەگرن؟ هەروەها خەڵکەکەش، ئایا خۆ ڕادەگرن لەوەدا کە مل بۆ هەق کەچ بکەن؟

٥)- ﴿ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ﴾، بێگومان پەروەردگاریشت بینەرە، واتە: حاڵی هەموو لایەك دەبینێ و، هەڵس و کەوتەکانتان دەبینێ، دەزانێ کێ چی دەکات و، چۆن دەکات؟ کە دەفەرموێ: ﴿ أَتَصْبِرُونَ ﴾، ئایا خۆتان ڕادەگرن؟ ئەمە بە تەئکید هاندانە بۆ خۆڕاگریی، وەك چۆن خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا... ﴿٤٨﴾ ﴾الطور، خۆت ڕابگرە بۆ حوکمی پەروەردگارت، بێگومان تۆ لە ژێر چاودێریی ئێمە دای، ئاگامان لێت هەیە، مشوورت لێ دەخۆین، بەسەرت ڕادەگەین، خۆت ڕابگرە و، چی خوا پێی خۆشەو پەسندە، بەو شێوەیە بکە و، گوێ مەدە ئازارو ناڕەحەتیی کافرەکان.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێـــزان!

ئـەم دەرسـەمان چـواردە (١٤) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (٢١ - ٣٤)، کـە تێیانـدا سـەرەتا بـاسی داواکارییـەکی بـێ جێـی کافـرەکانی کـراوە، بەڵکـو دوو داواکاریی، کـە دابەزینـی فریشـتان و بینینـی خوایـە و، بـەو بۆنەیەشـەوە، بـاسی حاڵـی شـووم و شـپرزەیان کـراوە، لـە قیامەتـدا.

پاشـان بـاسی سـکاڵای پێغەمبەرکـراوە ﷺ لـە چەنـگ خەڵکەکـەی و، پێـش ئـەوەش بـاسی پەشـێمانیی کەسـێك کـراوە، کـە بـە هـۆی هـاوەڵ و بـرادەری خراپـەوە، لـەڕێ لادەداو گرفتـار دەبـێ، دوایـی پەنجـەی پەشـێمانیی دەگـەزێ، لـە جیـاتی پەنجەیـەك، هـەردوو دەسـتەکانی دەگـەزێ، یـانی: یەکجـار زۆر پەشـێمانە. ئنجـا دوایـی بـاسی سـکاڵای پێغەمبـەر ﷺ دەکات، لـە چەنـگ خەڵکەکـەی کـە قورئانیـان لـە بیـر کـردوە و پشـتگوێ خسـتوە.

دوایـی بـاسی داواکارییـەکی دیکەیـان دەکات، کـە بریتیـە: لـە دابەزینـی قورئـان بـە یـەك جـار و، لـە جیـاتی ئـەوەی کـە شـەوانەو ڕۆژانـە و، لـە میـانی بیسـت و سـێ (٢٣) سـاڵدا دابـەزێ، بـە یەکجـار و یـەك تـەکان داببـەزێ! خـواش ﷻ بەرپەرچـی ئـەو داواکارییەشـیان دەداتـەوە، کـە حیکمەتەکـەی چییـە، بـاسی سـزای قیامەتیشـیان کراوە کـە لەسـەر ڕووان، لـە پـەو ڕوو بـەرەو دۆزەخ پەلکێـش دەکرێـن و ڕادەکێشرێـن.

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا ۗ لَقَدِ ٱسْتَكْبَرُوا۟
فِىٓ أَنفُسِهِمْ وَعَتَوْ عُتُوًّا كَبِيرًا ﴿٢١﴾ يَوْمَ يَرَوْنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ لَا بُشْرَىٰ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ وَيَقُولُونَ

حِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا ﴿٢٢﴾ وَقَدِمۡنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنۡ عَمَلٖ فَجَعَلۡنَٰهُ هَبَآءٗ مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ أَصۡحَٰبُ
ٱلۡجَنَّةِ يَوۡمَئِذٍ خَيۡرٞ مُّسۡتَقَرّٗا وَأَحۡسَنُ مَقِيلٗا ﴿٢٤﴾ وَيَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلۡغَمَٰمِ وَنُزِّلَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ
تَنزِيلًا ﴿٢٥﴾ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّ لِلرَّحۡمَٰنِۚ وَكَانَ يَوۡمًا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ عَسِيرٗا ﴿٢٦﴾ وَيَوۡمَ
يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيۡلَتَىٰ لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ
فُلَانًا خَلِيلٗا ﴿٢٨﴾ لَّقَدۡ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكۡرِ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَنِيۗ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِلۡإِنسَٰنِ
خَذُولٗا ﴿٢٩﴾ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوۡمِي ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورٗا ﴿٣٠﴾ وَكَذَٰلِكَ
جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّٗا مِّنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيٗا وَنَصِيرٗا ﴿٣١﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا ﴿٣٢﴾ وَلَا
يَأۡتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ وَأَحۡسَنَ تَفۡسِيرًا ﴿٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُحۡشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ إِلَىٰ
جَهَنَّمَ أُوْلَٰٓئِكَ شَرّٞ مَّكَانٗا وَأَضَلُّ سَبِيلٗا ﴿٣٤﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها ئەوانەی بە هیوای دیداری ئێمەنین، (بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە)،
گوتیان: دەبووایە فریشتەمان دابەزێتە سەر، یان پەروەردگارمان ببینین، بێگومان
لە دڵی خۆیاندا خۆ بەزلگرییان هەیەو، ستەم و سنوورشکێنییەکی گەورەیان کرد
﴿٢١﴾ ئەو ڕۆژەی فریشتان دەبینن، هیچ جۆرە موژدەو دڵخۆشییەك بۆ تاوانباران
نیەو (فریشتەکان) پێیان دەڵێن: زۆر لێتان قەدەغەیە (بچنە بەهەشت) ﴿٢٢﴾
هەرچی کردەوەی چاکی کردبووشیان، کردمانە تۆزو گەردی پرژو بڵاو ﴿٢٣﴾ لەو
ڕۆژەدا هاوەڵانی بەهەشت، نشینگەو شوێنی پشوودانیان (لە هی کافران) زۆر
باشترە ﴿٢٤﴾ ئەو ڕۆژە کە ئاسمان لە شێوەی هەوری سپیی دا لەت و پەت

دەبێ و، فریشتەکانیش بە ژمارەیەکی زۆر دادەبەزێنرێن (بۆ گۆڕەپانی قیامەت) ﴿٢٥﴾ لەو ڕۆژەدا حوکمڕانیی و باڵادەستیی بەس بۆ (خوای) بە بەزەیی چەسپاو دەبێ و، ڕۆژێکی زۆر قورس و زەحمەت دەبێ، لەسەر کافران ﴿٢٦﴾ هەروەها ئەو ڕۆژە (ڕۆژێك دەبێ) کە بابای ستەمکار (لە پەشیمانییان) هەردووك دەستانی دەگەزێ و، دەڵێ: خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێم گرتبایە بەر ﴿٢٧﴾ هەی هاوار بۆ من! خۆزگە فڵانکەسم بە دۆست نەگرتبایە ﴿٢٨﴾ بە دڵنیایی لە یادی خوا ( و قورئان) دوای ئەوەی بۆم هاتبوو، لایدام و شەیتانیش بۆ مرۆڤ، زۆر دەستخەڕۆکەر و لە تەنگانەدا پشت بەردەرە ﴿٢٩﴾ پێغەمبەریش گوتی: پەروەردگارم! بێگومان خەڵکەکەم ئەم قورئانەیان وێڵ کرد بوو (واز لێهێنا بوو) ﴿٣٠﴾ هەر بەو شێوەیەش بۆ هەر کام لە پێغەمبەران دوژمنێکمان لە تاوانباران ڕەخساندووە، پەروەردگاریشت بەسە ڕێنماییکار و پشتیوان بێ ﴿٣١﴾ ئەوانەی بێبڕواشن گوتیان: دەبووایە قورئانی هەموو پێکەوە بە یەکجار دابەزیبایە سەر، بەڵام بۆیە بەو شێوەیەمان دابەزاندوە، تاکو عەقڵ و دڵتی پێ بچەسپێنین و وردە وردەش بەسەرتدا خوێندوومانەتەوە (تاکو بە ئاسانیی بۆت فام بکرێ و لەبەر بکرێ) ﴿٣٢﴾ ئەوانیش (بێبڕوایەکان) هەر وێنەیەکت بۆ بێننەوە ئێمە وەڵامێکی هەقت بۆ دێنین و، ڕوونکردنەوەی باشترت بۆ دێنین (بۆ پرسیارو ئیشکالەکەیان) ﴿٣٣﴾ ئەوانەی لەسەر ڕوویان بەرەو دۆزەخ کۆدەکرێنەوە، ئا ئەوانە جێگایان خراپترو ڕێگاشیان گومڕایانەتر و هەڵەترە (بە ڕەهایی) ﴿٣٤﴾

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَعَتَوْ عُتُوًّا كَبِيرًا): (العُتُوُّ: النُّبُوُّ عَنِ الطَّاعَةِ)، وشەی (عُتُوٌّ) بە چەند شێوەیەك لێکدراوەتەوە:

أ- ملنەدان بۆ فەرمانبەریی.

ب- سنوور شکێنیی.

ج- خۆ بەزلگریی و، ملنەدان بۆ هەق.

(حِجْرًا مَّحْجُورًا): یانی: (مَنُوعٌ مَنعاً)، (الحِجر)، (المَمنُوعُ مِنْهُ بِتَحرِيمِهِ)، شتێك کە قەدەغە کرابێ و، ڕێی لێگیرابێ، ﴿حِجْرًا مَّحْجُورًا﴾، یانی: (مَنْعاً لاَ سَبِيلَ إِلى رَفعِهِ وَدَفْعِهِ)، بەجۆرێك ڕێی لێگیراوە، کە هیچ دەرەتان نیە بۆ لابردنی ئەو قەدەغەیە، یاخود بۆ پاڵ پێوەنانی، چونکە وشەی (حِجر)، دەگوترێ: (فُلاَنٌ فِي حِجْرِ فُلاَنٍ، أَي: فِي مَنعٍ مِنْهُ عَنِ التَّصَرُّفِ)، واتە: فڵانکەس لە حیجری فڵانکەس دایە، ڕێی لێ دەگرێ کە تەصەڕوف بکات، لە ماڵ و سامانی خۆیدا، یان دەڵێ: فڵانکەس حیجری خراوەتە سەر.

(هَبَآءً مَّنثُورًا): یانی: تۆزو گەردێکی پرژ و بڵاو، (الهَبَاءُ: دُقَاقُ التُّرَابِ ومَاانْبَثَّ فِي الهَواءِ)، (هَبَاء)، بریتیە لە تۆزو گەردی خۆڵ، هەروەها ئەوەی کە لە هەوادا بڵاودەبێتەوە، دیسان لە کاتێکدا تیشکی خۆر دێتە ژوورێ، ئەو شتە وردیلانەی دەیانبینین، (هَبَاء)یان پێ دەگوترێ، تاکەکەی (هباءَة)یە.

(مَّنثُورًا)، (نَثْرُ الشَّيءِ: أَي تَفْرِيقُهُ وَنَشْرُهُ)، (نَثر)، یانی: پرش و بڵاوکردن و، لێك جیا کردنەوە، (هَبَآءً مَّنثُورًا)، یانی: تۆزو گەردێکی پرش و بڵاو.

(مَقِيلًا ): واتە: شوێنی پشوودان، (قُلتُ قَيلُولَةً)، يان (قِلتُ قَيلُولَةً)، واتە: سەر خەوێکم شکاند لە کاتی نیوەڕۆدا، (نِمتُ نِصفَ النَّهَارِ)، ئنجا وشەی (مَقِيل)، (مَصدَرٌ أو مَوضِعِ القَيلُولَةِ)، یان چاوگە یاخود ئەو شوێنەیە کە سەرخەوی تێدا دەشکێنرێ.

(عَسِيرًا ): (يَومٌ عَسِيرٌ)، یانی: ڕۆژێکی سەخت و قورس و بە زەحمەت، ڕۆژێکی دژوار، (يَومٌ عَسِيرٌ)، یانی: (يَومٌ يَتَصعَّبُ فِيهِ الأمورُ)، ڕۆژێکە کارەکانی تێدا زۆر بە زەحمەت و قورس و دژوار دەبن.

(خَذُولًا ): یانی: (كَثِيرُ الخُذْلَانِ، وَالخُذْلَانُ: تَرَكُ مَنْ يُظَنُّ بِهِ مَنْ يَنصُرَهُ، نُصْرَتَهُ)، (خُذلان)، بریتیە: لەوەی کەسێك کە گومانی لێ دەکرێ، نومێدی لێ دەکرێ، کە سەرت بخات، پشتت بەردا، (خُذْلَانَ)، ئەوە واتاکەیەتی، ئنجا خوا دەفەرموێ: شەیتان زۆر پشت بەردەرەو زۆر وێڵکەرە بۆ مرۆڤ، لە تەنگانەدا.

(وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا ): واتە: خوێندوومانەتەوە زۆر بە هێواشیی و، بە پلە پلە و، بە شێوەیەکی ڕێك و پێك، چونکە (الرَّتَلُ: إتِّسَاقُ الشَّيءِ، وَانتِظَامُهُ عَلَى استِقَامَةٍ)، (رَتَل) بریتیە لە ڕێك و پێك بوونی شتێك، ئەوەیە کە شتێك بە شێوەیەکی ڕێك لەسەر ڕێیەکی تەواو پێکەوە ڕێز ببێ، دەگوترێ: (رَجُلٌ رَتِلُ الأَسنَانِ)، پیاوێك کە ددانەکانی ڕێك و پێك بن، شاش و باش نەبن، بەرزیی و نزمییان نەبێ، (التَّرتِيلُ: إرسَالُ الكَلِمَةِ مِنَ الفَمِ بِسُهُولَةٍ)، (ترتيل) بریتیە لەوە کە مرۆڤ وشە بە ئاسانیی لە زاری گۆ بکرێ، بچێتە دەر، کەواتە: (ترتيل)، یانی: چاك خوێندنەوەی قورئان و بە ڕێك و پێکیی خوێندنەوەی و بە هێواشیی، بە شێوەیەك کە هەر دەنگ و پیت و وشەیەك، مافی خۆی پێ بدرێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هـۆی هاتنەخـوارەوەی ئـەم دوو ئایەتـە: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۖ وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا ﴿٣٢﴾ وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا ﴿٣٣﴾ ﴾.

ئەم گێڕدراوەیە هەیە لە بارەیانەوە:

{عَـن عَبدِاللـهِ بـنِ عَبَّـاسٍ رَضِيَ اللـهُ عَنهُـمَا، قَـالَ: قَـالَ المُشرِكُـونَ: إِنْ كَانَ مُحَمَّـداً كَـمَا يَزعُـمُ نَبِيًّـا، فَلِـمَ يُعَذِّبُـهُ رَبُّـهُ؟ أَلا يُنـزِلُ عَلَيـهِ القُـرآنَ جُملَـةً وَاحِـدَةً؟ يُنـزِلُ عَلَيـهِ الآيَـةَ وَالآيَتَـينِ وَالسُّـورَةَ؟! فَأَنـزَلَ اللـهُ عَـلَى نَبِيِّـهِ جَـوَابَ مَـا قَالُـوا: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۖ وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾ ... إِلـخ} (أَخرَجَـهُ ابـنُ أَبِي حاتِـم فِي تَفسِـيرِه: ١٥١٣٦، وَابـنُ مُردَوَيـه فِي تَفسِـيرِهِ كَـمَا فـي «لُبَـابِ النُّقُـول» ص١٦٣، وَالـدرُّ المَنثُـور ج٦، ص٢٥٤، وَمِـنْ طَرِيقِـهِ الضِيـاءُ المَقـدِسِي فـي «الأَحادِيـثِ المُختـارَة»: ١١٩)[1].

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ)، دەڵـێ: هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان گوتیـان: ئەگـەر وەك موحەممـەد پێـی وایـە پێغەمبەری خوایـە، پـەروەردگاری بۆچـی نارەحـەتی دەکات؟ بۆچـی قورئـانی بـە یـەك جـار دانابەزێنێتـە سـەر؟ بەڵکـو هـەر جـارە ئایەتێـك، یـان دوو ئایـەت، یـان سـوورەتێکی بـۆ دادەبەزێنـێ؟! خـواش ﷻ وەك وەڵامـی ئـەوەی کـە گوتیـان، دابەزانـدە سـەر پێغەمبەرەکـەی ﷺ، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ﴾، تاکـو کۆتایـی.

---

(١) الإستيعاب في بَيانِ الأسباب، ج٢، ص١٥، قُلنا: وَهَذَا سَنَدٌ حَسَن.

## ماناى گشتيى ئايەتەكان

خـوا ﷻ کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا﴾، ئەمـە هـەر پەیوەسـتە بـەوەی پێشـەوە، واتـە: ئـەم (و)ە، بـۆ گێڕانـەوەو بادانەوەیـە، (واو العطـف)ە، ئـەم قسـانەی ئێـرە، دەگێڕێتـەوە بـۆ سـەر ئـەوەی پێشـێ، واتـە: خـوا ﷻ هـەر بـاسی کافـرو هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان دەکات، بـەڵام ئنجـا ئـەو سیفەتەشـیان بـۆ بەکاردێنـێ، واتـە: بزانـن کـە ئەوانـە بـە هـۆی ئـەوەوە کـە بـە ئومێـدی دیـداری ئێمـە نیـن، ئـاوا ڕوویـان کردۆتـە کوفـرو شـیرك و لادان و تـاوان، دەفەرمـوێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا﴾، ئـەو کافرانـەی بـە ئومێـدی دیـداری ئێمـە نیـن، بـە ئومێـدی زینـدوو کرانـەوەو سـزاو پاداشـت نیـن، گوتیـان: (چییـان گـوت؟) ﴿لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا﴾، دەبووایـە فریشـتەمان دابەزێتـە سـەر، یـان دەبووایـە پەروەردگارمـان ببینـن، تاکـو بـڕوا بـە پێغەمبەرەکـەی بێنیـن و، بـڕوا بـە کتێـب و ئاییـن و پەیامەکـەی بێنیـن، خـواش ﷻ لەوەڵامیـان دا هـەر ئەوەنـدە دەفەرمـوێ: ﴿لَقَدِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ وَعَتَوْ عُتُوًّا كَبِيرًا﴾، بەدڵنیایـی لـە دڵـی خۆیانـدا زۆر خۆیـان بـە گـەورە زانی، وەك لـە شـوێنێکی دیکـە لـە سـوورەتی (غافـر)دا دەفەرمـوێ: ﴿إِن فِى صُدُورِهِمْ إِلَّا كِبْرٌ مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِ ۝٥٦﴾غافـر، واتـە: ئەوانـە بـەس لـە دڵیانـدا خـۆ بـە زلگرییـەك هەیـە، کـە ئـەو خـۆ بـە زلگرییەیـان پـێ نایەتـە دی، واتـە: هـەر لـە دڵـی خۆیانـدا خۆیـان پـێ زلـە، بـەڵام لـە واقیعـدا زل و گـەورە نیـن، پێـی ناگـەن بـەو خـۆ گەورەکردنـە ناگـەن، وەك خولیـاو ئاواتێـکی پـووچ، ﴿وَعَتَوْ عُتُوًّا كَبِيرًا﴾، ئەوانـە سـەرپێچییان کـرد بـە سـەرپێچیی کردنێـکی گـەورە، ئـەوە مانایـەکی، یاخـود سـنوور شـکێنییان کـرد، بـە سـنوور شـکێنییەکی گـەورە، کەللەڕەقیـی و عینادیان کـرد، بـە کەللەڕەقیـی و عینادییـەکی گـەورە، کـە ئـەو داوایەیـان کـرد.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی یەکێك لە دوو داواکارییەکانیان، یەکیان هەر فەرامۆش دەکات، ئەویش بریتیە: لەوەی خوا ﷻ ببینن، ئەوەیان خوای پەروەردگار خۆی بە سەرەوە نابات و پشتگوێی دەخات، چونکە مرۆڤ لەم ژیانە دنیاییەدا، بەم جەستە خاکییەوە، هی ئەوە نیە تەماعی ئەوەی ببێ پەروەردگار ببینێ، بۆچی دەتوانێ هەندێك لە دروستکراوەکان ببینێ، تاکو بتوانێ پەروەردگار ببینێ، بۆ وێنە: ڕووح، هێزی کێشندە، هێزی موگناتیسیی، تیشکی ژێر سوورە سەرووی وەنەوشەیی؟!

﴿ يَوْمَ يَرَوْنَ الْمَلَٰٓئِكَةَ لَا بُشْرَىٰ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ ﴾، ئەو ڕۆژە کە فریشتان دەبینن ئەو ڕۆژە هیچ دڵخۆشییەك نیە بۆ تاوانباران، هیچ موژدەیەکیان بۆ نیە، ﴿ وَيَقُولُونَ حِجْرًا مَّحْجُورًا ﴾، فریشتەکان پێیان دەڵێن: لێتان قەدەغەیە بە قەدەغەیەکی زۆر، یاخود زۆر بە توخیی لێتان قەدەغەیە، چییان لێ قەدەغەیە؟ لێیان قەدەغەیە بچنە بەهەشت، لێیان قەدەغەیە کە خوا بەزەیی پێیاندا بێ، ئەوە واتایەکی، یاخود ﴿ وَيَقُولُونَ ﴾، واتە: تاوانبارەکان دەڵێن: ﴿ حِجْرًا مَّحْجُورًا ﴾، واتە: با ئەم سزای دۆزەخ و ئازارەی کە فریشتەکان دەیهێنن و سەرپەرشتیی دەکەن، با لێمان دوور بێ و، لێمان قەدەغە بێ.

﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُوا۟ مِنْ عَمَلٍ ﴾، ئەو ڕۆژەش (کە ڕۆژی دواییە) ئێمە ڕوومان کردە ئەوەی کردبوویان لە کردەوە، واتە: لە کردەوە باشەکان، ﴿ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴾، ئنجا کردمانە تۆزو گەردی پرژ و بڵاو، بۆچی؟ چونکە دیواری ئەو کردەوە باشانەیان لەسەر بناغەی ئیمان و خوا پێ مەبەست بوون (إخلاص) بنیات نەناوەو، هەر کردەوەیەکیش پەیوەست نەبێ بە خواوە، بە ڕەزامەندیی خواوە، بە شەریعەتی خواوە، بایی پوولێکە، خوا نرخ و بەهای بۆ دانانێ، چونکە کردەوە بەوە باش، دەبێ:

یەکەم: بۆ خوا بێ.

دووەم: بەپێی شەریعەتی خوا بێ.

بەڵام کە ئەو دوو مەرجەی تێدا نەبوون: أ- خوا پێ مەبەست بوون. ب- بەپێی شەرع و بەرنامەی خوا بوون، واتە: ئەو کەسە کارەکەی بۆ خوا نەکردوە و پاداشتی چی لە خوا دەوێ؟ چونکە کەسێك کارێك بۆ خوا بکات:

١- بەپێی شەریعەتی خوا دەیکات، بزانێ خوا چۆنی پێ چاکە، ئەو کارە ئەنجام بدرێ، بەپێی بەرنامەی خوا.

٢- بۆیە دەیکات پاداشتەکەی لە خوا وەربگرێتەوە، نەك بۆ خۆ هەڵکێشان و چاوەڕوانیی لە خەڵك، ئنجا کەسێك کارێك بۆ خوا نەکات، ستەمە چاوەڕوانیی پاداشتەکەی لە خوا بکات، کەسێك کارێك بەپێی بەرنامەی خوا نەکات، ستەم و بێ ویژدانیی دەکات، چاوەڕێی پاداشتەکەی لە خوا بکات، تۆ بەپێی بەرنامەی خوات نەکردوە و، بۆ ئەوەت نەکردوە ڕەزامەندیی خوای پێ وەدەست بێنی! بۆیە خوا کردەوەی ئەو جۆرە کەسانە دەکاتە تۆزو گەرد.

ئنجا دێتە سەر باسی ئەهلی بەهەشت ﴿ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ يَوۡمَئِذٍ خَيۡرٌ مُّسۡتَقَرًّا وَأَحۡسَنُ مَقِيلًا ﴾، هاوەڵانی بەهەشت، یاخود خاوەنانی بەهەشت لەو ڕۆژەدا کە فریشتان دەبینن، ڕۆژی دوایی، ﴿ خَيۡرٌ مُّسۡتَقَرًّا ﴾، شوێنی نیشتەجێ بوونیان باشترە ﴿ وَأَحۡسَنُ مَقِيلًا ﴾، شوێنی پشوودانیشیان باشترە، شوێنی تێدا نیشتەجێ بوونیان بەیەکجاریی و، شوێنی پشوودانی نێوە نێوەیان، کە دیارە بەهەشتییەکان، هەم شوێنی نیشتەجێ بوونیان هەیە و، هەم شوێنێك کە جار جار بۆی دەچن و پشووی لێ دەدەن، کە ئەم بینیوە ئەمە لە تەفسیرەکاندا باس کرابێ، بەڵام وای تێدەگەم، چونکە خوا ﷻ لە بەهەشتدا هەرچی مرۆڤ بیەوێ و پێی خۆش بێ، بۆی دادەنێ، وەك چۆن کۆشك و تەلاری هەمیشەییان هەیە، هەندێ شوێنیشیان هەن بە شێوەیەکی کاتیی، لێیان دەبن، وەك چۆن ئێستا خەڵك بەشێوەیەکی کاتیی چەند ڕۆژێك، یاخود چەند سەعاتێك دەچێ بۆ دەرەوەی شار، شوێنێکی ئیسراحەت و پشوودانی هەیە، هەرچەندە بە داخەوە خەڵکی ئەم ڕۆژگارە بە تایبەت لەم هەرێمی کوردستانی خۆماندا، ئەو ڤێلایانەی دروستیان کردوون،

بەزۆریی وایە لەسەر زەوی کشتووکاڵییەو، بەزۆریش بە پارەی حەڕام و قەدەغەیە، ئەگەرنا کەسێك لەسەر زەوی خۆی و، بە پارەیەك کە بە ئارەقەی نێوچەوان و، بە ڕەنجی شان و بە حەڵاڵیی پەیدای کردوە، ئەوە شتێکی باشە. مرۆڤ جار جار لە قەڵەباڵغیی و جەنجاڵیی شار دەچێتە دەر و، هەوایەکی پاك هەڵدەمژێ و، دەچێتە شوێنێکی هێمن و ئارامەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ خَيۡرٞ ﴾، شوێنی نیشتەجێ بوون و شوێنی پشوودانیان باشترە، لێرەدا وشەی ﴿ خَيۡرٞ ﴾، باشترە، وەك بەراورد نیە لەگەڵ هی دۆزەخییەکاندا، چونکە ئەوان حاڵیان هەر نیە، تاکو بەراورد بکرێ، بەرزیی و نزمیی (تفاضل)ی پێ بکرێ، بەڵکو یانی: نشینگەو سرەوتگای وان بەڕەهایی باشترە و خۆشترە، یاخود لێرەدا مەبەست پێی توانجە، یانی: بەڕاستیی ئەو بەهەشتە باشترە، لەو دۆزەخ و ئاگر و ئاوی کوڵاوو داغ و ئازارو ناڕەحەتیی و سووکایەتییەی بۆ بێبڕوایان دانراوە.

ئنجا خوا ﷻ باسی ڕۆژی دوایی دەکات: ﴿ وَيَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلۡغَمَٰمِ وَنُزِّلَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ﴾، ئەو ڕۆژە کە ئاسمان بە هەور (بە هەورێکی سپیی) لەت و پەت دەبێ، واتە: کاتێ کە لەت و پەت دەبێ، هەورێکی سپیی دەردەکەوێ، یاخود بەهۆی هەورێکەوە کە دێ، ئاسمان لەت و پەت دەبێ، یان لە ئەنجامی لەتبوونیدا هەورێکی سپیی لە شوێنی پەیدادەبێ، کە ئەمە دەگونجێ زانایانی فیزیك زان و گەردوونناس، زۆر شت لەو ئایەتە موبارەکە وەربگرن، چونکە ئەم گەردوونە لە ڕۆژی دوایی دا حاڵی بەو شێوەیە نامێنێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾إبراهيم، واتە: ئەو ڕۆژە زەوی بۆ جگە لەم زەوییە دەگوڕێ و ئاسمانەکانیش ... گۆڕانکارییەك بەسەر کۆی گەردووندا دێ و، لە شوێنی ئەو گەردوونە هەورێکی سپیی پەیدا دەبێ، چونکە: (الغَمَام: السَّحاب الرَّقيقُ الأبيَض)، هەورێکی سپیی تەنك، یاخود کە زۆر تۆخ نەبێ، ﴿ وَنُزِّلَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ﴾، فریشتەکانیش بە دابەزێنراتێکی سەرسوڕهێنەر دابەزێتران، لەو ڕۆژەدا.

﴿ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّ لِلرَّحۡمَٰنِ ﴾، لەو ڕۆژەدا حوکمڕانیی و دەستڕۆیشتوویتیی ڕەها بۆ خوای خاوەن بەزەیی، چەسپاوە، ﴿ وَكَانَ يَوۡمًا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ عَسِيرٗا ﴾، ئەو ڕۆژەش ڕۆژێکی زۆر زەحمەت و قورسە لەسەر بێبڕوایان، ﴿ وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ ﴾، ئەو ڕۆژەش کە ستەمکار هەردوو دەستی خۆی دەگەزێ.

ئەم تەعبیرە لە هەموو زمانەکاندا هەیە، دەڵێ: پەنجەی پەشیمانیی دەگەزێ، هەر کەسێ پەشیمان بێ، پەنجەی خۆی دەگەزێ، بەڵام ئەو بێبڕوایە هێندە پەشێمانە، هەردوو دەستانی دەگەزێ، کە ئەمە بۆ زێدەڕۆیی کردنە لە زۆر پەشێمان بوونییدا، وەك لە پەندی پێشینان دا هاتوە: فڵانکەس هێندە پەشێمانە، ئەگەر کەسی پەشێمان شاخی دەرکردبان، قۆچی دەرکردبان، دەبووایە ئەو قۆچی دەرکردبانە، یانی: هەر زۆر زۆر پەشێمانە.

ئنجا ئایا دەڵێ چی؟ ﴿ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا ﴾، دەڵێ: ئەی خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕێم گرتبایە بەر، خۆزگە لەگەڵ وی بەڕێدا ڕۆیشتبامایە، بە ڕاستە شەقامەکەی خوادا، ﴿ يَٰوَيۡلَتَىٰ ﴾، هەی هاوار بۆ من، ﴿ لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ فُلَانًا خَلِيلٗا ﴾، خۆزگە فڵانکەسم بە دۆست و خۆشەویستی خۆم نەگرتبایە، ﴿ لَّقَدۡ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكۡرِ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَنِي ﴾، بە دڵنیایی منی لە زیکر لادا، دوای ئەوەی کە بۆم هات، ذیکر یان یەکێك لە ناوەکانی قورئانە واتە: بیرخەرەوە، یاخود: منی لە یادی خوا لادا، دوای ئەوەی کە یادی خوام بۆ هات، لە سەر دەستی پێغەمبەر ﷺ. ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ فُلَانًا ﴾، یانی: کەسێکی دیارییکراو، کە ناوی نەهێنراوە، ﴿ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِلۡإِنسَٰنِ خَذُولٗا ﴾، بە دڵنیاییش شەیتان بۆ مرۆڤ زۆر پشت بەردەرە، (خَـذُول)، یانی: کەسێك کە (خُذلان)، بەسەر کەسێك دادێنێ، ڕێژگەی زێدەڕۆییە لە (خاذِل)ەوە یانی: (كَثِيرُ الخُذْلانِ)، (خُذلان)یش، بریتیە لەوەی کەسێك چاوەڕوانیی سەرخستن لە کەسێك بکات، کەچی ئەو پشتی بەربدا، (خَذَلَنِي)، واتە: پشتی بەردام، لە کاتێکدا کە چاوەڕوانییم لێ دەکرد پشتم بگرێ، بەڵام ئەگەر کەسێك چاوەڕوانیی

لە کەسێك نەکات، ناڵێ: (خَذَلَنِي)، دەڵێ: (لَم يَنصُرنِي)، پشتی نەگرتم بەڵام کەسێك چاوەڕوانیی سەرخستن و پشت گرتن لە کەسێك بکات، ئەویش پشتی بەربدا لە تەنگانەدا، ئەو کەسە پێی دەگوترێ: (خَاذِل)، کە (خَذُول)، صیغەی زێدەڕۆییەکەیەتی.

ئنجا دێتە سەر باسێکی دیکە، دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوْمِي ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ مَهْجُورًا ﴾، پێغەمبەریش ﷺ گوتی: ئەی پەروەردگارم! کۆمەڵەکەی من ئەم قورئانەیان پشتگوێ خستوە و، وازیان لێهێناوە، ئەوە واتایەکی.

﴿ مَهْجُورًا ﴾، واتایەکی دیکەشی هەیە کە لە (هُجر)ەوە هاتبێ، ئەم قورئانەیان کردوە بە شتێك کە قسەی پێ دەڵێن، قسەی ناشایستەی لە بەرانبەردا دەکەن، یانی: (يَقُولُونَ هُجراً عَلَيهِ)، ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾، هەروەها بەو شێوەیە [کە ئێستا هەیە، یاسای خوا، وابووە] کە بۆ هەر کامێك لە پێغەمبەران دوژمنانێکمان ڕەخساندوون لە تاوانباران، (عدو)، لێرەدا بێژەکەی تاکە، بەڵام مانایەکەی کۆیە، ﴿ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا ﴾، پەروەردگاریشت بەسە ڕێنماییکارو پشتیوانت بێ، لە بەرانبەر ئەو تاوانبارانەدا کە دژایەتیی پێغەمبەرانیان کردوە و، دژایەتیی پێغەمبەری کۆتایی و سەروەری پێغەمبەران موحەممەد ﷺ دەکەن، هەروەها هەموو ئەوانەی کە لە ڕێی پێغەمبەری خاتەمەوە دەڕۆن، خوا بەسە کە ڕێنماییکار بێ، بۆ دۆست و پشتیوانەکانی و، هاوکار و سەرخەریش بێ بۆیان.

ئنجا دێتە سەر قسەیەکی دیکەی کافرەکان: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ﴾، هەروەها ئەوانەی بێبڕوان گوتیان: دەبووایە (موحەممەد) ئەم قورئانەی بە یەکجار دابەزیبایە سەر، یاخود بۆچی بە یەك جار دانەبەزیوەتە سەری؟ ﴿ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا ﴾، خوا دەفەرموێ: بۆیە بەو شێوەیەمان دابەزاندوە، تاکو عەقڵ و دڵتی پێ بچەسپێنین و، بە شێنەیی و بە

هێواشیی و بە ڕێك و پێكیی خوێندوومانەتەوە بەسەرتدا، تاكو بە ئاسانیی لەبەری بكەی و فامی بكەی، لە هۆی هاتنە خوارەوەكەیدا باسمان كرد كە بێبڕوایەكان دەیانگوت: بۆچی بە یەك جار قورئانی بۆ دانەبەزیوە؟ ڕەنگە قیاسی قورئانیان لەسەر تەورات كردبێ، كە خوا ﷻ كاتی خۆی لەڕێی فریشتەكانەوە تەوراتی لە چەند تەختێك (ألواح)دا بۆ مووسا دابەزاندوە، دیاریش نیە لە چ ماددەیەك بوون، لە سەر چ جۆرە بەردێكی بە نرخ نووسراونەوە، گرنگ ئەوەیە تەورات لە سەر لەوحەكان نووسراوەتەوەو دراوەتە مووسا ﷺ ئەویش هەڵیگرتوون، ئنجا كافرەكان لەوەدا هەڵە بوون، بەڵام نا، خوا ﷻ وەك دەفەرموێ: بۆیە قورئانمان هەموو بە یەك جار دانەبەزاندوە و، لە ماوەی جیا جیادا دامانبەزاندوە، چونكە پێغەمبەری كۆتایی ﷺ ئوممەتێك پەروەردە دەكات، قۆناغ بە قۆناغ، دەبێ هەر ئایەتەو هەر سوورەتە، لە قۆناغی خۆیدا دابەزێ، بەڵام تەورات جیا بووە، ئەو كاتە بەنوو ئیسرائیل تازە دەربازیان بووە لە چنگی فیرعەون و، لەژێر ركێفی دەسەڵاتی فیرعەونییەكان هاتوونە دەر و، بە دەریای سووردا پەڕیونەوەو چوونە دەشتی (سیناء) و، پێویستییان بە بەرنامەیەك بووە، كە مووسا ﷺ بەپێی ئەو بەرنامەیە، ژیانیان ڕێك بخات و بەڕێوە بەرێ، نەك وەك ئوممەتی پێغەمبەری كۆتایی ﷺ ئوممەتێك بن: قۆناغ بە قۆناغ پێ بگەن و، ژیانی كۆمەڵایەتیی و ئابووریی و سیاسییان ڕێك بخرێ، ئەوان كۆمەڵێك بوون، دەربازیان بوەو لە كات و شوێنێكی دیاریكراودا بوون.

دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا ﴾، هیچ وێنەیەك بۆ تۆ ناهێننەوە، هیچ وەسفێك، مەگەر ئێمە هەقت بۆ دێنین و، ڕوونكردنەوەی باشترت بۆ دێنین، بۆ وەڵامی ئەو ئیشكال و پرسیارەی ئەوان.

لە كۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ الَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ﴾، ئەوانەی كە لەسەر ڕوویان كۆ دەكرێنەوە بۆ دۆزەخ، ﴿ أُولَٰئِكَ شَرٌّ مَكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴾، ئەوانە شوێنیان خراپترە و، ڕێشیان گومڕاترە، بێگومان مەبەست لە

﴿ شَرٌّ ﴾، کە ئەصڵی خۆی (أَشَرُّ)ە، بەڵام هەمزەکەی لابراوە، یانی: خراپتر، مەبەست ئەوە نیە کە بەرامبەرەکانیش شوێنیان خراپ بێ، بەڵام هی ئەو بێبڕوایانە خراپتر بێ، هەروەها مەبەست ئەوە نیە کە ڕێی بەرامبەرەکەشیان گومڕایە، بەڵام هی ئەوان گومڕاتر بێ، بەڵکو لێرەدا ئەو جۆرە بەراورد (مقارنة)یە، مەبەست پێی هێنانە بەرچاوی بەرامبەرەکە نیە، بەڵکو یانی: لە خودی خۆیدا شوێنی ئەوانە زۆر خراپە و، ڕێی ئەوانە زۆر گومڕاییە، ئەگەرنا مەبەست پێی بەراوردکردن نیە لەگەڵ شوێن و ڕێی بەرانبەرەکانیاندا.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بێبڕوایانی نائومێد لە دیداری خوا، بە هۆی خۆ بەزلگریی و ستەمەوە، داوای دابەزینی فریشتان و بینینی پەروەردگاریان دەکەن، بەڵام کاتێک لە دوا ڕۆژدا فریشتان دەبینن، زۆر بەزبریی دەیاندوێنن و، خواش ﷻ کردەوە چاکەکانیان تەفرو توونا دەکات، بە پێچەوانەی بڕوادارانەوە، کە دەبنە خاوەنی بەهەشت و تێیدا سەقامگیر دەبن و، ئەو ڕۆژەش ئاسمان لە شێوەی هەوردا لەت و پەت دەبێ و، فریشتەش دادەبەزن، لەو ڕۆژەدا حوکمڕانیی تەنیا هی خوا دەبێ و، بۆ کافرانیش ڕۆژێکی زۆر سەخت و دژوار دەبێ:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَوۡ نَرَىٰ
رَبَّنَاۗ لَقَدِ ٱسۡتَكۡبَرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ وَعَتَوۡ عُتُوّٗا كَبِيرٗا ﴿٢١﴾ يَوۡمَ يَرَوۡنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ لَا بُشۡرَىٰ يَوۡمَئِذٖ
لِّلۡمُجۡرِمِينَ وَيَقُولُونَ حِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا ﴿٢٢﴾ وَقَدِمۡنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنۡ عَمَلٖ فَجَعَلۡنَٰهُ هَبَآءٗ مَّنثُورًا
﴿٢٣﴾ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ يَوۡمَئِذٍ خَيۡرٞ مُّسۡتَقَرّٗا وَأَحۡسَنُ مَقِيلٗا ﴿٢٤﴾ وَيَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلۡغَمَٰمِ وَنُزِّلَ
ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ﴿٢٥﴾ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّ لِلرَّحۡمَٰنِۚ وَكَانَ يَوۡمًا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ عَسِيرٗا ﴿٢٦﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا﴾، ئەوانەی کە بە هیوا و بە ئومێدی دیداری ئێمە نین، گوتیان، خوا ﷻ لە جیاتی ئەوەی بفەرمووێ: (وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا)، دەفەرمووێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا﴾، ئەوانەی بە ئومێدی دیداری ئێمە نین، گوتیان، کە بێگومان بێبڕوایەکانن، بەڵام لێرەدا خوا ئەو سیفەتەیان تێدا زەق دەکاتەوە، کە یەکێک لە

تایبەتمەندترین و، زەقترین خەسڵەتەکانی بێبڕوایان، ئەوەیە کە بە ئومێدی دیداری خوا نین، بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، چییان گوت؟

٢)- ﴿لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا﴾، دەبووایە فریشتەمان دابەزنە سەر، یان پەروەردگارمان ببینین! ئەم ﴿لَوْلَآ﴾یە، لێرەدا (حَرْفُ تَحضِيض مُستَعمَلٌ فِي التَّعجِيز)، وشەی هاندانە، دەبووایە ئەوە ببێ، بەڵام مەبەست پێی دەسەوسانکردنە، واتە: کە فریشتەمان دانابەزنە سەر و پەروەردگارمان نابینین، کەواتە: ئێمە بیانوو و پاساومان هەیە، بڕوا ناهێنین، داوای ئەو دوو شتەیان کردوە:

أ- فریشتە دابەزن.

ب- خوا ﷻ ببینن.

خوا ﷻ چۆنیان وەڵام دەداتەوە؟

٣)- ﴿لَقَدِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ وَعَتَوْ عُتُوًّا كَبِيرًا﴾، بەڕاستیی {بەو دوو داواکارییە} لە دڵی خۆیاندا زۆریان خۆ گەورە کرد و، زۆریش سنوور شکێنی و لا ملییان کرد و، کەللە ڕەقییان نواند.

واتە: خۆ بەزلگرییەکە ڕۆچوویەو ڕیشەدارە لە دڵ و دەروونیاندا، پێشتریش باسمان کرد، وشەی: (عُتُوا) بریتیە لە سنوور بەزێنیی لە ستەمدا، یاخود بریتیە لە سەرپێچیی و لاملیی و بە قسە نەکردن و کەللەڕەقیی.

٤)- ﴿يَوْمَ يَرَوْنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ لَا بُشْرَىٰ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ﴾ {بەڵێ فریشتان دەبینن} بەڵام ئەو ڕۆژە کە فریشتان دەبینن، {کە مەبەست پێی ڕۆژی دواییە، بەڵکو لە سەرەمەرگیشدا هەموو کەسێك فریشتان دەبینێ، چ چاك بێ، چ خراپ بێ}، هیچ دڵخۆشیی و موژدەیەك نیە، لەو ڕۆژەدا بۆ تاوانباران، ﴿لَا بُشْرَىٰ﴾، یانی: (لا يوجَدُ شَيءٌ مِنَ البَشَارَةِ لِلمُجرِمينَ فِي ذَلِكَ اليَوم)، (لا) بۆ لابردنی (جنس)ە، واتە: هیچ جۆرە دڵخۆشیی و موژدەیەك نیە لەو ڕۆژەدا بۆ تاوانباران.

٥)- ﴿ وَيَقُولُونَ حِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا ﴾، (تاوانبارەکان) دەشڵێن: بادۆزەخمان لێ دوور و قەدەغە بێ، بە لێدوور بوونێکی تایبەت، ﴿ حِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا ﴾، (أي: حَرَاماً مُحَرَّماً):

ئەم تەعبیرە سێ واتای هەن:

١- قسەی بێبڕوایانە، کە دەڵێن: با دۆزەخمان لێ دوور بێ، بە لێ دوور بوون، یاخود لێمان قەدەغە بێ بە لێ قەدەغە بوون.

٢- یاخود قسەی فریشتەکانە، کە: ئێوە بەهەشتتان لێ قەدەغەیەو، بەزەیی خواتان لێ قەدەغەیە، بە قەدەغەبوونێکی خەست و خۆڵ.

٣- دەشگونجێ مانایەکی دیکەی سێیەمیشی هەبێ: ئەوە قسەی کافرەکان بێ کە بە فریشتەکانی دەڵێن و پەنایان پێ لە خوا دەگرن، چونکە عەرەب عادەتیان وابووە، ئەگەر تووشی مەترسییەك، یان تووشی دوژمنێکیان ببوونایە دەیانگوت: ﴿ حِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا ﴾، دیارە نەرێتیان وابووە و، ئەو کاتەش ئەو دوژمن و ئەو ناحەزە دەستی لێ نەوەشاندوون، چونکە تازە وایگوتوە، واتە: قەدەغەیە بە قەدەغە بوون، کە تۆ زەبرم لێ بدەی، ئنجا کافرەکان پێیان وایە کە قیامەتیش هەر وەك دنیایە و، ئەو نەرێتە لەوێش کاری پێ دەکرێ، بە فریشتەکان دەڵێن: ﴿ حِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا ﴾، وا دەزانن ئەوە بۆیان دەبێتە پارێزەرو چەپەر و تانەیەك لە بەرانبەر فریشتەکاندا، کە زیانیان پێ نەگەیەنن، بەڵام نەخێر ئەوە هەر عادەت و نەرێتێکی سەردەمی خۆیان بووە، سەردەمی نەفامیی، بەڵام لە لای خواو لە قیامەت، ئەوە سوودی نیە و هیچ دادێکیان نادات.

ئنجا ڕەنگە یەکێك بڵێ: باشە ئاخر ئەوانە کردەوەی باشیان هەبووە، هەیانبووە میوانداریی کردوە، هەیانبووە یارمەتیی لێقەوماوانی داوە، هەیانبووە سەخاوەتیی نواندوە، ئازایەتیی نواندوە، چاکەی کردوە! بۆیەش خوا فەرموویەتی:

٦)- ﴿ وَقَدِمۡنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنۡ عَمَلٖ فَجَعَلۡنَٰهُ هَبَآءٗ مَّنثُورًا ﴾، ڕووشمانکردە ئەو کردەوانەی کردبوویانن، ئنجا کردمانە تۆزوگەردی پرژوبڵاو، (قُدُوم)، یانی: هاتن، (قَدِمنا)،

یانی: هاتین، (القُدُومُ مستَعمَلٌ فِي مَعنَى العَمْدِ وَالإرادَةِ): لێرەدا (قُدُوم)، بەكارهێنراوە لە مانای ئەوەدا كە شتێك بویسترێ ئەنجام بدرێ، رووی تێبكرێ، واتە: رووممان كردە ئەو كردەوانەی كردبوویانن،

﴿ فَجَعَلْنَـٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴾ ئنجا كردمانن تۆزو گەردێكی پرژ و بڵاو، یانی: تەفر و تووناممان كردن، واتە: ئەو كردەوانەی كە لە دنیادا كردبوویان، كردەوە باشەكان و دڵیان پێ خۆش دەكردن بۆ قیامەت، بێتەوە ڕێیان، تەفرو تووناممان كردن، چونكە وەك پێشتر گوتمان: ئەو كردەوانەیان وەك دیوارێك بوون، كە لەسەر بناغەی بنیات نەنراوە، خوای پەروەردگاریش كردەوە بە دوو مەرج وەردەگرێ:

١- بەپێی شەریعەتی خوا ئەنجام درا بێ.

٢- ڕەزامەندیی خوای تێدا ڕەچاو كرابێ.

واتە: خوا پێ مەبەست بوون و، بەپێی شەریعەتی خوا بوون، ئەو دوو شا ڕەگە، یاخود ئەو دوو پایە سەرەكییە، دەبێ هەبن، ئنجا ئەو كردەوەیە لە لای خوای زانا و شارەزا قبووڵ دەبێ.

ئنجا دێتە سەر باسی ئەوانەی ئەهلی بەهەشت، ئەوان ژینگە و شوێن و حاڵ و باڵیان چۆنە؟

٧)- ﴿ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ يَوْمَئِذٍ خَيْرٌ مُّسْتَقَرًّا وَأَحْسَنُ مَقِيلًا ﴾، هاوەڵانی بەهەشت، یاخود: خاوەنانی بەهەشت، نشینگە و سرەوتگایان باشترە. ﴿ أَصْحَـٰبُ ﴾، كە كۆی (صاحِب)ە، (صاحِب)، هەم بە مانای هاوەڵ و هاودەم و برادەر دێ، هەم بە مانای خاوەنیش دێ، ئنجا بەهەشتییەكان، هەم دەبنە هاوەڵی بەهەشت و هەمیشە لە بەهەشت دان و لێی جیانابنەوە، هەم دەبنە خاوەنی بەهەشت و بەهەشت دەبێتە موڵكی ئەوان، خوا دەفەرموێ: خاوەنانی بەهەشت، یان هاوەڵانی بەهەشت لەو ڕۆژەدا، ﴿ خَيْرٌ مُّسْتَقَرًّا ﴾، شوێنی نیشتەجێ بوونیان باشترە، ﴿ وَأَحْسَنُ مَقِيلًا ﴾، شوێنی پشوودانی

کاتییشیان باشترە، چونکە (مَقِیل)، واتە: شوێنی قەیلوولە، شوێنی سەرخەو شکاندن، یانی: پشوودانێکی کاتیی، بەکارهێنانی وشەی: ﴿ خَيْرٌ ﴾یش لێرەدا جۆرێکە لە گاڵتە کردن بە کافرەکان، ئەگەرنا کافرەکان شوێنی نیشتەجێ بوون و شوێنی پشوودانیان هەر نیە، دۆزەخ دەبێ چ پشوویەکی تێدا بدەن؟ ﴿ مُّسْتَقَرًّا ﴾، (أي: مَكانُ الإستِقرارِ)، شوێنی تێدا نیشتەجێ بوون، (مَقِيل: مَكَانُ القَيلُولَةِ)، شوێنی پشوودانی کاتیی، وەك لە مانای گشتییەکەشدا گوتم: هەرچەندە لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە، بەڵام وای تێدەگەم، چونکە هەندێك لە زانایان لێیان بۆتە ئیشکال، کە باشە ئەوە بەهەشت شوێنی تێدا نیشتەجێ بوونە، بەڵام شوێنی پشوودانی کاتیی چۆن دەبێ؟ هەتا هەندێکیان ناچار بوون بڵێن: ئەوە خوا ﷻ لە بەرانبەر شوێنی کافرەکاندایە، خوای پەروەردگار باسی دۆزەخ دەکات کە هەم شوێنی تێدا نیشتەجێ بوونی یەکجارییەو، هەم شوێنی کەمێك تێدا مانەوەیە، ﴿ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴾ الفرقان -٦٦- کە لەوێ دەڵێن: شوێنی کەمێك تێدا مانەوە (مقاماً) بۆ بڕوادارانی گوناهکارە، کە تێیدا دەمێننەوە کەمێك و دوایی دەچنە دەرێ، بەڵام شوێنی تێدا نیشتەجێ بوونی یەکجاریی (مستقراً) بۆ ئەهلی کوفرە، گوتوویانە: خوای تاك و پاك وەك بەراورد لەگەڵ دۆزەخدا، ئاواش باسی بەهەشت دەکات.

بەڵام من وای تێدەگەم کە نەخێر مەبەست ئەوەیە کە وەك چۆن لە دنیادا خەڵکێك شوێنی هەیە، کە خانووبەرەو جێگاو ڕێگەیەتی و بەزۆریی لەوێیە، بەڵام هاوینە هەوارێکیشی هەیە، شوێنێکیشی هەیە جار جار دەچێ پشووی لێ دەداو، ئیسراحەتێکی لێ دەکات، لە جەنجاڵ و قەڵەباڵغیی شار دوور دەکەوێتەوە، هەرچەندە بەهەشت وانیە، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە (مَقِيل)، شوێنی پشوودانی کاتیی و، ﴿ مُّسْتَقَرًّا ﴾، شوێنی تێدا نیشتەجێ بوونی بەردەوامە.

٨)- ﴿ وَيَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلْغَمَٰمِ ﴾، ئەو ڕۆژە کە ئاسمان بە هەور لەت دەبێ، ﴿ تَشَقَّقُ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (تَتَشَقَّقُ)، هەر یەك واتاشیان هەیە، یانی: ئەو ڕۆژەی ئاسمان شەق دەبێ، لەت و پەت دەبێ، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ بِٱلْغَمَٰمِ ﴾، واتە: (السَّحابُ الرَّقِيق الأبيض)، هەورێکی تەنك، هەورێکی سپیی.

پیتی (ب) لە وشەی ﴿ بِٱلْغَمَٰمِ ﴾دا، سێ ئەگەری هەن:

١- (ب) (السببية)يەو، لە شوێنی خۆی بەکارهێنراوە، واتە: بە هۆی هەورەکەوە ئاسمان لەت دەبێ، هەورێکی سپیی دێ ئاسمان لەت و پەت دەکات.

٢- ﴿ بِٱلْغَمَٰمِ ﴾، یانی: (عَنِ غَمامٍ)، واتە، (ب) لە جیاتی (عن) بەکارهاتوە، واتە: ئاسمان لەت و پەت دەبێ و، سەرەنجام هەورێکی سپی شوێنی دەگرێتەوە، یان لێی پەیدا دەبێ.

٣- یاخود (ب)ی ﴿ بِٱلْغَمَٰمِ ﴾، بۆ (مُلاَبَسَة)یە، واتە: هاوجووت لەگەڵ هەوردا، ئاسمان لەت و پەت دەبێ، کە ڕەنگە ئەوە ئاماژەیەك بێ و، پسپۆڕانی بواری فیزیاو گەردووناسیی دەتوانن زیاتر لەو بارەوە قسە بکەن، بەپێی بیردۆزەیەك کە ئێستا باس دەکرێ: کاتێك دێ ئەم گەردوونەی ئێمە جارێکی دیکە دەتەقێتەوە، یان گۆڕانێکی بەسەردا دێ، خوای زاناو پەنهانزانیش ﷻ لە سوورەتی (الأنبیاء)دا، ئاماژەی پێ دەکات: ﴿ يَوْمَ نَطْوِى ٱلسَّمَآءَ كَطَىِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ۚ كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژە کە ئاسمان وەك تۆمار دەپێچینەوە (تۆمار: ئەوە بووە شتیان تێدا نووسیوە، کاتی خۆی بەم شێوەیەی ئێستا نەبووە، دەفتەر بێ، بەڵکو یەکپارچە بووە هەڵیانوێزنیوە و ڕێکیان نووشتیوە و، وەك گلۆڵە پێچاویانەتەوە)، وەك چۆن یەکەمجار دەستمان پێکردوە (بە دروستکراوەکان) ئاوا دەیگێڕینەوە، (واتە: لە کوێوە هاتوە، وەك حاڵەتی پێشێی لێ دەکەینەوە)، ئەوە بەڵێنێکە لەسەر ئێمە، کە ئێمە بە تەئکید وا دەکەین.

هەڵبەتە کاتێك هەر بیردۆزەیەکی زانستیی دەبێتە حەقیقەت، ئنجا دەگونجێ ئایەتەکانی قورئانی پێ تەفسیربکەین، چونکە قورئان حەقیقەتی موتڵەقە، بەڵام زانیارییەکانی مرۆڤ، شتی ڕێژەیین و دەبێ بسەلمێترێن، بۆ وێنە: ئێستا خڕێتیی (کرویة)ی زەوی، سووڕانەوەی زەوی، کۆمەڵەی خۆر، کەهکەشانەکان، ئەوانە بوون بە ڕاستیی زانستیی و، دەگونجێ ئایەتەکانیان پێ تەفسیر بکەین، بەڵام ئەو بیردۆزانەی کە جارێ هەر بیردۆزەن و نەبوونە ڕاستیی زانستیی، نابێ

ئایەتەکانی قورئانیان پێ تەفسیر بکەین، بە ڕەهایی، بڵێین: بەس ئەوە مانایەتی، بەڵام دەتوانین بڵێین: ئەو ئایەتە موبارەکە دەگونجێ ئەوەی ئەو بیردۆزەیە گوتوویەتی، مەبەست پێی نەوەبێ، بەڵام دەشگونجێ مەبەستی دیکەشی هەبێ.

٩)- ﴿وَنُزِّلَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا﴾، ئەو ڕۆژە فریشتەکان دادەبەزێنرێن بە دابەزاندن.

١٠)- ﴿ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ لِلرَّحْمَـٰنِ﴾، ئەو ڕۆژە حوکمڕانیی و، دەسەڵات و باڵا دەستیی، چەسپاوە بۆ خوای خاوەن بەزەیی، ﴿ٱلْحَقُّ﴾، (الحَقُّ: الثَّابِتُ، أو الخَالِصُ)، (حق) یانی: چەسپاو، یاخود بێ خلْتە، لەو ڕۆژەدا حوکمڕانیی و دەسەڵات، تەنیا هی خوای خاوەن بەزەییە و بەشی کەسی پێوە.

١١)- ﴿وَكَانَ يَوْمًا عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ عَسِيرًا﴾، ئەو ڕۆژەش ڕۆژێکە لە سەر بێبڕوایان زۆر قورس و دژوار و زەحمەت دەبێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**پەشیمانیی بابای کافر و دەستی خۆ گەزینی، کە بۆچی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕێی دانەگرت و، هاوەڵایەتیی فلان و فیسارێکی بەدکاری کرد و، دان پێداهێنانی کە گومڕای کردوە و، ڕاگەیاندنی خواش: کە شەیتان زۆر دەستخەڕۆکەری مرۆڤانەو، لە تەنگانەدا پشتیان بەردەدا:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا ٢٧ يَٰوَيۡلَتَىٰ لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ فُلَانًا خَلِيلٗا ٢٨ لَّقَدۡ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكۡرِ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَنِيۗ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِلۡإِنسَٰنِ خَذُولٗا ٢٩ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ ﴾، ئەو ڕۆژە کە ستەمکار هەردوو دەستی خۆی دەگەزێ، وشەی: ﴿ ٱلظَّالِمُ ﴾، (أل)ی ناساندن (التعريف)ی لەسەرە، ئنجا ئەو ناساندنە یان بۆ جینسە، واتە: هەموو ستەمکاران بەو شێوەیەن، یاخود مەبەست پێی (عهد)ە، یانی: ئەو ستەمکارانەی باسیان کرا، کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانن و بێبڕوا و کەللەڕەقەکانن، کە بڕوا بە پێغەمبەری خاتەم ناهێنن، هەردوو دەستی خۆیان دەگەزن، لە جیاتی پەنجەیەك یان دوو پەنجە، هەردوو دەستی خۆیان دەگەزن، واتە: یەکجار یەکجار زۆر پەشیمانن.**

**٢)- ﴿ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا ﴾، یەکێ لەو ستەمکارانە، لەو کافر و بێبڕوایانە، دەڵێ: ئەی خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕێم گرتبایە بەر، (إتِّخَاذُ السَّبِيل: أخذُهُ أو سلوكُهُ، وَالأخذُ هُوَ التَّناولُ فَأُطلِقَ هُنَا عَلَى السَّيرِ)، وشەی (أخذ)، یانی: گرتن، یاخود دەست گەیاندنە شتێك، (إتِّخَاذ)یش، (إفتِعَال)ە، لە (أَخْذ)، واتە: چاك، یان بە خۆ ماندوو کردنەوە و بە جیددیی گرتنی شتێك، لێرەدا ئەمە خوازراوەتەوە بۆ ڕۆیشتن، واتە: خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺدا بەڕێدا ڕۆیبامایە، کە ڕاستە شەقامی خوایە.**

٣)- ﴿ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴾، هەی هاوار بۆ من (وەرە!) خۆزگە فڵانکەسم بە دۆست و نیزیکی خۆم نەگرتبایە، واتە: ئەی هاوار، سزای من! ئامادەبە ئێستا کاتتە، ﴿ لَيْتَنِي ﴾، یانی: خۆزگە (وَیل)یش بە مانای هاوار دێ، بە مانای حاڵی خراپ دێ، بە مانای سزای سەخت دێ، ﴿ يَٰوَيْلَتَىٰ ﴾، ئەم ئەلیف (ا)ە، لە شوێنی (ي) دانراوە: لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: (یا وَیلَتِي)، ئەی سزاکەی من! هاوارەکەی من وەرە، فەرموویەتی: ﴿ يَٰوَيْلَتَىٰ ﴾، ئەم (ا)ە، لەجێی (ي)ی، پاڵدران (إضافة) دانراوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا ﴾، (فُلان)، ناوێکە کینایەیە بۆ هەر کەسێك کە ناوی عەلەمی باس ناکرێ، ناوە کەسییەکەی باس ناکرێ، بۆچی بریا ئەو کەسەی بە دۆست نەگرتبایە؟

٤)- ﴿ لَّقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكْرِ ﴾، بە دڵنیایی منی لە زیکر لادا، (ذِکر):

أ- دەگونجێ مەبەست پێی ناوی قورئان بێ، لەبەر ئەوەی قورئان بیرخەرەوەیە بۆ ڕاستییەکان، کە خوا لە زگماکی مرۆڤدا دایناون.

ب- دەشگونجێ (ذِکر) مەبەست پێی یادی خوا بێ، یانی: ئەو منی لە: یادی خوا، خوا لەبیر بوون و خوا لە یاد بوون، گومڕا کرد، ﴿ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِي ﴾، دوای ئەوەی ئەو یادی خوایەم بۆ هات، واتە: دوای ئەوەی بۆشم هاتبوو بە پێغەمبەردا ﷺ کەچی ئەو منی لێ لادا و، خستمیە سەر کوێرە ڕێ و ڕێچکەیەك، کە بۆ خۆی لەسەری بوو، لەو ڕاستە شەقامەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ڕێیە ڕۆشن و پڕ نوور و بەرەکەتە، منی لادا.

﴿ أَضَلَّنِي ﴾، منی گومڕا کرد، یانی: منی ون کرد لە ڕێیە، یاخود: ڕێیەکەی لەمن ونکرد، کە لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ لادان لە ڕاستە شەقام.

٥)- ﴿ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِلْإِنسَٰنِ خَذُولًا ﴾، بە دڵنیاییەوە شەیتانیش بۆ مرۆڤ زۆر دەستخەڕۆکەرە، زۆر پشت بەردەرە لە تەنگانەدا، (الخَذْلُ: تَرْكُ نَصرِ المُستَنجِدِ مَعَ القُدرَةِ عَلَى نَصرِهِ)، (خَذْل) بریتیە لە واز لێهێنانی یارمەتیدانی بابای هاوار تێبەستوو، لەگەڵ

توانینی یارمەتییدانیشیدا، ئنجا (خُذلان)، کە چاوگەکەیەتی کاتێك بەکاردێ، کە کەسێك چاوەڕوانیی لە کەسێك بووبێ، بەڵام ئەو هاوکاریی نەکردبێ، دەڵێ: فڵانکەس پشتی بەردام و، دەستخەڕۆی کردم، لەو بارەوە ئەم دەقە دێنین:

{عَـن مُجاهِـدٍ قَولـهُ: ﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّـالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ ﴾، عُقْبَـةُ بْـنُ أَبِي مُعَيْـطٍ دَعَـا مَجْلِسًـا فِيهِـمُ النَّبِـيُّ صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ لِطَعَـامٍ فَـأَبَى النَّبِـيُّ صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ أَنْ يَـأْكُلَ وَقَـالَ: لَا آكُلُ حَتَّـى تَشْـهَدَ أَنْ لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّـهُ وَأَنَّ مُحَمَّـدًا رَسُـولُ اللَّـهِ، فَقَـالَ: مَـا أَنـتَ بِـآكِلٍ حَتَّـى أَشْـهَدَ؟ قَـالَ: نَعَـم، قَـالَ: أَشْـهَدُ أَنْ لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّـهُ وَأَنَّ مُحَمَّـدًا رَسُـولُ اللَّـهِ، فَلَقِيَـهُ أُمَيَّـةُ بْـنُ خَلَـفٍ فَقَـالَ: أَقَـدْ صَبَـوْتَ؟ قَـالَ: إِنِّي أَخُـوكَ عَـلَى مَـا تَعْلَـمُ، وَلَكِـنْ صَنَعْـتُ طَعَامًـا، فَـأَبَى أَنْ يَـأْكُلَ حَتَّـى أَقُـولَ ذَلِـكَ، فَقُلْتُـهُ وَلَيْـسَ مِـنْ نَفْـسِي}[1].

واتــە: موجاهیــد دەڵــێ: لــە بــارەی ئــەم ڕســتە قورئانییــەوە: {ئــەو ڕۆژە کــە ســتەمکار هــەردوو دەســتی خــۆی دەگــەزێ} عوقبــەی کــوڕی ئــەبی موعەیــط کۆڕێــکی بانــگ کــرد، کــە پێغەمبەریشــیان ﷺ تێدابــوو بانگــی کــردن بــۆ خــواردن، پێغەمبــەر ﷺ ئامــادە نەبــوو بخــوات، فەرمــووی: ناخــۆم هەتاکــو شــایەتیی نــەدەی کــە بێجگــە لــە خــوا هیــچ پەرســتراوێك نیــە و موحەممەدیــش ڕەوانەکــراوی خوایــە، ئەویــش پێــی گــوت: ئــا خــۆی تاکــو شــایەتیی دەدەم؟ گــوتی: بەڵــێ، ئنجــا ئەویــش شــایەتمانی هێنــا، گــوتی: (أَشْــهَدُ أَن لا إِلَــهَ إِلاَّ اللــهَ وَأَشْــهَدُ أَن مُحَمَّــداً رَسُــولُ اللــهِ)، ئومەیــەی کــوڕی خەلــەف، گەیشــتە عوقبــەی کــوڕی ئــەبی موعەیــط گــوتی: هەڵگەڕاویــەوە؟ گــوتی: نــا، مــن براتــم چۆنــت ناســیوم هــەر وام، بــەڵام خواردنێکــم دروســتکردبوو، ئامــادە نەبــوو، بخــوات هەتــا ئــەوە نڵێــم، منیــش گوتــم، بــەڵام لــە دڵمــەوە نەبــوو، (واتــە: هــەر ســەرزارەکیی بــوو).

هەندێــك گوتوویانــە: ئــەو ئایەتــە لــەو بــارەوە هاتۆتــە خــوار، کــە بــە تەئکیــد ئــەو دەگرێتــەوە و، جگــە لەویــش هەردەگرێتــەوە.

---

(١) أخرجـه ابـنُ أَبِي حاتـم فِي تَفسـيرِهِ برقـم: ٢٦٨٣، ٢٦٨٤، وَالطَّبَرِي فِي جامـع البَيـان: ج١٩، ص٧، وَالإِسـتيعاب فِي بَيـان الأَسـباب (٣/ ١٥)، قُلنـا: وَهـذَا مُرسَـلٌ صَحِيـحُ إِسـنادِ.

**مەسەلەی سێیەم:**

**سکاڵاکردنی پێغەمبەر ﷺ لە چنگ خەڵکەکەی کە قورئانیان فەرامۆش کردووەو، دڵدانەوەی خوا بۆی کە بەپێی یاسا گەردوونییەکانی خوا، هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دوژمنیان هەبوون لە تاوانباران:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوۡمِي ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورٗا ٣٠ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّٗا مِّنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيٗا وَنَصِيرٗا ٣١ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوۡمِي ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورٗا ﴾، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! خەڵکەکەم ئەم قورئانەیان پشتگوێ خستوە، واز لێهێناوە.

ئایا ئەم سکاڵایەی پێغەمبەر ﷺ لە دنیادایە، یان لە دواڕۆژدایە؟ زۆربەی توێژەرەوان دەڵێن: لە دنیادایە، کە هەر ئەو ڕایەش بە بۆ چوونی من ڕاستە، بەڵام (أبو مسلم الأصفهاني) گوتوویەتی: لە ڕۆژی دوایی دا، ئەو سکاڵایە دەکات، بەڵام نا، من پێم وایە هەر لە دنیادایە، چونکە هەر دیارە کە پێغەمبەر ﷺ زۆر جاران داد و فیغانی بووە لە دەست کەللە ڕەقیی هۆزی قورەیش و کافرەکان.

﴿ مَهۡجُورٗا ﴾، (أي مَتْرُوكاً)، وازلێهێنراو، پشتگوێ خراو، یاخود: ﴿ مَهۡجُورٗا ﴾، (أي مَهجُوراً فِيهِ مِنْ أَهْجَرَ، أي: قَالَ الْهُجرَ)، قسەی ناشایستە و قسەی خراپی کرد، جنێوی پێدا، واتە: قورئانیان کردوە بە شتێك كە قسەی پێ بڵێن، بێ ئەدەبیی و قسەی ناشایستەی لە بەرانبەردا بکەن، وەك لە سوورەتی (المؤمنون)دا، هێناومانە: ﴿ مُسۡتَكۡبِرِينَ بِهِۦ سَٰمِرٗا تَهۡجُرُونَ ٦٧ ﴾المؤمنون، ﴿ تَهۡجُرُونَ ﴾، یانی: (تَقُولُونَ هُجراً)، قسەی ناشیرین دەکەن، قسەی نارێك دەکەن، لە (أَهجَرَ)، کە خوێندراویشەتەوە: (تُهجِرُون، أَهجَرَ، يُهجِرُ) یانی: قسەی ناشیرینی کرد.

٢)- ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّٗا مِّنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە کە ئێستا تاوانباران دژایەتیی تۆ دەکەن، بۆ هەر کام لە پێغەمبەران دوژمنمان لە تاوانباران بۆ ڕەخساندوون، (عَدُو)، لێرەدا بێژەکەی تاکە، بەڵام مانای کۆیە، هەروەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّهُمۡ عَدُوّٞ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٧٧ ﴾الشعراء، ﴿ فَإِنَّهُمۡ عَدُوّٞ لِّيٓ ﴾، نەیفەرموە: (أَعْدَاءٌ)، چونکە (عَدُوّ)، لێرەدا ناوی تاکە، بەڵام مەبەست پێی کۆیە، واتە: هەموو ئەوانە کە ئێوە دەیانپەرستن، دوژمنمن، جگە لە پەروەردگاری جیهانییان، واتە: کە ئێستا دژایەتیی تۆ دەکرێ، ئەی موحەممەد! ﷺ ئەو تاوانبارانە دژایەتیی تۆ دەکەن و قسەت پێ دەڵێن، ناوو ناتۆرەت بەدوا دەخەن، ئەوە یاسای خوا وابووە لە ژیانی هەموو پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم).

٣)- ﴿ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيٗا وَنَصِيرٗا ﴾، پەروەردگاریشت بەسە کە ڕێنماییکار و پشتیوان و هاوکارت بێ.

یاساو سیستمی خوا وابووە کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دژایەتییان بکرێ، ئەوە زۆر حیکمەتی تێدا هەن:

١- یەکێ لە حیکمەتەکانی ئەوەیە کە پاداشتیان گەورەترە.

٢- حیکمەتێکی دیکەی ئەوەیە کە ببنە سەرمەشق بۆ غەیری خۆیان و، خەڵك وانەزانێ کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) فەرشیان بۆ ڕاخراوەو، ڕێیان بە گوڵان چێنراوە، بەڵکو ڕێیان هەمووی دڕك و داڵ و، هەورازو نشێو بووە.

٣- ئنجا شوێنکەوتووانیان کە تەماشای پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دەکەن، لەگەڵ ئەو هەموو هەورازو نشێوو دڕك و داڵ و ناڕەحەتییەش دا، خۆڕاگر بوون، ئەوەش دەبێتە هۆی هاندان بۆ ئەوانیش کە خۆڕاگر بن.

**مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:**

**داواکردنی کافرەکان کە دەبووایە قورئان بە یەکجار و پێکەوە دابەزیبایە سەر موحەممەد ﷺ و، وەڵامدانەوەی خوا، کە دڵدامەزران و ئاسانیی لەبەرکران و فامکران: حیکمەتی بە جیا جیا دابەزینی قورئانە و، هەڕەشەکردن لە کافران کە لەسەر رוویان بەرەو دۆزەخ پەلکێش دەکرێن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا ﴿٣٢﴾ وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا ﴿٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُوْلَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٣٤﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان گوتیان.

واتە: ئەو بێبڕوایانەی کە پێشتر قسەیان لەبارەوە کرا.

٢)- ﴿ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ﴾، دەبووایە قورئانی بە یەك جار دابەزێنرابایە سەر، ﴿ لَوْلَا ﴾، بۆ هاندان (تَحْضِيض)ە، واتە: دەبووایە قورئان بە یەکجار دابەزیبایە سەری، ﴿ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ﴾، (أَي: مُجْتَمِعاً لاَ كَما أُنزِلَ نُجُوماً مُتَفَرِّقَةً)، ﴿ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ﴾، واتە: پێکەوە، نەك بە پرژو بڵاویی وەك ئێستا هەیە، بەڵکو هەمووی پێکەوە دابەزیبایە، قیاسی قورئانیان کردوە لەسەر تەورات، کە کاتی خۆی لە چەند لەوحێکدا بۆ مووسا ﷺ لەلایەن فریشتەکانەوە نووسراوەتەوە و، مووسا ﷺ هێناویەتی.

خوا ﷻ وەڵام دەداتەوە:

٣)- ﴿ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ ﴾، ئاوا بە شێوەیە دامانبەزاندوە تاکو دڵتی پێ بچەسپێنین، عەقڵتی پێ بچەسپێنین، وشەی (فُؤاد)، هەم بە مانای دڵ بەکارهاتوە لە

قورئاندا، هەم بە مانای عەقڵ، بەڵام زیاتر بە مانای عەقڵ، واتە: لە عەقڵتدا بیچەسپێنین، چونکە لەبەرکردنی قورئان، زیاتر پەیوەندیی بە هۆش و عەقڵەوە هەیە. ﴿لِنُثَبِّتَ﴾، (التَّثبِيتُ: جَعْلُ الشَّيءِ ثَابِتاً)، واتە: شتێك بچەسپێنی، سەقامگیری بکەی، واتە: قورئانمان بۆیە بەو شێوەیە دابەزاندوە، تاکو عەقڵ و دڵی تۆی پێ بچەسپێنین (پێی دامەزراو بکەین).

٤)- ﴿وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا﴾، زۆریش بەڕێکیی خوێندوومانەتەوە، بە خوێندنەوەیەکی ناوازە. (التَّرتِيلُ: التَّرَسُّلُ وَالتَّثَبُّت، وَالتَّرتِيلُ: حُسْنُ التَّألِيفِ بَيْنُ الدَّلالَة)، (ترتيل)، بریتیە: لە شتێك کە بە شێنەیی و بە لە باریی بێ و، بەڕێزو ڕێکیی و ڕۆشنیی و مانایەکەی ڕۆشن بێ، (الزمخشري) گوتوویەتی: حیکمەت لەوەدا کە خوا قورئانی بە چەند بەشێك دابەزاندوە بە بڵاویی نەك بە یەکجار، ئەوەیە کە بەهۆی ئەو چار وبار دابەزینەوە، عەقڵ و دڵی پێغەمبەری پێ بچەسپێنێ، تاکو چاکی لەبەر بکات و تێیبگات، چونکە بابای وەرگر دڵی بەهێز دەبێ، لەسەر لەبەرکردنی زانست، کاتێك کە ئەو زانیارییەی بۆی دەنێردرێ، شتێك دوای شتێك بۆی بێ و، بەشێك دوای بەشێك، نەك هەمووی پێکەوە.

٥)- ﴿وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ﴾، هیچ وەسفێك و وێنەیەك بۆ تۆ ناهێننەوە.

٦)- ﴿إِلَّا جِئْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا﴾، مەگەر ئێمە هەق (شتێکی چەسپاو) بۆ تۆ دێنین و، ڕوونکردنەوەی باشتر لەوەی ئەوان دەیڵێن، بۆ ئەو ئیشکال و پرسیارەی ئەوان، ڕوونکردنەوەی باشتریان بۆ دێنین، (مَثَل)، لێرەدا بە مانای وەسفێکی سەرسوڕهێنەر دێ، کە ئەو قسەیەی ئەوان گوتوویانە لە بارەی حاڵی پێغەمبەرەوە ﷺ گوایە: حاڵی پێغەمبەری کۆتایی وەك هی پێغەمبەران ناچێ (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) واتە: ئەو وێنە (مَثَل)ەیان، کە هێناوەتەوە گوتوویانە: حاڵی تۆ وەك حاڵی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ناچێ، کە یەکجار کتێبیان بۆ دابەزیوە.

کە دەفەرموێ: ﴿وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا﴾، یانی: (أَفضَلَ فِي الدَّلاَلَةِ)، مانایەکەی ڕۆشنتر و دیارترە.

ئێستا با شەش خاڵ لەبارەی جیاجیا دابەزێنرانی قورئان و، حیکمەیەکەیەوە بخەینە ڕوو:

## حیکمەتەکانی دابەزاندنی قورئان لە ماوەی بیست و سێ (٢٣) ساڵدا

١- بە ئاسانیی وەربگیرێ لەلایەنی خەڵکەوە و تێی بگەن و، پێغەمبەریش ﷺ ئاسانتر بتوانێ بیگەیەنێ، نەك هەمووی پێکەوە.

٢- قورئان بەرنامەی ژیانەو، بە گوێرەی ڕووداوەکان هاتوە.

٣- پەیوەندیی بەردەوامی پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان بە وەحییەوە، کە جار بۆ جار ئیمانیان پێی تازە دەبێتەوە.

٤- تاکو دەرفەتی گومانی کافرەکان نەبێ، کە یەکجار وەحیی هات و تەواو، بڕایەوە، بەردەوام ئەوە تازەبێتەوە کە خوا پەیوەندیی بەردەوامی لەگەڵ بەندەی خۆیدا هەیەو، لەگەڵ مسوڵماناناندا هەیە.

٥- ئەگەر بە یەکجار دابەزیبایە، دەبووایە بە یەکجاریش جێبەجێ کرابایە، کە ئەوەش زۆر قورس دەبوو.

٦- هەر بەشێك لە وەحیی بەڵگەیەکی سەربەخۆیە، بۆیە ئەوە بەردەوام لە تەمەنی پێغەمبەردا تازە بۆتەوە.

دەگونجێ زۆر حیکمەتی دیکەش لەو بارەوە بگوترێن.

لە کۆتایی دا خوا فەرموویەتی:

٧)- ﴿ٱلَّذِينَ يُحۡشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ إِلَىٰ جَهَنَّمَ﴾، ئەوانەی کە لەسەر ڕوویان بەرەو دۆزەخ کۆ دەکرێنەوە.

٨)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴾، ئەوانە شوێنیان خراپترە کە دۆزەخەو ڕێگاشیان گومڕاترە کە ڕێی شیرك و کوفرو لادان و تاوانە.

لە کۆتایی دا ئەم فەرمایشتە دێنین: [عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رسول الله ﷺ يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى ثَلاَثَةِ أَصْنَافٍ: صِنْفٌ عَلَى الدَّوَابِ، وَصِنْفٌ عَلَى الأَقْدَامِ، وَصِنْفٌ عَلَى الْوُجُوهِ] (أخرجه التِّرمِذِيُّ: ٣١٤٢، وَحَسَّنَهُ)، واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خەڵك لە ڕۆژی دوایی دا بە سێ جۆران کۆدەکرێنەوە، ١- هەندێکیان بە سواریی (بەڕێزو حورمەتەوە) و، ٢- هەندێکیان بە پێیان دەچن و، ٣- هەندێکیشیان لەسەر ڕوویان (ڕادەکێشرێن).

ئنجا یەکێ لە پێغەمبەری پرسی ﷺ گوتی: چۆن لەسەر ڕوو دەڕۆن؟ فەرمووی: ئەو زاتەی کە لەسەر پێیەکانیان ڕۆیشتاندوونی، بە توانایە کە لەسەر ڕووەکانیشیان بیانڕۆیشتێنێ[1].

هەڵبەتە کە دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴾، پێویستە ئەوەندە بزانین، کە مەبەست پێی ئەوەنیە کە خوا بەراوردی جێگەو ڕێگای بەهەشتییەکان و ڕێبازەکەیان بکات، لەگەڵ هی کافرەکان دا، بەڵکو یانی بە موتڵەقیی جێ و ڕێی کافرەکان زۆر زۆر خراپە و، ڕێگەکەشیان زۆر زۆر گومڕایانەو سەر لێ شێواوانەیە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

(١ [عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثَلاَثَةَ أَصْنَافٍ: صِنْفٌ مُشَاةً، وَصِنْفٌ رُكْبَانٌ، وَصِنْفٌ عَلَى وُجُوهِهِمْ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ يَمْشُونَ عَلَى وُجُوهِهِمْ قَالَ إِنَّ الَّذِي أَمْشَاهُمْ عَلَى أَرْجُلِهِمْ قَادِرٌ عَلَى أَنْ يُمْشِيَهُمْ عَلَى وُجُوهِهِمْ، أَمَا إِنَّهُمْ يَتَّقُونَ بِوُجُوهِهِمْ كُلَّ حَدَبٍ وَشَوْكٍ] أخرجه أحمد: ٨٦٣٢، وأخرجه أيضا: [عَنْ نُفَيْعٍ قَالَ سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! كَيْفَ يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى وُجُوهِهِمْ؟ قَالَ إِنَّ الَّذِي أَمْشَاهُمْ عَلَى أَرْجُلِهِمْ قَادِرٌ عَلَى أَنْ يُمْشِيَهُمْ عَلَى وُجُوهِهِمْ]: ١٢٧٠٨.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان دە (١٠) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (٣٥ - ٤٤)، لـەم دە (١٠) ئایەتـەدا، سـەرەتا خـوا ئامـاژەی کـورت بـە هـەرکام لـە مووسـاو هـاڕوون صـەڵات و سـەلامی خوایـان لەسـەر بـێ و، خەڵـکی میسـر دەکات، پاشـان نـووح و گەلەکـەی، صـەڵات و سـەلامی خـوا لەسـەر نـووح بـێ، دوایـی بـاسی گـەلانی عـادو سـەموود و هـاوەڵانی ڕەسـس و گـەلی لووطیـش کـراوە، صـەڵات و سـەلامی خـوا لەسـەر لـووط بـێ، کـە بـە هـۆی کوفـر و سـتەمەوە، خـوا هەموویـانی فەوتانـدوە.

دواییـش بـاسی بیبڕوایـانی ڕۆژگاری پێغەمبـەری کۆتایـی موحەممـەد ﷺ کـراوە، کـە چـۆن گاڵتەیـان پێکـردوەو، گوتوویانـە: ئەگـەر هاتبـاو خۆڕاگـر نەبایـن لەسـەر پەرسـتراوەکانمان، موحەممـەد لای دەدایـن، پاشـان خـوا عزوجـل مـۆری ئـارەزوو پەرسـتیی و، وەك ئـاژەڵ بـوون و، بگـرە گومڕاتریـش بـە نێوچـاوانی ئـەو کافرانـەی ڕۆژگاری پێغەمبـەری کۆتاییـەوە دەنـێ.

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَـٰبَ وَجَعَلْنَا مَعَهُۥٓ أَخَاهُ هَـٰرُونَ وَزِيرًا ﴿٣٥﴾ فَقُلْنَا ٱذْهَبَآ
إِلَى ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا فَدَمَّرْنَـٰهُمْ تَدْمِيرًا ﴿٣٦﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ لَّمَّا كَذَّبُوا۟ ٱلرُّسُلَ
أَغْرَقْنَـٰهُمْ وَجَعَلْنَـٰهُمْ لِلنَّاسِ ءَايَةً ۖ وَأَعْتَدْنَا لِلظَّـٰلِمِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٣٧﴾ وَعَادًا وَثَمُودَا۟
وَأَصْحَـٰبَ ٱلرَّسِّ وَقُرُونًۢا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا ﴿٣٨﴾ وَكُلًّا ضَرَبْنَا لَهُ ٱلْأَمْثَـٰلَ ۖ وَكُلًّا تَبَّرْنَا
تَتْبِيرًا ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ أَتَوْا۟ عَلَى ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِىٓ أُمْطِرَتْ مَطَرَ ٱلسَّوْءِ ۚ أَفَلَمْ يَكُونُوا۟ يَرَوْنَهَا ۚ بَلْ
كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ نُشُورًا ﴿٤٠﴾ وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَـٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ
ٱللَّهُ رَسُولًا ﴿٤١﴾ إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا لَوْلَآ أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا ۚ وَسَوْفَ

﴿يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ أَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ﴿٤٣﴾ أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٤﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

[بە دڵنیایی ئێمە کتێبمان بە مووسا داو، هاروونی برایشیمان لەگەڵی کردە وەزیر (٣٥) پێمان گوتن: بچنە لای ئەو خەڵکەی ئایەتەکانیانمان بە درۆ دانا، (دارو دەستەی فیرعەون)، ئیدی سەرەنجام بە سەختیی کاولمان کردن (٣٦) هەروەها گەلی نووحیش کاتێک پێغەمبەرانیان بە درۆ دانان، (لە تۆفاندا) نغرۆمان کردن و، بۆ خەڵکی کردمانن نیشانەو (پەندو) بۆ ستەمکارانیش ئازارێکی بە ئێشمان ئامادە کردوە (٣٧) هەروەها گەلی عادو، گەلی سەموودو، هاوەڵانی ڕەسس و گەلێك سەدەی دیکەش لەو نێوانەدا (پێغەمبەرانیان بۆ نێردراون) (٣٨) هەرکامێکیان وێنەمان بۆ هێنانەوە (لە گەلە فەوتێنراوەکان) و هەمووشیانمان (دوای سزابار بوونیان) تەفرو توونا کردن (٣٩) بە دڵنیاییش ئەوان (بێبڕوایانی ڕۆژگاری تۆ ئەی موحەممەد! لەسەفەری شامیاندا) بەلای ئەو شارەدا ڕەتبوونە، کە بارانێکی خراپی بەسەردا بارێنرا (بەرد بارانکرا) ئایا نەیاندەدی؟! بەڵکو بە هیوای زیندوو کرانەوە نین! (بۆیە ئەوە هەڵوێستیانە) (٤٠) کاتێکیش (کافرەکانی گەلەکەت) دەتبینن، تەنیا گاڵتەت پێ دەکەن، دەڵێن: ئا ئەمەیە خوا بە پێغەمبەر ناردوویەتی! (٤١) نیزیك بوو ئەگەر خۆڕاگر نەباین لەسەریان (لەسەر پەرستراوەکانمان)، گومڕامان بکات و، لەپەرستراوەکانمان لامان بدات! دوایی کاتێك سزاو ئازار دەبینن، دەزانن کێ گومڕاترە! (٤٢) ئایا ئەو کەسەت دیوە کە ئارەزووی خۆی بە پەرستراوی گرتوە؟ ئنجا ئایا تۆ بەسەریەوە دەبیە پارێزەر (نەهێڵی لابدات)؟ (٤٣) یان ئایا پێت وایە: زۆربەیان دەبیستن یان دەفامن! نەخێر، تەنیا وەك ئاژەڵان وان، بگرە ڕێ هەتڵەکەرتریشن (٤٤)].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(تَبَّرْنَا): (التَّبْرُ: الكَسْرُ وَالإِهْلَاكُ)، (تَبْر)، واتە: شکاندن و فەوتاندن، ئنجا (تَبَّرَ، يُتَبِّرُ، تَتبِيراً)، واتە: تێکیشکاند، تەفروتوونای کرد، بە تێکشکاندن و تەفروتوونا کردن.

(هُـزُوًا ): (الهُـزْءُ: مَـزْحٌ فِي خِفْيَـةٍ)، (هُـزء) بریتییە لە گاڵتە پێکردنێکی پەنهان، (الهُـزْءُ: مَصْـدَرٌ هَـزِءَ بِـهِ، وَالوَصْـفُ لِلْمُبَالَغَـةِ، لأَنَّـهُ صَـارَ نَفْـسَ الهُـزءِ)، وشەی (هُـزء) چاوگە، یانی: گاڵتە پێکردن، (هَـزِءَ بِـهِ)، واتە: گاڵتەی پێکرد، بەڵام کە فەرموویەتی: ﴿ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُـزُوًا ﴾، ئەو وەسفە بۆ زێدەڕۆییە، یانی: بۆتە خودی گاڵتە پێکردنەکە، ئەگەرنا یانی: (مَهـزُوءٌ بِـهِ)، واتە: تۆ دەگیرێن بە گاڵتە پێکراو.

(وَكِيلًا ): (وَكِيـل: فَعِيـلٌ بِمَعنَـى مَفعُـول)، (وَكِيـل)، لەسەر کێشی (فعیـل)ە، بەڵام بە مانای (مفعـول)ە، یانی: (مَوكُـولٌ إِلَيـهِ)، کارپێسـپێردراو، هەروەها (وَكِيـل)، بە مانای پارێزەریش دێت.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ أَرَءَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ﴿٤٣﴾ ﴾، لەو بارەوە ئەم دەقە هاتوە: [عَنْ عَبدِ اللهِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا فِي قَولِهِ: ﴿ أَرَءَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ﴾، قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ يَعبُدُ حَجَراً أَبيَض زَمَاناً مِنَ الدَّهرِ فِي الجَاهِلِيَّةِ، فَإِذَا وَجَدَ حَجَراً أَحسَنَ مِنهُ، رَمَى بِهِ، وَعَبَدَ الأَخَرَ، فَأَنزَلَ اللهُ الآيَةَ] (أخرجه إبنُ أَبِي حاتَم فِي تَفسِيرِهِ: ١٥١٩٩، وَإِبنُ مَردَوِيَه فِي تَفسِيرِهِ كَما فِي «الدُّرِّ المَنثُور»: ج٦، ص٢٦٠، وَمِن طَرِيقِهِ الضِياء المَقدِسي فِي «الأَحادِيث المُختارَة»: ١٢٠٢، قُلنا: وَسَنَدُهُ حَسَنٌ)[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، لەبارەی فەرموودەی خواوە کە دەفەرموێ: ﴿ أَرَءَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ﴿٤٣﴾ ﴾، دەڵێ: لە سەردەمی نەفامیی دا پیاوێك (یەكێك لە پیاوەكان، كۆڕەكە كۆڕی پیاوان بووە، ئەگەرنا ئافرەتیشیان هەروا بوون)، ڕۆژگارێك بەردێكی سپی دەپەرست، (ماوەیەكی زۆر بەردێكی سپی دەپەرست)، كاتێك بەردێكی لەو چاكتر و جوانتری دەبینی، ئەو بەردەی پێشێی [كە ڕۆژگارێك پەرستوویەتی] فڕێی دەداو ئەوەی دیكەی دەپەرست، ئنجا خوا ﷻ لەو بارەیەوە ئەوەی ناردە خوار: ئایا ئەو كەسەت دیوە كە ئارەزووی خۆی بە پەرستراوی گرتوە، ئنجا ئایا تۆ بەسەریەوە دەبیە پارێزەر (نەهێڵی لابدات)؟

---

(١) الإِستيعَاب فِي بَيَان الأَسبَاب: ج٣، ص١٥ و ١٦.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ وەك لـە پێناسـەی ئـەم دەرسـەدا باسـمان كـرد، لـەم (١٠) ئایەتـەدا سـەرەتا ئاماژەیـەكی كـورت دەكات بـە ژمارەیـەك لـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) و گەلـە فەوتـاو و غـەزەب لێگیـراوەكانی هەندێـك لـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، دواییـش بـاسی هەڵوێسـتی كەللـە ڕەقانـەو نەرێنییانـەی ئـەو خەڵـك و كۆمەڵگایـە دەكات، كـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ لـە نێویانـدا بـووە، واتـە: بـە پلـەی یەكـەم هـۆزی قوڕەیـش كـە لـە مەككـە بـوون و، هەروەهـا خەڵـكی دەوروبـەری مەككـەش، دەفەرمـوێ:

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَا مَعَهُۥٓ أَخَاهُ هَٰرُونَ وَزِيرًا ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمـە كتێبـمان بـە مووسـادا {كـە مەبەسـت تەوڕاتـە} و هـاڕوونی برایشـیمان لەگەڵیـدا كـردە وەزیـر، وەزیـر، واتـە: هـاوكار، یارمەتییـدەر، پشـتیوان، وەزیـری ئێسـتاش لـەم ڕۆژگارەی ئێمـەدا، بۆیـە پێـی دەگوتـرێ وەزیـر، - ئـەو زاراوەیـەش لەمێـژە داهاتـوە و لـە سـەردەمی ئومەوییـەكان و عەبباسییەكانیشـەوە بەكارهێنراوە - لەبـەر ئـەوەی وەزیـرەكان پاڵپشـت و هـاوكارن بـۆ ئـەو كەسـە كـە ئـەو قـەوارە سیاسـییە سەرپەرشـتیی دەكات، وەك سـەرۆكی حكوومـەت.

هەڵبەتـە هـاڕوون ﷺ وێـڕای ئـەوە كـە پاڵپشـتی مووسـا ﷺ بـووە، یەكـێ بـووە لـە پێغەمبـەرانی خـواش، چونكـە خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (مریـم)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ مُوسَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخْلَصًا وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ﴿٥١﴾ وَنَٰدَيْنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَٰهُ نَجِيًّا ﴿٥٢﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥ مِن رَّحْمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيًّا ﴿٥٣﴾ ﴾، واتـە: هەروەهـا یـادی مووسـا بكـە لـە كتێبـدا كـە هەڵبـژاردە بـوو و، ڕەوانەكـراوو پێغەمبـەر بـوو و، لـەلای چیـای طـووڕ نیزیكـمان خسـتەوەو، بـە شـێوە تایبـەت دواندمـان (قسـەمان لەگەڵـدا

کـرد) و لـە بەزەیـی خۆمانـەوە هـارِوونی برایشـیمان بـۆ کـردە پێغەمبـەر و پێـمان بەخـشی.

تاکـو بـۆی ببێتـە هـاوکار و یارمەتییـدەر، دیـارە لەسـەر داوای خـۆی: مووسـا ﷺ داوای لـە خـوای پـەروەردگار کـردوە کـە هـارِوونی بـرای پـێ ببەخشـێ، وەك پێغەمبـەرو، هـاوکارو یارمەتییـدەر: ﴿ وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ﴿٣١﴾ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ﴿٣٢﴾ ﴾ طـه.

ئنجـا ئایـا خـوا چـی بـە مووسـا و هـارِوون فەرمـوو؟! ﴿ فَقُلۡنَا ٱذۡهَبَآ إِلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾، پێـمان فەرمـوون: بـرِۆن بـۆ لای ئـەو کۆمەڵـە خەڵکـە کـە ئایەتـەکانی ئێمەیـان بـە درۆ دانـاون، کـە مەبەسـت پێیـان گـەلی میسـرە، بـە سـەرۆکایەتیی فیرعـەون و هامـان و قـارِوون، ﴿ فَدَمَّرۡنَٰهُمۡ تَدۡمِيرٗا ﴾، سـەرەنجام لەبەینـمان بـردن، کاوڵمـان کـردن، وەك چـۆن خانووێـك کاول دەکـرێ و دەڕووخێـنرێ، ئـاوا ڕووخاندمانــن.

هەڵبەتـە لێـرەدا خـوا زۆر بـە کورتیـی ئـەم بەسـەرهاتە دەگێڕێتـەوە، کـە ئێمـە لـە سـوورەتی (الأعـراف)دا، بـە درێژیـی قسـەمان لێکـردوەو لێـرە هەمـووی پێچراوەتەوەو، خـوا ﷻ لـەم سـوورەتەدا تەنیـا شـوێنی مەبەسـتی باسـکردوە، ئەگەرنـا کـە خـوا بـە مووسـاو بـە هـارِوونی فەرمـوو: بـرِۆن بـۆ لای ئـەو خەڵکـەی بڕوایـان بـە ئایەتـەکانی ئێمـە نەکـرد، وردەکاریـی زۆری تێدایـە کـە چـوون بـۆ لای فیرعـەون و وتووێژیـان لەگەڵـدا کـردو، فیرعـەون گـوتی: پـەروەردگاری جیهانییـان کێیـە؟ مووسـا ﷺ بەڵگەی بـۆ هێنایـەوە، وەك لـە سـوورەتی (الشـعراء)دا، پێـی دەگەیـن، هەروەهـا لـە سـوورەتی (طـە)دا، پێشـتر باسـمان کـرد، ئنجـا دوایـی فیرعـەون پێـی دەڵـێ: بەڵگـەت چییـە؟ مووسـاش دوو بەڵگـەی زۆر سـەرنج ڕاکێـشی پێشـان دەدات، یەکـەم: گۆچانەکـەی کـە دەبێتـە حەزیـا، دەبێتـە ئەژدیهایـەکی گـەورە، هەروەهـا دەسـتیشی کـە لە بـن هەنگڵی دەری دێنـێ، وەك چرایەکی زۆر تیشـکدەر دەتایسـێ و شـۆق دەدا، بـەڵام دوای ئەوەش

هـەر بڕواناهێنـن: فیرعـەون و قـاڕوون و هامـان و، گەلەکەیـان، سـەرەنجام خـوا ﷻ فەرمـان بـە بەنـوو ئیسـرائیل دەکات ڕابکـەن، خۆیـان قوتـار بکـەن، ئەوانیـش بـەرەو دەشـتی سـینا دێـن، بـەڵام دەریـای سـووریان دێتـە پێـش، خـواش دەریایـان بـۆ لـەت دەکات، هەڵبەتـە دوای ئـەوەی مووسـا ﷺ گۆچانەکـەی لـە دەریاکـە دەدا، وەك خـوا فەرموویـەتی: ﴿ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ ﴾ الشعراء، فیرعـەون و سـوپایەکەشی بـەدوای ئەوانـدا دێـن، وا دەزانـن ئـەوە هـەر شـەقامەڕێ بـووە، ئیـدی ئەوانیـش بـەدوای وانـدا تێیدەکـەن، ئنجـا دوای ئـەوەی کۆتـا کـەسی گـەلی مووسـا ﷺ دەردەچـن لـە دەریـا و، کۆتـا کـەسی سـوپای فیرعـەون دێتـە نێـو دەریـا، دەریـا وێـك دەکەوێتـەوەو هەموویـان نغـرۆ دەبـن، ئنجـا ئاوەیـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَدَمَّرۡنَٰهُمۡ تَدۡمِيرٗا ﴾.

ئنجـا بـاسی گـەلی نـووح ﷺ دەکات: ﴿ وَقَوۡمَ نُوحٖ لَّمَّا كَذَّبُواْ ٱلرُّسُلَ أَغۡرَقۡنَٰهُمۡ ﴾، خەڵـك و گـەلی نووحیـش دوای ئـەوەی پێغەمبەرانیان بـە درۆ دانا، ئێمە لـە ئـاودا نغرۆمـان کـردن، خنکاندمانـن، ﴿ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ لِلنَّاسِ ءَايَةٗ ﴾، بـۆ خەڵـکی کردمانـە نیشـانە، پەنـدو عیبرەتێـك وەك نیشـانەیەکی دیـار، ﴿ وَأَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴾، بـۆ ستەمکارانیش، سـتەمکارانی ڕۆژگاری تـۆش ئـەی موحەممـەد و ﷺ! هەمـوو ڕۆژگارەکانی دیکـەش: ئازارێـکی بـە ئێشـمان ئامـادە کـردوە، واتـە: بەسـەرهاتی نووحیـش ﷺ خـوا لێـرەدا بـە یـەك ئایـەت خوڵاصـەو پوختـەی کردۆتـەوە، ئنجـا جێـی سـەرنج ئەوەیـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ كَذَّبُواْ ٱلرُّسُلَ ﴾، گـەلی نـووح ﷺ پێغەمبەرانیـان بـە درۆ دانـا، هەڵبەتـە واپێدەچـێ نـووح یەکەمیـن پێغەمبـەری خـاوەن ئوممـەت بووبـێ، بێگومـان پێـش ویـش پێغەمبـەرانی دیکـە هاتـوون، بـەڵام واپێدەچێ: هەمـوو ئـەو خەڵکـەی لـە ڕۆژگاری نـووح دا بـوون، هەمـوو ئـەو مرۆڤانە بـۆ هەموویـان نێردرابـێ، بـەڵام بۆچـی دەفەرمـوێ: ﴿ كَذَّبُواْ ٱلرُّسُلَ ﴾؟

لەبـەر ئـەوەی گـەلی نـووح کـە بڕوایـان بـە نـووح ﷺ نەکـردوە، لەبـەر خـودی خـۆی نەبـووە، بەڵکـو لەبـەر ئـەو پەیـام و بەرنامەیـە بـووە کـە پێیـدا نێـردراوە،

کە پەرستنی خوایە بە تەنیا و پابەند بوونە بە شەرعی خواوەو، بەڕێوەچوونە بەپێی هیدایەت و بەرنامەی خوا، پاشان بڕوا بوونە بە ڕۆژی زیندوو بوونەوەو سزاو پاداشت و، بەهەشت و دۆزەخ و، خۆپاراستنە لە قەدەغەکراوەکان و، خۆ ڕازاندنەوەیە بە سیفەتە بەرزەکان و ...هتد.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلَام) بەو جۆرە بەرنامەو ڕێبازەوە هاتوون، کەواتە: کەسێ بڕوا بە یەکێکیان نەکات، ئەوە لەبەر بەرنامەکەیەتی، بڕوای پێناکات، کەواتە: وەك بڕوای بە هیچ کامیان نەکردبێ وایە.

ئنجا خوا ﷻ ئاماژە دەکات بە سێ کۆمەڵە خەڵکی دیکە: ﴿ وَعَادًا وَثَمُودَاْ وَأَصْحَٰبَ ٱلرَّسِّ ﴾، هەروەها گەلی عادو، گەلی ئەموود و، هاوەڵانی ڕەسس، کە وەك دوایی باسی دەکەین: (ڕەسس) هەندێك گوتوویانە: بە مانای بیرێك دێ، کە ئەوانە هاوەڵی بیر بوون و، هەندێك گوتوویانە: (أَصْحَابُ الرَّس)، هەر هەمان گەلی مەدیەنن، خوا دەفەرموێ: ئەوانیشمان فەوتاند، ﴿ وَقُرُونَۢا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا ﴾، هەروەها لەو نێوانەدا، زۆر سەدەی دیکەش، واتە: لە نێوان نووح و ئەو پێغەمبەرانەدا کە بۆ گەلی عادو گەلی ئەموود نێردراون، کە هوود و صالح بوون (علیهما السلام)، هەروەها (أصحابُ الرَّس)، کە ئەگەر پێغەمبەرەکەیان شوعەیب بووبێ، یاخود پێغەمبەرێکی دیکە بووبێ، ناوی نەهاتوە، زۆر سەدەی دیکەمان فەوتاندوون، لە ئەنجامی ئەوەداکە پێغەمبەرانیان بۆ ڕەوانکراون و، ئەوانیش بڕوایان پێ نەهێناون.

﴿ وَكُلًّا ضَرَبْنَا لَهُ ٱلْأَمْثَٰلَ ﴾، هەرکامیش لەو گەلانە کە فەوتاندوومانن، وێنەمان بۆ هێناونەوە، واتە: بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم السلام) و بەسەرهاتی گەلە فەوتاوەکانمان بۆیان هێناونەوە، کە وەك ئەوان مەکەن و پەندیان لێ وەربگرن، ﴿ وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا ﴾، هەر کامێکیشیانمان کاول کردوەو فەوتاندوە، بە فەوتاندنێکی زۆر سەرسوڕهێنەر.

ئنجا باسی دوا کۆمەڵە خەڵك و دوا کۆمەڵگا دەکات، کە خوا ﷻ سزای داون لەسەر ئەوەی بڕوایان بە پێغەمبەران نەهێناوە، کە گەلی لووطە، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَتَوْا عَلَى الْقَرْيَةِ الَّتِي أُمْطِرَتْ مَطَرَ السَّوْءِ ﴾، کاتی خۆی ئەوان تێپەڕیون بەلای ئەو شارەدا کە بارانێکی خراپی بەسەردا بارێنرا، لە شوێنەکانی دیکە خوای باڵادەست باس دەکات کە بارانی خراپ، واتە: بەرد بارانکردن، لەسەرێوە خوا ﷻ بەردی سوورەوە کراوی بەسەر گەلی لووط دا باراندن، (قَرية) واتە: شاری گەورە، ئەو شارەش کە ئەو بارانەی بەسەردا بارێندرا، هەندێك دەڵێن: سەدووم بووە، هەندێك دەڵێن: عەموورە بووە، هەندێك دەڵێن: بەڵکو پێنج شار بوون، بەڵام وەك یەك شار خوا باسی کردوون، چونکە لە نیزیك یەکدی بوون و، شوێنەکەشیان ئێستا بۆتە دەریاچەی مردوو (بَحرُ الميِّت)، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَتَوْا عَلَى الْقَرْيَةِ الَّتِي أُمْطِرَتْ مَطَرَ السَّوْءِ ﴾، بە دڵنیایی ڕەت بوو بوون بەلای ئەو شارەدا کە بارانی خراپی بەسەردا بارێندراوە، لەبەر ئەوەی خەڵکی حیجاز بە گشتیی و، قوڕەیش بەتایبەت کە بۆ بازرگانیی دەچوون بۆ شام، هەمیشە بەلای دەریاچەی مردوودا تێدەپەڕین، بۆیە دەفەرموێ: بەلایدا تێپەڕیون، ﴿ أَفَلَمْ يَكُونُوا يَرَوْنَهَا ﴾، ئەدی نەیاندەبینی؟ ئایا نەیاندەبینی کە چۆن کەسیان لێ نەماوە، شوێنەکەشیان بۆتە دەریاچەیەك، کە ئێستاش ماوە، دەریاچەی مردوو، کە هیچ زیندەوەرێکی تێدانیە، بۆیەش وای پێ دەگوترێ، واتە: نەك هەر ئاژەڵ، نەك هەر زیندەوەر، بەڵکو ڕووەکیشی تێدا ناژێ، لەبەر ئەوەی کە ڕێژەی خوێیەکەی زۆر زۆرە، ئایا نەیاندەبینی؟ ﴿ بَلْ كَانُوا لَا يَرْجُونَ نُشُورًا ﴾، بەڵکو ئەوانە بە ئومێدی بڵاوکرانەوەو زیندووکرانەوە (و سزاو پاداشت) نەبوون، بۆیە ئەو هەڵوێستە خراپ و نەرێنییەیان لە بەرانبەر تۆدا هەیە ئەی موحەممەد ﷺ!

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا ﴾، هەروەها (ئەی موحەممەد! ﷺ خەڵکە کافرو کەللەڕەقەکەی تۆش) کاتێك تۆ دەبینن، هەر بە گاڵتەت دەگرن، واتە: هەر دەتکەنە گاڵتە پێکراو ﴿ أَهَٰذَا الَّذِي بَعَثَ اللَّهُ

رَسُولًا ﴾، (دەڵێن:) ئا ئەوەیە کە خوا بە پێغەمبەر ڕەوانەی کردوە؟! وەك هەموو کەس لەوی چاکتر بێ! یان ئەو شایستەی ئەوە نەبێ! بۆیە خوا ﷻ لە سوورەتی (الأنعام)دا وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥ ﴿١٢٤﴾ ﴾، واتە: خوا دەزانێ پەیامی خۆی لەکێدا دادەنێ، بە کێی دەسپێرێ، یان لە سوورەتی (الزخرف)دا، کە ئەوان دەڵێن: ﴿ وَقَالُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنَ ٱلۡقَرۡيَتَيۡنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ ﴾، واتە: دەبووایە ئەم قورئانە دابەزێتە سەر یەکێك لە دوو پیاوە گەورەکانی دوو شارەکە، کە مەبەستیان پێیان مەککەو طائیف بووە، ئنجا دوو پیاوە گەورەکان، ئایا دەبێ هی مەککە نەبوو جەهل و، ئەوەی طائیف عوتبەی کوڕی ڕەبیعە بووبێ؟ زانایان لەو بارەوە ڕاجیاییان هەیە، گوتوویانە: ئەوانە ساماندار و بە خزم و قەومن و دەسەڵاتیان هەیە، ئەوانە شایستەن، خوا بیانکاتە پێغەمبەر ﷺ، تەرازوو و پێوەری ئەوان ئەو شتانە بوون: بزانن: کێ سامانی زیاترە؟ کێ دەستەڵاتی زیاترە؟ کێ خزم و قەومی زیاترە؟ بەڵام پێوەری خوا، شتێکی دیکەیە، پێوەری خوا ئەوەیە کە ئەو مرۆڤە خۆی چەند شایستەیە: عەقڵی، زگماك (فطرة)ی ئەدەب و ڕەوشتی، مەعدەنەکەی، سیفەتە بەرزەکانی، ئەوە پێوەری خوای پەروەردگارە، بۆیەش دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥ ﴿١٢٤﴾ ﴾ الأنعام، واتە: خوا خۆی زاناترە پەیامی خۆی دەدا بە کێ، کێ شایستەیەتی؟

دوایی کافرەکان دەڵێن: ﴿ إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنۡ ءَالِهَتِنَا ﴾، نیزیك بوو لە پەرستراوەکانمان لامان بدات، گومڕامانبکات، هەڵەمانبکات، ﴿ لَوۡلَآ أَن صَبَرۡنَا عَلَيۡهَا ﴾، ئەگەر خۆمان لەسەریان ڕانەگرتبایە، لەسەر پەرستراوەکانمان، خەریك بوو لامان بدات، بمانبات بۆ تەنیا خواپەرستیی، وازمان پێ لەو بت و صەنەم و پەرستراوانە بێنێ، بەڵام خۆمان لەسەر ڕاگرتن و بەردەوام بووین و دەستبەرداریان نەبووین!

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَسَوْفَ يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴾، لەمەودوا کاتێك كە ئازار و سزای خوا دەبینن، بۆیان دەردەكەوێ (دەزانن) كێ هەتلەترە، كێ لە ڕێ لادەرترە، كێ زیاتر ڕاستەڕێی ونكردوەو لێی بزر بووە؟!

لە كۆتایی دا، خوا ﷻ وەك مۆرێك بە نێو چاوانی كافرەكانی ڕۆژگاری پێغەمبەری ﷺ وەدەنێ، كە ئەوانە هەر ئارەزوو دەپەرستن و، ئەوانە هەستەوەرەكانی خۆیان و عەقڵ و هۆشی خۆیان بەكارناهێنن و لە دەستیان داون، وەك ئاژەڵن و لە ئاژەڵیش خراپترن، دەفەرموێ: ﴿ أَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ﴾، ئایا ئەو كەسەت بینیوە (بە چاوی عەقڵ و دڵ) كە ئارەزووی خۆی كردوە بە پەرستراوی خۆی؟ ﴿ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ﴾، ئایا تۆ بەسەریەوە دەبیە پارێزەر؟ تۆ كارپێسپێردراوی ئەوی، تاكو نەهێڵی لابدات؟ ﴿ أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ﴾، یان ئایا پێتوایە كە زۆربەیان دەبیستن، یان دەفامن؟ واتە: دەبیستن، بیستنێك كە شایستەی مرۆڤە، كە ببیستن، ئەو قسەیە كە بۆی دەكرێ، هەڵیسەنگێنن، ﴿ أَوْ يَعْقِلُونَ ﴾، یاخود پێت وایە زۆربەیان دەفامن، ﴿ إِنْ هُمْ إِلَّا كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴾، لە جیاتی خوا ﷻ وەڵام بداتەوەو بفەرموێ: زۆربەیان نابیستن و نافامن، وا نافەرموێ، چونكە ڕستەی: ﴿ أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ﴾، ئەمە پرسیار كردنی نكووڵیلێكەرانەیە، واتە: پێتوایە دەبیستن و دەفامن؟ بە تەئكید نەخێر، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ إِنْ هُمْ إِلَّا كَٱلْأَنْعَٰمِ ﴾، ئەوانە تەنیا وەك ئاژەڵن، ئەم ﴿ إِنْ ﴾ە، (إن النافية)ی پێ دەڵێن، ئەمانە تەنیا وەك ئاژەڵن، واتە: حوشتر و ڕەشە وڵاخ و مەڕ و بزن، یاخود (أنعام) یانی: كۆی ئەو ئاژەڵانەی مرۆڤ لێیان بەهرەمەند دەبێ، بە یەك سمەكانیشەوە، ئەسپ و ماین و كەر و ئێستر و فیل و... هەموو ئەوانەی مرۆڤ لێیان بەهرەمەند دەبێ، ﴿ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴾، بەڵكو ڕێیان هەتلەتریشە لە ئاژەڵان، چونكە ئاژەڵەكان پابەندن و بەپێی ئەو سروشتە كە خوا لەسەری سروشتاندوون، بەپێی ئەو غەریزانە كە خوا بۆی داناون، كۆنترۆڵ كراون و بەڕێوە دەچن، بەڵام مرۆڤ حەواڵەی عەقڵ و ویستی

ئـازادی خـۆی کـراوە، ئنجـا ئەگـەر عەقڵەکـەی بەکارنەهێنـاو، ویسـتە ئازادەکـەشی بـە هەڵەداچـوو، ئـەو کاتـە مانـای وایـە لـە ئـاژەڵ خراپـتر دەبـێ، تاکـە هۆکارێکیـش بـۆ ڕاسـت بەکارهێنـانی عەقـڵ و بـە هەڵەدانەچـوونی ویسـتی ئـازادی مـرۆڤ و هەتڵەنەبـوونی، بووناسـیی و ئیـمان و هیدایـەتی خـوای بـەرز و مەزنـە.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

باسی ناردنی مووساو هاروونی برای (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) بۆ لای گەلی فیرعەون و، فەوتاندنیان و، ناردنی نووح ﷺ بۆ لای گەلەکەی و، نغرۆکردنیان لە تۆفانداو، فەوتێندرانی گەلانی عادو ثەموود و خاوەنانی ڕەسس و، گەلی لووط، کە خوا ﷻ ئاماژە ئاسا، باسی ئەو ژمارەیە لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) دەکات و، ئەو گەلە فەوتێنراوانەی ناوی پێغەمبەرەکانیشیان ناهێنێ، بەڵام زانراون و لە شوێنەکانی دیکە لە قورئاندا باسکراون:

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَا مَعَهُۥٓ أَخَاهُ هَٰرُونَ وَزِيرًا ﴿٣٥﴾ فَقُلْنَا ٱذْهَبَآ إِلَى ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا فَدَمَّرْنَٰهُمْ تَدْمِيرًا ﴿٣٦﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ لَّمَّا كَذَّبُوا۟ ٱلرُّسُلَ أَغْرَقْنَٰهُمْ وَجَعَلْنَٰهُمْ لِلنَّاسِ ءَايَةً ۖ وَأَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٣٧﴾ وَعَادًا وَثَمُودَا۟ وَأَصْحَٰبَ ٱلرَّسِّ وَقُرُونًۢا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا ﴿٣٨﴾ وَكُلًّا ضَرَبْنَا لَهُ ٱلْأَمْثَٰلَ ۖ وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ أَتَوْا۟ عَلَى ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِىٓ أُمْطِرَتْ مَطَرَ ٱلسَّوْءِ ۚ أَفَلَمْ يَكُونُوا۟ يَرَوْنَهَا ۚ بَلْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ نُشُورًا ﴿٤٠﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:**

**١)- ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ ﴾، بە دڵنیایی کتێبمان بە مووسا دابوو، بە مسۆگەری.**

**بۆچی خوا ﷻ لێرەدا جەختی لەسەر دەکاتەوەو، داکۆکیی لێ دەکات؟ چونکە لە نێو کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ، هەبوون و ئێستاش لە نێو کافرەکانی**

ئـەم ڕۆژگارەشـماندا، هـەن، کـە نکووڵیـی دەکات لـەوەی خـوا هیـچ کتێبێـکی دابەزاندبێ بـۆ هیـچ مرۆڤێـك و، هیـچ کەسێکی کردبێتـە پێغەمبـەر، بۆیـە خـوا ﷻ لە سـوورەتی (الأنعـام)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَىْءٍ ﴿٩١﴾ ﴾، واتـە: وەك پێویسـت ڕێـزی خوایـان نەگـرت، کـە گوتیـان: خـوا هیـچ شـتێکی دانەبەزاندۆتـە سـەر هیـچ مرۆڤێـك، وەحیـی بـۆ کـەس نەنـاردوە، لەوێـش دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَـٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ﴿٩١﴾ ﴾الأنعـام، بڵـێ: ئـەدی کـێ ئـەو کتێبـەی دابەزانـدە سـەر مووسـا کـە ڕۆشـنایی بـوو و ڕێنماییکار بـوو بـۆ خەڵـك؟ بۆیـە خـوا ﷻ لـە پێـش دا بـاسی مووسـا ﷺ ی کـردوەو بـاسی کتێبەکـەی کـردوە، چونکـە تـەوڕات زۆر نـاودار بـووە لـە نێـو خەڵـك دا، نـەك بـەس لـە نێـو جوولەکـەکان دا، بەڵکـو لـە نێـو کـۆی کۆمەڵـگاو میللەتـان دا نـاسراو بـووەو مەشـهوور بـووە، بەڵـێ دەسـتکاریی کـراوەو گـۆڕدراوە، بـەڵام کتێبێـك بـووە، لەبـەر دەسـتی جوولەکەکانـداو، ئێسـتاش هـەر هەیـە، کـە تەوڕاتیـش تەنیـا بـە چـوار سـیفرەکە دەگوتـرێ: [١-تكويـن ٢-وخـروج ٣-وتثنيـة ٤-وعـدد]، بـەڵام ئێسـتا پەیـمانی کـۆن ئـەو چـوار سـیفرەیە، لەگـەڵ (٣٥) سـیفری دیکـەش، (سـیفر یـانی: کتێـب)، هەمـووی پێـی دەگوتـرێ: پەیـمانی کـۆن، بەسـەرژمێری (قـراءة رعائیـة)ش، پەیمانـی کـۆن (العهـد القدیـم) چـل و نـۆ (٤٩) سـیفرە.

٢)- ﴿ وَجَعَلْنَا مَعَهُۥٓ أَخَاهُ هَـٰرُونَ وَزِيرًا ﴾، لەگەڵیدا هارۆونی برایشیمان کردە وەزیر، واتە: پاڵپشت، وشەی وەزیر لێرەدا بە مانای (وەزیر)ی ئێستا نیە، ئەو وەزیرەی ئێستا بۆیە وای پێدەگوترێ: چونکە پاڵپشتە بۆ سەرۆکی حکوومەت، ئەگەرنا وشەی وەزیر لە (وَزَرٌ)ەوە هاتوە، ﴿ كَلَّا لَا وَزَرَ ﴿١١﴾ ﴾القیامة، واتە: هیچ پەنایەك نیە، هیچ یارمەتییدەرێك نیە، وەزیر یانی: هاوکار و پشتیوان و دەستبارگر، کە دیارە هارۆون ﷺ، بۆ مووسای برای ﷺ بەو شێوەیە بووە، ئنجا خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

٣)- ﴿ فَقُلْنَا ٱذْهَبَآ إِلَى ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا ﴾، بە مووساو هارۆونمان فەرموو: بڕۆن بۆ لای ئەو خەڵکە، کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دانان.

٤)- ﴿ فَدَمَّرْنَٰهُمْ تَدْمِيرًا ﴾، ئیدی یەکسەر ئێمەش بەوێرانکردن کاولمان کردن، لەبەینمان بردن. بێگومان پێش ئەوەی هاروون و مووسا بچن، ئایەتەکانیان بە درۆ دانەنابوون، بەڵام یانی گوتمان: بچن بۆ لای ئەو خەڵکە، ئەوانەی کە دوایی ئایەتەکان و نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆ دانان. وشەی (آيَات)، کۆی (آيَة)ە، یانی: نیشانە، ئەو نیشانە چ ڕستەکانی فەرمایشتی خوابن، چ ئەو موعجیزانە بن کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) پێشانی خەڵکیان داون، چ دیاردە سروشتییەکان بن، لە قورئاندا ئەوانە هەر سێکیان بە (آيَات)، ناویان هاتوە، واتە: ڕستەکانی فەرمایشتی خوا کە دەخوێنرێنەوەو، موعجیزەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) کە پێشان دەدرێن و، دیارە سروشتییەکان کە لە گەردوون و دەوروبەردا هەن.

ئنجا خوا باسی گەلی نووح دەکات:

٥)- ﴿ وَقَوْمَ نُوحٍ لَّمَّا كَذَّبُواْ ٱلرُّسُلَ أَغْرَقْنَٰهُمْ ﴾، هەروەها خەڵکی نووحیش {کە نووح بۆ لایان ڕەوان کرا} کاتێك پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا، خنکاندمانن، لە تۆفاندا نغرۆمان کردن.

٦)- ﴿ وَجَعَلْنَٰهُمْ لِلنَّاسِ ءَايَةً ﴾، بۆ خەڵکیش کردماننە نیشانە، کردمانە جێی پەندو عیبرەتێك کە وەك نیشانە لە دوورەوە دیار بێ.

٧)- ﴿ وَأَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾، بۆ ستەمکارانیش سزایەکی بە ئێشمان ئامادە کردوە، پێشتریش باسمان کرد کە: گەلی نووح، تەنیا نووحیان بۆ لا ڕەوان کراوە، بەڵام خوا دەفەرموێ: هەموو پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا، چونکە ئەو پەیامەی بە نووحدا نێردرابوو، هەر هەمان پەیامە کە هەموو پێغەمبەران هێناویانە، ئەوانیش بۆیە دژایەتیی نووحیان کردوەو بڕوایان پێ نەهێناوە، چونکە لەگەڵ خودی پەیامەکەدا ناکۆك بوون، ئنجا هەر ئەو پەیامەشە کە خوا بە هەموو پێغەمبەراندا ناردوویەتی، بۆیە هەر کەسێك بڕوا بە یەکێك لە پێغەمبەران نەکات، وەك ئەوە وایە بڕوای بە هەموو پێغەمبەران نەکردبێ، چونکە هەموویان هەر یەك پەیامیان پێ بووە، لە هێڵە گشتییەکانیانیداو لە نێوەڕۆکیدا،

کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾، ستەمکاران، چ گەلی نووح بووبن، چ هۆزی قورەیش لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ، چ هەر کافرانێکی دیکە بووبن، ئەوانەی ستەم دەکەن لە پێغەمبەران، لە پەیامی خواو ستەم لە خۆیان دەکەن، ئەوانە ئازارێکی بە ئێشمان بۆ ئامادە کردوون، ئنجا ئاماژە دەکات بە سێ جۆرە گەلی دیکە، کە ئەوانیش هەر فەوتێنراون:

٨)- ﴿ وَعَادًا وَثَمُودَاْ وَأَصۡحَٰبَ ٱلرَّسِّ ﴾، هەروەها گەلی عاد و گەلی ئەموود و هاوەڵانی (ڕەسس)، واتە: ئەو سێیەشمان فەوتاندن، وشەی (عاد): دیارە بە تەنوینیش خوێندراوەتەوە: ﴿ وَعَادًا ﴾، هەروەها تەنیا بە سەر (فتحة)ش، خوێنراوەتەوە، بەڵام وشەی: ﴿ وَثَمُودَاْ ﴾، بەس بە فەتحەیەو بە تەنوین نیە، ﴿ وَأَصۡحَٰبَ ٱلرَّسِّ ﴾، هاوەڵانی ڕەسس، هاوەڵانی ڕەسس زانایان زۆریان لەبارەوە گوتوون و لە سوورەتی (الدخان)یش دا خوای پەروەردگار باسی کردوون، بەڵام گرنگ ئەوەیە (ڕەسس):

أ- زۆربەیان دەڵێن: بە مانای (بیر) دێ، کۆمەڵێك بوون بیرێکیان هەبووە، یان سەرچاوە کارێزێکیان هەبووە.

ب- هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: (أصحَابُ الرَّسِّ)، هەر هەمان (أصحَابُ الأَيكَة)و خەڵکی مەدیەنن، کە پێغەمبەرەکەیان شوعەیب ﷺ بووە.

ج- هەندێکیشیان گوتوویانە: بۆیە پێیان گوتوون: (أصحَابُ الرَّسِّ)، (ڕەسس) یانی لەبن گڵ خستن، یاخود نقووم کردن لە زەوییدا، دەڵێن: ئەوانەش (رَسُّوا نَبِيَّهُم فِي البِئرِ)، پێغەمبەرەکەی خۆیانیان خستۆتە بیرێکەوەو، سەری بیرەکەیان داپۆشیوە، بەو شێوەیە ئەو پێغەمبەرەی خۆیانیان کوشتوە، یاخود هەر لەبن گڵیان خستوە.

(الطبري) دەڵێ: (هُمْ قَومٌ كَانُوا عَلَى بِئْرٍ وَذَلِكَ أَنَّ الرَّسَّ كُلُّ مَحْفُورٍ مِثْلُ البِئْرِ وَالقَبْرِ)، واتە: ئەوانە کۆمەڵە خەڵکێك بوون لەسەر بیرێك بوون، چونکە (ڕەسس) بە هەر هەڵقەنراوێك دەگوترێ، هەر چاڵێك وەك بیر بێ، یاخود قەبر، هەر شتێك زەوی هەڵکۆڵدرێ، پێی دەگوترێ (ڕەسس)[1].

---

(١) لە تەفسیری سوورەتی (الدخان)دا زیاتر لە بارەیانەوە دەدوێین.

بەهەر حاڵ خوای پەروەردگار تەنیا ئەوەندەی پێ پێویست بووە کە بفەرمووێ: هاوەڵانی (ڕەسس)یش وەك گەلی عادو ثەموود فەوتێندران، گەلی عاد پێغەمبەرەکەیان هوود بوو، گەلی ثەموودیش پێغەمبەرەکەیان صالح بووە، بەڵام هاوەڵانی ڕەسس - ئنجا (ڕەسس) بیر بووبێ، یان هەر شتێك بووبێ- دیار نیە پێغەمبەرەکەیان کێ بووە، بەڵام وا دیارە ئەو کاتە لە نێو گەلی عەرەبدا و ڕەنگە لە زۆر شوێنی دنیادا، ئەوانەش وەك چۆن گەلی عادو ثەموود، ناوبانگیان هەبووەو ناسراو بوون، پێغەمبەرەکەشیان ناسراو بووەو، هاوەڵانی (ڕەسس)یش ناسراو بوون، بۆیە خوا ﷻ باسی ئەوانیشی لەگەڵ عادو ثەمووددا کردوە، وەك چۆن گەلی عاد پێشێ بووە، دوایی ثەموودی بەدوادا هاتوە، وا پێدەچێ هاوەڵانی ڕەسسیش بە دوای گەلی ثەمووددا هاتبن لە ڕووی کاتەوە.

٩)- ﴿ وَقُرُونًا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا ﴾، هەروەها زۆر سەدە لەو نێوانەدا، واتە: زۆر کۆمەڵگاش کە لە سەدەکان دا ژیاون، لەو نێوانەدا، ئەوانیش فەوتێنراون، دوای ئەوەی پێغەمبەرانیان (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) بۆ هاتوون و، وەڵامی پێغەمبەرانیان نەداوەتەوە، یاخود دژایەتییان کردوون، ئەوانیش بە هەمان شێوەی پێشووەکانیان فەوتێنراون.

١٠)- ﴿ وَكُلًّا ضَرَبْنَا لَهُ الْأَمْثَالَ ﴾، بۆ هەرکام لەو کۆمەڵگایانەش وێنەمان هێناونەوە، واتە: باسی پێغەمبەرانی پێشووی خۆیان و گەلەکانیان و ڕووداوەکانی کە لەپێش ئەواندا ڕوویانداون، بۆمان باسکردوون، کە وەك نموونەو وێنە هێنانەوە بوون، چونکە (مَثَل)، بریتیە لە وەسفێکی سەرسوڕهێنەر، یاخود قسەیەك کە وەك پەند وابێ.

١١)- ﴿ وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا ﴾، هەرکامێکیشیانمان فەوتاند، بە فەوتاندنێك [کە بەس خوا دەزانێ چۆن بووە!] (إستَأصَلنَاهُم: فَدَمَّرنَاهُم بِالعَذَابِ إبَادَةً)، چونکە (تَتبِير)، یانی: (التفتِيتُ للأجسامِ الصَّلبَة)، (تَتبِير)، واتە: وردوخاش کردنی ئەو تەنانەی ڕەقن، ڕەق و وشکن، کە بهاڕدرێن، پێی دەگوترێ: (تَتبِير)، کە دەفەرمووێ: ﴿ وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا ﴾، واتە: هەر کامێکیانمان ڕیشەکێش کردن بە سزا و قەلاچۆمان کردن.

ئنجا خوا باسی دوا گەل و کۆمەڵە خەڵکێك دەکات، کە فەوتاندوونی لەسەر ئەوەی وەڵامی پێغەمبەرەکەی خۆیانیان نەداوەتەوەو، لەسەر خراپەکاریی خۆیان بەردەوام بوون، کە بریتین لە گەلی لووط، بەڵام بە گەلی لووط ناویان ناهێنێ، بەڵکو بەو حاڵەتە کە بەسەریان هاتوە، بەو سزایەی کە پێی سزا دراون، بەوە پێناسەیان دەکا، دەفەرموێ:

١٢)- ﴿ وَلَقَدْ أَتَوْا عَلَى الْقَرْيَةِ الَّتِي أُمْطِرَتْ مَطَرَ السَّوْءِ ﴾، بەدڵنیایی تێپەڕیبوون بەلای ئەو شارەدا، کە بارانی خراپی بەسەردا بارێنرا، بارانە خراپەکە، خوا ﷻ لە زۆر شوێندا ڕوونی کردۆتەوە چی بووە؟ بۆ وێنە: دەفەرموێ: ﴿ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ ﴾الحجر، واتە: بەردێك کە قوڕی وشك کراوە بوو، سوورەوەکراو بوو، ئەوەمان بەسەردا باراندن، لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: خوا ئاگرو کیبریت (گۆگرد)ی بەسەردا باراندن، ئێمە بە تەفصیلَ لە سوورەتی (هود)دا باسی بەسەرهاتی لووطمان ﷺ کردوە، ئێستاش لە دەریاچەی مردوودا کە شوێنی شارەکانی گەلی لووط بووە، شوێنەوارناسان ئەو جۆرە بەردانە کە ئەوانی پێ فەوتێندراون و، پەیکەرە ئێسقانەکانی ئەو خەڵکەو خانووەکانیان، دەدۆزنەوە، کە خوای باڵادەست دەفەرموێ: ﴿ وَالْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَىٰ ﴿٥٣﴾ ﴾النجم، واتە: شارە هەڵگێڕدراوەکان خوا بەریدانەوە، شارەکانی گەلی لووط، وەك چۆن ئەوان زگماکێ کە خوا مرۆڤی لەسەر خوڵقاندوە، هەڵیانگێڕابۆوە، لە جیاتی ئەوەی پیاو لەگەڵ ئافرەتدا جووت بێ، پیاویان لەگەڵ پیاودا جووت دەبوو و، ئافرەتیان لەگەڵ ئافرەتیان، خوای پەروەردگاریش ئەوانی هەڵگێڕایەوە، شارەکانی گەلی لووط بەرزکراونەوەو، دوایی بەردراونەوە، چونکە لە شوێنێك دا دەفەرموێ: ﴿ وَالْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَىٰ ﴿٥٣﴾ ﴾النجم، واتە: (خوا) شارە هەڵگێڕدراوەکانی بەردایەوە، پێشێ بەرزکراونەوە، ئنجا بەردراونەوە، دواییش بەردی سوورەوەکراوی بەسەردا باراندوون.

ئنجا خوا دەفەرموێ: مسۆگەر بەلای ئەو شارەدا کە بارانی خراپی بەسەردا بارێندرا بوو، تێپەڕیبوون، چونکە خەڵکی مەککەو خەڵکی حیجاز، کە ئەگەر دەهاتن بۆ بازرگانیی بۆ شام، بەلای دەریاچەی مردوودا تێدەپەڕین و دەیانبینی،

ئـەو کاتـەش وەك بەسـەرهاتی دەمـاودەم هەمـوو کەسـێك بیسـتوویەتی، کـە ئـەو شـوێنە، ئـەو شـوێن دەریایـە کـە پێـی دەگوتـرێ: دەریاچـەی مـردوو، شـوێنی چەنـد شـارێك بـووە، شـارەکان سـەرەوبن کـراون و، خەڵکەکەیـان هەمـوو فەوتێنـدراون.

١٣)- ﴿ أَفَلَمْ يَكُونُواْ يَرَوْنَهَا ﴾، ئایا نەیاندەبینی (تاکو دەرس و پەندیان لێ وەربگرن؟).

١٤)- ﴿ بَلْ كَانُواْ لَا يَرْجُونَ نُشُورًا ﴾، بەڵکو هۆی بێبڕواییەکەیان ئەوەبوو، کە بڕوایان بە زیندوو بوونەوە، بە بڵاوکرانەوە بە سزاو پاداشت نەبوو.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أُمْطِرَتْ مَطَرَ ٱلسَّوْءِ ﴾، وشـەی ﴿ ٱلسَّوْءِ ﴾، یـانی: (الـضُرُّ وَالعَـذَاب)، زیـان و ئـازار و سـزا، بـەڵام وشـەی (سُـوء)، واتـە: خـراپ، ئـەو شـتەی بـۆ مـرۆڤ خـراپ بـێ، بـەڵام ﴿ ٱلسَّوْءِ ﴾: نـاوە، واتـە: سـزاو ئـازار.

**مەسەلەی دووەم:**

**کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەری خاتەم ﷺ گاڵتەیان بە پێغەمبەری خاتەم کردووەو، گوتوویانە: نیزیك بوو لە پەرستراوەکانمان گومڕامان بکات، خواش ﷻ بە ئارەزوو پەرست و بە لە ڕیزی ئاژەڵاندا حیسابکراویان دادەنێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا ﴿٤١﴾ إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا لَوْلَآ أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا ۚ وَسَوْفَ يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ أَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ﴿٤٣﴾ أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ۚ إِنْ هُمْ إِلَّا كَٱلْأَنْعَٰمِ ۖ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٤﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَإِذَا رَأَوْكَ ﴾، هەرکاتیش تۆیان بینی، دوای ئەوەی خوا ﷻ باسی ئەزموونی تاڵی ئەو گەلە ڕابردووانە دەکات و، باسی ژمارەیەك لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) کە مووساو هاڕوونی برای و، نووح و، دوایی ناوی ژمارەیەك لەو گەلانە دێنێ، کە فەوتێنراون، بەڵام باسی پێغەمبەرەکانیان ناکات و ناویان ناهێنێ، کە ئەوە وەك زەمینە خۆشکردنە بۆ ئەوەی باسی واقیعی ڕۆژگاری پێغەمبەری خاتەم ﷺ بکات، حاڵی پێغەمبەری خاتەم بەدەست گەلە کەللە ڕەق و خراپەکەیەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا رَأَوْكَ ﴾، (ئەوانەی بێبڕوان) کاتێك تۆیان بینی، ئەی موحەممەد!.

٢)- ﴿ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا ﴾، تەنیا تۆ بە گاڵتەپێکراو دەگرن، چونکە پێشتر باسمانکرد (هُزْء)، چاوگی (هَزَءَ)یە، (هَزَءَ بِهِ، يَهْزَءُ هُزْءاً وهزوا) (هُزُواً)، یانی: گاڵتە پێکردن، بەڵام لێرەدا ﴿ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا ﴾، واتە: لێرەدا کە حاڵەتەکەی ئەوان بە چاوگ وەسف کراوە، یانی: تۆ دەکەن بە خودی گاڵتەپێکردنەکە، ئەگەرنا لە ئەسڵدا یانی:

(إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلاَّ مَهْزُوءاً بِهِ)، تۆ دەکەن بە گاڵتەپێکراو، بەڵام یانی: پێغەمبەریان ﷺ کردوە بە خودی گاڵتەکە.

٣)- ﴿أَهَٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا﴾ (بە سەرسوڕمانەوە دەڵێن:) ئا ئەوەیە کە خوا کردوویەتە پێغەمبەر! هەڵبەتە ئەوان بەگشتیی بڕوایان بەوە نەبووە خوا پێغەمبەر بنێرێ، بەڵام مەبەستیان ئەوە بووە، تانە لە پێغەمبەر ﷺ بدەن، هەروەك لە (السيرة النبوية لابن هشام)دا هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ دەچێ بۆ لای گەلێك، خۆییان پێ دەناسێنێ، وەك پێغەمبەری خوا، یەکێکیان دەڵێ: خوا کەسی دەست نەکەوت بێجگە لەتۆ بیکاتە پێغەمبەر ﷺ؟! یەکێکی دیکەیان دەڵێ: ئەگەر تۆ پێغەمبەر بی، لەوە گەورەتری قسەت لەگەڵ بکەم و، ئەگەر پێغەمبەریش نەبی، شایستەی ئەوە نی قسەت لەگەڵ دا بکەم، ئاوا بەو شێوەیە قسەی ڕەق و بێتامیان کردوە[1].

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿أَهَٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا﴾، ئەمە پرسیار لێکردنێکی نکووڵیلێکەرانەیە، یانی: ئێمە بڕوامان وانیە خوا ئەوی بە پێغەمبەر ناردبێ.

٤)- ﴿إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا﴾، خەریك بوو لە پەرستراوەکانمان لامان بدات، ﴿إِن﴾، لێرەدا بۆ جەخت کردنەوەیە، بەچی دەزانین ئەم ﴿إِن﴾ە، لابەر (نافية) و، بە مانای (ما) نیە؟ بە هۆی ئەو (ل)ەوە، ﴿إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا﴾، ئەگەر ئەو (ل)ە، چووە سەر فیعلەی کە لە دوایەوە دێ، ئەوە مانای وایە ئەم ﴿إِن﴾ە، بۆ جەختکردنەوەیەو بە هۆی ئەم (ل)ەوە، لەگەڵ ﴿إِن﴾ی، لابەر، لێك جیادەکرێنەوە.

٥)- ﴿لَوْلَآ أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا﴾، خەریك بوو لە پەرستراوەکانمان لامان بدا، ئەگەر خۆمان لەسەریان ڕانەگرتبایە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە زۆر پشوو درێژ بووین و، زۆر خۆڕاگر بووین، ئەگەرنا لای دەداین، ﴿لَوْلَآ﴾، لێرەدا (حَرْفُ امتِناعٍ لوُجُود)، پیتی نەبوونە لەبەر بوون: ﴿لَوْلَآ أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا﴾، بە هۆی ئەوەوە کە ئێمە خۆڕاگرییمان هەبوو، بۆیە نەیتوانی لە پەرستراوەکانمان لامان بدات.

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ ص٢١٦.

٦)- ﴿ وَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ حِينَ يَرَوۡنَ ٱلۡعَذَابَ مَنۡ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴾، لەمەو دوا دەزانن کاتێك سزاو ئازار دەبینن، دەزانن کێ گومڕاترەو کێ سەر لێ شێواوترە.

﴿ مَنۡ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴾، لێرەدا ئەو (مُفَاضَلَة)یە، بۆ گاڵتەپێکردنە، ئەگەرنا وەنەبێ پێغەمبەریش ﷺ ڕێیەکەی هەڵەبێ و هی وانیش هەڵەبێ، بەڵام هی ئەوان هەڵەتر بێ! نەخێر، لێرەدا تەنیا بۆ گاڵتە پێکردنە، یاخود (مُفَاضَلَة)ەکە بۆ ئەوە نیە بەرانبەرەکەشی لەبەرچاو بگیرێ (مسلوب المفاضلة).

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ:

٧)- ﴿ أَرَءَيۡتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ﴾، ئایا ئەو کەسەت بینیوە کە ئارەزووی خۆی کردۆتە پەرستراوی خۆی؟! ئەمە لێرەدا بۆ سەرسوڕماندنە، هەڵبەتە ﴿ ٱتَّخَذَ ﴾، دوو بەرکار (مفعول به)ی دەوێن، واتە: شتێکی گۆڕیوە لە حاڵێك بۆ حاڵێکی دیکە، یان لە شێوەیەك بۆ شێوەیەکی دیکە، کە ﴿ إِلَٰهَهُۥ ﴾، بەرکاری دووەم و پێشخراوەو ﴿ هَوَىٰهُ ﴾ بەرکاری یەکەم و دواخراوە.

٨)- ﴿ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيۡهِ وَكِيلًا ﴾، ئایا تۆ بەسەریەوە وەکیلی؟ واتە: پارێزەری، چاودێری؟ یاخود: ئایا کاری بە تۆ سپێردراوە، تاکو نەهێڵی لابدات؟ کە ئەم پرسیار کردنە پرسیار کردنی نکووڵییکەرانەیە، واتە: تۆ بەسەریەوە نەکراویە چاودێر و پارێزەر.

٩)- ﴿ أَمۡ تَحۡسَبُ أَنَّ أَكۡثَرَهُمۡ يَسۡمَعُونَ أَوۡ يَعۡقِلُونَ ﴾، یان ئایا پیت وایە زۆربەیان دەبیستن و دەفامن؟ ئەمە دیسان پرسیار کردنی نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: زۆربەیان نابیستن، زۆربەشیان نافامن، نابیستن، مەبەست ئەوە نیە گوێیان نیە، بەڵکو یانی: نابیستن هەق و ناهەق لەیەك جیا بکەنەوە، یان هەق قبووڵ بکەن، زۆربەشیان نافامن، فامینێك بیانگەیەنێتە ئامانج و دۆزینەوەی ڕێی ڕاست و، حیکمەتی بوون و ژیانیان.

١٠)- ﴿ إِنۡ هُمۡ إِلَّا كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴾، ئەوان هیچ نین جگە لە ئاژەڵ، بگرە ڕێیان گومڕاتریشە، یان: بەڵکو ڕێ هەتڵەکەرتریشن، لەڕێ لادەرتریشن، چونکە ئاژەڵ کە

ئەو دەنگ و قسەیەی دەیبیستێ، شتێکی لێ تێدەگات، بۆ وێنە: ئاژەڵێك، گوێدرێژێك، کاتێك ئاوی دەدەی، یان کۆی دەکەیەوە، یان لە تەویلەکەی دەری دەکەیە دەرێ، بە جۆرێك لە دەنگدان، شوان و گاوانەکان ئاژەڵەکانی خۆیان کە دەنگ دەدەن، کەم و زۆر بە قسەی خاوەنەکانی خۆیان دەکەن و شتێك حاڵی دەبن، بەڵام بێبڕوایان ئەوەندەشیان نیە.

## بۆچی خوا ﷻ بێبڕوایانی لە ئاژەڵ بە خراپتر داناون؟

١)- چونکە ئاژەڵ خوا بە ئاژەڵی خوڵقاندوون، بەڵام مرۆڤ خوا بە مرۆڤی خوڵقاندوە، بۆیە مرۆڤ کاتێك کە وەك ئاژەڵ مامەڵە دەکاو دەژی، مانای وایە لە ئاژەڵەکە خراپترە.

٢)- ئاژەڵەکان لێپرسینەوەیان لەسەر نیەو، کە مردن و کۆتاییان پێ دێ، بەڵام مرۆڤ لێی دەپرسرێتەوەو، زیندوو دەکرێتەوەو سزاو پاداشتی دەبێ.

٣)- ئاژەڵەکان خزمەتی زۆر پێشکەش بە مرۆڤان دەکەن، بەبێ منەت و پرتەو پۆڵەو منگەمنگ.

٤)- ئاژەڵ مەترسیی بۆ سەر کەس نیە، بەڵام مرۆڤ کە لادەدات، بۆخۆشیی و بۆ کۆمەڵگاکەشی دەبێتە میکرۆب و بەڵا.

٥)- ئاژەڵ ئەو غەریزەیەی خوا بۆی داناوە و، ئەو سروشتەی خوا لەسەری سروشتاندوە، لێی لانادات، بەڵام مرۆڤ کە بە حوکمی زگماك و عەقڵی بەڕێوە ناچێ و، گوێش بۆ وەحیی ناگرێ، مانای وایە لە ئاژەڵ خراپتر دەبێ.

٦)- پاشان ئاژەڵەکان بیانوو و پاساو ناهێننەوە، بۆ هەڵەو لادانی خۆیان، چۆنن هەروان.

٧)- مرۆڤ وەختێك لادەدا، لە یەك کاتدا سیفەتە خراپەکانی کۆمەڵێك نەك هەر ئاژەڵ، بگرە هی دڕندەش لە خۆیدا کۆدەکاتەوە، بۆیە خوا ﷻ لە چەند شوێنێك لە قورئاندا کافرەکانی بە خراپترین ژیاندار داناون، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الأنفال)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ

﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٥﴾﴾، واتە: بێگومان خراپترین پێڕۆ، خراپترین ژیاندار لەلای خوا ئەوانەن کە بێ بڕوان، چونکە ئیمان ناهێنن، لەبەر ئەوەی لە یەك کاتدا مرۆڤی بێبڕوا، سیفەتە خراپەکانی دڕندەکان لەخۆیدا کۆ دەکاتەوە، سیفەتی: گورگ، سیفەتی ورچ، سیفەتی بەراز، سیفەتی کەر، ڕێوی، مەیموون، طاووس... هەروەها سیفەتە خراپەکانی ژمارەیەك لە ئاژەڵان: لە نەفامییدا وەك کەر دەبن، لە خراپییدا وەك بەراز دەبن، لە لاسایی کردنەوەدا وەك مەیموون دەبن، بەڵام مەیموون هەر مەیموونەو، کەر هەر کەرەو، گورگ هەر گورگە، بەڵام مرۆڤی بێبڕوا لە یەك کاتدا، وەك هەموو ئەو ئاژەڵ و دڕندانە دەبێ و، سیفەتی خراپی هەموو ئەوانە لە خۆیدا کۆدەکاتەوە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ئەوانە لە ئاژەڵیش ڕێ هەتڵەکەرترن و لادەرترن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە هـەژدە (١٨) ئایـەت، پێـك دێ، ئایەتـەکانی: (٤٥ - ٦٢)، لـەو هـەژدە ئایەتـەدا، سـوورگەی سـەرەکیی بریتیـە: لـە خسـتنەڕووی کۆمەڵێك لـە دیاردە و دیمەنـە سـەرنج ڕاکێشـەکانی سروشـت، وەك نیعمـەت و چاکـەی خـوا ﷻ لـە ژیـانی بەشـەردا، بـۆ وێنـە: سـێبەر و خـۆرو شـەوگار و خەوتـن و ڕۆژگار و کاسـبیی و، نـاردنی بایـەکان و، ئـاوی پـاك و پاککـەرەوە دابەزێنـدران لـە ئاسـمانەوە، پاشـان دەریـاکان و، ئـاوی سـوێر و شـیرین و تێکـەڵ نەبوونیـان و، دروسـتبوونی مـرۆڤ لـە ئـاو و، دابـەش بـوونی بـۆ پشـتێ و بـەرێ و، دوایـی ئەسـتێرەکانی ئاسـمان و خـۆرو مانـگ و بـە دوای یەکداهاتنـی شـەوو ڕۆژ و ... هتـد.

بـەڵام چەنـد هەڵوێسـتێکی خراپـی کافـرەکان لـە بەرانبـەر پەیامـی خـواداو، چەنـد ڕێنماییـەکی خـواش بـۆ پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ و، ناوێتـە و نێواخنـی خسـتنە ڕووی چاکـەو نیعمەتـەکان کـراون.

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ ٱلظِّلَّ وَلَوْ شَآءَ لَجَعَلَهُۥ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا ٱلشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا
﴿٤٥﴾ ثُمَّ قَبَضْنَٰهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا ﴿٤٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِبَاسًا وَٱلنَّوْمَ سُبَاتًا
وَجَعَلَ ٱلنَّهَارَ نُشُورًا ﴿٤٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۚ وَأَنزَلْنَا مِنَ
ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ لِّنُحْۦِىَ بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا وَنُسْقِيَهُۥ مِمَّا خَلَقْنَآ أَنْعَٰمًا وَأَنَاسِىَّ كَثِيرًا
﴿٤٩﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَٰهُ بَيْنَهُمْ لِيَذَّكَّرُوا۟ فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٥٠﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا
فِى كُلِّ قَرْيَةٍ نَّذِيرًا ﴿٥١﴾ فَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَجَٰهِدْهُم بِهِۦ جِهَادًا كَبِيرًا ﴿٥٢﴾
۞ وَهُوَ ٱلَّذِى مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا

مَّحْجُورًا ﴿٥٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾
وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ ۗ وَكَانَ ٱلْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِۦ ظَهِيرًا ﴿٥٥﴾ وَمَآ
أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٥٦﴾ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ
إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿٥٧﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَىِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ
عِبَادِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى
ٱلْعَرْشِ ۚ ٱلرَّحْمَٰنُ فَسْـَٔلْ بِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٩﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسْجُدُوا۟ لِلرَّحْمَٰنِ قَالُوا۟ وَمَا ٱلرَّحْمَٰنُ
أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا وَزَادَهُمْ نُفُورًا ۩ ﴿٦٠﴾ تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا
سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴿٦١﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ خِلْفَةً لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ
شُكُورًا ﴿٦٢﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئایا نابینی چۆن پەروەردگارت سێبەری درێژ کردۆتەوەو، ئەگەر ویستبای وەستاوی دەکرد، دوایی خۆریشمان لە سەری کردۆتە بەڵگە (و هۆکاری پەیدا بوونی) ﴿٤٥﴾ دوایی وردە وردە بۆ لای خۆمانی دێنینەوە ﴿٤٦﴾ هەروەها (خوا) ئەو کەسەیە، کە شەوگاری بۆ کردوونە پۆشاك و خەوتنی بۆ کردوونە مایەی پشوودان و، ڕۆژگاریشی بۆ گێڕاون بە کاتی بڵاوبوونەوە (بە زەوییدا بۆ کار و کاسبیی و گەشت و گەڕان) ﴿٤٧﴾ هەروەها خوا ئەو کەسەیە کە بایەکان لەپێش دەستی بەزەیی (باران)ەکەیدا دەنێرێ و، لە سەرێوەش ئاوێکی پاککەرەوەمان دابەزاندوە ﴿٤٨﴾ تاکو زەوییەکی مردووی پێ زیندوو بکەینەوەو، بە ئاژەڵان و خەڵکانێکی زۆریشی (کە دروستمان کردوون) نۆش بکەین ﴿٤٩﴾ بە دڵنیایی ئێمە ئەو ئاوەمان بە شێوازی جۆراو جۆر لە نێویاندا بڵاوکردۆتەوە، تاکو بیریان بکەوێتەوە (و پەند وەربگرن)، کەچی زۆربەی خەڵکی هەر بێبڕواییان ویست

﴿٥٠﴾ ئەگەر ویستباشمان، لە هەر ئاوەدانییەکدا ترسێنەر و ورياکەرەوەیەکمان دەنارد ﴿٥١﴾ دەجا فەرمانبەریی کافران مەکەو، بەهۆی (قورئان)ەوە تێکۆشانێکی گەورەیان لەگەڵدا بکە ﴿٥٢﴾ هەروەها خوا ئەو کەسەیە کە دوو دەریایەکانی تێکەڵ کردوون: ئەمە شیرین و سازگار و، ئەوەش سوێر و تفت و تاڵەو، لە نێوانیاندا پەردەو نێوانێکی لە یەکدی قەدەغەکەرمان داناوە (تاکو پێکەوە تاوێتە نەبن) ﴿٥٣﴾ هەروەها (خوا) ئەو کەسەیە کە مرۆڤی لە ئاوێ دروستکردوەو، (وەچەکەی) کردوە بە هی پشتێ و هی بەرێ و، پەروەردگاریشت بە توانایە (لە سەر هەموو شتێك) ﴿٥٤﴾ (هاوبەشدانەرەکان) لە جیاتی خوا شتێك دەپەرستن کە نە سوودیان پێ دەگەیەنێ و نە زیانیان لێ دەدات و، بابای کافر پشتگیریی (شەیتان) دەکات لە دژی پەروەردگاری ﴿٥٥﴾ تۆشمان (ئەی موحەممەد ﷺ!) تەنیا وەك دڵخۆشکەر و ترسێنەر ناردوە ﴿٥٦﴾ بڵێ: هیچ کرێیەکتان لەسەر (گەیاندن)ی (پەیامی خوا) لێ داوا ناکەم، مەگەر کەسێك بیەوێ بەرەو پەروەردگاری رێ بگرێتەبەر (ئەوە پاداشت و خەڵاتی منە) ﴿٥٧﴾ (ئەی موحەممەد!) پشتیش بە (خوای) هەر ژیاویی کە نامرێ ببەستەو، بە ستایشکردنەوە بە پاکی بگرەو، ئەویش بەسە بۆ شارەزایی بە گوناهی بەندەکانی ﴿٥٨﴾ ئەو کەسەی ئاسمانەکان و زەویی و ئەوەی لە نێوانیان دایە، بە شەش رۆژ (قۆناغ)ان دروستکردوون و، دوایی چۆتە سەر تەخت (عەرش)، بە بەزەییە، بۆ شارەزایی لە بارەی هەر شتێکەوە، بەس لەو بپرسە ﴿٥٩﴾ هەر کات پێشیان گوترا (بە بێبڕوایەکان): کڕنووش بۆ (خوای) بە بەزەیی بەرن، دەڵێن: (خوای) بەبەزەیی کێیە؟ ئایا کڕنووش بۆ ئەوە ببەین کە فەرمانمانان پێ دەکەی؟ ئەوە هەر سڵەمینەوەیان بۆ زیاد دەکات ﴿٦٠﴾ بەردەوام بەرزو بەپێزە ئەو کەسەی لە ئاسمانێ بورجەکانی داناون (ئەستێرە گەورەکانی داناون) و چرایەك و مانگێکی رووناککەرەوەشی تێدا داناوە ﴿٦١﴾ هەروەها (خوا) ئەو کەسەیە شەوو رۆژان بەدوای یەکدا دێنێ، بۆ هەر کەسێك کە بیەوێ (خوا) بێتەوە یادی، یان بیەوێ سوپاسگوزاریی بۆ خوا بکات ﴿٦٢﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(مَدَّ ٱلظِّلَّ): (مَدَّ) یانی: درێژی کردۆتەوە، بەردەوامی کردوە، (ظِلّ)یش، یانی: سێبەر، (مَدَّ ٱلظِّلَّ)، سێبەری درێژ کردۆتەوە، (المَدُّ: الجَرُّ، مَدَّ الظِلَّ طَوَّلَهُ وَبسَطَهُ)، درێژی کردۆتەوەو فراوانی کردوە، ئەو سێبەرە.

(قَبَضۡنَٰهُ): (أي: أخَذناهُ)، وەرمانگرتەوە، یاخود (نَسَخْنَاهُ)، لامانبرد، مەبەست ئەوەیە کە دوایی وردە وردە تیشکی خۆر دێ و، سێبەرەکە نامێنێ.

(سُبَاتًا): (السَّبْتُ: القَطْعُ، قَطْعاً لِلعَمَلِ أي: للرَّاحَة)، (سُبات)، کە دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلۡنَا نَوۡمَكُمۡ سُبَاتًا ٩﴾ النبأ، یانی: کردوومانە بە هۆکاری دابڕینتان لە ئیش و کار و جموجۆڵ و چالاکیی و مایەی پشوودانتان.

(وَأَنَاسِيَّ): (أناسِي) کۆی (إنْس)ە، کە جینسی مرۆڤە، واتە: مرۆڤانێکی زۆر.

(صَرَّفۡنَٰهُ): واتە: گۆڕیومانە، (الصَّرْفُ: رَدُّ الشَّيْءِ مِنْ حَالَةٍ إلى حَالَة، أو إبْدَالِهِ بِغَيرِهِ)، (صَرْف) بریتیە لەوەی شتێك لە حاڵێك بۆ حاڵێك بگۆڕی، یاخود ئەو حاڵەتە لابەری، شتێکی دیکەی بێنیە جێی.

(مَرَجَ): (أصْلُ المَرْجِ: الخَلْطُ، وَالمَرَجُ: الإخْتِلاطُ)، (مَرْج) بە مانای تێکەڵکردنە، (مَرَجَ) بە مانای تێکەڵییە ﴿مَرَجَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ ... ١٩﴾ الرحمن، واتە: دوو دەریاکەی تێکەڵکردن و خستوونیە لای یەك، بەڵام پێکەوە ئاوێتە نابن، لەبەر ئەوەی پەردەیەکی لە نێوانـدا داناون.

(عَذۡبٞ فُرَاتٞ): (عَذْب) بە مانای سارد و خۆش، (فُرات)یش، بە مانای سازگار، دێ، واتە: بە ئاسانیی لە گەروێ بچێتە خوارێ، ئنجا وشەی (فُرات) و (عَذْب)، هەم بۆ تاك و هەم بۆ کۆش بەکاردەهێنرێن.

(مِلْحٌ): (مِلْح) ئەو ئاوەیە کە تامەکەی گۆڕابێ، ئەو گۆڕانەی کە زاندراوە، سوێر و تاڵ و تفت بێ.

(أُجَاجٌ): (الأُجَاجُ: شَدِيدُ المُلُوحَةِ والحَرَارَة)، زۆر سوێر و زۆر گەرم، دەگوترێ: (أَجِيجُ النَّار وَأَجُهَا)، بڵێسەی ئاگر، لەبەر ئەوەی گەرمە، شتی سوێریش لە جەستەی مرۆڤدا، مرۆڤی پێ گەرم دادێ.

(نَسَبًا): (النَّسَبُ وَالنِّسْبَةُ: إشْتِرَاكٌ مِنْ جِهَةِ أَحَدُ الأَبَوَيْنِ)، (نَسَب) و (نِسْبَة) بریتین لە بەشداریی لە لای یەکێك لە باب و دایکانەوە، ئەوە واتایەکی، بەڵام لە ڕاستییدا (نَسَب) بە مانای ئەو ڕەچەڵەکەیە لە ڕێی بابەوە درێژ دەبێتەوە، (صِهر)یش، ئەو نەسەب و ڕەچەڵەکەیە لەڕێی دایکەوە درێژ دەبێتەوە.

(وَصِهْرًا): (إسمٌ لِما بَيْنَ المَرءِ وَبَيْنَ قَرابَةِ زَوجِهِ، وَأَقَارِبِهِ مِنَ العِلاَقَةِ، فَصِهرُ الرَّجُلِ: قَرابَةُ امْرَأَتِهِ وَصِهْرُ المَرْأَةِ قَرابَةُ زَوجِهَا)، (صِهر) بریتیە لەو پەیوەندیی و نیزیکایەتییەی لە نێوان ژن و خزمەکانی دا دەبێ، بۆیە (صِهر)ی پیاو بریتیە لە خزمایەتیی ژنەکەی و، (صِهر)ی ئافرەتیش بریتیە لە خزمایەتیی مێردەکەی.

(ظَهِيرًا): (ظَهِير) لە (ظَهْر)ەوە هاتووە، (ظَهر) یانی: پشت، (ظَهِير) یانی: یارمەتییدەر و هاوکار، (ظَهِيراً: أَي مُعِيناً)، واتە: هاوکار.

(نُفُورًا): واتە: سڵەمینەوە، (النَّفْرَةُ: الإنْزِعَاجُ مِنَ الشَّيءِ وَإلى الشَّيءِ)، (نَفْرَة) بریتیە لەوە کە ئینسان لە شتێك بێزار بێ و، بەرەو شتێکی دیکە بچێ، یان لە شتێك دوور بکەوێتەوە، یاخود بەرەو شتێکی دیکە بچێ، هەردووکیان (نَفْرَة)ی، پێ دەڵێن.

(بُرُوجًا): (البُرُوجُ: جَمْعُ بُرج، وَهُوَ القَصْرُ أَو مَنْزِلُ الكَوكَبِ، أَوِ النَّجم)، یانی: (بُرُوج) کۆی (بُرج)ە، کە بە مانای قەڵا دێ، یان بە مانای کۆشك دێ، یان بە مانای مەنزڵگای ئەستێرەکان دێ، یان بە مانای خودی ئەستێرە گەورەکان دێ.

(خِلْفَةً ): (الخِلْفَةُ: يُقَالُ فِي أَن يَخلُفَ كُلُّ وَاحِدٍ الأَخَرَ)، (خِلْفَة) بەوە دەگوترێ: کە هەر کامێکیان بێتە شوێنی ئەوی دیکە، شەو بە دوای ڕۆژدا دێ، ڕۆژ بە دوای شەودا دێ، شەو دێتە جێی ڕۆژێ، ڕۆژ دێتە جێی شەوێ، زەوی کە بە دەوری خۆیدا لە بەرانبەر خۆردا دەخولێتەوە، شەو بە دوای ڕۆژێ دەکەوێ، ڕۆژ بە دوای شەوێ دەکەوێ، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يُغْشِي ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا ...﴿٥٤﴾﴾الأعراف، شەو بە دوای ڕۆژێدا دێنێ، بە شەو ڕۆژگار دادەپۆشێ، بە خێرایی بە دوای دەکەوێ، لەبەر ئەوەی زەوی دەوری سی (٣٠) کیلۆمەتر دەبڕێ لە خولەکێك دا لە سووڕانەوەی بە دەوری خۆی دا، مانای وایە زۆر خێرایە، ئنجا لەبەر ئەوەی پانتایی زەوی زۆر گەورەیە، ئەگەرنا زۆر بەخێرایی زەوی دەخولێتەوە، بەڵام کەمی پێوە دیارە، بەڵام خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا، شەست (٦٠) هێندەی خێرایی سووڕانەوەیەتی بە دەوری خۆیدا، چونکە لە سووڕانەوە بە دەوری خۆردا، لە چرکەیەکدا سی (٣٠) کیلۆمەتر دەبڕێ، خولەکێکیش شەست (٦٠) چرکەیە.

کەواتە: زەوی شەست هێندەی خێرایی سووڕانەوەی بە دەوری خۆیدا، بە دەروی خۆردا دەخولێتەوە، کە ئێمە هەستیشی پێ ناکەین.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ ٱلظِّلَّ ﴾، ئایـا سـەرەنج نـادەی پـەروەردگارت چـۆن سـێبەری درێـژ کردۆتـەوە؟ یـانی: ئایـا سـەرنج نادەیـە سـێبەر، پـەروەردگارت چـۆنی درێـژ کردۆتـەوە؟ بـەڵام بۆچـی دەفەرمـوێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ ﴾؟

یـانی: تەماشـای کـردەوەی پـەروەردگارت بکـە، تەماشـای کارو بەرنامـەی پەروەردگارت بکـە، چـۆن سـێبەری درێـژ کردۆتـەوە، وایکـردوە کـە سـێبەر بـەردەوام بـێ و بـەردەوام بـڕوا، ﴿ وَلَوْ شَآءَ لَجَعَلَهُۥ سَاكِنًا ﴾، ئەگـەر ویسـتبای سـێبەری دەوەسـتاند، ئەگـەر زەوی بـە دەوری خۆیـدا نەخولابایـەوە لـە بەرانبـەر خـۆردا، هەمیشـە نیـوەی زەوی تاریـك دەبـوو، نیـوەشی ڕوونـاك دەبـوو، کەواتـە: سـێبەر دەوەسـتا، ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَا ٱلشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا ﴾، دوایـی خۆرمـان کردۆتـە بەڵگـەی، واتـە: بـە هـۆی خـۆرەوە، سـێبەر پەیـدا دەبـێ، ئەگـەر تیشـکی خـۆر نەبـێ، دنیـا ڕوونـاك بکاتـەوە، ئـەو شـتەی تیشـکی خـۆری ناگاتـێ، سـێبەری بەسـەر دەکشـێ، بـە هـۆی تیشـکی خۆرەوەیـە، ئێمـە دەزانیـن سـێبەرو تاریکیـی هەیـە و، لـە ڕاسـتییدا ئەصـڵ بـوونی تاریکییـە، بـەڵام خـوا ﷻ بەهـۆی خـۆرەوە دڕی بـە تاریکیـی داوە، نـەك هـەر لەسـەر زەوی، لـە هـەر شـوێنێکی دیکـەش لـەم گەردوونـەدا، ئەگـەر تیشـك هەبـێ و، ڕووناکیـی هەبـێ، تاریکیـی نابـێ.

﴿ ثُمَّ قَبَضْنَٰهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا ﴾، دوایـی ئێمـە ئەو سـێبەرەمان هێـواش هێواش، یـان بـە ئاسـانیی بـۆ لای خۆمـان هێناوەتـەوە، واتـە: وەك چـۆن گلۆڵەیـەك، پەتێـك فـڕێ دەدەی، دوایـی وردە وردە ڕایدەکێشـیەوە، ئـەو سـێبەرەمان بـۆ لای خۆمـان هێناوەتـەوە، واتـە: وردە وردەو دوایـی سـێبەرەکە ناهێڵێیـن، پێشـێ بـۆ وێنـە: کـە

خۆر لەلای ڕاستەوە هەڵدێ، لای چەپت هەمووی سێبەرە، دوایی وردە وردە تاکو خۆر بەرز دەبێتەوە، سێبەرەکە کەم دەبێتەوە، هێواش هێواش، هێواش هێواش، هەتا کاتێک خۆر دەگاتە نێوەڕاستی ئاسمان، سێبەرەکان نامێنن.

ئنجا دوایی بە پێچەوانەوە تاکو خۆر بەرەو لای چەپ دەچێ، سێبەر لە لای ڕاستەوە درێژ دەبێ، هەتا کاتێ کە خۆر بەرەو ئاوا بوون، دەچێ، لای ڕاست هەمووی دەبێتە سێبەر، بەڵام ئەو سێبەرە زۆر بە هێواشیی و بە نەرمیی دێ و دەچێ، خوا ﷻ تەشبیهی کردوە بەوەی کە کەسێك شتێکی فڕێ دابێ، دوایی وردە وردە ڕایکێشێتەوە، ﴿ قَبۡضٗا يَسِيرٗا ﴾، یانی: هێواش هێواش، یاخود بە ئاسانیی.

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِبَاسٗا وَٱلنَّوۡمَ سُبَاتٗا وَجَعَلَ ٱلنَّهَارَ نُشُورٗا ﴾، هەروەها خوا ﷻ ئەو زاتەیە، ئەو کەسەیە، کە شەوگاری بۆ کردوونە پۆشاك، داتاندەپۆشێ، ﴿ وَٱلنَّوۡمَ سُبَاتٗا ﴾، خەوتنی بۆ کردوونە مایەی پشوودان و وەستاندنی ئیش و کار و چالاکییەکانتان، ﴿ وَجَعَلَ ٱلنَّهَارَ نُشُورٗا ﴾، ڕۆژگاریشی بۆ کردوون بە مایەی بڵاوبوونەوە، بڵاوبوونەوە بە زەوییدا بۆ کار و کاسبیی لە سوورەتی (القصص)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمُ ٱلَّيۡلَ سَرۡمَدًا إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِضِيَآءٍۚ أَفَلَا تَسۡمَعُونَ ٧١ ﴾، واتە: پێیان بڵێ: ئایا ئەگەر خوا ﷻ هەر لێی کردبان بە شەوگار، تاکو ڕۆژی قیامەتێ، چ پەرستراوێك جگە لە خوا کێ ڕووناکیی بۆ دەهێنان، ئایا نابیستن؟ دوایی دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرۡمَدًا إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِلَيۡلٖ تَسۡكُنُونَ فِيهِۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ٧٢ ﴾القصص، پێیان بڵێ: ئایا ئەگەر خوا ﷻ دنیای (سەر زەوی) بەردەوام بۆ کردبان بە ڕۆژگار، هەتا ڕۆژی قیامەتێ، جگە لە خوا چ پەرستراوێك شەوگاری بۆ دەهێنان، تۆزێك پشووی تێدا بدەن، ئایا نابینن؟

لە ڕاستییدا ئەو شەوگار و ڕۆژگارە، لە ئەنجامی خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا پەیدا دەبن، ئەگەرنا ئێستا مانگ هەمیشە لایەکی تاریکەو لایەکی

ڕووناکە، چونکە مانگ بە دەوری خۆیدا خولانەوەی نیە، بەس بە دەوری زەویی دا دەخولێتەوە.

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ ٱلرِّيَٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَيۡ رَحۡمَتِهِۦۚ ﴾، خوا ﷻ ئەو کەسەیە کە بایەکان دەنێرێ، وەك مـوژدە، لەپێش دەستی بەزەییەکەیەوە، کە مەبەست پێی بارانە، چونکە باران بەرجەستەکەری بەزەیی خوایە بۆ هەموو ژیانداران، بۆیە لێرەش و لە چەند شوێنی دیکەش ناوی لە باران ناوە: (ڕەحمەت)، ﴿ وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ طَهُورٗا ﴾، لەسەرێوە ئاوێکی پاککەرەوەمان دابەزاندوە، بۆچی؟ ﴿ لِّنُحۡـِۧيَ بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗا ﴾، تاکو زەوییەکی مردووی پێ زیندوو بکەینەوە، زەوییەکی دێمەکار و قاقڕ بێ کشتوکاڵی پێ زیندوو بکەینەوە، ﴿ وَنُسۡقِيَهُۥ مِمَّا خَلَقۡنَآ أَنۡعَٰمٗا وَأَنَاسِيَّ كَثِيرٗا ﴾، بیشینۆشێنین لەوانەی کە دروستمان کردوون، بە ئاژەڵان و مرۆڤانێکی زۆر، (بیخۆنەوە).

﴿ وَلَقَدۡ صَرَّفۡنَٰهُ بَيۡنَهُمۡ لِيَذَّكَّرُواْ ﴾، ئێمە ئەو ئاوەمان جۆرلو جۆر کردوە لە نێوانیاندا، تاکو پەند وەربگرن، بە شێوەی تەرزە دەبارێ، بەشێوەی بەفر دەبارێ، بەشێوەی باران دەبارێ، بەشێوەی ئاونگ و شەونم دەبێ و، پاشان بە بەفر بە کڕێوە دەبارێ، پرووشە دەکات، هەروەها تەرزە بە دەنکی گەورە گەورە دەبارێ، بە دەنکی گچکە گچکە دەبارێ، هەروەها باران بە خورزەم دەبارێ، بە نەرمە باران دەبارێ، بە باوە دێ، یانی: بە زۆر شێوە ئەو ئاوەی لە ئاسمانەوە دایدەبەزێنین، بە زۆر جۆرمان لێکردوە و، بەس یەك جۆر نیە، ﴿ لِيَذَّكَّرُواْ ﴾، تاکو وەبیریان بێتەوە، پەند وەربگرن، ﴿ فَأَبَىٰٓ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورٗا ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئامادە نەبوون، ملیان نەدا، مەگەر بۆ بێبڕوایی، یاخود: ﴿ كُفُورٗا ﴾، بە مانای سپڵەیی دێ، هەر سپڵەییان نواند لە بەرانبەر چاکەکانی خوادا ﷻ.

هەڵبەتە هەندێ لە زانایانیش ڕاناوی (ە)ی سەر ﴿ صَرَّفۡنَٰهُ ﴾، یان گێڕاوەتەوە بۆ قورئان، واتە: قورئانمان بە زۆر جۆر بۆ دابەزاندوون، بەزۆر شێوە، بەڵام

زۆربـەی خەڵـکی ملیـان نـەدا بـۆ هـەق، بەڵکـو هـەر چاویـان لـە بێبڕوایـی و لـە سپڵەیی بـوو، بـەڵام بەپێـی سـیاقەکە زیاتـر وا پێدەچـێ مەبەسـت پێـی ئـاو بـێ لێـرەدا، چونکـە ئاویـش باسـکراوە لـەم سـیاقەدا.

﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَّذِيرًا ﴾، ئەگـەر ویستباشـمان لـە هـەر شـارێکدا ترسـێنەرێك و هۆشـیار کەرەوەیەکـمان دەنـارد، بـەڵام تۆمـان بـە بـەس زانیـوە بـۆ هەمـوو مرۆڤایەتیـی، بە درێژایی زەمان و بەپانایی زەمین، ﴿ فَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَجَاهِدْهُم بِهِ جِهَادًا كَبِيرًا ﴾، تـۆ بـە قسـەی کافـران مەکـە و، بەهۆیـەوە (بەهـۆی قورئانـەوە)، جیهادێـکی گەورەیـان لەگـەڵ بکـە، یـانی: بە شـێوەیەکی گەورەو شـێوەیەکی زۆر بەرفـراوان و بـەردەوام لەگەڵیـان تێبکۆشـە، بەڵکـو خـوا ﷻ هیدایەتیـان بـدات.

ئنجـا خـوا بـاسی نیعمەتێـکی دیکـەی خـۆی دەکات، دەفەرمـوێ: ﴿ وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ ﴾، خـوا ﷻ ئـەو کەسـەیە کـە دوو دەریایەکانی تێکـەڵ کـردوون، ئەمەیـان شـیرین و سـازگارە، ئەوەشـیان سـوێر و تـاڵ و تفتـە، ﴿ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا ﴾، لـە نێوانیانـدا پەردەیـەکی دانـاوە، ﴿ وَحِجْرًا مَّحْجُورًا ﴾، هەروەهـا لێـك قەدەغەبوونێـکی بـە مانـای وشـە قەدەغـە، یـانی: ڕێ نـادرێ کـە تێکەڵ بـە یەکـدی بـبن، وەك دوایـی لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا زیاتـر باسـی دەکەیـن، کـە لەبـەر دوو هـۆکاران تێکـەڵ نابـن:

یەکەم: هەمیشە ئاستی ئاوی شیرین بەرزترە لە ئاستی ئاوی سوێری زەریایەکان، کە زۆربەی ئاوی کە ڕووبەری زەوی داپۆشیوە (سێ لەسەر چوار (٤/٣)ی پانتایی زەوی) هی زەریایەکان و ئۆقیانووسەکانەو هەمووشی سوێرە، ئێمە ئاوی شیرینمان تەنیا لە ڕێی بارانەوە دەست دەکەوێ، ئاوی شیرینیش هەرلە ئاوی سوێرەوە دێ، بەڵام خوا ﷻ لەڕێی بارانەوە دەیپاڵێوێ و، سوێریی و تفتیی و تاڵییەکەی بەجێ دەمێنێ و، ئاوێکی شیرین و زوڵاڵمان بۆ دێ، ئاوی شیرین و زوڵاڵیش کە لە ڕێی بارانەوە و، لە ڕێی بەفرەوە و، لە ڕێی تەرزەوە، دەبارێ، هەمیشە لە شوێنە بەرزەکانی زەوی دەبارێ، لەسەر چیایەکان و

لە شوێنە بەرزەکان، بۆیە هەمیشە ئاوی شیرین دوای ئەوەی مرۆڤەکان پێویستییان پێی نامێنێ، دێتەوە نێو ئاوی سوێر و زەریاو ئۆقیانووسەکان، هەرگیز ئاوی ئۆقیانووسەکان نایەت بۆ سەر چیایەکان، کە تێکەڵ بە ئاوی شیرین بێ.

دووەم: پێکهاتەی ئاوی سوێرو ئاوی شیرین لە یەك جیان، بۆیە ڕووبارێکی گەورەی وەك ئەمازۆن بە درێژایی هەشتا (٨٠) کیلۆمەتر دەڕوات و، هەر ئاوی شیرینە، هەروەها لە هەندێك لە ئۆقیانووسەکان دا، سەرچاوەیەکی ئاوی شیرین هەیە، کە خەڵك لەنێو ئەو ئۆقیانووس و زەریا گەورەیەدا، دەچن ئەو ئاوی شیرینە هەڵدەهێنجن، لەبەرئەوەی تێکەڵ نابن.

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ﴾، هەروەها خوا ﷻ ئەو کەسەیە کە لە ئاو مرۆڤی هێناوەتە دی، ئاو دەگونجێ مەبەست پێی ئاوی خواردنەوە بێ (ئاوی گشتیی) و، دەشگونجێ مەبەست لە (ئاو) لێرەدا (تۆو) بێ، ئەو تۆوەی پیاو و ئافرەت، کە یەك دەگرن و نوتفەی لێ پێك دێ، ئنجا ﴿ فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ﴾، گێڕاویەتی بە پشتێ و بەرێ، واتە: هەم لەڕێی پیاوەوە ڕەچەڵەك پەیدا دەبێ و، هەروەها هەم لە ڕێی ئافرەتیشەوە ڕەچەڵەك پەیدادەبێ، یانی: منداڵێك کە لە دایك دەبێ، چ کوڕ بێ و، چ کچ بێ، هەم دەچێتەوە سەر بابی و، هەم دەشچێتەوە سەر دایکی و، هەم سیفەتەکانی لە لای بابیەوە وەردەگرێ، مەرج نیە بەس هی بابی و باپیری، تاکو دەگاتەوە ئادەم، هەم سیفەتەکانی دایکیشی وەردەگرێ، مەرج نیە بەس خودی دایکی، دایکی و ئەنکی، یاخود برایەکانی دایکی، یاخود دایك و بابی دایکی، هەتا دەگاتەوە حەووا، هەروەها دەگاتەوە ئادەم، ﴿ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴾، پەروەردگاریشت بە توانایە، واتە: بە توانایە لەسەر هەموو شتێك، ئەوەتا لە نوتفەیەك مرۆڤ دروست دەکات، کە نیزیکە بەچاو نەبیترێ، ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ ﴾، لە جیاتی خوا ﷻ یان جگە لە خوا، شتێك دەپەرستن کە نە سوودیان پێ دەگەیەنێ، نە زیانیان لێ دەدات، ﴿ وَكَانَ ٱلْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِۦ ظَهِيرًا ﴾، کافریش

لـە دژی پـەروەردگاری پشـتیوانە، پشـتیوانی کێیـە؟ واتـە: پشـتیوانی هـەر کەسـێکە، دژی پـەروەردگاری بـێ، بـە تایبـەت ئیبلیـس، هەمـوو ئەوانـەی کـە دژایەتیـی خـوای پـەروەردگار دەکـەن، کافـر پشـتیان دەگـرێ.

دوایـی خـوا ﷻ چەنـد ئامۆژگارییـەکی پێغەمبـەر ﷺ دەکات و دەفەرمـوێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا﴾، تۆمـان نەنـاردوە مەگـەر مـوژدەدەر و ترسـێنەر بی، ﴿قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍ﴾، بڵـێ: مـن هیـچ جـۆرە کرێیەکتـان لـێ داوا ناکـەم، لـە بەرانبـەر گەیانـدنی پەیامـی خـوادا، ﴿إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا﴾، مەگـەر کەسـێك کـە بیـەوێ بـەرەو پـەروەردگاری ڕێ بگرێتـە بـەر، ئەمـە پێـی دەگوتـرێ: هـەڵاواردنی دابـڕاو (الإسـتثناء المُنقَطِع)، چونکـە ئـەوە کـە خەڵك بـەرەو پـەروەردگاری ڕێ بگرێتـە بـەر، بەشـێك نیـە لـەو کرێیـەی کـە لە ڕستەی پێشـێدا لابـراوە، واتـە: تەنیا پاداشـتێك کـە مـن لـە ئێـوەم بـوێ، ئەوەیـە کـە ئێـوە ڕێ بـەرەو خـوا ﷻ بگرنەبـەر، ئـەوە خـەڵاتی منـەو ئـەوە کـرێ و پاداشـتی منـە، ئەگەرنـا هیـچ چاوەڕوانییەکـم لـە ئێـوە نیـە.

دوایـی خـوا ﷻ پێـی دەفەرمـوێ: ﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡحَيِّ ٱلَّذِي لَا يَمُوتُ﴾، پشـت ببەسـتە بـەو (خـوا) هـەر ژیـاوە، کـە هەرگیـز نامـرێ، کـە بـەس خوایـە ﷻ خـاوەنی ژیـانی ڕاستەقینەیە، ژیانێـکی زاتیـی و، ژیانێـکی بـەردەوام و، ژیانێـك کـە مـردنی پێـش نەکەوتـوە و، مـردنی بەسـەردا نایـەت، ﴿وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِهِۦ﴾، بـە سـتاییش کردنیـەوە بـە پـاکی بگـرە، واتـە: بڵـێ: (سـبحان اللـه) (الحمـد للـه)، یاخـود هـەم بـە پـاکی بگـرەو هـەم ستاییشـیشی بکـە، ﴿وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا﴾، بەسـە ئـەو شـارەزا بـێ بـە گوناهـی بەنـدەکانی، واتـە: ئـەو مرۆڤـە لادەر و لاڕێیانـەی کـە گونـاح و تـاوان دەکـەن، بـۆ پەروەردگارتیـان لـێ بگـەڕێ، ئـەو چـاك دەزانـێ چـی دەکـەن و چـۆن دەکـەن و، گونـاح و تاوانەکانیـان چیـن؟

ئنجـا پێناسـەی خـوا ﷻ دەکات و دەفەرمـوێ: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۚ﴾، ئـەو خوایـە ﷻ کـە ئاسـمانەکان و

زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە، هێناونە دی، لە شەش ڕۆژاندا، واتە: شەش ماوە، شەش قۆناغ، چونکە ﴿أَيَّامٍ﴾، کە کۆی (يَوم)ە، لە زمانی عەرەبیی دا بە مانای ماوەیەك لە کات دەگوترێ، بەڵام ئەوە کە ئێمە ئێستا دەڵێین: (يَوم)، واتە: شەو و ڕۆژ، کە کۆی شەو و ڕۆژ دەکاتە (٢٤) سەعات، ئەوە چەمك و واتایەکی باو و عورفیی ئێمەیە، ئەگەرنا (يَوم) لە لای خوا ﷻ، وەك دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾﴾الحج، واتە: ڕۆژێك لە لای پەروەردگارت، هێندەی هەزار (١٠٠٠) ساڵی ئێوەیە، کە دەیژمێرن، هەروەها لە سوورەتی (المعارج)دا، دەفەرموێ: ﴿تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾﴾، واتە: جیبریل و فریشتەکان لە ڕۆژێکدا بەرەو لای خوا بەرز دەبنەوە، کە ماوەکەی پەنجا هەزار (٥٠٠٠٠) ساڵە.

کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾، لە شوێنەکانی دیکەش، وەك لە تەفسیری سوورەتەکانی: (الأنعام) و (الأعراف) و (يونس)دا باسمان کردوە، ﴿فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾، واتە: بە شەش قۆناغ، خوا ﷻ ئەم گەردوونەی هێناوەتە دی، بە سەرو خواریەوە، بەئاسمانەکان و زەوییەوە، ﴿ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ﴾، دوایی (خوا ﷻ) چۆتە سەر عەرش، چۆتە سەر بارەگا، چۆتە سەر تەختی حوکمڕانیی، کە هەشت فریشتە، یان هەشت جۆرە فریشتە، یان هەشت جۆرە مەخلووق لە قیامەتدا هەڵیدەگرن، ﴿وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ ﴿١٧﴾﴾الحاقة، کەواتە: ڕاست نیە عەرش تەعبیرێکی ڕەمزیی بێ، بەڵکو جیسمێکەو دروستکراوێکی خوایە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەریش دا ﷺ هاتوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {... فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ، فَاسْأَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ، فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الْجَنَّةِ، وَأَعْلَى الْجَنَّةِ، وَفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ، وَمِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الْجَنَّةِ}[1].

---

(١) حديث أبي هريرة: أخرجه أحمد: ٨٤٠٠، والبخاري: ٦٩٨٧، مطولًا، ومن حديث معاذ: أخرجه ابن ماجه برقم ٤٣٣١، ومن حديث عبادة بن الصامت: أخرجه الحاكم برقم ٢٦٩، وأخرجه أيضًا: الترمذي: ٢٥٣١.

واتـە: ئەگـەر داواتـان لـە خـوا کـرد، فیـردەوسی لـێ داوا بکـەن، چونکـە نێوەڕاسـتی بەهەشـتە و، بەرزتریـن شـوێنی بەهەشـتە و، لـە سـەرووی فیردەوسـەوە: عـەرشی خـوای خـاوەن بەزەییـە و، لـە فیردەوسـەوە ڕووبـارەکانی بەهەشـت هەڵدەقوڵـن و دێنـە خـوار.

بـەڵام ئایـا ئـەو عەرشـە چۆنـە و خـوا ﷻ چـۆن چۆتـە سـەر عـەرش، چـۆن بـۆی بـەرز بۆتـەوە؟ دەڵێیـن: وەك بـۆ خـوا ﷻ شایسـتەیە، نـەك وەك ئـەوەی کـە دێتـە زەینـی مرۆڤەکانـەوە، کـە شـتێکی ماددیـی دەچێتـە سـەر شـتێکی دیکـە، ئـەوە بـە نسـبەت دروسـتکراوەکانەوەیە، بـەڵام بـە نسـبەت خـواوە ﷻ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۝١١﴾الشـوری، کەواتـە: چوونـە سـەر عەرشـەکەی خـوای پەروەردگاریـش، وەك هـی دروسـتکراوەکان نیـە، کـە شـتێك لەسـەر شـتێك دادەندرێ، پاشـان عەرشـیش یەکێکـە لـە دروسـتکراوەکانی خـوا ﷻ و، خـوا ﷻ پێـش ئـەوەی عـەرش بخوڵقێنـێ، چـۆن بـووە، دوای ئـەوەی کـە عـەرشی دروسـتکردوە، گـۆڕانی بەسـەردا نەهاتـوە.

﴿ٱلرَّحْمَٰنُ فَسْـَٔلْ بِهِۦ خَبِيرًا﴾، خـوا ﷻ زۆر خـاوەن بەزەییـە، هـەر شـتێکت ویسـت هـەر لـەو بپرسـە، ئـەو زۆر شـارەزایە، یاخـود لـە بـارەی پـەروەردگارەوە لـە شـارەزایان بپرسـە، ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسْجُدُوا۟ لِلرَّحْمَٰنِ﴾، ئەگـەر پێیـان گوتـرا (واتـە: بـە کافـرەکان) کڕنـووش بـۆ خـوای بەبەزەیـی ببـەن، ﴿قَالُوا۟ وَمَا ٱلرَّحْمَٰنُ﴾، دەڵێـن: ڕەحمان چییـە؟! ﴿أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا﴾، ئایـا کڕنـووش بەریـن بـۆ شـتێك کـە تـۆ فەرمانمـان پـێ دەکـەی؟! ﴿وَزَادَهُمْ نُفُورًا﴾، ئـەو قسـەیە سـڵەمینەوەو دوور کەوتنـەوەی تێـدا زیـاد کـردن.

لـە کۆتاییـی دا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا﴾، واتـە: بـەردەوام بـەرزو بەپێـزە و، بەرزیـی و مەزنیـی هـەر بـۆ ئـەوە، ئـەو زاتـەی کـە لـە ئاسـماندا بورجـەکانی دانـاون، بـورج بـە مانـای کۆشـك دێ و، بـە مانـای ئـەو

مەنزڵانەش دێ، کە ئەستێرەکان پێیاندا ڕەت دەبن، یاخود خۆرو مانگ پێیاندا ڕەت دەبن، هەروەها (بورج) بە مانای ئەستێرەی گەورەش دێ، واتە: بەردەوام بەرزو بەپێزە ئەو خوایەی کە لەسەرێ، لە ئاسماندا، ئەستێرەکانی داناون، ﴿ وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا ﴾، هەروەها لە ئاسماندا چرا (سِراج)ی داناوە، کە مەبەست پێی خۆرە، ﴿ وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴾، هەروەها مانگی ڕۆشنیش، ئنجا ناوی لە خۆر ناوە (سِراج)، وەك لە سوورەتی (النَّبأ)دا، دەفەرموێ: ﴿ سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ ﴾، واتە: چرایەکی زۆر تیشکدەر، بەڵام خوای پەروەردگار (قَمَر)، لێرەو لە چەند شوێنی دیکەش بە (مُنِير) وەسف دەکات، واتە: ڕۆشنکەرەوە، چونکە تیشکی خۆر زاتییەو هی خۆیەتی، بەڵام هی مانگ وەرگیراوە لە خۆرەوە، تیشکی بۆ دێ، ئنجا مانگ ڕۆشن دەبێتەوە و، دەبێتە هۆی ڕۆشنکردنەوەی سەر زەویش، لە شەواندا.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ خِلْفَةً ﴾، (خوا ﷻ) ئەو کەسەیە کە شەوگار و ڕۆژگار بەدوای یەکدا دێنێ، واتە: جێگۆڕکەیان پێ دەکات، ﴿ لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا ﴾، بۆ هەر کەسێك کە بیەوێ خوای بکەوێتەوە بیر، یادی خوا بکات، ﴿ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا ﴾، یان بیەوێ سوپاسگوزاریی بۆ خوا بکات، ئەو شەو و ڕۆژانە بەدوای یەکدا دێن، کە لە شەوگاردا دەگونجێ ئینسان بەندایەتیی بۆ خوا ﷻ بکات و، شەونوێژ بکات و، عیبادەت و تاعەت بکات و، لە ڕۆژیشدا دەگونجێ کارو کاسبیی بکات.

دەشگونجێ ﴿ يَذَّكَّرَ ﴾، پەیوەندیی بە ڕۆژگارەوە هەبێ، لە ڕۆژگاردا مرۆڤ نیعمەت و چاکەکانی خوای بکەونەوە یاد، بەڵام لە شەوگاردا سوپاسگوزاریی بۆ خوا ﷻ بکات، وەك پێغەمبەر ﷺ دایکمان عائیشە لێی دەگێڕێتەوە لە صەحیحی بوخاریی دا، کە شەوێ شەو نوێژی کردوە، زۆر ماوەتەوە لە سەجدەدا، تاکو دایکمان عائیشە پێی وابووە گیانی سپاردوە، وەفاتی کردوە، دوایی دایکمان عائیشە پێی دەڵێ: خوا ﷻ لە هەموو شتێکی تۆ خۆش بووە، بۆچی هێندە

خۆت ئەزیەت دەدەی؟ ئەویش دەفەرموێ: {أَفَلاَ أَكُونُ عَبْداً شَكُورًا}[1]، واتە: ئایا نەبمە بەندەیەکی سوپاسگوزار؟ (شَكُور) چاوگە، یانی: سوپاسگوزاریی، کە لێرەدا دەگونجێ مەبەست پێی تاعەتی شەوێ بێ، هەروەك (تَذَكُّر)یش، مەبەست پێی هێنانەوە بیر خۆی بێ، بۆ چاکە و نیعمەتەکانی خوا ﷻ لە رۆژێدا.

---

(١) {عَنْ عائشة رَضي الله عنها : أَنَّ النَّبيَّ ﷺ كَانَ يَقُومُ مِنَ اللَّيلِ حَتَّى تَتَفَطَّرَ قَدَمَاهُ، فَقُلْتُ لَهُ: لِمَ تَصنَعُ هَذَا يَا رسولَ الله! وَقَدْ غَفَرَ الله لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ؟ قَالَ: أَفَلا أُحِبُّ أَنْ أَكُونَ عَبْداً شَكُوراً} مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: البخاري: ٤٨٣٧، ومسلم: ٢٨٢٠، هَذَا لفظ البخاري.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**خستنە ڕووی کۆمەڵێك لە چاکەو نیعمەتەکانی خوا ﷻ، وەك سێبەر و خۆر و شەوگار و خەوتن و ڕۆژگار بۆ کارو کاسبیی و، گەڕان و سووڕان و، بایەکانی پێش باران و، ئاوی پاککەرەوەی ئاسمان و، جۆرا وجۆرکردنی:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا ﴿٤٥﴾ ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا ﴿٤٦﴾ وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِبَاسًا وَالنَّوْمَ سُبَاتًا وَجَعَلَ النَّهَارَ نُشُورًا ﴿٤٧﴾ وَهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ لِنُحْيِيَ بِهِ بَلْدَةً مَيْتًا وَنُسْقِيَهُ مِمَّا خَلَقْنَا أَنْعَامًا وَأَنَاسِيَّ كَثِيرًا ﴿٤٩﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَاهُ بَيْنَهُمْ لِيَذَّكَّرُوا فَأَبَىٰ أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٥٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ ﴾، ئایا سەرنجی پەروەردگارتت نەداوە، نەتڕوانیوە بۆ پەروەردگارت؟ لێرەدا: ﴿ أَلَمْ تَرَ ﴾، (**الرُّؤيَةُ بَصَرِيَّةٌ وَضُمِّنَ الفِعلُ «تَرَ» مَعنَى النَّظَرِ، فَعُدِّيَ بِـ «إلى»**)، وشەی: (تَرَ) بینیت، لێرەدا مەبەست پێی بینینی چاوە [چونکە سێبەر و خۆر بە چاو دەبیندرێن] کرداری (تَرَ)، مانای تەماشاکردنی خراوەتە نێو، بۆیە بە (إِلَىٰ)، بەرکاری خواستوە، ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ ﴾، (أَلَم تَنْظُر إلى رَبِّكَ)، کە مەبەست تەماشا کردنی پەروەردگار نیە، چونکە پەروەردگار نابیندرێ، یانی: ئایا تەماشای کردەوەی پەروەردگارت نەکردوە، تەماشای ئەو سیستمی پەروەردگارتت نەکردوە، چییە؟!

٢)- ﴿كَيۡفَ مَدَّ ٱلظِّلَّ﴾، چۆن سێبەری درێژ کردۆتەوە، ﴿مَدَّ﴾، یانی: درێژی کردۆتەوە، یاخود پانی ڕاخستوە، سێبەری وا لێنەکردوە کە لە شوێنی خۆی بوەستێ، بەڵکو سێبەر هەمیشە لە جووڵەدایە درێژ دەبێتەوە، دوایی کورت دەبێتەوە.

﴿كَيۡفَ﴾ لێرەدا مەبەست پێی پرسیار کردن نیە، بەڵکو ﴿كَيۡفَ﴾، لێرەدا ناوێکە چۆنیەتییمان پیشان دەدات، دەلالەت لەسەر چۆنیەتی دەکات، واتە: (أَلَم تَرَ إِلى رَبِّكَ إِلى هَيئَةِ مَدِّهِ الظِّلّ)، تەماشای شێوە درێژ کردنەوەی پەروەردگارت ناکەی بۆ سێبەر، چۆنی بەردەوام کردوە؟ کە بەهۆی جووڵەی زەوی و سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا، لە بەرانبەر خۆردا، سێبەر دەجووڵێ، ئەگەرنا ئەگەر زەوی بە دەوری خۆی دا نەخوولابایەوە، وەك هەندێ لە خڕۆکەکان، کە سووڕانەوەی دەوری خۆیانیان نیە، هەمیشە نیوەیان شەوە و، نیوەشیان ڕۆژە و، نیوەیان تاریکە و، نیوەیان ڕووناکە، بەڵام سەر زەوی وانیە، بۆچی؟ چونکە زەوی بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، بۆیە بەردەوام تاریکیی و ڕووناکیی لەسەر گۆی زەوی بە دەوری یەکدا دێن، وەك یەکدی ڕاو بنێن، وەك لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا ...﴿٥٤﴾﴾، واتە: خوا بە شەوگار ڕۆژگار دادەپۆشێ، بە خێرایی بەدوای دەکەوێ، وەك یەکدی ڕاو بنێن، هەڵبەتە هەر شەوگار بە دوای ڕۆژگار ناکەوێ، ڕۆژگاریش بە دوای شەوگار دەکەوێ.

٣)- ﴿وَلَوۡ شَآءَ لَجَعَلَهُۥ سَاكِنٗا﴾، ئەگەر خوا ﷻ ویستبای سێبەری وەستا و دەکرد، جووڵەی نەدەبوو، ئەویش بەهۆی ئەوەوە ئەگەر زەوی نەخولابایەوە بە دەوری خۆیدا، هەمیشە نیوەی شەو دەبوو، نیوەی ڕۆژ دەبوو، ئنجا بزانە ژیان چۆن دەبوو؟

٤)- ﴿ثُمَّ جَعَلۡنَا ٱلشَّمۡسَ عَلَيۡهِ دَلِيلٗا﴾، دوایی خۆرمان کردۆتە بەڵگە لەسەری، یاخود خۆرمان کردۆتە ڕێ نیشاندەری، (الدَّليلُ: المُرشِدُ إلى الطَّريق)، واتە: بەهۆی خۆرەوە ئێمە سێبەرەکە دەبینین و سێبەر جووڵە دەکات، بە هۆی خۆرەوە ئێمە ئەندازەی درێژ بوونەوەی نیسێیەکان و تاریکییەکان دەزانین، بەهۆی جووڵەی خۆرەوە ئێمە دەزانین کاتەکانی کارەکان چۆنن؟

٥)- ﴿ ثُمَّ قَبَضۡنَٰهُ إِلَيۡنَا قَبۡضٗا يَسِيرٗا ﴾، دوایی بە هێنانەوەیەکی ئاسان و هێدیی بۆ لای خۆمامان هێناوەتەوە، (قَبْض) لە بەرانبەری ﴿ مَدَّ ﴾دایە، ﴿ مَدَّ ٱلظِّلَّ ﴾، سێبەری درێژ کردۆتەوە، بەڵام: ﴿ قَبَضۡنَٰهُ ﴾، واتە: هێناومانەتەوە، (قَبْض) یانی: وێکهێنانەوە، ﴿ مَدَّ ﴾، یانی: درێژ کردنەوە، دوایی سێبەرمان بۆ لای خۆمان هێناوەتەوە، ﴿ قَبۡضٗا يَسِيرٗا ﴾، بە هێنانەوەیەکی ئاسان، یاخود هێنانەوەیەکی هێواش هێواش و پلە پلە، کە هەستی پێ ناکرێ، واتە: دوایی سێبەرمان وردە وردە کەم کردۆتەوە، لە درێژ کردنەوەکەیمان کەم کردۆتەوە، لێرەدا وشەی (قَبْض) وەرگرتن، خوازراوەتەوە بۆ (نَقْص)، کەمکردنەوە.

٦)- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِبَاسٗا وَٱلنَّوۡمَ سُبَاتٗا ﴾، هەروەها (خوا ﷻ) ئەو کەسەیە کە شەوگاری بۆ کردوونە پۆشاک، وەك پۆشاك داتان دەپۆشێ و، خەوتنیشی بۆ کردوونە پشوودان و، ڕاگرتنی کارو جموجۆڵ و چالاکییەکان.

٧)- ﴿ وَجَعَلَ ٱلنَّهَارَ نُشُورٗا ﴾، ڕۆژگاریشی بۆ کردوون بە کاتی بڵاوبوونەوە، خوا ﷻ وشەی (نُشُور)ی، بۆ زیندوو بوونەوەش بەکارهێناوە، لێرەشدا بۆ بێداربوونەوە لە خەوی بەکارهێناوە و، (نُشُور) بە مانای (إنتِشار) بڵاوبوونەوەیە.

٨)- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ ٱلرِّيَٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَيۡ رَحۡمَتِهِۦ ﴾، خوا ﷻ ئەو زاتەیە، کە بایەکان وەك موژدە لە پێش دەستی بەزەییەکەی خۆیەوە ناردوون، بەزەییەکەی چییە؟ ئەو ئاوەیە کە لە ئاسمان دێتە خوار، کە خوا لە چەند شوێنێ لە قورئاندا، ناوی لێناوە ڕەحمەت، هەم لێرەدا و، هەم لە سوورەتی (الأعراف)داو، لە چەند شوێنی دیکەش دا، چونکە لە ڕاستییدا ئەو ئاوەی لە ئاسمان دێتە خوار، ئەو ئاوە شیرین و زوڵاڵ و خۆشە، کە ئەگەر ئەوە نەبووایە، ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی نەدەبوو، هەروەها ژیانی ڕووەك نەدەبوو، ژیانی ئاژەڵان نەدەبوو، بۆیە ناوی لێناوە ڕەحمەت، چونکە ئەو ئاوە بەرجەستەکەرێکی زۆر گەورەو گرنگی بەزەیی و میهرەبانیی و لوتفی خوای پەروەردگارە، بەرانبەر بە مرۆڤەکان و، بەرانبەر بە ئاژەڵەکان و ژیانداران بە گشتیی، بۆیە دەفەرموێ:

٩)- ﴿وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا﴾، لەسەرێوە ئاوێکی پاککەرەوەمان دابەزاندوە، یاخود ئاوێکی زۆر پاك، (طَهُور) دەگونجێ بە مانای: (بالِغٌ فِي الطَّهارَة)، زۆر پاك بێ، دەشگونجێ بە مانای: پاك و پاککەرەوە بێ، یانی: (طَاهِرٌ فِي نفسه، مُطَهِّرٌ لِغَيره)، بۆچی خوا ﷻ ئەو ئاوە لە ئاسمانێوە دادەبەزێنێ؟ کە ئەو ئاوە بە سێ حاڵەتان دادەبەزێ: ١- حاڵەتی باران، ٢- حاڵەتی بەفر، ٣- حاڵەتی تەرزە، بۆچی؟

١٠)- ﴿لِّنُحۡـِۧيَ بِهِۦ بَلۡدَةً مَّيۡتًا﴾، بۆ ئەوەی سەر زەویيەکی دێمەکارو وشکی پێ زیندوو بکەینەوە، ﴿بَلۡدَةً﴾، یان (بَلَداً)، یانی: (أَرْضاً)، وشەی (بَلَد) لە زمانی عەرەبییدا هەم بە (مُذَكَّر) دێ و، هەم بە (مُؤَنَّث)یش دێ، بۆیە لێرە کە دەفەرموێ: ﴿بَلۡدَةً مَّيۡتًا﴾، وشەی ﴿بَلۡدَةً﴾ی بە (مَيْت)، وەسفکردوە، لە جیاتی بفەرموێ: (بَلْدَةً مَيْتَةً)، لەبەر ئەوەی وشەی ﴿بَلۡدَةً﴾، مانای شوێن (مکان)ی تێدا ڕەچاو کراوە، کە (مکان)یش (مُذَكَّر)ە، (مُذَكَّر)ی مەجازییە، بۆیە بە (مَيْتاً)، هێناویەتی.

١١)- ﴿وَنُسۡقِيَهُۥ مِمَّا خَلَقۡنَآ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی بینۆشێنین بەوانەی کە دروستمان کردوون، کێن؟

١٢)- ﴿أَنۡعَٰمًا وَأَنَاسِيَّ كَثِيرًا﴾، ئاژەڵانێك و مرۆڤانێکی زۆر، ئەو ئاوە شیرین و زوڵاڵەیان پێ بنۆشێنین، (نُسقِيَهُ)، دەڵێ: (سَقَى: أَعطَى الشَّرَابَ)، (سقى) خواردنەوەی پێدا، بەڵام (أَسقى) یانی: (هَيَّأَ الماءَ لِلشُّرْبِ)، ئاوەکەی بۆ خواردنەوە ئامادەکرد، (سَقَى) هەیەو (أَسْقَى) هەیە، (سَقَى)، (ثُلاَثِي)یەو (أَسقى) (رُبَاعِي)یە، (سَقَى) یانی: ئاوی پێدا، یاخود خواردنەوەی پێدا، بەڵام (أَسقى) یانی: خواردنەوە، یاخود ئاوی ئامادەکرد بۆ خورانەوە.

﴿مِمَّا خَلَقۡنَآ﴾، (مِنْ) لە ﴿مِمَّآ﴾دا بۆ بەشێك (تَبعِيض)ە، (ما)ش (مَوصُولة)یە، یانی: (مِن الَّذِي خَلَقنا)، ئەو ئاوەی لە ئاسمان دامانبەزاندوە، لەوانەی کە دروستمان کردوون، بە ئاژەڵانێك و مرۆڤانێکی زۆری بنۆشێنین، (أَناسِي) کۆی (إِنسِي)یە، هەندێکیش گوتوویانە: کۆی (إِنس)ە، کە (إِنسِي) هاوواتای ئینسانەو

(ي)ەكـە بـۆ نەسـەب نیـە، وەك: (كُـرسِي) و (كَـرَاسِي)، (إِنسِي)یـش، (ي) كـە بـۆ پـاڵ وێـدان نیـە، بەڵكـو هـەر یـاێ ئەصـلی خۆیـەتی، وەك چـۆن (كُـرسِي) یائەكـەی پیتێـكی پێكهێنـەری ئەصڵـی وشـەكەیە، (كُـرسِي) بـە (كَـراسي) كۆدەكرێتـەوە، (إِنسِي)یـش، بـە (أُنـاسِي) كۆدەكرێتـەوە.

١٤)- ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَٰهُ بَيْنَهُمْ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئەو ئاوەمان لەنێوانیاندا جۆراو جۆر كردوە، (تَصرِيف) بە مانای (تَغيِير) و بە مانای (تَنوِيع) دێ، واتە: گۆڕیومانە، نەك بە یەك حاڵەت داباریێ، بەس باران بێ، ئەگەر تەنیا باران بووایە، یەكسەر ئەوەی كە دەباری دەباری، بەڵام دوایی كۆ نەدەبۆوە، یەكسەر دەهاتە خواریێ و تەواو، بەڵام خوا ﷻ بە شێوەی بەفریش دەیبارێنێ، بۆ ئەوەی لەسەر چیایەكان كۆبێتەوە، زۆربەی ئاوی سەرچاوەكان كە دەچێتە نێو زەویی، ئاوی بەفرە، وردە وردە دەتوێتەوەو بە زەویدا دەچێتە خوار، ئەگەر باران بێ، یەكسەر دێ، بۆیە ئەو كاتانەی باران زۆر بە لێزمەو خوڕزەم دەبارێ، یەكسەر لافاو هەڵدەستێ، بەڵام بە بەفر لافاو هەڵناستێ، ئەو بەفرە لە شوێنی خۆی دەمێنێتەوە، وردە وردە بە زەویدا دەچێتە خوار، هەروەها بە شێوەی تەرزەش، خوا ﷻ دەیبارێنێ، واتە: ئاوەكەمان جۆرا و جۆر كردوەو، تەنیا بە یەك حاڵ نیە، بەڵكو بە سێ حاڵەت دێتە خوار:

أ- بە حاڵەتی شلیی.

ب- بە حاڵەت شیكراوەیی كە بەفرە.

ج- بە حاڵەتی ڕەقیی و توندیی كە تەرزەیە، هەروەها ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَٰهُ بَيْنَهُمْ ﴾، واتە: ئەو ئاوە شیرینەمان ئەوە نیە، كە هەر لە یەك شوێن ببارێ، بەڵكو لە زۆر شوێن دەبارێ و خوا ﷻ بە هەموو زەویدا بڵاوی دەكاتەوە، بۆچی؟

١٥)- ﴿ لِيَذَّكَّرُوا۟ ﴾، بۆ ئەوەی پەند وەربگرن، ئەمە خوێندراویشەتەوە: (لِيَذكُرُوا)، بۆ ئەوەی بێتەوە یادیان، چونكە (ذَكَرَ) پێچەوانەی (نَسَي)یە، (نَسَي) یانی: لەبیری چوو، (ذَكَرَ) یانی: هاتەوە بیری.

پێشتریش گوتمان: هەندێک لە زانایان ڕاناوی (هـ)ی سەر ﴿صَرَّفۡنَٰهُ﴾ یان بۆ قورئان بردۆتەوە، واتە: قورئانمان بە زۆر جۆر بۆ ڕوونکردوونەوە، بەڵام سیاقەکە یارمەتی نادات.

١٦)- ﴿فَأَبَىٰٓ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورٗا﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی، ئامادە نەبوون، مەگەر بۆ سپڵەیی و بێبڕوایی، واتە: ئامادە نەبوون بۆ بڕوا هێنان و شوکرانە بژێریی، زۆربەی خەڵکی، بەڵکو هەر سەریان خورا بۆ سپڵەیی و بێبڕوایی، ﴿كُفُورٗا﴾، لێرەدا چاوگە، بە مانای کوفر دێ، دەشگونجێ بە مانای (كُفْرَان) بێ، کوفر واتە: بێبڕوایی (کُفران)یش، واتە: سپڵەیی و ناسپاسیی.

**مەسەلەی دووەم:**

**خـوا ﷻ نەیویسـتوە ئەگەرنـا لـە هەمـوو ئاوەدانییەکـدا ترسـێنەرو وریاکەرەوەیـەکی دەنـارد، کـە مەبەسـت پێغەمبەرانـە (علیهـم الصلاة والسـلام)، بۆیە پێویسـتە پێغەمبەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ گـوێ بـە کافـران نـەدات و، بەهـۆی قورئانـەوە تێکۆشـانێکی گەورەیـان لەگـەڵ بـکات، چونکـە بـەس خۆیـەتی ترسـێنەر و هۆشـیارکەرەوە لەلایـەن خـوای پـەروەردگارەوە، بـۆ هەمـوو مرۆڤایەتیـی:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَّذِيرًا ﴿٥١﴾ فَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَجَاهِدْهُم بِهِ جِهَادًا كَبِيرًا ﴿٥٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَّذِيرًا ﴾، ئەگەر ویستبامان لە هەر شارێك، لە هەر ئاوەدانییەکی گەورەدا، ترسێنەرو هۆشیارکەرەوەیەکمان دەنارد، زۆر جار گوتوومانە: (إنذار)، واتە: (إخبارٌ مَعَ تَخْوِيفٍ)، یان (إِعْلَامٌ مَعَ تَخْوِيفٍ)، ئاگادارکردنەوەیە، یان هەواڵ پێدانە، وێڕای ترساندن، کە بە کوردیی دەبێتەوە بە: ترساندن و، وشیارکردنەوە، یان وریاکردنەوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەگەر ویستبامان لە هەر ئاوەدانییەکدا، ترسێنەرێکمان دەنارد، کەواتە: خوا نەیویستوە، بەڵکو ویستوویەتی، یەك ترسێنەر و هۆشیارکەرەوە بۆ هەموو مرۆڤایەتیی بنێرێ.**

**زەمەخشـەریی خـاوەنی تەفسـیری (الکشـاف) بـۆ ڕوونکردنـەوەی چەمـکی ئـەم ڕستە قورئانییـە، دەڵـێ: (وَلَـو شِـئنا: لَخَفَّفْنَـا عَنْـكَ أَعْبَـاءَ نِـذَارَةِ جَمِيـعِ القُـرَى، وَلَبَعَثْنـا فِي كُلِّ قَرِيَـةٍ نَبِيّـاً يُنذِرُهـا، وَإِنَّمَـا قَصَرنَـا الأَمـرَ عَلَيـكَ، وَعَظَّمْنَـاكَ عَـلَى سَـائِرِ الرُّسُـلِ، فَقَابِـل ذَلِـكَ بِالتَّصَـبُّرِ).**

**واتـە: ئەگـەر ویسـتبامان ئـەرکی ترسـاندن و وریاکردنەوەی هەمـوو ئاوەدانییـەکان و، شـارو وڵاتانـمـان لەسـەر تـۆ سـووك دەکـرد و، لـە هـەر ئاوەدانییەکـدا پێغەمبەرێکـمان**

دەنارد، تاکو وریایان بکاتەوەو بیانترسێنێ و وەخەبەریان بێنێ، بەڵام ئیشەکەمان تەنیا لەسەر تۆ کورت هەڵێناوەو، تۆمان بە مەزنگرتوە بەسەر هەموو پێغەمبەراندا [کە ئەوان هەر کامێکیان بۆ ئاوەدانییەك و، بۆ قۆناغێك و، بۆ کاتێك و، بۆ کۆمەڵگایەك نێردراون، بەڵام تۆ بۆ هەموو مرۆڤایەتیی، بە درێژایی زەمان، بە پانایی زەمین] بۆیە تۆش پێشوازیی لەو ئەرکە بکە، بە خۆڕاگریی و بە پشوو درێژییەوە.

٢)- ﴿ فَلَا تُطِعِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾، ئنجا بە قسەی کافران مەکە، وشەی (طاعَة) کە لە قورئاندا زۆر دووبارە بۆتەوە، (الطّاعَةُ: عَمَلُ المَرءِ بِما يُطلَبُ مِنْهُ)، (الطّاعَة) بریتیە: لەوە کە مرۆڤ کارێك بکات کە لێی داواکراوە، ئنجا چ بەباری خێردا و، چ بەباری شەڕدا، بۆیە من پێم وایە (طاعَة) بە [بە قسەکردن] و [فەرمانبەریی] و [بە گوێڕایەڵیی] دەگونجێ مانا بکرێ، واتە: گوێڕایەڵیی کافران مەکە و، بە قسەیان مەکە و، فەرمانبەرییان مەکە، ئەوەی پێت دەڵێن جێبەجێی مەکە، هەڵبەتە خوا ﷻ لێرەدا کە بە (لا)ی (النهي) هێناویەتی: ﴿ فَلَا تُطِعِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾، بۆیە فیعلەکەشی پێ زەنەدار (مجزوم)ە، ئنجا کە ئەوە دەفەرموێ: مەبەست پێی وریاکردنەوەو بێدارکردنەوەی پێغەمبەرە ﷺ ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە، کە پێغەمبەری خوا بە قسەی کافرانی کرد بێ و، خوای پەروەردگاریش بفەرموێ: بە قسەیان مەکە، بەڵکو بەس هۆشداریی پێدانیەتی.

٣)- ﴿ وَجَـٰهِدْهُم بِهِۦ جِهَادًا كَبِيرًا ﴾ بەو (قورئان)ەش تێکۆشانێکی گەورەیان لەگەڵ بکە، بێگومان مەبەست پێی بێبڕوایانی ڕۆژگاری پێغەمبەرە، بەنسبەت ئەوەوە و، بەنسبەت شوێنکەوتووانیشیەوە، بێبڕوایانی سەرجەم کۆمەڵگاو ڕۆژگارەکانە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**تێکەڵکردنی هەردوو ئاوی شیرین و سوێرو، دانانی نێوانێک لە بەینیاندا، تاکو ئاوێتەی یەکدی نەبن و، دروستکردنی مرۆڤ لە ئاو و، دابەشکردنی وەچەکەی بۆ هەردوو جۆری پشتێ و بەرێ، یاخود نێرو مێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا ﴿٥٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

خوا ﷻ هەر لەسەر خستنەڕووی نیعمەتەکانی خۆی و، ڕوونکردنەوەی چاکەکانی خۆی، کە لە دیاردەو دیمەنە سروشتییە سەرسووڕهێنەرەکاندا بەرجەستە دەبن، بەردەوامە، دەفەرموێ:

١)- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ ﴾، هەروەها خوا ﷻ ئەو کەسەیە، دوو دەریایەکانی تێکەڵکردوون، بەریداونەوە نێو یەکدیی، چونکە (مَرَجَ الدَّابَّةَ فِي المَرْعَى)، واتە: ڕستی بۆ شل کردووەو بەری هەڵداوە، (البَحْر: المَاءُ المُسْتَبْحَرُ أَيْ: الكَثِيرُ العَظِيم)، لە زمانی عەرەبییدا (بَحْر) یانی: ئاوێکی زۆر و مەزن، مەرج نیە تەنیا ئۆقیانووسەکان بێ، بەڵکو ڕووباریش هەر (بحر)ی بۆ بەکاردەهێنرێ، وشەی (يَمّ)یش، بە هەمان شێوە، هەر بە مانای ئاوی زۆر دێ، ئنجا چ دەریا بێ و، چ ڕووبارێکی گەورە بێ، کە لە شێوەی دەریادا بێ، ئەوەش بۆیە دەڵێین: چونکە خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ ﴾، خوا ﷻ ئەو

کەسەیە کە دوو ئاوە زۆرەکانی بەرهەڵداونە نێو یەکدی، پێکی گەیاندوون، مەبەستی پێ ئاوی شیرین و ئاوی سوێرە، کە ئاوی شیرین لە ڕووبارە گەورەکاندا بەرجەستەیە، وەك: ڕووباری نیل و دیجلەو فورات و ڕووباری ئەمازۆن و سەیحوون و جەیحوون، ئەو ڕووبارە گەورانەی کە لە دنیادا هەن، ئاوی شیرین دێننە خوار و، دەڕۆن دوایی تێکەڵ بە زەریاکان دەبن، کە ئاوی سوێرن، بۆیە دەگونجێ هەردووکیان وشەی بەحریان بۆ بەکاربێ، چونکە (بَحر) یانی: ئاوێکی زۆری مەزن، ئنجا خوا ﷻ پێناسەی دوو ئاوە زۆرەکان دەکات:

٢)- ﴿ هَٰذَا عَذۡبٞ فُرَاتٞ ﴾، ئەمەیان شیرین و زوڵاڵە، واتە: بە ئاسانیی لە گەروو دەچێتە خوار، (عَذْب) بە مانای: (حُلْو) شیرینە، (فرات)یش، یانی: (سائِغٌ فِي الحَلقِ)، بە ئاسانیی لە گەروو دەچێتە خوار، کە سازگاری پێ دەڵێن و، وەك سوێر و ناسازگار، لەبەر تاڵیی و تفتیی لە گەروو ناگیرێ.

٣)- ﴿ وَهَٰذَا مِلۡحٌ أُجَاجٞ ﴾، ئەمەشیان سوێر و تاڵ و تفتە، (مِلْح) یانی: (المَالِح)، (مِلْح) یانی: خوێ، بەڵام لێرەدا بە مانای سوێرە، نەك خوێ، یانی: ئاوێکی سوێر، ﴿ أُجَاجٞ ﴾یش، یانی: (شَدِيدُ المُلُوحَةِ وَالحَرَارَةِ)، زۆر سوێر و زۆر گەرم، یاخود تاڵ و تفت، خوا ﷻ ئەو دوو جۆرە ئاوە زۆرەی بەرهەڵداونە نێو یەکدی و، وایکردوە بگەنە یەکدی.

٤)- ﴿ وَجَعَلَ بَيۡنَهُمَا بَرۡزَخٗا ﴾، بەڵام لە نێوانیاندا پەردەیەکی داناوە، (البَرزَخ: الحَائِلُ بَيْنَ الشَّيْئَيْنِ)، پەردەیەك کە لە نێوان دوو شتاندا بێ و، نەهێڵێ پێکەوە ئاوێتە ببن، نەك نەهێڵێ بگەنە یەکدی، گەیشتوونە یەکدی، بەڵام ناهێڵێ پێکەوە ئاوێتە ببن.

٥)- ﴿ وَحِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا ﴾، ئەو پەردەیە بە هەردووك ئاوەکان، بە هەردوو دەریایەکان، دەڵێ: نابێ تێکەڵ بن، قەدەغەیە تێکەڵ بن، ﴿ وَحِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا ﴾، یانی: (مَنْعاً مَمنُوعاً).

## واتاو هۆکاری تێکەڵ نەبوونی دەریای سوێر و شیرین

ئەمە پێویستە تۆزێک شی بکەینەوە: ئایا مەبەست لە بەرهەڵدانە نێو یەکدی ئاوی شیرین و سازگار، لەگەڵ ئاوی سوێرو تاڵ و تفت و، پاشان پەردە لە نێوان دانانیان و، پێکەوە ئاوێتە نەبوونیان، چییە؟

پسپۆڕان سێ هۆکاریان باسکردووە:

١)- بەرهەڵدانە نێو یەکدی هەردوو ئاوەکان ئەوەیە، کە بوار بدرێ بگەنە یەکدی، ئەوەش دیارە، هەم ڕووبارەکان کە ئاوی شیرینیان تێدایە: ڕووبارەکانی: نیل و دیجلە و فوڕات و ئەمازۆن و ڕووبارەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، هەموو ئەو ڕووبارە گەورە گەورانە، کە ئاوی شیرینن، دوایی دەڕۆن و دەڕژێنەوە نێو زەریاو ئۆقیانووسەکان، کە هەمووی ئاوی سوێر و تاڵ و تفتە، ئەوە شێوەی بەرهەڵدانە نێو یەکدی، بەڵام تێکەڵ نەبوون و ئاوێتە نەبوونیان، ئەوەی تاکو ئێستا دیارە ئەوەیە کە شوێنی ئاوی شیرین بەرزە، هەمیشە ئاوە شیرینەکان، کە ئاوی باران و بەفرو تەرزەن، لە چیایەکان و لە شوێنە بەرزەکان دەبارن و کۆدەبنەوە، دوایی ئەو بەفرو تەرزەو بارانە، دادەکرێ، لەنێو خەزنەکانی چیایەکاندا، دوایی وردە وردە بە شێوەی کانیی و، سەرچاوەو بیرو، کارێزو ئەوانە دێتە دەرێ، بەڵام دوای ئەوەی مرۆڤەکان کاریان پێنامێنێ، بۆ خواردنەوەو ئاودێریی و شۆردن و شوارو، دوای ئەوەی پێداویستییەکانی خۆیانی پێ جێبەجێ دەکەن، ئنجا بەری دەدەن و، ئەو ئاوە دەچێتەوە نێو دەریایەکان، کەواتە: هۆی تێکەڵ نەبوونی ئاوی شیرین و سوێر، ئەوەیە کە شوێنی ئاوی شیرین بەرزەو، شوێنی ئاوی سوێر نزمە.

کە ئەگەر بە پێچەوانەوە بووایە: شوێنی زەریایەکان و ئۆقیانووسەکان بەرز بووایە، لەوێڕا ئاو هاتبایە نێو ئاوە شیرینەکە، بە تەئکید ئەو کاتە ئێمە ئاوی شیرینمان لێ ون دەبوو، چونکە ئاوی سوێر زۆر زۆرە، یانی: سێ لەسەر چواری

ڕووبەری زەوی، پانتایی زەوی، ئۆقیانووسەکان دایدەگرن، ئەندازەیەکی کەمی ئاو، ئاوی شیرینە، چ ئەو دەریاچانە بن، کە مرۆڤ دروستیان دەکات، چ ڕووبارەکان بن، چ گۆم و گۆلەکان بن، ئەوە هۆکارێکی گرنگی تێکەڵ نەبوونیان، کە لە ڕووی جوگرافییەوە، شوێنی ئاوی شیرین بەرزترە، ئاوی شیرین دەچێتە نێو ئاوی سوێر، نەك ئاوی سوێر بە مل ئاوی شیریندا بێ.

٢)- ئاوی شیرین و سوێر جۆری پێکهاتەکەیان جیایە، بۆیە کاتێك کە ئاوی شیرین دەڕژێتەوە نێو ئاوی سوێریش، ماوەیەکی زۆر هەر تێکەڵ نابن، بۆ وێنە: ڕووباری ئەمازۆن کە لە چرکەیەکدا سێسەد هەزار مەتر سێجا (٣٠٠٠٠٠)م[٣] دەڕوات، دەچێتە نێو قووڵایی ئۆقیانووسی ئەتڵەسیی، هەشتا (٨٠) کیلۆمەتر دەڕوات، بەڵام ئاوی ڕووبارەکە هەر شیرین دەمێنێتەوە، یانی: بە درێژایی هەشتا کیلۆمەتر، خەڵك دەتوانێ بچێتە نێو ئۆقیانووسی ئەتڵەسیی و، لەوێدا ئاوی شیرین هەڵهێنجێ، لە ئاوی ئەو ڕووبارەی ئەمازۆن، هەروەها شوێنەکانی دیکەش ئاوە شیرینەکەیان بەهەمان شێوە دیارە، بەڵکو لە هەندێ شوێناندا لە وڵاتانی کەنداو، لەنێو ئۆقیانووسدا و لەنێو زەریا گەورەکاندا کە ئاوەکەیان شیرین و تاڵە، کانیی و سەرچاوەی گەورە هەن، خەڵك دەچنە ناێو قووڵایی ئەو زەریایە و، ئاوی شیرین و زوڵاڵ، لەوێ هەڵدەهێنجن، کانییەو دەردەقوڵێ و، ئاوی شیرین و زوڵاڵ، لە گەڵ ئاوی سوێری ئۆقیانووسەکەدا تێکەڵ نابێ[١].

٣)- پسپۆڕان و زانایان دەڵێن: نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو دەریای سوور کە کاتی خۆی (بَحر القُلزُم)یان پێگوتوە، ئەوەی نێوان میسرو دەشتی سینا، لەگەڵ دەریای سپی نێوەڕاست و، لەگەڵ دەریای ڕەش و، لەگەڵ ئۆقیانووسەکانی دیکە، ئەوانە هەر کامێکیان وەختێ کە لە مانگی دەستکردەوە تەماشایان کردوون، سەرنجیان داوە: هەر کامێکیان شێوەی پێکهاتەکەی جیایە و، خەتێکی باریکیان لە بەیندا هەیەو، ئاوەکان تێکەڵ بە یەکدی نابن، ئاوێتەی یەکدی نابن، واتە: ئاوی ئۆقیانووسەکانیش، جۆرێك لە نێوانیان لەبەیندا هەیە، چ جای، ئاوی سوێر و شیرین!

---

(١) تفسير النابلسي ج٦، ص٢٦٩.

زانایەکی گەورەی دەریاناس، دوای ئەوەی ئەو ڕاستییەی بۆ کەشف دەبێ، کە هەواڵی پێ دەدەن لە قورئانـدا خوای پەروەردگار ڕاستییەکی وای ڕاگەیاندوە، مسوڵمان دەبێ، دەڵێ: من ئێستا لە سەدەی بیستدام، ئەو نهێنییەم بۆ کەشف بووە، ئنجا ئەگەر لە قورئانێکدا ئەوە باسکرابێ (١٤٠٠) ساڵ لەمەو پێش، بە تەئکید ئەوە هی مرۆڤ نیە و، لە زانیاریی خوای پەروەردگارەوە سەرچاوەی گرتوە[1].

٦)- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا ﴾، خوا ئەو کەسەیە کە لە ئاو مرۆڤی دروستکردوە، دەگونجێ مەبەست لە (ماء)، لێرەدا ئاوی ئاسایی بێ، وەك لە سوورەتی (الأنبياء) یشدا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۝٣٠ ﴾، هەموو شتێکی ژیاندارمان لە ئاو دروست کردوە، دەشگونجێ لێرەدا مەبەست لە (ماء) تۆو (نُطفة) بێ، تۆوی پیاوو ئافرەت بێ.

٧)- ﴿ فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ﴾، دوایی خوا ئەو مرۆڤەو، وەچەی ئەو مرۆڤەی کردوە بە خزمی پشتێو خزمی بەرێ، یاخود کردوویەتی بە نێر و مێ، چونکە ڕەچەڵەکی مرۆڤ بە بابیەوە دیارە، خزمایەتیی (مصاهرة)ش لەڕێی دایکەوە، یاخود لەڕێی مێینەکانەوەیە، یانی: پیاوێك کە کوڕێکی دەبێ، کوڕەکەی درێژ بوونەوەی وەچەی ئەوە، دەبێ، بەهۆی کچەکەشیەوە زاوایەکی پەیدادەبێ، ئەویش دەبێتە هۆی خزمایەتیی، کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ نَسَبًا وَصِهْرًا ﴾، (النَّسَبُ: كِنايَةُ عَنِ الذَّكَر، والبِنتُ هِيَ الَّتِي تجلبُ الصِّهرَ، وَالصِّهرُ هِيَ الأُنثَى)، (نَسب) مەبەست پێی نێرینەیەو، کچیش زاوا و خزمایەتیی بەرێ پەیدا دەکات، بۆیە مەبەست لە (صهر) مێینەیە.

خوا ﷻ دوایی ئەو مرۆڤەی دابەش کردوە بۆ نێرو مێ، کە خوا ناوی لێناوە (نسب) و (صهر) نەسەب، واتە: خزمی پشتێ و، (صِهر)، واتە: خزمی بەرێ.

٨)- ﴿ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴾، هەروەها پەروەردگارت بە توانایە، بە توانایە کە بەم شێوەیەی کردوە، وەك بنچینە وایداناوە، بەڵام توانای خوا ﷻ سنوورێکی نیە و، قەیدو کۆت و بەندێکی لەسەر نیە، هەر بۆیە ئادەمی دروست کردوە، بەبێ ئەوەی لە باب و دایك پەیدابێ، عیساشی دروست کردوە بەبێ ئەوەی لایەنی بابی هەبێ و بە تەنیا لە دایك دروست بووە.

---

(١) هەمان سەرچاوە و بەرگ و لاپەڕە.

**مەسەلەی چوارەم:**

**باسی هەڵوێستی نەفامانەی کافرەکان، کە شتانێك دەپەرستن، نە سوودیان هەیە و، نە زیان و، چەند ڕێنماییەکی گرنگ بۆ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ لە بواری مامەڵەی لەگەڵ خەڵکدا و، باسی سڵەمینەوی کافرەکان لە ناوی ڕەحمان و، لە داوای کڕنووش بردن بۆ خوا ﷻ، کاتێ داوایان لێ بکرێ کڕنووش بۆ خوا بەرن، دەسڵەمنەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ ۗ وَكَانَ الْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِ ظَهِيرًا ﴿٥٥﴾ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٥٦﴾ قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِلَّا مَن شَاءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِ سَبِيلًا ﴿٥٧﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِ ۚ وَكَفَىٰ بِهِ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا ﴿٥٨﴾ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ۚ الرَّحْمَٰنُ فَاسْأَلْ بِهِ خَبِيرًا ﴿٥٩﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اسْجُدُوا لِلرَّحْمَٰنِ قَالُوا وَمَا الرَّحْمَٰنُ أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا وَزَادَهُمْ نُفُورًا ﴿٦٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ ﴾، [ئەوانەی باسکران، هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، کافرەکان]، لە جیاتی خوا ﷻ شتانێك دەپەرستن، کە نەسوودیان پێدەگەیەنن و نەزیانیان لێدەدەن، (و)، {الواو لِلحالِ، وَهَذَا مُستَعمَلٌ فِي التَّعجِيبِ مِن استِمرارِهِم فِي الشِّركِ}، (و) بۆ حاڵ یانی: لە حاڵێکدا کە لە جیاتی خوا ﷻ شتانێك دەپەرستن نە سوودیان پێ دەگەیەنن، نە زیانیان لێ دەدەن، جێی سەرسوڕمانەو سەرت سوڕهێنێ کە لەسەر هاوبەش بۆ خوا دانان، بەردەوامن و، شتانێك دەپەرستن بەو شێوەیەن!!

﴿ مَا لَا يَنفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ ﴾، شتانێك دەپەرستن کە نە سوودیان پێ دەگەیەنن و، نە زیانیان لێ دەدەن، نە سوودیان پێ دەگەیەنن، ئەگەر شتێك بکەن بە حیساب

ڕازییان بکەن، نە زیانیان لێ دەدەن، بە حیساب ئەگەر شتێك بکەن تووڕەیان بکەن، نە لە کاتی ڕازی بووندا، بۆیان سوود بەخشن و، نە لە کاتی تووڕەبوون و پەست بووندا، زیانگەیەنەرن، واتە: هیچیان لە دەست نایەت.

٢)- ﴿وَكَانَ ٱلْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِۦ ظَهِيرًا﴾، بابای بێبڕواش لە دژی پەروەردگاری پشتیوانە، واتە: پشتیوانیی کەسانێك دەکات کە دژی پەروەردگارن.

(أل) سەر ﴿ٱلْكَافِرُ﴾، ئەلیف و لامی ناساندنە و، مانای تێکڕا (إستغراق) دەگەیەنێ، واتە: تێکڕای کافران، پشتیوانی کەسێکن لە دژی پەروەردگاریانە، (ظَهِير: أي مُظاهِر ومُعِين)، واتە: پشتیوانییکار و هاوکار، ئنجا ئایا کێ لە دژی پەروەردگارە؟ هەر لە ئیبلیسەوە بگرە هەتا هەموو ئەوانەی کە دژایەتیی خوا ﷻ دەکەن، بابای کافر، لە دژی پەروەردگاری بۆیان دەچێتە سەنگەرەوە و، بە قازانجی دوژمنەکانی خوا ﷻ دژایەتیی خواو دۆستانی دەکات.

٣)- ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا﴾، تۆشمان نەناردوە، مەگەر دڵخۆشکەرو ترسێنەر بی، واتە: ئەرکی تۆ ئەی موحەممەد! ﷺ تەنیا ئەوەیە دڵیان خۆشبکەی بە پاداشتی خوا ﷻ، دڵیان خۆشبکەی ئەگەر بە ڕێی خوادا بڕۆن، هەم ژیانی دنیایان بەختەوەر دەبێ و، هەم لە ڕۆژی دوایی دا سەرفرازو سەر بەرز دەبن، هەروەها بشیانترسێنی: ئەگەر لەڕێی خوا ﷻ لابدەن و بەو شێوە نەژین، کە خوا ﷻ لە پەیام و وەحییەکەی خۆیدا، بۆی داناون، ئەوە هەم لە دنیادا تووشی بەدبەختیی و ژین تاڵیی دێن، لە ژیانی تاکیی و، خێزانیی و، کۆمەڵایەتیی و، سیاسییاندا و، هەم لە ڕۆژی دواییشدا تووشی سزاو جەزرەبەی خوا ﷻ دێن، کەواتە: هەم دڵیانخۆشبکە بەوە کە ئەگەر ڕێی خوا ﷻ بگرن، لە دنیاو دواڕۆژدا قازانجیانە و براوەن، هەم بشیانترسێنە کە ئەگەر لەڕێی خوا لابدەن، لە دنیاو دواڕۆژدا دۆڕاو و زەرەرمەندن، واتە: ئەرکی تۆ ئەوە نیە بەزۆر ملیان پێ بسووڕێنی بەرەو خواپەرستیی، ئەرکی تۆ بەس ئەوەیە ئاگاداریان بکەیەوە، لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ١٨﴾العنكبوت، واتە: پێغەمبەر ﷺ تەنیا گەیاندنی لەسەرە و، بە تەنیا ڕوونکردنەوەی لەسەرە.

٤)- ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ﴾، پێیان بڵێ: من هیچ جۆرە کرێیەکتان لێ داوا ناکەم، ﴿ أَجْرٍ ﴾، یانی: کرێ، پاداشت، (**الأجرُ: العِوَضُ عَنِ العَمَلِ**)، (**أجر**) بریتیە لە قەرەبووی کردەوەیەك، هەرشتێکی لە بەرانبەردا دابنرێ، پێی دەگوترێ: ﴿ أَجْرٍ ﴾، ئەو کرێیە ئەگەر کردەوەیەکیش بێ، کە مەبەست پێی پاداشت داناوە بێ، کرێیەکە و پاداشتەکە مەرج نیە تەنیا پارەبێ، یان شمەك و، کەل وپەل بێ، بەڵکو جاری وایە ئیشێکە، ئەو کارێکی بۆ کردوەو ئەویش کارێکی بۆ دەکاتەوە، بۆ نموونە: لە لادێدا خەڵك بۆ یەکدی دەچنە هەرەوەزێ و، هەموویان دەچنە ئیشی یەکدی، واتە: یەکێکیان دەچێ بۆ ئیشی دراوسێیەکەی و، دروسێیەکەشی دەچێتەوە بۆ ئیشی ئەو، واتە: ئیش لە بەرانبەر ئیش، کرێ و پاداشتەکەی ئەوەیە، ئنجا پێیان بفەرموو: تۆ هیچ چاوەڕوانییەکت لێیان نیە، هیچ کرێ و پاداشتێکیان لێ داوا ناکەی، لە بەرانبەر ئەوەدا کە تۆ پەیامی خوایان پێ دەگەیەنی.

٥)- ﴿ إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴾، مەگەر کەسێك بیەوێ بەرەو پەروەردگاری ڕێ بگرێتە بەر، ئەمە لە شێوەی ئەو ئایەتەی سوورەتی (**الشورى**) دایە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: بڵێ: من هیچ کرێ و پاداشتێکتان لە بەرانبەر گەیاندنی پەیامی خوادا، لێ داوا ناکەم، مەگەر خۆشەویستییم بۆ ئەوەی کە لە خوا ﷻ نیزیك بنەوە، واتە: بەس حەز دەکەم، کە لە خوا ﷻ نیزیك ببنەوە، ئەگەرنا هیچ چاوەڕوانییەکم لێتان نیە.

ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە کە شیعەکان لە تەفسیرەکانیاندا وایان تەفسیر کردوەو، هەندێك لە زانایانی دیکەش وایان هێناوە، کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ ﴿٢٣﴾ ﴾، یانی: (**إلاَّ أن تَوَدُّوني لِقَرابَتي**)، بەس ئەو کرێیەتان لێ داوا دەکەم، کە لەبەر خزمایەتیی منتان خۆش بوێ، بەڵام لەڕاستییدا ئەگەر لەبەر خزمایەتیی خۆشیان بوێ، ئەویش هەر دەکاتە کرێ، کەواتە: ئەو دووانە تێکدەگیرێن، بەڵام ئەگەر واتایەکەی ئەوەبێ کە: من هیچ چاوەڕوانییەکم لێتان نیە، مەگەر ئەوە کە حەز دەکەم لە خوا ﷻ نزیك بنەوە، ئەوە ئەو کاتە دەبێتە (**الإستِثناء**

المُنقَطِع)، هەڵاواردنی دابڕاو، ئەگەرنا ئەوی دیکە تێکدەگیرێ، لەلایەکەوە بڵێ: کرێتان لێ داوا ناکەم و، لەلایەکی دیکەشەوە بڵێ: منتان خۆش بوێ و لەگەڵم بن، لەبەر خزمایەتیی، مانای وایە پێشێ دەفەرمووێ: هیچتان لێ چاوەڕێ ناکەم و، دوایییش شتێکیان داوا لێدەکات، کە زۆر شتی تێدایە، چونکە ئەگەر خۆشیان بوێ لەبەر خزمایەتیی، دەبێ بە قسەشی بکەن و، دەبێ وابکەن و وابکەن، بەڵام نەخێر، واتە: بەس حەز دەکەم لە خوا ﷻ نیزیك ببنەوە، ئەو کاتەش بە کرێ دانانـدرێ.

ئنجا لێرەش کە دەفەرمووێ: ﴿إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا﴾، هیچ چاوەڕوانییەکم لێتان نیە، مەگەر کەسێك بیەوێ بەرەو پەروەردگاری ڕێ بگرێتە بەر، واتە: ئا ئەوە دیاریی و خەڵاتی منە، دیاریی و خەڵاتێك کە من لە ئێوەی چاوەڕێ دەکەم، ئەوەیە کە ڕێی خوا ﷻ بگرنە بەر، کە ئەوەش پێی دەگوترێ: هەڵاواردنی دابڕاو (الإستثناء المُنقَطِع)، چونکە ئەوان کە ڕێ بەرەو خوا ﷻ بگرنە بەر، بەشێك نیە لەو کرێ و پاداشتە، کە لە ڕستەی پێشێدا لابراوە.

٦)- ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَىِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ﴾، پشت بەو خاوەن ژیانە ببەستە، کە هەرگیز نامرێ، واتە: ئەو زاتەی کە ژیانی ڕاستەقینەی هەیە و، ژیانی تەواوی هەیە و، لە بەین چوون و مردنی بەدوادا نایەت، وەك باقی ژیاندارانی دیکە، بەس ئەو شایستەی ئەوەیە پشتی پێ ببەسترێ و، کاری خۆتی پێ بسپێری.

شایانی باسە: ئەو ڕستەیەی کە لە سوورەتی (الشورى)دا هاتوە، شیعەکان ئاوای تەفسیر دەکەن: ﴿إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ ۝٢٣﴾، ﴿ٱلْقُرْبَىٰ﴾، دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ، خوا ﷻ پێی فەرمووە: من چاوەڕوانییم لێتان هەیە، لەبەر خزمایەتیی منتان خۆش بوێ، یان خزمەکانی منتان خۆش بوێ، ئنجا هەمووشی دەبەنەوە سەر عەلی (خوا لێی ڕازیبێ) و، (أَهلُ البَیت)، کە ئەوان بە هەڵە دەڵێن: (آلُ البَیت)، کە لە ڕاستیی دا (آلُ مُحَمَّد ﷺ)، شوێنکەوتووانی موحەممەدن لە خزمانی و لە

بێگانـان، بـەڵام (أَهـلُ البَيـتِ)، واتـە: خزمـانی، کـە پێـش هەمـوو کـەس خێزانـەکانی دەگرێتـەوە (خـوا لێیـان ڕازیبـێ)، دایـکانی بـڕواداران، ئنجـا ئـەوانی دیکـە کـە بـە خزمایەتیـی دەچنـەوە سـەری: (عەلیـی و فاتیمـەو حەسـەن و حوسـەین) و، ئـەو وەچەیـەی کـە لێیـان پەیـدا بـوون (خـوا لێیـان ڕازیبێ)، چونکـە وشـەی (آل)، وەك لـە شـوێنی دیکـە گوتوومانـە: بـە تایبـەت لـە سـوورەتی (هـود)دا، باسـێکمان لـەو بـارەوە کـردوە: (آل الرَّجُـلِ: أتباعُـهُ وَخاصَّتُـهُ)، ئـالی هەرکەسـێك ئەوانـەن کـە لەگەڵیـدان و تایبەتـن پێیـەوە، چ بـۆ خێـر و، چ بـۆ شـەڕ، چونکـە خـوای پـەروەردگار دەفەرمـوێ: (آل فِرعَـون)، واتـە: ئەوانـەی بـە تایبـەت لەگـەڵ فیرعەونـدا بـوون و ڕێـی ئەویـان گرتـوە، یـان (آل إبرَاهِـم)، (آلُ نُـوح)، یـانی: ئەوانـەی کـە بـە تایبـەت لەگـەڵ ئیبراهیـم و لەگـەڵ نـووح دا بـوون، کەواتـە: ئێمـە کـە لـە تەحیاتـدا دەڵێیـن: (أَللّٰهُـمَّ صَـلِّ عَـلَى مُحَمَّـدٍ وَآلِ مُحَمَّـد)، (آل مُحَمَّـد)، واتـە: هەمـوو ئەوانـەی کـە بەڕاسـتیی دوای موحەممـەد ﷺ دەکـەون، بۆیـە مـن هەمیشـە لـە سـەرەتای دەرسـەکان دا دەڵێـم: (الحَمـدُ لِلّٰـهِ رَبِّ العالَمِـين، وَالصَّـلاةُ وَالسَّـلاَمُ عَـلَى مُحَمَّـدٍ وآلِـهِ أجمَعِـين، مِـنَ الصُّحْـبِ والأَزواجِ وَالقَرَابَـةِ وَالتَّابِعِـينَ لهـم بِإحسـانٍ إلى يَـومِ الدِّيـن)، چونکـە (آلِ مُحَمَّـد ﷺ)، بریتیـن لـە: هـاوەڵانی و هاوسـەرانی و خزمـانی و پاشـان شـوێنکەوتووانیان، بـەو ڕێیـەدا کـە پێغەمبـەر ﷺ پێیـدا ڕۆیشـتوە.

٧)- ﴿ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِ ﴾، بە ستایشکردنەوەش پەروەردگارت بە پاك بگرە، واتە: لە کاتێکدا کە بە پاکی دەگری، ستایشیشی بکە و، لە کاتێك کە ستایشی دەکەی، بە پاکیشی بگرە، یانی: بڵێ: (سُبحانَ اللهِ وَالحَمدُ لِلّٰهِ) یان (سُبحانَ اللهِ وَبِحَمدِهِ)، بە پاکگرتنی خوا، واتە: خوایە! تۆ هیچ کەم و کوڕییت نیە، نە لە زاتت و، نە لە سیفەتت و، نە لە کردەوەکانت و، نە لە وەحیی و شەریعەتەکەت و، نە لە فەرمایشتەکەت دا.

ستایشـکردنی خـواش ﷻ، واتـە: خوایـە تـۆ خـاوەنی هەمـوو سـیفەتێکی بـەرزو پەسـندی، بۆیـە شایسـتەی هەمـوو سـتایش و مـەدح و سـەنایەکی.

٨)- ﴿وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا﴾، بەسە پەروەردگارت شارەزای گوناهی بەندەکانی بێ، گوناهی بەندەکان هەر لە لای پەروەردگارت چاك زانراون و دەیانزانێ و، پێیان ئاشنا و شارەزایە، واتە: دەربەستی ئەوە مەبە کە کافرەکان ئەو هەموو گوناهو هەڵەو پەڵانە دەکەن، پەروەردگارت زۆر شارەزایە و، چاك سزاشیان دەدات، بۆیان لە نێو دوو نانی گەرمدا هەڵدەگرێ.

٩)- ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾، پەروەردگاری تۆ ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەویی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە، لە شەش ڕۆژاندا، {بە شەش قۆناغ} هێناونە دی.

١٠)- ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾، پاشان چۆتە سەر عەرش، چۆتە سەر بارەگای خۆی، بەرز بۆتەوە بۆ سەر عەرش، سەقامگیر بووە لەسەر عەرش، چونکە ﴿ٱسْتَوَىٰ﴾.

أ- بە مانای چووە سەر (عَلَى)، ب- بە مانای بەرز بووە (إرتَفَعَ)، ج- بە مانای سەقامگیربوو (إستَقَرَّ) دێ.

١١)- ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ﴾، زۆر بە بەزەییە، (الرحمن) لێرەدا گوزارە (خبر)ی نیهاد (مبتدأ)ێکی قرتێندراوە، یانی: (هُوَ الرَّحمَنُ)، ئەو زۆر خاوەن بەزەییە.

١٢)- ﴿فَسْـَٔلْ بِهِۦ خَبِيرًا﴾، واتە: لە بارەی ئەوەوە لە شارەزایان بپرسە، یاخود: بەس لەو بپرسە بۆ هەر شتێك کە بتەوێ تێیدا شارەزا بی، واتە: بەس ئەو شارەزایە، بە هەموو شتێك، ئەم تەعبیرە زیاتر وەك پەندێکە، وەك لە زمانی عەرەبییدا هاتوە: (عَلَى الخَبِيرِ سَقَطتَ)، تووشی شارەزای خۆت بووی، یانی: ئەو شتەی تۆ بۆت، بۆتە مەتەڵ و بۆت حەل ناکرێ، شارەزاییەکەی لە لای منە، وەرە با پێت بڵێم! بۆ هەردوو واتاکان گونجاوە، هەم دەگونجێ کە مەبەست ئەوەبێ: ئەگەر بتەوێ لە بارەی خواوە بزانی ﴿فَسْـَٔلْ بِهِۦ خَبِيرًا﴾، هەر لە خۆی بپرسە، با خۆییت پێ بناسێنێ، لەڕێی خۆیەوە دەزانی: خوا ﷻ زاتی، سیفەتی، کردەوەی، حاڵی، چۆنە؟ یاخود لە بارەی خواوە ﷻ کێ زۆر شارەزایە، لەو بپرسە، بۆ ئەوەی بە ناشێیی و بە نەزانیی هەڵوێستێك وەرنەگری لە بەرانبەر خوادا، کە نەیناسی و پێی نائاشنا بی، بە هۆی نەزانییەوە.

هەڵبەتە ئێمە هەم لە سوورەتی (الأعراف)دا، لە تەفسیری ئایەتی (٥٦)داو، هەم لە سوورەتی (یونس)دا، لە تەفسیری ئایەتی (٣)دا، زۆر بە تەفسیل لە بارەی چۆنیەتی دروستبوونی گەردوون، واتە: بەسەرو خوارێی ئاسمانەکان و زەوی، بە شەش قۆناغ و، پاشان چوونە سەر عەرشی خوای پەروەردگار، باسی تایبەتییمان لەو بارەوە کردوون، بۆیە لێرە بە پێویستی نازانین زیاتر شی بکەینەوە[1].

١٣)- ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسْجُدُواْ لِلرَّحْمَـٰنِ قَالُواْ وَمَا ٱلرَّحْمَـٰنُ ﴾؟ ئەگەر پێیان گوترا کڕنووش بۆ (خوای) خاوەن بەزەیی ببەن، گوتیان: بەبەزەیی چییە؟ کە لێرە مەبەست لە (سُجُود)، یانی: دانی پێدا بێنن بە پەروەردگارێتیی دا و، بە یەکتایی لە پەرستراوێتیی دا و، بۆی ملکەچ بن، ئەگەرنا مەبەست کڕنووشی نوێژ نیە، چونکە، ناگونجێ ئێستا ئیمانی نەهێنابێ، پێی بڵێی: وەرە کڕنووشی نوێژ بەرە، نا، یانی: ئەگەر پێیان بگوترێ: بۆ خوای خاوەن بەزەیی، ملکەچ بن و، دان بە پەروەردگارێتیی و تەنیا پەرستراوێتیی ویدا بێنن و، دان بە شەریعەت و بەرنامەکەیدا بێنن، مەبەست پێی ئەوەیە، هەرچەندە ڕەنگە زۆر کەس وای لێکدابێتەوە، وابزانێ کە مەبەست ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ پێی گوتبن: وەرن سەجدەی نوێژ بەرن! وەرن نوێژ بکەن! بەڵام نەخێر، وانیە، ئنجا ئێمەش دەبێ وریا بین، کەسێك کە جارێ بووناسیی ئیسلامیی قبووڵ نەکردوە، ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی نەچۆتە نێو عەقڵ و دڵەوە، مەعقووڵ نیە داوای لێ بکرێ پابەند بێ بە شەریعەتەوە: نوێژ بکات، ڕۆژوو بگرێ، باقی ئەرکەکانی دیکەی شەریعەت جێبەجێ بکات، چونکە کەسێك بڕوای بە ئەصڵی دین نەبێ، ئەرکدار ناکرێ بە لقەکانی دینەوە، (**مَن لَم يُؤمِن بِأَصلِ الدِّين، أَو أُصُولِ الدِّين، لا يُكَلَّفُ بِفُرُوعِهِ**)، بێگومان ئەوە شتێکی بەڵگە نەویستە، ئنجا ئەگەر پێیان بگوترێ: بۆ خوای خاوەن بەزەیی ملکەچ و تەسلیم بن، چی دەڵێن؟

﴿ قَالُواْ وَمَا ٱلرَّحْمَـٰنُ ﴾، دەڵێن: ڕەحمان چییە؟ ئەم پرسیارکردنە، پرسیارکردنە بۆ پێ سەیر بوون، (إستِغْرَاب) کە مەبەست پێی نکووڵییلێکردنە.

---

(١) هەروەها دواتر لە تەفسیری سوورەتی (فصلت) و سوورەتی (الرحمن)یش دا کورتە باسی گرنگمان لەوبارەوە کردوون.

١٤)- ﴿أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا﴾، ئەمەش پرسیارکردن و نکوولّییلێکردن و مل نەدانە، واتە: ئایا ئێمە ملکەچ بین بۆ کەسێك کە تۆ فەرمانمان پێ دەکەی؟

١٥)- ﴿وَزَادَهُمْ نُفُورًا﴾، [ئەو قسەیە کە پێیان دەگوترێ: بۆ خوای خاوەن بەزەیی ملکەچ بن]، زیاتر دەیانسلّەمێنێتەوەو زیاتر دوور دەکەونەوە، (نُفُور)، بە مانای ڕاکردن (فرار)و دوورکەوتنەوە (إبتِعاد)و سلّەمینەوە دێ.

**مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:**

**جارێکی دیکە باسی نیعمەتەکانی خوا ﷻ: دروستکردنی ئەستێرە مەزنەکان و خۆری تیشکدەرو، مانگی ڕووناککەرەوە لە ئاسمان و، بەدوای یەکدا هێنانی شەوو ڕۆژان، بۆ کەسانێك کە بیانەوێ خوایان بێتەوە یادو، سوپاسگوزاریی بۆ بکەن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِي جَعَلَ فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴿٦١﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ خِلْفَةً لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا ﴿٦٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِي جَعَلَ فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا ﴾، بەردەوام بەرز و بەپێز و پایە بەرزە، ئەو زاتەی بورجەکانی لە ئاسماندا داناون، (بُرُوج) کە کۆی (بُرْج)ە، یان بە ئەستێرە گەورەکان دەگوترێ، یان بە ئەو دوازدە قۆناغەی کە خۆر پێیاندا تێدەپەڕێ، دەگوترێ، کە لە تەفسیری سوورەتی (الرعد)دا، ناوی بورجەکانمان هێناوەو لەو بارەوە وردتر قسەمان کردوە، کە زیاتریش وا پێدەچێ مەبەست پێی ئەستێرە گەورەکان بێ، واتە: بەردەوام بەرزو بەپێزە ئەو خوایەی کە لەسەرێ ئەستێرە مەزنەکانی داناون.

٢)- ﴿ وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴾، هەروەها چرایەك و مانگێکی ڕوون و ڕوونکەرەوەی تێدا داناوە، (فِيهَا) ئەم ڕاناوە بۆ: (ٱلسَّمَآءِ)، دەچێتەوە، لە ئاسمانێدا، چی داناوە؟ ﴿ سِرَٰجًا ﴾، چرایەك، کە مەبەست پێی خۆرە، ﴿ وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴾، مانگێکی ڕۆشنیش، هەڵبەتە (سِرَاج) خوێندراویشەتەوە: (سُرُجًا)، واتە: چەند چرایەك، ئەو کاتە: هەم خۆریش و هەم ئەو ئەستێرانەش کە زیاتر لە زەوییەوە تیشکەکەیان نیزیکە، هەموویان دەگرێتەوە، جێی سەرنج ئەوەیە کە خوا ﷻ لێرەدا بە خۆر دەفەرموێ: (سِرَاج)، بەڵام بە مانگ دەفەرموێ: ﴿ وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴾، مانگێکی ڕۆشن، ڕۆشنکەرەوە،

کە ئەوەش ئیعجازێکی عیلمیی تێدایە، خۆر تیشکەکەی زاتییە، لە نێو خۆردا تەقینەوە نێوکییەکان (**الإنفجارات النووية**) ڕوو دەدەن، لە ئەنجامی ئەوەدا لە هەر چرکەیەکدا، دەوری پێنج ملیۆن تەن وزە سەرف دەبێ لە خۆر، لە سوورەتی (النبأ)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ ﴾، چرایەکی زۆر پڕشنگدار و تیشکدەر، هەروەها لە سوورەتی (نوح)یشدا بە هەمان شێوە، خوا ﷻ هەمیشە خۆر، بە چرای تیشکدەر و چرایەکی زۆر ڕۆشن دادەنێ، بەڵام مانگ بە ڕۆشنایی و ڕۆشنکەرەوە، لەبەر ئەوەی ڕووناکیی مانگ لە خۆرەوە وەری دەگرێ و، ڕووناکییەکی خودیی نیە.

٣)- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ خِلْفَةً ﴾، هەروەها خوا ﷻ ئەو زاتەیە کە شەو و ڕۆژی والێکردوون، بە دوای یەکدا بێن، ﴿ خِلْفَةً ﴾، (**إِسمٌ لِمَا يَخلُفُ غَيرَهُ فِي بَعْضِ ما يَصْلُحُ لَهُ**)، ﴿ خِلْفَةً ﴾، بەوە دەگوترێ: شتێك بە دوای شتێکدا بێ، لەو شتەدا کە بۆی شایستە بێ و لەگەڵی دا بگونجێ، مەرج نیە لە هەموو شتێکدا.

لێرەدا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: شەوو ڕۆژی کردوونە جێنشینی یەکدی، چونکە شەو دێتە جێی ڕۆژو، ڕۆژ دێتە جێی شەو، هەڵبەتە جێیەکەشیان هەر بریتیە لە ڕووبەری زەوی، شەو و ڕۆژ بە دەوری زەویی دا دێن، بەردەوام خڕۆکەی زەوی، کە خڕو هێلکەیی هەڵکەوتوە، نیوەی تاریکەو نیوەشی ڕووناکە، ئەو ڕووناکیی و تاریکییە بەردەوام بە دوای یەکدا دێن، چونکە زەوی لە خولەکێك دا دەوری سی (٣٠) کیلۆمەتر دەبڕێ لە سووڕانەوەی بە دەوری خۆیدا، بەڵام لە سووڕانەوەی بە دەوری خۆردا لە هەر چرکەیەکدا سی (٣٠) کیلۆمەتر دەبڕێ، واتە: شەست هێندەی کە بە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە، خێراتر بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە، ئنجا لە ئەنجامی سووڕانەوەی بە دەوری خۆیدا، شەو و ڕۆژ پەیدادەبن و بە دوای یەکدا دێن، وەك لە سوورەتی (الأعراف)دا، دەفەرموێ: ﴿ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا ﴿٥٤﴾ ﴾، خوا ﷻ بە شەوگار ڕۆژگار دادەپۆشێ، بە خێرایی بەدوای دەکەوێ، ﴿ حَثِيثًا ﴾، (يَعنِي: سَرِيْعاً)، هەروەها هاو کات کە شەو بەدوای ڕۆژ دەکەوێ، ڕۆژیش بەدوای شەو دەکەوێ، لە ئەنجامی سووڕانەوەی

زەوی بە دەوری خۆریش دا بەخێرایی سی (٣٠) کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا، چوار کەشەکانی ساڵ پەیدادەبن.

دەفەرموێ: خوا ﷻ شەو و ڕۆژی والێکردوون، جێی یەکدی بگرنەوە، بۆچی؟!

٤)- ﴿لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا﴾، بۆ هەر کەسێك کە بیەوێ، یاد بکات، یان سوپاسگوزاریی بوێ، ﴿أَن يَذَّكَّرَ﴾، خوێندراویشەتەوە: (أَن يَذْكُرَ)، (ل)کە، بۆ (تعليل)ە، یانی: ئەوەی بۆیە والێکردوە، بە سوودە بۆ کەسێك کە بیەوێ بیری بکەوێتەوە، یاخود ئەگەر (يَذْكُرَ) بێ، تاکو: یادی خوا ﷻ بکات، (تَذَكُّر)، (تَفَعُّل)ە، لە (ذِكر)، (أَي: تَكَلُّفُ الذِّكر)، وشەی (ذِكر) و (تَذَكُّر)، لە قورئاندا بە مانای ڕامان هاتوون، بە مانای وەبیر هاتنەوەی شتێك کە لەبیر چووبێتەوە، هاتوون، بە مانای زانینی شتێکیش دێن و، بە مانای پەند وەرگرتنیش دێن، ئنجا خوا ﷻ شەو و ڕۆژی کردوون بە جێنشینی یەکدی، بە دوای یەکدا دێن بۆ کەسێك کە بیەوێ وەبیری بێتەوەو ڕامێنێ، پەند وەربگرێ، ﴿أَوْ أَرَادَ شُكُورًا﴾، یاخود ئەگەر بیەوێ سوپاسگوزاریی بکات، (شُكُور) چاوگەو هاوواتای (شُكر)ە، (شُكُور) و (شُكر)، هەردووکیان یانی: سوپاسگوزاریی، (شُكر)یش ئەوەیە کە کەسێك چاکەی لەگەڵت دا کردبێ و، تۆ بە چاکەکەی بزانی و، نادیدەی نەگری، کە لێرەدا مەبەست پێی بەندایەتیی کردنە بۆ خوا ﷻ، چونکە کە تۆ دەزانی خوا ﷻ ئەو هەموو چاکانەی لەگەڵ تۆ دا کردوون، ئەوە خوازیاری ئەوەیە تۆ بەندایەتیی بۆ بکەی و بیپەرستی، ئنجا دەگونجێ ئەو وەبیر هاتنەوەیە لە ڕۆژدا بێ و، ئەو سوپاسگوزارییە کە مەبەست پێی خواپەرەستییە لە شەودا بێ، خوا پەرستییەکانی شەو، بە تایبەت شەو نوێژ و، دەشگونجێ هەم وەبیرهاتنەوە (تَذَكُّر)ەکە، هەم سوپاسگوزارییەکە، هەم لە شەودا بن، هەم لە ڕۆژدا بن، یاخود بە پێچەوانەوە: سوپاسگوزارییەکە لە ڕۆژدا بێ و، هاتنەوە بیرەکەو، پەند وەرگرتنەکە لە شەودا بێ، هەموو واتایەکان گونجاون.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان دەرسی کۆتاییە لە سوورەتی (الفرقان)، کە پازدە (١٥) ئایەت دەگرێتەوە، ئایەتەکانی: (٦٣- ٧٧)، کە خوای زاناو شارەزا تێیاندا پازدە (١٥) سیفەتی بنەڕەتیی، بەندە هەڵبژاردەو پەسندەکانی خۆی خستوونە ڕوو.

شایانی باسیشە: ئەو پازدە (١٥) خەسڵەتە زۆربەی بوار و ڕەهەندەکانی دین و ژین دەگرنەوە، بە هەردوو باری کردنی چاکەو، خۆ پاراستن لە خراپەوە، ئەو پازدە (١٥) سیفەتەش ئەمانەن:

١- بە ئارامیی بەڕێدا ڕۆیشتن.

٢- قسەی سەلامەت و بەڕێز کردن لەگەڵ نەفاماندا، یاخود واز لێ هێنانیان.

٣- شەونوێژ کردن.

٤- پاڕانەوە لە خوا بۆ پارێزران لە دۆزەخ.

٥- میانجێتیی لە خەرج کردندا، نە چنگ قووچاویی، نە دەست بڵاویی.

٦- نەپاڕانەوە لە جگە لە خوا، چاوەڕوانیی نەکردنی ئەو شتانەی کە تەنیا بە خوا دەکرێن، لە جگە لە خوا.

٧- خۆپاراستن لە کوشتنی بە ناهەق.

٨- خۆپاراستن لە زیناو داوێن پیسیی.

٩- تۆبە کردن و چاکسازیی، دوای ئەوەی کە تووشی هەڵەو پەڵەیەك دەبێ.

١٠- گۆڕینی کردەوەی خراپ بە هی باش.

١١- ئامادە نەبوون لە کۆڕ و مەجلیسی درۆداو، خۆپاراستن لەو کۆڕ و مەجلیسانە.

١٢- بەڕێزەوە تێپەڕین و ڕابردن بەلای لەغوودا، واتە: قسەو کردەوەی پووچ و بێ کەڵك.

١٣- کەڕو کوێرانە مامەڵە نەکردن لەگەڵ ئایەتەکانی خوادا، بەڵکو بە گوێی کراوەو، بە چاوی کراوەوە لەگەڵ ئایەتە بینراوو بیستراوەکانی خوادا مامەڵە کردن.

١٤- لە خوا پاڕانەوە، کە هاوسەر و وەچەی دڵخۆشکەریان پێ ببەخشێ.

١٥- لە خوا پاڕانەوە، کە بیانکاتە پێشەوای پارێزکاران.

ئنجا لە کۆتایی ئەم سوورەتەشدا خوا ڕایگەیاندوە، کە ئەوەی وا دەکات خوای کارزان و بەخشەر گرنگیی بە مرۆڤەکان بدات و ڕێزیان لێ بگرێ، پاڕانەوەو بەندایەتییانە بۆ خوا، یاخود ئەوەی وا دەکات کە خوا گرنگییان پێ بدات، ئەوەیە کە بانگیان بکات بۆ لای بەندایەتیی بۆ خۆی و، حیکمەتی خواش لە ناردنی پێغەمبەران و لە دابەزاندنی کتێبەکانیدا، کە بەندەکانی خواپەرست بن و بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، لەبەر ئەوەیە کە بەس ئەوە مایەی سەر بەرزیی دنیاو دواڕۆژیانە، ئەگەرنا خوای باڵادەست نە لە گوناهی بەندەکانی زەرەرمەندە، نە لە بەندایەتیی و چاکەکانیشیان بەهرەمەندە.

﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ
سَلَٰمٗا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ
عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ﴿٦٦﴾
وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامٗا ﴿٦٧﴾ وَٱلَّذِينَ لَا
يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن
يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامٗا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا
مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلٗا صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ
غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابٗا ﴿٧١﴾ وَٱلَّذِينَ لَا

يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغۡوِ مَرُّواْ كِرَامٗا ﴿٧٢﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ
لَمۡ يَخِرُّواْ عَلَيۡهَا صُمّٗا وَعُمۡيَانٗا ﴿٧٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا
قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ يُجۡزَوۡنَ ٱلۡغُرۡفَةَ بِمَا صَبَرُواْ
وَيُلَقَّوۡنَ فِيهَا تَحِيَّةٗ وَسَلَٰمًا ﴿٧٥﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ حَسُنَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ﴿٧٦﴾ قُلۡ مَا
يَعۡبَؤُاْ بِكُمۡ رَبِّي لَوۡلَا دُعَآؤُكُمۡۖ فَقَدۡ كَذَّبۡتُمۡ فَسَوۡفَ يَكُونُ لِزَامَۢا ﴿٧٧﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بەنـدەكانی (خـوای) بـە بەزەییـش ئەوانـەن: كـە بـە هێمنیـی بەسـەر زەویـدا دەڕۆن و، هـەركات نەفامـان دواندیانـن، قسـەی سـەلامەتیان لەگـەڵ دەكـەن (یـان پێیـان دەڵێـن: سـەلامتان لێبـێ) ﴿٦٣﴾ هەروەهـا ئەوانـەن كـە لـە خزمـەت پەروەردگاریانـدا شـەوگار بەسـەر دەبـەن، لـە حاڵێكـدا كـە كڕنووشـیان بـردوەو بەپێـوە وەسـتاون ﴿٦٤﴾ هەروەهـا ئەوانـەن كـە دەڵێـن: پەروەردگارمـان! ئـازاری دۆزەخـمان لـێ لابـدە، بێگومـان دۆزەخ ئازارەكـەی بەردەوامـەو لەكـۆڵ نابێتـەوە ﴿٦٥﴾ بێگومـان (دۆزەخ) خراپتریـن نشـینگەو جێـی تێـدا مانەوەیـە ﴿٦٦﴾ دیسـان ئەوانـەن كـە كاتێـك سامانیان خەرجكـرد، زێدەڕۆیـی و ڕژدیـی ناكـەن و، لـەو نێوانـەدا ڕێـك و میانجییـن ﴿٦٧﴾ هەروەهـا ئەوانـەن كـە لەگـەڵ خـوادا لە هیـچ پەرسـتراوێك ناپاڕێنـەوەو، ئەو كەسـەی خـوا قەدەغـەی كـردوە، بـە هـەق نەبـێ نایكـوژن و، زینـا ناكـەن و، هـەر كەسـێكیش دووچـاری (سـزای) گوناهەكـەی دەبـێ ﴿٦٨﴾ ڕۆژی قیامەتـێ سـزای بـۆ چەندقـات دەكـرێ و بـە ڕیسـوایی تێیـدا هـەر مـاو دەبـێ ﴿٦٩﴾ مەگـەر كەسێك بگەڕێتـەوە (لای خـوا)و، بـڕوا بێنـێ و، كـردەوەی چـاك بـكات، ئەوانـە خـوا خراپەكانیـان بـۆ دەگـۆڕێ بـە چـاكان و، خـواش لێبـوردەی بـە بەزەییـە ﴿٧٠﴾ كەسـێكیش بگەڕێتـەوەو كـردەوەی چـاك بـكات، ئـەوە گەڕانەوەكـەی بـۆ لای خوایـە، (بـا قـەدری گەڕانەوەكـەی بزانـێ

چونکە پاداشتێکی مەزنی هەیە) ﴿٧١﴾ {دیسان بەندە پەسندەکانی خوای بەبەزەیی} ئەوانەن کە ئامادەی گوناهو خراپە نابن و، کاتێکیش بەسەر قسەی پووچدا رادەبرن، بەرێزەوە رادەبرن (تێکەڵ نابن) ﴿٧٢﴾ هەروەها ئەوانەن کاتێك نیشانەو ئایەتەکانی پەروەردگاریان (بە بیستراوو بینراوەوە) بیر دەخرێنەوە، کەرانەو کوێرانە لەپەوڕوو بەسەریان دا ناکەون (بەڵکو بە گوێ و چاوو عەقڵی کراوەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن) ﴿٧٣﴾ هەروەها ئەوانەن کە دەڵێن: پەروەردگارمان! لە هاوسەران وەچەمان مایەی دڵخۆشیی و دڵ ئاسوودەییمان بۆ برەخسێنەو، بۆ پارێزکارانیش بمانکێرە بە پێشەوا ﴿٧٤﴾ ئەوانە بەهۆی خۆڕاگرییانەوە کۆشکەکانی (بەهەشت)یان بە پاداشت دەدرێنێ و، سەلامیان لەوێدا لێ دەکرێ ﴿٧٥﴾ تێیاندا هەرماو دەبن، ئەو بەهەشتە (باشترین) نشینگەو شوێنی تێدا مانەوەیە ﴿٧٦﴾ بڵێ: ئەگەر (لە خوا) پاڕانەوەتان نەبێ، پەروەردگارم هیچ بایەختان پێنادات، (کەچی) ئێوە (ئەوەی خوا بە پێغەمبەرەکەیدا ناردوویەتی) بەدرۆتان دانا، بۆیە لەمەو دوا (سزا) پێتانەوە پەیوەست دەبێ و ملتان دەگرێ ﴿٧٧﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(هَوْنًا ): (الهَوْنُ: مَصْدَرُ الهَيِّنِ، وَهُوَ السَّكِينَةُ وَالوَقَارِ)، (هَوْن) چاوگی (هَيِّن)ە، کە بریتیە: لە ئارامیی و سەنگینی.

(غَرَامًا): (غَرَاماً: أَي لازِمَاً دَائِمَاً غَيْرُ مُفَارِقٍ، وَمِنْهُ سُمِّيَ الغَرِيمُ لِمُلاَزَمَتِهِ)، (غَرَاماً) واتە: پەیوەست، بەردەوام، جیانەبووەوە، لەمەوە بە بابای خاوەن قەرز گوتراوە: (غَرِيم)، لەبەر ئەوەی کەسێك قەرزی لەسەر کەسێك بێ، لە کۆڵی نابێتەوە تاکو قەرزەکەی دەداتەوە، دەگوترێ: (فُلاَنٌ مُغْرَمٌ بِكَذَا، أَي: لاَزِمٌ لَهُ مُولَعٌ بِهِ)، فڵانکەس زۆر هۆگریی فڵانشتەیە، واتە: پێیەوە پەیوەستەو، لێی جیانابێتەوە.

(يَقْتُرُواْ ): (قَتَرَ، يَقْتُرُ، وَيَقْتِرُ: فَهُوَ مُقْتِرٌ أَي: ضَيَّقَ)، (قَتَرَ) یانی: (ضَيَّقَ)، ئنجا چ (مضارع)ەکەی بە (يَقْتُرُ) چ (يَقْتِرُ) بێ، هەروەها بە (يُقَتِّرُ)ش، (قَتَّرَ، يُقَتِّرُ)، هەمووی بە مانای (ضَيَّقَ)یە، واتە: تەنگی کردەوە، تەسکی کردەوە، بە کوردیی دەڵێین: دەست نووقاندن، چنگ نووقاندن، ڕژدیی و چرووکیی.

(قَوَامًا ): (قَوَاماً: عَدْلاً وَقَصْداً بَيْنَ طَرَفَينِ)، (قَوَام) بە مانای دادگەر، بۆ شتێك کە میانجیی بێ لەنێوان دوو لایاندا، نەبەولا دابێ، نەبەولا دابێ، ماڵ بەخشینیش دەکەوێتە نێوان دەستبڵاویی و چنگ قووچاویی، نە دەستبڵاو بە، نە دەست قووچاوبە، بەڵکو ماڵ خەرجکەرێکی دادگەرو تێر و تەواو بە.

(أَثَامًا ): (الإِثْمُ وَالأَثَامُ: إِسْمُ لِلأَفْعَالِ المُبَطِّئَةِ عَنِ الثَّوَابِ، وَجَمْعُهُ آثَام)، (إِثْم) و (أَثَام)، ناون بۆ ئەو کردەوانەی مرۆڤ لە پاداشت دوا دەخەن و، بە (آثَام) کۆدەکرێنەوە، بەڵام لەوێدا ﴿ يَلْقَ أَثَامًا ﴾، یانی: تووشی سزای گوناهەکەی دێ.

(ٱلزُّورَ): بە مانای درۆ دێ، چونکە (زُوْر) لە ئەسڵدا بە مانای لادان دێ، (الـزُّورُ: المَيـلُ)، لادان، لەوەوە، درۆش کە لە جادەی ڕاستیی لادەدا، بۆیە بە درۆ گوتراوە: (زور)، بەڵام وێڕای ئەوە (زَور)، بە مانای (ضَيف)یش، دێ یانی: میوان و ئەویش هەر لە (مَيـل)ەوە هاتوە،چونکە میوانەکە بە لای ماڵی خانە خوێدا، لادەدات.

(لَمْ يَخِرُّواْ): (خَـرَّ: أي سَـقَطَ سُـقُوطاً يُسْـمَعُ مِنْـهُ خَرِيـرٌ)، (خَـرَّ) یـانی: کەوتنێـک کـەوت دەنگێـکی تایبەتیـی لێهـات، بـە کوردیـی دەڵێـن: زرمـە، گرمـە، ڕمبـە.

(قُـرَّةَ أَعْيُنٍ): (قَـرّ) پێچەوانـەی (حَـرّ)ە، (قَـرّ) یـانی: سـارد و فێنـك، (حَـرّ) بـە مانـای گـەرم، ئنجـا لەبـەر ئـەوەی فرمێسـکی شـادیی و دڵخۆشـیی سـاردە، لـەوەوە بـە دڵخۆشـییان گوتـوە: (قُرَّةُ عَيْن)، واتـە: ئـەوەی کـە دەبێتـە مایـەی فرمێسـکی شـادیی، چونکـە ئینسـان کـە دڵخـۆش و شـادمان بـوو، فرمێسـکی ساردی دێ، ئـەوەش شـتێکی ئەزموونکـراوە، بـەڵام مـرۆڤ کـە دڵـی تونـدو ناڕەحـەت بـوو، فرمێسـکەکانی گـەرم دەبـن، کەواتـە: (قَـرَّ عَيْنُـهُ: أي: سُرَّ)، دڵخـۆش بـوو، دڵخۆشـکرا.

(ٱلْغُـرْفَـةَ): (الغُرْفَـة: مَنَـازِلُ الجَنَّـةِ الرَّفِيعَـة)، پلـە بـەرزەکانی بەهەشـت، نـەك بـە مانـای ژوورێـك، یـانی: (يُجْـزَوْنَ القُصُـورَ العَـوالِي)، کۆشـکە بەرزەکانیـان دەدرێنـێ.

(مَا يَعْبَؤُاْ بِكُمْ): واتـە: بایەختـان پێنـادات، گرنگییتـان پێنـادا، (مَـا عَبَـأْتُ بِكَـذَا: لَـمْ أُبَـالِ بِـهِ، وَأَصلُـهُ مِـنَ العِـبْءِ)، (مـا عَبَـأْتُ بِكَـذَا)، واتـە: بایەخـم پێنـەدا، گرنگییـم پێنـەدا، لـە ئەسـڵدا لـە (عِـبْءِ)ەوە، هاتـوە، (عِـبءِ)، یـانی: کـۆڵ و ئـەرك و بـار، ئنجـا کـە تـۆ گرنگییـت بـە کەسـێك بـە شـتێك دا، مانـای وایـە ئەرکەکەیـت خسـتۆتە سـەر شـانی خـۆت.

(لِزَامًا): (لُـزُومُ الـشَّيءِ: طُـولُ مَكْثِـهِ)، شـتێك کـە زۆر بمێنێتـەوە، لـە کـۆڵ نەبێتـەوەو پەیوەسـت بـێ، پێـی دەگوتـرێ: (لازِم)و (لِزام).

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هـۆی هاتنـە خـواری ئـەو ئایەتـە موبارەکـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴿٧١﴾ ﴾:

**لەوبارەوە دوو بەسەرهات گێردراونەوە:**

**یەکەمیان: {عَنْ عَبْدِ اللهِ ابنِ مَسعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُ قَالَ: سَأَلتُ أو سُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَيُّ الذَّنبِ عِنْدَ اللهِ أكْبَرُ؟ قَالَ: أَنْ تَجْعَلَ لِلهِ نِدّاً وَهُوَ خَلَقَكَ، قُلْتُ: ثُمَّ أَيُّ؟ قَالَ: أَنْ تَقتُلَ وَلَدَكَ خَشْيَةَ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ، قُلْتُ: ثُمَّ أَيُّ؟ قَالَ: أَن تُزانِيَ بِحَلِيلَةِ جَارِكَ، قال: وَنَزَلَتْ هَذِهِ الأَيَةُ تَصدِيقاً لِقَوْلِ رَسُولِ اللهِ ﷺ: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ....} (أخرجه البخاري: ٧٥٣٢، ومسلم: ١٣٢).**

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، دەڵـێ: پرسـیارم کـرد لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ، یـان پرسـیاری لێکـرا: چ گوناهێـك لـەلای خـوا گەورەتـرە؟ فەرمـووی: ئـەوە کـە هاوتـا بـۆ خـوا دابنێـی، لـە حاڵێکـدا کـە تـۆی دروسـتکردوە، {هاوبـەشی بـۆ دابنێـی} گوتـم: دوای ئـەوە چ گوناهێـك گەورەتـرە؟ فەرمـووی: ئـەوە کـە منداڵەکـەی خـۆت بکـوژی، لـە تـرسی ئـەوەی خواردنـت لەگـەڵ بخـوا، گوتـم: دوای ئـەوە چـی؟ فەرمـووی: ئەوەیـە کـە لەگـەڵ هاوسـەری دراوسـێکەتدا زینـا بکـەی، (عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود) دەڵـێ: دوایـی ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوار، وەك بەڕاسـتدانان بـۆ قسـەکەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ.

دووەمیان: [عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا أَنَّ نَاساً مِنْ أَهْلِ الشِّرْكِ قَتَلُوا فَأَكْثَرُوا، وَزَنُوا فَأَكْثَرُوا، ثُمَّ أَتَوا مُحَمَّداً ﷺ فَقَالُوا: إِنَّ الَّذِي تَقُولُ وَتَدعُو لَحَسَنٌ، وَلَو تُخْبِرُنَا أَنَّ لِما عَمِلْنَا كَفَّارَةً؟ فَنَزَلَ: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ... ﴾، وَنَزَلَ: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الزمر] (أخرجه البخاري: ٤٨١٠، ومسلم: ١٩٣).

واتــە: عەبدوڵــڵای کــوڕی عەبــاس (خــوا لێیــان ڕازی بــێ)، دەڵــێ: کەســانێك لــە هاوبــەش بــۆ خــوا دانــەرەکان لەســەردەمی نەفامیــی دا، کوشــتاریان کردبــوو، زۆر خەڵکیــان بــە ناهــەق کوشــتبوو، زۆریــش زینایــان کردبــوو، دوایــی هاتنــە لای موحەممــەد ﷺ گوتیــان: ئــەوەی دەیڵێــی و، خەڵــکی بــۆ بانــگ دەکــەی شــتی چاکــە، بــەڵام ئەگــەر هەواڵــت پێدابایــن: ئایــا ئــەوەی کردوومانــە، ســڕینەوەی بــۆ هەیــە؟ ئیــدی بــەو بۆنــەوە ئــەم ئایەتــەی ســوورەتی (الفرقــان) و، ئایەتەکــەی ســوورەتی (الزمر) ئایــەتی (٥٣) دابــەزی.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەك گوتمان: کە ئەو پازدە (١٥) ئایەتە، پازدە سیفەتی گرنگ و بنەڕەتیی بۆ بەندە پەسندەکانی خوا دەخەنە ڕوو، ئەوەی تێبینیش دەکرێ: ئەو سیفەتانە زۆربەی بوارەکانی دینداریی و مسوڵمانەتییان گرتوونە، کە ئێمە ئێستا چاوێکی خێرا بە مانای گشتیی ئەم ئایەتانەدا دەگێڕین، چونکە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا، زیاتر دەچینە نێو وردەکاریی چەمك و واتاکانیانەوە:

خوا ﷻ لە کۆتایی ئەم سوورەتە موبارەکەدا - کە وەك لە سەرەتایەوە گوتمان: ئەم سوورەتە زیاتر تەرخانکراوە بۆ باسی قورئان و وەحیی و پێغەمبەرایەتیی و باسی پێغەمبەر ﷺ هاوکات تێواخن لەگەڵ ئەوەشدا باسی نیشانەکانی خوا ﷻ باسی یەکتایی خوا لە پەرستراناییدا لە پەروەردگارێتیدا - ئنجا لە کۆتایی دا خوا ئەو بەندانەی خۆی، کە بەو ڕاستەشەقامەی خوا بە یەکگرتن و، شوێن پێی پێغەمبەر هەڵگرتن و، پەیڕەویی لە قورئانکردندا دەڕۆن، بۆمان پێناسە دەکات بە سیفەتە بنەڕەتیی و بنچینەییە پەسندو چاکەکانیان، چ ئەنجامدانی شتی چاك بن، چ خۆپاراستن لە شتی خراپ بن.

دەفەرموێ: ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا ﴾، بەندەکانی خوای خاوەن بەزەیی، ئەوانەن کە بە هێمنیی و ئارامیی بەرێدا دەڕۆن، ﴿ وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا ﴾، کاتێك نەفامان دەیاندوێنن دەڵێن: سەلام، یاخود قسەی سەلامەت دەکەن.

جێی سەرنج ئەوەیە کە: خوا ﷻ بۆ پێناسە کردنی بەندەکانی خۆی پێشێ باسی بەرێدا ڕۆیشتنیان دەکات، دوایی باسی قسەو دواندنیان دەکات، ئنجا دوایی باسی شەونوێژو تاعەت و بەندایەتییان دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ

سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴾، هەروەها بەندەكانی خوای خاوەن بەزەیی، ئەوانەن كە شەوگار دەمێننەوە بۆ پەروەردگاریان بە كڕنووش بردوویی و بە وەستاویی، چونكە ﴿ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴾، كۆی (ساجد) و (قائم)ن، یانی ئەوانە شەوگار دەمێننەوە: لە حاڵێك دا كڕنووشیان بردوە و، دەمێننەوە بە وەستاویی، ئایەتەكانی خوا دەخوێنن، ئنجا ئەوە خواپەرستیی شەوێیانە، كە ڕەوشتی ڕۆژێیانی جوان كردوە، ئەوەی كە لەگەڵ خوادا ﷻ ڕاست بێ، بە تەئكید لەگەڵ خەڵكی خوادا چاك دەبێ و، لەڕاستیی دا: لەگەڵ خەڵكدا چاكبوون، بەرهەمی لەگەڵ خوادا ڕاست بوونە، كە لێرە خوا ﷻ لەگەڵ خوادا ڕاستبوونەكەیانی بەرجەستە كردوە، لە خواپەرستیی شەوێدا، كە هەم نوێژی شێوان دەگرێتەوە، هەم نوێژی خەوتنان دەگرێتەوە، هەم نوێژی بەیانی دەگرێتەوە، هەرسێكیان مەیلەو لە شەوێدان، هەروەها شەونوێژیش دەگرێتەوە، لە پێش ئەوانەدا، واتە: نەك هەر فەڕزەكان دەكەن، بەڵكو شەونوێژانیش دەكەن، ئنجا ئەوە شەونوێژو خواپەرستیی شەوێیانە، وا ڕەوشت و ئاكارو قسەو بەرو مەجلیسی ڕۆژێیانی بەو شێوەیە ڕەندو پەسند كردوون.

﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴾، هەروەها ئەوانەی دەڵێن: پەروەردگارمان! سزای دۆزەخمان لێ لابدە، چونكە سزای دۆزەخ لە كۆڵ نابێتەوەو پەیوەستە، واتە: لەگەڵ ئەوەشدا كە ئاوا خوا پەرستن و ئەهلی تاعەتن، بەڵام بوغرا نابن، لەخۆ بایی نابن، بەڵكو لەخوا دەپاڕێنەوە كە سزای دۆزەخیان لێ لابدات، ﴿ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴾، بەڕاستیی دۆزەخ خراپترین شوێنی تێدا نیشتەجێ بوونەو، خراپترین شوێنی تێدا مانەوەیە، (مُستَقَرّ يَعني: مَكانُ استِقرار)، شوێنی تێدا سەقامیربوون و نیشتەجێ بوون. (مُقام يَعني: مَكان إقامَة)، شوێنی تێدا مانەوەی كاتیی، دۆزەخ چ بەشێوەی هەمیشەیی تێیدا بمێننەوە، چ بەشێوەی كاتیی، خراپترین شوێنە.

﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴾، هەروەها بەندەكانی خوای خاوەن بەزەیی ئەوانەن: كاتێك ماڵ دەبەخشن، خەرج

دەکـەن، نـە زێدەڕۆیـی دەکـەن، نـە ڕژدیـی و چرووکیـی دەکـەن، نـە دەسـتبڵاون، نـە چنـگ قووچـاون، ﴿ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴾، لـەو نێوانـەدا میانجییانـە مامەڵـە دەکـەن، واتـە: بەخشـندەیەکی بـە سـەلیقەو تـەواون.

﴿ وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ ﴾، هەروەهـا بـە دڵنیایـی بەنـدەکانی خـوای خـاوەن بەزەیـی، ئەوانـەن کـە لەگـەڵ خـوادا لـە پەرسـتراوێکی دیکـە ناپاڕێنـەوە ﴿ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ﴾، کەسـێکیش کـە خـوا قەدەغـەی کـردوە، بکـوژرێ، مەگـەر بـە هەقـی خـۆی، ئەگەرنـا نایکـوژن، ﴿ وَلَا يَزْنُونَ ﴾، زینـاش ناکـەن، واتـە: خۆیـان لـە شـیرك دەپارێـزن، خۆیـان لە قەتـڵ دەپارێـزن، خۆیان لـە زینـا دەپارێزن، ئـەو سـێیەش، سـێ گوناهـی زۆر گـەورەن و، یەکەمیـان لەهەموویـان گەورەتـرە.

﴿ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴾، هەرکەسـێکیش ئـەوە بـکات، یەکـێ لـەو گوناهانە، یـان هەموویـان بـکا، تـووشی سـزای گوناهـو تاوانەکـەی دەبـێ، (أثـام)و (إثـم)، بـە مانـای گونـاح دێـن، کـە بـە (آثـام) کۆدەکرێنـەوە، بـەڵام لێـرەدا بـە مانـای سـزای گوناهەکەیـان دێـن.

﴿ يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾، ئـازاری لـە ڕۆژی هەڵسـانەوەدا بـۆ چەنـد قـات دەکرێتـەوە، ﴿ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا ﴾، هەروەهـا بـە ڕیسـوایی تێیـدا دەمێنێتەوە.

ئەو گوناهبارانە هەر ئەوە سزا و سەرەنجامیانەو هەموویان بەو شێوەیەن:

﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا ﴾، مەگـەر کەسـێك بگەڕێتـەوەو بڕوا بێنـێ و، کـردەوەی بـاش ئەنجـام بـدات، ﴿ فَأُولَٰئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ ﴾، ئـا ئەوانـە خـوا خراپەکانیـان بـۆ بەچاکـە دەگـۆڕێ، کـە وەك دوایـی بـاسی دەکەیـن، هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: هـەر خـودی خراپـەکان دەبـن بـە چاکـە، هەندێکیش گوتوویانـە: نـا، یـانی لەمـەودا خـوا ﷻ بەهـۆی ئیمانـەوە وایـان لێـدەکات، کـە ئەگـەر تاکـو ئێسـتا خراپەیـان کـردوە، لەمـەودا چاکـە بکـەن، ﴿ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾، بـە دڵنیایـی خـواش لێبـوردەی بـە بەزەییـە.

﴿ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴾، کەسێکیش بگەڕێتەوەو، کردەوەی باش بکات، بە دڵنیایی ئەوە گەڕانەوەکەی بەرەو لای خوایە، واتە: با قەدری بزانێ و، بزانێ شتێکی زۆر گەورەی کردوە.

﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ ﴾، بەندەکانی خوای خاوەن بەزەیی (بەندە پەسندەکانی)، ئەوانەن کە: ئامادەی گوناهو درۆ نابن، ئامادەی لادان و هەڵەو پەڵە نابن، ﴿ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغۡوِ مَرُّواْ كِرَامًا ﴾، کاتێکیش بە لای قسەی پووچ و کردەوەی پووچ دا ڕەت دەبن و گوزەر دەکەن، بەڕێزەوە گوزەر دەکەن، (كِرام) کۆی (كَريم)ە، (كَريم)، یانی: بەڕێز، بە حورمەت، حورمەتی خۆیان دەپارێزن، تێکەڵ بە خەڵکێکی نا ئەهل و ناشایستە نابن، لە قسەوکرداری پووچ و بێکەڵکیاندا ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ لَمۡ يَخِرُّواْ عَلَيۡهَا صُمّٗا وَعُمۡيَانٗا ﴾، هەروەها بەندە پەسندو هەڵبژاردەکانی خوای خاوەن بەزەیی: ئەوانەن کاتێک نیشانەکانی پەروەردگاریان دەخرێنەوە بیر، نیشانە بیندراوەکان (دیاردە سروشتییەکان، دیمەنەکان، نیعمەتەکانی خوا) و نیشانە بیستراوەکان، کە ڕستەکانی فەرمایشتی خوان، کاتێک ئەوانەیان دەخرێنەوە بیر: ﴿ لَمۡ يَخِرُّواْ عَلَيۡهَا صُمّٗا وَعُمۡيَانٗا ﴾، بە کەڕیی و کوێریی بەسەریاندا ناکەون، واتە: ئاژەڵانە مامەڵەیان لەگەڵدا ناکەن، کە ڕوویان هەر لە خوارێ بێ، جارێ سەر هەڵنەبڕن بۆ لای خوا، خوایە! ئەوانە نیشانەکانی تۆن!!

﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ ﴾، ئەوانەش کە دەڵێن: پەروەردگارمان! لە هاوسەرانمان و لە وەچەمان مایەی دڵخۆشیی و شادمانییمان پێ ببەخشە، سەرمانیان پێ بەرزبکە، دڵمانیان پێ خۆشبکە بە ژن و منداڵەکانمان، کە ئەهلی تاعەت و چاکە بن، ﴿ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴾، بۆ پارێزکارانیش بمانکە بە پێشەوا، واتە: نەك هەر پارێزکار بین، بەڵکو پێشەوای پارێزکاران بین، سەرمەشقیان بین، لە پێشەوە بین، ئنجا ئەوانەی خاوەنی ئەو پازدە سیفەتەن: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يُجۡزَوۡنَ ٱلۡغُرۡفَةَ بِمَا صَبَرُواْ ﴾، ئا ئەوانە کۆشکە

بـەرزەکانی بەهەشـتیان بـە پاداشـت دەدرێنـەوە، بەهـۆی خۆڕاگرییانەوە، ﴿ وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَٰمًا ﴾، کـە سـڵاویان لێ دەکرێ و، سـەلامیان لێ دەکرێ، ﴿ تَحِيَّةً ﴾، پێیـان دەگوتـرێ: (حَيّاكَ اللـه)، (سَلام)یش، پێیـان دەگوتـرێ: ئاشـتیی و سـەلامەتییتان لەسـەربێ، لـە لایـەن کێیـەوە لێیـان دەکـرێ؟ لـە لایـەن فریشـتەکان و لـە لایـەن خـوای پـەروەردگارەوە، ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، لەوێـدا هەرمـاو دەبـن، بـە بەردەوامیـی و هەمیشـە تێیـدا دەبـن، ﴿ حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴾، ئـا ئـەو بەهەشـتە باشـترین شـوێنی تێـدا نیشـتەجێ بـوون و، باشـترین شـوێنی تێـدا مانەوەیـە.

﴿ قُلْ مَا يَعْبَؤُا۟ بِكُمْ رَبِّى لَوْلَا دُعَآؤُكُمْ ﴾، بڵـێ: پـەروەردگارم گرنگیـی و بایەختـان پێنـادات، ئەگـەر پاڕانـەوەی خۆتـان نەبـێ، ئـەوە واتایـەکی.

یاخـود: پـەروەردگارم گرنگییتـان پێنـادات و بایەختـان پێنـادات، ئەگـەر ئـەوە نەبێ کـە بانگتـان دەکا بۆبەندایەتیـی بـۆ خـۆی، بۆیـە پێغەمبـەری کۆتایـی ﷺ نـاردوەو کتێبـی دابەزانـدوە، چونکـە بانگتـان دەکا، بـۆ خێـر و خۆشـیی خۆتـان، کـە ئەگـەر بەندایەتیـی بـۆ خـوا نەکـەن، دەبنـەوە بـە هیـچ، پـووچ دەبـن، خـوا پێیخـۆش نیـە مرۆڤـەکان پـووچ بـن، پێیخۆشـە پوخـت و چـاك و پـڕ کاکڵ و نێـوەڕۆك بـن، ﴿ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ ﴾، ئێسـتاش ئێـوە ئـەی بێبڕوایـەکان! بـە درۆتـان دانـا، ئەمـە لێـرەدا ڕوو وەرسـووڕاندن و ئاوڕدانەوەیـە لـە بێبڕوایـەکان، ئەگەرنـا خـوا ﷻ ئەوانـەی کـە لـە خوا دەپاڕێنـەوە، یـان ئەوانـەی کـە خـوا بانگیـان دەکات، تاکو لێـی بپاڕێنـەوەو بەندایەتیی بـۆ بکـەن، هەموویـان هـەر وانیـن، هەندێکیـان بـە وەفـان، کـە ئیمانداران‌ـن، بـەڵام لێـرەدا خـوا ڕوو لـە کافـرەکان دەکات، دەفەرمـوێ: ﴿ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ ﴾، ئێـوە پێغەمبەری خـواو، پەیامـی خـواو، قورئـانی خواتـان بـەدرۆ دانـا ﴿ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًۢا ﴾، لەمـەودوا سـزای ئـەو بـەدرۆ دانانـە لـە کۆڵتـان نابێتـەوەو، پێتانـەوە پەیوەسـت دەبـێ و، دەبێتـە بـاری شـانتان، خـوا پەنامـان بـدات.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**بە هێمنیی بەڕێدا ڕۆیشتن و، بەڕێزەوە دواندنی خەڵکی نەفام و، شەو نوێژ کردن و، لە خوا پاڕانەوە بۆ لادانی سزای بەردەوامی دۆزەخ، چوار لە خەسڵەتە پەسندەکانی بەندە چاکەکانی خوان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ﴿٦٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا ﴾، بەندەکانی خوای خاوەن بەزەیی، ئەوانەن کە بە ئارامیی و سەنگینیی، بە هێمنیی بەڕێدا دەڕۆن، نەك بە شڕو دڕیی، بە فیزو کەشخە، هەروەها نەك بە مردەلۆخەییش، بەڵکو بە سەنگینیی و بە ویقار و بە هێمنیی بەڕێدا دەڕۆن، ئەمە شێوەی چەند ئایەتێکە لە قورئاندا، بۆ وێنە:

أ- لە سوورەتی (لقمان)دا ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٖ ﴿١٨﴾ ﴾لقمان، واتە: بە فیزو کەشخە بە زەویدا مەڕۆ، چونکە خوا هەر لەخۆبایی بووێکی شانازییکەر (بەسەر خەڵکیدا) خۆشناوێ.

ب- هەروەها لە سوورەتی (الإسراء)یشدا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ إِنَّكَ لَن تَخۡرِقَ ٱلۡأَرۡضَ وَلَن تَبۡلُغَ ٱلۡجِبَالَ طُولٗا ﴿٣٧﴾ ﴾، واتە: بە کەیف خۆشیی و بە دڵخۆشیی

و، بە شانازیی بەخۆوە کردن بە زەویدا مەڕۆ، چونکە تۆ زەوییت بۆ نادڕێ و، هێندەی چیایانیش بەرز نابی، کەواتە: بۆچی خۆت هەڵدەکێشی؟ ئەوەتا زەوی کە مەخلووقێکی گچکەی خوایە، بۆت نادڕێ، ئەو چیایانەش کە دروستکراوی خوان، بە ئەندازەی وانیش بڵیند نابی، چونکە تۆ زۆر بچووك و نابووتی ئەی مرۆڤ! لەڕووی قەبارەوە، کەواتە: تۆ دەبێ لەڕووی نێوەڕۆکەوە، لە ڕووی رووح و مەعنەوییەوە، ئاگات لەخۆت بێ، ئەویش بەوە دەبێ کە خۆت لە ڕەوشت و خەسڵەتە خراپەکان بپارێزی و، خۆت برازێنیەوە بە ئاکارو بە سیفەتە بەرزو جوانەکان، بەوە نێوەڕۆکت پەیدادەبێ، مرۆڤیش بە نێوەڕۆك و بە رووحەکەی کە پاکیکات و چاکیبکات، ڕێزو حورمەتی پەیدا دەبێت و، بە جێنشینی خواو، بە ڕێز لێگیراو لەلای خواو، بە هەڵگری ئەمانەتی خوا، دادەنرێ.

ج- هەروەها لە فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ! عَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ، فَإِنَّ الْبِرَّ لَيْسَ بِالإِيضَاعِ} (أخرجه أحمد: ٢١٨٠٤، والبخاري: ١٥٨٧، والنسائي في الكبرى: ٤٠١٤)، واتە: ئەی خەڵکینە! هێمن بن، چونکە چاکەکاریی لە زۆر خێرا ڕۆیشتندا نیە.

لــە ســووڕەتی (التوبــة)دا دەفەرمــوێ: ﴿... وَلَأَوْضَعُوا۟ خِلَـٰلَكُمْ ... ﴿٤٧﴾﴾، (أَوضَعُـوا) یـانی: وڵاخەکەیـان تیـژ لێدەخـوڕی، کەلێـرەدا مەبەسـت تەنیـا وڵاخ نیـە، هـەر ئامرازێـکی دیکـەش دەگرێتـەوە، یاخـود ئەگـەر بەپێـش بـڕوا، یـانی: چاکەکاریـی لـەوەدا نیـە کـە ئینسـان زۆر پەلەپـەل بـکات و خێـرا بـڕوات.

ئنجـا خـوا ﷻ بـە وەسـفکردنی چۆنیەتیـی ڕۆیشـتن دەسـتی پێکـردوە، پاشـان قسـە کـردن، تاکـو بزانـرێ کـە ڕەوشـت و ئـاکار سـەنگی مەحەکـە، ناميلکەیەکیشـم هەیـە بەنـاوی: {ڕوشـت و ئـاکاری پەسـند سـەنگی مەحـەکی مسـوڵمانەتییە}.

٢)- ﴿وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَـٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَـٰمًا﴾، هەروەها کاتێك نەفامان دەیاندوێنن، قسەی سەلامەت دەکەن، ئەمە سێ واتایان بۆ لێکداونەوە:

أ- ﴿قَالُوا۟ سَلَـٰمًا﴾، یانی: ئەو بێژەیە دەڵێن: (سَلامٌ عَلَيكُم)، سەلامتان لێ بێ، خوا حافیزتان بێ، ئێمە لەگەڵ ئێوە هاوکوف نین، بڕۆن خواتان لەگەڵ.

ب- یاخود: ﴿ قَالُواْ سَلَٰمًا ﴾، یانی: (قالُوا سَدَاداً، قَولاً ذَا سَلاَمَةٍ)، قسەی باش و ڕێك و پێکیان لەگەڵدا دەکەن، قسەی نەفامانە، لەگەڵ نەفامانیشدا ناکەن.

ج- یاخود: (سَلاَمَاً أَي: تَسَلُّمَاً مِنْكَ، أَي: بَرَاءَةً مِنْكَ)، واتە: سەلام، من لەگەڵ تۆدا نایەمە نێو تەرازوویەوە، بڕۆ خواحافیزت بێ.

٣)- ﴿ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴾، هەروەها ئەوانەی کە بۆ پەروەردگاریان کڕنووش بردووانەو، وەستاوانە شەوگار بەسەر دەبەن، (بَاتَ، يَبِيتُ: أَدرَكَهُ اللَّيْلُ، نَامَ أَو لَمْ يَنَم)، (بَاتَ، يَبِيتُ)، واتە: شەوی بەسەردا هات، ئنجا چ بنوێ، چ نەنوێ، کەواتە: ﴿ يَبِيتُونَ ﴾، یانی: شەوگار دەمێننەوە، لە خزمەت پەروەردگاریاندا، بە کڕنووش بردوویی و بە وەستاویی، (سُجَّدَ: جَمْعُ سَاجِدٍ، وَقِيَام: جَمْعُ قَائِمٍ)، واتە: کڕنووش بردووانەو وەستاوانە.

کەواتە: ئەوە عیبادەتی شەوییانە، ڕەوشتی ڕۆژێیانی جوان کردوون و، ئەوە ڕاستییانە لەگەڵ خوادا، کە چاکیی لەگەڵ خەڵکی خوای تێدا پەیدا کردوون.

٤)- ﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ ﴾، هەروەها ئەوانەی دەڵێن: پەروەردگارمان! ئازاری دۆزەخمان لێ لابدە.

٥)- ﴿ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴾، بە دڵنیایی ئازارو سزای دۆزەخ پەیوەست و بەردەوامە، (غَرَامَاً: أَي لازِمَاً غَيْرَ مُفَارِقٍ)، پەیوەستە، بەردەوامە، لە کۆڵ نابێتەوە، جیانابێتەوە.

٦)- ﴿ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴾، بە دڵنیایی دۆزەخ خراپترین شوێنی تێدا نیشتەجێ بوونەو، خراپترین شوێنی تێدا مانەوەشە، (أَي: بِئْسَ الْمُسْتَقَرُّ وَبِئْسَ المُقَامَ)، ئایا بۆچی هەردوو وشەکەی بەکارهێناون؟ ﴿ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴾، چونکە: نیشتەجێ بوونەکە، یەکجارییەو، مانەوەکە کاتییە، لەبەر ئەوەی دۆزەخ بۆ بێبڕوایانی خراپەکار دەبێتە شوێنی نیشتەجێ بوون، بە شێوەیەکی یەکجارەکیی، بەڵام بۆ بڕوادارانی گوناهکار دەبێتە شوێنی تێدا مانەوەی کاتیی.

بەشێك لە زانایانیش (مستقر) یان بۆ کاتیی (مؤقت) و (مقام) یان بۆ هەمیشەیی داناوە.

یاخود دۆزەخ کەمی تێدابێ، یان زۆری تێدابێ، خراپترین شوێنە، ئەوەیانم نەبینیوە لە تەفسیرەکاندا باسکرابێ، کە ئەوەش پێم وایە مانایەکی زۆر ڕێکە، واتە: دۆزەخ ئەگەر کەمی تێدا بمێنیەوە، بە شێوەیەکی کاتیی، یاخود بەهەمیشەیی تێیدا بێ، هەر خراپترین شوێنە، بەڵام ئەگەر بە هەمیشەیی تێیدابێ، خراپترو ناڕەحەتییەکە زیاترە.

جێی سەرنج ئەوەیە: دوای ئەوەی خوا باسی شەونوێژو، عیبادەت و، تاعەت و، باسی ڕەوشت و ئاکاری بەرزو جوانیان دەکات، ئنجا باسی سیفەتی چوارەمیان دەکات کە ئەوەیە دەڵێن: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ ﴾، هەروەها (بەندە پەسندەکانی خوا) ئەوانەن دەڵێن: پەروەردگارمان! ئازاری دۆزەخمان لێ لابدە... واتە: بە شەونوێژەکەیان بوغرا نەبوون و لە خۆبایی نەبوون، بڵێن: لە هەموو ئاوان پەڕیونەوە!! ئنجا ئەمە وەك ئەو ئایەتە وایە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلصَّـٰبِرِينَ وَٱلصَّـٰدِقِينَ وَٱلۡقَـٰنِتِينَ وَٱلۡمُنفِقِينَ وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ ﴿١٧﴾ ﴾آل عمران، واتە: خۆڕاگران و ڕاستان و ملکەچان (بۆ خوا)و ماڵبەخشەران و، ئەوانەی کە پێش بەیان داوای لێبوردن (لە خوا) دەکەن، شەونوێژو تاعەتیان کردوە، تاکو لای بەرەبەیان، ئنجا پێش ئەوەی سپێدە بدات، داوای لێبوردن لە خوا دەکەن، وەك شەوگاریان هەموو بە گوناح بردبێتە سەر! نەك وەك هەندێ کەس بە دوو ڕکات نوێژ، پێی وایە لە هەموو ئاوان پەڕیوەتەوە، لەگەڵ تاعەت و عیبادەتێکی زیادەی بوو، هەوایەکی دەچێتە کەللەوە، پێی وایە زۆر لەخەڵکی دیکە جیایە، یان کە ڕیشێکی هێشتەوە، یان کە کردەوەیەکی ئەنجامدا، لەخۆڕا ئیددیعای گەورە گەورە دەکات! کە بەدڵنیایی ئەو خۆ پێ زۆر بوون و خۆ پێ چاك بوون و، خەڵك پێ کەم بوونە، نیشانەی ئەوەیە کە عیبادەکەی بەکەڵك نەهاتوە، عیبادەت ئەگەر بە کەڵك بێ و جێ بگرێ، ڕەوشت و ئاکاری مرۆڤ و ناخی مرۆڤ جوان دەکات.

هەندێك لەوانەی ئیددیعای شوێنکەوتنی پێشینی چاك و، پابەندیی بە قورئان و سوننەتەوە بوون، دەکەن، سەرنجیان دەدەی: هەوایەکیان لە کەللە دایە، بۆ وێنە دەڵێن: فڵانکەس و فڵانکەس نابێ سەلامیان لێ بکرێ، یان نابێ بدوێنرێن، یان هاموشۆیان بکرێ! یانی: من هێندە چاکم، شایستەی ئەوە نیم سەلام لەو فڵانکەسانە بکەم، ئەوانیش هێندە خراپن، شایستەی سڵاو لێکران نین! بەڵام نەتۆ هێندە چاکی، نە خەڵك هێندە خراپە، تۆزێ وەرە خوار!

هاوەڵان خوا لێیان ڕازیبێ خوا ئاوا مەدحیان دەکات، ئیمانداره چاکەکان خوا، ئاوا مەدحیان دەکات، کە چی هی وا هەیە بە مستە ئاوێك دەکەوێتە مەلە، بەڵام لەخۆبایی بوون و لە کەوڵی خۆ دەرچوون بەهۆی تاعەتەوە، نیشانەی ئەوەیە کە تاعەتەکەی بەکەڵك نەهاتوە، خواپەرستیی ئەگەربە کەڵك بێ و کاکڵدارو پەسند بێ، ئینسان نەرم و ئارام و هێمن دەکات، ئینسان خاکیی دەکات، ئینسان والێدەکات خۆی پێ لەکەس زیاد نەبێ، بگرە هەمیشە خەڵکی پێ لەخۆی چاکتر بێ، نەك پێی وابێ خەڵك بە کەڵکی ئەوە نایەن سەلامیان لێبکات، سەردان و هاموشۆیان بکات، یانی: ئەو هێندە چاکەو خەڵك هێندە خراپە! کە ئەوە درۆیە، بەڵام ئەگەر ڕاست بکات، ئەوجار مادام ئەو هێندە چاکە، دەبێ بچێ بۆلای خەڵك، کێ وەك پێغەمبەران (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) چاك بووە؟ کەچی تەماشا دەکەی چەند نەرم و حەلیم و هێدیی و مەند و ئارام بوون، چەند ڕەوشت جوان بوون لەگەڵ خەڵك دا، چەند دڵسۆز و بە پەرۆش بوون!

کەواتە: با بزانرێ ئەوانەی کە بە تاعەت و، بە زانیاریی شەرعیی و، بە هەندێك ڕواڵەتی دینداریی و ڕیش هێشتنەوەو دەلینگ کورتکردنەوەو، ئەو شتە جوزئییانە، لەخۆبایی دەبن، با بزاندرێ کە ئەوە هەمووی پێچەوانەی ئەو سیفەتانەیە، کە خوا بەندە چاکەکانی خۆییان پێ وەسف دەکات، ئیمانداران ئەوانەن کە بە تاعەت بوغرا نابن، هەتا خوا زیاتر یارمەتییانبدات تاعەت بکەن، ئنجا زیاتر خۆیان بە قەرزاری خوا دەزانن و، سەرەنجامیش لەگەڵ خەڵکدا نەرم و نیانتر و هێمن و هێدیی و مەندتر دەبن.

**مەسەلەی دووەم:**

**بەنــدە هەڵبــژاردەکانی خــوا نــە دەســتبڵاون، نــە چەنــگ نووقــاون، بەڵکــو بەخشــندەی بــە ســەلیقەو تێــرو تــەواون:**

**ئەمەش باسی سیفەتی پێنجەمیانە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا ﴾، هەروەها ئەوانەی کاتێك ماڵی خۆیان دەبەخشن، خەرج دەکەن، کەواتە: ماڵ بەخشین و ماڵ خەرج کردن، سیفەتێکی بنەڕەتیی بەندە بۆ خوا صوڵحاو و پەسندەکانی خوایە، نەك چاو لە دەستی خەڵك بن، چونکە پێغەمبەر دەفەرموێ: ﷺ {اليَدُ العُلْيَا خَيرٌ مِنَ اليَدِ السُّفْلَى} **(أخرجه أحمد: ١٥٦١٦، والبخاري:١٣٦١، مسلم: ١٠٣٣، وغيرهم)**، واتە: دەستی بەرز لە دەستی نزم چاکترە.

دەســتی بــەرز دەســتی بەخشــەرەو، دەســتی نزمیــش دەســتی وەرگــرە، بەنــدە چاکــەکانی خــوا دەســتی بەخشــەرن، دەســتی بــەرزن، کەســابەت دەکــەن، خۆیــان مانــدوو دەکــەن، بژیــو پەیــدا دەکــەن، تەمبــەڵ تەمبــەڵ دانانیشــن، چاویــان لــە دەســتی خەڵــك نیــە، بۆیــە دەتوانــن ببەخشــن، ئەوانــەی کــە کاتــێ ماڵــی خۆیــان بەخــشی.

٢)- ﴿ لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا ﴾، نە زێدەڕۆیی دەکەن، نە ڕژدیی و چرووکیی دەکەن، **(الإِسْرَافُ: تَجَاوزُ الحَدّ)**، (إسراف) واتە: لە سنوور دەرچوون، **(وَالإِقتارُ: الإِجْحَافُ وَالنَّقصُ عَمّا يَقتَضِيهِ الحَال)**، (إقتار)یش، بریتیە: لە کەمکردنەوەو تەنگکردنەوە لەوەی حاڵەکە بیخوازێ.

٣)- ﴿ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴾، شێوەی ماڵ سەرف كردنیان لەو نێوانەدا میانجییە، ﴿ وَكَانَ ﴾، دەچێتەوە بۆ (إنفاق)، ماڵ سەرف كردنەكەیان ﴿ بَيْنَ ذَٰلِكَ ﴾، لەو بەینەدا ﴿ قَوَامًا ﴾، (قَوام: العَدْلُ وَالقَصْدُ بَيْنَ الطَّرَفَيْنِ)، (قَوام) دادگەریی و میانجییە لەنێوان دوو لای تێپەڕێنەردا، كەواتە: بەندە پەسندەكانی خوا، تەنیا شەونوێژ نازانن، بەڵكو كاسبیی و بژێو پەیدا كردنیش دەزانن، بژێوی حەڵاڵ و زەڵاڵ.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ئەو بەندانەی خوای بەبەزەیی، جگە لە خوا لە کەس ناپاڕێنەوەو، خۆشیان لە قەتڵ و زینا دەپارێزن و، ئەگەر تووشی گوناهیش بوون، دەگەڕێنەوە بۆ لای خواو، بە ئیمان و کردەوەی باش قەرەبووی دەکەنەوەو، کردەوە خراپەکانیان دەگۆڕن بە کردەوەی چاك:**

ئەمانەش سیفەتەکانی: شەش و حەوت و هەشت و نۆ و دە (٦ - ١٠)ن:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَٰئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ ۗ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَإِنَّهُ يَتُوبُ إِلَى اللَّهِ مَتَابًا ﴿٧١﴾ ﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ ﴾، بەندە پەسندەکانی خوای خاوەن بەزەیی، ئەوانەن کە لەگەڵ خوادا لە پەرستراوێکی دیکەدا ناپاڕێنەوە.**

**٢)- ﴿ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ﴾، ئەو مرۆڤەی خوا قەدەغەی کردوە، بکوژرێ، نایکوژن، مەگەر بە هەق، ئەمە واپێدەچێ زەمینە سازییەك بێ بۆ جەنگ و کوشتار کە لە دوایی دا فەرز دەکرێ، واتە: ئەگەر بە هەقی خۆی بێ، شێری چەنگ بە خوێنن، بەڵام بە ناهەق دەست بۆ کەس درێژ ناکەن.**

**٣)- ﴿ وَلَا يَزْنُونَ ﴾، هەروەها داوێن پیسیی ناکەن، لێرەدا بە نسبەت قەتڵ و زیناوە نەوانە (الَّذِينَ)ی دووبارە نەکردۆتەوە، (إسم الموصول)ی دووبارە نەکردۆتەوە، چونکە ئەم سێیە زۆر پێکەوە پەیوەستن، ئەوەی کە هاوبەش بۆ خوا دابنێ و کافر بێ، بە زۆریی**

وایە قەتڵیش دەکات و، زیناش دەکات، کەسێکیش ئەهلی تەوحید بێ، خۆی لە قەتڵ و زیناش دەپارێزێ.

٤)- ﴿ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامٗا ﴾، هەر کەسێکیش ئەوە بکات، تووشی گوناح دێ، (أَثَام: عَلى زنةِ الوَبال وَالنَّكال، يَعني: جزاء الإثم)، (أثام) یانی: گوناح، بەڵام بە تەئکید لێرەدا مەبەست پێی سزای گوناهە، واتە: تووشی سزای گوناهەکەی دێ.

٥)- ﴿ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، سزای بۆ چەند بەرانبەر دەکرێتەوە.

٦)- ﴿ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ﴾، بە ڕیسوایی و زەبوونیی و شەرمەزاریی، هەرماو دەبێ لە دۆزەخدا.

کە دەفەرموێ: ﴿ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ ﴾، سزاو ئازاری بۆ چەند بارە دەکرێتەوە، مەبەست ئەوەیە کە لەسەر هەر گوناهێك سزا دەدرێ، ئنجا گوناهەکانیش زۆرن کەواتە: سزایەکەش کەڵەکە دەبێتەوە، زانایان هەندێك قسەی دیکەشیان لەوبارەوە کردوون، بەڵام ئەوەی گومان لە هەموویان چاکترە، واتە: دوو قات و چەند قات بوونەوەی سزایەکە، چونکە خوا لە جێی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ جَزَآءٗ وِفَاقًا ﴿٢٦﴾ ﴾النبأ، واتە: سزای پڕ بە پێست، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَا ... ﴿٤٠﴾ ﴾الشورى، سزای خراپەیەك، خراپەیەکی وەك خۆیەتی، بەڵام لێرەدا کە دەفەرموێ: بۆیان دووقات یان چەند قات دەکرێتەوە، یانی: با وانەزانرێ کە لەبەرامبەر هەموو ئەو گوناهانەدا سزایەك دەدرێن، بەڵکو هەر گوناهێك سزای پڕ بە پێستی خۆی هەیە.

٧)- ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلٗا صَٰلِحٗا ﴾، مەگەر کەسێك بگەڕێتەوەو، بڕوا بێنێ و، کردەوەی باش ئەنجام بدات، کەسێك بگەڕێتەوەو کردەوەی باش ئەنجام بدا، نە سزای بۆ چەند بەرانبەر دەکرێتەوەو، نە بە ڕیسواییش لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە، هەڵبەتە کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ﴾، یانی: هەم سزاش دەدرێ، هەم ڕیسواش دەکرێ،

ئنجا ڕیسوا بوونەکە بۆ ڕووحە، کە سزایەکی مەعنەوییە، ئازارو سزایەکەش بۆ جەستەیە، واتە: هەم ڕووح و هەم جەستەیان، سزا دەدرێن، ئنجا دەفەرموێ: ئەوەی بگەڕێتەوەو بڕوا بێنێ و کردەوەی باش بکات:

٨)- ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖ﴾، ئا ئەوانە خوا خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێ بە چاکە، ئەم ڕستەیە زانایان - وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا - دوو واتایان بۆ لێکداونەوە:

أ- ئەوە کە خودی کردەوە خراپەکان ببنە چاکە، هەتا لە هێندێك ڕیوایەتاندا هاتوە: کاتێك لە قیامەت دا بابای خراپەکار دەبینێ، خراپەکانی بوون بە چاکە، خۆزگە دەخوازێ زیاتری خراپە کردبان! کە من ئەوەم تۆزێك پێ سەیرەو (الطَّبَرِي)یش ئەو ڕایەی ڕەفز کردوە، دەڵێ: (ذَٰلِكَ مَا لاَ يَقُولُهُ ذُو حِجًا)، ئەم قسەیە هیچ خاوەن عەقڵێك نایکات، کە خودی خراپەکان ببنە چاکە، دەڵێ: چونکە خراپەکان ئازە کراون: قەتڵەو زینایەو شیرکەو، دزییەو خراپەیە، چۆن دەبێ بە چاکە؟ خراپە دەبێ مرۆڤ خوا خوای بێ لێی بسرێتەوە، لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەریشدا ﷺ هەر ئەوەندە هاتوە، بۆ وێنە دەفەرموێ: {الإِسْلاَمَ يَجُبُّ مَا كَانَ قَبْلَهُ} (أخرجه أحمد: ١٧٨١٢، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن)، واتە: ئیسلام پێش خۆی دەسرێتەوە.

گەڕانەوەش بۆ لای خوا، پێش خۆی دەسرێتەوەو خاوێنی دەکاتەوە.

ب- مانای دووەم کە تەبەریی هەڵیبژاردوە، ئەوەیە کە لەمەودوا، ئەگەر تاکو ئێستا خراپەیان کردوە، بەهۆی ئەوەوە کە کوفرو شیرکیان لە دڵدا بووە، (گۆزە چی تێدابێ ئەوەی لێ دەڕژێ)، کەسێك کوفرو شیرك، لە عەقڵ و دڵیدا بێ، بە ئەندامەکانیشی ئاوان و خراپە دەکات، بەڵام لەمەودوا کە تەنیا خواپەرستیی و بەندایەتیی بۆ خوا دەچێتە عەقڵ و دڵیانەوە، ئەو درەختە پڕ پیت و پێزە، دیارە میوەی وەك خۆی دەردەکات و، لەمەودوا خراپەکانیان دەگۆڕێن بۆ چاکە، خوا خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێ بە چاکە، واتە: لەمەودوا وایان لێدەکات لە جیاتی خراپە چاکە بکەن، هەڵبەتە ڕایەکەی یەکەمیش، لە کەرەم و بەخشندەیی خوا، هەموو شتێکی چاك دەوەشێتەوە، بۆیە پێم وایە ئەگەر هەردووك مانایەکان پێکەوە کۆبکرێنەوەو، بگوترێ: خوی بەبەزەیی:

١- وایان لێ دەکات لەمەودوا لەجیاتی خراپە چاکە بکەن.

٢- هەروەها خراپەکانیان لی لادەبات و لە جێی وان بۆیان دەگۆڕێ بەچاکە، لەوبارەشەوە هەندێك دەقی سوننەت هەن بۆ نموونە: [(عن عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ قَالَ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةَ الْعَقَبَةِ الْأُولَى عَلَى أَنْ لَا نُشْرِكَ بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلَا نَسْرِقَ وَلَا نَزْنِيَ وَلَا نَقْتُلَ أَوْلَادَنَا ، وَلَا نَأْتِيَ بِبُهْتَانٍ نَفْتَرِيهِ مِنْ بَيْنِ أَيْدِينَا وَأَرْجُلِنَا ، وَلَا نَعْصِيَهُ فِي مَعْرُوفٍ فَإِنْ وَفَيْتُمْ فَلَكُمْ الْجَنَّةُ وَإِنْ غَشِيتُمْ مِنْ ذَلِكَ فَأُخِذْتُمْ بِحَدِّهِ فِي الدُّنْيَا، فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ وَإِنْ سُتِرْتُمْ عَلَيْهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ فَأَمْرُكُمْ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ إِنْ شَاءَ عَذَّبَ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ).

[عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم: (إِنِّي لَأَعْلَمُ آخِرَ أَهْلِ الْجَنَّةِ دُخُولاً الْجَنَّةَ، وَآخِرَ أَهْلِ النَّارِ خُرُوجًا مِنْهَا، رَجُلٌ يُؤْتَى بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُقَالُ: اعْرِضُوا عَلَيْهِ صِغَارَ ذُنُوبِهِ وَارْفَعُوا عَنْهُ كِبَارَهَا، فَتُعْرَضُ عَلَيْهِ صِغَارُ ذُنُوبِهِ، فَيُقَالُ: عَمِلْتَ يَوْمَ كَذَا وَكَذَا كَذَا وَكَذَا، وَعَمِلْتَ يَوْمَ كَذَا وَكَذَا كَذَا وَكَذَا، فَيَقُولُ: نَعَمْ. لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يُنْكِرَ، وَهُوَ مُشْفِقٌ مِنْ كِبَارِ ذُنُوبِهِ أَنْ تُعْرَضَ عَلَيْهِ. فَيُقَالُ لَهُ: فَإِنَّ لَكَ مَكَانَ كُلِّ سَيِّئَةٍ حَسَنَةً، فَيَقُولُ: رَبِّ قَدْ عَمِلْتُ أَشْيَاءَ لاَ أَرَاهَا هَا هُنَا). فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ] أخرجه أحمد: ٢١٤٣٠، ومسلم: ١٩٠، والترمذي: ٢٥٩٦، وقال: حسن صحيح، وابن حبان: ٧٣٧٥.

٩)- ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بە بەزەییە، لێبوردەیە گوناهەکەیان دەبوورێ، بەبەزەییشە کە لەمەودوا یارمەتییان دەدا، چاکە بکەن، خراپەکەیان لەکۆڵ دەکاتەوەو، چاکەشیان بە قسمەت دەکات.

١٠)- ﴿ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴾، هەر کەسێك بگەڕێتەوەو کردەوەی باش بکات، بە دڵنیایی گەڕانەوەکەی بۆ لای خوایە، واتە: ئەم گەڕانەوەیە شایستەی ئەوەیە پێی بگوترێ: گەڕانەوە، (مَتاب)یش چاوگی میمییە، بە مانای گەڕانەوە دێ، واتە: با قەدری بزانێ کە بۆ لای کێ گەڕاوەتەوە؟!

**مەسەلەی چوارەم:**

**بەندە پەسەندەکانی خوا، ئامادەی گوناهو لادان نابن و، بەڕێزەوەش بەلای قسەو کردەوەی پووچدا ڕادەبرن و، بە گوێ و چاوی کراوەشەوە لەگەڵ نیشانە بینراوو بیستراوەکانی خوادا مامەڵە دەکەن، نەک کوێرانەو کەڕانە:**

ئەمانەش سیفەتەکانی: یازدەو دوازدەو سێزدە (١١ - ١٣)ن:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغْوِ مَرُّواْ كِرَامًا ﴿٧٢﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّواْ عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴿٧٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ ﴾، هەروەها بەندە هەڵبژاردەو پەسەندەکانی خوای خاوەن بەزەیی ئەوانەن: کە ئامادەی درۆ و ناهەق نابن، (زور) بە مانای درۆ دێ و، بە مانای گوناح دێ و، بە مانای لادان دێ و، بە مانای خراپەش دێ، (أَي: لا يَحضُرُونَ مَحَاضِرَ البَاطِل)، ئامادە نابن لە کۆڕو مەجلیسی باتیڵ و خراپەو گوناهو لادان و درۆ دا، ئامادەی ئەو جۆرە کارانە نابن، ئامادەی ئەو جۆرە کۆڕ و مەجلیسانە نابن.

ئنجا نەک هەر ئەوەندەش:

٢)- ﴿ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغْوِ مَرُّواْ كِرَامًا ﴾، تەنانەت ئەگەر بەلای قسەو کرداری پووچیشدا تێپەڕین، بەڕێزەوە تێدەپەڕن، واتە: نەک هەر ئامادەی گوناهو درۆو تاوان و لادان نابن، بەڵکو خۆیان لە پووچیش دەپارێزێ، (لغو) واتە: کردار یان قسەی پووچ، کە سوودی نەبێ و بێ کەڵک بێ، ئەوانەی لە قسەو کردار، کە پێویستە وازیان لێ بهێنرێ و پشتگوێ بخرێن، لەو جۆرە کارانەدا بەشدار نابن.

لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێم: کە هەندێک لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: (لغو) واتە: شیرك و گوناهو تاوان و، هەموو ئەو شتانەی پێچەوانەی شەریعەتن!

بەڵام بێگومان ئەوە ڕاست نیەو هەڵەیە، (القُرطبي) ڕایەکی وای هێناوەو پێشتر لە تەفسیری سوورەتی (المؤمنون)یش دا باسم کرد، بەڵام ئەوە ڕاست نیە، چونکە خوا (لغو)ی لە شوێنی خۆیدا هێناوەو، (زُور)ی لە شوێنی خۆیدا هێناوەو (قَتْل) و (زینا) و (شرك)ی لە شوێنی خۆیان داو، بە ماناو چەمکی تایبەتیی خۆیان، هێناون، واتە: (لغو) وشەیەکی تایبەتەو لە (لَغَى)ەوە هاتوە، (اللَّغَى: صَوْتُ العَصافِيرِ)، دەنگی پاساریی، دەنگی چۆلەکان، کە سوودێکی نیە بۆ ئێمە، ئەو جریوە جریوە، کەواتە: (لغو) یانی: قسەی پووچ و کرداری پووچ، بۆیە خوا دەفەرموێ: بەڕێزەوە ڕادەبرن و خۆیان تێکەڵ بە قسەو کرداری پووچ ناکەن، لەوبارەوە ئەم فەرمایشتە هەیە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: [مَا مِنْ قَوْمٍ يَقُومُونَ مِنْ مَجْلِسٍ لاَ يَذْكُرُونَ اللَّـهَ فِيهِ إِلاَّ قَامُوا عَنْ مِثْلِ جِيفَةِ حِمَارٍ وَكَانَ لَهُمْ حَسْرَةً] (أخرجه أبو داود: ٤٨٥٥، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَصَحَّحَهُ الألباني)، واتە: هیچ کۆمەڵە خەڵکێك لە کۆڕو مەجلیسێك هەڵناستن، کە یادی خوای تێدا نەکرابێ، مەگەر کاتێك هەڵدەستن، وەك لەسەر کەلاکی تۆپیوی کەرێك هەڵسابن و، بۆیان دەبێتە مایەی پەشێمانیی و خەفەت.

٣)- ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ لَمۡ يَخِرُّواْ عَلَيۡهَا صُمّٗا وَعُمۡيَانٗا ﴾، هەروەها ئەوانەی کاتێك نیشانەکانی پەروەردگار دەخرێنەوە بیریان، کەڕانەو کوێرانە بەسەریاندا ناکەون، ﴿ لَمۡ يَخِرُّواْ ﴾، (لَم يَسقطوا)، ناکەون، (استُعِيرَ الخُرُورُ: السقُوطُ، لِحالِ الكَراهِيَّةِ وَالتَّباعُدِ كَالَّذِي يَخِرُّ إِلى الأَرضِ كَي لا يَرى ما يَكْرَهُ)، لێرەدا وشەی (خُرُور)، کە بە مانای لەپەوڕوو کەوتنە، خوازراوەتەوە بۆ حاڵەتی پێناخۆش بوون و خۆ دوور گرتن، وەك کەسێك کە لەپەوڕوو بە زەویدا دەکەوێ، بۆ ئەوەی ئەو شتەی پێی ناخۆشەو حەزی لێناکات، نەیبینێ.

لێرەدا با ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر بێنین ﷺ کە هەر پەیوەندیی بەوەی پێشەوە هەیە: ﴿ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغۡوِ مَرُّواْ كِرَامٗا ﴾، پێغەمبەر ﷺدەفەرموێ: [ إِنَّ اللَّـهَ تَعَالَى يُحِبُّ مَعَالِيَ الأُمُورِ وَيَكْرَهُ سَفْسَافَهَا] (أخرجه الطَّبَرَانِي فِي الكَبِيرِ: ٢٨٩٤

عَـن حُسَـيْنِ بـنِ عَـلي رَضِيَ اللـهُ عَنهُـما، وصحَّحـه الألبـاني في «الصحيحـة»: ١٦٢٧}، واتـە: بـە دڵنيايـى خـوا حـەز لـە كارە بـەرزەكان دەكات و، ڕقـى لـە كارە نـزم و پەسـتەكان دەبێتـەوە.

﴿لَمْ يَخِرُّواْ عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا﴾، (صُـمّ) كـۆى (أَصَـمّ)ە، و (عُميـان) كـۆى (أعمى)يـە، واتـە: كەڕانـەو كوێرانـە لەگـەڵ نيشـانەكانى پەروەردگاريانـدا مامەڵـە ناكـەن، كـە دەخرێنـەوە بيريـان، نيشـانەكانى پەروەردگاريـان: أ- ديـاردەو ديمەنـە سروشـتييەكانن كـە دەبينرێـن، ب- ڕسـتەكانى قورئانـن كـە دەبيسـترێن، ئنجـا بـەرەو ديـاردە سروشـتييەكان، عەقـڵ و چاويـان دەكەنـەوەو، بـەرەو فەرمايشـتەكەى خـواش، گـوێ و عەقڵيـان دەكەنـەوە بـۆ ئـەوەى چـاك لێـى تێبگـەن.

(الزمخـشري) لـە (الكَشّـاف)دا دەڵـێ: (فَالْمَعْنَـى: لَـمْ يَخِـرُّوا عَلَيْهَـا فِي حَالَـةٍ كَالصُّمِّ وَالْعَمَـى، وَلَكِنَّهُـمْ يَخِـرُّونَ عَلَيْهَـا سَـامِعِينَ مُبْصِرِيـنَ، فَيَكُـونُ الْخُـرُورُ مُسْـتَعَارًا لِلْحِـرْصِ عَـلَى الْعَمَـلِ بِـشَرَائِعِ الْقَلْـبِ، كَمَا يُقَـالُ: أَكَـبَّ عَـلَى كَـذَا).

واتـە: كـە دەفەرمـوێ: ﴿لَمْ يَخِرُّواْ عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا﴾، يـانى: بـە حاڵەتێـكى وەك كەڕيـى و كوێريـى مامەڵەيـان لەگـەڵ دا ناكـەن (لەگـەڵ نيشـانەكانى خـوادا) بەڵكـو بەسـەرياندا دەكـەون، بـە بيسـتن و ديتنـەوە، لێـرەدا وشـەى (خُـرُور) {واتـە: (سُـقُوط): كەوتـن} خوازراوەتـەوە بـۆ ئـەوە كـە ئينسـان سـوور بـێ لەسـەر شـتێك بـە دڵ و گيـان لـە قووڵايـى ناخيـەوە.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**بەندە پەسندەکانی خوا لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە کە ژن و منداڵەکانیان وابن، مایەی شادمانیی و سەربەرزیان بن و، بشبنە پێشەوا بۆ پارێزکاران:**

ئەمیش هەردووک خەسڵەتی کۆتایی: چواردەو پازدە (١٤ - ١٥)ن:

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ ﴾، هەروەها بەندەکانی خوای خاوەن بەزەیی ئەوانەن کە دەپاڕێنەوە، دەڵێن: پەروەردگارمان! لە ژنەکانمان و لە وەچەکانمان مایەی دڵخۆشییمان پێ ببەخشەو، بۆ پارێزکارانیش بمانگێڕە بە پێشەوا.

﴿ قُرَّةَ أَعْيُنٍ ﴾، پێشتریش باسمانکرد (قُرّ) یانی: (بَرد)، سارد، پێچەوانەی (حَرّ)ە، گەرم لەبەر ئەوەی فرمێسکی شادیی فێنکەو ساردە، یانی: چاوانێك کە فرمێسکی شادییان پێدا بێ، فرمێسکی سارد، مانای وایە خاوەنەکەیان دڵخۆشە، یانی: خوایە مایەی دڵخۆشییمان لە ژنەکانماندا، لە وەچەکانماندا پێ ببخشە، کە وابن پێیان سەر بەرزو دڵخۆش بین، نەك بۆمان ببنە مایەی خەفەت و شەرمەزاریی و عەیبداریی.

٢)- ﴿ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴾، بشمانکە بە پێشەوا بۆ پارێزکاران، واتە: نەك هەر پارێزکار بین، بەڵکو پێشەوای پارێزکاران بین، دوای ئەوەی بۆ ژن و منداڵیان دەپاڕێنەوە ئنجا دەڵێن: بمانکە بە پێشەوا بۆ پارێزکاران، چونکە کەسێك پێشێ نێو ماڵی خۆی چاك نەکات و، نیزیکەکانی خۆی چاك نەکات، زەحمەتە خەڵکی دیکەی دوورتر بە قسەی بکات و، چاوی لێبکات و، بیکاتە سەر مەشق.

**مەسەلەی شەشەم:**

**بەندە پەسندەکانی خوا کۆشکە بڵندەکانی بەهەشتیان بە پاداشت دەدرێنێ و، سڵاویان لێ دەکرێ و، سەلامیان لێ دەکرێ، لەو باشترین نشینگەو جێگەو ڕێگەیەدا هەرماو دەبن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يُجۡزَوۡنَ ٱلۡغُرۡفَةَ بِمَا صَبَرُواْ وَيُلَقَّوۡنَ فِيهَا تَحِيَّةٗ وَسَلَٰمًا ﴿٧٥﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ حَسُنَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ﴿٧٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:**

١)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يُجۡزَوۡنَ ٱلۡغُرۡفَةَ بِمَا صَبَرُواْ ﴾، بەندە هەڵبژاردەکانی خوا کە خاوەنی ئەو سیفەتانەن، ئەو (١٥) سیفەتەن: ئەوانە کۆشکە بەرزەکانی بەهەشتیان بە پاداشت دەدرێنێ، بەهۆی ئەوەوە کە خۆیان ڕاگرت، (**الغُرفَةُ: البَيْتُ المُعتَلي يُصْعَدُ إلَيها بِدَرَجٍ**)، (**غُرفَةُ**) بریتیە لەو قاتە بەرزەی کە بە پەیژە بۆی سەر دەکەون، لێرەدا وشەی: (**غُرفَةُ**) مادام (**أل**)ی ناساندن (**تعريف**)ی لەسەرە، مانای جینس دەگەیەنێ، بۆیە تاك و كۆ دەگرێتەوە، واتە: کۆشك و ژوورە بڵندەکانی بەهەشتیان پێ دەدرێن.

﴿ بِمَا صَبَرُواْ ﴾، بە هۆی خۆڕاگرییانەوە، ﴿ بِمَا ﴾، (ما) لێرەدا (**ما المصدَرِية**) یە، یانی: (**بِصَبرِهِم**)، بە هۆی خۆڕاگرییانەوە، ئەو پاداشتەیان دەدرێتێ.

٢)- ﴿ وَيُلَقَّوۡنَ فِيهَا تَحِيَّةٗ وَسَلَٰمًا ﴾، لەوێدا هەم سڵاو (**تَحِيَّة**)، یان لێ دەکرێ، هەم سەلام، ﴿ وَيُلَقَّوۡنَ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**يَلْقَونَ**)، واتە: تووش دەبن، (**لِقاء**)، بریتیە: لە ڕووبەڕوو بوونەوەی شتێك و تووش بوونی شتێك، لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ بیستنی (**تَحِيَّة**) و (**سلام**)، (**تَحِيَّة**) ئەوەیە کە بڵێی: (**حَيَّاكَ الله**)، خوا بتژێنێ، بەردەوامت بکات، (**سلام**)یش، ئەوەیە بڵێی: خوا سەلامەتت بکات، (**سَلَّمَكَ الله**)، کەواتە: لەلایەن فریشتەکان و لە لایەن خوای پەروەردگارەوە: دڵنیا دەکرێنەوە، کە هەر ژیاوو هەر ماو دەبن و، سەلامەت و بێمزەڕەتیش دەبن.

٣)- ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، لەوێدا بە هەمیشەیی دەمێننەوە.

٤)- ﴿ حَسُنَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ﴾، ئەوێ (ئەو بەهەشت پڕ کۆشك و باڵەخانە بەرزانە) باشترین شوێنی نیشتەجێ بوونە و، باشترین شوێنی تێدا مانەوەشە، واتە: بەهەشت چ تێیدا هەرماوێ و بمێنیەوەو، بیکەیە شوێنی مانەوەی یەکجاریی، چ کەمێکی تێدا بمێنیەوەو، بە شێوەیەکی کاتیی تێدا نیشتەجێ بێ، ئەوە باشترین شوێنە.

**مەسەلەی حەوتەم و کۆتایی:**

**خوای تاك و پاك و بێ نیازو جێی نیاز، ڕایدەگەیەنێ کە مرۆڤەکان ئەگەر بەس لەخوا نەپاڕێنەوەو نەیپەرستن، هیچ جێی بایەخیی نین و گرنگییان پێ نادات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَا يَعْبَؤُا۟ بِكُمْ رَبِّى لَوْلَا دُعَآؤُكُمْ ۖ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًۢا ﴿٧٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

**١)- ﴿ قُلْ مَا يَعْبَؤُا۟ بِكُمْ رَبِّى لَوْلَا دُعَآؤُكُمْ ﴾، بڵێ: پەروەردگارم هیچ گرنگییتان پێ نادات و تۆسقاڵێك بایەختان پێ نادات، ئەگەر پاڕانەوەکەتان نەبێ، ئەم (ما)یە، دەگونجێ (ما النافية) بێ، واتە: پەروەردگارم گرنگییتان پێ نادات، دەشگونجێ (ما الإستفهامية) بێ، ﴿ مَا يَعْبَؤُا۟ بِكُمْ رَبِّى ﴾، واتە: پەروەردگارم چ گرنگییەکتان پێ دەدا؟ چونکە (عَبَأ) وەك (مَلأ)، (عَبَأ، يَعْبَأ)، یانی: گرنگیی پێدا، گرنگیی پێ دەدا، واتە: ئەگەر پاڕانەوەتان نەبێ و، بەندایەتییتان نەبێ بۆ خوا، لە لای خوا ڕێزو نرختان نابێ، مرۆڤەکان ڕێزو نرخیان بە ئەندازەی پەیوەندییانە لەگەڵ خوادا، بە بارتەقای بەندایەتییانە، بۆ خوا عزّ وجل.**

**واتایەکی دیکەی ئەوەیە: ﴿ قُلْ مَا يَعْبَؤُا۟ بِكُمْ رَبِّى لَوْلَا دُعَآؤُكُمْ ﴾، پەروەردگارم گرنگییتان پێ نادات و بایەختان پێ نادا، ئەگەر بانگتان نەکات، واتە: بۆیە بایەختان پێ دەدا، کە بانگتان بکات، بۆ بەندایەتیی بۆ خۆی و پابەندیی بە شەریعەتەکەیەوەو پەیڕەویی لە پێغەمبەرەکەی ﷺ کەواتە: ئەم ئایەتە موبارەکە دوو مانای هەن، بە پێی جیاوازیی حاڵەتی ئیعرابیی وشەی (دعاء):**

**مانای یەکەمیان: (دُعَاء: مُضَافٌ إِلَى الفاعِلِ)، واتە: ئەگەر پاڕانەوەی ئێوە نەبێ، پەروەردگارم گرنگییتان پێ نادا، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الدُّعَاءُ**

**هُوَ ٱلْعِبَادَةُ]** **(أخرجه أحمد: ١٨٤١٥، والبخاري في الأدب المفرد: ٧١٤، وأبو داود: ١٤٧٩، والترمذي: ٢٩٦٩، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا)** واتە: پاڕانەوە بریتیە: لە عیبادەت. کەواتە: بە هۆی بەندایەتییتانەوە، خوا ڕێزتان لێدەگرێ و گرنگییتان پێ دەدات.

مانای دووەمیان: (**دُعَاء: مُضَافٌ إلى مَفعُولِهِ**)، واتە: خوا بۆیە گرنگیی و بایەختان پێ دەدا، کە بانگتان بکا بۆ بەندایەتیی، وەك لە (**إبنُ عَبّاس**)ەوە هاتوە: (**لَولا دُعاؤهُ إيّاكُم لِلدِّينِ وَالإسْلاَمِ**)[1]، واتە: لەبەر ئەوە نەبێ کە خوا بانگتان دەکات بۆ دین و بۆ ئیسلام، نەگەرنا گرنگیی و بایەختان پێ نادات، بەڵام دەیەوێ بانگتان بکات، کەواتە: ئێوەش بە دەم بانگی خواوە بچن و، تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، بۆ ئەوەی ڕێزو حورمەت و ئێوەڕۆکتان بەو شێوەیە بێ، کە شایستەیە بۆ جێنشینەکانی خوا، بۆ مرۆڤە ڕێز لێگیراوەکانی خوا.

لێرەشدا دێینە کۆتایی سوورەتی (الفرقان) لە خوای پەروەگار داواکارین: ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە دەڕازێنەوە بەو پازدە (١٥) سیفەتەی کە لە بەندە هەڵبژاردەو، پەسندەکانی خوای بەبەزەیی دا هەن و، خوا بمانپارێزێ لەو سیفەت و خەسڵەتە خراپانەی، کە دژو پێچەوانەی سیفەتە بەرزەکانی بەندە پەسندەکانی خوان.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمْ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

(١) أخرجه ابن أبي حاتم في تفسير: ١٥٥٠٥.

## نێوەڕۆک

## تەفسیری سوورەتی الفرقان